# سیاسەت و حکوومەت لە ئاسیای ناوەڕاست دا


نووسەران

د. حەبیبوڵڵا ئەبولحەسەن شیرازی و د. محەممەد ڕەزا مەجیدی

وەرگێڕانی

ڕەحمان ئەمیری



هەولێر - ٢٠٠٩





دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● سیاسەت و حکوومەت لە ئاسیای ناوەڕاست دا
● نووسینی: د. حەبیبوڵڵا ئەبولحەسەن شیرازیو د. محەممەد ڕەزا مەجیدی
● وەرگێڕانی: ڕەحمان ئەمیری
● نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
● پیتچنین: هەڵۆ جانانی و کۆسار خودایاری
● بەرگ: هۆگر سدیق
● ژمارەی سپاردن: (٩٤٦)
● نرخ: (٤٥٠٠) دینار
● چاپی یەکەم : ٢٠٠٩
● تیراژ: ١٠٠٠ دانە
● چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٣٩١)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێرست

# "پێشەکی وەرگێر"

ئەگەر بە کورتی ئاورێك لە نەزمی کۆنی ناوچە و ولاتە جیاجیاکانی هەنووکەی جیهان بدەینەوە، یان تیشك بخەینە سەرهەندێك لە رابردووی رەوتی پێکهاتنی ولاتە سەربەخۆ نۆێیەکان و بیچمگرتنی شوناسی نەتەوەیی، نەتەوە ژێر دەستەکان لە جیهاندا، دەتوانین ئاماژە بە ئاسیای ناڤین وەك یەکێك لەو ناوچەگەلەی کە چەندین نەتەوە و ئەتنیکی جیاجیای لێ نیشتەجێیە، بکەین. سەردەمانێك ئەم ناوچەیە لە ژێر دەسەلاتی یەك سیستەموحکوومەتێکی ناکۆجێیی، بێ لە بەر چاوگرتن، یان گرینگیدان بە پرسەکانی پێوەندیدار بە زمانوکولتووروئایینیدا بووە. لە راستیدا دەبێ بلێین کە دەسەلاتی ناناوەندی زۆری هەولێدا کە ئەوەندەی لە توانای دایە بۆ توونا کردن و لە ناوبردنی مێژوو، زمان، کولتوورو کەلەپووری ئەم نەتەوانە، نەتەوەیەکە دەستکرد لە ژێر باندۆری چەتری ئیدئۆلۆژیکی خۆی لەم نەتەوانە پێکبێنێ. هەلبەت بۆ ئەم مەبەستە هێزێکی مادی و مرۆیی زۆریان بێ کار هێناو لە ماوەی پتر لە حەوت دەیە، دەیان رێکاری جۆربەجۆریان گرتە بەر. بەلام هەروەك سەرئەنجام رەوتی گۆڕانگارییەکان لە ناوچەو لە جیهاندا پێشانیدا، سالی ١٩٩١ی زایینی بە خرۆشانی هەموو نەتەوەو ئەتنیکەکانی ژێر دەسەلاتی ئەم سیستمە و بە هێنانە ئارای پرسی نەتەوەی و کولتووریوزمانیوئایینییان، جارێکی دیکەش بە هەموو ئەو سیستم و ئیدئۆلۆژیك و نەتەوەخۆویستانە لە جیهاندا سەلمێندرا، کە هیچ کات نابێو ناکرێ پرسەکانی پێوەندییدار بە نەتەوەیەك یان چەند نەتەوە وەپشت گوێ بخرێ و گرینگی پێ نەدرێ. دیارە ئەم راپەڕینەو سەر هەلدانە لە ناکاو نەبوو بەلکو ئاکامی رەوتێکی دەیان سالەی خەباتی نەتەوەکانی ئەم ناوچەیە بوو. بێگومان هەنووکەش زۆر ولاتی دیکە لە جیهاندا هەن کە چەندین نەتەوەو ئەتنیك لە ژێر یەك سیستمی داخراوی سیاسی یان ئیدئولۆژیك تێدا نیشتە جێیە. لێرەدا دەتوانین ئاماژە بە تورکیەو ئێران، عێراق، سووریە... هتد بکەین. بۆ وێنە ولاتی ئێران کە لە شەش نەتەوەی بەلووچ، کورد، عەرەب، تورکەمەن، فارس، تورکی ئازەری پێکهاتووەو هەرکام لەم نەتەوانە لە



ئێراندا خاوەنی کولتوور و زمان و مێژووی تایبەت بە خویانن و هەرکام لەم نەتەوانە سالانێکی دوورو درێژە بۆ دەستە بەر کردنی مافی مرۆییو نەتەوەیان خەبات دەکەن کە دیارە خەباتی رزگاریخوازی ئەم نەتەوانە یەك لە وان نەتەوەی کورد بە چەندین قۆناخی جیاجیا تێپەریوەو هەنووکەش بە خۆشییەوە گەیشتووەتە لوتکەی خۆی و هەستی نەتەوایەتی کورد لە چاو نەتەوەکانی دیکەی ئێران بەر چاوترەو دیارترەو بۆ گەیشتن بە مافە مرۆییو نەتەوەییەکانی خەباتی خۆی زیاتر چڕ کردووەتەوەو هیوای گەیشتن بە سەربەستی یەکجارەکی بەرزتر بووەتەوە، دیارە هەر نەتەوەیەك بۆ بە دەستهێنانی مافەکانی لە خەبات نەوەستێ و بەردەوام و شێلگیرتربێ باکی نەبێ لە قوربانیدان، بێگومان هیچ هێزێك و دەسەلاتێك ناتوانێ پێش بەو رەوتە پیرۆزە بگرێ و خەباتی نەتەوەکانی ژێر دەسەلاتی سۆڤییەت و هەلوەشانەوەی ئەم یەکیتییە دەرخەری ئەم راستییە. لە پێوەندی لە گەل ئەم بەرهەمەدا دەبێ بلێیم کە بێ کەموکۆری نییە، هەربۆیە داوا لە خوێنەرانی خۆشەویست دەکەم کە بە دەستنیشان کردنی کەموکورییەکان یان ئەگەر سەرنجیان لە پێوەندی لە گەل کتێبەکەدا هەیە هاوکاریم بکەن. هەروەها جێی خۆیەتی سپاسی بە پایانی خۆم ئاراستەی چەند هاورێی ئازیزم، بەرێزان کاك حەسەن سەلیمیو ئەفراسیاب گەرامیو جەلال کشوەردوست بکەم کە لە پێداچوونەوە بەم کتێبەدا هاوکارییان کردووم، وسپاسی کاك مەسعود ئەفشاری دەکەم کە لە هێندێك بواری دیکەدا یارمەتی کردووم.

**رەحمان ئەمیری**

**١٣٨٧/٢/١٠**

**٢٠٠٨/٤/٢٩**

# پێشەکی نووسەران

هەڵوەشانەوەی یەکیەتیی سۆڤییەت و جۆری دوو جەمسەری زاڵ بەسەر سیستمی نێونەتەوەیی لە ئاستەکانی نەتەوەیی و ناوچەیی و نێونەتەوەییدا شوێنەوار و کۆمەڵێك پێشهاتەیی گرینگی بە دواوە بوو. جیا لە پێکهاتنی وڵاتانی سەربەخۆ، ناوچەگەلێکی نوێ هاتنە ئاراوە، کۆمارە باشورییەکانی سۆڤییەتی پێشوو لە دوولای دەریای مازەندەران و لە ناوچەی باشووری قەفقازدا، ئاسیای ناڤین یان پێکهێناوە، کە لە گۆڕانکارییەکانی دەیەی رابردوو و لە ئاست ناوچە و جیهاندا، خاوەن رۆڵی جیاوازو تا رادەیەك چالاك و کارتێکەر بوون. لەم نێوەدا ناوچەی ئاسیای ناوەندی و وڵاتەکانی ـ کە بابەتی خوێندنەوە و توێژنەوەی ئەم نووسراوەیەیە ـ هۆکارگەلی جۆراوجۆری مێژوویی جوغرافیایی، کولتووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووریو... . بایەخێکی تایبەتی هەیە. کۆمارەکانی باکووری دوولای خەزەر خاوەنی پێوەندییەکی قووڵی مێژوویی‌و کولتوورییە لەگەڵ ئێراندا ئەمە خۆی هانەیەکی گرینگە بۆ توێژیینەوە لەسەر ئەم ناوچەیە. ئاشتی وسەقامگیری و ئاسایشی ناوچەکە بەستراوەتەوە بە هاوکاری ناوچەیی، لە ئاست دولایەنەو چەند لایەنە، بەتایبەتی تاقم و رێکخراوە ناوچەییەکانەوە.

ناسینی هۆکارەکانی سەرکەوتن و ئاستەنگەکان، پێویستی بە ناسینی وردی نەتەوەکانی ئەم ناوچەیە هەیە. لەسەر ئەم بنەمایەو بە سەرنجدان بە چەند یەکەیەکی (مادەیەکی) وانەیی کە لە قۆناخەکانی کارناسی و کارناسی باڵا لە بوارەکانی زانستی سیاسی‌و توێژینەوە ناوچەییەکاندا، بۆ ئەم ناوەندە توێژینەوەیە، نووسراوەی ئامادە لەبەر دەستی خوێندکارانی بەڕێزی زانکۆو هەمووی خوازیاران پێشنیار دەکەین ئەم کۆمەڵە لە سێ پاژ ئامادە کراوە:

پاژی یەکەم، ناوچەی ئاسیای ناڤین و کۆمارەکانی دەناسێنێ، جیا لە باس کردن لە تایبەتمەندییەکانی ناوچەکە، لە چوارچێوەی جوغرافیای سرووشتی و مرۆڤی، جوغرافیای سیاسی‌و جوغرافیای ئابووری و تایبەمەتمەندییەکانی پێنج کۆماری ئاسیای ناوەندی توێژینەوەی لەسەر دەکرێت.

پاژی دووهەم، تیشك دەخاتە سەر سیاسەت و حکوومەت لە ئاسیای ناڤین و لە دوو روانگەوە، سەرنجی گوڕانکارییەکانی ئەم وڵاتانە بەر لە هەرسهێنان و دوای هەرسهێنانی



یەکیەتیی سۆڤییەت دەدا، بەشی یەکەم بۆ دەورانی پێش تێکچوونی یەکیەتیی سۆڤییەت تەرخانکراوە لە دوو فەسڵدا لە دەورانی یەکیەتیی سۆڤیەتەوە "لە پێکهاتن هەتا هەرسهێنان"و لە سەردەمی تێپەڕ بوونیش بە ناونیشانی "تێڕوانین لە ناوەندەوە تاکو سەربەخۆیی" گرنگترین بابەتەکانی ناوەندی سیاسەت و حکوومەت وەبەر سەرنج دەکەوێت بەشی دووهەم کۆمارە سەربەخۆکانی ناوچەی ئاسیای ناڤین دوای هەرسهێنانی یەکیەتیی سۆڤییەت باسی لێ دەکرێت و پێکهاتەی حکوومەت، ناوەندە مەدەنییەکانو حیزبە سیاسییەکانی قەزاقستان، ئوزبەکستان، قیرقیزستان، تورکمەنستان و تاجیکستان بە وردی تاوتوێ دەکرێت.

پاژی سێهەم، بە سەرنجدان بە بایەخی سرووشتی ناوچەکە و کاراکتێرەکانی ناوچە و دەرەوەی ناوچەکە لە وەرچەرخانەکانی ئەم بیاڤە جوغرافیاییە، ئەم بابەتە لەژێر ناوی "ناوچەی ئاسیای ناوەندی لە سیستمی نێونەتەوەیی" لە دوو فەسڵدا لێکدەدرێتەوە، گرنگترین یاریزانانی ناوچەکە وەك رووسیە و تورکیە و ئێران و هێندێك لە یاریزانان و هێزەکانی دەرەوەی ناوچەکەو رۆڵی ئەوان لە گۆڕانکەارییەکانی ناوچەکەدا دەخرێتە بەرباس‌و لێکدانەوە. لەم بیاڤەدا جیا لە هێزە دەرەکییەکانی وەکو ئەمریکاو یاریزانانی دیکەی وەك ئیسرائیل‌و پاکستان، رۆڵی دوو رێکخراویی دەرەوەی ناوچەکە ناتۆ و رێکخراوی ئاسایش‌و هاوکاری ئەورووپا لە گۆڕانکارییەکانی ئەم ناوچەیە بایەخی پێ دەرێت.

هیوادارین کە ئەم تەقەلایە هەنگاوێکی چووکە لە ئاراستەی پەرەپێدانی پانتایی توێژینەوەی ناوچەیی ـ کە بە یەکێك لە پێویستییەکانی کۆمەڵگای زانستی و بیاڤی بڕیاردەری وڵاتی ئێمە دێتە ئەژمار. نووسەرانی ئەم بابەتە پێشەکی داوای لێبووردنی کەم کوڕییەکانی دەکەن و داواکارین لە خوێنەرانی خاوەن راوو نووسەران کە هەر چەشنە رەخنە یا پێشنیار و ئاموژگارییەکی زانستییان هەیە پێمانی رابگەیەنن، هەروەها پێویستە هەموو ئەو بەرێزانەی کە لە پێکهێنانی ئەم بەرهەمە هاوکاریان کردووین و هەروەها لە بەرپرسانی بەڕێزی دەزگای چاپەمەنی (قومس) کە بەسەبر وتاقەتەوە، لە چاپ و پەلەکردن بۆ بڵاو کردنەوەی ئەم کتێبە هاوکارییان کردووین سپاسی ئەمەگناسییان بکەێن.

**حەبیبوڵڵا ئەبوئەلحەسەن شیرازی**
**محەممەد رەزا مەجیدی**
**ئەندامی هەیئەتی زانستی زانکۆی تاران**
**سەرماوەزی ١٣٨٢**

# پاژی یەکەم

# "ئاسیای نێوەڕاستو کۆمارەکانی"

# فەسڵی یەکەم

## تایبەتمەندییەکانی ناوچەکە

ئەحمەدبن یەعقوب جوغرافیازانی سەدەی سێهەمی کۆچی لە کتێبی "البلدان" کە لـە سـاڵی ٢٨٧ی کۆچی مانگی (٨٩١زایینی) نووسراوە، تەواوی ئەو ناوچانەی کە ئەمڕۆکە کـە بـە نێـوی ئاسیای ناوەندی[١] دەخویندرێتەوە، بە بەشێك لـە خۆراسـانی گـەورە نێـوبردووە. سـاڵانی دواتـر "ئەستەخەری" لە کتێبی "المسالك وممالك" کە لـە سـاڵی ٣٤٠ی کۆچـی (٩٨٥ زایینیـدا) کـە نووسراوە بە (ناوچەکانی) ئەوبەری چۆمی جیحون (ئامۆدەریا) (ماوراء النهري) پێ گوتراوە و لـە سەدەی دوایی کە ئیسلام بەر بڵاوتر بووەوە و باکووری تورکستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانان، بەو بەشە داگیر کراوەی تورکستان گوتراوە کە هـەمان تـورانی کۆنـە.[٢] لـە ئینـسیکلۆ پێـدیای رووسیەی تەزاری واژەیەك بـە نێـوی رۆژهـەڵاتی نێوەڕاسـت[٣] بـە نـاو نیـشانی چوارچـێوەیەکی جوغرافیایی دیاری کراویەکی سیاسی وەبەرچاو ناکـەوێت بـەڵام بـە دوو ناونیـشانی تورکـستانو (ماوراء النهر) بەرەوروو دەبین کە تێدا واژەی تورکستان هاتووە:

لـە بەشـی رۆژئـاواو ناوەنـدی قـارەی ئۆرئاسـیا، وڵاتـی تورکـستان هەیـە. ئـەم نێـوە لەسەردەمێکی کۆنەوە هەبووە ئەم وڵاتە لە چیاکانی ئەوراڵ تاکو دەریای خـەزەر لـە رۆژئـاواو

---

(1) Teantralnaya Azyia (canteral Asia)

(٢) غولام رزا گۆلی، "کۆماری خودمۆختاری و موسڵمانەکانی قەرەقاڵپاق"

(3) Sarclnaia Asyia (Madle Asia)



باشووری رۆژهەڵاتییەوە تاکو ئاڵتاو سـنووری چـین لـە باشـووری ئێـران و ئەفغانـستان و لـە باکوورەوە بە پارێزگاکانی "تورسـك" "تۆمـسك" هەڵکـەوتووە، ئـەم وڵاتـە نیـوەی پانتـایی ئەوروپای لەخۆ گرتووە لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتوانی کەمترە.[١] لەنێوەی سەدەی نۆزدەهـەم، جوغرافیاناسان و گەشتیارانی ئەوروپایی بە سەرنجدان بە بارودۆخی جوغرافیاییو دابەش کرانی هەرێمەکان و (بە لەبەرچاو گرتنی زەنجیرە چیاکان، رووبـارە گـەورەکانو هەڵکەوتـەکانی تـری زەویی ناسی) بەشێك لە قاڕەی گەورەی ئاسـیایی بـە "ئاسـیای ناوەنـدی"[٢] نێـو دەبـەن کـە بریتییە لە پێنج وڵاتی ئاسیای ناوەندی هەنووکە. سین کیانگی چین، تەبـەتی بـاکووری، بەشـی رۆژئاوای مەغۆلستان، کەشمیر بەشێك لە باکووری پاکستان، ئەفغانستان و بەشێك لە خۆراسان و مازەندەرانی ئێران دەگرێتەوە دوای جێگربوونی حکوومەتی بلشویکەکان لـە سـاڵی ١٩٢٤ی زایینیدا ناوی داتاشراویی "ئاسیای ناڤین"[٣] بە هۆی گوشـارەکانی رووسـیەی کمۆنیـستییەوە پێکهات کە بێشك لە پێوەندی دەگەڵ هێزی شوورەوەی و پاوانخوازییەکانی ئەواندا بـووە، بـەم شێوەیە ئاسیا لە رووی سیاسییەوە بۆ مسکۆ دابەشکرا بە ئەژمارهاتووە.

١) ئاسیای نزیك: کە بە نزیکترین بەشی ئاسیای بە مسکۆ لە قەڵـەم دەدرێـت واتـە بـە داگیر کراوەکانی قەفقاز دەگوترێت.

٢) ئاسیای نێوەڕاست: کە بە نێوان ئاسیای نزیك و دوور دەگوترێت.

٣) ئاسیای دوور: کە بە دوورترین ناوچەکانی ئاسیا بـە مـسکۆ واتـە داگـیر کراوەکـانی سیبریو ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئاسیا[٤] لەقەڵەم دەدرێت.

٤) بەشی گەورەی ئەم ناوچانەی ئێستا هەمان (ماوراء النهر)ی پێشووە کـە لـە رووی جواغرافیاییەوە لە نێوان دوو رووباری گەورەی "ئامۆدەریا" (جێجون)و سیردریا (سـیحوون) هەڵکەتووە بەڵام بیاقی دەسەڵاتی سیاسیو فەرهـەنگی (مـاوراء النهـر) کـە لـە گـرنگترین ناوەندەکانی شارستانییەتی رۆژهەڵاتە، بەپێی بەڵگە نامە مێژووییەکان پانتای ئەم ناوچـەیە

---

(١) ئا. بلینتسکی، خۆراسان و ماوراءالنهر (ئاسیای نـاڤین). وەرگێڕانـی پـەرویز وەرجانـد (تـاران: ناوەنـدی بەدواداچوون و لێکولینەوەی، ١٣٧١)، س ١٩.

(2) Central Asia
(3) Middla Asia

(٤) ناسری هومایون (چاوخشاندنێك بە ئاسیا و ناسینی ئاسیای ناوەندی" و روژنامەی توێژینەوی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ساڵی یەکەم، ژمارەی سێهەم، زستانی ١٣٧١، لاپەڕەکانی ٣٢ ـ ٣٣.

له توركستان واته ناوچەكانی هەڵكەوتوو، لە ژێر ركێفی موسڵمانان و ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی چین كە سەحرا نشینە تورك و مەغۆلەكان ئاوەدانیان كردبوو تاكو ئەفغانستان و بەلوچستانو پاكستانی ئێستا بووەو تەنانەت كارتێكەری كولتووریان لە سین كیانگی چینیش زیاتر تێپەڕیوە.

لە بواری رەگەزەوە بەشێك لەم ناوچەیە، واتا (ماوراءالنهر) لە سەرەتا لەلایەن ئارییەكان ئاوەدان كراوەتەوە، بەڵام بە سەرنجدان بە هاتنی نەتەوەكان، عەشیرەتەكانی تورك زۆربەی بەشەكانی ناوەندییەوە بەرە بەرە كەوتنە ژێر باندۆری كولتووری توركانەوە. جگە لە حكوومەتەكانی تاهیرییەكان، سفارییەكان و سامانییەكان (بنەماڵە دەسەڵاتدارەكانی ناوچەكە)، بە رەچەڵەك تورك بوون. ئەمانە وەك دەسەڵاتی ئێرانی و بەشێك لە مێژووی ئێران دەئەژمێردران یا بە نوێنەری حكوومەتەكانی ئێران بۆ كۆكردنەوەی باج بۆ ئێران لەقەڵەم دەدران. ئێستاش جگە لە تاجیكەكان كە بە فارس زمانن زۆربەیان بە رەچەڵك ئاریایین، تایبەتمەندییە رواڵەتیو زمانییەكانی زۆربەی خەڵكانی ئەم ناوچەیە توركین. رووسەكان لە راستای جیاكردنەوەی نەتەوەكانی غەیرە رووس لە رابردووی مێژووی خۆیاندا وشەی "ئاسیای ناڤین" یان بە تەواوەتی بەربڵاوتر بە جێگای واژەی مێژووی (ماوراء النهر) بۆ ئەم ناوچەیە دیاری كردووە. پانتایی ئەم ناوچەیە ٩٠٠ /٣/٩٩٣ كیلۆمەتری چوار گوشەیەو رێژەی دانیشتووانی دەورووبەری پەنجا ملیۆن كەسە. كە زیاتر لە سێ لە چواری موسڵمانی سونیی و حەنفین. ئەم ناوچەیە لە باكوورەوە بە رووسیە، لە رۆژهەڵاتەوە بە چین، لە باشوورەوە بە ئەفغانستان و ئێران و لە رۆژئاواوە بە دەریای خەزەر كۆتایی پێدێ و كۆمارەكانی ئوزبەكستان، قیرقیزستان، قەزاقستان، توركمەنستان، تاجیكستان لەخۆ دەگرێت. پێش ئەوەی بە شێوەیەكی جیاجیا باس لە هەركام لەم پێنج كۆمارە بكەین، ئاماژە بە تایبەتمەندییە گشتییەكانی ئەم ناوچەیە دەكەین كە گرینگترینیان دەتوانین لە هۆیەكانی خوارەوە كورت بكەینەوە.

یەكەم ئاسیای ناڤین لە بواری جوغرافیاییەوە لە شوێنی گرێدانی ئووروپاو لە رۆژئاواو ئاسیا لە رۆژهەڵات هەڵكەتووە و لەلای باكووریشەوە بە رووسیە و لەلای باشووریش بە جیهانی ئیسلامەوە بەستراوەتەوە.(١)

(١) پیرۆز مجتهدزادە، "جوغرافیا و سیاسەت لە دونیای رووداوەكان"، مانگ نامەی زانیاری سیاسی- ئابووری، ژ (١١٩ ـ١٢٠)، جۆزەردانی ١٣٧٦ لاپەرەی ٣٥



دووهەم: ئاسیای ناوەندی ناوچەیەكە لەناو وشكایدا گەمارۆ دراوە بەبێ ئەوەی كە راستەوخۆ رێگای بۆسەر دەریای ئازاد هەبێت.(١)

سێهەم: ئاسیای ناوەندی خاوەنی ژێرخانی سرووشتییە بەتایبەت گاز و نەوت و ئاسنەكانی، كەم وێنەیە ئەم ناوچەیە خاوەنی كەشو هەوایەكی تایبەتییە بۆ چاندنی لۆكە و بەرهەمەكانی دیكەیە.

چوارەم: ئەوەی كە ئاسیای ناوەندی لە شوێنی یەكگرتنی كولتووری نێوان رۆژئاواو رۆژهەڵات هەڵكەوتووە بە جۆرێك لەگەڵ كولتوورەكانی توركیو ئیسلامی پێوەندیی لەمێژینەیان هەیە، لە رووی مێژووییەوە ناوچەكە بۆ ماوەیەكی زۆر كەوتۆتە سەر رێگای (هەورێشمەوە). كولتووری رۆژئاوایش هەر لەم رێگایەوە توانیویەتی خۆی بخزێنێتەوە ناو رۆژهەڵاتەوە.(٢)

پێنجەم: لە رووی ژیۆستراتیژیكییەوە ئاسیای ناڤین سیمایەكی تایبەتی لە كردەكان و دژ كردەوەكانە لە بەشێكی بەرفراوانی جیهاندا. ئاسیای ناڤین تاكە ناوچەیەكی جیهانە كە چوار هێزی ناوكی رووسیە، چین، پاكستان، هێندی پێكەوە گرێداوە.

شەشەم: لە رووی جوغرافیایی ئابووریش(٣) دەتوانین سەرنج بدینە ئەم ناوچەیە كە تایبەتمەندیەكانی خوارەوە لەخۆ دەگرێت.

١ـ كۆتایی هاتن بە پەراوێز بوونی ئەم ناوچەیە لە دونیای دەرەوە، بارودۆخی لەباری جوغرافیایی بەو مانایە كە ئەم وڵاتانە لە خاڵی یەكگرتنی دوو قارەی گەورە هەڵكەوتوون دەتوانێ وەكو پردێكی پێوەندی نێوان ئەوروپاو ئاسیا رۆڵ بگێڕن.

(١) تیوشوكوئی "سەركەوتنی ژیئوپولتیك و ئابووری وڵاتانی ئاسیای ناوەندی لە دەیەی ٩٠و تێروانێك لە پەرەگرتنی ئەوان"، وەرگێڕانی شارۆخ بەهار، و رۆژ نامەی ئاسیای ناوەندیو قەفقاز، ژمارەی ٥ (هاوینی ١٣٧٣) لاپەرەكانی ١١١ـ ١١٢.

(٢) غولام حوسێن حەیدەری، تایبەتمەندییەكانی ژیئوپۆلوتیكی ئاسیای ناوەندی، (تاران: چاپخانەی رێكخراوی جوغرافیای وەزارەتی بەرگری، ١٣٧٢)، ل ١١٤.

(3) Geoeconmics

٢ـ هاتنه ئارای پێوەندییەكی ئاسیایی لەگەڵ هەموو وڵاتانی دراوسێ گونجاو دەبێت.

٣- بە هۆی بایەخی رۆژ لەگەڵ رۆژی فاكتەرە ئابوورییەكان لە پێوەندییە نێونەتەوییەكان و پیشەسازی دەوڵەمەندی وزە، ئاسنەكان و بناغەی پیشەسازی، كشتوكاڵ و بوارەكانی تكنۆلوژی ئەمڕۆ، وڵاتانی ئاسیای ناڤین دەتوانن لە چوارچێوەی ئابووری جیهاندا خێراترگەشە بكەن.

٤ـ پرۆسەی ناوچەیی بوونی ئابوورییەكانی جیهان هاوكات لەگەڵ نێونەتەوەیی بوونی ئەوانە كە هەر كامیان بەپێی بەشی خۆیان دەتوانن هاریكاری ئابووریان لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ بەرز بكەنەوە. جیا لەمانە چەندین تایبەتمەندی وەكو هەڵكەوتن لە نزیك بە یەكگیشتنی ئاسیاو ئەوروپا، دراوسێەتی لەگەڵ هێزە گرینگەكانی وەكو چین و رووسیە و ئێران و پاكستان، خاوەنی دووهەم كۆگای گەورەی وزەی دونیا وەكو كانزاكانی زێر (بۆ وێنە كانزاكانی وڵاتی ئوزبەكستان ٩٩/٩٩ لە سەد خالسە) قورقوشم، ئۆرانیۆم، ئاسنە قورسەكانی تر، جۆراجۆری بەرهەمە كشتوكاڵییەكان، پەرەسەندنی حەشیمەت، توانایی وزە بۆ پەرەپێدان و پەروەردەكردنی كولتووری ئیسلامیو بازاڕی بەكار هێنانی زیاتر لە ٥٠ ملیون، تایبەتمەندییەكی بێوێنەی بەم وڵاتانەی بەخشیوە، بە جۆرێك كە هێندێك لە بیرۆكڤانان ئەم ناوچەیە بە "دڵی ئاسیا"(1) ناو دەبەن. بارودۆخی ئاماژە پێكراو لەگەڵ كۆمەڵێك شتی دیكە وەكو ناروون بوونی بارودۆخی حكوومەتەكان لە هەمبەر كۆمەڵگاو بە شێوەی گشتی نا چالاك بوونی پرۆسەی نەتەوە و دامەزراندنی دەوڵەت. كێشەی جوراوجۆرەكانی جۆغرافیو سنووری، فرە نەتەوەیی و عەشیرەتیو شەڕە ناوخۆییەكان و دەست پێ را نەگەیشتن بە ئاوە گەرمە نێونەتەوییەكان، گەمارودراو بە وشكایی، كۆمارەكانی ناوچەكەی لە رەهەندی ئەمنییەتییەوە مەترسی زیانیان لە سەرەو لە هەلومەرجێكی وادا، بوونیان و بانگهێشت كردن لە هێزەكانی دەرەكی بۆ گەشەپێدانی ئابووری وەكو بێ خەرجترین ئالترناتیڤ هەڵبژێردراوە(٢). ئەم جۆرە پێویستییە،

(1) Heartland of Asia

(٢) سەنم كازرونی، ئاسیای ناوەندی داهاتوویەكی نادیار (تاران: بلاكراوەی گوزینش ١٣٧٦)، لاپەڕەی، ١٢.



دەوڵەتانی ناوچەكەی خستووتە هەلو مەرجێكەوە، كە ئەوان راستەوخۆ و بەبێ هیچ ناوبژیوانێك لەگەڵ كۆمپانیا فرە نەتەوییەكان خەریكی وتوێژ كردن دەبن و هەر ئێستاش كۆمپانیا گەورەكای وەكو "شۆرون" ئاكسون، كۆنگۆ، هێندێكی دیكە لە كۆمپانیاكانی رۆژهەڵاتی دوور وەك "دوو" كە زیاتر لە یەك ملیارد دۆلاری لە ئوزبەكستان سەرمایەی داناوەو "میتسۆبیشی" كە لە بەرهەمەكانی نەوتی سەرمایەگوزاری كردووە لەگەڵ كاربەدەستانی ناوچەكە كەوتوونەتە دانووستاندنەوە. ئەم كارە بووەتە هۆی زیادە كردنی ركەبەری لە نێوان هێزە ناوچەیی و نێونەتەوەییەكان. زۆربەی سەرمایەدانەرەكان هی كۆمپانیا ئەمریكاییەكانن. یەكیەتیی ئەوروپاش پلانی بۆ ركابەری لە ناوچەكەدا لەبەرچاو گرتووە ٢٨٪ لەو ١٥/٥ ملیارد سەرمایە گوزاریی كە لە كنارەكانی دەریای خەزەر كراوە هی كۆمپانیاكانی ئوروپایی رۆژئاوان. یەكیەتیی ئەوروپا بە نیازە تاكو ساڵی ٢٠١٠ نزیكی ١٧/٤ ملیارد دولارله ناوچەی غەیرە كەنارییەكان، ٢٤/٥ ملیارد دولار لە سەرچاوە كنارییەكانی دەریای خەزەرو نزیكەی ١٣/٧ ملیارد دولار لە پلانەكانی گواستنەوەی وزەی ناوچەكە سەرمایە گوزاری بكات.

# فەسڵی دووهەم

## تایبەتمەندییەکانی پێنج کۆمار

### ئەلف. جوغرافیای سرووشتی و مرۆیی

١ـ ئەم وڵاتە لە بەشی ناوەوەی قارەی ئەورووپا- ئاسیا و باکووری ئاسیای ناوەندی هەڵکەوتووە، کە زیاتر لە سەد نەتەوەیی لەخۆ گرتووە کە بەشێك لەم نەتەوانە ژمارەیان ناگاتە چەند سەد کەس. کۆماری قەزاقستان کە دەوروبەری ١٧ملیۆن حەشیمەت و بە رووبەری ٢/٧١٧/٣٠٠ کیلۆمەتری چوار گۆشەیە، لەنێوان کۆمارەکانی سوڤییەتی پێشوو بە دووهەمین کۆمار لە بواری روبەرەوە لە قەڵەم دەدرێ. بە جورێك کە رووبەری ئەم وڵاتە لە رووباری "ولگا" لە رۆژئاواو چیاکانی ئاڵتا، لە رۆژهەڵات ١٩٠٠ کیلۆمەترە و لە باکوورەوە بە رووسیەو بەشێك لە سیبری و لە رۆژئاواوە بە هێڵکی کەناری نزیکەی ٢٣٢٠ کیلۆمەترو بە درێژای دەریای خەزەر و رۆژهەڵاتەوە بە چین و مەغولستان و لە باشوورەوە بە ئوزبەکستان و قیرقیزستان و تورکمەنستان کۆتایی پێدێ. سرووشتییە کە وڵاتێك بەم رووبەرەوە خاوەنی تایبەتمەندی ئاوو هەوای جوغرافیای جۆراوجۆرە. ئاو و هەوای قەزاقستان قارەییە، بەڵام لە ناوەوە وڵاتێکە کە خاوەنی هەوراز و نشێوێکی بەربڵاوە. بۆ وێنە، لە باکوور نێوەنجی پلەی گەرمی لە ژانوییە ١٨سانتیگرادە و لە باشوور ٣ پلەی سانتیگرادە. قەزاقستان سەرەڕای هەبوونی چەندین چیای بەفرگیربە بەرزایی ٥٠٠٠ مەتری لە ئاستی دەریاوە، چەندین دەشتی پڕ ئاو و بەپیت و ناوچەگەلێکی بیابانی و گەرم بە بەرزایی ١٣٠ مەتری لە ئاستی دەریا لەخۆ دەگرێت. نێوەنجی ساڵانەی باران بارین لەناوچەکانی کوێستانی دەگاتە ١/٦٦٠ میلیمەتر لە کاتێکدا لە ناوەندی ناوچەکەو کوریەکان لە ١٠٠ میلیمەتر تێناپەرێت[1]. کۆمار قەزاقستان وڵاتێکە کە رێگای بە ئاوی ئازاد نییە. رووبەری ئاوەکانی قەزاقستان ٤٧٥٠٠و رووبەری

(1) The Europa warld year Boo 2002 (London Europa publicationsltd, 2003), p2281



وشکایی ٢/٦٦٩/٨٠٠ کیلومتری چوار گوشەیە. تۆڕی ئاویی ئەم وڵاتە بە بەراورد لەگەڵ رووبەرەکەی کەمە. دەریاچە گرینگەکانی بریتین لە: ١ــ ئاراڵ ٢ــ بالخاش ٣ــ زایسان کە دەریاچەی ئاراڵ هاوسنوورو هاوبەشە لەنێوان دوو کۆماری قەزاقستان و ئۆزبەکستان. هەروەها رووباری "ئیرتیش"، گەورەترین و پڕئاوترین رووباری قەزاقستانە. دووهەمین رووباری گرینگی ئاسیای ناڤین واتە سیردەریای (سیحون) بە ١٤٠٠ کیلۆمەتر درێژایی لە سنووری باشووری ئوزبەکستانەوە، دێتە ناو ئەم وڵاتە و دەڕژێتە ناو رووباری ئاراڵەوە. زیاتر لە یەك لە سێ رووبەری قەزاقستان دەشتایی و نزیك بە ٢٪ی کوێستانییە. بەندەری ئەکتائو گرینگترین بەندەری ئەم وڵاتەیە. شارەگرینگەکانی بریتین لە: ١ـ ئای ئاتی ٢ـ کارئاگاندا ٣ـ چمکینت ٤ـ سمی پالاتینسك ٥ـ پاولاووار ٦ـ تاق مەلا (ئاستانە)یە.

قەزاقستان خاوەنی کانزایی جۆراوجۆرە هێندێك لەو کانزایانە، بریتین لە کانزای گەورەی بەردی خەڵووزو بەردە ئاسن، قۆرقوشم، فافۆن، مس و نەوت. بەشێك لە ئاسنەکان وەکو ئۆرانیۆم، کرومیت، نیکل، مینیزیم، تەنگستن، مەنگنز، قەلایی، بەردی کل، کادمیۆم، بۆکسیت هیدروکسیدی ئالمینیۆم، زێو، ئاسن، فوسفات و هێندێك لە ئاسنە کەم وێنەکانی دیکە لە کۆماری قەزاقستان دەر دەهێنێت. پێشەسازییەکانی بریتییە لە پێشەسازی هێنانە دەر و تواندنەوەی ئاسنەکان و غەیرە ئاسنەکان و پێشەسازی کیمیایی، سووتەمەنی، وزو دروستکرانی ئوتۆمبیل، چیمەنتۆ رستن و چنین، رستنی گۆرەویی، پێشەسازی خۆراك (تایبەت بە کونسرووت و گۆشت)و پێشەسازییە بچووکەکانی تر[1]. لە بواری کشت و کاڵییەوە لۆکە، برنج، دانەوێڵە، میوە، سەوزە، ترێ، نەی شەکر، پەتانە، کەتان دەچێندرێت، قەزاقستان لە بواری ئاژڵدارییەوە خاوەنی پلەی یەکەم بووە لە سوڤییەتدا. مەڕومالاتی دیکە بۆ بەدەستهێنانی گۆشت و شیرەمەنی بەخێو دەکەن پێستی مەڕی "ئەستراخان" نێوبانگی زۆری هەیە، جیا لە مالاتی سەرەکی، بەرزایش بەخێو دەکرێت. راوەماسی لە کۆماری قەزاقستان بە شێوەیەکی باش پەرەی سەندووە[2].

(١) حەبیبوڵلا ئەبوئەلحەسەن شیرازی. نەتەوەکانی ئاسیای نێوەڕاست (تاران: سەنتەری بە دواداچوونی سیاسی و نێونەتەوەیی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٥)، ل ١١٦

(٢) شیرین ئاکینەر، ئەتنیکە موسڵمانەکانی سۆڤییەت، وەرگێڕانی عەلی خەزای فەڕ (مەشهەد: بڵاو کراوەی ئاستانی قودسی رەزەیی، ١٣٦٦)، ل ٣٥٤.

بەربلاوی زۆری ئەم وڵاتە و بوونی لەوەڕگەو چیمەن و مێرگی زۆر بووەتە هۆی ئەوەی کە، ئەم وڵاتە بە درێژایی مێژوو ببێتە شوێنی نیشتەجێ بوونی مەڕدارە کوچەرەکانی تورك و چەندین شەڕو تێکهەڵچوون لەسەر پاوان کردنی ئەم لەوەڕگایانە روویداوە. لە دەورانی دەسەڵاتداری قەیسەرییەکان و دواتر کۆمۆنیستییەکان و کەم بوونی زەوی بەپیتی کشتوکاڵ لە رووسیە بووە هۆی هاتنی رووسەکان بۆ ئەم وڵاتە و داگیر کردنی زەویە بەپیتەکان. کە ئەمە خۆی بووە هۆی سەرهەڵدانی کێشە لەنێوان دانیشتوانی رەسەن و رووسەکان و لە کۆتاییدا ئاوارە بوونی خەڵکی رەسەنو گۆرانکاریی لە دێموگرافی حەشیمەتی لێکەوتەوە[1]. بە هۆی دژواری و دەست پێڕانەگەیشتنی بەم ناوچەیە کە لە دوور بوونی لە ناوەند و سنوورە ئەوروپایەکانی حکوومەتی پێشوو سەرچاوە دەگرێت، بووە هۆی ئەوەی کە لە قەزاقستان وەکو ناوچەیەکی ئەمەن بۆ دانانی پێگەی مووشەکی بە کلاوەکی ناوکی و ناوەندی بەرێ کردنی کەشتی ئاسمانیو تاقی کردنەوەی ناوکی کەڵکی لێوەرگیرێت. لەلایەکی دیکەوە هاو سنوور بوونی قەزاقستان لەگەڵ چین سەرنجی دوو حکوومەتی سۆڤییەت و چین کە دژایەتی بەرژەوەندییان هەبوو بۆ بەشەکانی سنووری ئەم وڵاتە راکێشرابوو. بە گشتی ئەم هۆیانە بووە هۆی گەشە سەندنی بایەخی رۆژ لەگەڵ رۆژی ئەم وڵاتە بەربلاوەو دەوڵەمەندە بەتایبەتی دوای گۆڕانکاری سەردەمی گۆرباچوف و دوای بەدەستهێنانی سەربەخۆیی. هەر بەم هۆیە لەنێوان زلهیزە جیهانیو ناوچەییەکان و بۆ کارتێکەری لەم وڵاتەدا رکەبەرایەتێکی چڕوپڕ دەستیپێکرد. وڵاتانی دیکەی ئاسیای ناوەراستیش بەم هۆیەوە هەروەها بە سەرنجدان بە بەربلاوی کانزای بەهێز و کەرەستەی ناوکی ئەم وڵاتە دەرهەق بەم حکوومەتە تێبینییان لەبەرچاو گرتووە و شێوازی رێبەری کردنی رێبەرانی ئەو وڵاتەیان بەرز نرخاندووە.

جێگای وەبیر هێنانەوەیە کە سیاسەتی رووسەکان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ناوەندە و بگرە هەتا رووسیەکانی نیشتەجێی ئەم وڵاتە زۆرتر لەسەر بنەمای جیا کردنەوەی قەزاقستان لە ئاسیای ناوەڕاست داڕێژرابوو، هەنووکەش ئەم سیاسەتە درێژەی هەیە. چونکە زیادەبوونی ئەم وڵاتە بەرین و دەوڵەمەندە بە ئاسیای ناڤین دەتوانێ وزەی دەسەڵاتی زیاتر بەم کۆمەڵەیە بدا. هەر بۆیە بە بیانووی جیاوازی پێکهاتەی حەشیمەت (نزیك بە نیوەی دانیشتوانی قەزاقستان لە

(1) Eastern Europe, Russoa and central Asia, (London: Europapubications Ltd, 2003). P. 195



رووسەکان پێکهاتوون)و هەڵکەوتەی جوغرافی وڵاتەکە، هەوڵدراوە کە شوناسێکی جیا لە ئاسیای ناوەندی بۆ قەزاقستان بدۆزنەوە. هەڵبەت بارودۆخی جوغرافیاییو راستییە مێژوویی ئەتنیکیو کولتوورییەکان، ئەم جیاییە ناپەرژێننو پێوەندییە نیشتمانیو مێژوویيو کولتوورییەکانی قەزاقستان لەگەڵ ئاسیای ناوەندی ئەوەندە ئاشکرایە کە ناتوانرێ حاشای لێ بکرێ. سیاسەتوانە قەزاقەکانی قەزاقستان وێرای هەوڵدان بۆ هاو ئاراستە کردنی نێونجی لەگەڵ سیاسەتی رووسەکانی قەزاقستان و مسکۆ بە مەبەستی جیایی لە ئاسیای نێوەڕاست، لانیکەم بە ئاراستەی خۆ بە گەورە زانین بەسەر وڵاتانی ئاسیای نێوەڕاستدا، لە هەندێك بڕگەدا پیشتیوانیان لەوە کردووە کە وڵاتەکەیان بچێتە رێزی وڵاتانی ئاسیای ناڤینەوە. زۆرینەی رووسەکان و سلاڤەکانی قەزاقستان کە نزیکەی ٤٠٪ حەشیمەتی ئەم کۆمارە پێکدێننو لە بەشەکانی باکووری، نزیك بە سیبری رووسیە دەژین. قەزاقەکانیش کە نزیکەی ٤٤٪دیکەی حەشیمەتی ئەم وڵاتە پێکدێنن زۆربەیان لە بەشەکانی باشوور رۆژئاواو ناوەند نیشتەجێن. ناوچە رووس نشینەکان ناوەندەگەورەکانی بەرهەمهێنان و جووتیاری و ئاژڵداری و بەشێك لە کانزاکانی ئەم کۆمارە پێکدەهێنن.

بە سەرنجدان بە دراوسێییەتی قەزاقستان لەگەڵ رووسیا، ئەم کۆمارە بە توندی جێگای سەرنجی رووسەکانە. ئەم سەرنجە تا رادەیەکە کە بانگەشەی خاوەنداریەتی خاکی ئەو وڵاتەی لێکەوتوتەوە. ئەم بانگەشەیە لە دوای سەربەخۆیی کۆمارەکانی سۆڤییەت وەکو کەرەستەیەکەی گوشاری رووسەکان بەسەر قەزاقستاندا بەڕێوە چووە. بە واتایەکی دیکە نەك هەر رادەی بەرز بوونەوەی حەشیمەتی رووسەکان لەم وڵاتە، بەلکو بارودۆخی جوغرافیایی شوێنی نیشتەجێ بوونیان بەردەوام وەکو کەرەستەیەکی گوشار بەسەر حکوومەتی قەزاقستان سەپاوە[1]. ناوچەکانی قەزاقستانیش بە هۆی بوونی زەریاچەی ناسراوی زایسانو بالخاشو ئوراڵو رووباری سیدریا (سیحون)و کەنارەکانی دەریای خەزەر لەگەڵ لەنگەرگای ناسراوی شفچنکو کانزای بەربلاو، یەك لەوان کانزای نەوتی تەنگیز، بایەخێکی تایبەتی ئابووری هەیە. ئەم ناوچەیە بایەخی سیاسیو کولتوریشی هەیە، کە هۆیەکی دراوسێیەتی سنووری بە پانتاییەکی زۆر لەگەڵ وڵاتی چین و جیرانییەتی لەگەڵ خەڵکانی موسڵمان نشین و بوونی ویلایەتی تورکستانە.

(١) عەلی رەزاشیخ عەتارە ریشەکانی هەڵس و کەوتی سیاسی لە ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، (تاران: چاپەمەنی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٣)، لاپەڕەکانی ٢٠٣ ـ ٢٠١

خەڵکی تورکستان بەدین داری و بەریان زۆری ئایینی نێوبانگیان هەیە و بە هۆی بوونی مەزار گەلی ناسراوی خەڵکی ئاسیای نێوەڕاست، یان گومەزی "خواجەی ئەحمەدی یوسوی" گەورەترین زانای سۆفی بە رەچەڵەك تورکی ئەم ناوچەیە شوێنی کۆبوونەوەی موسڵمانانی دیکەی ئاسیای ناوەندییە و شاری ئەترانیز کە یەکێك لە ناوەندەکانی خوارزم شاو وشوێنی دەسپێکی هێرشی چەنگیز بۆسەر ئێران بووە لە تورکستان هەڵکەوتووە. زمانی نەتەوەیی ئەم وڵاتە، زمانی قەزاقییەو یەکێکە لە لقەکانی تورکی ناوەندی، کە ئەمە وەك بەشێك لە لقەکانی زمانی قیچاقی بە ئەژماردێت. پێتەختی قەزاقستان ئاستانەیە.

٢ـ ئوزبەکستان

ئوزبەکستان کە لە رۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاستدا هەڵکەوتووە، لەگەڵ چوار وڵاتی دیکە ئەم ناوچەیە واتە قەزاقستان، قرقیزستان، تاجیکستان و تورکمەنستان دراوسێیە، ئوزبەکستان لە باشوورەوە لەگەڵ ئەفغانستان هاوسنوورە، ئەم وڵاتە سەربەخۆ ونووێیە نزیکەی ٤٤٧ هەزار کیلۆمەتری چوار گۆشە رووبەری هەیەو ژمارەی دانیشتوانی بە پێی دوایین ژمێریاری ساڵی ١٩٩٩ نزیکەی ٢٣/٩ ملیون کەسە. ئوزبەکستان لە رووی کەش و هەواوە بە هەرێمێکی گەرمو وشکارۆ دەژمێردرێ. کە هاوینەکانی زۆر گەرم و دوورودرێژ و بە پێچەوانەوە زستانەکانی کورت و وشکە سەرمایە بە جۆرێك کە لە مانگی جوولای نێونجی پلەی گەرما دەگاتە ٣٢ پلە و هێندێك رۆژیش دەگاتە ٤٠ پلە، لە زستانیش پلەی هەوا زۆرجار بۆ ٣٠ پلەدادەبەزێت[1].

پێتەختی کۆماری ئوزبەکستان شاری مێژووی تاشکەندە و لە شارەکانی ناسراوی دەتوانین ئاماژە بە دوو شاری مێژووی سەمەرقەند و بۆخارا بکەین. کە بە زمانی فارسی تاجیکی دەدوێن. زمانی فەرمی ئەم کۆمارە تورکی ئوزبەکییە و دراوی ئەم وڵاتە سمە. لە ئوزبەکستان چەندین ئەتنیکی جواروجۆر هەیە (نزیکەی ١٢٩ ئەتنیکی جوارجۆر) کە ٧٢ لە سەدیان ئوزبەکین. ئیسلام ئایینی فەرمی ئەم وڵاتەیە و زۆرینەی موسڵمان لە پێرەوانی حەنەفی مەزهەب پێکی دێنن. لەم نێوەدا کەمینەی وەهابیش هەن کە لەلایەن عەربستانی سعوودییەوە پشتگیری دەکرێن هەروەها دەتوانین ئاماژە بە سۆڤییەکانیش بکەین کە لە باشووری ئوزبەکستان کەمینەیەکی بەرچاو پێکدێنن. لەم وڵاتەدا پەیڕەوانی ئاینییەکانی دیکەش دەژین کە دەتوانین ئاماژە بە

(1) Eastern Furope, Russiaand central Asia, (London: Europapublions Ltd 2003), p.484



پەیڕەوانی ئایینی ئورتۆدۆکسو جوولەکە بکەین. ئۆزبەکستان لە ئاسیای نێوەڕاستدا لەنێوان دوو رووباری ئامودریاو سیردریا هەڵکەوتووە و درێژایی ئەم وڵاتە لە رۆژهەڵاتەوە تا رۆژئاوا نزیکەی ١٤٢٥و لە باکوورەوە تا باشوور ٩٣٠ کیلۆمەترە. ئەم وڵاتە لە باکووری رۆژهەڵاتەوە لە رێی چیاکانی پسکام، زنجیرە چیاکانی چالْقال. چیاکانی فەرغانە و ئالایی بە قرقیزستان و لە باکوورەوە بە باکووری رۆژئاواو لە رێگای کەلات ئەستۆرتی رووباری ئاراڵەوەو لە بیابانی قەزڵ قوم و زنجیرە چیاکانی کارژانتا و بەشی باکووری رۆژهەڵاتی بە زنجیرە چیاکانی ئوگامەوە بە قەزاقستان و لە باشووری رۆژهەڵاتەوە لە رێگای زنجیرە چیاکانی کۆرامین، تورکستان و زەرئەفشان، حەسارو باباتاق بە تاجیکستان و لە باشووری رۆژئاوا لە رێی ئامۆدریا، چیاکانی تنگستاو، باشووری قەڵاتی ئەستۆرەت و شەش کەناری بیابانی راستی ئامۆدریا بە تورکستان و لە کۆتاییدا لە باشوورەوە لە رێی ئامۆدریا بە ئەفغانستان کۆتایی پێ دێت. رووبەری ٤٤٧/٤ هەزار کیلۆمەتری چوار گوشەو پەنجاو شەشەمین وڵاتی جیهانە لە رووی رووبەرەوە. گەورەترین رووباری ئوزبەکستان رووباری ئاراڵە[1] و رووبارە گرینگەکانی ئەم وڵاتە بریتییە لە: ١- ئاناسای ٢- ئەنگیزکوول ٣- ساری قامیش ٤- شۆرکوول، ئوزبەکستان کۆمەڵێك کۆگای دەست کردی ئاوی تا رادەیەك زۆر هەیە. بەشی زۆری خاکی ئوزبەکستان دەشتە (٧٨/٧ لەسەد)و بەشەکانی دیکە لە چیاکان و هەوراز و نشیوکانی نێوان چیاکان (٢١/٣ لەسەد) پێکدێت.

بەرزترین لوتکەی ئوزبەکستان کە لە زنجیرە چیاکانی حەسار هەڵکەوتووە، چیای حەزرەتی سوڵتانە ٤٦٤٣ مەتر بەرزایی هەیە، ئامودەریا سیردریا نزیکترین رووبارن بە ئوزبەکستان. بەشی زۆری خاکی ئوزبەکستان واتە بەشەکانی رۆژهەڵات و ناوەندی ئەم ناوچەیە لەبارو بەشی رۆژئاوای ئەم ناوچەیە وشکارۆ هەڵکەوتووە. بە شێوەی گشتی تایبەتمەندی ئاووهەوای ئوزبەکستان جیاوازی زۆری پلەی گەرماو، رادەی کەمی باران بارین لە ساڵداو زۆر هەتاو دەیگرێ. ئوزبەکستان وڵاتێکە بوومەلەرزەی لێ دەدا. لە خاکی ئوزبەکستان نزیکەی ٣٠٠٠جۆری گیا دەستدەکەوێ کە دوسەدو پەنجا جۆری تایبەتە بەو وڵاتە، شارە گرینگەکانی ئوزبەکستان بریتین لە: تاشکەند بە ٢/٥ ملیۆن کەسی، سەمەر قەند بە ٣٦٠ هەزار کەس، نەمنگان بە ٣٣٠ هەزار کەس، ئەندیجان بە ٣٠٠ هەزار کەس[2]، بۆخارا بە ٣٤٠ هەزار کەس،

(١) داود چەرمی، ئوزبەکستان، (تاران: بڵاوکراوەی کاروباری دەرەوە ١٣٥٠) لاپەڕەی ١٠٢

(٢) ئەبوئەلحەسەن شیرازی، پێشوو، ل ٧٤

فەرغانە بە ١٩٥ هەزار کەس‌و خۆقەند بە ١٨٠ هەزار کەس حەشیمەت. تاشکەند پێتەختی ئۆزبەکستان تاکە شاری ئاسیای نێوەڕاستە کە خاوەنی هێڵی میترۆیە.

کۆماری ئۆزبەکستان خاوەنی پیشەسازی گەورەی گازی سرووشتی و کانزای گرینگی نەوت و بەردی خەڵووز، مس، قورقۆشم، مەنگنیز، تەنگستەن، ئورانیوم، زێر، فافۆن، فلۆریت کەل‌وپەلی بنیاسازی (لەوانە بەردی مەرمەڕ و بەردی ئاسن)ە. پیشەسازی کۆماری ئەزبەکستان بریتییە لە: دەرهێنانی نەوت و گازی سرووشتی، پاڵاوتنی نەوت، ماشێن سازی، (بەرهەمهێنانی بەربڵاوی کەرەسەی ماشێن "ئۆتۆمبێل" و چاندنی لۆکە و رستن و چنین لە ئاسیای ناڤین)، کانگاو دەرهێنانی بەرهەمە کانگاییەکان ئاسن و پۆڵا، پیشەسازی کیمیایی، کارەباو بەرد، لۆکە پاککەرەوە، جۆڵایی، پیشەسازی خۆراك، کۆنسرسازی‌و میوە پیشەسازییە سووکەکانی دیکە. لە رووی جوتیارییەوە، کۆماری ئۆزبەکستان ناوەندی گەورەی چاندنی لۆکە بووە. لە دەورانی یەکیەتیی سۆڤییەتدا جگە لەوە، لە چاندنی جوراوجۆری کوش (کنف) پلەی یەکەمی لە سۆڤییەتدا هەبوو. تۆوی میوە، سەوزە و ترێش دەچێنرێت[1]. بەخێوکردنی مەڕ بە شێوەیەکی بەربڵاو گەشەی سەندووە بە جۆرێك کە کۆماری ئۆزبەکستان بەرهەمهێنەری سەرەکی خۆرییە لە سۆڤییەتدا و لە بەخێوکردنی کرمی هەورێشمیش پلەی یەکەمی لە سۆڤییەتدا هەبوو. بەخێو کردنی بەراز لە ئۆزبەکستان برەوی هەیەو لە ساڵی ١٩٧٩دا ژمارەی بەخێو کردنی بەراز لە ئۆزبەکستان گەیشتووەتە ٣٦٨٠٠٠ سەر[2].

٣ـ تورکمەنستان

تورکمەنستان کە لە باشووری رۆژئاوای ئاسیای ناڤین هەڵکەوتووە، لە باکوورەوە بە ئۆزبەکستان؛ لە باکووری رۆژئاواوە بە قەزاقستان؛ لە رۆژئاواوە بە دەریای خەزەرە لە باشوورەوە بە ئێران و لە باشووری رۆژهەڵاتیشەوە لەگەڵ ئەفغانستان هاوسنوورە. ئاو و هەوای ئەم وڵاتە تازە سەربەخۆیە وشکاوییەکی توندە. واتە هاوینانێکی زۆرگەرم‌و زستانەکی زۆر ساردی هەیە. بە جۆرێك نێوەنجی پلەی گەرما لە مانگی ژانوییە دەگاتە ٤ دەرەجە ژێر سفرو هەر ئەم پلەیە لە زستان دەگاتە ٣٣ دەرجە ژێر سفر؛ بەلام لە مانگی ژووئیەی نێونجی پلەی

(١) شیرین ئاکینەر، نەتەوەکانی موسڵمان لە یەکێەتیی سۆڤییەت. وەرگێڕانی محەمەد حوسێن ئاریا (تاران: کۆمپانیای بلاوکراوەکانی زانستی و کولتووری، ١٣٦٧)، ٣٣٣

(٢) ئاکینەر، پێشوو، ل ٣٧١



گەرما دەگاتە ٢٨ دەرجەی سانتیگراد، یان لە باشووری رۆژهەڵات لە بیابانی قەرەقوم (kara Kum) زۆر جار پلەی گەرما لە هاوین دەگاتە پەنجا دەرجەی سانتیگراد. هەروەها لە زۆربەی شەوێنەکانی وڵات باران کەم دەبارێت. بە شێوەیەك کە نێونجی بارینی ساڵانە لە ٨٠ میلیمەتر لە باکووری رۆژئاوا تا وەکو دەوروبەری ٣٠٠ میلیمەتر لە شوێنە کوێستانییەکان لە هەڵکشان و داکشان دایە[1]. کۆماری تورکمەنستان لە ئەندامی گرووپی تورکەکانی باشوورن، لە ٢٧ ئوکتۆبری ساڵی ١٩٩١ زاییدا بە سەربەخۆیی گەیشتن. زمانی فەرمی دانیشتوانی ئەم وڵاتە تورکمەنی‌و ئایینی زۆرینەیان ئیسلامە. زۆربەی موسڵمانانی ئەم کۆمارە سوننە مەزهەب و حەنەفین. هەروەها لەنێو موسلمانانی تورکمەنستان کەمینەیەکی گەورە لە سۆفیان و شامانیزم (shamanism) هەن کە ئەم کۆمەڵە ئایینییانە بە شێوەی نەریتی هەرمانی خۆیان لەم وڵاتە پاراستووە. باس لەوە کراوە کە زیارەت و شوێنە پیرۆزەکان لەم کۆمارە کارێکی پەسند کراوە و باوە و بەریانی سیاسی، ئایینی لەوێ برەوی زۆرە. لە تورکمەنستان پەیرەوانی ئایینەکانی دیکەش هەن لەنێو ئەواندا دەتوانین ئاماژە بە مەسیحییەکان بکەین. پێتەختی ئەم وڵاتە عێشق ئابادە و لە شارە ناسراوەکانی دەتوانین ئاماژە بە شاری مێژووی "مرو" بکەین[2].

حەشیمەتی ئەم وڵاتە تا ساڵی ١٩٩٥ زیاتر لە ٤/٤٦ ملیۆن کەسی بووە کە بەم جۆرە لەنێو وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاستداحەشیمەتی کەمترە لە تورکمەنستان فرە رەگەزی زۆر بەرچاوە، تورکمانەکان وەکو دانیشتووانی سەرەکی ئەم وڵاتە ٧٣/٣ لە سەدی زۆرینەی حەشیمەت پێکدێنن، رەگەزەکانی دیکەش بە دوای یەکدا ٩/٨ لە سەد رووسی، ٨/٩ لە سەد ئۆزبەکی، قەزاق ٢ لە سەد، تاتار، ئازەری، ئەرمەنی‌و ئۆکراینی هەرکامیان ١ لە سەدی حەشیمەتی ئەو وڵاتە پێکدێنین. کەمینەکانی رووسی سپی پێست و فارسیش لەم وڵاتەدا دەژین. پێکهاتەی کۆمەڵایەتی تورکمانەکان عەشیرەتی و خێڵەکییە. ناسراوترینیان بریتییە لە ١ـ تکە ٢ـ نخورر ٣ـ یموت ٤ـ گۆگۆلان ٥ـ ئوزبەك. سەرۆك کۆماری هەمیشەیی تورکمەنستان واتە سەفەر موراد نیازۆف لە هۆزی تکەیە. زمانی فەرمی تورکمەنستان "تورکمەنی"یەو ئەلف و بێی فەرمی ئەو وڵاتە لاتینییە[3]. تورکمەنستان لەناوچەی رۆژئاوای وڵات، سنووری

(1) The Europa World year look 2002, p. 1993

(2) Eastarn Ewope, Russiqandcen trl Asia. P. 422

(٣) ئەبوئەلحەسەن شیرازی، پێشووە ل٩٦.

ئاوی لەگەڵ دەریای خەزەر هەیە. ئەم بابەتە بایەخی زۆری بەم وڵاتە بەخشیوە. رووبەری ئەم وڵاتە ٤٤٨/١٠٠ کیلۆمەتری چوار گۆشەیە.

تورکمەنستان لە رۆژئاوا تا رۆژهەڵات ١١٠٠ کیلۆمەتر درێژاییی‌و لە باکوور تا باشوور ٦٥٠ کیلۆمەتری پانتایی هەیە. لە رووی رووبەرووە لەنێو کۆمارەکانی یەکیەتیی سۆڤییەت پلەی چوارەمی هەیە. جەیحون یان ئامودەریا رووباری ناسراوی تورکمەنستان کە پانتاییەکەی لە هێندێك شوێن دەگاتە ٣ کیلۆمتر. زەریاچەکانی مەرغاب، تجن و ئەتراك، کاناڵی بەناوبانگی "قەرەقۆم"و کەنداوی قەرەبغاز لەم وڵاتە هەڵکەوتووە. هەشتا لە سەدی رووبەری تورکمەنستان لە بیابانی قەرەقۆم پێکدێت. بیابانی قەرەقۆم یەکێك لە گەورەترین و گەرمترین بیابانەکانی جیهانە. ئاووهەوای تورکمەنستان گەرمو وشکە. تاقە لەنگەرگای گرینگی تورکمەنستان "کراستاو دسك" (ئاوی سوور)ە. شارە گرینگەکانی بریتین لە: ١ـ عشق ئاباد پێتەختی تورکمەنستان ٢- چارجۆ ناوەندی پارێزگاری لەباب ٣ـ تاشا ئۆز (داش حوز)، ماری ناوەندی پارێزگای مارییە[١]. کانزا هەرە گەورەکانی تورکمەنستان بریتییە لە کۆگای گەورەی نەوت و گازی سرووشتی، کانزایی گرینگی یۆد، برومین، سولفات سیدیومی سروشتی (لەناوچەی قەرە ـ) بۆ غاز کۆڵ کە لە پاڵ دەریای خەزەر هەڵکەوتووە یەکێك لە گەورەترین کانگاکانی (سولفاتی سیدیۆم لە جیهانە)، قوم کانی، بنتونسیت، سولفۆرو سولفاتی سیدیوم، پێشەسازی شیمیایی، وزە، رستن و چنین، پێشەسازی خۆرك (زیاتر لەسەر بنەمای بەرهەمی ناوچەی بەتایبەتی گۆشت)ە. دروستکردنی شەراب و چەندین پیشەی چووکەی دیکە... کێڵانی زۆربەی زەویەکانی ئەم کۆمارە پێویستی بە ئاو داشتن هەیە. بەرهەمی گشتی تورکمەنستان کەتانە بەرهەمەکانی دیکە ئەمانەن: چەندین جۆر دانەوێڵە (گەنم، جۆ، ئەرزەن). ترێ، پەتاتە، جۆرەکانی سەوزە و گزرە (بەتایبەتی یۆنجە). بەخێوکردنی مەڕومالاَت لە تورکمەنستان زۆر پێشکەوتووە. بۆ بەدەستهێنانی پێستی ناسراو بە ئەستراخان و بەرهەممهێنانی خوری بۆ پێشەسازی فەرش چنین، مەڕو ماڵات بەخێو دەکەن. گیانداری دیکە وەکو ئەسب، وشتر و بەرزایش بەخێو دەکرێن، بەخێوکردنی کرمی هەوریشم هەیەو راوە ماسیش باوی زۆرە[٢].

(١) حوسێن کەریمی، تورکمەنستان (تاران: بلاوکراوی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٥) لاپەڕەی ١٠٨.

(٢) ئاکینەر، پێشوو ل ٣٨٥.



٤ـ قرقیزستان لە رۆژهەڵاتی ئاسیای ناوەڕاستدا هەڵکەوتووە، وڵاتێکی بچووك و بە وشکایی گەرما دراوە کە لە باکوورەوە بە قرقیزستان، لە رۆژئاواوە بە ئوزبەکستان، لە باشوورو باشووری رۆژئاواوە بە تاجیکستان و لە رۆژهەڵاتیشەوە لەگەڵ کۆماری چین هاو سنوورە. ئەم وڵاتە یەکێك بوو لە کۆمارە بچوکەکانی سۆڤیەتی پێشوو، کە لەو سەردەمەدا بە کۆماری سۆسیالیستی قرقیزستان نێو دەبرا. بەڵام دوای سەربەخۆیی، بوو بە کۆماری قرقیزستان. بەم کۆمارە قرقیز یان قرقیزیایش یان دەگوت. ئایینی خەڵکی قرقیزستان موسڵمانان و پەیڕەوی حەنەفین کە ئەم دەستەیە یەکێکە لە لقەکانی سونیی. هەرچەندە ئەم وڵاتە کەمینەکانی دیکەی ئایینی وەکو کەلیمیو مەسیحیشی هەیە. کە لە بەجێ گەیاندنی ئەرکە ئایینەکانیادا ئازادن. پێتەختی کۆماری قرقیزستان شاری بیشکێکە کە تا پێش سەربەخۆیی بە "فرونز" نێویان دەبرد. زمانی زۆرینەی خەڵکی ئەم کۆمارە قرقیزییە، بەڵام بەم حاڵەش زمانی رووسی لە قرقیزستان بە شێوەیەکی فەرمییە[١]. حەشیمەتی ئەم وڵاتە زیاتر لە ٤/٥ ملیۆن کەسە کە زۆرینەی حەشیمەت، قرقیزی پێکی دەێنن. رووسەکان ٢٠/٩ لەسەد، ئوزبکی ١٢/٧ لەسەد، ئوکراینی ٢/٤ لەسەد و نەتەوەکانی دیکەش ١١/٦ لە سەدن[٢]. کۆماری قرقیزستان لە رووی ئاو و هەواوە جۆراوجۆرە، بە جۆرێك کە پلەی گەرما لە شوێنە نزمەکان لەچاو شوێنە نەوییەکان زۆر لەیەك جیاوازە، نەك هەر ئەمە بەڵکو لەو وەرزەکانی دیکەی ساڵدا ئێمە شاهێدی هەڵکشان وداکێشانی پلەی گەرما لە رووی ئاو و هەواوە و تەنانەت رادەی باران بارینی ساڵانەشدا هەین، بە جۆرێك کە لە شوێنەنزمەکانی قرقیزستان نێونجی پلەی گەرما لە مانگی جوولایی دەگاتە ٢٨ سانتیگراد، لە کاتێکدا لە مانگی ژانوییە دەگاتە ١٨دەرجەی ژێر سفر. هەروەها بارینی ساڵانە لە قرقیزستان لە ١٨٠ میلیمەتر لە چیاکانی تین شانی رۆژهەڵات تاکو دەوروبەری ٧٥٠ میلمتر لە زنجیرە چیاکانی فرگانا لە حاڵی هەڵچوون و داچوون دایە. لە شێوە ستارگەکان کە خەڵکی لێ نیشتەجێن نێونجی بارینی ساڵانە کە نێوان ١٠٠ تا ٥٠٠ میلیمەتر لە گۆڕان دایە[٣]. کۆماری قرقیزستان لە باکووری رۆژهەڵاتی ئاسیای ناڤین کە لەناوچەی تیان شان و باشووری رۆژئاواو بە بەرزاییەکان پامیرـ ئالا هەڵکەوتووە. قرقیزستان لە رۆژهەڵاتو باشووری رۆژهەڵات لە

(1) Eartern Eutope, pussinandcentral Asia, (London: Europpublications, 2003), p.226

(2) Kyrgzstan Tnvestment Guid, Decemder 1999, p17.

(3) The Europa world yeardook, p. 2398.

ڕێگایی زنجیرە چیاکانی کووك شان بە چین و لە باشوورەوە بە هۆی زنجیرە چیاکانی زائالیسك و تورکمەنستان بە تاجیکستان و لە باکووری ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژئاواوە لە ڕێگای زنجیرە چیاکانی زانالیسم ـ ئالاتوو ڕووباری چوو، بە قەزاقستان و لە باشووری ڕۆژئاواوە لە ڕێگای لوتکەی پسکەم و زنجیرەی باڵ چاتکان بە ئوزبەکستان کورت دەبێتەوە. ڕووبەری قرقیزستان ١٩٨/٥٠٠ هەزار کیلۆمەتری چوار گوشەیە. زیاتر لە سێ لە چواری ئەم وڵاتە بە چیا داپۆشراوە کە لەنێوانیاندا ڕووبارو بەنداوی جۆراوجۆر بەرچاو دەکەوێت. "ایسك کول" گەورەترین و قووڵترین زەریاچەیەو نارین، ئالاسو چوواز، ڕووبارە گەورەکانی ئەم وڵاتەن. لە تایبەتمەندییە سرووشتییەکانی تری ئەم وڵاتە هەڵکەوتن لە سەرهێڵی بۆمەلەرزەیە[1].

ئاوهەوای قرقیزستان کوێستانییە و بەهار و هاوینی مام ناوەندییە. بەڵام زستانگەلێکی ساردو ئەستەمی هەیە. کۆماری قرقیزستان خاوەنی تایبەتمەندی ئاو و هەوای لەبارو، دیمەنی ڕەنگاوڕەنگ، زنجیرە چیای ڕازاوە و شیو و ڕووباری پڕجۆش و خرۆشە. چیاکانی تیان شانو کیسارو- کاریگەرییەکی باشیان لە پێکهاتنی تۆرەئاوییەکانی قرقیزستاندا هەیە. نیوەی تیان شان و بەشێك لە پامیری لەخۆگرتووە. نزیکەی ٥٥/٣ لەسەدی خاکی قرقیزستان چۆمەکان پێکیان هێناوە. گەورەترین چۆمی قرقیزستان نارین درێژاییەکەی ٥٣٥ کیلۆمەترە. لە قرقیزستان نزیکەی ١٩٢٣ زەریاچەی بەرووبەری نزیك بە ٦٨٣٨ کیلۆمەتری چوار گۆشە هەیە. سێ زەریاچەی گرینگی ئەم کۆمارە: ١ـ ئەیسك کۆل ٢ـ سان کۆل ٣ـ چاتیر کۆل. ناوچە و شارە گرینگەکانی قرقیزستان بریتین لە: ١ـ ناوچەی چۆ لە باشووری ئەو وڵاتە لە شێوەکانی چۆ، چاڵیو چۆڵی نێوان شاخەکان وەك حەشارگە هەڵکەوتووە. ٢ـ ناوچەی ئێسك گۆل لە بەشی کوێستانی تیان شانە، ٣ـ ناوچەی نارین ٤ـ ناوچەی ئالاسی کە نزیکەی ٥٨ لەسەدی ڕووبەری ناوچەکە بۆ جووتیاری کەڵکی لێوەر دەگرن. ٥ـ ناوچەی جەلال ئاوا ٦ـ ناوچەی ئووش کە لە بەرەوپێش بەرانی ئابووری قرقیزستان ڕۆڵی کاریگەری هەیە. هەنووکە بەرهەمە پیشەییەکانی ڕەوانەی دەرەوە دەکرێت. کانزای گشتی قرقیزستان بریتییە لە: بەردی کل (ئانتیموفی)، جیوە، ئورانیۆم، بەردی خەڵووز، نەوت و گازی سرووشتی، قورقۆشم، فافۆن، سولفیدەکانی مس و هێندێك مەوادی کانگاییتر. کەرەسەی بینا سازیشی بریتییەلە بەردی گرانیك،

(١) پەروین مەعەزەمی گودەرزی، قرقیزستان (تاران: بڵاو کراوی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٧) لاپەرەکانی ١٠٢



مەڕمەڕ، قسڵ، خاکی قسڵ، بەردی گەچ و لمی نەرم لە قرقیزستان هەیە. پیشەکانی قرقیزستان بریتین لە: پیشەی وزە، کانزا، تواندنەوەی ئاسنەکان و نا ئاسنەکان، دەرهێنانی بەردی خەڵووز، گاز، نەوت، پیشەی ماشێن (بۆ وێنە بەرهەمی کەرسەی ماشێن و جووتیاری) بەرهەمی کەرستەی بینا، بەرهەمی چیمەنتۆ و کەرەستەکانی دیکەی بیناسازی، پێشەسازی خۆراك (تایبەتی شەکرو گۆشت)، جۆلایی، ڕستنی گۆرەویی، پێشە چووکەکانی دیکە. جووتیاریی کۆماری قرقیزستان بریتییە لە چاندنی دانەوێڵە (گەنم، نەیشەکەر، تووت و کەتان). بەخێو کردنی مەڕ، کە خوری باشی هەیەو بەخێو کردنی بەرازیش برەویی زۆری[1] هەیە.

٥ـ تاجیکستان

تاجیکستان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیای ناڤین هەڵکەوتووە و بە وڵاتێکی کوێستانی بە ئەژمار دێ کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە بە قرقیزستان، لە ڕۆژئاواوە و لە باکووری ڕۆژئاواوە لەگەڵ ئوزبەکستان، لە ڕۆژهەڵاتەوە بە چین و لە باشوورەوە لەگەڵ ئەفغانستان، هاوسنوورە. ئەم وڵاتە تازە سەربەخۆیە، نزیکەی ١٤٣١٠٠ کیلومتری چوار گۆشە ڕووبەریەتی (ناوچەی خودموختاری بەدخشانیش دەگەڕێتەوە)و حەشیمەتی دەوروبەری ٦ ملیۆن کەسە. کە ٦٧٪ لە گوندەکان و٣٣٪ لە شارەکان دەژین. تاجیکستان لەنێوان دوو زنجیرە چیای تین شان کە تاکو چین درێژایی هەیەو پامیر کە تاکو ئەفغانستان درێژایی هەیە هەڵکەوتووە. ئەم وڵاتە خاوەنی چوار پارێزگا یان ویلایەتە بە ناوەکانی خوجەند، کۆلاب، قرقان تەپەو ویلایەتی خۆدموختاری بەدەخشانی کوێستانی و ٤٤ ناوچەی دیکە. ویلایەتی خۆدموختاری بەدەخشان کە لە بەرزاییەکانی پامیر هەڵکەوتووە ٤٤٪ خاکی تاجیکستانی لەخۆ گرتوووە، ناوەندەکەی شاری خارەقە. شیویی بە پیتی فەرغانە لە باکوور و شیویی وەخش لە باشووری ڕۆژئاوای هەڵکەوتوون. بسیر دەریا (سەیحون)و چۆمی زەرئەفشان لە باکوور و ئامودەریا (جەیحون) لە باشووری ئەم وڵاتە هەڵکەوتووە کە ٧٪ زەویەکانی بۆ کێڵان بەکار دێ. پێتەختی تاجیکستان شاری دووشەنبە (ئەستالین ئابادی) پێشووە. لە ڕووی مێژوویەوە ناونرانی بە هۆی پێکهاتنی "دووشەنبە بازاڕ"ی کۆنی ئەم ناوچەیە بووە[2] زمانی نەتەوەیی ئەم وڵاتە تاجیکییەوە دەگەڕێتەوە بۆ دەستەی زمانەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران. گەشانەوەیی سەرلەنوێی کولتووری ئێرانی دوای زاڵبوونی عەرەبەکان و بە دەسەڵات گەیشتنی سامانییەکانە. سەرچاوەی کولتوورە و وێژەی ئێرانی

(١) ئەبولحەسەنی شیرازی، پێشوو، ل ١٠٥

(2) Eastern Europe, Russia aqn cpntral Asiq, p. 397

تاجیکییە. زۆربەی زانایانی وەك ئەبووعەلی سینا کەڵکیان لە کتێبخانەکانی شاری بۆخارا پێتەختی سامانییەکان گرتووە. هەر بەم هۆیە لە دوو ساڵ پێش ئێستا دراوی باوی ئەم وڵاتە لە رۆبلی رووسییەوە گۆڕا بە سامانی. وێژە و شیعر لەتاجیکستان جێگای تایبەتی خۆی هەیە بە جۆرێك کە تاجیکەکان شانازی بە شیعرە کۆنەکانی حافز، مەولانا، سەعدی، خەیام، فردەوسی‌و، گەورەکانی دیکە وێژەی فارسییەوە دەکەن داب و نەریتی کۆنی ئێرانی وەك جێژنی نەوروز و جەژنە ئایینییەکان هەنووکەش گرینگی پێدەدرێ. بە جۆرێك کە پاش سەربەخۆیی لەلایەن دەوڵەتەوە وەکو پشووی فەرمی راگەیاندرا. ئایینی زۆربەی تاجیکەکان سوننەو لە لقی حەنەفین. تاقمێکی بچووك لە شیعەکانی ئیسماعیلی لە چیاکانی پامیر لەناوچەی بەدخشان بە رێبەری ئاقا خان ژیان دەکەن‌و تەنیا ١٠٪ لەم شێعرانە پەیرەوی دوازنزە ئیمامەن.

تاجیکستان وڵاتێکی کوێستانی و لەسەر هێلی بوومەلەرزەیە. بەهۆی کوێستانی بوونی، ئاو و هەوای لە شوێنە بەرزەکان و ناوچە نەوییەکان جۆراوجۆرە. بە شێوەیەك کە لەناوچە پێدەشتەکانی باکوور وەکو خەنجەد نێونجی تین لەمانگی ژانوییە ٩ پلەی سانتیگرادو لە هاوین ٢٧/٤ پلەی سانتیگرادە و ئەمە لە کاتێکدایەکە لەناوچە پێدەشتەکانی باشوور جیاوازی پلەی گەرما (تین) زیاترە. رادەی باران بارینی ساڵانە لەناوچە بەرزو کوێستانییەکان زۆر لە خوارێیە (نێوان ٦٠ تا ٨٠ میلیمەتر لە ساڵدا). بەفرو سەهۆڵبەندان دەبێتە هۆی ئەوە چەند مانگ لە ساڵ، بەشێك لەم وڵاتە دەست پێڕانەگەیشتوو بەهێڵێتەوە(١).

تاجیکستان خاوەنی رووباری زۆرە. ئامودەریا واتە جەیحون و سیردەریا واتە سەیحون لە رچێنەکە* سرووشتییەکانی پامیرو تین و شانەوە سەرچاوە دەگرن و دوو سەرچاوەی گرینگی ئاویی ناوچەکەن. گەورەترین زەلکاوی ئەم وڵاتە ناویی فراکۆلە، کە لە رۆژهەڵاتی پامیرە(٢).

کانزا گەورەکانی تاجیکستان بریتین لە کانگا دەوڵەمەندەکانی وەکو ئاسن، قورقۆشم، فافۆن، مس، قەڵایی، جیوە، بەردی گرانبایی‌و نیوە گرانبایش لەم کۆمارەدا هەیە. پیشەسازی کۆماری تاجیکستان بریتییە لە: پیشەسازی وزە، کانگا، درهێنانی میتالی نا ئاسنی، دەرهێنانی نەوت، گاز، بەردی زێر. دروستکردنی ماشێن (بەتایبەت کەرسە بۆ پیشەسازی

(1) The Europa wold Year Book 2002, p. 3835

* رچێنکە سروشتییەکان: بەخچاڵە تەبیعییەکان

(٢) رۆئیا مەنتەزەمی، تاجیکستان (تاران: بڵاو کراوی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٤) لاپەڕەکانی ٣ ـ ١



کەتان)، پیشەسازی کیمیایی، ئالمینیۆم، لۆکە پاککەرەوە، جۆڵایی رستن و چنین، جلوبەرگ، رستنی گۆرەویی، فەرش چنین، پیشەسازی خۆراك و پیشەسازی سووکی تر، بەرهەمی گشتی تاجیکستان کەتانە. بەرهەمەکانی دیکە وەك ترێ و میوەکان، سەوزە و دانەوێڵە (گەنم‌و جۆ)، بەخێو کردنی مەڕومالاَت وەکو مەڕ وگا... بەرزا و کرمی هەورێشمیش بەخێو دەکرێت(١).

### ب. جوغرافیای سیاسی

١ـ قەزاقستان

کۆماری قەزاقستان بەهۆی بەربلاویی زۆری خاکەکەی و هەبوونی سنووری دوورو درێژ لەگەڵ دوو هێزی گەورەی ناوچەکە واتە رووسیە و کۆماری گەلی چین و هەبوونی زیاتر لە ٢٣٢٠ کیلۆمەتری کەناری لە بەشی رۆژهەڵاتی و باکووری دەریای خەزەر، هەروەها بوونی کانزای زۆری ژێر زەبی، بەتایبەتی نەوت و گازو هەڵکەوتەی ئێستراتێژی کەم وێنە لەنێوان وڵاتانی ناوچە گرینگییەکی تایبەتی بە خۆوە گرتووە. ئەم وڵاتە بە بوونی چەند وێزگەی ناوکی بۆ کاروباری ئاشتیخوازانە کەڵکی لێوەردەگرێت، هەروەها لەژێر رکیفدا بوونی چەند پێگەی ئاسمانی لەوانە بایکۆنۆردو بوونی کانزای گەورەی ئورانیووم دەتوانرێ وەك هێزی ناوکی لەناوچە بناسێت(٢).

٢ـ ئوزبەکستان

گرینگی ئێستراتیژیکی ئوزبەکستان لەناوچەی ئاسیای ناوەڕاستدا بەم شێوازەیە کە ئەم وڵاتە لە دڵی ئاسیای ناڤین لەنێوان دوو رووباری سیر دەریاو ئامۆدەریا هەڵکەوتووە و لەگەڵ هەموو کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاستدا هاوسنوورە. هەروەها ئوزبەکستان وەك پڕ حەشیمەترین کۆماری ئاسیای ناڤین بە ئەژمار دێت. ئوزبەکستان بە هۆی هۆکارەکانی جوغرافیایی، ئابووری، مێژوویی، کولتووری، نەتەوەیی و ئایینی خاوەن تایبەتمەندییەکی باشە لە پێوەندییەکانی ژێئوپۆلۆتێك و ئابووریدا بەم هۆیانەی خوارەوە جێگای بایەخە:

١ـ لە رووی جوغرافیاییەوە وەك دڵی ئاسیای ناڤین و شوێنی یەکگرتنی ئەوروپا لە رۆژئاوا، ئاسیا لە رۆژهەڵات هەڵکەوتووە، لە باکوورەوە بە رووسیە و لە باشوورەوە بە جیهانی ئیسلام دەبسترێتەوە.

(١) ئاکینەر، پێشوو ٣٧١ ـ ٣٧٠.

(2) Hefeez Melik, Central Asia: gts strategic Tmportancand Future prospecta, (newyork: st. Martens paress, 1994), qp. 10 – 15

٢ـ ڕێگای بە ئاوی ئازاد نییە و بۆ دەسراگەیشتن بە ئاوی ئازاد دەبێ بە خاکی دراوسێ کانیدا تێپەڕێ.

٣ـ خاوەنی پیشەسازی دەوڵەمەندە بەتایبەتی گاز، نەوت، بەردی خەڵووزو زێڕ.

٤ـ لەگەڵ کولتووری ئیسلامی پێوەندی لەمێژینەی هەیە و خاوەنی شوناسی ئیسلامییە.

٣ـ تورکمەنستان

دەتوانێ هەڵکەوتووی ئێستراتیژیکی تورکمەنستان لە ڕووی بوونی ئەم تایبەتمەندییە جۆراوجۆرانەی خوارەوە لەناوچەی ئاسیای نێوەڕاستدا لەبەرچاو بگیردرێ.

١ـ خاوەنی کانزای هەرە گەورەی ژێرزەوییە بەتایبەت نەوت و گاز، بە جۆرێك کە کانگای گازی تورکمەنستان پتر لە ١٣تریلیۆن مەتری شەشپاڵوو مەزەندە دەکرێت. هەروەها بە چوارەم، بەرهەم هێنەری گازی جیهان بە ئەژمار دێت.

٢ـ لە ڕەوگەی ڕێگای هەوریشم هەڵکەوتووە.

٣ـ کەوتۆتە لێوارەکانی دەریای خەزەرەوە.

٤ـ دراوسێی ئەفغانستانو ئێرانە.

٥ـ هەڵکەوتی ترانزێتی تایبەت بە خۆی هەیە.

٦ـ لەسەر ڕێگای پێوەندی ئاسیای دوور و ئەوروپا هەڵکەوتووە.

٤ـ قرقیزستان

گرنگیی ئێستراتیژیکی وڵاتی قرقیزستان لە تەوەرەکانی خوارەوە کورت دەبێتەوە.

١ـ چین و تاجیکستان لێك جیا دەکاتەوە و دراوسێی وڵاتانی قزاقستان و ئوزبەکستانە.

٢ـ کاریگەریی مێژوویی چین بە شێوەیەکی بەرچاو لەم وڵاتە دەبینرێت.

٣ـ لە ڕاستیدا قرقیزستان کۆگایەکی گەورەیە کە کانزای جۆراوجۆری گرانبایی تێدا شاراوەیە.

٤ـ هەڵکەوتن لە ڕەوگەی هەورێشم و چیاو لوتکەی جوان و ڕووباری شینی ئایسك کۆل بووەتە هۆی ڕاکێشانی گەشتیاریی.

٥. تاجیکستان

بوونی سنووری هاوبەش لەنێوان چین و ئەفغانستان و نزیك بوونی لەگەڵ پاکستان و هیندوستان، ئەم کۆمارەی کردۆتە دەروازەی ئاسیای ناوەندی بە ڕوویی وڵاتانی چین و هیند و پاکستان. بوونی کەمینەی ڕووسی لە کۆماری تاجیکستان وەك فاکتۆرێکی بنەڕەتی بۆ



کۆماری تاجیکستان بە ئەژمار دێت. بوونی ڕچێنەکی سرووشتی و جۆراوجۆر لە چیاکانی تاجیکستان کە سەرچاوەی سەرەکییە بۆ دوو ڕووباری ئامۆدەریا و سیردەریا گرینگییەکی ئیستراتیژیکی بەم وڵاتە کوێستانییە بەخشیوە[1].

## ج. جوغرافیای ئابووری

لە ڕووی کانزاو سامان لەنێوان پێنج وڵاتی ئاسیای ناوەندیدا کەلێنێکی بەرچاو هەیە، کە لەلایەك قەزاقستان و تورکمەنستان و ئوزبەکستان و لەلایەکی دیکەوە قرقیزستان و تاجیکستان هەڵکەوتوون. هەنووکە توانایەکان و سەرچاوە ئابوورییەکانی، یەکە بە یەکەی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست تاوتوێ دەکەین:

١. قەزاقستان

ئەم کۆمارە بە سەرنجدان بە جۆراوجۆری هەرێمیو بەرینی خاکەکەی، یەکێك لە دەوڵەمەندترین کۆمارەکانی یەکیەتیی سۆڤییەت لە بواری بەرهەمهێنان و ناردنی بەرهەمە جووتیارییەکان مەوادی خاو بە ئەژمار دێت. یەك لە سێ زەویە بە پیتە جووتیارییەکانی سۆڤییەت لە قەزاقستانە. کە بەرهەمی سەرەکی ئەوان گەنمە[2]. ئەم کۆمارە خاوەنی کانزای گەورەیە. بە جۆرێك کە لەسەرژمێری ساڵی ١٩٩٠ زایینی دەری دەخا، کە ئەم وڵاتە ٩٠٪ کروم، نزیکەی ٥٠٪ بەردی خەلووز و ٧٪ نەوتی یەکیەتیی سۆڤییەتی دابیندەکرد[3]. لە ڕووی پیشەسازییەوە، قەزاقستان یەکێك لەو کۆمارانەیە، کە ناوەندی سووتەمەنیو هێزی (وزە)یە. ڕادەی ٢٠ ویستگەی بەرهەم هێنەری کارەبا کە ڕۆژانە بە هۆی ٣٠٠ هەزار تەن بەردی خەڵووز کار دەکەن، کارەبای ئاسیای ناوەڕاست و ناوچەی ئوراڵ و ڕۆژئاوای سیبری بەرهەڤ دەکەن لە شاری شفچینکۆ ڕائاکتۆرێکی ناوکی هەیە کە ئاوی دەریای خەزەر بۆ بەکارهێنانی خەڵك و پیشەسازی و بۆ خواردن، شیرین دەکا، لەم وڵاتەدا ئاسنەکانی شیاوی پیشەسازی ئەلکترۆنیکی، ناوکیو مووشەك سازی دەردەهێنرێ.

(1) Mohammad reza Hafeznia, “Strategic Roleofthe Cqucqsuscentarl Asia Axisin Global Competition”, Amu Daryq. Vol, 7, no. 14, spring 2003, pp. 41 – 55

(٢) ئەکرەم حوسێن پوور، مەنیژە تورابسزادەو... . نێوەرۆکی وەرچەرخانەکان لە ئاسیای ناوەند و قەفقاز (تاران: ئێنتشاراتی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٣)، ل ٣٤١.

(3) Logal Regime

قەزاقستان ساڵی ١٩٩٣ لەنێو وڵاتانی بەرهەم هێنـەری نـەوت، پلـەی بیسـتو چـوارەمی هەبوو کە بەرهەمی دەگەیشتە ٢٣/١ ملیـۆن تـەن. ئـەم کۆمـارە سـەرەڕای کـانزای گـەورەی نەوتی، خوازیاری بەکارهێنانی نەوتی بەستێنی دەریای خەزەر بوو. ئەمە بووەتە هۆی مـشت و مڕی نێوان وڵاتانی لێوار دەریای خەزەر (ئێران و تورکمەنـستان و قەزاقـستان و ئازەربایجـان و رووسیە). بەلەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە بەرنامەیەکی یاسایی بۆ دەریای خەزەر دانەرێژراوە.

دوای رووسیە قەزاقستان دووهەمین وڵاتە لە هەناردنی نەوت لەنێوان وڵاتـانی سـەربەخۆی هاوقازانج کە، کۆگاکانی نەوتی یان لەنێوان ٥ تا ٢٢ ملیارد بەرمیل مەزندە دەکرێت[(١)]. بەڵام دوایین هەڵسەنگاندنی ساڵی ٢٠٠٣ باس لەوە دەکا کە ئەم وڵاتە خاوەنی ٥/٤ ملیارد بـەرمیل نەوتی سەلمێزاوە تا ئێستا ١٩٨ ناوەندی نەوت و گاز لەم وڵاتـە دوزراونەتـەوە کـە گـەورەترین ناوەندیان تەنگیزە[(٢)] کە لە باکووری رۆژهەڵاتی دەریای خەزەر هەڵکـەوتووە. بـە دوای ئەمـەدا گرینگترین مەیدانە نەوتیەکانی ئەم وڵاتە بریتین لە: مەنگیـشلاق، فـەلات ئەویـست ئـورت و شاخپاخت. بەرهەمهێنانی نەوتی ئەم وڵاتە بە سەرنجدان بە پلانە داڕێژراوەکان لەلایەن دەوڵـەت و راکێشانی سەرمایە گۆزارنی دەرەکـی جۆراوجـۆر، لـە سـاڵی ١٩٩٥دا رۆژانـە ٤٠٠ هـەزار بەرمیل، لە ساڵی ٢٠٠١دا نزیکەی ٨٠٠ هەزار بەرمیلو لە سـاڵی ٢٠٠٣ دەورووبـەری ٩٣٩ هەزار بەرمیل لە رۆژانەدا بووە.و بە گرینگیدان بە پلانی جۆراوجۆر، ئێستا لە حاڵی جێبـەجێ بوون دایە، چاوەڕوان دەکرێت ئـەم رێژەیـە سـاڵی ٢٠٠٥ بگاتـە ١/٢ ملیـۆن و سـاڵی ٢٠١٠ بگاتە ١/٧ ملیۆن بەرمیل لە رۆژدا[(٣)]. کۆمپانیا گرینگە نەوتییە جیهانییەکان وەکـو شـورەن، ئاکسۆن، تۆتاڵ، فینائەلف، ناجیب، تگزاکۆ، لووك ئاویل، مۆبیل، شەل، هەریکان، ئیمپکس و ئەی ئێف سی لە وڵاتانی ئەمریکا، بریتانیا، ئیتالیا، رووسیە، کەنـەدا، ژاپـۆن، ئاڵمانیـا لـەم پلانەدا چالاکانە بەشداری دەکەن و سەربەستانە یـان هێنـدی جارلـە شـێوەی هاوبـەش لەگـەڵ کۆمپانیا دەوڵەتیو تایبەتییەکانی دوای سەربەخۆیی بەردەوام زیاتر بووە بە جۆرێك کـە سـاڵی ١٩٩٣ز نزیکەی ٦٣١ هەزار بەرمیل و لە ساڵی ٢٠٠٢ دەورووبەری ٧٩٩ هەزار بـەرمیل لـە

(١) گۆڤاری نەوت و گاز لە ساڵی ٢٠٠١: ٥ ملیارد بەرمیل، گۆڤاری ئـەژماری BP لـە سـاڵی ٢٠٠١دا ٨ ملیارد بەرمیل، زانیاری وزە لە ساڵی ١٩٩٨دا ٢٢ ـ ٨ ملیارد بەرمیل مەزەندەیان کردووە.

(2) Tengiz

(3) Kazakhstan in WWW. Eiq. Doe. Gov/ emeu/ cabs/ kacak. html



رۆژدا بووە، بەپێی پلان داڕشتەکان ئەم رێژەیە ساڵی ٢٠٠٥ گەیشتووەتە ١ ملیون و بۆ سـاڵی ٢٠١٠ دەگاتە ١/٥ ملیۆن بەرمیل لە رۆژدا[(١)].

بەکارهێنانی نەوت و پێژراوەکانی نەوتی لەم وڵاتە لە ساڵی ٢٠٠١ گەیـشتە ١٨٠ هـەزار بەرمیلو ساڵی ٢٠٠٢ تەنیا ١٤٠ هەزار بەرمیل لە رۆژدا بـووە. قەزاقـستان سـێ پاڵاوگـەی نەوتی خاوی هەیە کە بە ریز بەمشێوەیەن لە پاولۆدار[(٢)] (باکووری وڵات)، ئەوەی دیکە یان لـە ئـاتیرائو[(٣)] (رۆژئـاوای وڵات) سـێهەمیان لـە چـیمکەنت[(٤)] (باشـووری وڵات) هەڵکـەوتووە و سەرجەم توانایی نزیکـەی ٤٢٧ هـەزار بـەرمیلیان لـە رۆژدا هەیـە. هـەروەها بـە مەبەسـتی زیادکردنی وەبەرهێنان و نوێ کردنەوەی پاڵاوگەی ئاتیر ئائۆ گرێبەستێك لەگەڵ کۆمپانیایـەکی ژاپۆنی بەناوی ماربین واژۆ کراوە، کە ئەم پرۆژەیە تا ساڵی ٢٠٠٤ کۆتایی پێ دێت[(٥)].

بەپێی دوایـین ژمێریـاری بڵاوکـراوەی مـانگی جـوولای سـاڵی ٢٠٠٣، کۆگاکـانی گـازی سروشتی قەزاقستان نزیکەی٦٠تریلیۆن فـووتی سـێجایە[(٦)]. بـەکارهێنانی نـاوخۆیی لـەگازی سروشتی ئەم وڵاتە لە ساڵی ٢٠٠٠ نزیکەی ٤٩٠/٩ ملیارد فووتی سێجاو لـە سـاڵی ٢٠٠١ دەورووبەری ٥٠٥ ملیارد (فووتی سێجا) بووە کە لـە ئاکامـدا دەوڵـەتی ئاسـتانە لـە سـاڵی ٢٠٠٠ نزیك بە ١٧٦/٦ ملیارد فووتی سێجا گازی لە دەرەوە (زیاتر لە ئوزبەکستان) کڕیـوە. گرینگترین ناوەندە گازییەکانی قەزاقستان، کاراستگاناك[(٧)] لە نزیکی سنوورەکانی رووسیە بـە پاشەکەوتی نزیکەی ١٦ تریلیون فووتی سـێجا، ئامانگلـدی[(٨)] بـە پاشـکەوتی نزیکـەی ١/٨ تریلیۆن فووتی سێجایە کە بەپێی پلانی داڕێژراو بۆ بەکارهێنانی بازەرگانی و بۆ نـاردنی گـاز لەم سەنتەرانە لە ساڵی ٢٠٠٥دا دەستپێکرد، هەروەها دەوڵەتی قەزاقستان خوازیاری ئەوەیـە کە پاڵاوگەیەکی دیکەی گازی سرووشتی بە پشتیوانەیی نزیکەی ٦٠٠ ملیۆن دوڵار لە ناوەندی گازی کارانتگاناك تەرخانبکات[(٩)]

(1) Ibid
(2) Parlodar
(3) Atyrau
(4) SHYMKENT
(5) Ibid
(6) Ibid
(7) Karachaganak
(8) Amangelqy
(9) Ibid

سەرەڕای بوونی کانزای گرینگی گازی سرووشتی، ئەم کۆمارە بۆ کەڵکی ناوخۆیی لە ڕووسیە و دراوسێکانی گازی خۆی دابیندەکا.

٢ ـ ١ سیاسەتی ئابووری

قەزاقەکان بۆ چاك کردنی بارودۆخی ئابووری خۆیان ڕوویان لە ڕێکخراوەکان و سەرچاوە ماڵییە نێونەتەوەییەکان کردووە. سیاسەتی پلانی ئابووری ئازادیان هەڵبژارد و هەنووکە لەحاڵی تێپەڕ بوون بەسەر ئابووری ئازاد دان، کە بە سەرنجدان بە جێبەجێ کردنی پلانی تایبەتی کردن و ئابووری ئازاد، ئەمە بوّتە هۆی ئازاد بوونی نرخەکان و دانی کۆمپانیاکان بە کەرتی تایبەت و شەریکە دەرەکییەکانو پشتگیری نەکردنی دەوڵەت لە کارخانە و بنیاتنەرانێك کە قازانجیان نییە، بوّتە هۆکاری قەیرانو داخرانی کۆمپانیاکان و بێکاری لە قەزاقستان. ئێستا قەزاقستان بۆ بەهێز کردنو پەرەپێدان بە پێوەندی ئابووریی دەرەکی و ڕاکێشانی سەرمایەی دەرەکی، هاندانی بۆ ئەنجامدانی سەرمایەدانانی هاوبەشو هێنانی تکنۆلۆژی پێشکەوتوو لە وڵات و پەروەردە کردنی پسپۆر لە بواری چالاکی ئابووری دەرەکی، هەوڵێکی بەرچاوی بەجێ گەیاندووە.

٢ـ ئۆزبەکستان

ئۆزبەکستان بە پڕحەشیمەترین وڵاتی ئاسیای ناوەڕاست دەژمێردرێ و کانزای پربایەخی سرووشتیو مەعدەنی هەیە. هەنووکە لەبەر نەبوونی پێوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئاوە نێونەتەوەییەکان، هەروەها شەڕ لە تاجیکستان و ئاڵۆزییەکانی ئەفغانستان، ئەم کۆسپانە تا ڕادەیەك، ڕێگر بووە لە بەرەوپێش چوونی زیاتر لە٥٠٪ لە داهاتەکانی هەناردەی ئۆزبەکستان، لە ڕێگەی هەناردنی لۆکەوە مسۆگەر دەبێت. لەگەڵ ئەوەی کە لەم وڵاتە

سەد بواری پێشەسازی هەیە کە بەرهەمەکانیان بۆ هەفتا وڵات دەنێردرێت. بەڵام ئابووری ئەم وڵاتە تاك بەرهەمیو لەسەر بناغەی چاندنی لۆکەیە. ئۆزبەکستان بەزێڕی سپی "تەڵای سفید" ناونراوە. ئۆزبەکستان خاوەنی تۆڕی ڕێی ئاسنی سەرانسەرییە لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە و خاوەنی ڕێگایی قیرتاوە بۆ پێوەندی گرتن لەگەڵ هاوسێکانی بە جۆرێك کە دەتوانرێ لەم ڕێگا پێوەندیانەوە بۆ ناردنی کەل و پەل و یان ترانزیت بۆ وڵاتانی دیکەی ناوچەکە کەڵکی لێ وەربگیردرێ. بەرهەمهێنانی ناخالیسی ناوخۆیی ئۆزبەکستان لە ساڵی ١٩٩٥ زایینیدا بەرانبەر بە ١٠ ملیارد دۆلار بووە ڕێژەی هەنارده و هاورده بەم شێوازە بەرانبەرە لەگەڵ ١/٨و ١/٦ ملیارد دۆلار.[1]

(١) تازەکانی ئابووری، ژمارە ٧٦، بانەمەڕی ١٣٧٨، ل ١٩.



لەم وڵاتەدا بۆ یەکەم جار ساڵی ١٨٨٠ز لە هەرێمی فەرغانە نەوت و گاز دۆزرایەوە و لە ساڵی ١٩٤٠ دەرهێنانی ئەم کانزایانە دەستی پێکرد. زۆرترین کۆگاکانی وزەی فۆسیلی لەم وڵاتە لە باکووری ڕۆژئاوای زنجیر چیای حەسارو بەشی بیابانی پارێزگاکانی قشقە دەریاو بوخارا هەڵکەوتووە. بەپێی دوایین هەڵسەنگاندنەکان لە ساڵی ٢٠٠٢، کانزاکانی نەوتی باوەڕپێکراوی ئۆزبەکستان ٥٩٤ ملیۆن بەرمیلە و پاشکەوتەکانی دیکە تا دوو ملیارد بەرمیل مەزەندە دەکەن[1] تاکو ئێستا ١٧١ ناوەندی نەوت و گاز لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئەم وڵاتە ناسێندراون کە ناوچەی بوخاراو خێوە ٦٠٪ ئەم ناوەندانە لەخۆ دەگرێت. لە ناوەندە گرینگەکانی ئەم ناوچەیە دەتوانین ئاماژە بە ناوەندی کەك دوو حلاق[2] بکەین کە دەورووبەری ٧٠٪ لە بەهەم هێنانی نەوتی ئەم وڵاتە لە چاڵەکانی ئەم ناوەندە ئەنجامدەدرێ. هەروەها ناوچەی فەرغانە نزیکەی ٢٠٪ سەنتەرەکانی نەوتی ئەم وڵاتە لەخۆ گرتووە. لەگەڵ ئەویش دەشتی ئەستۆورتو دەریاچەی ئاراڵ، ناوچە گەلێکن کە لەبەرچاو گیراون بۆ دۆزینەوەی نەوت، کاری پێویستیان لەسەر بکرێ. بەرهەمی نەوتی ئەم وڵاتە پاش تێپەڕ بوونی ٧ ساڵ لە سەربەخۆیی، دوو بەرانبەر زیاتر بووە. واتە لە ٦٥٥٠٠ بەرمیل لە ڕۆژ، لە ساڵی ١٩٩٢ گەیشتووە ١٦٠٠٠٠ بەرمیل لە ڕۆژ و لە ساڵی ١٩٩٨، ئەمە لە کاتێکدایە کە بەکارهێنانی نەوت و بەرهەمەکانی تری نەوت لەم وڵاتە لە ١٩٤٠٠٠ بەرمیل لە ساڵی ١٩٩٢ بۆ ١٣٠٠٠٠ بەرمیل، لە ساڵی ٢٠٠٠ دابەزیوە بەم جۆرە ئۆزبەکستان لە گرووپی بەرێکەرانی نەوتی ناوچەی ئاسیای ناوەندییە. هەر چەندە بە لەبەرچاو گرتنی ئەم ڕاستییە کە پاشکەوتەکانی ئەم وڵاتە ڕوولە کەم بوونە، کۆمپانیای نەتەوەیی نەوت و گازی ئۆزبەکستان پێش بینی دەکات، بەرهەمهێنانی نەوت لە ساڵی ٢٠٠٥ تەنیا ١٢٠٠٠٠ هەزار بەرمیل لە ڕۆژدا دەبێ. کە ئەم ڕادەیە تەنیا لەناوخۆ کەڵکی لی وەردەگیرێتو بە کردەوە هەناردن ڕادەگیرێ. حکوومەتی ئەم وڵاتە لە کاتی سەربەخۆییەوە تا ساڵی ٢٠٠٢ نزیکەی ١/٢ ملیارد دولار لە پێناو نوێکردنەوەی پێشەسازی نەوتو گاز سەرمایەی داناوە، هەروەها لە راستای ڕاکێشانی سەرمایەی دەرەکی، لە مانگی ئاوریلی ٢٠٠٠ هەستا بە فرۆشتنی ٤٤٪ لە بەشەکانی کۆمپانیا "نەوت و گاز دوو چاوە" (کۆمپانیایەکە لە ترانس گاز)، ٤٤٪ لە بەشەکانی "شرکت از ترانس گاز" (شەریکەی هێنان و گواستنەوەی نەوت و گاز)، ٣٩٪

(1) Uzbakistan in www. eia. do. gor/emeu/cabs/uzbek
(2) Kokdu malak

بەشەکانی "شرکت از نفت پورایوتگا" (شەریکەی پاڵاوتنی نەوت)و ٣٩٪ لە بەشەکانی "شرکت ازبور نفت گاز" (شەریکەی هەڵقەندن) تەرخان کرد. هەروەها لەم کاتەدا سەرە کۆماری ئەم وڵاتە لە بڕیارێکی پەسندکراو، رایگەیاند کۆمپانیا چالاکە دەرەکییەکان لە بورای دۆزینەوە و دەرهێنانی نەوت و گاز لە ئوزبەکستان، لە دانی باجی داهاتەکەیان دەبووردرێن. دەسەڵاتی بەربڵاویان لە بواری بەرهەمهێنانی نەوت و گاز هەیە بەم شێوەیە سەرنجی چالاکی بۆ ئەم بەشە راکێشا. هەروەها دەوڵەتی ئەم وڵاتە پلانێکی داڕشتووە کە لە ماوەی چەند ساڵی داهاتوودا ٤٠٠ ملیۆن دۆلار بە شێوەی بەشداری لە بەرهەمهێنان لەگەڵ سەرمایەدانەرەکانی دەرەکی لە ٨٠ گۆڕەپانی نەوتی سەرمایە گۆزاری دەکا. هەر ئێستا ٧٨ ناوەند لە ١٦ بەش بۆ ئەم سەرمایەدارانە ئامادە کراوە.(1)

ئوزبەکستان خاوەنی سێ پاڵاوگەیە لە فەرغانە، ئالتی ئەریك و بۆخارا، کە توانای پاڵاوتنیان دەگاتە ٢٢٢٠٠٠ بەرمیل نەوتی خاو لە رۆژدا. پاڵاوگەی بۆخارا کە هەنووکە رۆژانە ٥٠ هەزار بەرمیل نەوتی خاو دەپاڵێوێت. توانای ئەوەی هەیە لە رۆژدا زیاتر لە ١٠٠هەزار بۆشکە بپاڵێوێ. یاسای ئەم وڵاتە دەرفەتی هەناردنی بەرهەمەکانی دیکەی نەوتی بە پاڵاوگەکانی داوە. لە پێناو نوێکردنەوەی پاڵاوگەکان، دەوڵەت چەند گرێبەستێکی لەگەڵ کۆمپانیاکانی ئەمریکایی تگزاکوو شۆرن واژۆ کردووە. لە ٢٠٠١دا کۆمپانیای میسوبیشی ١٠ پۆینی هەڵسا بە ٢٠٠ ملیۆن دولار سەرمایەگوزاری بۆ نوێ کردنەوەی پاڵاوگەی فەرغانە. هەروەها دەولەت بە مەبەستی پەرەپێدان لەم بوارەدا لەگەڵ وڵاتانی ئالمان و فەرانساش گرێبەستی واژۆ کرد(2) پاشکەوتی جێی متمانە لە گازی سرووشتی ئوزبەکستان تا ٦٦/٢ تریلیۆن فووتی سێجا مەزەندە کراوە و بەم شێوەیە ئەم وڵاتە سێهەمین بەرهەمهێنەری گازی سرووشتییە لەنێوان وڵاتانی cts (دوای رووسیە و تورکمەنستان)و یەکێکە لە دە بەرهەم هێنەری گرینگی گازی سرووشتی لە جیهاندا. هەر چەند ئیمکانی هەیە پاشکەوتی گازی سرووشتی ئەم وڵاتە لەنێوان ٧٤ تا ٨٨ تریلیۆن فووتی سێجا بێت(3)

کەڵك وەرگرتن لە گازی سرووشتی ئەم وڵاتە ٥٢ گۆڕەپانە، کە گرینگترینیان بریتییە لە: شۆرتان، گازەلی، پامۆکو خۆزاك. ئەم ناوەندانە لە دوو ناوچەی "ئامودەریا باسین"و

(1) Ibid
(2) Ibid
(3) Ibid



"مبارك" لە باشووری رۆژئاوای ئەم وڵاتە هەڵکەوتوون. بەرهەمی گازی سرووشتی لە ئوزبەکستان لە دەورانی سەربەخۆییەوە تا ئێستا ٣٠٪ پەرەی گرتووە و گەیشتووتە ١/٥١ تریلیۆن فووتی سێجا کۆمپانیای ترینتی وزەی بریتانیا،(1) لە ساڵی ٢٠٠١ لە پێناو سەرمایە گوزاری ٤٠٠ ملیۆن دولار گرێبەستێکی لەگەڵ پرۆژەکانی بەرهەمهێنانی گازی ئوزبەکستان لەگەڵ ئەم دەوڵەتە واژۆ کرد. لە مانگی مارسی ساڵی ٢٠٠٢دا کۆمپانیای لۆك ئەویلو ئەیترای رووسی بە هاوبەشی کۆمپانیای ئوزبەك گازی ئوزبەکستان کۆمپانیایەکی هاوبەشیان پێکهێنا. تاکو گۆڕەپانەکانی گازی نوێ لەم وڵاتە بۆ بەرهەمهێنانی وەگەڕ بخەن کە دەگوترێ ٨/١ تریلیۆن فووتی سێجا لەخۆ دەگرێت. لە ئاوریلی ٢٠٠٣ کۆمپانیای لوك ئەویلی رووسیەو کۆمپانیای دەوڵەتی نەوتو گازی ئوزبەکستان گرێبەستێکی یەك ملیارد دۆلاری لە پێناو وەگەڕ خستنی بەرهەم لە ناوەندی گازی ناسراو بە کاندیم شادی، هەڵکەوتوو لە باشووری رۆژئاوای ئوزبەکستان واژۆیان کرد. بەم پێیە لایەنی رووسی ٧٦٠ ملیۆن دۆلارو لایەنی ئوزبەك ٢٤٠ ملیۆن دۆلار تەواونرخی گرێبەستێك کە پێی پابەندن وەبەر دەکەوت. ئەم گۆڕەپانە لەناوچەی نێوان بۆخاراو خێوە هەڵکەوتووە کە دەگوترێ بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی شارەزایان بەرهەم لەم ناوەندە ساڵانە نزیکەی ٢٧ ملیارد فووتی سێجا دەبێت(2) هەروەها لە مانگی مای هەمان ساڵ راگەیەندرا شەریکەی نەوتی داچ برلانکوی هۆلەندی بە واژۆ کردنی گرێبەستێك لەگەڵ رژێمی ئوزبەکستان بە نرخی ٢٦٥ ملیۆن دۆلار لە بواری بەرهەمهێنانی گازی سرووشتی لەم وڵاتەدا سەرمایەگۆزاری دەکات. ماوەی کەڵك لێوەرگرتن ٢٠ ساڵە. دوای جێبەجێ کرانی تەواوی پلانەکە ساڵانە ٥ ملیارد فووتی سێجا گازی سرووشتی بەکار بهێنرێت. بەرهەمی ئەم پلانە لە ساڵی ٢٠٠٤ دەست پێدەکاو بڕیارە بۆ ئەم مەبەستە ٣١ ئالقەی چاڵی نەوت هەڵبقەندرێ.

١ـ٢. سیاسەتی ئابووری و تایبەتمەندییەکانی.

سیاسەتە پێویستەکان بۆ تێپەڕ بوون لە ئابووری بازاڕ لەلایەن ئوزبەکستانەوە بەم شێوەی خوارەیە:

١ـ ئابووری لە سەرەوەی سیاسەت.

(1) Trinty Energy UK
(2) Ibid

٢ـ بەجێگەیاندنی چاکسازی ئابووری و گۆڕانکاری دێمرکراتێك.

٣ـ لە سەرەوە بوونی یاسای ئابووری‌و پێویستی جێبەجێ کردنی لە پێناوی لەبەرچاو گرتنی مافی هاووڵاتیان.

٤ـ دانانی سیاسەتی پشتیوانی لە توێژی هەژار.

٥- تێپەڕ بوونی قوناخ بە قوناخ بۆ گەیشتن بە ئابووری ئازاد و دوری کردن لە راچەڵەکاندنی کۆمەڵگا.

٣. تورکمەنستان

ئابووری تورکمەنستان بەسراوەییەکی زۆری بە بەرهەم و ئاڵ وگۆڕی کانزای وزە و لۆکەوە هەیە ئەم وڵاتە لەگەڵ ئەوەی کە لە رووی بوونی کانزای سرووشتییەوە بە وڵاتێکی دەوڵەمەند بە ئەژمار دێ و خاوەنی پاشکەوتی زۆری یۆد، سۆلفاتی سیدیۆم و کانگای زێڕو پلاتینە، بەڵام زیاتر پشت بە ناردنی نەوت و گاز و کەل و پەلی سووك بەتایبەتی تاڵی لۆکە دەبەستن، بە جۆرێك کە پتر لە ٧٥٪ بارستایی هەناردەکانی تورکمەنستان نوت و گاز پێکی دێنێت. بەپێی هەڵسەنگاندنی ژێدەرە نێونەتەوەییەکان لە ساڵی ٢٠٠٢دا، ئەم وڵاتە خاوەنی ٥٤٦ بەرمیل نەوتی پەرژێرندراوە. بەڵام چاوەڕوان دەکرێت، پاشکەوتی رێتێچووی ئەم وڵاتە نزیکەی ١/٧ ملیارد بەرمیل بێ[١]. بەشی زۆری کانگا نەوتییەکانی ئەم وڵاتە لە رۆژئاواو ناوچەی نزیك بە دەریاری خەزەر هەڵکەوتووە. گرینگترین ناوەندە نەوتییەکان و گازی ئەم وڵاتە بریتین لە: نەبیت داغ، قۆم داغ، چلکن، کوتۆرتەپە، زیگەلی دەروازە و دەشتی مەرغاب.

بەرهەمی نەوتی ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٩٩٢دا نزیکەی ١١٠ هەزار بەرمیل لە رۆژ دابووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٥ زایینی بۆ ٨١ هەزار بەرمیل لە رۆژدا دابەزی. رێژیمی ئەم وڵاتە بە مەبەستی بەرهەمهێنان هەستا بە راکێشانی سەرمایەی دەرەکی و وەرگرتنی کۆمپانیا دەرەکییەکان لە پرۆژەکانی نەوت و گاز، دوابەدوای ئەم کارانە، بەرهەمی نەوتی خاو لە ساڵی ١٩٩٩ گەیشتە ١٥٦ هەزار بەرمیل لە رۆژدا و ئەم رەوتە بە پەرەگرتنی بەرچاویی، لە ساڵی ٢٠٠٢ گەیشتە ٢٠٠ هەزار بەرمیل لە رۆژدا.[٢]

(1) Tukmenistanin www.eia.doe.gov/emeu/cabs/turkmen
(2) Ibid



زۆرترین بەرهەمی نەوتی خاوی ئوزبەکستان لەناوچەی لەباب لە رۆژهەڵاتی ئەم وڵاتە و هەروەها لە دەشتی بەرزی قارەکەی لە دەریای خەزەر بەدەست دێت. کۆمپانیای ئارژانتینی "برایداس"[١] لەم بوارەدا چالاکییەکی بەربلاوی هەیە و دوو کۆمپانیای ئەهلی بە ناوەکانی "یاتشار"[٢] و "کیمیر"یان[٣] دروستکردووە، سەرجەم نزیکەی ١٦٠ ملیۆن دۆلار لەم بوارەدا سەرمایەگۆزاری کراوە. بەپێی پلان دارِشتنەکانی عشق ئاباد بەرهەمی ئەم وڵاتە تا ساڵی ٢٠١٠ دەگاتە نزیکەی ١ ملیۆن بەرمیل لە رۆژدا.

کەڵك وەرگرتنی نێوخۆیی ئەم وڵاتە تەنیا ٥٢ هەزار بەرمیلە. تورکمەنستان دوو پاڵاوگەی هەیە کە یەکیان لە شاری سەدی بە توانای ١٢٠ هەزار بەرمیل و ئەوی دیکەیان لە شاری تورکمەنباشی بە توانایی ١١٦ هەزار بەرمیل هەڵکەوتووە. ئەم وڵاتە بەپێی پلانێکی کورت خایەن، بریارە ئەم پاڵاوگەیە نوێ بکاتەوە و لەم راستایە کۆمپانیایەکی فەرەنسایی بە هاریکاری کۆمپانیای نەتەوەیی نەوتی کۆماری ئیسلامی ئێران بەپێی گرێبەستێك بە بارتەقای ٣٠٠ ملیۆن دۆلار، بەرنامەیەك لە پێناو نوێ کردنەوەی ئەم دوو پاڵاوگەیە تاکو ساڵی ٢٠٠٤ دەستپێبکەن. وا بڕیارە بەپێی ئەم پلانە توانای پالاوتنی نەوتی خاوی پاڵاوگەی تورکەمە نباشی بگاتە ٣٦١٥٠ هەزار بەرمیل لە رۆژدا. سەرمایە دانەرانی ژاپۆنی‌و ئاڵمانی بەرپرسیایەتی ماددی ئەم پرۆژەیان وەئەستۆ گرتووە[٤] بە پێی ژمێریاری ساڵی ٢٠٠٢، توکمەنستان وەك یەکێك لە گەورەترین وڵاتانی خاوەنی پاشکۆی گازی سرووشتییە لەجیهاندا، کە نزیکەی ١٠١ تریلیۆن فووتی سێجا گازی سرووشتی هەیە[٥]. بەشی زۆری ئەم کانگایانە لەناوچەکانی دەوروبەری ئاوی ئامودەریا هەڵکەوتووە. کارناسان لەسەر ئەوبروایەن کە نیوەی ئەم رێژەیە لە ناوەندە گازییە گەورەکانی "دولت آباد ـ دونمز"[٦] هەمار کراوە. ناوەندە گازییەکانی دیکەی ئەم وڵاتە لەناوچەکانی، مەرغاب، لیباتسکی‌و مارینسکی هەڵکەوتوون. بەرهەمی گازی سرووشتی ئەم وڵاتە لە ساڵی ٢٠٠١ نزیکەی ١/٦٤ تریلیۆن فووتی سێجا بووە. بەکار هێنانی نێوخۆیی گازی سرووشتی لەم وڵاتە تەنیا ٢٦٠ ملیارد فووتی سێجاو بەشی گرینگ لە بەرهەم هێنان لەم وڵاتە بۆ دەرەوە بەرێدەکرێت. کڕیارانی گازی سرووشتی ئەم

(1) Bridass
(2) Yashar
(3) Kaymir
(4) Turkmaistan in www.Ena.Doe.Gov/emeu/cabslturkmen.
(5) Ibid
(6) Dauletabad - Donmec

ولاَتە بریتین لە: ئوزبەکستان، قەزاقستان، رووسیە، ئۆکراین، گۆرجستان، ئازەربایجان و ئەرمەنستان.
گرینگترین هێڵی لولەی گاز بۆ دەرەوە، هێڵی ئوزبەکستان ـ قەزاقستان ـ رووسیە ـ ئوکراینە.

دەوڵەتی عشق ئاباد بۆ راکێشانی سەرمایەدارانی دەرەکی خوازیارە کەل و پەلی بەکارهێنان و ناردنی گازی ئەم ولاَتە سەرلەنوێ نۆژەن بکاتەوە، بە جۆرێك کە لە سەرەتای ساڵی رابردووی میلادی نۆژەن کردنەوەی تۆڕی ئۆتۆماتیکی کەرستەکانی کۆنترۆڵی ناوەندە گازییەکانی دەوڵەت ئاباد ٣ تا ٦٠ کیلومەتری سنوورەکانی باکووری رۆژهەلاَتی ئێران بەپێی گرێبەستێك دراوە بە کۆمپانیایەکی ئیسرائیلی.[1]

١ـ٣. سیاسەتی ئابووری و تایبەتمەندییەکانی.

١ـ لەسەر بنەمای خاوەنداریەتی حکومەتییە.

٢ـ خاوەن ئابووری تاك بەرهەمییە (گازو لۆکە)

پلان دارشتنی ئابووری لەسەر ئەساسی دووبابەت بناغەی دانراوە:

١ـ برینی هێڵە بەسراوەییە ئابوورییەکان لەگەڵ مسکۆ و ولاَتانی دیکەی سۆڤییەت.

٢ـ دارشتنی ئابوورییەکی نەتەوەیی بە مەبەستی کەڵك وەرگرتن لەسەرچاوە سرووشتییەکان،و دابینکردنی پێویستییەکانی نێوخۆیی، کە ئەم ئەستراتیژییە چەند تەوەریی سەرەکی هەیە:

ئەلف) تورکمەنستان بکرێ بە ناوەندی ترانزێتی ئاسیای ناڤین.

ب) پێکهێنانی کەرتی تایبەت.

ج) دانانی ناوچەی ئازادی بازرگانی ـ پیشەسازی.

د) زیاتر کردنی بەرهەمهێنان، بیناسازیو ئاوەدان کردنەوە، بەکارهێنانوگۆڕینی بە پێشەسازی سرووشتیی ولاَت.

٤ـ قرقیزستان

قرقیزستان ولاَتێکی کوێستانییە و تەنیا ٧٪ خاکەکەی بۆ جووتیاری بەکار دێت. سەرەرای ئەو کێشەیە ئاماژەی پێکرا، ئابووری ئەم ولاَتە لەسەر بنەمای جووتیاری بیچمی گرتووە، بە جۆرێك کە ٣٤/٧ ٪ بەرهەمهێنانی ناخالیسی ناوخۆیی لە ساڵی ١٩٩٤ بەرهەمی وەرزێری و دارستان بووە.[2]

(١) کەناڵی خەبەریی ئیرنا ئابووری، خەرمانانی ١٣٨٢.

(٢) حەبیبەی فەتحی، "چاوخشاندێك بە بارووەۆخی ئابووری ولاَتانی موسڵمانی ئاسیای نێوەڕاست و قەفقاز"، گۆڤاری توێژینەوەکانی بازەرگانی، ل ١٣٦.



کانزاکانی نەوتی و گازی ئەم ولاَتە، دەوڵەمەند بە ئەژمار نایەن. بەم هۆیە بۆ دابینکردنی سووتەمەنی پێویست، خۆی بە کۆمارەکانی دیکەی ناوچەکە گرێداوە. بەلاَم لەرووی کانگای بەردی خەڵووز دەوڵەمەندە. کە لە هەموو ئاسیای ناوەندی پلەی یەکەمی هەیە. ئەم ولاَتە لە رووی هەبوونی وزەی هیدرۆلیك دەوڵەمەندە.

سەرچاوە گەورە ئابوورییەکانی ئەم ولاَتە بەم جۆرەی خوارێیە:

١ـ کانی کانزایی بریتییە لە پاشکەوتی بەربلاَوی ئانتیموان، جیوە، ئورانیوم، بەردی خەلووز بەردی مەڕ مەڕ، زێر، بەردی کل، مس، ...

٢ـ پیشەسازییەکانی بریتییە لە بەرهەمهێنانی کارەبا و ئەلکترونیك (کۆی بەرهەمەکانی کارەبای ئەم ولاَتە نزیکەی ٢٠٠ ملیارد کیلۆواتی کاتژمێرە)، کە کارەبای پاشکەوتی بۆ قەزستان بەڕێ دەکا) توانەوەی مەتاڵە ئاناسنەیەکان، پیشەی ماشێن سازی بۆ وێنە بەرهەمهێنانی کەرەسەی ماشێن و کەرەسەی جووتیاری، بەرهەمهێنانی چیمەنتۆ و کەل و پەلی بیناسازی، بەرهەمهێنانی خۆراك بەتایبەتی گۆشتو پیشەسازی ئاسیا بە ئەژمار دێ. بەرو بوومی بۆ ٥٠ ولاَتی جیهان بەڕێ دەکرێ.

٣ـ جۆراوجۆری ئاوهەوایی بووەتە هۆی رەنگاورەنگی بەرووبوومەکان، کۆی خاکی شیاوی کێلاَن ١٠/٥٨١/٧٠٠ هەکتار دەبێ. کە زیاتر لە ١٩٣/٦٠٠ هەکتاری، چیمەن و سەوزەلاَنی پێکی هێناوە. لە بەرهەمە گرینگە جووتیارییەکان دەتوانین دانەوێڵە (بەتایبەتی گەنم) نەی شەکر، لۆکە، تووتن، چەوەندەر، ترێ، میوەکان نێو ببەین.

٤ـ بەپێی لێکدانەوەکانی ئەنجامدراو لەلایەن شارەزایانی نێونەتەوەیی وزە، پاشکەوتی نەوتی ئەم ولاَتە نزیکەی ٤٠ ملیۆن بەرمیلە و لە ئەساسدا پێویستی بە هاوردەی نەوت و بەرهەمەکانی دیکەی نەوتی هەیە.[1] لەم ولاَتەدا ٧ بیاڤی نەوتی دوو بیاڤی نەوت ـ گازی بینراوەتەوە، بەلاَم بەهۆی کوێستانی بوونی ئەم ناوچەیە کە لەم بیاڤگەلەدا تێدا هەڵکەوتوون، دەرهێنانی لەم کانگایانە لەگەڵ دژوارییەکی زۆر بەرەو روویە. لە ساڵی ٢٠٠٠ بەرهەمی نەوتی ئەم ولاَتە رۆژانە ٢١٠٠ بەرمیل و بەکارهێنانی نزیکەی ١٢٠٠٠ بەرمیل لە رۆژدا بووە. بەرهەم هێنانی نەوت لە ساڵی ٢٠٠٥ دەگاتە ٣٠٠٠ هەزار بەرمیل لە رۆژدا.

گرینگترین بیاڤە نەوتییەکانی ئەم ولاَتە بریتین لە: چای، ئات باشی، ئایسك کوڵ، ئالیی.

(1) Kyrgyza tan in www. Eiq. Doe.Gov /emeu/Cabslkyrgyz

کۆمپانیای حکوومەتی نەوت و گازی قرقیزستان لە پێناوی پەرەپێدانی پلانی بردنەسەرێی بەرهەمهێنانی نەوت، لەگەڵ دەوڵەتی چین لەم بوارەدا سەرمایەگوزاری هاوبەشی کردووە. هەروەها، پاشساڵی ٢٠٠١، کۆمپانیایەکی قرقیزی ـ ئوتریشی لەگەڵ کۆمپانیای دەوڵەتی نەوت و گازی ئەم وڵاتە بە هاوبەشی نزیکەی ٥ ملیۆن دۆلار لەم راستایە سەرمایەی داناوە. کە هەتا ساڵی ٢٠٠٢ ئەم رێژەیە گەیشتە ٣٠ ملیۆن دۆلار.

پسپۆرانی قرقیزی و چین ساڵی ٢٠٠٢ هەڵسان بە چاك كردنەوە و نوێژەنکردنەوەی ١٠٠ چاڵە نەوتی بێ کەڵکی ئەم وڵاتە. هەروەها شەریکەی قرقیزی نەوت گازلە ساڵی ٢٠٠٢دا، ٣٠ ملیۆن دۆلاری تەرخان کردبۆ هەڵقەندنی ئەو چاڵە نەوتییانەی دەدۆزرێنەوە.

قرقیزستان خاوەنی پاڵاوگەیەك لە شاری جەلال ئاوا (١٥٠ مایلی باشووری بیشکێك، پێتەختی قرقیزستان). کە لە ساڵی ١٩٩٧ دامەزراوە و لەلایەن "کۆمپانیای نەوتی قرقیز"ەوە سەرپەرشتی دەکرێت. ئەم کۆمپانیایە بە سەرمایەی هاوبەشی "کومپانیای قرقیزی نەوت گاز"و کۆمپانیایەکی بریتانیایی پێکهات. توانای پاڵاوتنی پاڵاوگەکە ١٠٠٠٠ بەرمیل لە رۆژدا دەبێت. هەروەها کۆمپانیایەکی سەرمایە دانەری هاوبەشی قرقیز ـ قەزاق بە نێوی بیگمائواویل لە ساڵی ٢٠٠٢ پاڵاوگەکی بچووکی بە توانایی ٤٠٠ بەرمیل لە رۆژدا دروستکرد. کە کۆمپانیای قرقیزیی نەوت گاز ٢٥٪، ئابیلای خاویی گرووپ ٥٠٪و سەرمایە دانەرەکانی تایبەت ٢٥٪ لە خاوەندارییەتی پاڵاگەکەیان لەبەردەستدا هەیە و بەرهەمەکانی ئەم پاڵاوگەیە بە دەوڵەتی قرقیزستان دەفرۆشیت. سەرچاوە سەلمێنراوەکان، گازی سرووشتی قرقیزستان بە نزیکەی ٢٠٠ ملیارد فووتی سێجا مەزەندە دەکەن. ساڵی ١٩٩٢ بەرهەمی گازی ئەم وڵاتە ٣/٥ ملیارد فووتی سێجا بووە بەڵام وردە وردە ئەم ژمارەیە کەم بووەتەوە، بە جۆرێك کە لە ساڵی ٢٠٠٠ نزیکەی ٥٠٠ ملیۆن پێ شەشپاڵوو گەیشتووە، بەم شێوازە ئەم وڵاتە لە پێشوودا بەگازی هاوردە بەتایبەتی بە وڵاتی ئوزبەکستان بەستراوە بووە. لە ساڵی٢٠٠٠دا بەکارهێنانی گازی سرووشتی دەورووبەری ٦٧/٥ ملیاردی پێشەشپاڵوو بووە کە نزیکەی ئەو میزانەی لێ دەرهێنراوە.[1]

١ـ٤. سیستمی ئابووری پلان دارێژیی دەوڵەت.

بەریان بەرەو ئابووری بازار لەسەر بناغەی پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی دیکەی جیهان پشتیوانیی لێکراوە و سەرمایە گوزاری دەرەکی وەکو هۆکارێکی پێویست بۆ پەرەپێدانی ئابووری سەرنجی پێدراوە. یاساگەلێکی بەربلاو لەلایەن پارلمان لە پێناو تایبەتی کردن،

(1) Ibid



پێکهێنانی سەرمایەگوزاری هاوبەش و ناوچەی ئازادی بازرگانیو ئازاد کردنی بازرگانی دەرەکی پەسند کراوە[1].

٥ـ تاجیکستان

ـ نزیك بە تەواوی پیشەسازی تاجیکستان بەستراوەتەوە بە هاوردەی کەرەسەی خاو، سووتەمەنی، وزە. لە تاجیکستان پتر لە ٣٠ کانگای بەردی خەڵووز دۆزراوەتەوە و لەم بوارەدا لەنێوان وڵاتی ئاسیای ناوەندی دوای قرقیزستان پلەی دووهەمی هەیە. تەنیا لە کانگای "خان ـ یغتاب نزیکەی٦٠٪ بەردی خەڵووزی نایاب کەڵکی لێوەردەگیرێ.[2] گەورەترین سەرچاوەی وزەی ئەم وڵاتە پاشکەوتی ئاوییە. دوای فیدراسیۆنی رووسیە، تاجیکستان خاوەنی پلەی دووهەمە لە رووی سەرچاوەی ئاوییەوە. تاجیکستان تەنیا نزیکەی ١٢ملیۆن بەرمیل نەوتی پاشکەوتی بەردەوامی هەیە. بەرهەمهێنانی نەوتی ئەم وڵاتە لە ساڵی ٢٠٠١ لەلایەن کۆمپانیای "تاجیك نەفت و گاز" رۆژانە بە شێوەی نێونجی ٣٥٠ بەرمیل بووە کە لە چاو پێشوو کەمتر بووە، چونکە لە ساڵی ١٩٩٢ (پێش دەسپێکی شەڕی نێوخۆیی بۆماوەی پێنج ساڵ ) رۆژانە دەوروبەری ١٣١١ بەرمیل نەوتی خاو لەم وڵاتە بەرهەم دەهات. بەکارهێنانی نەوت و مەوادەکانی تری نەوتی لەم وڵاتە لە ساڵی ٢٠٠١دا رۆژانە ٢٩٠٠٠ بەرمیل بووە. کە نزیك بە تەواوی ئەم رێژەیە لە دەرەوە دەهێنرا. بۆ وێنە ٧٠٪ لە وڵاتی ئوزبەکستان دەکڕدرا. بەڵام لە ساڵی ٢٠٠١دا پاڵاوگەی بچووکی "کونیبودم" بە پاڵاوتنی ٤٠٠ بەرمیل نەوتی خاو لە رۆژدا دەستی بەکار کرد.[3] رێی تێدەچێ کە تاجیکستان ٢٠٠ ملیارد پێ شەشپاڵووی گازی سروشتی هەبێت. بەڵام بەشی زۆری بەکارهێنانی نێوخۆیی لە گازی سرووشتی لە وڵاتانی تورکمەنستان و تاجیکستانەوە بۆ وڵاتەکەی دەبا. لە ساڵی ٢٠٠٠دا رێژەی گازی هاوردە لەم وڵاتە ٤٤/١ ملیارد پێ شەشپاڵوو بووە. ناوەندی گازی "خوجە سارتز"[4] لەناوچەی خالتوونی باشووری یەکێك لەو ناوەندانەیە کە هەنووکە بڕیارە کەڵکی لێوەربگیردرێ.[5]

(١) "ئابووری قرقیزستان"، وەرزنامەی توێژینەوەی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز، ساڵی سێیهەم، ژمارەی ٧، ١٣٧٣، ل ١٩٣.

(٢) "ئابووری تاجیکستان"، وەرزنامەی توێژینەوەی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز، ساڵی سێهەم ژمارەی ٧، ١٣٧٣، ل ١٧٦.

(3) Tajikstan in www. Eia. Doe. Gov /emeu/ cabs/ tajik

(4) Khoiasartz

(5) Ibid

# پاژی دووهەم

# "سیاسەت و حکوومەت لە ئاسیای نێوەڕاستدا"

## بەرهەمی یەکەم: پێش لێك هەڵوەشانەوەی یەکیەتیی سۆڤییەت

## فەسڵی یەکەم

### سەردەمی یەکیەتیی سۆڤێیەت لە گەشەسەندنەوە تا لێك هەڵوەشانەوە

پاش شەڕی یەکەمی جیهانی (١٩١٤ـ ١٩١٨)؛ ڕژێمی تەزاری بە چەندین هۆکاری وەکو گوشاری ئابووری، گەشەکردنی بیروڕای گشتی و بووژانەوەی چالاکی گرووپە شۆڕشگێڕەکان بەرەو رووخان دەرۆیشت تا ئەوەی کە بەسەرهەڵدانی شۆڕشی ١٩١٧ی رووسیە سەرکەوتنی بلشویکەکان[1] بە ڕێبەری لنین، تەمەنی سێسەد ساڵەی رۆمانسەکان کۆتایی پێهات. لە مارسی ١٩١٨دا بۆلشویکەکان واتە باڵی زۆرینەی حیزبی سوسیال دێموکراتی رووسیە، ناوی حیزبەکەیان گۆڕی بە حیزبی کۆمۆنیستی و لە ژووئیەی هەمان ساڵدا دوای پەسندکردنی یەکەمین یاسای بنەڕەتی، کۆماری سۆسیالیستی فدراتیوی سۆڤییەت[2] پێکهات. لێرەدا پێویستە کە سەرەتا سیاسەتی ڕێبەرانی سۆڤییەت لە پێوەندی لەگەڵ نەتەوەکانی ئاسیای ناوەڕاست بە شێوەی گشتی تاوتوێ بکەین، پاشان بە شێوەی جیا ڕێبازی هەر یەك لەوانە تاوتوێ بکەین.

### گوتاری یەکەم: شۆڕشی بلشویك و نەتەوەکان

بە سەرکەوتنی شۆڕشی بلشویك لە ساڵی ١٩١٧دا، نەتەوەکان و ئەتنیکە جیاجیاکانی ئیمپراتۆری تەزاری کە پێشتر تامی تاڵی زوڵمیان چێشتبوو لە هەوڵی رزگارکردنی خۆیاندا بوون. ئەوان پێداگریان لەسەر شوناسی کۆنی خۆیان دەکرد و خوازیاری سەربەخۆیی، ئازادی و

(1) Bolsheviks
(2) Ussr



یەکسانی لەگەڵ ئەتنیکە دەسەلاتدارەکانی رووس بوون. لنین کە لە گرینگی پرسەکە گەیشتبوو، هەر لە سەرەتاوە بە دەرکردنی بڕیارێك، جموجۆڵی شۆڕشگێڕی نەتەوەکانی کۆنترۆڵ کرد. نێوەرۆکی بڕیاری دەرچوو کە لە ١٥ی نوامبری ١٩١٧ راگەیاندرا، هەڵگری خاڵی زۆر گرینگ، تایبەت بە نەتەوەکان بوو.

١- یەکسانی و دەسەڵاتداری نەتەوەکانی نیشتەجێی رووسیە.

٢- مافی نەتەوەکانی رووسیە بۆ ئازادی لە پێناو دەرکردنی بڕیاری پێکهێنانی رێکخراو یان پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

٣- دانی گەرەنتی بۆ پەرەدانی ئازادی کەمینە نەتەوەییەکان و گرووپەئایینەکانی نیشتەجێی رووسیە[1]، بەڵێ! لنین، هەر ئەو لنینەی کە ئایین و مەزهەبی بە تریاك و هۆشبەری کۆمەڵایەتی خەڵك، دەزانی، بەهۆی پێویستی تەواوی بەهێزە نەتەوەیی و ئایینییەکان، ئازادی و تەنانەت ئازادی جیابوونەوەی لە حکوومەتی رووسیەی پێشکەش دەکردن، ئەم بابەتە هیچ هۆیەکی نەبوو جیا لەوەی لنین بۆ پتەو کردنی حکوومەتی بلشویکی خۆی، هەستی بە پێویستی تەواو، بەهێزە نەتەوەیی و مەزهەبییەکان ـ بەتایبەت هێزە ئیسلامییەکان کە یەکەمین کەمینەی گرینگی رووسیە چ لە رووی چەندایەتیو چ لە رووی چوونایەتی یان پێکدەهێنا، دەکرد.

هەست کردن بەم پێویستییە بۆ حکوومەتی نوێی سۆڤییەت بە رادەیەك بوو کە لنین و ئیستالین بە هاوبەشی راگەیاندراوێکیان لە ٧ی دیسامبری ١٩١٧ تایبەت بۆ کرێکارانی موسڵمانی رووسیە دەکرد تێدا نوسیبوویان: "بیروباوەڕو ئاکارو تەنانەت دامەزراوەی نەتەوەیی و مەزهەبی ئێوە لە ئەمڕۆوە ئازادە، هێرش ناکرێتە سەری ئێوە دەتوانن بەپێی "راگەیاندراوی یاسایی نەتەوەکانی رووسیە" کە لە رۆژی ١٥ نوامبر، بە هەر شێوازێك کە ئارەزوو دەکەن ژیان بکەن و هەر جۆر حکوومەتێکیان بوێ دامەزرێنن". هەر بەم هۆیە لە ساڵی ١٩١٨، لەلایەن حکوومەتی بلشویکی "لنین"ەوە رێگا درا بە موسڵمانانی رووسیە کە "کۆنفرانسی موسڵمانانی رووسیە" لە مسکۆ ببەستن.

لەم کۆنفرانسەدا نوێنەرانی تەواوی موسڵمانانی رووسیە تێدا بەشدار بوون و داویان لە سۆڤییەت کرد کە بە پەیرەوانی ئایینی محەممەدی جۆرێك خودموختاری نێوخۆیی بدات. ئەم

(1) H. BDavis, nationalism and socialism – marxistand labar Theories of nationalism to 1917. (new york, 1976).

داوایە لەلایەن لنینەوە پەسند نەکراو هەر بەم هۆیە موسڵمانانی رووسیە دوو کۆنفرانسی دیکەیان پێکهێناو لە پێوەندی لەگەڵ وەرگرتنی خودمۆختاری، هەڕەشەیان لە لنیین کرد. دواترو پاش پێکهێنانی چوارەمین کۆنگرەی ئایینی موسڵمانان حکوومەتێکی کاتی ئیسلامی یان هەڵبژارد و خێرا لەلایەن "عەلیم جانی باوەردی" موفتی ئەوکاتی موسڵمانانی رووسیە، خودموختاری تورکستان و جگە لە ویلایەتەکانی بۆخاراو خان نشینی خێوە، راگەیاندرا[1].

لەگەڵ کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی، هەمووشتێك گۆڕانی بەسەر داهات. بلشویکەکان لەگەڵ هێزی ئاڵمانی روبەروو نەبوون و بڕیاریاندا کە ئیمپراتۆری خۆیان هەتا کەوشەنی پێشووی تەزاری دابمەزرێنن. بناغەی وەها ئیمپراتۆرییەك بەسترابوو بە "زاڵبوون بەسەر قەومەکانی رووسدا" دەبێ ئەوە بزانین کە جێ‌گرتنی رێژیمی سۆڤییەت لەناوچەی موسڵمانانی سۆڤییەتی پێشوو بەرە بەرە جێبەجێ کراو هێزەکانی بلشویك دوای گرتنی هەر شوێنیك، پیشوویان دەداو دواتر خەریکی دەسبەسەردا گرتنی شوێنەکانی دیکە دەبوون. ئۆپەراسیۆنی ئاماژە پێکراو ١٢ساڵ درێژەی کێشاو لەم ماوەیەدا هێزەکانی بلشویك و سوپای سوور بەرە بەرە چالاکی نیزامیان دژی موسڵمانەکان ئەنجامدەدا و یەکەمین شوێن لە ناوچەکانی موسڵمان نشینی رووسیە کە کەوتە بەردەستی هێزەکانی بلشویك، تورکستان بوو کە لە ساڵی ١٩١٨ رووی داو دواین وڵاتیش تاجیکستان بوو کە ساڵی ١٩٢٩ لکێنرا بە کۆماری سۆڤییەتەوە.[2]

رەوتی بزووتنەوە و بەرەنگاری نەتەوە موسڵمانەکانی رووسیە لە بەرانبەری هێرش و تەوژمی بلشویکەکان بە دوو قۆناخ دابەش دەبێ: قۆناخی یەکەم گوشار یان بە واتای رووسی کردنی ناوچە ئیسلامییەکانی رووسیە لە ساڵی ١٩٢٤ کۆتایی پێهات و قۆناخی دووهەم هەر لەو ساڵەوە تا ١٩٣٩درێژی کێشا.

لە ساڵی ١٩٢٤ بە هۆی هێرشی توندی هێزەکانی بلشویك، دواین پێگەی هێزە ئیسلامییەکان لە بەشێکی ئاسیای نێوەڕاستی رووسیە تێك شکێنداراو لەو ساڵە بە دواوە حکوومەتی سۆڤییەت سیاسەتێکی لەپێش گرت کە مەبەستی سەرەکی تواندنەوەی هەر جۆرە پاشماوەیەکی ئایینی ئیسلام بوو.

(1) Teresa Rakawska– Harmtan, Russia Nationalism in Central Asia (Boulder: Westview Press, 1953).
(2) Ibid



بە مەبەستی بەڕێوەبردنی ئەم پلانە، یەکەم هەڵوێستی دەوڵەتی سۆڤییەت، دابەشکردنی تورکستان بەسەر چەند کۆمارو چەندین ناوچەی خودمۆختاری جۆراوجۆر[1] بوو.

حکوومەتی سۆڤییەت بۆ دروستکردنی دوو بەرەکی و جیایی لەنێوان موسڵمانانی تورکستان، ئەو وڵاتە دابەشکرد بە سەر چەند کۆمار، وەك کۆمارەکانی تورکمەنستان، ئوزبەکستان، قرقیزستان، هەروەها چەند ناوچەگەلی خودمۆختاری، وەك (کاراکالپاگیا).

مەبەستی دولەتی سۆڤییەت ئەوە بوو ناوەندیەتی لە ئاسیای نێوەڕاست لەبەر یەك هەڵوەشێنێتەوە و بە دابەش‌و جیا کردنەوەیان، دووبەرەکی لەنێو موسڵمانان پێکبێنێ. پاش سەرکەوتنیان، کاری سەرەکی کۆمۆنیستەکان پروپاگەندەی توند بە دژی ئایین و نەتەوەکانی ئەم ناوچەیە بوو. بە جۆرێك کە مزگەوتەکان[2]، کتێب‌و نووسراوە ئایینییەکان لەنێو دەبران و تەنانەت دوایین هێماکانی نەتەوەیی لەم وڵاتە، واتە رێنووسیش کرا بە رووسی و ژمارێکی زۆر لە موسڵمانانی ئاسیای ناوەڕاست بۆ سیبری دوورخرانەوە[3]. دەوڵەتی سۆڤییەت بە جێگای ئەو ژمارە موسڵمانە دوورخراوە، لە شوێنەکانی رووسیەوە دەستەیەکی دیکەی لە رووسەکانیش بۆ ناوچەکانی دیکە رادەگواستن ولە ئاسیای ناوەڕاست نیشتەجێ دەکران تا بەم شێوە هەم پلانی بە رووسی کردنی ئاسیای ناوەڕاست بەجێ بگەیەنن و هەم موسڵمانەکانیش ئاوارە بکەن.[4] سەپاندنی ئەم جۆرە سیاسەتانە وایکرد کە خەڵکی خۆجێیی ناوچەکە، کاری وەرزێڕی بەجێ بهێڵن و روو لە ناوچە پیشەسازییەکان بکەن. هەروەها، ئامانجی دیکەی دەوڵەتی سۆڤییەت ئەوە بوو کە لە بەشداری کردنی خەڵکی خۆجێیی لە کارە گرینگە کانی دەوڵەتی‌و ناحکوومیدا پێشگیری بکات تا بەم شێوازە رووسەکان جڵەوی دەسەڵاتی بە دەستەوە بگرن. دوای

(1) Alaxande Benigsanand Broxup, op. cit,. andalso see Edward Allworth, central Asia: 120years of Russian Rule, (London: Duke unirsity parss, 1989), pp. 60-70

(٢) بەپێی سەرژمێری فەرمی لە دەورانی تەزاری ٧٠٠٠ مزگەوت لە رووسیە هەبوون لە کاتێکدا بەپێی سەرژمێری گۆڤاری شەڕی سۆڤیەت (ساڵی ١٩٤٩) ئەم رێژەیە لە ١٣٢٠ مزگەوت پتر نییە.

(٣) بەپێی سەرژمێرییەکی فەرمی لە سەرچاوەکانی سۆڤییەت حەشیمەتی مۆسڵمانان لە ئاسیای ناوەڕاست لە ساڵی ١٩٢٦ی زایینی ٣/٩٦٨/٢٨٩ کەس بووە لە کاتێکدا کە حەشیمەتی هەر ئەم ناوچەیە لە ١٩٣٩بە هۆی دوور خستنەوەی بە کۆمەڵی مۆسڵمانان بە ٣/٠٩٨/٧٦٤ کەس دابەزیوە.

(٤) بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٢٦ز دوو ملیۆن هاووڵاتی رووسی لە بەشەکانی رۆژئاوای یەکیەتی سۆڤییەت بۆ ناوچە مۆسڵمان نشینەکان کۆچ دران.

بەڕێوەبردنی ئەم نەخشەیە، دواین قۆناخی بە رووسی کردنی ناوچە موسڵمان نشینەکانی رووسیە ساڵی ١٩٢٩ جێبەجێ کرا. بەم واتایە کە ڕێنووسی هەموو کۆمارە موسڵمان نشینەکان لەلاتینەوە بکرێ بە رووسی. هۆی گۆڕینی ئەم ڕێنووسە ئەوە بووە کە دواین ڕێگای هاوپێوەندی ئەم نەتەوانە لەگەڵ ئیسلام بە تەواوەتی لێك دابڕێن.

شەڕی دووهەمی جیهانی خاڵی وەرچەرخانی ئیسلام لە سۆڤییەتدا بوو و بارودۆخ بە تەواوەتی گۆڕا. موسڵمانەکان کە نزیکەی ٢٠ ساڵ بە تەواوی لە هەر چەشنە بەشداری لە چالاکییە ئایینییەکان بێبەش ببوون، سەرلەنوێ ئازاد بوون تاکو بە کاروباری ئایینی خۆیان رابگەن. هەر لە سەرەتای هێرشی ئالمانییەکان، ڕێبەرانی دەوڵەتی سۆڤییەتی بە جۆرێك نیگەران کردبوو کە سیاسەتی ئەوان لەمەڕ پەیڕەوانی ئایینەکان گۆڕانی بەسەر داهات(١). هۆکاری سەرەکی ئەوەی کە دەوڵەتی سۆڤییەت خوازیاری ئازادییەکی رووالەتی و کاتی بە موسڵمانان بوو، ئەوە بوو لە یارمەتی ئەوان بۆ شەڕ لەگەڵ ئالمانییەکان لە ناوەوە بەهرەمەندبن، یان لانیکەم بەم شێوەیە ئەوان لەبیر کردنەوە لە ڕاپەڕین و شۆڕش یان کاری تێکدەرانە دوور بخەنەوە.

کاتێك شەڕی دووهەمی جیهانی کۆتایی پێهات و هەست کردن بە پێویستییەکی تونـد، بەهێزە ئیسلامییەکانی رووسیە لەنێو چوو، دەوڵەتی رووسیە سەرلەنوێ سیاسەتی پێشووی خۆی دەرهەق بە موسڵمانان گرتە پێش. ئیستالین لەکاتی شەڕدا پارێزگاری کردن لە نیشتمانی باب و باپیرانی بە جێگای پارێزگاری لە کۆمەڵگای سۆسیالیزم هێنا گۆڕێ، پاش ئەوە کە پێویستی پێ نەمان سەرلەنوێ کێشەی نەتەوەکانی غەیرە رووسی لەبیر کرد و بە خێرایی سیاسەتی پێشوویی ڕچاو کردەوە و لە ساڵی ١٩٤٧ ئۆرگانە جۆراوجۆرە دەوڵەتییەکانی سۆڤییەت پەلامارێکی چڕوپڕیان بۆسەر ئایین و مەزهەب و موسڵمان دەستپێکرد بە جۆرێك کە حیزبی کۆمۆنیستی

(١) لەم پێوەندییەش بەڵگە هەیە کە دەری دەخات سەرەتای شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی چەند مانگ پێش هێرشی ئالمانییەکان بە گوێ گەیشتووە و تەنانەت راپۆرتێکی گرینگ لەم پێوەندییە لە مانگی مای ١٩٤٢ گەیشتووە ئەستالین کە باسی لە بوونی بزووتنەوەکی ئازادی خوازی لەنێوان موسڵمانی رووسیە دەکا کە وای لە دەوڵەتی سۆڤییەتی کرد کە پەرە بە ڕاگەیاندنی ئایینی بدات و تەنانەت بووە هۆی پێکهێنانی کۆنفرانسێکی ئیسلامی ئۆفا دەکا. سەردانی ئەم چاوگە بکەن:
Helen carrere dencausse, Talamand Tho kussan Empire (lond: T. B. tairis andco lrd, 1988), pp. 38-47 .



سۆڤییەت سیاسەتی دژی ئایینی خۆی زیاتر لە هەموان رووبەڕووی چینی لاو کردو بە جۆرێك ئەوانیان فێر دەکردن کە "لاوانی کۆمۆنیست جیا لەوە کە خوا نەناسێکی بە باوەڕ بن، بەڵکو ئەرکیانە بە توندی خەباتی دژی هەر جۆرە بیروباوەڕێکی ئایینی لەنێو لاودا بکەن لە پروپاگەندە نەك هەر بە نوسراوە نەوەستان، بەڵکو لە تەواوی کارگەکان، خوێندنگاو دامەزراوە کۆمەڵایەتی، دەوڵەتییەکان، ئەندامانی حیزبی کۆمۆنسیت ئەرکیان بوو بە بڵاو کردنەوەی کتێب و وتاری جۆراوجۆر بیروڕای لاوان لە هەمبەر دین و ئایین ناشیرین بکەن. هەروەها پاش شەڕی نێونەتەوەیی، حکوومەتی سۆڤییەت بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ بزووتنەوە نەتەوەیی و ئایینییەکان بە خێرا دەستی بە رووسی کردنی کۆمەڵگای سۆڤییەت کرد. بە جۆرێك کە هێلن کارێردانکۆس، کارناسی هەڵکەوتووی نەتەوەکانی سۆڤییەت، لەم بوارەدا بەم شێوەیە دەگەڕێنێتەوە: "ساڵی ١٩٥٢ حکوومەتی فیدراتیوی سۆڤییەت ببوو بە ئیمپراتۆرێکی راستەقینە، کە لەویدا وەکو هەموو ئیمپراتۆرییە داگیرکەرەکانی پێشوو نەتەوەیەك بەسەر ئەوانی دیکەدا باڵادەست بووو لێرەدا نەتەوەی رووس بوو کە بە هۆی شارستانییەت و کولتووری بەرزتری خۆیان" ئەرکی بەڕێوەبردنی بەشەکانی ئیمپراتۆری لە ڕێگای پێشکەوتن وەئەستوو دەگرت. یەکێتی سۆڤییەت پێکهاتەیەکی نایەکسانی نەتەوەکان بوو کە لەژێر دەستی "برای گەورەتر" واتە نەتەوەی (رووس)دا بوون. برایەك کە هەوڵی دەدا ئەوان وەك خۆی لێ بکات و لەنێو خۆیدا وردوخاشیان بکەن.(١) دوای ئیستالین دەسەڵاتدارانی نوێی رووس لەگەڵ ئەوەی کە لە هەوڵی راست کردنەوەی راستییە مێژووییەکان و گەڕاندنەوەیی شانازییەکانی سۆڤییەت بوون، بەڵام تەواوی هەوڵیان ئەوە بوو کە ئەم کارە نەبێتە ئامرازێك بۆ چەکەرە کردنی بیری نەتەوەخوازی لەنێوان نەتەوەکان. ئەوان سیاسەتی دژە ئایینی بە گرژتینێکی زیاتر، بەتایبەتی بۆ موسڵمانەکان، گرتە بەرو بە هەموو تواناوە پێشی بە تێکۆشانیانی گرت . وەها سیاسەتێك بووە هۆی ئەوە کە ڕاپەڕینو بزاوتی موسڵمانان وەکو ژیلەمۆی ئاگر بمێنێتەوە و پریشکەیەك لە داهاتوودا گڕبگرێت.

**گوتاری دووهەم: لنیین و پلانی ئابووریی نوێ (گەلاڵەی نپ)**

لەنێوان ساڵەکانی ١٩١٨و ١٩٢١دا بلشویکەکان بەرێبەری لنیین لەگەڵ کێشەی گەورە بەرەو روو بوون کە بە توندی هەڕەشەی لە دەسەڵاتی ئەوان دەکرد. بۆ ئەم مەبەستە لنیین و

(1) Carrered encausse, op. cit

هاوڕێکانی بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەم بارودۆخە نالەبارە و مەترسی هێنەرەدا، کۆمەڵێك سیاسەتیان هێنایە قۆناخی جێبەجێ کردن کە وەك "کۆمونیسم جنگی" باسیان دەکرێ بلشویکەکان بەو سیاسەتانە لە راستیدا دەیانەویست کە پێش هەموو شتێك لە هەموو کەرەستەیەکی پێویست بۆ لەناو بردنی نارازیانی دەرەوە و نێوخۆ کەڵك وەر بگرن، دواتر لە رووی ئابووری بەرنامەیەکی تۆکمەی دەوڵەتی دابڕێژن کە تیایدا خاوەندارییەتی کەرەسەکانی بەرهەمهێنان وکاروباری دیکەی ئابووری لەوانە بانکەکان و کۆمپانیا پێشەسازییەکان، هەروەها کاروباری جووتیاری و بازرگانی دەرەکی نجەنە ژێر رکێفی دەوڵەتەوە[1]. بەڕێوەبردنی ئەم سیاسەتانەی ناسراو بە "کۆمۆنیزمی جەنگی" لەئاکامدا بووە هۆی ناڕەزایەتی کرێکارانی پێشەسازی، هەروەها بوو بە هۆی تێکهەڵچوون لەنێوان وەرزێرانی خۆجێیی و بلشویکەکان[2].

جیا لەوە، بلشویکەکان پێش بەدەستەوە گرتنی هێزی سیاسی، بۆ مافی نەتەوەکانی نا رووسی لەژێر ئیمپراتوری تەزاری بۆ دیاری کردنی مافی چارەنووس پێداگری زۆریان دەکرت. بەڵام دوای سەرکەوتن راگەیاندراوێکیان لەم بارەیەوە دەرکرد، کە بەم پێیە هەرکام لە نەتەوەکانی غەیرە رووس رێگایان پێ دەدرێت کە بۆ خۆیان کۆمار پێکبهێنن. بەڵام لە هەمان کاتدا نابێت خۆیان لە ئیمپراتۆری رووسیا جیا بکەنەوە و دەبێ حوکمی رووسیای سۆڤییەت قبووڵبکەن، ئەوە بوو کە لە دیسامبری ١٩٢٢ حکوومەتی بلشویك بە شێوەی فەرمی پێك هاتنی "یەکیەتی گەلانی سۆسیالیستی سۆڤیەتی راگەیاند کە بریتییە لە کۆمارەکانی رووسیە، رووسیەی سپی، ئوکراین و کۆمارەکانی قەفقازو پاشانیش یاسای بنەڕەتی ١٩٢٤ ئەم شێوازەییە فەرمی ناسی، ساڵی ١٩٢٩ی زاینیش کۆمارەکانی ئوزبەکستان، تورکمەنستان و تاجیکستان بەم دستەیە زیاد کران. بەڵام دوای ماوەیەك بلشویکەکانیش وەکو سیاسەتی پێشووی تەزارەکان کە لەسەر بنچینەی رووسی کردنی هەموو ئیمپراتۆرییەکانی سۆڤییەتیان گرتە بەرو لە رێگای کەرەستە جۆراوجۆرەکانی وەکو سوپای سوور دەسەڵاتی تەواوی خۆیان بەسەر سەرجەم کۆمارەکانی سۆڤییەتدا سەپاند[3].

(1) Geoffrey wheele, The Modern Hisrory of Soviet centrol Asia (London: Wiedenfeld paress, 1964), p. 117
(2) Richard pipcs, The Formotion of the soviet union: Communismand nationalism in 1917 – 1923 (Combridge: Harvard University paress, 1954). Pp. 257 – 259
(3) Thoms Remington, Building Socialism in Bolshevik Russia: Tdeology ond Tndustrial organization 1917 – 1927, (Pittsburgh: university of Pittsburgh Press, 1984), p. 23



بەڵام لە چەندین بوارەوە، بەڕێوەبردنی سیاسەتی ناسراو بە کۆمۆنیزمی جەنگی، هەروەها قەیرانە ئابوورییەکانی هەڵقولاویی شەڕە نێوخۆییەکان و تەنانەت پەرەگرتنی ناڕەزایەتیو مانگرتنەکان لە سەرانسەری رووسیە، دەسەڵاتی بلشویکەکان لەگەڵ مەترسییەکی زۆر بەرەوروو کرد[1].

ئەم بوارە مەترسی هێنەرانە بوونە هۆکارێك تاکو لنیین لە ساڵی ١٩٢١کۆمەڵێك بەرنامەی چاکسازی بکات.و بەرنامەی نۆێی خۆی بە ناونیشانی گەلاڵەی "نپ"[2] بخاتە قۆناخی جێبەجێ کردنەوە. ئەم بەرنامە ئابوورییە لە ئاکامی شکستی تەواوی بەرنامەکانی ناسراو بە کۆمۆنیزمی جەنگی هاتە گۆڕێ لە راستیدا تایبەتمەندی سەرەکی ئەمە، قەبووڵکردنی بەرژەوەندی کاتی چالاکیی کەرتە تایبەتیەکان بوو. مەبەست لە جێبەجێ کردنی گەلاڵەیە نوێ کردنەوەی ئابووری رووسیە پاش دەرئەنجامە ماڵوێرانکرەکانی شۆڕش، شەڕە نێوخۆییو دەرەکییەکان، هەروەها بەڕێوەبردنی کۆمۆنیزمی جەنگی بوو. بەم شێوەیە لە شارەکان چاودێری کردن بەسەر بەڕێوەبردنی کارگەو کۆمپانیا بچووکەکان درا بە بەشی تایبەت و رێگا درا کە گوندنیشنەکانیش هەتا پاش ماوەی بەرو بوومەکانیان بفرۆشن و لە بەرانبەردا باج بە دەوڵەت بدەن بەڵام دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ئەم تایبەتی کردنە هیچ کاتێك پێشەسازی گرینگ، هێڵە گرینگەکانی رێگاوبان، بازرگانی دەرەکیو سیستمی بانکی لەخۆ نەدەگرت و ئەم کاروبارە هەروا لەژێر چاودێری دولەتدا مایەوە[3] گوتاری سێهەم: ئیستالینیزم پاش مردنی لنیین یەکیەتیی سۆڤییەت لە رووی کۆمەلایەتی ـ ئابوورییەوە گۆڕانێکی نوێی دەستپێکرد. ژۆزێف ئیستالین کە لە ساڵی ١٩٢٢دا توانی بەسەر رکەبەرەکانی بەتایبەتی ترۆتسکی سەربکەوێ‌ودەسەڵاتی سیاسی بەدەست بێنێ، هەروەها لەهەمان ساڵدا وەکو سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیست هەڵبژێردرا. یەکیەتیی گەلانی سۆڤییەت لە دەورانی ئیستالین بەرابەر بوو لەگەڵ تەواو بوونی شەڕە ناوخۆییەکان و لە پاشان کۆجێیی نیزامی و سیاسی، کەمکردنەوەو یان لابردنی چاودێری کرێکاران بەسەر کاروباری پێشەسازی، هەوەها پەرەگرتنی دیوان سالاری و لە سەرەووی ئەمانەش بی هیوابوون لە شۆڕشی جیهانی سۆسیالیستی، کەوابوو بە سەرنجدان بەم وەرچەرخانە، ئێستالین بیرۆکەی سۆسیالیزم لە ولاتێك، یان بە واتایەکی باشتر

(1) Alexander Bennigsenand Enders Wimbbush, Muslims of Thesoviet Empire, (Bloomington: Tndlana university press, 1986), P. 36
(2) New Ecaonomis Policy
(3) Alexader Park, Bolshsvismin turkestan 1917-1927, (New york: Columhia unirersty Press. 1957). P. 62

"سوسیالیزمی نەتەوەیی" هێنا گۆڕێ. لەگەڵ ئەویشدا، کۆنگرەی شانزەهەمی حیزبی کۆمۆنیست لە نوامبری ١٩٢٦ پلانی پێشکەوتن لە وڵاتە پێشکەوتووە رۆژئاواییەکانی بە ئامانجی پەرەپێدانی پیشەسازی ئەکتیڤ هێنایە بەرباس و جەختیان لە سەر دەکرد[1] ئەمە لەکاتێکدا بوو کە باڵی چەپی حیزبی کۆمۆنیست بە ڕێبەری "تروتسکی" ئەم کارەی وەکو کەڵك وەرگرتنی زیاتر لە وەرزێران لە قەڵەم دەداو پێداگری لەسەر بیرۆکەی "شۆڕشی بەردەوام" دەکرد. کە لەم پێوەندییەدا، ڕێبەرانی سۆڤییەت لە دەیەی ١٩٣٠ز بەم لاوە "شۆڕشێك لە سەرەوە" لەم وڵاتەیان هێنایە قۆناخی جێبەجێ کردن کە پایەی سەرەکی بریتی بوو لە: بە زۆر تێکەڵکردنی پیشەسازی، گەشەپێدانی پیشەسازی و شۆڕشی کولتووری، بە جۆرێك کە ئێستالین راشکاوانە لە ساڵی ١٩٣٠ز رایگەیاند، کە ئاڕمانجی سەرەکی ئەو لەو بەرنامەیە گۆڕینی سۆڤییەت لە وڵاتێکی جوتیاریەوە بۆ وڵاتێکی پیشەسازی کە بتوانێت پێداویستییەکانی خۆی دابینبکات. ئەوە بوو کە ئیستالین بەرە بەرە گەڵاڵەی نپی لنیین کە گەرانتی پلانی نیوە سەرمایەداری بەرژەوەندی خوازانەی دەکرد وەلانا، ئابوورییەکی تەواو سۆسیالیستی هێناگۆڕێ بەم شێوازی گۆشارێکی زۆریان خستەسەر بەشەکانی جووتیاری و زیاتر بایەخیان بە بەشداری (تعاونی) کردنی دەدا. بۆ هەرچی زیاتر پیشەسازی کردنی وڵات، بایەخیان زیاتر دەدا بە پیشەسازی قورس و کەرەستەکانیو پیشەسازی سووك و کەرەستەی کەڵك وەرگرتنیان فیدای ئەمانە کرد، دوای پیشەسازی کردنی، رەوتێکی سەرسوورهێنەر پێکهات، تا ئەو جێگای یەکیەتی سۆڤییەت تا کاتی هێرشی هیتلەر بەسەر ئەم وڵاتە لە ژووئەنی ١٩٤١ بوو بە یەکێك لە هێزە پیشەسازییە گەورەکانی جیهان.

ئێستالین بە لێهاتوویيو بەهێزی تەواوەوە دەستی کرد بە لەنێو بردنی ڕێبەرانی شۆڕشی بلشویکیو هاورێنانی لەمێژینەی خۆی، بە جۆرێك ناوی ئەو لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤییەت هاوتا بووو تەنانەت لە کۆنگرەی هەشتەمی شووراکانی یەکیەتیی سۆڤییەت لە دیسامبری ١٩٣٦ یاسایەکی بنەڕەتی دیکەی پەسند کرد کە بە ناوی ئێستالین دەناسرا. ئەم یاسا بنەڕەتییە لە راستیدا دێموکراتی ترین یاسای بنەڕەتی بوو کە ئازادی باری تاکەکەسو کۆمەڵایەتی لەخۆ دەگرێ. بۆ وێنە لەم یاسا بنەڕەتییە تەواوی نەتەوەکانی سۆڤییەت بوون بە خاوەنی مافی یەکسان، هەروەها بە دەستپێکی شەڕی دووهەمی جیهانیو هێرشی ئاڵمانییەکان لە ژووئیە ١٩٤١، ئێستالین دەستی کرد بە پێدا هەڵگوتن ە سەر نەتەوەخوازی و نیشتمانپەروەری تا ئەو

(1) Richard sakwa, soviet Politcs. (London:Routedge, 1989), P. 43.



جێگایەی کە، سروودی ئینترناسیونالیزمی جێگای خۆی دا بە سروودێکی نەتەوەییو بەربەرەکانی لەگەڵ ئاڵمانی وەکو بەرەنگارییەکی گەورەی نەتەوەیی ناو برد، تەنانەت لەم دەورانە کلێسا سەرلەنوێ بوو بە جێی سەرنجی ئێستالین[1]

بە کۆتایی هاتنی شەڕ، بارودۆخی کۆمەڵایەتیو سیاسی سەرلەنوێ گۆڕانی بەسەرداهات و حکوومەتی سەرەرۆیانەی، ئێستالین سەرلە نوێ دەستی پێ‌کردو هێرشی کردە سەر هەرێمی کولتووری، ئیدئۆلوژیك[2]. بە جۆرێك کە ئێستالین لەهەموو شوێنێك وتەی کۆتایی دەگوت و هەموو کاتێك کۆبوونەوەکان بە قسەی ئەو کۆتایی پێ دەهات. توندوتیژییەك کە ئێستالین بەکاری دەبرد لە راستیدا بە رادەیەك بوو پێشگیری لە هەر چەشنە ناڕازییەتی نێوی خۆی سۆڤییەتی دەگرت.[3] بە دەرکەوتنی ئێستالینیزم لە راستیدا خاوەندارێتی تایبەت، بوو بە دەوڵەتی بوونی ئابووری. نەك هەر ئەمە بەلکو هەموو شتێك لەسەر بناغەی دەسەڵاتی دەوڵەتی و هێزی تەواوی ئێستالین هەڵدەسنگێندران. کەواتە دەتوانین بڵێین ئێستالینیزم نیزامی، بوو بە ئابووری کراوەی دەوڵەتی و پێکهێنانی سیاسەتی دیوان سالاری و زنجیرە شێوازی. لەم سیستمەدا دەنگەکانی خەڵك و دادوەری نەك یاسا، بەلکو هۆکارو سیاسییەکان رۆڵیان دەگێڕا، بە جۆرێك کە پولیسی سیاسی بەهێزێکی لە رادەبەدەرەوە کە بووی، راستەوخۆ لە دادگاکاندا ناڕازیانی ئیعدام دەکرد. ئێستالین بەردەوام حیزبی لەگەڵ سوپا هەڵدەسەنگاند و کادرە پلە نزمەکانی وەکو خاوەن پلەکان، کادرە نێونجییەکانی وەکو ئەفسەران و کادرە پلە بەرزەکان وەکو بەرپرسانی سوپا دەشوبهاند، هەروەها ئێستالین کۆمەڵگای سۆڤییەتی لەگەڵ (ماشین) بەراوەرد دەکرد کە خەڵکی ئاسایی تێدا رۆڵی پێچ و مۆرەیان هەبووو ڕێبەرانیش لە پەنای ئەواندا راوەستان[4].

(1) Josph stalin, on the nation guestion (London: lawrenceand wisshart, 1942), p. 29
(2) Helen carrer dencausse, the Decline of Emire (New york: newsweek Tnc, 1978), pp. 36 – 39

(٣) مارتین ئووبن، کا. گا. ب: مردون و ژیانی سەرلەنوێ، وەرگێڕانی مەحموود گەوهەرچی (تاران: ئینتشاراتی ئیتلاعات، ١٣٧٤)، لاپەڕەکانی ٤٢ ـ ٦١. هەروەها سەردانی ئەم چاوگە بکەن لە یۆگنبا ئەلباتس، کا. گا. ب: حکوومەت لە ناو حکوومەتدا، وەرگێرانی مێهدی پرتۆیی (تاران: ئینتشاراتی قفنوس، ١٣٧٩)و جیمز ئادامز، سیخورانی نوێ (تاران: ئینتشاراتی ئیتلاعات، ١٣٧٧).

(4) Edward allworth, central asia: 120 yars of rassian rule (durham :dake vniversity perss 1989), p. 555

## گوتاری چوارەم: ئارمانج خوازی خرۆشچۆف

پاش مەرگی ئێستالین لە مارسی ١٩٥٣دا کاروباری وڵات کەوتە دەستی "ڕێبەرییەکی بە کۆمەڵ" ئەم کادرە ڕێبەرییە پێکهاتبوون لە پلە بەرزەکانی دەوڵەتی وەکو مالێنکۆف مۆلۆتۆف، هەروەها بریتی بوو لە بژاردەکانی حیزبی (خروشچۆف) سەرکردە نیزامییەکان (ژوکۆف)، هەروەها پۆلیسی نهێنی رووسیە (بریا) هەموو ئەم کەسایەتییە نیزامی و سیاسەییەکان جگە لە (بریا) لەسەر ئەم بڕوایە بوون کە دەبێ شێوەی بەڕێوەبردنی حکوومەتی ئێستالین گۆڕانکارییەکی بەربڵاوی تێدا جێبەجێ بکرێت، حکوومەتی تیرورو زەبروزەنگ دەبێ جێگای خۆی بە سیستمێك لەسەر بناغەی دادپەروەری ئازادی و خواستی خەڵك بدا، هەروەها سیستمی نیزامی ـ دەوڵەتی دەورانی لنیین سەرلەنوێ پێکبێتەوە و خەڵك تا ڕادەیەك لە ئازادیە مەدەنییەکان و دیموکراسی بەهرەمەند بن، نەك هەر ئەوە بەلکو کادری ڕێبەری ئاماژە پێکراو لەبیری ئەوەدا بوون کە گۆڕانکاری بە سەر سیستمی ئابووری سۆڤیەتیشدا بێنن. تاکو لەبەر ئەنجامە خراپەکانی کۆجێیی بوونی دەوڵەت و بۆروکراسی تاکەکەس کەم بکەنەوە. بەڵام دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین ئەگەر چی ئەم کادری ڕێبەرییە لە دانی ئازادییە مەدەنییەکان بە خەڵك و مەرج دانان بۆ سیستمی سۆڤییەت لەگەڵ یەکتر ڕێك کەوتۆبوون بەڵام لە هەمان کاتدا لە رووی تاکتێکییەوە ڕێگاکانی دەست وێڕاگەیشتن بە ئامانجە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ یەکتردا جیاوازییەکی زۆریان هەبوو، بۆ وێنە مالنکۆف بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی، لایەنگری بەهێز کردنی تەواو دەزگا دەوڵەتییەکان، سەرمایەگۆزای زیاتری کاروباری جووتیاری و پێشەسازی سووك و چاودێری کەمتر لەسەر پرۆژەی نیزامی ـ پێشەسازییەکان بوو، بەڵام ڕای خرۆشچۆف لەسەر ئەوە بوو کە چاودێری تەواوی حیزبی سۆسیالیستی سۆڤییەت لەسەر کاروباری سیاسیو ئابووری ئەم وڵاتە گەرانتی بکات و هەرچی زیاترە سەرمایەگۆزارییەکان ڕەوانەی پێشەسازی قورس و بەرگری بکات. هەروەها ناوبراو دیگوت کە بۆ بردنە سەرەوەی بەرهەمی جووتیاری و پەرەگرتنی پێشەسازی سووك بە جێگای گۆڕینی ڕێگای سەرمایەدانەرەکان دەبێ چاکسازی پێکهاتەیی ئەنجامبدرێ، جگە لەمە گشت سەرمایەدارەکان ئاکامێکی ئەوتویان نابێ. کە واتە لەگەڵ مردنی ئێستالین جۆرێك "کەش و هەوایەکی کراوەی سیاسی"و تەنانەت ئابووریش لە گۆمەڵگای سۆڤیەتدا بەرقەرار بووو خرۆشچۆف دوای سەرکەوتن بەسەر رکەبەرەکانی توانی بە کۆمەڵێك چاکسازی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری لە ماوەی ساڵانی ١٩٥٧ تاکو ١٩٦٤ ئەم بارودۆخە تا ڕادەیەکی زۆر بەهێز بکات. لە گۆڕەپانی



نێوخۆییشدا خرۆشچۆف سیاسەت و پلانگەلێکی تایبەتی هێنایە قوناخی جێبەجێ کردنەوە. کە بە "سڕینەوەی ئێستالین" ناسراوە.

ئەم سیاسەتانەی ناسراوە بە سرینەوەی ئێستالین کە لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستدا لە فێوریەی ١٩٥٦ ـ رەهەندگەلی بەرینتری بە خۆوە گرت. خرۆشچۆف لە ئاخافتێنێکی نا فەرمیدا دەستی بە ئاشکرا کردنی تاوانە ترسێنەرەکانی ئێستالین کردو بە دوای ئەوەدا ملیۆنان بەندکراوی سیاسیو حوکم دراوانی ئوردوگاکانی کاری زۆرەملێ ئازاد کران. هەروەها لە بواری کۆمەڵگا، کولتوور، ئەدەبیاتو بڵاو کراوەی کتێب، ئازادییەکی ڕێژەیی هاتە ئاراوە. لەم بوارانەدا جۆرێك بارودۆخی نافەرمی و لە دەرەوەی دەسەڵاتی حیزبی کۆمۆنیست پەرەی گرتو تەنانەت لە پێکهاتەکانی ڕێبەری حیزب و وڵاتیش ئاڵوگۆڕێکی بەربڵاو پێکهات. بە جۆرێك خرۆشچۆف پەرەی بە دەسەڵاتی ناوچەییەکان و بایەخێکی زۆری بە بەشداری خەڵك لە کاروباری سیاسی دەدا.(١) ناوبراو زۆر خێرا دەزگای ئەمنییەتی وڵاتی گۆڕیو سەربەخۆیی کاری لێ ئەستاندن. ئەم دەزگا ئەمنییەتییە ساڵی ١٩٥٤ بەناونیشانێکی دیکە ناسراو بەکۆمیتەی ئەمنییەتی دەوڵەتی ـ کا. گ. ب. کارەکانی دەستیپێکرد. لە سەردەمی خرۆشچۆڤدا تیرۆری سیاسی بە شێوەی سەردەمی ئێستالین نەمابوو، دادگا ئاساییەکان دەسەڵات و هێزی زیاتریان پێدرا. دەزگاکانی پێشووتر دەستیان لە دەستێوەردان لە کاروباری یاسای کورت کرایەوە. تەنانەت خرۆشچۆف دەوڵەتی سوڤییەتی وەکو "دەوڵەتی هەموو خەڵك" لەقەڵەم دەدا نەك دەوڵەتی دیکتاتۆریی پرولتاریاو هەر ئەمە بووە هۆی ئەوە کە رووناکبیران بڕوایان کردبوو کە سیستمی سوڤییەت لە دیکتاتۆرییەوە بۆ حکوومەتی خەڵکی لە حاڵی گۆڕانایە. هەروەها خرۆشچۆف بە مەبەستی ئەنجامدانی چاکسازی و سرینەوەی ناوەندگەرییەتی لە کاروباری ئابووری و جووتیاری چالاکییەکی زۆری کردو هەر لەم پێناوەدا پێشنیاری کردبوو کە ڕادەی ئەو باجانەی کە لەژێر رکێف و دەسەڵاتی تایبەتی گوندنشینەکانی کەڵخۆزی دایە کەم بکرێتەوە هەروەها ئەستاندنیماڵیات لە بە روبوومەجۆراوجۆرەکان و مەڕومالات هەڵوەشێتەوە.

(١) هێلن کارردانکوس، ئیمپراتووری بەربڵاو، وەرگێڕانی غولام عەلی سیار (تاران: بڵاو کردنەوەی نوێ، ١٣٦٦) ل ٥٩.

زیدەباری ئەوەیش ئەم دەست بەسەر داهێنانە نێوخۆییانەی خرۆشچۆف سیاسەتی کەمکردنەوەی کێشە و پێکەوە ژیانێکی ئاشتیخوازانەی لە بواری پێوەندییە دەرەکییەکان کردەوە لەگەڵ جیهانی ڕۆژئاوا بە شێوەی ئاشتی خوازانە هەڵسوکەوتی کرد بە جۆرێك کە خرۆشچۆف لە مانگی مای ١٩٥٥ لەگەڵ دەوڵەتی نەمسا (ئوتریش) گرێبەستی ئاشتی واژۆ کرد. هەروەها هەر لەو ساڵەدا سەفەری بۆ ژنێف کردو لەگەڵ ڕێبەرانی وڵاتانی ڕۆژئاوا بەتایبەت ئەمریکا دەستی بە وتووێژ کرد، تا ئەو جێی کە خرۆشچۆف یەکەمین ڕێبەری یەکیەتیی سۆڤییەت بە ئەژمار دی کە لە کۆتایی ژووئیە و سەرەتای مانگی ئووتی ١٩٦٠دا سەردانی ئەمریکای کردەوە ئەم جۆرە وەرچەرخانە لە دوو بواری پێوەندی دەرەکی و نێوخۆیی یەکیەتی سۆڤییەتدا بە ڕادەیەك پەرەی گرت کە تەنانەت لە کۆنگرەی بیستەمی کۆمۆنیست بە ڕاگەیاندنی بێزاری لە ئێستالنیزمو ڕێبازی کەسێتی ناوبراو هێڵە گشتییەکانی ئیدئولۆژیی خۆی بەم شێوەیەی خوارەوە باسکردووە.[1]

١) دەرچوون لە شەڕو لایەنگری لە ئاشتی نەك هەر کارێکی گونجاو بەلکو بە کارێکی پێویست چاوی لێدەکرا ئەم بنەمایە بە لەبەرچاو گرتنی واقیع بینیەکانی پەرەگرتنی چەکی ناوکی بیچمی گرتبوو.

٢) ڕچاوکردنی بنەمای پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانە لەگەڵ وڵاتانی دیکەی جیهان بەتایبەت ئەمریکا و جیهانی ڕۆژئاوا، ئەم بنەمایەش هەڵقوڵاوی ئەو گۆڕانکارییە کە لە ئاستی پێوەندییە نێونەوییەکان پێکهاتبوو.

٣) بە لەبەرچاو گرتنی ئەو پەرەسەندن و لێکترازانەی کە لە پێکهاتەگەلی نێونەتەوەییدا بیچمی گرتووە، ئەو هیوایە هەبوو کە وڵاتە جۆراوجۆرەکانی جیهان لە سیستمی پارلمانیو لە ڕێگای ئاشتیخوازانەوە بە سۆسیالیزم بگەن، بە جۆرێك کە خرۆشچۆف بڕوای بەوە کردبوو کە هاوسەنگی و ئاڵوگۆڕی هێز لە ئاست هێزە جیهانییەکان لە بەرژەوەندی کۆمەڵگای سۆسیالیزم گۆڕدراوەو ئەم کارە دەبێتە هۆی وەدیهاتنی سوسیالیزم لە ڕێگای ئاشتیخوزانەوە. ناوبراو تێزی پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی خۆی لەگەڵ بۆچوونەکانی لنین گرێدەداو سەر لەنوێ دەسپێکردنەوەی سیاسەتی (دتانت) سڕینەوەی کێشەکان بواری بە تەشەنەی کۆمۆنیزمی

(١) یانی دارابی شەڕ، ڕووداوەکانی سیاسی یەکێەتی سۆڤییەت، وەرگێڕانی هورمز هومایوون پوور (تاران: ئینتێشاراتی شۆڕشی ئیسلامی، ١٣٦٧)، لاپەڕەکانی ٢٩- ٢٨.



ئەورووپایی بەرهەڤ کرد. بەڵام لەگەڵ بوونی ئەم فاکتۆرانەش، لەو شوێنەی کە ئەم گۆڕانکارییە لە سەرەوە بۆ خوارەوە بوو بزووتنەوەکی چاکسازیو سەقامگیری لێ نەکەوتەوە بە جۆرێك کە سیاسەتەکانی ئەستالنیزم بەرە بەرە لە ساڵی ١٩٦٥دا لە کۆمەڵگای سۆڤییەت سەرلەنوێ خۆی دەرخستەوە.[1]

**گوتاری پێنجەم: کۆمەڵگای نوێی بێرژنێف.**

لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٦٥ خرۆشچۆف بە هۆی شێوە کودەتایەك لە دەسەڵات کەوت دواتر ڕێبەری یەکیەتیی سۆڤییەت کەوتە دەستی تاقمێکی پێنج کەسی کە ناسراوترینیان لئۆنید بێرژنێف بوو، چوار کەسی دیکە کە لە گەڵ بێرژنێف بوون بریتی بوون لە: میخائیل سۆسۆلۆف، ئەلکساندر شلپین، نیکلای پادگۆڕی و لە سەرەوەی هەمووان ئالکسی کاسیکین کە بەڕێوەبەرێکی لێهاتووو کارناسێکی بواری ئابووری بوو. ئەندامەکانی ئەم ڕێبەرییە بە کۆمەڵە لەمەڕ ئیستراتیژیو سیاسەتی داهاتوویان هاوڕا بوون و لەسەر ئەم ویستە سوور بوون کە لە کۆجێیی دەسەڵات لە دەستی کەسێك و پێش بە گەڕانەوەی "کارێزما پەروەری" ئیستالینینی بکەن، ئەوان هەروەها پێشگیریان لەهێندێك لە سیاسەتەکانی خرۆشچۆف وەکو بردنە سەریی ئاستی بژیۆی خەڵك، وەلانانی تیرۆر و توندوتیژی و دێموکراتیك کردنی حکوومەت دەکرد، بەڵام لە هەمان کاتدا لەو بڕوایەدا بوون کە خرۆشچۆف لە هەمبەر هێرش کردن بۆسەر پوانگەلی چینی تایبەت، غەیرە ناوەندی کردنی کاروباری ئابووری، چاکسازی دێموکراتێکی حیزبی، ئیستراتیژی بەرگریو سیاسەتی دەرەوە زیادە ڕەویی زۆری کردبوو، کەواتە دەبوایە ریفۆرم بکرێت. بەم جۆرە ڕێبازی بنەڕەتی حکوومەتی سۆڤییەت لە دوو دەیەی پێشوو هەوڵدان بۆ گۆڕانگاریی لە هێمنانە و پارێزکارانە بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لەنێو ئەندامانی ڕێبەرانی بەکۆمەڵی ئاماژە پێکراو بۆچوونگەلێکی جیاوازو بەرچاو دەکەوێت، بۆ وێنە، کاسکین خوازیاری ئەولەوییەتدان بە سەرمایەگۆزاری لە بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی بە جێگای بەشی بەرگری بوو و تێدەکوشا بە بەرنامەڕێژییەکی تۆکمە دەسەڵاتی زیاتر بە مودیران بدرێ. هەروەها کاسکین خوازیاری باش بوونی پێوەندییەکانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات و لەو بڕوایەدا بوو

(١) ئیلاهەی کۆلای، سیاسەت و حکوومەت لە فیدراسونی ڕووسیا (تاران: ئینتشاراتی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٦) لاپەڕەی ٢٥.

که بەرزبوونەوەی بازرگانی لەنێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو دەست پێڕاگەیشتن بە تکنولۆژی پێشکەوتووی ڕۆژئاوا دەتوانێ ڕێگای چاکسازی ڕاستەقینەی ئابووری ڕێکبخا، کەواتە دەبێ لە بەدواچوونی بوارەکانی ئایینیو ئیدئولۆژیکی خۆ بپارێزین وەك یەکەمایەتی لە قۆناخەکانی دواتر دابنرێت، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە بێرژنێف بایەخێکی زیاتر بە کۆنترۆلی تەواوی حیزب دەداو پەرەپێدانی بەشی پێشەسازی بەرگریو پێداگری لەسەر پڕوپاگەندە و هاندانیان بە جێگای بەرهەڤ کردنی هاندەرە ماددییەکان یەکەمایەتی زۆرتریان پێدەدان. ئەم جۆرە جیاوازییانە گەیشتە شوێنێك لە ڕاستیدا بناغەی بەربەرەکانێی سیاسیو تاکە کەس پەرەی سەند، لە ساڵەکانی ١٩٦٤ هەتا ١٩٧٠ بۆ زاڵبوون بەسەر بواری سیاسەتی سۆڤییەت لەنێوان بێرژنێف لەلایەكو کاسکین لەلایەکیتر ڕویدا لەم نێوەشدا بێرژنێڤ بوو کە لەم بەربەرەکانێیەدا سەرکەوتوانە هاتەدەر و لە ساڵەکانی کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ دەسەڵاتی خۆی لە کاروباری دەرەکیو ناوخۆیی قایم کردو دەزگای دەوڵەتی خستە ژێر ڕکێفی حیزبەوە. ناوبراو لە پێوەندی لەگەڵ سیاسەتەکانی دەرەوە و نێوخۆیی سۆڤییەت شێوازێکی هەرە پارێزکارانەی گرتەپێشو، دوای تەقەلای سەرنەکەوتووی کاسکین بۆ جێبەجێ کردنی چاکسازی (١٩٦٤ـ ١٩٦٦) ڕێبازی سیاسیو ئیدئولۆژیی ئاستەمتری بەڕێوەبرد کە پێداگری لەسەر دیسیپلینی توند و ئەمەگناسو چاودێری حیزب بەسەر بوارەکانی ئابووری دەکردو هاندەرە مادییەکان کەمتر سەرنجی پێدەدرا.

لە ڕاستیدا بە دوای ئەم سیاسەتانە بوو کە شوورای نەتەوەیی ئابووری و کومیتەی ناوچەییەکانی پێوەندیدار لە هەموو ئاستەکاندا هەڵوەشانەوە و بێرژنێڤ جارێکی دیکە بەڕێوەبەریو پلان دارشتەکانی کۆکراوەی خرۆشچۆڤ کە ئەو وەلای نابوو هێنایەوە گۆڕێ. دوای ئەوە کۆمیتەی ناوەندی سەرلەنوێ پێکهاتەوە. ناوبراو لە ساڵی ١٩٦٥ بەم لاوە لە بواری سیاسییەوە زۆر دەدواو سڕینەوەی ئیستالینیزمی لە هەموو ئاستەکاندا یاساغ کرا. ئەم سەردەمە کە بە قۆناخی سەقامگیری و پاشان ڕاوەستان دەناسرێت؛ "لیبرالیزمی ئابووری" لە تەنیشت "سیاسەتی پارێزکارانە" سەرنجی پێ دەدرا، نەك گۆڕان لە بنچینەدا، هەروەها بێرژنێڤ لەنێوان ساڵەکانی (١٩٦٤ تاکو ١٩٨٢)دا سەرنجی بە بوارەکانی سەربازی و بەرگری دەدرا. لە ڕووی پێوەندییەکانی دەرەوەیشدا بێرژنێڤ قسەوباسێکی زۆری دەکرد، بە جۆرێك کە لە ماوەی دوو دەیەی دوای کۆنفرانسی یالتا (ساڵی ١٩٤٥) پێوەندییەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا زۆر بە توندی بەرەو کز بوون ڕۆیشت. دروستکردنی دیواری بەرلین لە ساڵی ١٩٦١و



قەیرانی مووشەکی کوبا لە ساڵی ١٩٦٢ لەو هۆکارانە بوون کە پەرەی بە ناکۆکی پێوەندییەکانی نێوانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا. بەلام لە نیوەی دووهەمی دەیەی ١٩٦٠ لە ئاکامی گوشارەکانی ئالکسی کاسیکین- سەرۆك وەزیری ئەوکاتی رووسیا کە لەلایەك خوازیاری باش کردنی پێوەندییەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا بووو لەلایەکی دیکەوە، بواری کەشێکی دیکە لە سڕینەوەی قەیران و لابردنی دوژمنایەتی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای لە دەیەی ١٩٧٠ ڕەخساند. بە جۆرێك کە بێرژنێف لە کۆنگرەی بیست و چوارەمی حیزبی کۆمۆنیست کە لە ساڵی ١٩٧١ لە مسکۆ بەڕێوە چوو لەسەر پێویستی گرتنە پێشی سیاسەتی توندتر لە کاروباری ناوخۆو نەرمی نواندنی زیاتر لە سیاسەتی دەرەکی، بەتایبەت لەگەڵ ئەمریکا پێداگری دەکرد.[١]

لەم دەیە بوو کە بێرژنێف ڕێبەری سۆڤییەت و هەروەها نیکسونو فۆرد ـ سەرکۆمارەکانی ئەمریکا، هەروەها برانت و ئەشمیت- ڕێبەرانی ئاڵمانی ڕۆژئاوا و... ڕێگای پێکەوە هەڵکردنو سڕینەوەی کێشەیان گرتەبەرو دوا بە دوای ئەمە کۆمەڵێك ڕێککەوتنامە لەنێوان ئەم کەسایەتیانە واژۆ کران، بۆ وێنە:

١ـ گرێبەستی سنوور دارکردنیو چاودێری بەسەر چەکە ناوەکییەکاندا و ئەو ئیستراتیژیەی کە لە ساڵی ١٩٧٢دا لە کاتی سەفەری نیکسون ـ سەرکۆماری ئەوکاتی ئەمریکا بۆ مسکۆ کە ئەم گرێبەستە بە "سالت یك" ناسراوە.

٢ـ گرێبەستی موشکگەلی دژە موشەکی وشکارۆ، ساڵی ١٩٧٢.

٣ـ ڕێکەوتننامەی دەستدرێژی نەکردنی ناوکی، ساڵی ١٩٧٣.

٤ـ ڕێکەوتننامەی "ولادی و ستوك" ڕێکەوتننامەی کۆتایی هلسێنکی، لە ساڵی ١٩٧٥و دانوستانەکانی (سالتی ٢) لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٧٦ـ١٩٧٩.

بە دوای ئەم گرێبەست و ڕێکەوتننامانەدا پێوەندییەکانی یەکیەتیی سۆڤییەت لەگەڵ ئەمریکاو ئەورووپا بەرەو باشی دەڕۆیشت. بەلام سێ ڕووداوی گرینگ لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧٩ـ ١٩٨١ پێوەندییەکانیان بەرەو خراپی بردو بووە هۆی ئەوەی ئەمریکاو سۆڤییەت جارێکی دیکە تووشی شەڕی سارد بن کە بریتی بوو لە:

---

(١) ئیلاهەی کۆلایی، یەکیەتی سۆڤییەت لە پێکهاتنەوە تا هەرەسهێنان (تاران: ئینتشاراتیو وەزارەتی کاروباری دەرەوە ١٣٧٦) لاپەڕەی ١٢٧.

١) رووخانی شای ئێران (١٩٧٨ـ ١٩٧٩)

٢) دەستدرێژی سۆڤییەت بۆسەر ئەفغانستان (١٩٧٩)

٣) سەرکوتی بزووتنەوەی هاوپێوەندی یەکیەتییەکانی ئازادی کرێکاری لە (هەنگاریا) لەهستان (١٩٨٠ـ ١٩٨١).

لە راستیدا چاوپێکەوتنەکانی بەرپرسانی کۆماری ئەمریکا و سۆڤییەت ـ بێرژنێڤ و کارتێر ـ لە ژووئەنی ١٩٧٩بە واژۆ کردنی پێش نووسی رێکەوتننامەی(سالّتی٢) کۆتایی پێهات و کۆتایی هێنەری دەورانی ناکۆکی و دەسپێکی هێدی بوونی پێوەندییەکانی رۆژئاواو رۆژهەلاّت بە ئەژمار دێت[1] یەکیەتی سۆڤییەت لە دەیەی ١٩٧٠ تووشی گۆڕانکارییەکی زۆر بوو، تا پێش ئەمە سۆڤییەت وەك ولاّتێکی تاك حیزبی دەناسرا، کە هەموو پێکهاتە بناغەییەکانی کۆمەلّگا وەك راگەیەنە گشتییەکان، دادگاکان، " سیستمی پەروەردەو تەنانەت یەکیەتی کرێکارانیش لەژێر چاودێری توندا بوون، پۆلیسی نهێنی وشیارو ترسێنەر چاودێری بەسەر هەموو ئەمانەدا دەکردو یاساکانیان بە تەواویی لە پەراوێز خستبوو، گۆڕانکاری لە سۆڤییەت تەنیا لە سەرەوە بۆ خوارێ، ئەویش بە هۆی لێکدانەوەی نوێ کە لە مارکسسیزم ـ لنینیزم دەکرا، کەواتە بواری رەخنە گرتن لە ئیدئولۆژی زالّ، یان دژایەتی کردنی بە شێوازی ولاّتانی فرە حیزبیو دێموکرات زۆر ئاستەم و تەنانەت نەگونجاو بوو، بەلاّم لە دەیەی ١٩٧٠ بەم لاوە ولاّتی سۆڤییەت لەحالّی تاقیکردنەوەی کەش و هەوایەکی نوێدا بوو. ئەم کەش و هەوا نوێیە ئاکامی وەرچەرخانێکی قوولّ بوو کە لە ئاست کۆمەلّگای سۆڤییەتو تەنانەت سیستمی نێونەتەوییدا رویدەدا. هەلّدێرە گشتییەکانی ئەم وەرچەرخانە دەرەکی و نێوخۆییانە بەسەر کۆمەلّگای سەرەڕۆیی لێدراویی سۆڤییەتدا بە توندی کارێگەریان بوو کە لە چەند دێری خوارەوە ئاماژەیان پێ دەکەین.

١) گۆڕانکاری و جێگۆڕکێ پێکردن لە رووی دێموگرافییەوە لەم ولاّتەدا، وەك کەم بوونی حەشیمەت لە گوندەکان و گەشە سەندنی شارنشینی، بەرزبوونەوەی چەندایەتیو چۆنایەتی کرێکارانی پێشەسازی، گۆڕانی حەشیمەتی سۆڤییەت لە هەمبەر بەرز بوونی رادەی تەمەنیان بۆ تەمەنی کەم کە زیاتر لە نیوەی خەلّکی سۆڤییەت لەژێر تەمەنی سی سالّیدا بوون، هەروەها

(١) یانی دارایی شەر. وەرچەرخانە سیاسییەکان لە یەکیەتی سۆڤییەت لە بێرژنێفەوە هەتا گۆرباچۆف، وەرگێڕانی هۆرموز هۆمایۆن پوور (تاران: ئینتشاراتی شۆڕشی ئیسلامی، ١٣٦٧)، ل ٩٥.



گەشە سەندنی لە رادەبەدەری حەشیمەتی نەتەوەکانی نێو یەکیەتیی سۆڤییەت کە لەنێویاندا نەتەوەی سلاڤ زۆرترو زووتر گەشەی کرد.

٢) ئازادی رادەربڕینو ئازادی هاتوچۆ لە ئووتی ١٩٧٥ لەلایەن بێرژنێڤ لەگەلّ هۆکارەکانی وەکو بەناچار واژۆ کردنی گرێبەستی هلسینکی و دەروەستبوون بە نێوەرۆکی رێکەوتننامەکان لەسەر بناغەی پاراستنی مافی مرۆڤ هەلّێکی رەخساند تا لە پێوەندی لەگەلّ پرسگەلی وەك مافی مرۆڤ، ئازادی تاك و کۆمەلاّیەتی لە سۆڤییەتدا راو بۆچوونی زیاتر بێتە گۆڕێ. لەم هەلومەرجە دایە کە خەلّکی سۆڤییەت خواستەکانی خۆیان وەکو برەودان بە دیموکراسی، ئابووری ئازاد، زانست و کولتوور لە چوارچێوەی دەسەلاّتی حیزبی دەسەلاّتداری نوێخواز لە بیچمگەلی کۆنی سۆڤییەت سەرنجی پێدەدەن، هەر چەندە کە هەولّی رووناکبیران بۆ جێبەجێ کردنی چاکسازی لەگەلّ بەربەرەکانێی توندی هێزە پاوانخوازەکانی حیزب و پۆلیسی نهێنی بەرەو روو دەبوو.

٣) لاواز بوونو دابەزینی کارتێکەری ئیدئولۆژیك کە خەلّکی سۆڤیەتی بە دوو دەستەی رازی و نارازی دابەشدەکرد، سەرنج نەدانی روو لە زیادی لەنێو خەلّك و بێمتمانەیی ئەوان بە بەلّێنییە هلۆلّ و یەك لە دوای یەکەکان لەمەڕ گەشەپێدانی خێرای ئابووری ولاّت و ئەم بێ باوەرییە خۆی دەیتوانی هۆکارێکی گشتی بێت بۆ پەرەسەندنی رۆژ لەگەلّ رۆژی رووناکبیری لەنێو خەلّكو نەتەوەکانی سۆڤییەت، بە جۆرێك لە دەورانی دوای خرۆشچۆف جیا لە پێکهاتەی رێکخراوگەلی سەربەخۆ لەنێو دەزگای حکوومەتی سۆڤییەت، توێژێکی بەربلاّو لە نارازیانو رووناکبیران پێکهاتن کە کۆمەلّگای سۆڤییەتی بە توندی خستە ژێر کارێگەری خۆیەوە.[1] ئەم رووناکبیرو نارزاییانە دەتوانین بەگشتی بە سەر چەند دەستە دابەشبکەین لەوانە:

ئەلف) رۆژئاواخوازەکان و لیبرالەکانی سۆڤییەت کە دژی ئیدئولۆژیکی مارکسیزم ـ لنینیزم و جۆری حکوومەتی ئیستالینی بوون، ئەم تاقمانە رێزیان بۆ ئازادییە پارلمانییەکان دادەناو لە روانگەی ئابوورییەوە، دژی سەرمایەداری کۆن بوون و پشتیوانیان لە سیستمە جۆراوجۆرە ئابوورییەکان دەکرد.

ب) گرووپە سۆسیالیستییەکان کە بە دوو لقی سۆسیالیستی مەسیحی ئەخلاقی دابەش دەبوون، سۆسیالیستە ئەخلاقییەکان بە گشتی لەژێر چەتری بیرۆکەی تولستۆیی بوون و بە رای

(١) هەمان سەرچاوە ١١٤ـ ١١١.

ئەوان کۆمەڵگای سۆڤیەت لەو کاتەوە کە گرینگی بە پرسە مۆراڵییەکان، نەداوە، بەرەو دواکەوتوویی رۆیشتووە. ئامانجی سەرەکی سۆسیالیستە مەسیحییەکان دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی لەسەر بنەمای برواو بەها کانی مەسیحیەتە.

ج) نەتەوەخوازان و ئیسلامییەکانیش کاریگەریەکی قووڵیان لەسەر گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگای سۆڤییەتدا هەبوو، تەگەرە نەتەوەییەکان لە هێندێك لە کۆمارەکانی سۆڤییەت سەریان هەڵدابووو دژی زمانی داسەپاوی رووسیو بە زۆر خوێندن لەنێو خوێندنگاو زانکۆکاندا بوون، ئیسلامییەکانیش بەردەوام لە بەرانبەر سیاسەتە دژە ئایینییەکانی مسکۆ نارەزایەتیان دەردەبڕی.

د) گرووپ گەلێکی دیکەی وەکو تاقمی داهێنان (ئەبتکار)و یەکیەتییەکان و رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پێکهاتن کە خوازیاری حکوومەتی یاساو بەهێز کردنی سیستمی یاساییو پێش گرتن لە ژێرپێنانی یاسا لەلایەن ناوەندە دەسەڵاتدارەکان و تێگەیاندنی خەڵك لە پێوەندی لەگەڵ مافە سەرەتاییەکانیان .

## گوتاری شەشەم: رێبەرە بەساڵدا چووەکان

### ئەلف. ئاندرەپۆف

دوای مردنی بێرژنێف لە نوامبری ١٩٨٢دا زنجیرە گۆڕانکارییەك لە رێبەری حیزبی کۆمۆنیست پێکهات رۆژێك دوای مردنی بێرژنێف "یوری ئاندرەپۆف" کە لە ساڵی ١٩٦٧ سەرۆکایەتی "کا. گ. ب"ی لە ئەستۆ بوو، بۆ رێبەری حیزبی کۆمۆنیست هەڵبژێرا. رێفورمی ئابووری ئاندرەپۆف مزگێنییەك بوو بۆ گۆڕانکاری گەورەتر، تایبەتمەندییەکانی سەردەمی دەسەڵاتی کورتی ناوبراو روون و بەرچاوە، لەم کاتەدا خەڵکیش ئاندرەپۆف وەکو رێفورمخوازو ئازادیخوازێکی گەورە لە قەڵەم دەداو بە روانگەیەکی ئەرێنی دەیانڕوانییە ناوبراو و راگەیەنەرەکان لە پێوەندی لەگەڵ خۆشەویستی ئەو بۆ کولتوورو ئەدەبیات، نوێخوازی و سەرنجدان بە رووناکبیران و تەنانەت دژبەرانی حکوومەت لە هەمبەر ناوبراو زۆر نوسراوەیان بڵاو دەکردەوە. ئەندەرپۆف بیری لە بەرنامەیەکی نوێی چاکسازی لە سیستمی سیاسی سۆڤییەت دەکردەوە. لایەنگرانی خوازیاری گۆڕانکاری لە بارودۆخی هەنووکە لە رێگای نوێ کردنەوە و هێنانی هێزی لاو بۆ ناوگشت ناوەندەکانی دەسەڵات بوون. ئەندەرپۆف لە شەستەمین ساڵەوەگەری دامەزراندنی یەکیەتیی سۆڤییەتی سۆسیالیستی گرینگی بە"پرسی ئاشتیو



کەمایەتییە نەتەوەییەکانی"دا، چونکە لەو کاتەدا ئەم پێش بینییە بەهێز بوو کە لە ئاکامی نەتەوەخوازی، مەترسی دابەش بوونی سۆڤییەت لە گۆڕێ دایە. هەروەها چاکسازی رێبەرانی سۆڤییەت لە بەرز بوونەوەی چاودێری ئەکتیڤی هێزی نیزامی و بەرگری وڵات، ئەوە بوو تا لەم رێگایەوە سۆڤییەت بتوانێت رۆڵی زاڵبوونی بەسەر خەریتەی سیاسی جیهاندا بپارێزێو لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رکەبەرایەتی بکا.

ئامانجی سەرەکی ئەندرەپۆف لە چاکسازییەکانی، پێشخستن و رزگار کردنی ئابووریی روو لە پاشکەوتوویی سۆڤییەت بوو. بەبێ ئەوەی کە یەکێتی ئیدئولوژیك و سیاسی دەستەو گرووپەکانی نێو حیزب بخاتە مەترسییەوە. پلانی ئەو بەربەرەکانی توندە لەگەڵ گەندەڵی ئیداری، هەروەها هێندێك داهێنانی بچووکی ئابووریە تاکو رادەی توانایی سیستم بباتە ئاستێکی بەرز. لەم راستایەدا یەکەمین پلانی ئەندرەپۆف پەیرەوی لە سیاسەتی بردنە سەرێی دیسیپلینو وەدرنانی مووچە خۆرانی بێ کەڵك و بێ توانا، هەروەها بەدوادا چوونی یاسایی ئەو کەسانەی لە بازاڕی رەشدا (ئازاد) کاریان دەکرد. ناوبراو لە سیستمی نێوخۆییدا پەرەی بە سەربەستی لەنێو ئیدارەکانداو لە بەشی جووتیاریشدا لەگەڵ میخائیل گۆرباچۆف دەستی بە پێکهێنانی گرووپە بەلێندەرەکان کرد. ئەندەرپۆف زۆر سەرنجی بە نوێ بیرکردنەوە و نوێخوازی لە پێشەسازیدا دەداو رەخنەی زۆر توندی لە بەرنامەی تۆکمەی دەوڵەتییەکان لە بواری ئابووری گرت، هەر بەم هۆیە لە دەورانی ناوبراو ماف و مووچەی کرێکاران زیاتر بە بەرهەمهێنانی نوێوە وە بەستراوە بوووە.و بەڕێوەبەران لە رووی سەرماگۆزاریو حەقدەست و یاری کردنی نرخ، دەسەڵاتێکی زۆرتریان وەدەستدەهێنا.

هەروەها هەر لەم دەورانەدا مژاری ناکوجێیی کەرتی تایبەت و بەرزبوونەوەی ئاستی پەروەردەییەکان، لێهاتووی لە بواری لێکۆڵینەوە بۆ بەدەستهێنانی پیشەسازی بچووکی تایبەت، باسی زۆر بەربڵاوی لێ کەوتەوە. رێفومەکانی ئەندرەپۆف شوێنەواری ئەرێنی لەسەر ئابووری سۆڤییەت بەجێ هێشت و ئاستی چەندایەتیو چۆنایەتی بەرهەمەکانی لە پانتاییەکی بەربڵاودا بردە سەرێ. لە سیاسەتی دەرەکیشدا ئەندرەپۆف رەوتی سرینەوەی کێشەی نێوان رۆژئاواو رۆژهەڵاتی گرتە پێشو بەریانی خۆی بۆ باشتر کردنی پێوەندییەکانی دەگەڵ ئەم دوو زلهێزە ئاشکرا کرد. نیشانەکانی باشتر بوونی ئەم پێوەندییە پێکهێنانی ئابلوقە ئابوورییەکانی رۆژئاواو دەستپێکردنی سەرلەنوێی وتووێژ بۆ چاودێری بەسەر مووشەکە وشکارۆ پێوەکان،

هەروەها ناوبراو زۆر هەوڵی ئەرێنیدا بوو بۆ باشتر کردنی پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپاو چین کە لە چاو هەوڵەکانی دیکەی سەرکەوتووتر بوو.[1]

### ب) چرننکۆ

پێش هەموو شتێك دەبێ بڵێین کە "کنستانتین چرننکۆ" پاش مردنی ئەندرەپۆف لە ساڵی ١٩٨٣ وەك سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت هەڵبژێرا، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە "میخائیل گۆرباچۆف" پیاویی جێیّ متمانەی ئەندرەپۆف بووو ناوبراوی بۆ جێگری خۆی دانابوو. گۆرباچۆف لاوترین ئەندامی دەفتەری سیاسی حیزب بوو کە لە ساڵی ١٩٨٠ بە تەواوەتی بوو بە ئەندام، لەم دەورانەدا لایەنگرانی بێرژنێف پشگیریان لە چرننکۆ دەکردو ئەویان لە گۆرباچوف پێ باشتر بوو، چرننکۆ خوازیاری بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی بێرژنێف بوو، لێك نزیك بوونەوەی کولتووری و ئیدئۆلۆژیکی لەگەڵ جەمسەری ڕۆژئاوا ڕەت دەکردەوە و ئەمەی بە خەیانەتێکی گەورە بە کۆمەڵگای سۆڤییەت لەقەڵەم دەدا، بەڵام ئەو نەیتوانی لە دەورانی ١٥مانگەی دەسەڵاتی خۆیدا ڕەوتی چاکسازی کە ئەندرەپۆف دەستی پێ‌کردبوو، رابگرێت.[2] بەڵام دەورانی نەخوشی چرننکۆ لە ژانۆیەی ١٩٨٥ دەستپێکرد مەیدانی بۆ گۆرپاچۆفی ٥٤ ساڵە کردەوە، تاکو لێهاتووی خۆی بۆ پۆستی سکرتێری پێشانبدات. لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠ ڕادەی دەسەڵات لە دەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی بەزیانی جەناحی لایەنگری بێرژنێف گۆڕانی بەسەر داهات و هێزی باڵی ڕیفۆرم خوازان زیاتر بوو، بەم جۆرە بوو کە گۆرباچۆف لە ڕەوانگەی دەفتەری سیاسی حیزبی کۆمۆنیستەوە لە بەرانبەر ڕکەبەرانیدا خۆشەویستییەکی زیاتری بەدەست هێناو لە کۆتایدا پاش سەکتەی چرننکۆ لە دیسامبری ١٩٨٤ بەڕێوەبردنی کاروباری حیزبی وەئەستۆ گرت.

### گوتاری حەوتەم: چاکسازییەکانی گۆرباچۆف

گۆرباچۆف لە سەرەتای ڕێبەریدا لەهەوڵی ئەوەدا بوو تاکو سیمایەکی دیکە لە خۆی پیشان بدات، ناوبراو بە پێچەوانەی ڕێبەرانی دیکەی سۆڤییەت بەردەوام دەچووە ناو خەڵك‌و سەردانی کێڵگە هاوبەشەکان و کۆمپانیاکانی دەکرد. گرینگی دان بە هۆی پاشکەوتووی ئابووری، بە یەکەمین کارەکانی بە ئەژمار دەهات. لە یەکەمین ئاخاوتنی خۆیدا لە کومیتەی ناوەندی حیزب

(١) دارایی شەر، پێشوو لاپەرەکانی ١٠٧ ـ ١٠٥.

(2) Richard sakwa, Soviet Politics, (London: Routledge, 1989), P. 25.



پێویستی جێبەجێ کردنی چاکسازی و جەختی لە سەر بەدواچوونی سیاسەتی چاودێری بەسەر چەك و چۆڵدا دەکرت. گۆرباچۆف لە کتێبی خۆی بە ناوی "پرسترویکا" کە لە مانگی نوامبری ١٩٨٧ بڵاو کرایەوە لە پێوەندی لەگەڵ ئەم پێویستییە ئەڵێت "کۆمەڵگا لەگەڵ کومەڵێك پرس ڕووبەڕوو بووە کە پێشی بە توانایەکانی گرتووە" شکستە یەك لە دوای یەکەکانی ئابووری کێشەکی زۆری لە سەریەك کەڵەکە کردووەو بارودۆخەکە بەرەوو خراپی ڕۆیشتووە، جۆری مکانیزمەکانی نەگونجاو ئاستەنگە لە بەر دەم پێشکەوتنی پلانە ئابووری‌و کۆمەڵایەتییەکان، هەمووی ئەم گەندەڵییە لە دەورانێك بیچمی گرتووە کە شۆڕشی تێکنۆلۆژی، دەروازەیەکی نوێی بۆ پەرپێدانی کۆمەڵایەتی ئابووری کردووەتەوە"[1].

گۆرباچۆف درێژەی بە بەرنامە چاکسازییەکانی ئەندرە پۆفدا، ئەوەیش بگوترێ کە لە ساڵی ١٩٨٥دا دوازدەیەمین پلانی پێنج ساڵەی ئابووری بە مەبەستی ئامانجی بەرز فڕانە چووە قۆناخی جێبەجێ کردنەوە، گەشەی چوار لە سەدی ئابووری بۆ وەڵاتێك کە تووشی دواکەوتووییەکی توند ببوو ئامانجی سەرەکی ئەم بەرنامەیە ڕاگەیاندرا. هەروەها ئەم بەرنامەیە بۆ بردنە سەری توانایی کرێکاران، کەڵك وەرگرتن لە تێکنۆلۆژی پێشکەوتوو، سەرمایە گوزاری بۆ توێژینەوەی زانستی و زیاد کردنی بەرهەمهێنان بوو[2].

بیست و حەوتەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیست لە ساڵی ١٩٨٦ وەکو نوێنگەی بەرنامە چاکسازییەکانی ڕێبەری سۆڤییەت بۆ چاکسازی لە کاروباری ئابووری‌و سیستمی بەڕێوەبەری وڵاتدا بوو. ئەم کۆنگرەیە دوای کۆنگرەی بیستەم لە ساڵی ١٩٥٦و کۆنگرەی بیست و دووهەم لە ساڵی ١٩٦١دا بێگۆمان لە دیارترین کۆنگرەکانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت بوو. ڕەنگە وەکو کۆنگرەی گۆرباچۆف یاد بکرێت. لەم کۆنگریەدا گۆرباچۆف ٥ کاتژمێر لەمەڕ کەم‌کاری و گەندەلییەکانی دەورانی حکوومەتی بێرژنێف بەبێ ئەوی کە ئاماژە بەناوی بکا، دووا. پاشان باسی لە پێویستیی زنجیرە چاکسازییەکی بناغەیی لە سیستمی ئابووری وڵاتدا کرد، دەیگوت کە گۆڕانکاری ڕواڵەتی هیچ کێشەیەك چارەسەر ناکات.

(١) میخائیل گۆرباچۆف، پرسترویکا، وەرگێرانی عەبدولرەحمان سەدریە (تاران بڵاو کراوەی ئاویی، ١٣٦٦) لاپەڕەی ٢٩.

(2) Andrss Aslund, Gorbachevs studdle For Reform, (n. Y: Cornel universitypres, 1989), p. 20

گۆرباچۆف بەڵێنیدا کە هەمووی ئەو چاکسازییانەی لە چوارچێوەی سۆسیالیزمدا جێبەجێ بکات. کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەتیش نۆزدەهەمین کۆنفرانسی سەرانسەری خۆی لە ژووئیەی ١٩٨٧دا بۆ توێژینەوە لەسەر چاکسازییەکانی گۆرباچۆف پێکهێنا. گۆرباچۆف لەم کۆنفرانسەدا راپۆرتێکی تێروتەسەلی لەسەر بارودۆخی نا ئارامی ئابووری سۆڤییەت پێشکەش کردو دوای دانپێدانان بە دواکەوتوویی ئەم وڵاتە بە راشکاوانە باسی لەوە کردکە بەربەرەکانی لە بەرامبەر چاکسازییەکانی ناوبراو دەکرێت و رەخنەی لەو کەسانەی گرد کە کارشکێنی دەکەن و زیاتر لە بیری بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان دان. گۆرباچۆف لە کۆتایی ئەم راپۆرتەدا چوارچێوەی ئابووری خۆی، بەم شێوەیە پێشنیار کرد[1].

١) ئەسپاردنی دەسەڵاتی زیاتر و پێدانی خۆبەرێوەبەری بە یەکە بەرهەم هێنەرەکان و لە پێش گرتنی سیاسەتی ناکۆجێیی ئابووری، ئازادی لە کڕین و فرۆشتنی بەرهەمەکان و کەرەستەکانی دروستکراو هەروەها دیاریکردنی حەق دەست لەسەر بنچینەی هەر یەکێکی بەرهەمهێنان.

٢) گرینگیدان بە خۆشگوزرانی خەڵك و بەرز کردنەوەی رێژەی کەرستەکانی بەکارهێنان و لەسەرەوەی هەموان دیاریکردنی سیستمی نرخەکان لەسەر بناغەی بووژانەوەی ئەرز، داواکارییەك لەژێر تیشکی ئەودا رەنگە هانەی چەندایەتی کەرستە بەرێتە سەرێ.

لەم رووە بوو کە گرێبەستی کۆتایی ئەم کۆنفرانسە ئەو خاڵانەی خوارەوەی پەسند کرد.

١) ئەنجامدانی چاکسازی سیاسی هەروەها پێدا چوونەوە بە پێکهاتەی دەوڵەت و حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت، دابەشکردنی ئەرکەکان لەنێوان حیزب و شووراکان، لە پێش گرتنی رێگا دێموکراتیکەکان لە پێوندی لەگەڵ نەتەوەکانی سۆڤییەت و دروستکردنی پێوەندی نزیکی رێبەرانی حیزبی کۆمۆنیست لەگەڵ خەڵکی ئەم وڵاتە، کەمکردنەوەی خولی بەرێوەبەری بەرێوەبەرانی سیاسی بە دوو دەورەی پێنج ساڵەو لە سەرەوەی هەموویان پێداگرتن لەسەر "گلاسنوست"و بارودۆخی کراوی سیاسی.

٢) خەبات لەگەڵ بۆرۆکراسی یان دیوانسالاری تاك و بێکەڵك، هەروەها پێویستی چاکسازی (ریفورم) لە داد و ناوەندەکان، رەخساندنی بواری پێویست بۆ بەجێ گەیاندنی "پرۆسترویکا"و نوێکردنەوەی ئابووری یەکیەتی سۆڤییەت.

(١) مەحموود تلوعی، لە لێنینەوە تا گۆرباچۆف، (تاران: ئینتشاراتی تاران، ١٣٧٠) لاپەڕەکانی ٣٦٢ ـ ٣٥١.



٣) هەروەها لەم کۆنفرانسەدا بڕیار درا کە چاکسازی بۆ لەنێو بردنی شك و گومان لە دابەشکردنی دەسەڵات لە یاسای بنەڕەتی جێبەجێ بکرێت[1]. لەم پێناوەدا لە دیسامبری ١٩٨٨ یاسای بنەڕەتی یەکیەتی سۆڤییەت بە شێوەی فەرمی چاو پێدا خشێنرایەوە بەپێی ئەم پێداچوونەوەیە گۆڕانکاری لە پێکهاتەی دەوڵەتی و سسیستمی پارلمانی، هەروەها یاساکانی هەڵبژاردنی ئامانجی سەرەکی چاکسازی یاسای بنەڕەتی نوێی پێکدەهێنا. لەم یاسای بنەڕەتییەدا هەڵبژاردن بوو بە رکەبەری و سیستمی دادوەری ئەو وڵاتە تا رادەیەك سەربەستی بەدەستهێنا. یاسای نوێی هەڵبژاردن لە چوارچێوەی جێبەجێ کردنی سیاسەتەکانی گلاسنۆست کە بریتی بوو لە هێندێك گۆڕانکاری بناغەیی بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

ئەلف) دەنگدانی نهێنیو ناساندنی پاڵێوراوەکانی هەڵبژاردن، زیادە کردنی ژمارەی پاڵێوراوەکان، پێویستی بوونی هەلومەرجی بەرامبەر بۆ هەموان.

ب) بەرێوەبردنی هەڵبژاردنی فرەپاڵێوراویی.

ج) هەڵبژاردن لە رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان و دابەشکردنە ناوچەییو جۆغرافیاییەکان، بوونی مافی پروپاگەندە بۆ هاوڵاتیانو بوونی نێو زێدە یەك لە سەدی دەنگەکان بۆ سەرکەوتن.

هەروەها لە دیسامبری ١٩٨٩و مارسی ١٩٩٠ چاکسازیگەلێك لە یەکیەتی سۆڤییەت پێکهات، بۆ وێنە پێکهێنانی سیستمی فرە حیزبی، پەرەپێدانی ناوەندی هەڵبژاردنی راستەوخۆ و پەرەپێدانی مافەکانی پێوەندیدار بە خاوەندارێتی تایبەتیو سەرمایەگۆزاری. لەسەر ئەم ئەساسیە کە لە کۆتایی ١٩٩٠دا گۆرباچۆف و یەلتسین- سەرۆکی ئەوکاتی شوورای باڵای سۆڤییەت و بەپێی هەنگاوێکی هاوبەش بۆ کۆکردنەوەی بەرنامەیەك بۆ دانانی بەشی کەرتی تایبەت و سیستمی ئابووری نا حکوومی، هەروەها بە دوای ئەم هەنگاوە هاوبەشە بوو کە گەڵاڵە یان رێفۆرمی ٥٠٠ رۆژەی ناسراو بەم رێسایانەی خوارەوە تۆمار دەکرێت[2].

١) پەلە لە تایبەتی کردنی خاوەندارێتی دەوڵەتی و کەڵك وەرگرتن لە نەختینەیی راگیراو.

٢) هەڵوەشاندنەوەی سوبسیدەکان و دامەزراندنی بارودۆخی بەکرێدان لە هەموو بوارێکدا.

(1) Berendan Kiernan, The End of Soviet Polites, (Boulder: Westview Press, 1993), P.44.

(2) Richard. Sakwa. Gorbachvand his Redorms, (combridge: bhilip Allan, 1990), pp.133 – 141

٣) خۆ بواردنی تەواوی حکوومەت لە کۆتنرۆڵکردنی نرخەکان و فرۆشتنی خواردەمەنی لە ڕێگای کۆپپینەوە.

٤) لابردنی بە پەلەی سیستمی هەنووکە، دانانی دزگای شیاو بە جێگای ئەوانە.

هەر بەو جۆری کە ئاماژەمان پێکرد گۆڕانکاری لە یەکێەتی سۆڤییەت نەك هەر لەژێر گوشاری لەکار کەوتەیی سیستمی ئابووری ئەم وڵاتە بوو بەلکو هەڵقوڵاییی گۆڕانکاریی گەلێك بوو کە لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و کولتوورییەوە سەرچاوەی دەگرت، گرینگترینی ئەم گۆڕانکارییانە دەتوانین بەم شێوەیە دابنێین:

١) گەشەسەندنی چینی مام ناوەندی لە ئاکامی بەرزبوونەوەی حەشیمەتی شاری، بە جۆرێك لە دەورانی خرۆشچۆفدا هێشتا زۆرینەی کۆمەڵگای سۆڤییەت گوندنشین بوون بەڵام لە دەیەی ١٩٨٠دا دوو لە سێی حەشیمەتی تەواوی وڵات لە شاردا ژیانیان دەکرد، ساڵی ١٩٥٩ تەنیا سێ شار حەشیمەتیان پتر لە یەك ملیۆن کەسی بوو بەڵام لە ساڵی١٩٨٥ئەم ژمارەیە گەیشتە سیو دوو شار[1].

٢) پەرەگرتنی چەندایەتیو چۆنایەتی ڕاگەیەنە گشتییەکان، بە جۆرێك لە دەورانی خرۆچۆف کەمتر لە یەك لە سێ خەڵك خاوەنی تەلەفیزیۆن بوون. بەڵام لە دەیەی ١٩٨٠ کەڵك وەرگرتن لەم ڕاگەیەنە گشتییانە گەیشتە هەموو شوێنەکانی وڵات. بەڕێوەبردنی بەرنامەی ناسراو بە گلاسنوست بووە هۆی ئەوە تاکو چالاکی سینەماو تیاترو ڕاگەیەنە گشتییەکان دوای نزیکەی ٧٠ ساڵ چاودێری توندی حیزبی کۆمۆنیست لە کەشێکی ئازادتردا جێبەجێ بکرێت.

٣) بەرزبوونەوەی چونەیەتیو چەندایەتی ئاستی پەروەردە، بە جۆرێك کە خەڵکی سۆڤییەت لە ساڵی ١٩٨٩ زیاتر لە دوو لە سێی خوێندەواری ناوەندیان نەبووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٦ هەر ئەم ڕادەیە خاوەنی خوێندەواری مامناوەندی بوون، لەگەڵ ئەوەدا کە لە ساڵی ١٩٥٩دا نزیکەی ٥/٥ ملیۆن کەسی خوێندواری بەرزیان بوو بەڵام ئەم ڕێژەیە لە ساڵی ١٩٨٦ گەیشتە ٢٤ ملیۆن کەس.

٤) بەرزبووەنەوەی حەشیمەتی لاوی ئەم وڵاتە، هەروەها دابەزینی ڕادەی تەمەنو بیچمگرتنی لێڕوانینی نوێ لە مەڕ کۆمەڵگا.

لەوەو بە دواوە هەوڵدەدەین هێڵە گشتییە چاکسازییەکانی گۆرباچۆف بە وردی باسیبکەین:

(1) Gail Lopius, statend cociety, in Dallin and lappidus The soriessystem in crisis, p. 134



**١) پروسترۆیکا**

گۆرباچۆف یەکەمجار وشەی پروسترۆیکای لە ئاوریلی ١٩٥٨ هێنایە گۆڕێ و مەبەستی ناوبراو لە نوێکردنەوەو چاکسازی بنچینەیی لە پێکهاتەی ئابووری وڵاتی سۆڤییەتدا بوو. گۆرباچۆف ئیدئولۆژی پروسترۆیکای بە بیرۆکەی ئەندێشەکانی لنیین لەقەڵەم دەدا و بە ئاماژە بە سیاسەتەکانی نوێی ئابووری ناوبراو پێداگری لە سەر درێژەدانی ئەم ڕێگایەی دەکرد. بنەماکانی پروسترۆیکای گۆرباچۆف بریتی بوون لە، گۆڕانکاری خێراو بنچینەیی لە پێکهاتەی ئابووری وڵات، سڕینەوەی ناوەندگەرێتیو سەرمایە گۆزاری ئابووری، هاوئاهەنگی ئابووری وڵات لەگەڵ ژیاندنەوەی ئابووری، زانستیی تەکنیکی وڵاتانی سەرمایەداری ڕۆژئاوا بە هاتنی سۆڤییەت بۆ بازارەکانی جیهانیو پەیوەست بوون بە ئابووری نێوەنەتەوەیی، بەرزبوونەوەی چۆنایەتی بەڕێوەبەری ئابووریو بەدەستهێنانی تکنۆلۆژی پێشکەوتوو جێگۆڕکێی سەرمایەگۆزاری ئابووریو هاندانی بەشی کەرتی تایبەت و کۆگەل، هەروەها برەودانی بازرگانی تایبەتیو هەڵوێستی ناوچەیی و... . گۆرباچۆف خۆی لەم پێوەندیەدا دەڵێت:

"پروسترۆیکا بەم واتەیە کە سەرکەوتوو بین بەسەر ڕاوەستانداو ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی تەگەرە لەسەر ڕێگا لایانبەرین. پروسترویکا بە واتای داهێنان و ڕەخساندنی دەرفەتە بۆ کۆمەڵانی خەڵك و ڕێوشوێنێکە بۆ پێگەیشتوویی کۆمەڵایەتی ـ ئابووریی زیاتر! پروسترۆیکا بە واتای پاراستنی دیسیپلین و ڕەخنەگرتن لەخۆ لە هەموو بەشەکانی کۆمەڵە پێگەیشتوویی دێموکراسی لەسەر پایەکی بەربڵاو، خۆبەڕێوە بەری سۆسیالیستی، ریزگرتن لە تاك گەرایی ئەرێنی و گرینگیدان بە کەسایەتی مرۆڤ و..... تایبەتمەندی گرینگی پروسترۆیکا ئەوەیە کە سۆسیالیزم و دێموکراسی پێکەوە گرێدەدا ..... "[1]

هەروەها گۆرباچۆف دەڵێت؛ "پرۆسترۆیکا شۆڕشێکە، شۆڕشێکی زۆر ئاشتی خوازانە و دێموکراتێك ..... لە کۆمەڵی ئێمەدا هێچ توێژێکی گەورە بوونی نییە کە خواستە درێژخایەنەکانی لەگەڵ پرۆسترۆیکا لە دژایەتیدا بێت..... ئێمە هی سەردەمی خۆمانین، سەردەمی خۆو ڕەوشتەکان و ئەندێشەیەکی یەك لایەنی، بەم هۆیە دەڵێم کە دەبێ هەمووان بگۆڕدرێین ... . "[2]

(١) میخائیل گۆرباچۆف، پروسترۆیکا، وەرگێرانی عەبدلرحمان سەدریە (تاران: بڵاوکراوی ئاویی، ١٣٦٦) ل ٤١.

(٢) گۆرباچۆف، پێشوو لاپەرەکانی ٩٧ ـ ٩٦.

## ٢ـ گلاسنۆست

گۆرباچۆف لە پێناو چاکسازییە ئابوورییەکەی بۆ پەرەپێدانی دیموکراسی کەشو هەوای کراوەی سیاسی هێنایە بەرباس و ئەمەی بە گلاسنوست ناساند، ناوبراو لەمبارەیەوە دەڵێت، "پروسترۆیکاش تەنیا لەسەر بنەمای دیموکراسی ئیمکانی دەبێت ..... ناکرێت جیا لە ڕێگای دیموکراسی هاوپێوەندی لەگەڵ ڕێوشوێنی ئابووریی پێشکەوتووو بەڕێوەبەری بە توانا، ڕێگایەکی دیکە بپێوین ..... بۆ پێکهێنانی گۆڕانکاری بنەڕەتی لە یەکێتی سۆڤییەت دەبێ بە هەموو هێزەوە، دیموکراسی چالاك بکرێت[1]، گۆرباچۆف هەروەها دەڵێت "ڕۆژئاواییەکان وا دەزانن کە لنیین لایەنگری حکوومەت سالاری سەرەڕوویانە بوو لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونە پێشاندەری ناشارەزایی تەواو لەسەر لنیینیزم و لەوانەشە هەڵگری خواستێکی ئاگایانە بۆتە شك و گۆمان و بەراوەژووو پێشاندانی ئەم ڕێبازەیە. لە حاڵێکدا بەپێی بۆچوونی لنیین سۆسیالیزم و دیموکراسی لە یەکتر جیا ناکرێتەوە لەم بوونەدا تەنیا لە ڕێگای بەدەستهێنانی ئازادی و دیموکراسییەوەیە کە کۆمەڵانی کرێکارو زەحمەتکێش بە دەسەڵات دەگەن و سەقامگیری دەکەن..... ئێمە لە کۆبوونەوەی ژانویەی ١٩٨٧دا زۆر تێکۆشاین تاکو بناماکانی دیموکراسی لە سۆڤییەتدا بەهێز بکەین. خۆگەردانی بکەین بە ڕێوشوێنی خۆمان، ئازادی بەیان لە هەموو ناوەندە ئیدارییەکان پەرە پێبدەین ..... ئێمە دەخوازین ڕاشکاویی لە هەموو کاروباری گشتیو تاکیدا هەبێت. خەڵك دەبێ بزانێت چ شتێك باشە چ شتێك خراپە، تاکو پەرە بە بەشەکان بداتو دژایەتی لەگەڵ خراپەکان بکاتو...[2] بە بۆچوونی گۆرباچۆف بەڕێوەبردنی گلاسنۆست پێویستییەکی گرینگە بۆ باشتر بەڕێوەبردنی پروسترۆیکا، بەم جۆرە پلانگەلی ناسراو بە گلاسنۆست دەرفەتێکی بەر بڵاو بۆ سڕینەوەی ئیستالینی لە کۆمەڵگای سۆڤییەتیدا ڕەخساند. چونکە گلاسنۆست بایەخی بە بەشداری کردنی سیاسی و مافە بنەڕەتییەکانی خەڵك لە سیستمی سیاسی وڵات دەدا. بە شێوەی جیدی قۆرخ کردنی سیاسی لە حیزبی کۆمۆنیستدا دەخستە مەترسییەوە زۆربەی بژاردەکان و "نومنکلاتورا"ی نیگەران و شڵەژاند بوو.

گۆرباچۆف خۆی لەمبارەیەوە دبێژێت. "ئەمانهەوی جارێکی تر جەخت لەسەر کەش و هەوای کراوەی سیاسی بکەین، ڕەخنەگرتن و ڕەخنە لە خۆمان بۆ حیزبی ئێمە وەك یاری

(1) Sakwa, Gorbachevand his Redorms, P. 65.

(٢) گۆرباچۆف، پێشوو ـ لاپەڕەی ٩٨.



دیموکراسی منالآنە نییە بەلکو کردەیەکە بنەمای گرینگی هەیە. لەم کەشو هەوایەدا ڕێگایەك دەبینین و تێیدا ڕوانگەگەلی جیاواز بەدی دەکرێ، کە لەواندا ویستەکانی هەموو چین وگرووپەکانی وڵاتی سۆڤییەت ڕەنگدانەوەی دەبێت.... ناتوانین دیموکراسی بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئەم ڕێگایە وێنا بکەین... . پێویستە تەوەزەلەکان، هەڵپەرستان، بەرژەوەندیی خوازان، فریودەرانی خەڵك و کەسانێك ڕەخنە سەرکوت دەکەن، دەستیان ئاوەڵا نەبێ...[1]

جێگەی باسە کە تاکو دەیەی ١٩٨٠ حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت لە هەلومەرجێکی داخراودا بەبێ ڕکەبەر چالاکی دەکرد بەلام لە دەیەی ١٩٩٠ لەگەڵ کۆمەڵێك ڕکەبەری گەورەو بچووك ڕووبەڕوو بووەوەو ئەمە لە ڕاستیدا یەکێك لە بەرەنجامەکانی گلاسنۆست یان کەشو هەوای کراوەیی سیاسی بەپێی خواستی گۆرباچۆف لە نیوەی دووهەمی ١٩٨٠دا بوو. بە جۆرێك کە لە کۆتایی ١٩٨٨ نزیکەی ٦٠ هەزار ئەنجوومەن و گرووپی سیاسی کە بریتی بوون لە ڕێکخراوە حکوومیو ناحکوومییەکان لە سۆڤییەتدا هاتنە ئاراوە و تاکو دوو ساڵی دواتر ١١ هەزار گرووپی دیکەشی پێ زیاد بوون کەبەرچاوترینیان بریتین لە[2]: ڕووناکبیرانی لایەنگری ڕۆژئاوا، سۆسیال دیموکراتەکان و ئیسلام خوازان، ئیستالینییە نوێیەکان و....

## ٣ـ خەڵك سالاری و حکوومەتی یاسا

ساڵی ١٩٩٠ حیزبی کۆمۆنیستی بیست و هەشتەمین کۆنگرەی خۆی بەست. لەم کۆنگرەیەدا پێداگریان لەسەر دەسەڵاتی یاسا دەکرد و بایەخێکی زۆرتریان بە پرسە سیاسییەکاندا، گۆرباچۆفیش لەمبارەوە دەڵێت: "پارێزگاری کردن لە مافەکانی مرۆڤو دەسەڵاتی یاسا بۆ ئێمە چارەنووس سازە لە نەبوونی ئەمانەدا دیموکراسی تراوێلکەیەك زیاتر نییە چونکە لەبەرچاو گرتنی مافەکانی مرۆڤ سەقامگیری سیستمی یاسا خەڵك لە بەرانبەر دەسەڵاتخوازیی دەسەڵات و پاوانخوازی دەسەڵاتبەدەستان دەپارێزێت و ماف و ئازادییە مەدەنییەکانیان گەرانتی دەکات... . یاسا دەبێ پێداویستییەکانی کۆمەڵگا بە باشی وەدی بهێنێت و دەرفەتی داهێنان و هاوپێوەندی بۆ هاووڵاتیان هەبێ. کە واتە ئێمە بەم ئەسڵە پابەند دەبین کە هەمووکارێك ئازادە جیا لەوانەی کە یاسا پێشی پێ گرتووە.[3]

(١) هەمان چاوگ، لاپەڕەکانی ١٠٣ ـ ١٠٣.

(2) Sakwa, op. cit, 66.

(٣) گۆرباچۆف، پێشوو، لاپەڕەی ١٤٢

له راستیدا بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی فرە پاڵێوراوی جیا کردنەوەی کاری حیزب لە چۆنییەتی کاری ئیدارەکان، کەم کردنەوەی دەسەڵاتی کا. گ. ب‌و هەروەها سەرنجدان بە مرۆڤایەتی و مافەکانی مرۆڤ، پێداگری لەسەر دەوڵەتێکی سۆسیالیستی یاسایی و پێکهاتنی کۆنگرەی نوێنەرانی گەل، دانانی پۆستی سەرۆك کۆماری و کۆمەڵێك شتی تر لەم پێوەندیەداو لە چوارچێوەی بەرنامەکانی گلاسنۆست و خەڵك سالاری‌و دەسەڵاتی یاسایی گۆرباچۆف پێویستی بە هەڵسەنگاندنە. ناوبراو لە بارەی گرینگیدان بە توانایەکانی مرۆڤ دەڵێ: ئەگەر مرۆڤێك نەژینێینەوە، یان ئەگەر لێهاتوویە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤەکان، خواستەکانی کرێکاران‌و ناوەندە و رێکخراوەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی سەرنجی پێ نەدرێت، ئەوان بۆ هاوکارییەکی باش هانندەدەین هیچکات سەرکەوتوو نابین تەنانەت یەکێك لەو ئەرکانەی کە خۆمان داماننابوو جێبەجێ بکەین چ بگات بە پێراگەیشتن بە بارودۆخی وڵات....[1]

گۆرباچۆف نەك هەر بە دەستەوە گرتنی پۆستی سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیست‌و سەرۆکایەتی پرزیدیۆم و دەسەڵاتەکانی سەرچاوە گرتوو لە دەستەی بەڕێوەبەریی شوورای باڵای بۆ خۆی بە کەم دەزانی، بەلکو کۆنگرەی نوێی نوێنەرانی گەلیش کە پارلمانێکی هەمیشەیی پەسند کردبوو گۆرباچۆفی وەك سەرۆکی دەسەڵاتداری شوورای باڵا دەستنیشان کرد. بەو حاڵەش گۆرباچۆف بەرەوپێشبردنی چاکسازییەکانی خوازیاری دەسەڵاتی زیاتر بوو. تا شوێنییەك کە لە فێورییەی ١٩٩٠پلۆنۆم یان دەفتەری سیاسی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت پێشنیاری گۆرباچۆفی بۆ پێکهێنانی پۆستی سەرۆك کۆماری بە دەسەڵاتێکی زیاترەوە پەسند کرد. لەم رووەوە زیاتر بوونی دەسەڵاتی سەرۆك کۆماری لە گەورەترین گۆڕانکاییەکان بوو کە رێبەری سۆڤییەت لە سیستمی سیاسی ئەم وڵاتە پێکی هێنا، حیزبی کۆمۆنیستیش کۆنترۆڵی خۆی بەسەر چاودێری کادرەکان و دیوانسالاری حکوومەتی لەدەست دابوو. لە راستیدا گۆرباچۆف بە هۆی بەهێز کردنی شوورای باڵاو دواتر بە پێکهێنانی پۆستی سەرۆك کۆماری هێز و کۆنترۆڵی راستەخۆی حیزبی لەسەر ژیانی سیاسی وڵات کورت کردەوە و ئەمە بێگومان دژایەتییەکی توندی پارێزکارانی لێکەوتەوە. لە مانگی ژووئیەی ساڵی ١٩٩٠دا حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت

(١) هەمان چاوەگ، ل ٣٣ .



بیست و هەشتەمین کۆنگرەی خۆی بە بەشداری ٤٩٥٧ نوێنەری لە مسکۆ بەڕێوە برد. ئەم کۆنگرەیە بە خاڵی وەرچەرخان لە مێژووی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت بە ئەژمار دێت. لەم کۆنگرەیەدا کۆمەڵێك لە نوێنەران بۆ یەکەمجار رەخنەیان لە سیاسەتەکانی سکرتێری حیزب دەگرت و تەنانەت هێندێکیان بە نیشانەی نارەزایەتی لە سیاسەتەکانی حیزب لە ئەندامیەتی خۆیان کشانەدەوە. بەو حاڵەش زۆربەی هەرە زۆری کۆنگرە سەرلەنوێ گۆرباچۆفی وەکو سکرتێری گشتی حیزب هەڵبژارد. گرینگترین بڕیارێك کە لەم کۆنگرەیەدا درا، گۆڕانی پێکهاتەی دەفتەری سیاسی حیزب و کەم کردنەوەی دەسەڵاتیان بوو. بەپێی ئەم بڕیارە دەفتەری سیاسی حیزب کە نوێنەری رێکخراوە کۆمۆنیستەکانی ١٥کۆماری یەکێەتی سۆڤییەت تێدا ئەندامیەتیان هەبوو زیاتر رۆڵی هاوئاهەنگ کردنی کاروباری نێوخۆیی حیزبیان دەگێڕاو سکرتێری گشتی تەنیا لە هێندێك بواری پێویست راپۆرتی دەناردەوە بۆ کۆمیتەی ناوەندی.[1]

### ٤ـ ئەندێشەی نوێ

گۆرباچۆف بەشێکی زۆری کتێبی "پرۆسترۆیکا"ی خۆی بە ئەندێشەی نوێ (اندیشه نوین) تەرخانکرد، ناوبراو لەم بەشەدا باس لە گۆڕانکارییەکی قوول لە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤییەت دەکا، رێوشیوێنە بنەڕەتیەکانی گۆرباچۆف ناسراون بە ئەندێشەی نوێ، دەتوانین لە چەند دێری خوارەوەدا بە کورتی باسیان بکەین:

١) گرێدراویی لە رادەبەدەری بە جیهان و پێداگری لەسەر هاریکاری کردنی نێونەتەوەیی، بە جۆرێك کە گۆرباچۆف لە کتێبی پرۆسترۆیکا دەڵێت، "ئەمڕوکە سۆڤییەت بە تەنیا ناتەوانێ پرسەکانی خۆی چارەسەر بکات و ئەوە شەرم نییە کە خوازیاری هاوکاری نێونەتەوەیی بیین. بە شارەزایی تەواو لە ریسالەتمان و بێ هەر چەشنە تێبینییەك دەبێ بڵێم کە هەمووان ئەمڕۆ لە جیهان زیارتر پێویستمان بە هاوکاری یەکتر دەبێت. پێویستی لێك نزیك بوونەوە خێرا لە زیاد بوون دایە... . ئێمە ئەمڕۆکە بەجیا نەبوونەوەی تەواوی جیهان‌و پێویستی یەکخستنی هەموو پێداویستییەکان بۆ تەناهی و مانەوەمان و دوارۆژی مرۆڤایەتی دەبێ زیاتر هەولبەدەین....[2]

(١) تلووعی، پێشوو ل ٣٧٧.

(2) M. s Gorbacheh. Porestroika (Newyork: cons, 1987), p. 186.

٢) پێویستی دامەزاندنی نەزمێکی نوێی جیهانیو مەترسی لەمەڕ کەڵك وەرگرتن لە چەکەناوکییەکان وەك ئەوەی گۆرباچۆف لەم بارەوە دەڵێت: "... . دەبێ بە شێوەیەکی دیکە لە راستییەکانی ئەمڕۆکەی جیهان بگەین و بە هەستیارییەوە هەڵسوکەوت بکەین، بە دەستپێکی دەورانی ناوکیو کەڵك وەرگرتن لە هێزی سەربازی لەوانەیە مرۆڤ ژیانی هەرمانی لەدەست بچێو مەترسی لەناوچوونی بەم چەکانە لە ئارا دایە ... . رکەبەرایەتی نیزامی لە شەڕی ناوکی، سەرکەتوو ناناسێت... . سەردەمی ئەوە هاتووە کە ئێمە دەست لەم کارانە هەڵبگرین... . ئەمڕۆ کە ئەمریکاو سۆڤییەت لە دۆخێکادانین تاکو خواستەکانی خۆیان بەزۆر بەسەر خەڵکدا بسەپێنن..... خەڵك ئەمڕۆکە لە شەڕو پێکدادان وەزاڵە هاتوون و بە دوای رێگایەکن تاکو جیهانێکی هێمن و جێگای متمانە دروستبکەن....."[1] ناوبراو هەروەها درێژەداو دەڵێت".... شەڕی ناوکی کەرەستەیەك نییە تاکو بەم شێوەیە بگەین بە ئارمانجی سیاسیو ئابووری و ئیدئولوژیك. ئاسایی کردنی پێوەندییە نێونەتەوەییەکان لە بوارەکانی ئابووریو پێوەندییەکان و کۆمەڵناسی دەبێ تایبەتمەندی نێودەوڵەتی بەربڵاوی هەبێت، ..."[2]

٣) گرینگی دەوری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ سەقامگیریی ئاشتی و تەناهی لەنێوان نەتەوەکان، هەروەك هێنانە گۆڕێی پرسی ئەمنییەتی دوولایەنەو لێك دانەبڕاو لە جیهانو ئەوەی کە نابێ ناکۆکییە ئیدئۆلۆژیکەکان لە ئاستی پێوەندییە نێونەتەوەییەکان تێکەڵبکرێت. گۆرباچۆف لەم بارەوە دەڵێت: ".... بە هۆی نامومکێن بوونی رێگا چارەی سەربازی بۆ کێشە نەتەوەییەکان ئاخاوتنێکی نوێ لە پێوەندی نێوان دەسەڵات و ئەمنییەت سەرنجی پێ دەدرێت.

ناتوانرێ ئەمنییەت لەگەڵ کەرەستەی سەربازی بەراوەرد بکرێ..... ئەمنییەت لێك دانەبڕاوە واتە یان ئەمنییەتێکی بەرامبەر بۆ هەمووان هەیەو یان ئەوەی کە ئەمنییەتێك بوونی نابێت. تەنیا پایەی پتەوی ئەمنییەت، ناسینی ئوگریی هەموو نەتەوەکان و یەکسانی مافەکانیان لە کاروباری نێونەتەوەیی دایە ئەمنییەتی هەر نەتەوەیەك دەبێ لەگەڵ ئەمنییەتی

(1) Tbid, p. 186

(2) گۆرباچۆف، پێشوو، لاپەڕکانی ١٩١ ـ ١٩٠



هەموو ئەندامانی جڤاکی نەتەوەیی هاوپێوەند بێت... رکەبەرایەتی لە نێوان وڵاتانی کاپیتالیزم و سۆسیالیزم دەرباز بوونی نییە بەڵام ئەم رکەبەرایەتییە دەتوانری لە چوارچێوەیەکی هێمنانە بەڕێوە بچێت....."[1]

٤) گۆرباچۆف پێداگری لەسەر ئەم خاڵە دەکرد کە ئاژاوە نێوخۆییەکان نەك هەر داهاتووی سۆڤییەت بەلکو پێگەی ئەو وەکو هێزێکی گەورە لەگەڵ مەترسی بەرەو روو دەکات. جێگای باسە کە ئامانجی سەرەکی گۆرباچۆف لە هێنانە گۆڕی بیردۆزی ئەندێشەی نوێ (اندیشەی نوین) سەرکەوتوویی لە سیاسەتی دەرەوەی بێرژنێڤ جیا لەوەی کە ئاستی هێزی نیزامی سۆڤییەت لەگەڵ ئاستی هاوتەرازی ئێستراتیژیکی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان بگەیێنێ. بەڵام ناوبراو نەیتوانی بەو رادەیەش هێزی سیاسیو ئابووری وڵاتەکەی بەرەو باشی ببات. لەم چوارچێوەدا ئامانجی سۆڤیەت هاوسەنگ کردنی سیاسەتی "هێرشی وەڵامدەرانە" لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، بەڵام گۆرباچۆف بە پێویستی زانی کێشەکانی ئەمریکا بگوازیتەوە بۆ رێگاچارەی سیاسی، بەم شێوە پێشگیری لە بەفیڕۆ چوونی سەرچاوە داراییەکان بۆ بەشی پیشەسازی سەربازی بکا.

٥ـ کەمبوونەوەی سەرنج بۆ "جیهان گەرایی کرێکاری"و "جیهانی سێهەم"،..... یەکێکی دیکە لەبەرچاوترین داهێنانەکانی نوێکردنەوە لە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤییەتە کە خۆی لە رێوشوێنی بنچینەیی "اندیشە نوین"ی گۆرباچۆف دێتە ئەژماردن. بەهۆی ئەم رێگای دەرباز بوونە رێبەری سۆڤییەت هێزەکانی ئەم وڵاتەی لە ئەفغانستان کشاندووە، ماناگەلێك وەکو لێهاتوویی ئارەزوومەندانە (کفایت عقلانی)[2]و بەرگری بەرگریکارانە (دفاع دفاعی)[3] هێنایە ناو سیاسەتی دەرەوەی سۆڤییەت. هەروەها واتای ئەمنییەتی وەڵام دەرانەی لە پێوەندی لەگەڵ ئەمریکا پێشنیار کرد و گرینگی سەرنجدان بە بۆچوونەکانی مرۆڤ، نەك چینایەتی لە پێوەندی نێونەتەوەیی هێنایە ئاراوە، جگە لەمانەش چاوپێکەوتنەکانی گۆرباچۆف لەگەڵ رێگان ـ سەرۆك کۆماری ئەوکاتی ئەمریکا کە پێوەندییەکانی دوو وڵاتی هێنایە قۆناخێکی نوێوە، هەر لەم پێناوەدایە. شایانی تاوتوێ

(1) B. Kagarlitsky. “Perestoika”, Newle8t Review, may 1988, no. 169, pp. 63 – 83
(2) Reasonable sufficiency
(3) Defensive Defence

کردنە، هەروەها پێداگری گۆرباچۆف بۆ هاوکاری وتووێژی پێکەوە ژیانی هێمنانە لەنێوان هەموو ولأتانی جیهان لەگەڵ سیستمی جۆراجۆری سیاسی لە ناوەندی ئەندێشەی نوێ بەدی دەکرا. ئەو لەم پێوەندیەدا باسی ئەوە دەکا، "... . بەرنامەی ئەندێشەی نوێ لە راستیدا رێگایەکە بۆ وتووێژ نەك هەر لەگەڵ ئەوانەی کە رازین بەلکو لەگەڵ ئەوانەی کە وەك ئێمە بیرناکەنەوە و پێداگری فەلسەفە و سیستمێکن کە دژی فەلسەفە و سیستەمی ئێمەن و ئەمە بە کارێکی پێویست دەژمێرێت..... مـن لەسـەر ئـەو بڕوایـەم کەسـایەتی سیاسـییەکانی ئەمڕۆکە دەبێ شارەزایی توانای ڕووناکبیرانی نەتەوەکانی دیکە بن، جیـا لـەوە بیرتەسـك و شوینیست و کورت بین و تەنانەت تووشی خراپتر لەوانەیش دەبن...

وتووێژ لەگەڵ خەڵکانێك لە ئایینە جۆراوجۆرەکان و بە روانگەیەکی جۆراوجۆر لە ژیـان بـۆ ئێمە گرینگییەکی بێ ئەملاو ئەولایە..... کاتێك ئێمـە رێوشـوێنی "ئەندێـشەی نـوێ"مـان قەبووڵکرد وتووێـژ و دانوسـتان بـە کەرەسـتەیەکی گونجـاو دەزانـین کـە دەبـێ لـە سیاسـەتی نێونەتەوەیی کەڵك لەوە وەربگرین، بەبێ وتووێژ و دانووستان ئاستەمە بڕوا بکەین کە دەتـوانین بە لێك تێگەیشتنێکی دوولایەنە بگەین(1).

---

(1) W. Benn,Glasnos, the Jourral of communist studies, no. 3, September 1987, p. 267.

# "فەسڵی دووهەم"

## (دەورانی گوێزرانەوەی کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاست، تێڕوانین لە ناوەندەوە هەتاکو سەربەخۆیی)

ڕێژیمەکانی ئاسیای نێوەڕاست بۆ جێگر کردنی بارودۆخی سیاسیو بۆ چارەسەر کردنی قەیرانە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکان، پێویستیان بە زنجیرەیەك وەرچەرخان و گۆڕان هەبوو. لەم پێوەندییەدا، بژاردە سیاسییەکان ڕۆڵێکی زۆر گرینگیان گێڕا. ئەوان لە وەڵامی گەشەسەندنی تەنگژەکانی هەبوو نیشانیان داوە، کە لە هەوڵێکی بەربڵاودان بۆ ڕاکێشانی بیروڕای گشتی. لە ڕاستیدا، پرۆسەیەکی چاکسازی نێوخۆیی هەم لە ڕاستای ئاڵوگۆڕی کادری سیاسیداو، هەم لە ڕێبازو خەتی سیاسیدا، دەرفەتیدا بەم ڕێژیمانە تاکو خۆیان وەکو پارێزەرانی بەرژەوەندی نەتەوەیی لە قەڵەم بدەن. ناوەندیی گەری وەها ڕێبەرانێك لەسەر کێشەگەلی وەکو چاکسازی کولتووری و ئابووری (لانیکەم بۆ کورت ماوە) بووە هۆی دابەزینی شلێژی پێوەندییەکانیانو پشتیوانی کردنی زۆرینەی چین و توێژەکانی خەڵك لە ئەوان.

هەوڵە ڕێفۆرمخوازییەکان، دوو ڕێگای بۆ بواری سەقامگیری سیاسی پێکهێنا. یەکەمین ڕێگا قەتیس کردنی وەها ڕیفۆرمێك بۆسەر پرسەکانی کولتووریو ئابووری بوو، چوونکە سەرنجدانی خەڵك بە گشتی بەم پرسانەی ئاماژە پێکراوە ڕێگای بۆ سیاسی بوونی ئەوان دابین کردبوو، بەم شێوازە، بژاردەکانی ئەم وڵاتانە لە دژایەتی کردنێکی سەرەروویانە لەگەڵ خواستەکانی جەماوەر دەستیان هەڵگرتو بۆ ڕاکێشانی پشتیوانی گشتی هەڵوێستیان گۆڕی. لە ڕاستیدا کاکڵی ئەم پرۆسەیە لەسەر هەڵوێست گوڕینێك لە کولتووری بەڕێوەبەری حکوومەتی ناوەندی، بۆ کولتوورێکی هەڵقوڵاو لە خواستەکانی خەڵك بوو. ئەم بەرخودانە پۆزوتیڤە لەگەڵ پێوەندییەکانی کۆنی ناوەند و دەورووبەر بوارێکی نوێ بۆ هەریەك لە بژاردەکانی ئەم کۆمارانە



دەرەخساند تاکو خۆیان وەکو پشتیوانی بەرژەوەندی نەتەوەیی لە قەڵەم بدەن. هەروەها ئەوان دەبوایە ئەرکی کۆنترۆڵی سیاسی وەئەستۆ و خۆشیان کێشەکان چارەسەر بکەن.

دووهەم، بژاردەکانی ئەم کۆمارانە لە ناساندنی خۆیان وەکو پێشڕەوانی بزاڤی ناسیۆنالیستی لە ئاسیای ناڤین (بە مەبەستی خەباتی دژ بە کۆجێیی بوونی سیاسی)و ڕاکێشانی ڕای گشتی لە پانتاییەکی بەربڵاو، لە ئازادییەکی زیاتر بەهەرەمەند بوون تاکو بتوانین لە بەرانبەر هەر چەشنە چاکسازی سیاسی ڕابوەستن. بەپێی وەها گریمانەیەك، هەوڵی ریفۆرمخوازانەی ئەوان زۆرتر لەسەر بەرزکردنەوەی سەربەخۆیی سیاسیو ئابووری لەنێوخۆدا بوو، هەتا بەو شێوە بتوانن دۆخێك پێکبێنن کە هەستی نەتەوەخوازی ڕاستەوخۆ دژی دوژمنێکی دەرەکی (حکوومەتی ناوەندی) نەك دەوڵەتی خۆیان ڕێنوێنی بکەن. زێدە لەوەش، ئاڵۆزی ریفۆمی ناوەند و دەورووبەریش دەیتوانی وەك مەترسییەکی بەهێز بە ئەژمار بێ بۆسەر چاودێری کردنی سیاسی لەسەر ئەوان.

بەڵام ئەوان بە سەرنجدان بە سیاسەتی ناوبراو هەر لە هەوڵی پاراستنی پێگەی خۆیان بوون. تاکە شوێنێك لە پێوەندی لەگەڵ گەشەسەندنی ناسیۆنالیزم دەتوانین ئاماژە بە تاجیکستان بکەین. واتە شوێنێك کە هەژمونی خوازەکانی ئەم کۆمارە لە پێوەندیی لەگەڵ پرۆسەی ئاماژە پێکراو بەرگرییان دەکردو کاتێك لەگەڵ پێکدادان و گێرەو کێشەی نێوخۆیی ڕوبەڕوو بوون دەستی یارمەتی و هاوکارییان بۆ مۆسکۆ درێژ کرد. لە ڕاستیدا بژاردەکانی دەسەڵاتدار بە کەڵك وەرگرتنی هێزی دەرەکی لە ڕاستای بڵاوە پێکردنی نەیاران و پشتگوێ خستنی جیایی لە ناوەندی سیاسی، نەك هەر لە بەرانبەر دوژمنێکی دەرەکیو لە پێناو پاراستنی پرستیژی خۆیان نەپاراست بەلکو بە بەستراوە بوون بە هێزی دەرەکی خۆیان لە بەرانبەر خەڵکدا پۆشتەو پەرداخ کرد. بەم شێوەیە بە شکاندنەوەی حکوومەتی تاجیکی بەلای دوژمن، بارودۆخێکی لەبار بۆ پەرەگرتنی خێرای سیاسی، دژایەتێکی بەهێزی گشتیو بوارگەلێکی زیاتری بۆ هێزەکانی دژبەر دابینکرد. بۆ دەوڵەمەند کردنی باسی پێشوو، ئەم بەشە تەرخان دەکەین بە هەڵسەنگاندنی بژاردە سیاسییەکانی حیزبی کۆمونیست و هۆی ئاڵ و گۆڕ لە نێو کادرەکانو پێوەندی ئەوانە لەگەڵ ناوەندە سیاسییەکان کە هێشتا ئیحتوباری خۆیی پاراستووە و ناوەندی دەسەڵاتیان هەر بە دەستەوەیە، لێکدانەوە و شرۆڤەی لەسەر دەکەین .

### گوتاری یەکەم: وەرچەرخانە سیاسییەکان لە ئاستی ڕێبەراندا.

خەڵکی خۆجێیی ئاسیای نیوەڕاست لە بەراورد لەگەڵ هەموو نەتەوەکانی یەکیەتی سۆڤییەتی پێشوو رادەی بەشداریکردنیان لە کاروباری سیاسی زۆر لە خوارێ بووە. نێونجی ئەندامیەتی خەڵکی سۆڤییەت لە حیزبی کۆمونیستدا لە سەرەوەی ١٠٪ بووە بەڵام هەنووکە ئەو رادە ئاماژە پێکراو لە ئاسیای ناڤیندا، کەمتر لە شەش لەسەد نیشاندەدا[١]. ئێستا دەرکەوتووە ڕێژەی بەشداریی‌و دووری کردنی خەڵك لە بەرنامە و پرۆسە پەرەگرتووی سۆڤییەت لە خوارێ بووە. هەروەها هێندێك لەسەر ئەو باوەڕەن کە هۆکاری ئەو کێشەیە، لەلایەن خەڵکانێکەوەیە کە شوناسی سیاسی حیزبی کۆمۆنیستیان وەك تەنیا حیزبی زاڵ خەملاندووە.[٢] هەر بۆیە نیزامەکانی ناوبراویش دەگەڵ قەیرانی شوناس ڕووبەڕووبوونەوە.

لە رووی مێژووییشەوە، دەزگاکانی سیاسی ئاسیای ناوەندی زیاتر لە کۆمارەکانی دیکەی سۆڤییەت لەژێر رکێڤی رووسەکاندا بوون. لە راستیدا، ئەم هەوڵانە بۆ کەمکردنەوەی دەستێوەردانی نەتەوەکان لە کاروباری وڵات بووە بە جۆرێك کە خرۆچۆف پێشتر وەها بوارێکی خۆش کردبوو.[٣] بە چاوپێخشاندنێکی خێرا بە سەر ڕێکخراوەکانی حکوومی و حیزبی کۆمارەکاندا دەبینین کە رادەکی زۆر لە پۆستەکانی فەرمی وڵات لەژێر دەسەڵاتی رووسەکاندا بووە. بۆ نموونە: لە ساڵی ١٩٦٦دا کەمتر لە نیوەی ئەندامەکانی "پریزیدیۆمەکانی" هەر کۆمارێك لە حەشیمەتەکانی خۆجێیی پێکدەهات.[٤]

لەکاتێکدا لە کۆتایی ١٩٦٠و ١٩٧٠ لە زۆربەی کۆمارەکان رادەی نوێنەرانی خۆجێیی زیاتر دەبوو، بە شێوەی دیار تەنیا لە ئوزبەکستان زۆرینەیەك توانی ئێدارەی ڕێکخراوە سیاسی

---

(1) The communist partyof the soviet union in figures (1967 – 1987), novosti paress Agency

(2) see: hellene carrered, encausse, decline of an empire, chapters seven. And eight and Edward allwarth, central asia: 120 years of Russian rule, chapter five

(3) john h. miller, "cadre polre policyan nationality areas recruit ment of cpsu first and second secretaries in aon – Russian republicsof the ussr", sorietstudies, January 1984,pp,6-36.

(4) yaroslar bilinski, "the rulersand the ruled", problemsod communism, no 2, vol 16, pp. 16-26.

بۆ وێنە ئۆزبەکستان ٧/٧، قرقیزستان ٥/٧، قەزاقستان ٤/٨، تاجیکستان ٥/٨ـ تورکمەنستان ٥/٧، لە بەراوەرد لەگەڵ کۆمارەکانی رووسیە ١٠/١، ئۆکراین ١٤/٢و بلارووس ١٠/٣.



یەکانی (پریزیدیۆمی حیزبی) لە ساڵی ١٩٧٧ وەئەستوە بگرێت.[١] هەر بۆیە لە سەردەمی بێرژنێفش بە دانی بەشی زیاتر بە نوێنەرانی بۆمی، بەرژەوەندی نەتەوەکان دابین نەکرا، ئەمە لەو راستایەدابوو کە تا پێش نێوەی ١٩٨٠ بژاردە سیاسییەکانی هەمان بیری ئەستالینیان بەڕێوە دەبرد و هەمان بیروباوەڕیان لە سەردەمی بێرژنێفیش پەرەپێدابوو.[٢] کەواتە دەسەڵاتدارانی ناوەند بە جێگای سەرنجدان بە خۆجێیی بوونی خۆیان بەلای مسکۆدا شکانەوە. لەم پێوەندیەدا ئەدوارد ئالۆرس، بەم جۆرە باسی دەکات:

"لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا، ئەگەر کەسێك لە ئاسیای ناڤیندا وەکو کاندیداتۆری ڕێبەری حیزبی یان حکوومی هەڵبژێردرابا، دەبوایە ئەو کەسە ئەم تایبەتمەندیانەی خوارەوەی هەبێت."

دەبێ ئەو کەسە پیاو بێ، بتوانێ بەسانای بە زمانی رووسی بدوێ و بنووسێ، دەرچووی یەکێك لە پەیمانگا یان زانکۆکانی رووسی بێ، بە شێوەی ئاشکراو بە نووسراوە چالاکانە بەرگری لە رووسییەو حیزبی کۆمونیست بکاو بەرپرسایەتی گرینگی دەوڵەتیشی هەبێ و یان پێشتر بووبێ و....[٣]

بەدەستهێنانی ئەزموونی سیاسی وەها ڕێبەرانێك هەر بەو شێوازەی هاوشێوەی ئیستالین بوو کە بۆ ڕاهێنان و بارهێنانی ئەوان لە دەرەوەی نێوخۆ دابینکردبوو. تاکو لەگەڵ بیری سیاسی هاوتەرازەکانی ناوەندی خۆی شارەزا بێت و گەشەی پێپدرێت. بە جۆرێك کەسایەتی ڕێبەرانی ئاسیای ناوەندی زیاتر لە بەرژەوەندی مسکۆ و بەردەوام بە زیانی خەڵکی هەژاری ئەم ناوچەیە دەشکایەوە. ڕێبەرانێك وەکو رەشیدئۆف و کەنایەف، ئامانجەکانی مسکۆیان لە پێناو پەرەپێدانی بەربڵاوی بەرهەمهێنانی لۆکە، ڕێکخستنی پەروەردەیی دژە ئایینی‌و ڕێزلێنان لە برای گەورەی رووس لە راستای گەشەپێدانی ئەم کۆمارانەدا بوو.[٤]

---

(1) B. Bellhorn, "Berzhnevs Cadre Policy" problemsod communism, No 4, vol 25, .1977, PP.15 – 29.

(٢) بۆ وێنە، زۆربەی بەڕێوەبەرانی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست بۆ ماوەیەکی زۆر لەو کەسانە بوون: شەرەف رەشید ئوزبەکی (٨٣ ـ ١٩٥٩)، دین محەممەد کەنایفی قەزاقی (٨٦ ـ ١٩٦٤و ٦٣ ـ ١٩٦٠)، جەبار رەسوڵ ئۆفی تاجیکی (٨٣ ـ ١٩٦٠)، محەممەد نەزیر جیۆرفی تورکەمنی (٨٥ ـ ١٩٦٠)و بۆسابالیف قرقیزی (٨٥ ـ ١٩٦١).

(3) E. Allworth,, 120 years of Russian Rule in central, p. 55"

(4) Ibid

له سەردەمی بێرژنێف، پشتگیری بەربڵاوی حکوومەتی ناوەندی له بژاردەکانی ئاسیای ناڤین بووه هۆی زیاتر بوونی پێوەندییەکانیان. قۆناخی ئاماژه پێکراو به پێشکەش کردنی تێزی "خوجێیی گەرایی کادری" پێیدا دەگرت به جۆرێك که رادەی نوێنەرانی خۆجێیی به شێوەیەکی بەرچاو پەرەی گرت. هەروەها سیاسەتی گرینگیدان به کادر له دەورانی بێرژنێف بوو بەهۆی هاتنی سەردەمێکی گونجاو، بۆ بەرپرسه فەرمییەکانی کۆمارەکان.

ئاکامەکانی ئەوەبوو، هەر جۆره سیاسەتێك به پێچەوانەی رێچکەی بێرژنێف، دەیتوانی ببێته هۆی گۆڕانکاری له سیاسەتی کادری و جیابوونەوەی کۆمارەکانی ئاماژه پێکراو له حکوومەتی ناوەندییدا. به جۆرێك شەپۆلی چاکسازی دوای مردنی بێرژنێف (سەرەتا لەلایەن ئەندرەپۆف و دواتر لەلایەن گۆرباچۆف) ئاسیای ناوینی تووشی گۆڕانکاری سیاسی کرد. له پێناو هەوڵدان بۆ لەناو بردنی گەندەڵی ئیداری، کۆمەڵێك پاڵاوتن دەستپێکرد بوو و هەر لەم کاتەدا به پەرەگرتنی چالاکییه سیاسییەکان، رای گشتی پێداگری له سەر گۆڕانکاری له سیاسەتی ئاسیای نێوەڕاستدا دەکرد.

گۆڕانکاری له رێچکەی سیاسی له ئاسیای ناڤیندا هاوکات بوو لەگەڵ مردنی بێرژنێف و هاتنه ئارای دوو شەپۆلی جیاواز. یەکەمین شەپۆل (که له بەشی ناوەندییەوه پێکهات) دەستی به ناساندنی کادرەکان کرد تاکو بەم شێوازه ئەو تۆره گەندەڵیانەی که لەسەردەمی بێرژنێفدا پەرەی گرتبوو لەناوی ببەن و سەرلەنوێ ئاسیای نێوەڕاست به بەشێك له فیدراسیۆنی سۆڤییەت لەقەڵەم بدەنەوه. دووهەمین شەپۆل، وڵامدانەوەیەك بوو به کاروکردەوەکانی ناوەند، که بەرەبەره رێبەرانی سیاسی له بواری نەتەوەخوازییەوه بۆلای دەسەڵاتدارێکی تایبەت رادەکێشا. کەواته وەها گۆڕانێکی هزری بووه هۆی پتەوتر بوونی پێگەی سیاسیو پاراستنی سەقامگیری سیاسی کۆمارەکان.

یەکەمین شەپۆلی گۆڕانکاری له سەردەمی دەسەڵاتی یوری ئەندەرپۆف (١٩٨٢ـ ١٩٨٤) وەکو یەکەمین سەرۆکی حیزبی کۆمونیستی یەکیەتیی گەلانی سۆڤییەت دەستپێکرد و هەڵبژاردنی گۆرباچۆف وەکو یەکەمین سەرۆکی حیزب له ساڵی ١٩٨٥ توندتر بوو. له راستیدا، دەستپێکی وەها بزاوتێك وەك هەوڵدان بۆ لەناوبردنی شوێنەواری نەگەتیڤ و (تۆڕه گەندەڵیەکان، دژی، خزمگەرایی[1] له رووی سیاسی)و سیاسەتی سەقامگیر کردنی کادری

(1) Nepotism



بێرژنێف، به ئەژمار دێت. بۆیه حکوومەتی ناوەندی بۆ کەم رەنگ کردنی دەسەڵاتداری سیاسی خۆجێیی ئاسیای نێوەراست دەستیان به شەڕێکی پڕوپاگەندەی بەربڵاو کرد. وەها کردەویەك بوو به هۆی پاك بوونەوەی زۆربەی دەزگاکانی سیاسی ناوچەکه لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٣ ـ ١٩٨٧. له درێژایی ئەم ماوەیه، هەزاران کادری سیاسی خۆجێیی، خاوەندارانی هاوبەش و سەرمایەداراکان له پوستەکانیان ولانران و زۆربەیان به فەرمانی لیگاچۆف جێگری سەرۆکی حیزبی کۆمونیست، به هۆی ئەو گەندەڵ کارییانەیان، خرانه بەندیخانه.

ئەم هێرشه به شێوەیەکی بەهێزتر له ئوزبەکستان بەڕێوەچوو، به جۆرێك تاکو ساڵی ١٩٨٨ زیاتر له پەنجاو هەشت هەزار کادری سیاسی ئاڵوگۆڕ کران.[1] پێش لێکولینەوەی ناوەند له پێوەندی لەگەڵ کاروباری نەگونجاویی ئاستی بەرهەمهێنانی لۆکه، یەکەمین نیشانه له ئاڵوگۆڕی ئیداری به گۆڕینی جێگری سەرۆکی حیزبی کۆماری له مانگی مای ١٩٨٣ دەرکەوت.[2] پاش دوومانگ، وەزیری ناوخۆو بەرپرسی "کا. گ. ب" گۆڕدران. مانگی دواتر یانی ئوکتۆبری ١٩٨٣، سکرتێری حیزبی کۆمونیست مرد و خێرا به جێگای ناوبراو عوسمان خودایەفیان دانا.[3]

پانتایی پاکتاو کردن بۆ دەرەوەی سنوورەکانی ئوزبەکستان پەرەی سەند. له نوامبری ١٩٨٥، سکرتێری حیزبی قرقیزستان که ماوەکی زۆر (١٩٦١ـ١٩٨٥) لەسەر کورسی دەسەڵاتدا بوو، لەسەر کار لابرا. له دسامبری هەر ئەو ساڵەشدا، رەحمان نەبی ئۆف وەکو سکرتێری حیزبی کۆمونیستی تاجیکستان هەڵبژێردراو راست چەند رۆژ دواتر، ئاڵ وگۆر به سەر سکرتێری حیزبی تورکمەنستانیش داهات و به جێگای ئەو نیاز ئۆف دانرا. له راستیدا، لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٤ـ ١٩٨٧ تەواوی سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندییەکانی ئوزبەکستان، تاجیکستان، قەرقیزستان و تورکمەنستان گۆڕانکاریان به سەر داهات. له کۆتاییدا، له دەسامبری ١٩٨٦، بەرچاوترین کەسایەتی ئەستراتێژی حکوومەتی ناوەندی به گۆڕینی سەرۆکی یەکەمی قرقیزستان واته کۆنایف و جێگری گەنەدی کەلبین که کەسێکی رووسی بووو پێشتریش هیچ جۆره بەشدارییەك یان تێکلاوییەکی له کۆماری ناوبراو نەبووه لەگەڵ دژایەتی گشتی بەرەوڕوو بوو.[4]

(1) J. critchlow, "obduracy of uzbek cadres castngshade on nationalities Plenum" Report ontheussk, 24 march 1989
(2) Gleason, Soviet Federalism, p. 109
(3) D. Calisle, op – cit. p - 34
(4) Birll olcott, op. cit, p. 64"Perestroika in Kazakhstan"

لەم کاتەدا، حکوومەتی ناوەندی هەوڵێکی نوێی لەسەر بنەمای پێویستی پاراستنی کولتووری نێونەتەوەیی لە سۆڤییەت دەستپێکرد. گۆرباچۆف بە درێژایی سەردەمی دەسەڵاتی خۆی (١٩٨٦ـ ١٩٨٨) رەخنەیەکی توندی گرت لە کەسانی پێش خۆی لە پێوەندی دەگەڵ لەنێوبردنی میراتە کۆنەکانی ناوچەکە و چاوپۆشی کردنی ئەوان لە هەمبەر ئیسلام هۆشداریداو تێدەکۆشا تاکو ئیحتووباری خۆی لەلای ئەوان بەدەست بهێنێت.[١] ناوبراو لە وتوێژێکی لە باکو لە(نوامبری ١٩٨٦) لۆمەی کادرەکانی حیزبی کرد و داوای لێ کردن تاکو بایەخی زیاتر بە رێورەسمە ئایینییەکان بدەن[٢].

هەروەها پێداگری ناوبراو لەسەر پێویستی بەردەوامی پەروەردەی نێونەتەوەیی لەنێو کۆمارەکاندا جێگای سەرنج بوو. لە راستیدا، وەرچەرخانی سیاسەتی مسکۆ بۆچوونەکانی بێرژنێف بۆ لاواز کردنی ئازادی، سوور بوون لەسەر کادری خۆجێییو سەرنجدان بە بواری ئابووری لە ئاسیای نێوەڕاستداوحاشا کردنو قبووڵ نەکردنی ئەوانە لەلایەن گۆرباچۆف لە خاڵە بەرچاوەکانی ئەم سەردەمەبوو. چاکسازییەکانی ئاماژە پێکراو لەژێر کاریگەری سیاسەتەکانی دژە کۆماری بە تەواویی توندوتیژانە بوو، نارازیان و دژبەران زۆربەیان دانانی بەرپرسانی ناخۆجێیی لەسەر دەزگا کۆمارییەکان بەراونان و وەدەرنانی خۆیانیان لەقەڵەم دەدا.[٣]

هەروەها کاریگەری نەخوازراوی پرۆسترۆیکا و لەنێوچوونی ئابووری لە سۆڤییەت ببوە هۆکاری زێدەبوونی ناکۆکی لەنێو نەتەوەکان و پێکدانەکان لەنێوانیاندا، لە (١٩٨٩ ـ ١٩٩٠). ئازادی گلاسنوست و سەرکەوتنی بزووتنەوە سیاسییەکان لە کۆمارەکانی دیکە بووەهۆی رێکخستنی بزاوتەکانی دیکە. گرووپە گوشارە نافەرمییەکان، دامەزراوە گشتییەکان و رێکخراوە سیاسییەکان لە هەوڵی دامەرکاندنی پرسەکانی سەرەوە بوون.

بۆ یەکەمین جار، گوشاری گشتی (نەك بە شێوەی راستەخۆ بەلکو لە رێگای لەناوبردنی ئاشکرای یاساو دیسیپلین و هێژمونی سیاسی رێبەرانی کۆمار) سەپێنرایە سەر بژاردەکانی ئەو کۆمارانە. کەواتە، رێبەرانی ئاماژە پێکراو بەهۆی ئەم گۆشارانە دەبوایە سیاسەتەکانەی

(١) دانانی گەنادی کلبین شەپۆلێکی بەربڵاوی لە رێپێوانی گشتی بە دواوە بوو بە جۆرێك کە لە ئاکامی ئاژاوەکانی پێتەخت لانیکەم چوار کەس کوژران.

(2) Gail W. lapidus, "Gorba chevand tge national question" Gail W. lapidus, "Gorba chevand tge national question" soviet Economy, vol, 5, no. 3. pp 2d – 250

(3) J. Critchlow, Religion in Uzbekistan Reportan the ussr, 14: Decemberl 1986, p. 18



خۆیان لە پێوەندی لەگەڵ لاواز بوونی پێوەندییەکانیان لەگەڵ خەڵك باش بکەینو یان لە بەرانبەریاندا رابوەستن.

بەریانی ئەوان بۆ وەها کارێك بە سەرنجدان بە رووداوەکانی نێوان ساڵانی ١٩٨٣ تاکو ١٩٨٨ کە پێش هاتبوو، ئەرێنی بوو. رەزامەندی رواڵەتی لەنێوان حکوومەتە ناوەندییەکان و کۆمارەکان لە مەڕ هەوڵدانی حکوومەتی ناوەندی بۆ راکێشانی دەزگا سیاسییەکانی ژێر رکێفی ئاسیای ناڤین، لە بەریەك بڵاو ببوونەوە. سنووردار بوونی پشتیوانی سیاسی، گاڵتە پێکردنی جەماوەری ناوچەکە کە ببووە هۆی گوشار خستەسەر ناوەند و کەم بوونەوەی داهاتی نایاسایی لەرادەبەدەری بژاردەکانی کۆمار، هەرکام بە جێی خۆیان گوشارەکانی دەوروبەر بە دژی حکوومەتی ناوەندیان چروپڕ دەکرد. نارەزایەتی لەرادەبەدەر بە دژی کۆمارەکان و رێبەرانیان بووە هۆی ئەوە تاکو بژاردەکان بۆ پێشگیری لە داگیرکاری حکوومەتی ناوەندی بەسەر ناوچەکە بۆلای ناسیونالیزمدا بشکێنەوە.[١]

ئاکامی هێرشەکانی ناوەند و پەرچەکردارەکانی جێی تێڕامانی چین و توێژەکانی خەڵکی راپەڕییو لە ئاسیای ناڤین دەرکەوتنی رێبەرانی کۆمۆنیستی نەتەوەخوازی لێکەوتەوە. زێدە بوونی راستەخۆی گوشارەکان، پاڵی بە رێبەرانی ئاماژە پێکراونا تا خۆیان راستەخۆ چاودێری کاروبارەکان وەئەستۆ بگرن. دژ کردەوەی بژاردە ناسیۆنالیستییەکانی زیاتر بە مەبەستی بەرگری کردن لە پێگەی خۆیان لە بەرانبەر مسکۆ، هەروەها لەپێناو دامرکانی دژ کردەوەی چین و توێژەکانی خەڵکی راپەڕیو بوو.

هەر بۆیە یەکەمین قۆناخی ئەم پرۆسەیە، لەسەر کار لابردنی کەسانی سیاسی لایەنگری ناوەند لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٨ ـ١٩٨٣ دا بوو. پێداگرتن لەسەر گرینگی گۆشارە کۆمەلایەتییەکان، راستییەك بوو کە پێوەندی بە شوێندانانی راستەخۆ بۆ سەر دیاریکردنی سەرلەنوێ پێگەی بژاردە سیاسییەکان لە ئاسیای نێوەڕاستدا هەبوو ئەمە کاتێك روویدا کە دووهەمین شەپۆلی گۆڕانکاری هزری سیاسی لە رێگای کۆمەڵێك راپەڕینی نێوخۆی بواری بۆ خۆش کرابوو لەراستیدا ئەمە بەمانای راچەڵەکاندنی بژاردەی کۆمارەکان لەقەڵەم دەدرا. ئاکامی ئەم شۆڕشانە بووە هۆی گۆڕینی سەرۆکی یەکەمی حیزبی کۆمونیست "کلبین" لە

(1) Critchlow, op. cit"Obduracy of uzbekcadres"

ئالْماتــا پێتــەختی قەزاقــستانو بــۆ جێگــری شــووراى وەزیــران "نــور ســولْتان نەزەربایەف"لە(ئاوریلی١٩٨٩) دیاریکرا.[١]

لە ئوزبەکستان "ئیسلام کەریم ئۆف" بە جێگـای "نیـشانۆف" هاتـە سـەرکار لـە (ژووئـەنی ١٩٨٩)، زیاتر لە یەکسەدوو بیست کەس لە خەڵك بە هۆی تێکەڵچوونەکانی نێـوان ئوزبکـەکان و مشکاتییەکان کە لە شیوی فەراغنە روویدا، کوژران،[٢] پاش ساڵێك بە سەر ئەم رووداوە، سکرتێری حیزبی کۆمونیستی قرقیزستان لە هەڵبژاردنەکاندا شکستی خـوارد و شـووراى بـاڵای حکوومـەتی "عەسکەر ئاقایەفی" لە جێگای ئەو هەڵبژارد.[٣] کەواتە هـەرکام لـە کۆمارەکـان بـە مەبەسـتی گۆڕانکاری لە کەشی سیاسی، رێبەرانی پێشکەوتوویان لەسەر کورسی کاروباری دەسـەڵات دادەنـا، دانانی ئەوانە بە دوای لەسەر کار لابرانی بژاردە هەڵبـژێراوەکانی حکوومـەتی ناوەنـدی بـە مانـای دۆزینەوەی رێبەرانی نەتەوەیی لە ئاست کۆمارەکانی ئاماژە پێکراو لە قەڵـەم دەدرێـت. بـۆ وەهـا رێبـەرانێك پرۆسـەی پێکهـاتنی کۆمارەکـانی ئاسـیای نێوەڕاسـت لـە چوارچـێوەی دوو پرۆسـەی "پێکهێنانی نەتەوە"و "حکوومەت" گرینگی هەبوو، کە باسی لە سەر دەکەین.

**ئەلف: پرۆسەی پێکهێنانی نەتەوە**

یەکێك لە خاڵە سەرەکییەکانی پێکهاتنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی، نەتەوەیـە (nation). لـە پێناسە کردنی نەتەوەدا، دەکرێ وا بڵێین کە: نەتەوە بریتییـە لـە گرووپێکـی کۆمەڵایـەتی کـە هەڵگری ئیدئولۆژی، بنیاتی سیاسی، داب و نەریت و هەستی هاوبەش.[٤]

نەتەوەکان لەژێر سێبەری هێزی دەوڵەت، پێکدێن و بیچم دەگرن و ژیان دەکەن بە واتایەکی دیکەی نەتەوەکان کاتێك لەراستیدا نەتەوەن کە هێزی خۆی واتـە دەوڵـەتی خـۆی پێکبێنێـت. شوناسو یەکێەتی نەتەوەیی کـە لـە پرۆسـەیەکی مێژوویـیدا پێکـدێت، گـرینگترین بناغـەی دەوڵەتی نەتەوەین، لە پێوەندی لەگەڵ کۆمارە سەربەخۆ و نوێیەکاندا دەتـوانین بڵـێین کـە ئـەم کۆمارانە وەها پرۆسە یا رەوتێکیان تێپەڕ نەکردووە. هەر بوویە زرۆبەیان لەگەڵ کێـشەی یـەك نەبوونی نەتەوەییو یەکبوونی دەروونی بەرەوڕوو بوون.

(1) Brill olcott, op. cit, p. 43."Perestroika in Kazakhstan"
(2) Brill Brown,op cit."violence Eruptsin uzbekistan"
(3) charlescarlson Report "Politicalstagnanion Gives wayto Democratic Tmpulas" on the ussr, 4 Jonuary 1991, p. 31
(4) Jack polanoand Roy Alton, the Tnternationol Relations Dictionary, p. 33.



لە هەرکام لەو کۆمارانەدا، لە بەرانبـەر نەتـەوە و زمانێـك کـە نـاوی لێنـراوە تۆخمگـەلی نەتەوەییو زمانی دیکەش هـەن کـە لـە کۆمارەکـانی دراوسـێدا، نەتـەوە و زمـان، شوناسـی نەتەوەیی ئەوان پێکدێنن کە خوازیاری، نیشتمان و شوێنی ژیانێکن کە لە ژێر دەسـەڵاتی ئـەو کۆمارەدا بێ، لەمبارەوە لەنێوان گرووپـەکان و حکوومـەتی ناوەندیـدا کەشـێکی نالـەبار لـە ئارادایە، دیاردەیەك کە دەبێتە هۆی لاواز بوونی یەکیەتیی نەتەوەیی و هاوبەنـدی ویـەکبوونی نەتەوەی لـە کۆمارەکانـدا. سـنوورەکانی نێـوان ئـەم کۆمارانەیـە کـە میراتـی بـەجێ مـاوی ئیستالینییە و نێوەڕۆکێکی دەستکردی هەیە. چ بگا بە خەڵکانێك کە لە یەك نەتەوەن بەڵام لە دابەشکردنێکی داسەپاوداو تەنانەت لە ناوچـەیەکی جوغرافیایـدا لـە یـەك جیـا کراونەتـەوە. ناوچەی فەرغانە کە لە رووی رەگەزی و کولتورییەوە پێکهاتەیەکی هەیە، لەنێوان کۆمارەکـانی ئوزبەکستان تاجیکستان، قرقیزستاندا، دابەشکراوە. ئەو بەشەی کە وەبەر قرقیزستان کـەوتووە واتە ویلایەتی "ئووش" لە سەردەمی مانێکی کۆندا ئوزبەکی تێدا ژیـاون. پـاش دابەشـبوونی فەرغانە، کۆمەڵێکی زۆری قرقیزی لە کوێستانەکان بۆ نیـشتەجێ بـوون بـەرەو ئـەو ناوچـەیە کۆچیان کرد، بەڵام بەهۆی کەم بوونی زەوی بۆ کێڵاندن، لە ساڵی١٩٩٠ شەڕو پێکـدادان هاتـە ئاراوە کە ٣٢٠ کـوژراویی لێکەوتـەوە.[١] هۆکـاریتـر زمـان بـوو. بـە دوای پێکهـاتنی ئـەم کۆمارانە، تورکیە بە پشتیوانی ئەمریکا هەوڵێکی بەربڵاوی دەستپێکرد تاکو بە ناوی "زمان" وەك کەرەستەیەکی سەرەکی بۆ خزین بۆ ناوچەکە کەڵك وەرگرێت و کۆمارەکـانی ناوچـەکە لـە ژێر ناوی "پان تورکیزم"و "پان تورانیزم" ناسنامەیەکی تورکی پـێ بـداو لـە دەوری تاقگـەی ئانکارا کۆببنەوە.

هۆکاری سێهەم، کە خوازیـاری پێـدانی شـوناس و یەکێـەتی نەتـەوەیی بـەم کۆمارانـەن. گەڕانەوە بۆ چاوگە کولتوورییەکان وگەڕانەوە بۆ لای ئیسلام و بیروباوەڕی ئیسلامییە.[٢]

هەڵبەت سیاسەتی رێژیمی کۆمۆنیستی سۆڤییەت نەك هەر لەسـەر بنـەمای رەدکردنـەوەی نەتەوەکان بوو، بەلکو بە دانانی پێكهاتێکی سیاسی کولتووری کۆکراوەی رووسـی، هـیچ کـام

(١) ئەیگۆراتۆ، "گەیۆ ئاسیای ناڤین دەتەقێتەوە؟ وەرزنامەی توێژینـەوەکانی ئاسـیای نێوەڕاسـت و قـەفقاز، ساڵی دووهەم، ژمارە یەك، هاوینی، ١٣٧٢، لاپەڕەی ١٩٧.

(٢) محەمەد تاهری "ئێران پردی ستراتیژیکی رۆژئاواو رۆژهەڵات: دانی رێگای هەوریشم، رۆژنامەی ئیتلاعات، ٧٥/٢/٢٠، لاپەڕەی ١٢.

لەم وڵاتانە دەرەتانی خۆدەرخستن، یان دەربڕینی کولتووری تایبەتی خۆیان نەبوون هەر چەندە ئیسلام هیچکاتێك ئاسیای ناڤین بەجێ نەهێشت.[1]

لە نەبوونی هەر جۆرە ئیدئولۆژیەکی پەسند کراوی دەوڵەتی، تاکە ڕێگای بەردەم خەڵك بۆ گەڕانەوە و پەیویست بوون بە ئایینەکان وەك یەکێك لە بەهێزترین چاوگی شوناسییە. لەم نێوەدا بێگۆمان ئیسلام بەشێکی جیا نەکراوەیە لە شوناسی کولتووری کۆمارەکانی ئاسیای ناڤین.

## ب. پرۆسەی درۆستکردنی دەوڵەت

دەوڵەت گرینگترین هێزی ڕێخستنی هەر وڵاتێکە کە باسکی بەڕێوەبردنی ئەو هێزە "واتا حکوومەت"مافی پاوان کردنیو بەکارهێنانی هێزو بەڕیوە بردنی توندوتیژی هەیەو گرینگترین یاریزانی سیاسییە لە گۆڕەپانی سیاسەتە نێونەتەوەیەکانداو پردی پێوەندی نێونەتەوەییە لە نێوان کۆمەڵێك پرسی سیاسی، ئابووری و فەرهەنگی دەوڵەتەکان.

وڵاتە سەربەخۆ نوێیەکانی ئاسیای نێوەڕاست هیچکاتێك لە مێژووی سیاسی خۆیاندا خاوەنی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ بە واتای ئەمڕۆیی "دەوڵەتی نەتەوەیی" نەبوون. قۆناخەکانی پرۆسەی پێکهێنانی دەوڵەتیان تێ نەپەراندووە. ئەم کۆمارانە بە درێژایی ٧٤ ساڵ دەسەڵاتداری کۆمۆنیستەکان خاوەنی پێکهاتەکی سەربەخۆ نەبوون، بەلکو لەسەر بنچینەی دابەش بوونی دەسەڵاتی سیاسیو بەرژەوەندی ناوەند و ستراکتۆرێکی سیاسی دەروەست بە ناوەند، کە خاوەنی سێ دامەزراوەیە، واتە پارلمان، حیزبی کۆمۆنیست و دەوڵەت[2] بووە، تێدا دامەزراوە، کە پاش هەرسهێنانی دەسەڵاتی سیاسی بە تەواوەتی لە دەستی رووسەکان، دانیشتوانی ئەم کۆمارانە و خەڵکانی خۆجێیی سەربە مسکۆ بوون، وەکو کەرەستەی جێبەجێ کردنی بڕیاراتی حاکمانی مسکۆ کاریان دەکردو زۆر جار بە هۆی خۆجێیی بوونی هێندێك لە ڕێبەران، ئەندێشە سەربەخۆو نەتەوەییەکان لەم وڵاتانەدا مانایەکی نەبوو.

دەسەڵاتی پاوانخوازانەی حیزبی کۆمۆنیست و ئیدئولۆژی زاڵ، بۆ هۆی ئەوە کە بنیاتە فەرمییە بەهێزەکانی، وەك پارلمان، یەکینە ئیدارییە ناوچەییەکان و بنیاتە نافەرمییەکانی

(١) مارینا ئەستپانینت، "ئیسلام و کۆمۆنیزم و سیاسەت" وەرزنامەی توێژینەوەی ئاسیای ناڤین و قەفقاز، ساڵی یەکەم، ژمارەی ٣، زستانی ١٣٧٢، لاپەڕەکانی ٢٨٩ـ ٢٨٨.

(٢) لێرە بە مانای هێزی جێبەجێکارە.



دەسەڵاتداری وەك: یەکیەتییەکان، سەندیکاکان و... . هتد وەکو بەڕێوەبەرانی بێ ئەملاو ئەولا بنو لە هێزو دەسەڵاتی پێویست بۆ بڕیاردان بێبەش بن. بە جۆرێك کە پارلمان لە ساڵدا دوو جار کۆبوونەوە پێکدەهێنا و نۆێنەرانی مەجلیسی بریاردان تەنیا مۆری تەئیدیان لەسەر بڕیارەکان دەدا.[1]

کۆمارەکانی ناوچەی ئاسیای ناڤین کە هیچ ئامادەییەکیان لە راستای سەربەخۆیی بووندا نەبوو بە تەواوەتی لە بارودۆخی پێش هاتوو بێ ئاگا بوون. لە وەها کەشێکدا کومەڵێك لە ئەندامانی حیزبی کۆمونیستی زاڵ بەسەر ناوچەکە بە هۆی گۆران لە راو بیرکردنەوەیان، هەروەها رێکخستنی حیزبیان بە یارمەتی سیخورەکانی کا. گ. ب لە دەڤەرەکان، هێزەکانی نیشتەجێی رووسی لەو شوێنەو بە پشتیوانی مسکۆ، دەسەڵاتی خۆیان دەپاراست و مەحکەمیان دەکرد. ئەم بژاردانەی دەسەڵاتدار لەراستیدا هەمان میراتگرانی سیستمی کۆن بوون، کە زنجیرە شێوازی حیزبیان تێپەڕاندبوو. ئەوان پاش سەربەخۆیی، تەواوی دەسەڵاتیان قۆرخ کرد و تەنانەت لە دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان هێزە دژبەرە نەتەوەیەکاندا، وەکو دێموکراتو ئیسلامی کە زۆرینەیان بەرهەمی نەوەیی سەردەمی "گلاسنوستی گۆرباچۆف" بوون، سەرپێچیان کرد.

ئەمڕۆکە جگە لە ئاقایەف سەرۆك کۆماری قرقیزستان، (سەرۆکی پێشووی ئاکادیمی زانستە سیاسییەکان) کە لە دەرەوەی حیزبی کۆمۆنیست، دەسەڵاتی بە دەستەوە گرتبوو، ئەوە ڕێبەرانی دیکەی حیزبە کۆمونیستەکانی پێشوو بوون کە دەسەڵاتیان بە دەستەوەیە.

لەگەڵ هەموو ئەمانە ڕێبەرانی ئاسیای نێوەڕاست هێزی ئەوەیان نەبوو گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکانی هەڵقولاو لەهەڵوەشانەوەی سۆڤییەت لەبەرچار نەگرن. بوویە دیاریکردنی شوناسی نەتەوەیی نوێ و سەربەخۆ و گەڕان بۆ پێگەیەك لە بواری پێوەندییەکانی نێونەتەوەییدا کێشەیەکی نوێ بۆ ڕێبەرانی ئاسیای نێوەڕاست پێکهێنا.

لەم روانگەوە کۆمارەکانی ئاسیای ناڤین بۆ ڕێكو پێك کردنی پێکهاتەی فەرمی دەسەڵات هەوڵێکی نوێیان بۆ دانانی چوارچێوەی یاساییو چاکسازی دەستپێکرد. کە باشترنیان دانان و پەسند کردنی یاسای بنەڕەتی لەم کۆمارانەدا بوو.

(١) ئەکبەر حەسەن پوور و پێشوو، "نێوەڕۆکی گۆڕانکاری لە ئاسیای ناوڤینو قەفقاز"، (تاران: ناوەندی توێژینەوەی سیاسیو نێونەتەویی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ساڵی ١٣٧٣)، لاپەڕەی ٤٠٣

هەڵبەت لەگەڵ ئەوەی کە پەسند کرانی یاسای بنەڕەتی نوێ لە کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاستدا دامەزراوە، بەرفراوانی دەسەڵات، قەوارەیێکی نوێ بە خۆوە گرتبووەوە، بەڵام تەنیا، حکوومەتەکانی پێکهاتوو لە نوێنەرانی دیکتاتووری پرولتاریا بوون هەتا ساڵی ١٩٩١ بە ناچاری دەبوایە ڕۆڵی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بگێڕن. بە جۆرێك کە ئەوان بە جێگەی پشتگیری لە جیهانگەری کۆمۆنیزم لەگەڵ ئەرکی پارێزگاری لە بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆیان بەرەوروو دەبن.

**گوتاری دووهەم: نوێ کردنەوەیان مۆدرنیزە کردنی دەسەڵاتخوازی**

دووهەمین شەپۆلی گۆڕانی سیاسی ڕێژیمەکانی ئاسیای ناوین کاتێك دەستی پێکرد کە ئەوان شێوازێکی نوێیان بۆ بەڕێوەبردنی کۆمارەکانیان پێشکەش کرد.

ئەوان گوتیان کە خۆیان دەتوانن وەڵامدەری داواکاری ڕێکخراوەکانی نێو کۆمەڵگای خۆیان بن، بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵێك ڕیفۆرمیان لەبەرچاو گرتبوو تاکو بەم شێوە راوەستان لە کۆمەڵگادا لەنێو ببەن و لە ئەگەری شۆڕشی نێوخۆیی کەم بکەنەوە، بەم پێیە بە ئەنجامدانی وەها چاکسازییەك ڕەزامەندی گشتی وەدەست بێنن و پێش بە سیاسی بوونی خەڵك بگرن، هەتا بەم جۆرە پێگەی سیاسی وەها ڕێبەرانێك لە هەر چەشنە هەڕەشەیەك پارێزراو بێ.

خاڵەکانی جێگای راوێژی چاکسازی دەکرا لە دوو شێوازی لە یەك جیاوازی کولتووری - ئابووری بێنە ئاراوە. ستراتیژی وەها هەنگاوێگ، پاراستنی سەقامگیری سیاسی کۆمارەکان بوو کە بەشێوەی هاوکات دامرکاندنی ویستە گشتییەکان و کەم بوونەوەی دوژمنایەتی ئەوان لەگەڵ ڕێبەرانی لەخۆ دەگرت. بە زیاتر کۆبوونی وەها ڕیفورمێك بەسەر ناڤگەی هەڵسورانی ئابووری، کولتووری، سەرنجی خێرای کۆمەڵگای بۆ لای وەها بابەتگەلێك رادەکێشرا. کەواتە ڕێژیمەکانی ناوبراو سەرکەوتوو بوون و خۆیان وەکو پێشکەوتووخواز و پشتیوانانی بەرژەوەندی نەتەوەیی بناسێنن. لە بەرانبەردا، بەربەرەکانی ڕێژیمەکانی ئاماژە پێکراو لە بەرانبەر ڕیفورمی دێموکراتێکدا نەك هەر نەکەوتە بەر نارازایەتی بەڵکو توانایی ئەوان لە بواری بەڕێوەی بردنی کۆمارەکانی خۆیاندا (بە ڕێکخستنێکی بەرتەسك) پتر دەبوو.

بەم شێوەیە، پلانی وەها چاکسازییەك دەیتوانی بژاردەکانی وڵاتانی ئاسیای نێوەڕاست وەکو "هاوپەیمانی دەسەڵاتخواز" کە لەپێناو سەقامگیری ناوچەدا هەوڵی خۆیان بەکار هێناوە، بیانناسێنن لە رووی مێژووییەوە گۆڕانی ڕێچکەی بژاردە سیاسییەکانی ئاسیای ناڤین لە دەیەی ٨٠ز، دەسپێکی نوێ بوو لە ناوچەکەو بۆ یەکەمجار ڕێبەرانی کۆمارەکانی ئاماژە پێکراو- بە



هۆی گلاسنوست و پروسترۆئیکای گۆرباچۆڤ ـ توانیان لە ناوەند دوور بکەونەوەو خۆیان وەکو پشتیوانانی بەرژەوەندی نەتەوەیی بناسێنن، بەم جۆرە پاساوی بدەن کە ئەم کانگایانە، تایبەتە بە نەتەوەکانی ئاسیای نێوەڕاستە[1].

لە بەرانبەردا ئەوان توانیان تاکو چالاکییەکانیان لە راستای وەدیهێنانی خواستەکانی نەتەوەیی کە لەسەر بنەمای پێدانی کولتووری نەتەوەیی بوو جێبەجێ بکەن.

لە هەر کام لە کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاستدا لەسەر مەسەلەی ڕیفورمی سیاسی سەرپۆشیان داناوە و هۆکارەکەش ئەوەیە کە، ڕێبەرانی ئەو کۆمارانە لەو بڕوایەدابوون کە لە هێنانەئارای ڕیفۆرمی دێموکراتیکدا، ئابووری پێگەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە.

پاش هەرسهێنانی سۆڤییەت، ئاڵوگۆڕێکی گرینگی سیاسی لە گوازتنەوەی دەسەڵاتی تەشکیلاتیداو لە چوارچێوەی حیزبی کۆمونیستەوە بۆ دەزگاکانی دەوڵەتی روویدا. هەرکام لە کۆمارەکان لە بازنەی وەها ئاڵوگۆڕێك دا، سەرۆك کۆمار وەکو سەرۆکی دەوڵەتی نوێ (پێشتر کەسی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست پێگەی سیاسی باشتری هەبوو)، کابینەی وەزیرانی (جێگری شوورای وەزیران)و کۆمیتەی راوێژکارانی سەرۆك کۆمار وەکو ناوەندی سەرەکی بڕیاردانی کۆماری دیاریکران.[2] هەڵەبەت وەها ئاڵوگۆڕێك ناکرێت ئێمە بە واتای دوورەپەرێزی لە ناوەندگەرایی بەردەوامی دەسەلاتی سیاسی لێکی بدەینەوە، بەڵام بە هەرحاڵ بژاردەی کۆمارەکان لە دەسەڵاتێکی زیاتر (لە بەراورد لەگەڵ هەر برگە لە بەڕێوبەرایەتی حیزبی کۆمۆنیست) بەهرەمەند بوون.

کۆمارەکان لە دەڤەری خۆیاندا هەموو سازمان و ڕێکخراوەیان بە تەواوی خستە ژێر رکێفی خۆیان. یاساکان لە هەر کۆمارێکدا بە پەسندی دوایین قۆناخی کۆمیتەی راوێژکارانی کۆماری بە ئەنجام دەگەیشتو دەکەوتە قۆناخی جێبەجێ کردن.

(ئەم کۆمیتانە ١٠ هەتا ١٤ ئەندامیان هەیەو بە بەراوەرد لەگەڵ دەزگای بۆرۆکراسی پێشوو، کۆمیتەی راوێژکارانی سەرۆك کۆمار ٢٠ لە سەد، بە پێی راپورتی گەیشتوو کەمترن). لە هەر وڵاتێك کۆمیتەکان، چوارچێوەی سەرەکی سیاسەت دانانی ئاشکرا دەکرد.[3]

---

(1) “marking Jtwithout mocsow”, Usnewand world raport, 5 April 1991

(2) Bss Brown,, Report on "political change in central Asia: Reform or Regression" the ussr, 12 malcgh 1991, pp. 18 - 21

(٣) هەمان چاوگ.

هەڵبەت دەسەڵاتی سیاسی لە حیزبی کۆمۆنیستدا گوازرایەوە بۆ دەوڵەت. بەڵام دەسەڵاتدارانی پێشوو جیا لە سەرەکۆماری قرقیزستان هێشتا هەر دەسەڵاتیان بە دەستەوە بوو لە ئاسیای ناڤیندا[1] وکەسی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست بوون و ئەمە زۆر ئاشکراو حاشاهەڵنەگرە. ئێستاش ٨٥ تاکو ٩٤٪ ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیست لە ناوەندەکانی یاسادانانی کۆمارەکان دان .[2] هەروەها ئەندامانی کۆمیتەی راوێژکارانی سەرۆك کۆماریو کۆمیسیۆنەکانی چاکسازی ئابووری هەر ئەندامانی پێشووی حیزبی کۆمۆنیستن.[3] بە شێوەی گشتی هەڵکەوتووەکانی هەر کۆمارێك لە راستای جیا کردنەوەی پێوەندی نێوان ناوەندو دەورووبەر دەبوایە بە شێوەی فەرمی حیزبی کۆمۆنیستی خۆیان لە حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی گەلانی سۆڤییەت جیا بکەنەوە. (کۆتایی ساڵی ١٩٩١)و دواتر حوکمی تەکفیری حیزبی دەر بکەن (لانیکەم بواری ناو)و بە جیگای ئەوان رێکخراوەکانی خەڵکی دامەرزێنن. لە کاتێکدا بژارەی کۆمارەکان بواریان بۆ چاکسازی دەرەخساند ئۆگری کەمتریان لە مەڕ دەستێوەردانی هێزەکانی دەرەکی لە خۆنیشان دەدا.

رێبەرانی ئاسیای نێوەڕاست بە کردەوە نیشانیاندا کە لە بەرانبەر پرۆسەی دێموکراتێك زیاتر خۆراگرییان کردووە. بە جۆرێك کە بژاردەکانی ئاماژە پێکراو لەگەڵ گەشەسەندنی رێکخراوە سیاسییەکان بەرەوروو بوون.[4] سەرەڕای پەسند کردنی یەکێك لە بەندەکانی یاسایی بنەڕەتی لەسەر پایەی لابردنی دەسەڵاتی سیاسی حیزبی کۆمۆنیست لە جووڵای ١٩٩١، رێبەرانی ئاماژە پێکراوە لە تومارو هاوکاری هەموو حیزبەکان خۆیان پاراست تەنیا ئێزنیان بە لێبراڵە سیاسییەکان دەدا چالاکی بکەن.

کۆنترۆلی بەردەوامی دەوڵەت بەسەر کەرەستە پێوەندیدارە گشتییەکان، بوونە لەمپەر لە بەردووەم چالاکی گرووپە سیاسییە نافەرمییەکان.[5] کۆنترۆڵی چروپر لەلایەن کۆمیتەی هەڵبژاردن

(١) عەسکەر ئاقایەف پێشتر سەرۆکی ئاکادیمی زانستە سیاسییەکان و جێگری شوورای باڵای قرقیزستان بووە

(٢) لە ساڵی ١٩٩٠، نزیکەی ٨٧ لە سەدی ئەندامانی شوورای باڵای قەزاقسان کۆمۆنیست بوون

(٣) بەم شێوازە، نزیکەی ٨٥٪ ئەندامانی ئوزبەکستان ٩٢٪ لە قرقیزستان، ٩٤٪ لە تورکمەنستان پێکیاندەهێنا.

(4)Mosa w news. 21 July 1991. P. 5

(5) Roland Danlreuther, “Creating News States In Central Asia”, ADEIPHI Eaoer, .No, 28s, March 1994, Pp, 45



(لەژێر رکێفی کۆمۆنیستەکان) لە پێوەندی لەگەڵ کاندیداتورەکانی سەرۆك کۆماری لە ساڵی ١٩٩٠داو لە قەڵەم خستنی هێندێك لە کاندیداتۆرەکان بە هۆی دژایەتی ئەوان لەگەڵ کۆمۆنیزم و دانانی ئەم مەرجە کە هەر کەسێك خۆی بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری بپاڵێوێ دەبێ بە هۆی[1] شەست هەزار، یان سەد هەزار ئیمزا پەسند کرابێ،[2] ئەوە نیشانەی گۆشارە تەشکیلاتییەکان بوون کە لەلایەن ئەو رێکخراوانەوە بەسەر کەشی سیاسی ناوەند وارريد کرابوون.

بە هەرحاڵ، لەناوچوونی چاکسازی دێموکراتێك لە ئاسیای نێوەراست لەگەڵ دژکردەوەی توندی خەڵك بەرەوروو نەبوو[3] و لەگەڵ دانانی هێندێك لە کاندیداتوورەکان، خەڵك لە هەڵبژاردنەکان بەشداریان کرد و بەم شێوازە هەڵبژاردن بەبێ هیچ توندوتیژییەك بەڕێوە چوو.[4] لە راستیدا گرفتی سەرەکی رێکخراوە بەرهەڵستکارەکان بوون تاکو خەڵك، بۆ نموونە: لە ئوزبەکستان[5] زۆربەی خەڵك لە ئاست پرسە سیاسییەکان بێ هیوا بوون[6] کەواتە تێدەگەین تاکتێکی بژاردەکان لە پرۆسەی چاکسازی زیاتر لەسەر لایەنە کولتووریو ئابوورییەکان کۆ کرابووەوە، چاکسازی سیاسی پشتگوێ خرابوو. بەم هۆیە رێبەرانی خۆیان وەك پێشرەوانی گەشەپێدانی نەتەوەیی دەناساند، ئەوان بە دامرکاندنی خەباتی سیاسیو دڵسارد کردنەوەی رێکخراوە سیاسییە دژبەرەکان وایان دەنواند کە هیچ هێزێك ناتوانێ حاشا لە رۆڵی ئەرێنی ئەوان بکات.[7] رێگا چارەی سیاسی بژاردە کۆنەکانی ئاسیای

(١) بۆ وێنە، ئەو رێکخراوانە کە دژی کۆمونیزم بوون و پشت گوێ خران بریتی بوون لە حیزبی رستا خیزی تاجیکستان، حیزبی دێموکراتی قرقیزستان و حیزبی بیرلکی ئوزبەکستان.

چاو لە. Soviet News, 8 March, 1990 pp- 1-4 بکەن

(٢) کاندیدا تورەکانی سەرۆك کۆماری لە ئوزبەکستان و قرقیزستان دەبوایە بە هۆی کۆکردنەوەی سەد هەزار واژۆ پەسند بکرێن، کە چی ئەم ئەژمارە لە قرقیزستان کەم کرایەوە بۆ شەست هەزار واژۆ.

(3) Eastren Europe. News letter,vol. 5, "soviet central Asia: Forced coha bitation," no. 24, 2 Decmber 1991

(4) Radio Liberty Research Bulletin, 13 December 1990.

(5) "Eastren Eruoe Newe Lettr,Centra The Samarkand scenario" vol, 6. no, 21, 7June 1992

(6) Moscow news, 30 December 1990

(7) "central Asia Tndependence" Martha Bvillolcott, Foreign Affairs, Summer 192, p. 116.

نێوەڕاست بە پاڵپشتی چاکسازی لە یاسای بنچینەیی وڵات و بەڕێوەبردنی ڕێفراندۆم بووە، بە جۆرێك کە بە سەرنجدان بە دەسەڵاتی بەرزتری سەرکۆماری، سیستمی سیاسی لەسەر پایەی دەسەڵاتی تاکە کەسی بونیات نرابوو. بۆ وێنە، ڕێبەرانی ئەم وڵاتانە بەپێی بەڕێوەبردنی کۆمەڵێك ریفراندۆم لە ساڵی ١٩٩٥، ماوەی سەرۆك کۆماری خۆیان تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٠ درێژ کردەوە (سەرۆکەکانی ئوزبەکستان، قزاقستان، قرقیزستان) لە هێندێك شوێندا بینراوە کە ماوەی سەرۆك کۆماری زێدە بووە، یان هەتا هەتایی بووە. بە جۆرێك لە تاجیکستان بەپێی ڕێفراندومێك کە لە سپتامبری ١٩٩٩ بەڕێوە چوو، ماوەی سەرۆك کۆماری لە ٥ ساڵ بۆ ٧ ساڵ زیاد کراوە لە تورکمەنستان لەسەر داوای نوێنەری ریش سپییەکان، نیازئۆف، کرایە سەرۆك کۆماری هەتا هەتایی ئەمە بەو واتایەیە کە وڵاتانی ئاماژە پێکراو بە هۆی گەشە نەکردنی کولتووری سیاسی، سیستمی ناوەندی دەسەڵات بە توندنی لەژێر چاودێری سەرکۆماردا بووە.

**گوتاری سێهەم: پرۆسەی چاکسازی فەرهەنگی**

ریفۆرمی کولتووری بۆ خەڵکی ئاسیای نێوەڕاست لە گرینگییەکی تایبەت و سەرنجراکێش پشکدرابوو. بە جۆرێك کە لە زۆربەی خۆپێشاندانە گشتییەکاندا هەمیشە کێشەکانی وەك: زمان، نەتەوە، مەزهەب، وەك هێما نەتەوەییەکانی هەر کۆمارێك، لەبەر چاو گیراون. هەر بۆیە لە ساڵی ١٩٨٩دا، ڕژێمەکانی ئاماژە پێکراو هەوڵیان دەدا هێندێك چاکسازی لەو بوارانەی ئاماژە پێکراو جێبەجێ بکەن هەتاکو بەو شێوەیە هێما نەتەوەییەکان سەرلەنوێ زیندوو بکەنەوە.

ناوەندی ژیاندنەوەی فەرهەنگی لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندی بۆ ژیاندنەوەی سەرلە نوێی زمانە نەریتییەکانی خەڵك دەگەڕێتەوە. زمانی رووسی زیاتر لە ٧٤ ساڵ ڕۆڵی گرینگ و بەرچاوی هەبوو لە ژیانی کۆمەڵایەتی پەروەردە و بەکارهێنان و... . هەموو دەبوایە زمانی رووسی فێربن پێداگرتن لەسەر پەرەپێدانی دوو زمانی (خۆجێیی‌و رووسی) بەتایبەتی بە دانانی خوێندنگای رووسی بووبە هۆکارێك تا نێوەی توێژی لاو لە فێر بوونی زمانی زگماکی بێبەش بن. لەو شوێنانە کە بەستراوەی بە زمانی بێگانە دەتوانی وەکو چاوگی ئاڵۆز کردنی



کۆمەڵایەتی بە ئەژمار بێ.[1] بۆیە نارەزایەتی جەماوەری لەنێوان ساڵەکانی١٩٨٧ و ١٩٨٩ لەسەر ئەم پرسانە کۆ بوونەوە.[2] رووناکبیرانی خۆجێیی، گرووپە نافەرمی و ڕێکخراوە سیاسییەکانی هەر وڵاتێك لە هەوڵی بەکار هێنانی سەرلە نوێی زمانی زگماکی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و بە فەرمی ناسینی لەنێو کۆمەڵگادا بوون.

داخوازی ئاماژە پێکراو لە زۆربەی خۆپێشاندانەکانی خەڵکی ئەم ناوچەیە بەرچاو دەکەوێ.[3] بوویە لە وەڵامی ئەم داخوازییە جەماورییە، تاکە ڕێگای گونجاو، یاسایی کردنی زمانی خۆجێیی ئەوان وەکو زمانی فەرمی کۆمارەکانیان بوو.

لە دوو کۆماری قەزاقستان و ئوزبەکستان، پلانی یاسایی بوونی زمانی خۆجێیی بۆ باسێکی زیاتر لە راگەیاندنەکاندا بڵاو کرایەوە[4]. هەڵبەت لە قرقیزستان پێشتر ئەندامانی ئاکادیمی زانستی رەخنەی توندیان لە بوونی وەها پلانێك گرتبوو[5]. بەڵام ئاقایەف لە کاتی بوون بە سەرۆك کۆمار بەڵێنیدابوو کە پێویستە خۆێندنی قرقیزی لەبەر چاو بگیرێ. کەواتە لە ئاگۆستی ١٩٨٩ تاکو دسامبری ١٩٩٠، هەر وڵاتێك یاسایەکیان لە پێوەندی لەگەڵ بایەخدان بە پرسە کۆمەڵایەتی و زمانی خۆجێییەکان دانابوو[6].

هەروەها لە ساڵەکانی دواییدا، ئایینی ئیسلام ببوو، جێگای سەرنج و بایەخدانی تایبەت کۆمارەکانی ناوبراو. پاڵاوتنە دژە ئایینییەکان لە نێوان ساڵی ١٩٨٠ (بە تایبەتی لە ئوزبەکستانو قەزاقستان) پاش ڕوودانی دووهەمین شەپۆلی گۆڕانی هزری سیاسی، راگیرا. بە

---

(1) Helencarrere d, Encausse, the Decline of on Empire, cha pter one.
(2) Michael Kirkwood, Glasnost: the natioalguestionand soviet language policy, sovid studies vol. 43, no. 1. pp. 61 - 81
(3) Timnr kosaoglu uzbekstudents Demand uzbek Be Mede the Republican state ", longuge Rrporton the ussr, 23 February 1989, pp. 21. 22, and olso see Martha Brill , opcit, pp. 68 – 69."olcot perestrokain kaza khstan
(٤) یەکەمین پلانی پێش نووسی یاسایی کردنی زمانی قزاقی لە مانگی مایی ١٩٨٩و لە ئوزبەکستان لە جوولای ١٩٨٩ بڵاو کرایەوە.
سەردانی ئەم ژێدەرە بکەن:
Mbrill ollcot, perestroika in kaezkhstan opcitand see M. Kirkwood, opcit, p. 77
(5) Bess Brown, Kirgizia: stagnation Gire Wey Democratic Impulse Report on the ussr. 12 june 1990, p. 32.
(6) m. Brill olcott, Ibid

جۆرێك كە ڕێبەرانی ئەو وڵاتانە بە ئەركی خۆیان دەزانی ڕەزامەندیان هەبێ لە هەمبەر بە فەرمی ناسینی ئیسلام. لە ساڵی ١٩٨٩، بە شێوەی فەرمی[1] ئیزنیاندا بە دامەزاندنو كرانەوەی سەدان مزگەوت بۆ یەكەم جار، ڕێورەسمی ئایینی وەكو گرتنی ڕۆژوو لە مانگی ڕەمەزان بە شێوەی ئازاد و بە كردەوە گیرا[2] مەلاو زانا ئایینییەكان ئیزنیان پێدرا كە دەوری خۆیان سەبارەت بە موسڵمانەكان بگێڕن.

زنجیرە بابەتێك لە ڕۆژنامە و گۆڤارە دەوڵەتییەكاندا بڵاو كرایەوە[3] پێشنیارو بۆچوونەكانیان لە پێوەندی لەگەڵ ئاریشە كۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەكان پێشكەش بكەن و تەنانەت مافی بەشداری یاسایی نوێنەرانیان لە كۆنگرەی كاندیداتۆرەكانی گەلی لە ساڵی ١٩٨٩و لە پارلمانی كۆماری لە ساڵی ١٩٩٠دا هەبێ[4].

بەم شێوازە، ڕێژمەكانی ئاسیای ناوەندی بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی سیاسی خۆیان ناچار بوون تاكو لە ئیسلام كەڵكی سیاسی وەربگرن، بۆیە بانگهێشتی موفتییەكانیان كرد تاكو نائارامییە جۆربەجۆرەكان لە ناوچەكانی وەك ئاڵماتا وفەراغنەو دووشەنبە هێدی بكەنەوە[5].

گۆڤارەی فەرمییەكانیش هاوكاری و پشتیوانی ئیسلامیان دەكرد بە جۆرێك خوازیاری هەنگاوی بە پەلە لە بەرانبەر خوو گرتن بە مادە سڕكەرەكان، ئەلكۆل، بێ ئەخلاقی، بەرتیل خواردن..... هتد بوون[6] لە وەرچەرخانێكی بێ وێنەدا، بەڕێوەبەرانی سیاسی پشتیوانیان لە

(١) زیاتر لە ٣٠٠ مزگەوت لە ئەفغانستان لە حاڵی دروستكردندا بوو و زیاتر لە ٢٧٥ مزگەوت لە ئاسیای ناوەندی كرانەوە.

سەردانی ئەم ژێدەرە بكرێ:

moscow news, 25 septamber 1990, p. 5

(2) J. critchlow Isiam in Public Life: con this Be soviet Uzbekistan?, Report on the ussr, 16 March, 1990,p. 23.

(3) ) Ibid

(٤) لە ساڵی ١٩٨٩، لانیكەم چوار زانای ئایینی چوونە ناو گۆنگەرەی گەلەوە

(5) yaacor Ro, I, “the Islamic Jnfluence Nationlin soviet central Asia Ibid, and Oslo Paul Gobl, The Muftiion Moscow TV”, report an The vssr, Aeril 26,1990, pp. 21-22.

(6) No. Usmanor, “useful points of collaboration uzbekstan quoted in j. crtichlow, “Islomin public life” opcit .p.24.



ئازادی سیاسی كرد[1] بە جۆرێك كە هێنانی قورئان لە ئێران و عەربستانی سعوودییەوە ئازاد كراو، بۆیەكەمجار ڕەزامەندیی خۆیان بۆ لەچاپدانی قورئان دەربڕی[2]

بەم پێیە، وەها هەوڵێك بە مەبەستی كاناڵیزەو چاودێری هێزە ئیسلامییەكان لە پێناو دابین كردنی سەقامگیری لەوڵاتدا بوو. ڕێبەرانی ئەم وڵاتانە ناچار بوون تاكو لەگەڵ تەڤگەرە ئیسلامییەكان بە شێوەی فەرمی وتۆوێژی سیاسی بكەن و ئازادی زیاتر بە ئەوان بدرێ. تاكو لە كاتی پێویستدا پشتگیریان بكەن، هەروەك "كریت كلئو" كارناسی ناسراوی كێشەكانی ئاسیای ناڤین، ئاماژە دەكا:

ئەگەر ڕێژیمە كۆمارییەكان دەگەڵ ئیسلام ڕێكو سازاون، هێندێك لە مەلا ڕەسمییەكانیش دەگەڵ دەوڵەت ڕێككەوتوون[3]

لایەنیدیكەی كە نەوەی نوێ دەبوایە سەرنجی پێبدا، چاكسازی یا پێداچوونەوە بە ڕابردووی مێژوویی (پێشو دوای شۆڕشی بلشویكی) ئاسیای ناوەندی بوو. بە جۆرێك بەرە بەرە سەرلەنوێ ئیزن بەم كۆمەڵگایە درا تاكو لە پێوندی لەگەڵ ڕابردووی مێژووی خۆیان ئاخاوتن بكەن. كەریم ئۆف و نەزیریانۆف هەر دووك دژایەتی خۆیان لە پێوەندی لەگەڵ تێكڵاو بوونی ئاسیای نێوەڕاست لەگەڵ سۆڤییەت بە درێژایی دەسەڵاتی ڕووسەكان دەربڕیوە[4] و هاوبەش بوونی جووتیارانییان بردە ژێر پرسیارەوە.[5] كۆمەڵێك لەو ڕێبەرانەی ئەو سەردەمە لە لایەن دەسەڵاتەوە ڕێزیان لێ نەدەگیرا[6] ڕێبەرانی دیكەی وكوو خان كیساری تاسمۆف، یوزان حاجیو شێخ عەلی مایتیفیش وەبەر ئەم لوتفە كەوتن. ڕێبەری كۆمارەكان تەنانەت پێیان لەو زیاتر درێژ كردو كۆمەڵێك ئیمكاناتی فێركاری و لێكوڵینەوەیان بۆ ئەم مەبەستە تەرخان كرد[7]هەروەها هەنگاوگەلی خێرا لە پێوەندی دەگەڵ دژایەتی ڕووسی، گۆڕینی ناویی شارەكانو هیماكان، پێكەرەكان و هی... جێبەجێ كرا[8]هەروەها بژاردە سیاسییەكانی ئاسیای نیوەڕاست

(1) J. critchlow Isiam in Public Life: con this Be soviet Uzbekistan?, Report on the ussr, 16 March, 1990,p. 23

(2) Ibid

(3) “Soviet News”, 8 July 1990, P.7.

(4) J. Chritchlow, “Islam in Pilbic life… Opcit, P.25.

(5) “Soviet News”, 22 march 1990, P.7.

(6) News week, 16 july 1991, p. 51.

(7) CaRISLE, Opcit.

(8) J. Chritchlow uzbebistan: wgatever Heppenedto Marxism? Report on The ussr march, 1991, pp. 17 – 20.

به جۆرێك خۆیان دەنواند كە خوازیاری چاكسازی نەتەوەیین. هەڵبەتە ترسـی ئـەوە هـەبوو كـە رادەی ویستە نەتەوەیەكان لە رادەبەدەر زیاتر بێ، بەڵام ڕێبەرانی ئاماژە پێكراو وایـان دەنوانـد كە خۆیان وەكو قارەمانی كولتوری نەتەوەییو پشتیوانی گەشەپێدانی نەتەوەیی بناسێنن تـاكو كۆنترۆلی كاروبارو پرۆسەی سیاسی وڵاتی خۆیان بگرنە دەست.

### ١ ـ ٣. دەركەوتنی ناسیونالیزم.

دەركـەوتنی ناسـیونالیزم لـە نێـوان كەمینەكانـدا دەتـوانرێ وەكـو یـەكێك لـە ئاخێزگـە گرینگەكانی شلەژانی سیاسی لە هەر وڵاتێكدا بە ئەژمار بێ. هاتنی ناسیونالیزم لە هەركام لە وڵاتانی سۆڤییەتی پێشوو پێشاندەری تێكشكانی سیاسەتی نەتەوەكان لەم وڵاتەدا بوو، لەگـەڵ تـەقلای بـەربڵاویی حكومـەتی ناوەنـدی لەسـەر دانـانی پێناسـێكی تـاك،[1] ناكۆكییـە ئەتنیكییەكان بە شێوەكی لە رادەبەدەر زیاتر بووەو پێكهاتەی فیدراڵی كۆمەڵگای سـۆڤییەتی دابوو بەر رەخنە.

هـەروەها بزووتنـەوە نەتەوەییـەكان، رۆڵـی سـەرەكیان لـە وەلانـانی بـژاردەكانی حیزبـی كۆمۆنیست لە هەر وڵاتێكدا هەبوو. بە جۆرێك هێزە نەتەوەخوازەكان لە گورجستان، مۆڵداڤیو كۆمارەكانی باڵتیـك پـێش هەرەسـهێنانی سـۆڤییەت، وەهـا بارودوخێكیـان هـەبوو. هـاتنی ناسیونالیزم بۆ ناوچەكە دەیتوانی وەك گۆنجاوترین هۆكاری لاوازبوونی ڕێژیمەكانی ناوچـەكە بـە ئەژمار بێ. بەڵام دژكردەوەی ئاسیای نێوەڕاست)جگە لە تاجیكـستان) نـەك هـەر ئامـانجێكی وایان نەگرتە پێش بەلكو دژكردەوەی ئەوان لە بەرانبەر پرۆسترۆێكا گلاسنوست لە چەندین لاوە جێگای شرۆڤە و پرسیارە. یەكەم بەلەبەرچاو گرتنی ئەوە كـە ناوچـەكە لـە رووی ئابوورییـەوە بێبەش كرابوو، كە واتە بۆچی تەنگژە سیاسیو كۆمەڵایەتییـەكان پێـك نـەهاتووە؟ دووهـەم، بۆچی لەگـەڵ ئـەوەی كـە خـەڵكی ئاسـیای نێوەڕاسـت لـە رووی سیاسـی وە دەروەسـتییەكی ئیدئۆلۆژی كەمیان لە بەرانبەر حیزبی كۆمۆنیستدا هەبووە؟، بەڵام هـەموو جـارە بـژاردەكانی كۆمۆنیست دەسەڵاتیان بەسەر ئەوانەوە بووە؟ سێهەم، بۆچی بە سەرنجدان بـەوەی كـە زۆرتـرین جووڵانەوەی نەتەوەخوازی لە رووی كۆمەڵایەتییەوە لە ئاسیای ناڤین سـەریهەڵداوە؟ بـەڵام وەهـا بزووتنەوە گەلێك لە ئاستێكی لاوازدا كاریان كردووە؟ لە وڵامی ئەم پرسیارانەدا دەتـوانین بـەم

(1) Graham Fuller, centeal Asia The guest for Identity Current History. Vol. 93, no. 582. April 1994. p. 196 .



شێوەیە پاساوی بكەین كە ناسیونالیزمی ئاسـیای نێوەڕاسـت وەكـو مەترسـییەكی بـەهێز بـە ئەژمار نەهاتووەو هەر ئەمە بۆتە هۆی سـەقامگیری سیاسـی لـەم كۆمارانـە بـە جۆرێـك كـە بارودۆخ بۆ پاراستنی بژاردەكانی حیزبی كۆمۆنیست و دەسەڵاتی سیاسی ئەوان بۆ بەڕێوەبردنی كاروبار دابینكراوە. لە شرۆڤەی ئەم بابەتەدا دەتـوانین پێـداگری لەسـەر سـێ كـاراكتێری ئـەم یارییە واتە دەوڵەت (حیزبی كۆمۆنیست)، تەڤگەرە دژبـەرەكان (گرووپـە نافەرمییـەكان كـە پێش دارِمانی سۆڤییەت پێكهاتن)و خەڵك بكەین. لەم پێوەندییەدا رەنگە بـۆ جیـا كردنـەوەی سیستمی سیاسی ـ كۆمەڵایەتی بە سێ لێكدانەوەی كاتی قاییل بین. سەرەتا، قەیرانی ئابووری وەك گرینگترین لێكدانەوەی كاتی بە ئەژمار هاتووە، ئەگەر سیستمێكی ئابووری بە هێنانە دی زۆرترین خواستەكانی پێویستی خەڵك سەرنەكەوێت، سرووشتییە كە دژكردەوەو رەنگدانـەوەی خەڵك لـە ئاسـت وەهـا سیـستەمو رێبەرانێكـدا نگـەتیڤ دەبێـت. دووهـەم، لـە نـاخی وەهـا سیستمێكدا نارەزایەتی گەلێك- بەتایبەتی لـە نێـوان پـۆلێنی روونـاكبیر- دەردەكـەوێت كـە خوازیـاری گۆڕانكـاریی بنـەڕەتی دەبـن. كـەوابوو ئـەم پۆلێنبەندییـە بـە سـەرنجدان بـەهێزی ئیدئولۆژیك و توانای رێكخستنی خۆیان، تاكو بە دندانی رابوونی جەماوەری و دروسـتكردنی ناكۆكییە كۆمەلایەتییەكان، هەرِەشە لە دەوڵـەت بكـەن سـێهەم، كـاركردی رێـژیم دەكەوێتـە بـەرباس. بریـاردانی لاوازی دەوڵـەتیو ناكارامـەیی لـە كاروبـار دەتـوانرێ هـۆی سـەرەكی سەرهەڵدانی قەیرانی كۆمەڵایەتی بێ. خەڵكی موسڵمانی ئـەم ناوچـەیە و ناقـابیلی ئـەوان لـە جۆری گەشەسەندنی نەتەوەیی لە سۆڤییەت و پێوەندی بەردەوامی ئەوان بە كولتـووری غـەیرە كۆمۆنیستی وەكو گۆنجاوترین چاوگی بزووتنەوەی نەتەوەخوازی بە ئەژمار هاتوون. بـە هـاتنی پرۆسترۆیكا (ئابووری ئاسیای ناوەندی بەرەو لەناوچوونێكی قورس چـوو)و لـە گلاسنۆستیـشدا (ئازادی زیاتری بۆ باس لەسەر كێشەكانی ناوچەكە) كێشە كۆمەڵایەتییەكان پتر بوو. هەر بۆیە وا لە لێكنادرێتـەوە كـە كێـشەكانی بـەدی هـاتووی لـە نێـوان كۆمـەڵگاو دەوڵەتـە، بـەلكو پێكدادانەكانی ئاماژە پێكراو زیاتر لەنێوان گرووپە كۆمەڵایەتییە ركەبەرەكان بووە.

بەرنگاری خەڵكی ئاسیای ناڤین لە بەرانبەر دەسەڵاتی رووسەكاندا پیـشاندەری ئامـەزرۆییێكی زۆری ئەوان بە كولتووری نەریتی خۆیان (لە بواری گرێدراویان بە هێندێك بـەهای كۆمەڵایـەتی)و بە نیشانەی بوارێكی گرینگـی وەدی هـاتوو بـۆ بزاوتـە ناسیۆنالیـستی یەكانیانـە، نارەزایـەتیی جەماوەری لە جۆری گەشەسەندنی كۆمەڵایەتی سۆڤییەت بووە هۆكارێك تا حەشیمەتی خـۆجێیی

لە رووی کۆمەڵایەتییەوە تێك بروخێن بە جۆرێك کە دەرەتانی ئەوەیان نەبێ بتوانن ناسیۆنالیزمێك کە لەناخیاندا پاراستوویانە، بیانهەوێت لە چوارچێوەی جووڵانەوەکی سیاسی دەری ببرن. لە کاتێکدا ئازادی گلاسنۆست دەرفەتێکی نوێی رەخساند هەتا لەسەر خواستەکانی ناسیۆنالیستی خۆیان پێداگری بکەن. بۆ خەڵکی ئاسیای نێوەڕاست پرسگەلێك وەکو زمان، ئایین و پێشکەوتنە مێژوویی یەکان لە گرینگییەکی تایبەتی بەهەرەمەند بوو بە جۆرێك کە تەنانەت ئامادە بوون چاوپۆشی لە گۆڕینی سیاسەتی فەرمانڕەوایی خۆیان بکەن بەڵام پێگە لە دەست نەدەن تەنیا لە تاجیکستان رواڵەتی مەسەڵەکە جیاوازی هەبووو هێرشی ناسیۆنالیزمەکان بە شێوەی راستەوخۆ دژی رێژیمی دەسەڵاتدار کۆببوونەوە.

دژایەتی کۆمەڵایەتی خەڵکی تاجیکستان لە چوارچێوەی خۆپێشاندانی گشتی، پتەو بوونی بزاڤە دژبەرەکانی‌و گرینگتر لە هەموان رادیکالیزە بوونی ئیسلام و بەرجەستە بوونی بە شێوەیەکی جێگای سەرنج دژایەتی لەگەڵ بژاردەکانی تاجیکی کردبووە ئامانج. چاوگی سەرەکی ئەم ناکوکییە کۆمەڵایەتییە لە کارکردی خراپی حکوومەتی تاجیکستان (پێش تێکرووخانی سۆڤییەت) کورت دەبێتەوە. بژاردەکانی دیکەی سیاسی کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاست (ئوزبەکستان، تورکمەنستان، قرقیزستان و قەزاقستان) لە بەربەرەکانی کە لەگەڵ ئەم ناکۆکییە کۆمەڵایەتییە، لە راستای گۆڕانی رێچکەی سیاسی ـ کادری خۆیان (٩٠ ـ ١٩٨٩)، هێندێك چاکسازیان لە بواری ئابووری، هەروەها لە بواری کولتووری دەستپێکرد. لە راستیدا، وەها کردەوە گەلێك بووە هۆکارێك تاکو مەترسی بەهێزی دژمنایەتی کۆمەڵایەتی لەنێو بچێت و بژاردەکان لە هەر چەشنە مەترسییەك پارێزراو بن.

لەلایەکی‌ترەوە، رێبەرانی ئەم وڵاتە بڕیاریاندا تاکو لە حکوومەتی ناوەندی دوور بکەونەوە و لەلایەن جەماوەرەوە پێشتیوانیان لێ بکرێ. بۆ ئەم مەبەستە هەر ئەوەندە بەس بوو کە ئەوان لەگەڵ سیاسەتی دژی ئایینی ناوەند و چاودێری چروپڕی ناوەند بەسەر سەرچاوە سرووشتییەکانی وڵاتانی خۆیان و چالاکییە ئابوورییەکان دژایەتی بکەن. هەر بۆیە بە گۆڕانی خواستی سیاسی نەتەوەیی نوێ بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری، ئەوان توانیان دژمنایەتی گشتی لە درێژ ماوە بە دژی حکوومەتی ناوەندی بوروژێنن و لە کورت ماوەدا لە پشتیوانی گشتی بەهەرەمەند بن.



بەم پێیە، رێبەرانی ئاسیای ناڤین (جگە لە مەحکەم ئووف سەرۆك کۆماری تاجیکستان) بە گرتنی پێشی وەها سیاسەتێك دژمنایەتی گشتی کۆنترۆڵ بکاو ئەوەی لە دژی حکوومەتی ناوەندی بە کار بێنن. لەگەڵ ئەوەیشدا بە دەستپێکردنی کۆمەڵێك چاکسازی کولتووری ـ ئابووری خۆیان وەك پشتیوانی نەتەوەیی ناساند. جیا لەوە، بە دوای وەها رێفورمێکدا چوون دەیتوانی بواری بۆ سەقامگیری سیاسی هەر کۆمارێ دابینبکاو دژ کردەوەی گرووپە بەرهەڵستکارەکان هەڵبوەشێنێتەوە. بەم شێوازە رێبەری وڵات، ئیتر کەسێکی دژی کۆمار و دژی نەتەوە لەقەڵەم نەدەدرا بەلکو کەسێکە کە پشتیوانی کۆمارو وڵاتە.

لە راستیدا، چاکسازییە گرینگە کولتووری و ئابوورییەکان هێزێکی ئەوتۆی پێدان کە لە بەرانبەر رێفۆرمی سیاسیدا بەربەرێکانە بکاو ببنە هۆکاری سەقامگیری سیاسی ناوچەکە. بۆیە رێبەرانی پێشووی حیزبی کۆمۆنیست بە گرتنە پێشی وەها سیاسەتێك توانیان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر تەشکیلاتی سیاسی بپارێزن. رێکخراوی دژبەر، لە کۆمارەکاندا هەبوون و هەن بەڵام لە چالاکی سیاسی‌و هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەست نەهێنا. چاودێری بەردەوامی حکوومەت بەسەر پرۆسەی سیاسی‌و پەرەگرتنی کەرستەی پێوەندییە گشتییەکان لە ناوەوەی کۆمارەکاندا بووە هۆی دابەزینی کارتێکەری هێزە بەرهڵستکارەکان و پتەو بوونی پێگەی سیاسی بژاردە کۆنەکانی ئاسیای نێوەڕاست.

**گوتاری چوارم: تێروانین لە رێفۆرمی ئابووری**

پاشکەوتووی ئابووری لە ئاسیای ناوەندیدا و کاریگەری لەسەر بیاڤە کۆمەڵایەتی‌کاندا، هۆکاری سەرەکی شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکان لەناوچەکەدا بوو. بۆیە بابەتێکی گرینگتر کە بژاردەکان دەبوایە سەرنجیان پێ‌بدایە پرسی چاکسازی ئابووری بوو سێ بابەتی سەرەکی ئەم پرۆسەیە بریتی بوون لە: بەدەستهێنانی هەموو چالاکییە ئابوورییەکانی ناوەوەی سنوورەکانی خۆیان (دەسەڵاتداری ئابووری)، چاکسازی ئیستراتیژیك بە مەبەستی دابەزاندنی کارتێکەری ناکارای چین و توێژەکانی کۆمەڵگا، سەرمایە دانانی نوێ بە مەبەستی لەناو بردنی ئاریشە کۆمەڵایەتییەکان واتە بێکاری، پێشکەوتن لە کاروباری ئاماژە پێکراوە یارمەتی بە سەقامگیری سیاسی لە درێژە ماوەدا. هەڵبەت لە کورت ماوەیشدا، بە دوادا چوونی فەرمانرەوایی ئابووری لە بازنەی ناخۆیی دەرەتانی بە بژاردەکانی ئاماژە پێکراو دا تاکو حکوومەتی ناوەندی لەو پاشکەتنە بەرپرسیار بناسێنن‌و تاوانەکە لە خۆیان دوور بخەنەوە.

چاوگی ئابووری ئەم دژمنایەتییە (لەلایەن خەڵكو بژاردەكان) بە دژی ناوەند، زیاتر بە هۆی پێوەندی چەوسانەوەی ئابووری بوو كە دەسەڵاتدارانی حاكم بۆ ماوەی هەفتا ساڵ بەڕێوەیان برد. ئامانجی مسكۆ، كەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە سرووشتییەكان و بەڕێوەبردنی كۆمارەكانی ئاسیای ناوەندی بوو. زیاتر لە ٩٠٪ی سەرمایەدارە پێشەسازییەكانی ناوچەكە لەژێر كۆنترۆڵی ناوەندا بوون[1]. جگە لە تەرخانكردنی سەرمایەدانانی گەورە لە پێناو مەترسی ئاماژە پێكراو، تەرخانكردنی بودجەی نێوخۆی كۆمارەكان زۆر لەوە كەمتر بوو.[2] بایەخی لە رادەبەدەر بە ناوەند (كۆبوونی پێوەندی دەروونی نێوان وەزارەتەكانی ناوەندی) ببوە هۆی بێ ئاگا بوون لە ویستە نێوخۆییەكانی ناوچەكە، بە جۆرێك ئاكامێكی خراپی لە ئاسیای ناوەندیدا بەجێ هێشت كە دەتوانین ئاماژە بە ناكارامەیی بەرهەمهێنان لە بواری ئابووری‌و هاندان لە رووی كۆمەڵایەتی و بارودۆخی نالەباری سرووشتی بكەین وەزارەتەكانی بەستراوە بە پێشەسازی بە دەستێوەردانی نابەجێ لە پێوەندی لە گەڵ كرێكارانی دەرەكی بارودۆخی بۆ گەشەسەندنی خراپی پێوەندییە قەومییەكان پێكهێنا. هەروەها خۆراگری ئەوان لە بەرانبەر سەرمایە گۆزاری زیاتر تێك دەرانە بوو. بۆ ئەو جۆرە كردەوانە دەتوانین ئاماژە بە سەپاندنی بڕیاری ناڕەوای پێشخستنی دروێنە كردن، بێ‌كەڵك راگرتنی زەوی‌و ئاو، هاندانی خەڵك بۆ كەڵك وەرگرتنی خراپ لە كوودە كیمیاییەكان بكەین.

بژاردە نوێیەكانی ئاسیای نێوەڕاست زۆر كەمتر لە باب و باپیرانیان، وەها بارودۆخێكیان قەبووڵدەكرد. بۆ وێنە، كاتێك "نەزەر بایۆف" لە ژووئیەی ١٩٨٩دا وەك یەكەمین كەسی حیزب دەركەوت زیاتر هێڵی گۆرباچۆفی لەنێو پرۆسترویكادا رەنگی دایەوە. وتەكانی ناوبراو لە كۆبوونەوەی بەرزی كۆماریدا زیاتر لەسەر بوونی كێشە كۆمەڵایەتییەكانی ناوچەكە وەك بێكاری، شوێنی ژیان و بارودۆخی نالەباری لەش ساغی بوو. بۆ لابردنی ئەمانە دەبوایە پلانگەلێكی درێژ ماوە جێبەجێ بكرایە.[3]

لە بەرانبەردا ناوبراو سەرقاڵی پەرەپێدانی بیروباوەڕێك بوو كە بریتی بوو لە سیاسەتە سەرەكییەكانی. ناوبراو پێشكەتنی گوزەرانی كۆمەڵایەتی‌و بەرهەمهێنانی ئابووری لە ریزی

(1) M. Rywkin, opcit, chapter Four
(2) Donna BagryOutscde Moscow: powe, politicsand Budgetary policy in the soviet Republics, Columbia university press, 1987, p. 119 .
(3) Bess Brown, nursultan nazarbayevof Kazakhstan, opoit, p. 11."



باش كردنی گوزەرانی خەڵكی ئەو كۆمەڵگایەی لەقەڵەم دەدا.[1] بەهەرحاڵ ئامانجەكانی نەزەر بایەف زیاتر لەژێر كۆنترۆڵ دەرهێنانی سەرچاوەكان و پێشەسازییەكانی هەركام لە كۆمارەكاندا بوو، ئەمە دەرخەری ئەوەبوو كە بزوێنەرانی سەرەكی گەشەی بەڕێوەبەری لە هەر كۆمارێكدا لە ناوخۆیی دەسەڵات سەرچاوە دەگرێ.

وەها بیروبۆچوونێك لە لێكدانەوەیی دەرهەستی كەریم ئۆف و ئاقایەفیشدا، لەسەر بەدەست هێنانی دەسەڵاتی سیاسیدا هەبوو.[2] لە كاتێكدا سەرلەنوێ وتوێژەكان لە پێوەندی لەگەڵ یەكگرتنی فیدارڵی (١٩٩٠_ ١٩٩١) پێكدەهات (واتە هێندێك پێش جیابوونەوەی سۆڤییەت) رێبەرانی ئاسیای نێوەڕاست بە روونی لە پێوەندی لەگەڵ سەربەخۆیی كۆمارەكانی خۆیان بە هۆی بەستراوەییەكی زۆری ئابووری بە سۆڤییەت رد دەكردنەوە. بە جێی ئەوە، ئەوەی كە ویستی ئەوان بوو واتە كۆتایی هێنان بە تالان بردنی ئابووری و جێگر كردنی پێوەندی دوولایەنە لە بارەتەقای دانی نرخەكان، (بە مەبەستی كەڵك وەرگرتن لە نرخەكانی ئەوان) حكوومەتی ناوەندی دەتوانێت چاودێرییەكی زۆرتر بەسەر وڵاتانی ئاماژە پێكراودا بكا.[3]

بە دوای وەها ئامانجێك، هەركام لە كۆمارەكانی ئاسیای نێوەڕاست (بەرابەر لەگەڵ كۆمارەكانی دیكەی سۆڤییەت) رێچكەی سیاسی، ئابووری خۆیان لە ساڵی ١٩٩٠ بڵاو كردەوە. [4] دەسەڵاتداری سیاسی، لە پێوەندی لەگەڵ خاوەنداریەتی‌و چاودێری بەسەر سەرچاوەكان (گشت سەرچاوە سرووشتی‌و سەرمایە دانەرە پیشەییەكانی نێوخۆی كۆمار) لە بەرانبەر داواكاری مافی بڕیاردان لە پێوەندی لەگەڵ هەڵبژاردنی سیستەمە كۆمەڵایەتی‌و

(1) Brill olcott ."perestroika in Kazakhstan", , opcit

(٢) كەریم ئۆف و ئاقایەف رازی بوون بە داهاتووی یەكیەتی سۆڤییەت لە چوارچێوەی كۆنفدراسیۆنێكی سیاسی پێكهاتوو لە كیانی سەربەخۆ. هەر دوو لەو بڕوایەدا بوون كە بەستراوە بوونیان بۆماوەی ٧ دەیە بە سۆڤییەت (ناوەند) بۆ ئەوان قازانجی نەبوو لە شوێنێك كەریم ئۆف ئاماژە دەكا كە بۆچی دەبێ نرخی لۆكە مسكۆ دیاری بكاتو ... .

J. critchlow, "Uzbeks look ad Gorbachevs union", op cit, p. 21.
(3) J. critchlow, , opcit ."uzbeks Baching offties With centre

(٤) ئوزبەكستان لە ١٢ سپتامبری ١٩٩٠، توركمەنستان لە ١٦ سپتامبری ١٩٩٠، تاجیكستان لە ١٨ ئوكتۆبری ١٩٩٠، قرقیزستان ٢٤، ئوكتۆبری ١٩٩٠و قەزاقستان ٢٥ ئوكتوبری ١٩٩٠.

سیاسییەکانداکرا.[1] لە کاتێکدا وەها بۆچوونگەلێك لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە زیاتر بە شێوەی تیۆری دەگوترا. بەڵام بەهەرحاڵ ئەمە یەکەمین هەنگاو بوو کە بۆ بەدەستهێنانی کۆنترۆلی ئابووری وڵاتانی ئاماژە پێکراو هەڵێنرا. هەروەها ڕێژێمەکانی ئاماژە پێکراو لە ماوەی وتوێژەکانیان لە بارەی یەکگرتنی فیدراڵی (١٩٩٠ ـ١٩٩١) دەیانتوانی بڕیاری سەرسوڕهێنەری خۆیان لەسەر بەرگریکردن لە بەرانبەر چاودێری ناوەند رابەگەیەنن. پاساوەکانی ئەوان دەیتوانی لە سەر بنەمای پەرەدان بە گوشارە گشتییەکان لە ناوەوەی کۆمەڵگای خۆیان بێتە ئاراوە، هەر بۆیە کۆمارەکانی قەزاقستان و ئۆزبەکستان وەها پلانێکیان رەت کردەوەو زیاتر خوازیاری گرینگیدان بە لایەنی ئابووری بوون[2].

ئاقایەف، نەزەبایەف و کەریم ئۆف، هەرکام یەك بە دوای یەك لە پێوەندی دەگەڵ بەرەنگاری گۆرباچۆف بۆ دانی کۆنترۆلی سیاسی بەسەر کۆمارەکانی ئاماژە پێکراودا وەبەر لۆمەیاندا. تەنانەت تاکو پێش سەربەخۆیی راستەقینەی ئاسیای ناڤین، ئەم ڕێژیمانە سیاسەتی سەربەخۆیی خوازیان درێژە پێدا. چوونە سەری نرخی خواردەمەنییەکان.[3] دابەزینی بەرهەمێنانی لۆکە لە ئوزبەکستان،[4] زیادە بوونی کۆچی رووسەکان.[5]و رەخنەی نەزەر بایەف لە گۆرباچۆف بۆ پشت گوێ خستنی پلانی ٥٠٠ رۆژەی "یالنسکی"[6] بوونە هۆکاری کێشە و گرفتی بۆ کۆنترولی ناوەند.

بێگومان دەبوایە بۆ گەشەپێدانی ناوچەکان زیاتر گرینگی بە کۆمارەکان بدرایە. پێشتر هەر کۆمارێك کۆمیتەگەلێکی تایبەتی بۆ نوێژەن کردنەوەی سەرلەنوێ ئابووری پێکهێنا بووو لانیکەم لەم بوارەدا سێ رێکخراو بە دوای یاسای کردنی خاوەنداریەتی تایبەتی خۆیان بوون. قەزاقستان، یەکەمین بانکی تایبەتی بە مەبەستی دابینکردنی لایەنی ماڵی پرۆژە بازرگانییەکانی ناوچەکە دروستکرد.[7] بەم شێوەیە ڕێبەرانی ئاسیای ناڤین بە شێوەیەکی

(1) Moscow news, 23 november 1990. p. 7.
(2) J. critchlow “Uzbeks looksad Gorbache,v unian Ideas”, Report on the ussr Imarch 1997 Pp. 20 – 25
(3) Mark Rhodes “Food supply in the ussr”, Report in the ussr. 110. ctober 1991, p. 15.
(4) Moscow News, 22 march 1991, p. 6.
(5) J. crtichlow, “Uzbeks Demand Haltto Russinn In Migration” Report on the ussr, 2 march 1990, Pp. 18 – 19.
(6) Bss Brown, nursultan Nazarbayev of Kazakhstan op cit, p. 12.
(7) J. critchiow, “Political changes in cenral Asia” J. critchiow



بەرچاو هەم لە ناوەوە و هەم لە دەرەوە وەکو ئۆگرانی گەشەی ئابوورییەکی سەربەخۆ وڵات لە قەڵەم دەدران.

لە پێناوی هەوڵدان بۆ سەربەخۆیی ئابووری، ڕێژیمەکانی ئاماژە پێکراو دەبوایە کۆمەڵێك کار بۆ پێشخستنی پێگەی ئابووری خۆیان و کەمکردنەوەی رادەی نارەزایەتی گشتی جێبەجێ بکەن. ئەم کردەوانە دوو جۆر بوون: یەکەم هەوڵدان بە مەبەستی جێگرکردنی پێگەی ئابووری لە ناوخۆی وڵات، دووهەم: راکێشانی سەرمایەی نوێ بە مەبەستی لابردنی ئارێشەی بێکاریو پەرە نەگرتوویی ئابووری.

یەکەمین هەنگاوی سەرەکی لەم بوارەدا، واژۆی پەیمانی هەڤکاری ئابووری لەنێوان پێنج کۆماری ئاسیای ناڤین بە مەبەستی پشتگیری لە دابەشکردنی کەڵ و پەل لەناوچەکەدا بوو.[1] وەها پەیمانێك (لە بواری بەرێکردنی مەوادی خواردەمەنی) بۆ کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاست دڵنیا بوون لەوی کە زۆر باشتر لە کۆمارەکانی ئەوروپایی، سۆڤییەت دەتوانێ وەها کارێك جێبەجێ بکەن.[2] لە لایەکی دیکەوە ئیمکانی بەستنی گرێبەستەکان، پەیماننامەکانی دوو لایەنە لەگەڵ وڵاتانی دیکەی سۆڤییەت لە ئارا دابوو.[3]

لانیکەم کۆمارەکانی قەزاقستان، قرقیزستان و ئوزبەکستان هەنگاوگەلێکیان لە پێناو کەمکردنەوەی کارتێکری ناکارایی سیستم بەجێ گیاند. (هێندێ کاری باش کران بۆ وێنە یارمەتی دانی ماڵی بە بێکاران،[4] دانی خواردەمەنی بە منداڵانی ژێر ١٣ ساڵ بە خۆڕایی، گەرانتی کردنی مافەکانی مامۆستایان و خانەنشینیان[5] هێندێك هەنگاوی چاکسازی بچووك، هیوایەکی بۆ چارەسەر کردنی شوێنی نیشتەجێ بوون پێکهێنا.[6]

هەروەها ڕێبەرانی کۆمارەکان بە مەبەستی گەشەپێدانی بناغە پیشەییە لاوازەکانی وڵاتی خۆیان، کۆمەڵێك هەنگاویان لە پێناو راکێشانی سەرمایەدارانی نۆێ جێبەجێ کرد. لەم بوارەدا قەزاقستان پێشەنگ بوو، بە جۆرێك کە" نەزەر بایەف" لە ماوەی چەند ساڵی

(1) Moscow news, 13 July 1990, p. 4.
(2) M. Rywkin, op cit, p. 50
(٣) لەم بوارە، کۆمەڵێك گرێبەست لەگەڵ روسیا، ئوکراین، ئازەربایجان، بیلورووس و گورجستان واژۆکران.
(4) Weekly Record of Events on the ussr, 15 July 1991, p. 31.
(5) Izvestia, 5 octobe 1991
(6) J. critchlow, “the Crisis Deepens” Report on the ussr, 4 January 1991, p. 37.

رابردوودا، لە پێوەندی لەگەڵ سەرمایەگۆزاریدا دەستی بە وتوێژ و توێژینەوە لەمەڕ جۆرەکانی پەرەگرتن لە کۆریای باشوور، تورکیە، پاکستان، ئەمریکاو هێند کرد. وڵاتانی ئاماژە پێکراو لە کۆتایی مانگی مای ١٩٩١ نزیکەی ٥٧ گرێبەستی هاوبەشیان لەگەڵ وڵاتانی دەرەکی و کۆمپانیا تایبەتییەکان واژۆ کردووە.[١] دوو بیلیۆن دۆلار(مەوادی خواردەمەنیو سەوزە) لەلایەن پاکستانەوە، دانی سەرمایەی پێویست لەلایەن کۆریای باشوورەوە بە مەبەستی دامەزراندنی ٧ کارگەی جلو بەرگ، لە بەرانبەردا هەناردنی ماشینی جلوبەرگ شۆردن و یەخچاڵ بۆ وڵاتانی هاوقازانج. وتوویژ لە پێوەندی لەگەڵ دانانی پاڵاوگەی نەوت لە قەزاقستان لەگەڵ کۆمپانیای ئەمریکایی شۆروون و عەربستانی سعوودی ئەنجامدراوە.[٢] هاوشێوەی ئەمە، ئوزبەکستان و تاجیکستانیش بۆ پێشخستنی ئابووری خۆیان ناچار لە هەوڵی راکێشانی سەرمایەی دەرەکیدا بوون. ئوزبەکستان نزیکەی ٨٢ گرێ بەستی هاوبەش وەکو دانانی کارگەکی بەرهەمهێنانی مەوادی دەرمانی لەلایەن ئەسپانیا،[٣] کارگەیی پیاڵەی شووشەیی لەلایەن چینەوە،[٤] دانانی سەرمایە، بەبڕی ٢١٦ بیلیۆن دۆلاری بۆ دامەزراندنی پاڵاوگەکی گاز تا کۆتایی مانگی ژووئەنی ١٩٩١ واژۆ کردووە.[٥] هەروەها وڵاتانی ئاماژە پێکراو بە مەبەستی کۆنترولی زیاتری گەشە پێدانی نێوخۆیی لە توانای ئەوەیان هەبوو کە بڕێکی زۆر لە سەرمایەکانی خۆیان لەو شوێنانەی کە کرێکاری زیاتر لێ بوو تەرخانبکەن، بۆ نموونە، کارخانەکانی مەوادی خۆراکی لە شوێنێکی قەزاقستان بە ناوی "نوێ ئەزەن" دروستکرا کە لە ساڵی ١٩٨٩خاوەنی کرێکارانی زیاتر و گۆڕەپانی تەنگژەی سیاسی بوو. بەم شێوەیە، رادەیەکی زۆر لە دووکانەکانی ئاوریشم بۆ (ئووس ئووبلاسی) قەزاقستان تەرخانکرا.[٦]

---

(1) Time, 22 Jul 1991.
(2) ) Bess Brown "Kazakhscounty seventy Years of Soviet Economic Disaster", Report on the ussr 29 July. 1991, Pp 21-23
(3) Pravda vostoka December 1989, p. 2.
(4) J. Critchiow "Uzbeks looking to world market" Report on the ussr, march 1990. Pp. 14-16.
(٥) گرێبەستێکی تری هاوبەش لەگەڵ پاکستان لە بواری رستن و چنین، لەگەڵ کۆرەی باشوور لە بواری دامەزاندنی کارگەی جل و بەرگ و ئاوریشم واژوو کراون.
(6) ) J. crtichlow, "Economic Accord to Aid Kirgizia" report on the ussr, 17, Aori. 1991.



بەم پێیە، رێژیمەکانی ئاسیای نێوەڕاست لە چاودێرییە نێوخۆییەکان زیاتر بەهرەمەند بوون تاکو بتوانن ئاکتیڤانە لە راستای نەهێشتنی کێشە سەرەکییەکانی خۆیان هەنگاو هەڵێنەوە.

**گوتاری پێنجەم: پێکهاتنی ئۆپۆزسیون و حیزبە دژبەرەکان**

پشتیوانانی سەرەکی لە گۆڕانە سیاسییەکان لە ناوەوەی کۆمارەکانی سۆڤییەتی پێشوودا بریتی بوون لە گرووپەکانی گوشار بەرە گشتییەکان و رێکخراوە سیاسییەکان، کە لە ساڵی ١٩٨٧دا لە گۆرەپانی سیاسی دەرکەوتن، بە شێوەی گشتی، بوونی وەها رێکخراوگەلێك بۆ یەکەمجار بە سەرنجدان بە بەستراوە نەبوونیان بە حیزبی کۆمۆنیست، پێشاندەری قازانجی گشتی خەڵکانی جۆراوجۆری کۆمەڵگا بوو.

گۆرباچۆفیش هەبوونی وەها گرووپگەلێکی وەکو بەشێکی سەرەکی لە پلانی گلاسنۆستی خۆی لە قەڵەم دەدا. و لەو بڕوایەدا بوو کە ئەوانە لە جێبەجێ کردنی وەها پرۆسەیەك سەرنجی کۆمەڵایەتی، ئابووری و دەوروبەر بۆلای خۆیان رادەکێشن.[١] بۆ نموونە لە گورجستان و ناوچەی باڵتیك رێکخراوگەلێکی لەو چەشنە بۆ چارەسەر کردنی ئاریشە نێوخۆییەکانی خۆیان ببوونە رکەبەری سیاسی حیزبی کۆمۆنیست. لە هێندێك بواردا بۆ پێکهێنانی بەرە (لە چوارچێوەی ناڤگەی گشتی) ویستەکانی خەڵکیان بەیان دەکرد.[٢]

ئامانج لە وەها گوتارێك زیاتر تاوتوێ کردنی رێکخراوەیی سیاسییە، کە لە بیچمی گرووپە نافەرمییەکان لە ئاسیای نێوەڕاستدا دەرکەوتبوون. لە راستیدا، گەشەسەندنی گرووپە نافەرمییەکان زیاتر بە مانای سەرکەوتنی بژاردە سیاسییەکان لە هەر کۆمارێکدا بووە.

بۆ دەوڵەمەند کردنی باسی سەرەوە، سەرەتا شرۆڤەیەك لە سەر پێوەندی نێوان دەوڵەت و گرووپە نافەرمییەکان دەکەین تاکو لە لێکدانەوەو شروڤە کردنی گشتیدا هەڵێنجێینن کە بە چ شێوەیەك رەوتی وەها پێوەندییەك زیاتر لە دەسەڵاتو کۆنترولی تەواویی دەوڵەتی (ناوەند گەرایی حیزبی کۆمۆنیست) هاتووەتە دەرێ و بە شێوەیەکی یەکسانو تێکڵاوتر رێبەری کراوە. پاشان شرۆڤەی خاڵە لاوازەکانی گرووپەکانی ئاماژە پێکراو دەکرێ و لە کۆتاییدا ئاماژە بە رۆڵی ئیسلام و کارتێکەری ئەو لەسەر سەقامگیری و یان شەڵەژاندنی رەوشی سیاسی لە ناوچەکەدا دەکەین.

---

(1) B. Brown. "the Role of Informal Groups". op. cit
(2) see J.Dreiteld, op. cit.

## ١ـ٥. به سیاسی بوونی گرووپەکان

پرۆسەی بە سیاسی بوونی گرووپەکان لە ئاسیای ناڤیندا لە سەرەتایی ساڵی ١٩٨٩ دەستی پێکرد. گرینگترین رێکخراوی سیاسی لە بواری خەباتگێرییەوە، گرووپەکانی گوشار، حیزبەکان و ناوەندە گشتییەکان بوون کە لە گۆڕەپانی سیاسی ئاسیای نێوەڕاستدا دەرکەوتن و لە خوارەوە ئاماژەیان پێدەکەین.

گرووپەکانی گوشار:

ئاستی بەرزی چالاکی گرووپەکانی گوشار لە ئاسیای نێوەڕاستدا لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٩-١٩٩٠ بوو. ئامانجی سەرەکی گرووپە ئاماژەپێکراوەکان زیاتر لەسەر مەسەلەی چاکسازی لە نێو حکوومەتدا بوو. بۆ نموونە زۆربەی گرووپەکان خوازیاری ریفۆرم لەسەر کێشەی "زمان" بوون، هەنووکە رێکخراویی سیاسی و گرووپە ئیسلامییەکان زیاتر بە دوای ئاڵ وگۆر لە سیستمی سیاسیدا بوون. گرووپەکانی گوشار بە کارتێکەری لە ناو خەڵکداو لەژێر گوشار خستنی دەسەڵات هەنگاویان بۆ لابردنی ئاستەنگی تایبەتی هەڵدەهێناوە. هەروەها رێکخراوەی ئاماژە پێکراو یەکەمین رێکخراوگەلێکی ناحکوومی بوون کە بوون بە هۆکارێك تاکو خەڵك لە وڵاتانی خۆیان دەرفەتی بەشداریکردن لە پرۆژەی سیاسییاندا هەبێت.[١] لە راستیدا نکۆڵی جەماوەری لە حیزبی کۆمۆنیست و هۆی بەشدار بوونیان لە کاروباری سیاسی بەرێبەری وەها گرووپگەلێك دەرخەری نەبوونی ئازادی کۆمەڵایەتی و سیاسی لەنێو خەڵك بە درێژایی ٧٤ ساڵ دەسەڵاتداری حکوومەتی کۆمۆنیستییە.

زۆرینەی گرووپەکانی گوشار لە ئاسیای ناوەندی، لە چوارچێوەی رێکخراوی لایەنگری ژینگە، یان پرسەکانی پێوەنیدار بە لاوان و یان لایەنگرانی کەلتوورو زمانی خوجێی خۆیان، دەناسا. لە پرسەکانی گرێدراو بە ژینگە وەها گرووپگەلێك دەرفەتیان پێدرابوو تاکو توێژینەوەی ئازاد، لەنێو خۆی کۆمارەکانی خۆیان ئەنجامبدەن. بۆ وێنە "کۆمەڵەی ژینگەی پاولۆدار"[٢] لە قەزاقستان (١٩٨٨)، کۆمەڵەی ژینگەی تاجیکستان و[٣] گرووپی ئاشارا لە ئوزبەکستان، لە نێوکۆمەڵگادا بانگەشەیان بۆ بۆچوونەکانی خۆیان دەکرد.[٤]

---

(1) Bess Brown, the Role of Inforimal Groups", op. cit, p. 21
(2) Kazakhstan Prarda, 13 llovember 1988
(3) Suzanne crow Informal Groups in Tajikistan: willthey Harea Role" , 23 february 1990. p 20
(4) Bess Brown, the Rok of puplic Groups", op cit, p 23. "



بەم شێوازە هێژمونی خوازانی ئاسیای نێوەڕاست، لە پێوەندی لەگەڵ گشەپێدانی رێکخراوە کولتووریەکان و لاوان لە ساڵەکانی ١٩٨٩و ١٩٩٠دا رێچکەی ئەرێنییان دەستپێکرد. لە نوامبری ١٩٨٩، دەنگۆی ئەوە هەبوو کە لە هێندێك لە رێکخراوەکانی لاوان لە کۆماری قەزاقستان بە پشتگیری "ئاتا- میکین چالاکیان کردووە".[١] هەروەها لە کۆمارەکانی تاجیکستان، ئوزبەکستان و قرقیزستانیش لانیکەم سازمانگەلێك لە لاوان وەکو رێکخراوەکی گرینگ چالاکییان بووە. سیاسەتی ئەو رێکخراوانە کە ئامانجی کۆمەڵایەتی و کولتووریان هەبوو، لەلایەن دەسەڵاتدارانی وڵاتانی ئاماژە پێکراو بە بپارێزەوە دەخرانە ژێر چاودێرییەوە، هەڵبەت رێکخراوەکانی ژینگە زیاتر لەلایەن بەرپرسانی وڵاتەوە رێزیان لێ دەگیرا. لە ساڵی ١٩٨٩ چەندین دەستەی زمان لە ئاسیای ناوەندی پێکهاتن. دەستەی قەزاق تیلی لە قەزاقستان، دەستەی ئوزبەکستان، دەستەی تورکی لە قرقیزستانو دەستەی زمان فارسی لە تاجیکستان، هەرکام بە نۆرە خوازیاری رێفۆرمی زمانی لە نێو وڵاتانی خۆیاندا بوون.[٢] لە کاتێکدا گرووپە توندرەوەکان وەك تورکەکان لە مافی خۆیان بێبەش دەبوون. گرووپەکانی دیکەی زمانی لە تاجیکستان و قەزاقستان و ئوزبەکستان دەرفەتیان پێ درابوو تاکو لە داڕشتنی یاسای گرێدراو بە زمانی نوێ بەشداری چالاکانەیان هەبێ[٣] رێچکەی هاوئاهەنگ و رێك و پێکی وەها گرووپگەلێك بووبە هۆکارێك تاکو بوونی وەها رێکخراوەیەك لەلای بەرپرسانی کۆمارەکان بە پوزەتیف لە قەڵەم بدرێت. رێبەرانی کۆمارەکانی ئاسیای ناڤین ئامانجی گرووپەکانی گوشاریان لە بەراوەرد لەگەڵ سازمانە سیاسییە فریەکان بە تەواوەتی بە جیاواز لە قەڵەم دەدا. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە بوونی گرووپەکانی گوشار نەك ئەوان لەگەڵ مەترسی رووبەروو ناکات بەلکو یارمەتیدەری پلانی چاکسازی ئەم رێبەرانە بووە و ئەوان لە وەها رێگایەکی گۆنجاودا دەتوانن لە پێناو چارەسەر کردنی نارەزایەتی گشتی هەنگاو هەڵێنن.

---

(1) For detail see B. Brown the Roublican state longuage" op cit, and Timuykocaoglu, ", opcit, S. crow, Informnl Groups in Tajikistan…Opcit, and Timuky Ocaoglu uzbek students call: For uzbek to Be Made the Rpublican State language, Report on the ussr, 24 February 1989, pp 21.22.

(٢) وەها گرووپگەلێکی نافەرمی، گەلاڵەو رەشنووسەکانی گرێدراو بە یاسادانانی زمانی نەتەوەیی خۆیان دەدا بە بەرپرسانی کۆماریو بە شێوەی ئازاد بۆچوونەکانی خۆیان باسدەکرد.

(3) Bess Brown, “the Rile of Informal Groups” op. cit

ئەو کەرەستانە بریتی بوون لە هێڵەکانی تەلەفوون، تەلێکس و ناوەندە ئیدارییەکان.

هەروەها ڕێبەرانی ئاسیای نێوەڕاست تێدەکۆشان لە گەشەسەندنی چالاکی سیاسی گرووپەکانی گۆشار کەم بکەنەوە تاکو ئەوان بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. کۆنترۆڵی ئەم گرووپانە بە نۆبەی خۆی دەبووە هۆکارێك تا هەر چەشنە مەترسییەکی بەهێز دژی ڕژێمەکانی ئاماژە پێکراو لەنێو ببەن و ئەوان بە سانایی بتوانن هەر جۆرە سیاسەتێك بەسەر ئەم گرووپانەدا بسەپێنن و تەنانەت بە فەرمی ناسینی گرووپەکانی گوشار لە دەسەڵاتی ڕێبەرانی کۆمارەکاندا بوو، بە جۆرێك پاش جێ گرتنیان کەرەستەی تایبەتیان بۆ تەرخان دەکردن[1]. تاکو بتوانن بە شێوەیەکی کاریگەریانە لە چقاکی گشتیدا هەڵسوڕانیان هەبێت. وەها ڕێکخراوێکی فەرمی جیا لەوی کە لەلایەن کەرستە پێوەندییە گشتییەکان باسیان لێوە دەکرا بۆ خۆشیان دەیانتوانی گۆڤاریان ڕۆژنامەیەکیان هەبێت.

کۆنترۆڵی بەردەوامی زۆربەی کەرەستەی پێوەندییە گشتییەکان لەلایەن دەزگا حکوومەتییەکانەوە، ئیزنی بە ڕێبەرانی ئاماژە پێکراودا تاکو بەو رادەیەی کە لە پێوەندی لەگەڵ ڕێکخراوەکانی ئاماژە پێکراو زانیاری بە خەڵك بدرێ و لەو بوارەشدا شارەزایی پێویستیان هەبێت. بە شێوەی گشتی ئەو گرووپگەلەی کە بە فەرمی ناسرا بوون لە خۆشەویستییەکی زیاتر بەهەرەمەند ببوون و لە ڕاگەیاندراوەکانیش باسیان لێوە دەکرا. بۆ نموونە، لە قەزاقستان ئامانجی ڕێکخراوەیی گرووپەکانی "نەواداسمی پلاتینسك"و "دادپەروەری" لە ڕۆژنامەی "پراودا" لە سەرەتایی ساڵی ١٩٨٩ ڕەنگدانەوەی دەبوو[2]. هەروەها کۆڕو خۆپێشاندانەکانیان لە گۆڤارەکانی دەوڵەتی بڵاو دەکرانەوە.

تەنانەت گرووپەکانی دژبەر هەولیان دەدا تاکو بۆچوون و ئامانجی داڕێژراوی خۆیان لە ڕێگای ڕۆژنامەکانەوە بڵاو بکەنەوە.[3] بەم شێوازە ڕێکخراوەی سەرەکی هەبوو لەم کۆمەڵگایە و بەو راستییە گەیشتن کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان پێویستیان بە راکێشانی پشتیوانی سەرجەم چین وتوێژەکانی خەڵك دا هەیەو بۆ بەدەستهێنانی ئەم پشتگیرییە دەبی کەڵك لە کەرەستەی پێوەندییە گشتییەکان وەربگیرێت. چاودێری و سنووردانان بۆ گرووپەکانی گۆشاری کارتێکەر، زیاتر لە راستای دژایەتی نەکردنی ئەوان لەگەڵ حکوومەتدا بوو. پێوەندی چین و

(1) Bess Brown, "the Rile of Informal Groups" op. cit
(2) Suzanne Crowe, "Informal Grupsn in Tajikistan : Will They Hare Role?", Report an the Ussr, 23 February 1990, PP. 20 - 24
(3) Moscow News, No, 17, 1990



توێژەکانی خەڵك لەگەڵ وەها گرووپگەلێك وەکو زمانی دایکی (گرووپی قەزاق زمانەکان)، تورکی (گرووپەکانی قرقیز زمان)، ئاشار (ناوەندی هاوکاری نیشتەجێ قرقیزی لەناوچەی ئووش) دەیانتوانی هەر جۆرە ڕەخنەیەك لە پێوەندی لەگەڵ حکوومەتێك کە سەرنجی بە ویست و داخوازییەکانیان نەبادا، بهێننەگۆڕێ.

کارکردی ئەم گرووپانە لەنێو کۆمارەکانی خۆیاندا دژوارتر دەهاتە بەرچاو. لەلایەکی دیکەوە، دەسەڵاتدارانی ئەم کۆمەڵگایە هەوڵیاندەدا تاکو ڕۆخساری نەتەوەیی ئەم گرووپانە لە ڕێگای ڕاگەیاندنەکانی خۆیانەوە لە ژێر کۆنترۆڵ بگرن و لاوازیان بکەن و وا بنوێنن کە ئەوان لە لای حکوومەت قورسایەکی ئەوتۆیان نییە.[1]

بە شێوەیەکی گشتی، گرووپەکانی گۆشار لە هەرکام لە کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاستدا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو بە جۆرێك وەها ڕێکخراوێك نەك هەر ڕۆڵی دژبەریان بەجێ دەگەیاند بەڵکو نەقشی سەرکەوتووی خۆیان لە هاریکاریو هاوئاهەنگی لەگەڵ حکوومەتدا دەبینی.

دەسەڵاتدارانی وەها حکوومتگەلێك بەکارتێکەری و کۆنترۆڵی بەردەوامیان بەسەر ڕاگەیاندنە گشتییەکاندا توانیان گرووپەکانی گۆشار لە راستای ئامانجی خۆیان ڕێبەری بکەن و لە کاتی نارەزایەتی دەربرینەکانیشدا لە بازنەی سیاسی وەدەریان بنێن.

**٢ـ٥. حیزبە سیاسییەکان و بیاڤە گشتییەکان (ناوەندو دامەزراوە مەدەنییەکان)**

برەوی ڕێکخستنی ئاماژە پێکراو زیاتر لەنێو کۆمارە ڕۆژئاواییەکانی سۆڤییەتدا جێگای سەرنج بوو، گرووپەکانی وەك"ساجودیسەکانی"لیتوانی و بەرەی لەتوویان ـ بە هوکاری سەرکەوتوانەی شاندێك بە ناوی هەیئەتی "مۆتلفە" سەر بە گرووپی گۆشار توانیان گۆشارێکی گشتی بێنن بۆ دەسەڵاتداران و ناچاریان بکەن کە لە راستای چاکسازیدا هەنگاوەکانیان خێراتر بکەن[2].

لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندیش هەوڵدەدرا تا وەها ڕێخراوگەلێك پێکبێت بەڵام هەوڵ و تەقەلای لەو چەشنە سەرکەوتنی ڕێژەیی بەدەستهێنا. بۆ نموونە لە قەزاقستان، قرقیزستان و

(1) Alfred Erich senn "Towardslithuanian Independence" problems of communism, March – April 1990.

(٢) لە نوامبری ١٩٨٨، یەکەمین بەرەی ئالماتاو پاش ئەو لە ئۆکتۆبری ١٩٨٩ "بەرەی یەکیەتیی نەتەوەیی" لە قەزاقستان پێکهات تا بەم شێوازە بتوانن کاریگەرییەکی کەمیان لە سەر ڕێفراندۆم هەبێ. لە تورکمەنستانیش بەرەی ئاگری بیرایك لە سپتامبری ١٩٨٩دا خەریکی تێکۆشان بوون.

تورکمەنستان، بنیاتە گشتییەکان و حیزبە سیاسییەکان لە ئارادانەبوون، بەڵام بەهۆی بڵاو بوونەوەی بۆچوونە حکوومییەکان. لە کەناڵی ڕۆژنامە دەوڵەتییەکانەوە، ئەو جۆرە ڕێکخراوانە برەوی کەمتریان هەبوو.[1] بەر لە کودەتای ئاگۆستی ساڵی ١٩٩١، تەنیا بزووتنەوەی دێموکراتێکی قیرقیزستان، هەڵگرو خاوەنی چۆنایەتیو پێکهاتەی ڕەسمی بوو.[2]

لە وڵاتانی ئوزبەکستان و تاجیکستاندا، گرووپە بەرهەڵستکارەکان سەرکەوتنی زیاتریان بەدەستهێنا. لە باشترینو سەرکەوتووترین حیزبەکانی ئوزبەکستان دەتوانین ئاماژە بە دوو حیزبی بیرلێك (وەحدەت)و ئیرەك (ئازادی) بکەین.

حیزبی بیرلێك لە ساڵی ١٩٨٨ لە لایەن ئەندامانی ئاکادیمی زانستەوە پێکهات و ساڵی دواتر بە هۆی بەشداری لە خۆپێشاندان و بەرپا کردنی بزاڤە دژبەرەکان زۆر خێرا ناسراو جێی خۆی کردەوە[3] هەرەمی هێرشی خۆپێشاندانەکان کە لەلایەن حیزبی بیرلێك لە ساڵی ١٩٨٩ ڕێکخرابوو، زیاتر لە ڕاستای یاسای پێوەندی چەوسێنەرانەی، ئابووری حکوومەتی ناوەندی لەگەڵ ئەم کۆمارانەدا بووە، هەروەها مەسەلەکانی بیاڤی و کولتوور لەلایەن خۆپێشاندەرانەوە سەرەنجی پێدەدرا. ئاکامی گۆشاری حیزبی بیرلێك و چین و توێژەکانی خەڵك (بەرەی گشتی) کۆمەلێك سەرکەوتنی لە بواری ڕێفۆرمخوازیدا لێ کەوتەوە .

داخوازییە ڕێفۆرمە سیاسییەکان بریتین لە:

دانانی یاساگەلێك لەمەڕ زمانی نەتەوەیی، پێوەندییە ئابوورییەکانی ناوەند لەگەڵ کۆمارو مەسەلەی کۆچی رووسەکان بۆ ئوزبەکستان.

ڕوانگەی کەریم ئۆف، سکرتێری نوێی کۆماری ئوزبەکستان لەسەر حیزبی بیرلێك پۆزەتیڤ بوو.[4] بە جۆرێك حیزبی ئاماژە پێکراو ڕولێکی تایبەتی لە کاروباری سیاسیدا

---

(١) لە نوامبری ١٩٨٨، یەکەمین بەرەی ئالماتاو پاش ئەو لە ئۆکتۆبری ١٩٨٩ "بەرەی یەکیەتیی نەتەوەیی" لە قەزاقستان پێکهات تا بەم شێوازە بتوانن کاریگەرییەکی کەمیان لە سەر ڕێفراندۆم هەبێ. لە تورکمەنستانیش بەرەی ئاگزی بیرایك لە سپتامبری ١٩٨٩دا خەریکی تێکوشان بوون.

(2) Bess Brown, the Fall of masaliev: kyrgyzstans Revolution Advances Report on, "the ussr 19 April 1991, Pp. 12 – 15 .

(3) A Bohr and T. Kocaoglu in Tasgkent “Birlik ‘s stages Another Demonstaration Repartan The ussr, 16 june 1990

(4) J. critchlow, nrwleader softens Stance Towards Birlik, opcit p. 12."



دەگیرا[1] لە ساڵی ١٩٨٩دا، حیزبی بیرلێك کۆمەڵێك ڕەخنەی بەرچاوی لە دەسەڵاتی بەڕێوەبەرگرت.[2]

ئاکامی وەها دژایەتی کردنێك لە ژووئیەی ١٩٨٩دا بووە هۆی خۆپێشاندانێکی توندوتیژ لە ناوچەی فەراغنە، هەروەها لە شاری پارکنێتیش لە ساڵی ١٩٩٠[3]. لە وەڵامدا حکوومەت، هەوڵیدا تاکو پلانێکی تۆکمە بۆ کەم ڕەنگ کردنەوەی ڕۆلی حیزبی بیرلێك دابڕێژێ ولەلایەن حکوومەتەوە بایەخێکی ئەوتۆی بۆی دانەنرێت. بەو جۆرەی کە لە وەڵام بە ڕووداوەکانی شاری پارکنێت کەریم ئۆف ڕووی لە حیزبی بیرلێك کردوو ئەوانی وەکو هەڵپەرەست کە هەوڵی گەیشتن بە دەسەڵات دەدەن، لەقەڵەمدا.

بۆ بەربەرەکانێ لە بەرانبەر کارتێکەریو پەرەگرتنی برەوی حیزبی بیرلێك، سەرکردە سیاسییەکانی ئۆزبەکستان چەندین تاکتیکیان گرتەبەر، یەکەمین و گرینگترینی، ڕاگەیاندنی نایاسایی چالاکی حیزبی ئاماژە پێکراو بوو. لەلایەکی دیکەوە، حکوومەت بە بیانووی پاراستنی دیسیپلینی گشتی، بەڕێوەبردنی هەر چەشنە خۆپێشاندانێکی گشتی سنووردار کرد. لە ٢١ ئوکتۆبری ١٩٨٩دا، ئەنجوومەنی باڵای کۆماری بڕیارنامەیەکی پەسند کرد. بەم جۆرە کە بەڕێوەچوونی هەرکارێك کە ببێتە هۆی سەقامگیری سیاسی وکۆمەڵایەتی لە نێوخۆیی وڵات، لە لایەن دەسەڵاتەوە ڕێگای پێ دەدرێ. هەروەها لە بڕیارنامەی ئاماژەی پێکراودا هاتبوو کە: بەڕێوەبردنی هەرچەشنە خۆپێشاندانێك بەبێ مۆڵەتی یاسایی یاساغە.[4] جیا لەوەش پاش خۆپێشاندانی شاری پارکنێت، ناوەندی شوورای باڵا بڕیارنامەیەکی توندتری لەمەڕ ئەومەسەلەیە بڵاو کردووەتەوە: هەر کەسێك ببێتە هۆکاری توندوتیژی و بەزاندنی سنوورە یاساییەکان، هەرەشە لە ئارامیو هێمنی کۆمەڵایەتی یان پەشێوی و ئاڵۆزی لە کۆمەڵگادا پەرەپێبدا بە ٥٠٠ ڕووبل سزای نەغدییان دوو مانگ دوور خستنەوە بۆ کەمپەکانی کرێکاری مەحکووم دەکرێت.[5]

---

(1) Akaratnychy, soviet central Asia1…., " .opcit. Pp. 173 – 181.

(٢) ڕەخنەکانی ئاماژە پێکراو زیاتر بریتی بوو لە کۆچی بیانییەکان بۆ ناوەندی وڵات کە دەبووە هۆی پێکهاتنی بیکاری.

(3) soviet News, 28 march 1990, p. 6.
(4) Ibid
(5) Ibid.

ئوپەراسیۆنی بەرگریانەی دیکە لە رێگای راگەیاندنە گشتییەکانەوە لە راستای بێ نێوەرۆك کردنی "حیزبی بیرلێك" بەڕێوە چوو. ئەوان حیزبیان بەهۆی کۆشتنی ژمارەیەك لە خەڵکی سەڤیل کە بەشداریان لە خۆپێشاندانەکانی فراغنە و پارکنێت کردبوو، بە تاوانباریان لە قەڵەم دان.[1] لە راپۆرتێکی دیکەدا هاتووە کە حیزبی بیرلێك ئامانجی دابەشکردنی وڵات و پەرەدان بە کێشە ئەتنیکییەکانی هەیە.[2] لە راڤەیکی دیکەدا راگەیاندرا کە رێبەرانی بەرەی گشتی خۆیان وەك نوێنەرانی خەڵك ناساندوە و لەو باوەڕەدان کە کارێکی پۆزەتیڤ لە کۆماری ئوزبەکستان ئەنجام نەدراوە.[3] وەها رێبەرانێك وەك بەکرێگیراوانێك تاوانبار کراون کە مەبەستیان بە دەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسییە. هەر بوویە بە سەرنجدان بە پروپاگەندەکانی سەرەوە، حیزبی بیرلێك سەرکەوتنێکی ئەوتۆی لە هەڵبژاردنەکاندا بەدەست نەهێنا.

بەم شێوەیە دژکردەوەی دژمنکارانەی سەرکردەکانی حکوومی بوو بەهۆی ئەوە تاکو حیزبی برلێك دابەش بێتو لە فێورییەی ١٩٩٠دا بوار بۆ پێکهاتنی بزاوتی سیاسی ئیرلیك خۆش بکرێ[4].

بۆ کەمکردنەوەی کارتێکەری سیاسی حیزبی بیرلێك، دەسەڵاتدارانی ئوزبەکستان بە خێرایی حیزبی نوێی ئیرەکیان بە فەرمی ناساند. رێبەرانی حیزبی ئێرەکیش زۆر خێرا داواکارییەکانیان بەم شێوەیە بڵاو کردەوە کە ئەوان خوازیاری چاکسازی ئابووری لەسەر بنەمای بازاڕی ئازاد و دانانی سیستمی فرە حیزبین لە پارلماندا[5].

لە ماوەی ئەو یەك ساڵەدا، گرووپە نارازاییەکان پێداگریان لەسەر مەسەلەی چاکسازی سیاسی دەکرد. دوو حیزبی ئیرەكو بیرلێك لەم بوارەدا گەیشتنە رێکەوتنێکی فەرمی. ئەوان رایانگەیاند کە دەبێ لە راستای گۆڕین ودێموکراتیزەکردنی وڵات هەنگاو بنرێ و دووبەرەکی

(١) رێبەرانی حیزبی بیرلێك لە هەڤپیڤینێك لەگەڵ کەناڵی خەبەر مسکۆ رایانگەیاند کە هۆی کوژرانی ئەم خەڵکە بە دندانی سەربازانی چەکداری حکوومەتییەوە بووە.

(2) Pravda vostoka quoted in Ibid.

(3) Pravda vostoka quoted in J. critchlow, "Vzbekistan: the Next nationalities crisis" Report an the Ussr, 18 May 1990, p. 12.

(4) Described as “Embadying the moderate winy off Birlik” in Moscow news, No 19, 15, march 1990

(5) J. critchlow, “Political Opposition in Uzbekistan: Fact and Fiction” Report on The Ussr – 2 February 1991, PP. 17 – 21.



وەلابنرێت[1]. ئەوان رێفراندۆمی فێورییەی ساڵی ١٩٩١ کە لە پێوەندی دەگەڵ بەردەوام بوونی فیدراسیۆنی سۆڤییەتدا بوو بایکۆتیان کرد و خوازیاری دەست لە کارکێشانەوەی کەریم ئۆف بوون.[2] وەها مەسەلەیەك بووە هۆی ئەوە کە رۆڵی گرینگی دوو حیزبی بیرلێك و ئیرلێك (کە لە ساڵەکانی ١٩٨٩و ١٩٩٠ خاوەنی دەورێکی بەرچاو بوون) لە ساڵی ١٩٩١دابەزێت.[3] بە جۆرێك کە هەڵبژاردنەکانی سەرکۆماری لەگەڵ راگەیاندنی سەربەخۆی ئوزبەکستان لە سپتامبری ١٩٩١دا هاوکات بوو، حیزبی ئیرلێك توانی تەنیا ٦٠٠٠٠ دەنگ بۆ بەربژاردەی خۆی "محەممەد سالح" کۆبکاتەوەو حیزبی بیرلێکیش بارودۆخێکی هاوچەشنی هەبوو.[4] ئاکامی هەڵبژاردنەکە بە سەرکەوتنی کەریم ئۆف بە بەدەستهێنانی ٧٢٪ دەنگەکان کۆتایی پێهات.[5]

شکستی حیزبەکانی ئاماژە پێکراو بە هۆی سیاسەتی پێشکەوتنخوازانەی پۆلێنە دەسەڵاتدارەکانەوە بوو. کەریم ئۆف ئورگانە سیاسییەکانی دەسەڵاتی سەرلەنوێ رێکخستەوەو رێچکەی سیاسی خۆی لەسەر پرسە تایبەتییەکان کە جێگای سەرنجی خەڵکی وڵاتەکەی بوو خستەوە ژێر پاوانی خۆی، بەڕێوەبردنی گۆڕانکاری لە بورای کولتووری و هێنانە ئارای سەربەخۆیی ئابووری، لەو پرسانە بوون کە دەبووە هۆی رەزامەندی خەڵك لە دەسەڵات و هەروەها دەبووە هۆی دابەزینی رۆلی گرووپە دژبەرەکانیش.

لە تاجیکستانیش پێش دامەزراندنی حیزبی رەستاخیز لە سپتامبری ١٩٨٩ هەوڵگەلێکی سەرنەکەوتوو بۆ دامەزراندنی ناوەندێکی گشتی لەلایەن توێژی رووناکبیری خۆجێیەوە هاتەئاراوە.[6] ئامانجە سەرتاییەکانی حیزبی رەستاخیز چاکسازی ئابووری لە پێشەوەی ویستەکانیاندا بوو. تاکو سەرنجی حکوومەتی ناوەندی بۆلای خۆیان رابکێشن. تەشکیلاتی رێکخراوی رەستاخیز لە نوامبری ١٩٨٩ بە فەرمی ناسێندرا. مەبەستی سەرکۆماری

(1) “Weekly Record of Events” Report on the ussr, 21 Januayy 1991, p. 31

(2) Bess Brown, The ussr Referendum ln Central Asia Report on the ussr" March1991.

(3) the Econwn, ll Desember 1991, p. 56.

(4) Weekly Record of Events. Report on the ussr, 29 norember 1991. p. 31"

(5) Time, 23 February 1992, p. 46.

(٦) دوو دامەزراوەیی گشتی سەرنەکەوتوو پێش دامەزراندنی حیزبی رەستاخیز بریتی بوون لە ١- "یاوەرانی نوێژەن کردنەوە" ٢- دامەزراوی گشتی مەعرفەت، سەردانی ئەم ژێدەرە بکەن:

Suzanne crow, Informal Groups in Iajikistan: willthey Hovearole, "Reporton the ussr, 23 Fabruary 1990, Pp. 20. 23

تاجیکستان "تاهیر مەحکەم ئووف" لە پەسند کردنی وەها ڕێخراوێك زیاتر بۆ، هاندانی پلورالیزم لە وڵاتەکەیدا بوو.[(١)]

لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٠، مەبەستی دەسەڵاتخوازانی زاڵ لە هەمبەر پێکهاتنی وەها گرووپگەلێك بەخێرای گۆڕانی بە سەر داهات، هۆکاری مەسەلەکە ئەوە بوو کە چین و توێژەکانی خەڵك لە رادەبەدەر پشتیوانیان لە گرووپە دژبەرەکان دەکرد.[(٢)] بۆ نموونە لە رۆژی ٤ی دسامبری ١٩٨٩و ٢٩ ژانوییەی ١٩٩٠ مامۆستایان و خوێندکارانی ناڕازی بۆ پشتیوانی کردن لە حیزبی رەستاخیز لە خۆپیێشاندانێکدا کە لە شاری دووشەنبە بەڕێوەچوو، بەشداریان کرد، ئەوان خوازیاری کەم رەنگکردنەوەی بۆرۆکراسی حیزبیو دەوڵەتیو لابردنی ماددەی ٦ی یاسای بنەڕەتی یەکیەتیی سۆڤییەت بوون.[(٣)] هەروەها خۆپیێشاندەران خوازیاری پەسندی یاساگەلێك لە پێوەدنی دەگەڵ زمانی نەتەوەیدا بوون.[(٤)] قەیرانی کۆمەڵایەتی ئاماژە پێکراو لە خۆپیێشاندانی ١١ی فێوریەی هەمان ساڵدا بە ڕێبەری حیزبی رەستاخیز کە (گرووپە ئیسلامییەکانیش تێدا بەشدار بوون) بەڕێوەچوو، گەشەسەندو بە جۆرێك ٣٠٠٠ کەس لە خەڵکی پێتەخت "دووشەنبە" کۆبوونەوە.[(٥)] داواکاری خەڵك زیاتر لەسەر نەبوونی خواردەمەنیو خانوو بەتایبەتی لە کاتێکدا ٢٠٠٠٠ ئاوارەی ئەرمەنی ئازربایجان لە وڵاتی ئەواندا نیشتەجێ ببوون و خەڵکی تاجیکستان زیاتر داوای شوێنی نێشتەجێ بوونی هاوشێوەیان دەکرد.[(٦)] خۆپیێشاندانەکە بە خێرایی تێکەڵ بە توندوتیژی بوو بە جۆرێك شەقامەکانی شار زیاتر لە ٥ رۆژ لە ژێر کۆنترۆلی نارازیاندا بوو. لە کاتێکدا ئاڵۆزی تێکهەڵچوون درێژەی هەبوو، کۆمیتەیەك لەژێر ناوی "وەحدەت" لەلایەن گرووپە نافەرمییەکان فەرمانیان پێدرا کە بە توندی بەرەنگاری کاربەدەستانی حکوومی ببنەوە. گرووپە دژبەرەکان لەو بڕوایەدا بوون کە "مەحکەم ئۆف" "بەرپرسی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست" دەبێ دەست

(1) “Record ot weekly Events” Report on the ussr, 17 December 1989. p. 27
(2) Soviet News, 20 March 1989. p. 3. see olso Report on the ussr, 7 July 1989. Pp.22- 23
(٣) ماددەی ئاماژە پێکراو ڕێبەری کۆمۆنیستی گەرەنتی دەکرد.
(4) the Economist, 3 Eebruary 1990
(5) Bess Brown, Report on The uss, 23 February 1991, Pp. "Disturbances in Tajikistan," 32 – 33.
(6) Ibid



لە کار بکشێنێتەوە و بە جێگای ناوبراو "بۆری کەریم ئۆف" دابنرێت. ئەگەرچی مەحکەم ئۆف و چەند کەس لە هاورێکانی ئەم پیشنیارەیان قەبووڵکرد.[(١)] بەڵام کۆمیتەی ناوەندی پەسندی نەکردو بڕیاریدا تاکو سەربازەکان، بڵاوە بە خۆپیێشاندەران بکەن. پاش ٢٢ رۆژ پێکدادان ٢٢ کەس لە خەڵك کوژران و زیاتر لە سەدکەسیش بریندار بوون.[(٢)]

دژکردەوەیەك کە حکوومەت لە بەرانبەر تەنگژە سیاسییەکانی ئاماژە پێکراو لە خۆی پێشاندا ئاکامێکی جیا لە زیان بۆ حیزبی رەستاخیزیی لێنەکەوتەوە چەند کەس لە سەرکردەکانی حیزبی رەستاخیز بە هۆی پەرەپێدان بەم ئاڵۆزیانە گیریان و قۆڵبەست کران. کەرستەی پێوەندییە گشتییەکانیش بە جۆرێك ترسی لەناو تەواوی خەڵکدا پێکهێنا کە حیزبی ناوبراویان وەکو هۆکاری تێکهەڵچوون و رووبەروو بوونەوە ئەتنیکییەکان تاوانبار کرد.

سەرنەکەوتنی حیزبی رەستاخیز لە هەڵبژاردنەکاندا، پێشاندەری سەرکەوتنی شەڕی راگەیاندنی گشتی بە دژی وەها رێکخراوێك بوو.[(٣)]

کێشەکانی سەرەوە، وەك چارەسەرێکی کاتی بۆ کێشەکانی نێو کۆمەڵگا هاتە ئاراوەو توانی بە شێوەی کاتی پێش بە سەرهەڵدانی بیری ڕێفورمخوازی بکا. بێ دەنگی تەواو بەسەر شاردا (بە هاتنی سەربازانی داگیرکاری سۆڤییەت بۆ ناو شار)[(٤)] بە واتای زیاتر سنووردار کردنی خۆپیێشاندان بە دژی حکوومەت بوو. کەسانێك وەکو "بۆری کەریم" بە تاوانی هەوڵدان بۆ لاواز کردنی ستراکۆری سیاسی دەسەڵات مەحکووم کران.[(٥)] هێرشی توندی راگەیەنە گشتییەکان دژی حیزبە نارەزایەکان درێژەی هەبوو و لە سپتامبری ١٩٩٠دا ناوەندی شواری

(١) لە رۆژی ١٤ فێورییەی مەحکەم ئۆف، لەگەڵ سەرۆك وەزیران "عەزەت ئالە خایەف"و سەرۆکی شوورای باڵا"پالی یۆف" لە تەلەڤیزیون دەست لە کار کێشانەوەی خۆیان راگەیاند.
(2) Moscow Newe, 7 march 1990, P. 5.
(٣) لە هەڵبژاردنەکانی شوورای باڵای تاجیکستان لە فێورییەی ١٩٩٠دا کە بەڕێوەچوو ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیست بە زۆرینەی نزیکەی ٩٥٪ دەنگەکانیان بەدەستهێنا.
(٤) لە دووشەنبە هاتوو چووی خەڵك لە کاتژمێری ١٠ی شەوەوە یاساغ کرا وەها بارودۆخێك تاکوو مارسی ١٩٩١ درێژەی کێشا، سەردانی ئەم چاوگە بکەن: Moscow News. 13 April 1991. p. 4.
(5) "Weekly Record of Events" Report on the ussr 2 March 1990, p. 34.

باڵای تاجیکستان یاسایەکی بۆ ئەم مەبەستە پەسند کرد: کەسانێك کە دەبنە هۆی ئاژاوەگێڕی لە وڵات و بۆختان هەڵبەستن بۆ سەرۆك کۆمار بۆ ماوەی ٦ساڵ دەخرێنە بەندیخانەوە.[١]

هەڵبەت وەها کردەوەگەلێك تەنیا بووبە هۆکاری زیاد بوون و پتەو بوونی گرووپ و ڕێکخراوە دژبەرەکان. بۆ نموونە لە ئاگۆستی ١٩٩٠دا حیزبی ڕەستاخیز لەگەڵ حیزبی دێموکراتی تاجیکستان، کە هەڵوێستێکی هێمنانەتریان دژ بە حکوومەت هەبوو، یەکیان گرت[٢]. مەحکووم ئۆف ترسی لەوە بوو کە کاندیاتۆرێکی دیکە لە بەرانبەر ئەودا زەق بێتەوە. هەموو حیزب و گرووپەکان، مەحکەم ئۆفیان بە هۆی بە ئەسپایی هەنگاونانی لە پێناو دامەزراندنی ڕیفورم لەناو خۆی وڵاتداو ڕێگەدان بە سەربازانی رووسی بۆ سەرکوتی خەڵکی سڤیلی تاجیکستان، ناوبراویان دایەبەر جنێوو سووکایەتیی پێکردن.[٣]

هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٩٠، ڕادەی ئەندامی حیزبی دێموکرات گەیشتە ١٠٠٠ کەس‌و حیزبی ڕەستاخیزیش گەیشتە ٥٠٠٠ کەس.[٤] لەگەڵ بە فەرمی ناسینی حیزبی دێموکراتی تاجیکستان لە ژانوییەی ١٩٩١، یەکەمین ڕێکخراوی دژبەر لە مەیدانی سیاسی دەرکەوت. ئەم مەسەلەیە زیاتر بە مەبەستی وەدەرنانی حیزبە ڕادیکاڵەکانی دیکە لە گۆڕەپانی سیاسیدا بوو.[٥] لە گرینگترینی ئەم ڕێکخراوانە، حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی (ڕێنسانسی ئیسلامی) بوو کە لە سێپتامبری ١٩٩٠ دامەزراو زۆر بە خێرایی چالاکییەکانی یاساغ کرا.[٦]

ڕاپۆرتە چاپەمەنییەکان هەموویان، پشتیوانیان لە سیاسەتەکانی مەحکەم ئووف لەمەڕ بەرگری لە هەوڵی کودەتاچیە نوێ پارێزەکان بە دژی حکوومەتی ناوەندی دەکرد. ئێستا کە دژکردەوەی حیزبە گرینگە کانی وەك ڕەستاخیز، دێموکرات و ژیانەوەی ئیسلامی، پێشاندەری دژایەتی لەگەڵ

(1) "Weekly Record of Events" Report on the ussr 26 July 1990, p. 36.

(2) Bess Brown set Bach torconservas in Tajikistan, op. cit. p. 16."

(3) Moscow, 30 December 1990, p. 8

(4) Moscow Newe, 12 August 1990, p. 11. seeolso "Weekly Rrcprd of Events" Report on the ussr, 26 July 1991, p. 34

(5) Record of weekly Events, Report on the ussr, 2 Januury 1991, p. 35."

(٦) ئەندامانی IRPیان حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی، دوای دامەزرانی زیاتر لە هەزارکەس مەزەندە کراوە سەردانی ئەم سەرچاوە بکەن:

Bess Brown, the Islamic Renaissanci party in Centrol, roport on the ussr, 10 Msy 1991, p. 13 .



وەها سیاسەتێکدا بوون.[١] لە خۆپێشاندانێکی هاوبەش لەلایەن ڕێکخراوەکانی ئاماژە پێکراودا کە بەڕێوەچوو زیاتر لە ٢٠٠٠ کەس خوازیاری دەست لە کار کێشانەوەی مەحکەم ئۆف، هەڵوەشانەوەی شوورای باڵاو بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی نوێ بوون. وەها ڕاچڵەکاندنێك لەلایەن خەڵك و پشتیوانی نەکردنی حکوومەتی ناوەندی بۆ هێور کردنەوەی بارودۆخەکە، بووە هۆی ئەوەی کە جارێکی دیکە مەحکەم ئۆف دەست لەکار بکشێنێتەوە. دەست لە کارکێشانەوەی سەرۆکی وڵات لە ٣١ی ئوکتۆبر لەلایەن شوورای باڵاوە پەسند کرا. لە هەمان کۆبوونەوەدا، شوورای باڵا بۆ دامرکاندنی خۆپێشاندەرەکان ڕایگەیاند کە تاجیکستان وەکو وڵاتێکی سەربەخۆیە.[٢]

لە وەها بارودۆخێکدا بژاردەکانی کۆمەڵگا سەرلەنوێ دەستیان کرد بە گۆڕینی ستراکتۆری‌و نەخشەی دامەزراندنی حیزبێکی نوێیان هێنا گۆڕێ، تاکو لە ڕێژەی نارەزایەتی کەم بکەنەوە.[٣] سەرکۆماری نوێی وڵات "ئەسلانۆف"یش لە ڕۆژی ١٩ سپتامبر دەست لە کار کێشانەوەی خۆی لە حیزبی کۆمۆنیست ڕاگەیاند. ناوبراو لەو بڕوایەدا بوو کە دەسەڵاتی سەرکۆماری دەبێ لە سەرەوەی سیاسەتەکانی حیزبی بێت. بەم پێیە، ناوی حیزبی سۆسیالیستی تاجیکستان گۆڕدراو لە٢٠ی ئوکتۆبری ١٩٩١ پەسند کرا کە تاجیکستان دەبێ لەسەر بنەماکانی دێموکراسی بەڕێوە بچێ. سێ ڕۆژ دواتر ناوبراو بڕیاری هەڵوەشانەوەی حیزبی کۆمۆنیستیدا.[٤] هەڵبەتە وەها گۆڕانکارییەك یارمەتی بە بەرەی دژبەرەکانداو بوو بە هۆکارێك تاکو ئەوان لە نەمانی سۆڤییەت وەکو جووڵانەوەکی سۆمبولیك پشتیوانی بکەن.[٥]

چەند ڕۆژ پێش هەڵوەشانەوەی حیزبی کۆمۆنیست، شەڕو پێکدادان لەنێوان پێشکەوتن خوازان و پارێزەران ڕووی داو ئەمە بووە هۆکارێك تاکو هێزە بەرهەڵستکارەکان دەرفەتی هەر چەشنە مەشقەکیان هەبێت.

(1) Ibid

(2) Bess Brown, Setbach forconservatives in Tajikstan. Opcir, p. 21 .

(3) Tass, 30 Augustand 18 se ptember 1991

(4) Weekly Record of Events, Report on The ussr, 4 Octobre 1991"

(٥) خۆپێشاندەران پەیکەری لێنینیان لە چەند شار هێنایە خوارێ بابەتی جێگای سەرنج کاتێك بوو کە شارەوانی تاجیسکتان بڕیاریدا هەتا پەیکەری گەورەی لێنیین لە شاری دووشەنبە، بهێنێتە خوارێ. سەردانی ئەم چاوگە بکەن.

Bess Brown, "Biow to conservatives in tajikisstan", op cit. p. 2.

بۆیە شۆڕای باڵا لە کۆبوونەوەکی نائاساییدا بڕیاری سەرۆك کۆماری بۆ هەڵوەشاندەوەی حیزبی کۆمۆنیستی ڕەدکردەوە و تاکو سەرەتای ١٩٩٢ باری نائاسایی ڕاگەیانرا. بەم شێوازە سەرۆك کۆمار ئەسلانۆف جێگای خۆی دا بە سەرۆکی شووڕای باڵا "ڕەحمان نەبی ئۆف". دژ کردەوەی سێ حیزبی گرینگی دژبەر، بانگهێشت کردنی خەڵك بۆ گۆڕەپانی سیاسی بوو. بەم شێوەیە زیاتر لە ٢٠٠٠٠ کەس لە پێش بینای شووڕای باڵا کۆبوونەوە.

گرینگی خۆپێشاندانی ئاماژە پێکراو بە ڕادەیەك بوو کە نەبی ئۆف ناچار بوو لەگەڵ نوێنەرانی ناڕازی وتوێژە بکا. خواستەکانی ناڕازیان بریتی بوون لە: هەڵوەشاندنەوەی ڕاگەیاندنی باری نائاسایی، هەڵوەشانەوەی سەرلەنوێی حیزبی کۆمۆنیست، بە فەرمی ناسینی هەموو حیزبە سیاسییەکان، وەدوا خستنی هەڵبژارنەکانی سەرۆك کۆماری و پێکهێنانی هەڵبژاردنی نوێ بۆ شووڕای باڵا. هەر چەندە وتوێژەکان بە ئاکامێك نەگەیشت.(1) بەڵام بەشداری زۆر و بەردەوامی خۆپێشاندەران لە بەردەم شووڕای باڵا کاریگەری لەسەر بڕیارەکانیان دەبوو.

سەرئەنجام پارلمان لە دەنگدانێکدا (١٧٨ دەنگی بەڵێ و بەبێ نارازی) حکوومەت نیزامی هەڵوەشانەوەو دواتر هەڵوەشانەوەی حیزبی کۆمۆنیستیان ڕاگەیاند. لە ٢٤ی سێپتامبری ١٩٩١ بڕیار درا ڕێفراندومێك بۆ هەڵوەشانەوەی شووڕای باڵا ئامادە بکرێت. هەروەها سێ حیزبی سەرەکی تاجیکستان بە فەرمی ناسێندران و ئیزنیان پێدرا هەتا کاندیداتۆڕەکانی خۆیان بە کۆمیسیۆنەکانی هەڵبژاردن بناسێنن. دانی وەها ئیمتیازگەلێك پێشاندەری هێزو پتەویی گرووپە دژبەرەکانی ناو تاجیکستان بوو.

### (٣ـ٥) گرفتی ستراکتۆری حیزب و گرووپە سیاسییەکان

دوو هۆکاری گرینگ بوونە هۆی دابەزینی کاریگەری حیزب و گرووپە بەرهەڵستکارەکان لە ئاسیای نێوەڕاستدا، یەکەم لە خۆبایی بوون لە ڕووی سیاسییەوە، دووهەم ڕێفۆرم لە ناوحکوومەتدا، جیا لەو دوو هۆکاری ئاماژە پێکراو گرفتە پێکهاتەیەکانیش ئاستەنگ بوون لە بەردەم گەشەی حیزبە دژبەرەکان و کارتێکەری ئەوان لە سەر کۆمەڵگاکانی ئاسیای نێوەڕاستدا. ئەم گرفتانە بریتی بوون لە: لاواز بوونی پشتگیری خەڵك لە ڕووی سیاسی و

(1) The os Angeles Times, 20 ctober 1991.



ماددیییەوە.(1) دووهەم دەسەڵاتدارانی یەك کولتووری سیاسی دەسەڵاتخواز کە دوور بوون لە ڕێوشوێنی دێموکراتێك یان بەشداری گشتی . سێهەم پاڕێزکارە ڕووناکبیرە خۆجێیەکان. چوارەم ئەتنییك گەرایی‌و ناکارایی نێوەڕۆکی کۆمەڵگای ئاسیای ناوەند و دژبەران. لێرەدا تەنیا پێویستە تاوتوی لەسەر دوو تەوەری گرینگ لە گرفتەکانی سەرەوە بکەین:

**ئەلف. ڕووناکبیران**

یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی بزاڤە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەکان چینی ڕووناکبیرە کە هەم بۆ ڕاکێشانی ئەندامی چالاك‌و هەم بۆ ڕێبەری وەها بزاڤ گەلێك ڕۆڵیان هەیە.(2) لە کاتێکدا چینی ڕووناکبیر بەردەوام لە ڕیزی پێشەوەی گەشەی هێزە دژبەرەکان بوون، بەڵام لە پشتیوانییەکی باش بەهەرەمەند نەبوون. لە ژووئەنی ١٩٩١ ئاژانسی تاس نامەیەکی سەر ئاوەڵای لەلایەن ڕووناکبیرانی قرقیزەوە بڵاو کردەوە ئەوان داوایان لە هاوڵاتیان کردبوو کە لە کاری توندڕەوانە کە دەبێتە هۆی کێشە و هەژاری دوور بکەونەوە.(3) هەروەها ئەوان سکاڵایان لەوە دەکرد کە بۆچی ڕێوشوێنی دێموکراسی دەبێ فیدای بەرژەوەندییە نەتەوەییکان بێت و هیچ جۆرە هاوسەنگییەك لەنێوان گرووپە قەومییەکانی جۆراوجۆر لە کۆمەڵگادا نەبێت. نامەیەکی هاوشێوەی تر لە ئوزبەکستان خوازیاری یەکسانی لە تێکۆشانی گرووپە دژبەرەکان بووە، لە خەباتی سیاسی ڕووناکبیرانی جۆرێك نێوەڕۆکی پارێزکارانە دەبینرێت. بۆ وێنە کۆمەڵگای ڕووناکبیرانی قەزاقستان بە شێوەیەکی تەواو پەیڕەوییان لە بۆچوونەکانی "نەزەر بایەف" سەرۆك کۆماری قەزاقستان لەمەڕ قەدغە کردنی خۆپێشاندان دەکرد.(4)

جیابوونەوەکانی نێو حیزبەکانی بیرلیکی ئوزبەکستان و ڕەستاخیزی تاجیکستان زیاتر بەهۆی پارێزکارانی ڕووناکبیرەوە بووە کە لە ترسی تاوانبار بوون بە گەندەڵی‌و بناژۆ خوازی دەستیان لە کاری حیزبایەتی هەڵگرت.(5) لەلایەکی دیکەوە ئەوان مەیلی پێکهێنانی حیزبی سیاسی میانەڕەوتر

(1) paul Goble problems of communism. July – August "Ethnic politics in the ussr,", 1989, Pp. 1-14
(2) Crane Brinton, Anatomy of Revolution, (ondon: penguin pul bling press, 1925) chaptertwo.
(3) Tass Report Reproduced in Report on the ussr, 26 July 1991, p. 44
(4) Bess Brown, Report on The ussr, "nursultan nazarbayevot Kazkhtan: A profile" 31 may 1991 p. 12.
(5) Suzanne Crow, opcit, p. 20." .Informal Groups in Tajikistan …"

وەکو ئیرلیك و دێموکراتیان لا دروستبوو. وەها پارێزکارانێك دەتوانێ لە چەندین بواردا بێتە گۆڕێ. یەکەم رادەی رووناکبیرانی ئاسیای نێوەڕاست زۆر کەمە، بە جۆرێك ١٠ تاکو ١٤٪ حەشیمەتی ئاسیای نێوەڕاست چینی رووناکبیر پێکی دێنێ. هەنووکە لە کۆمارەکانی سۆڤییەتی پێشوودا ئەم رێژەیە گەیشتووەتە ٢٢٪[١]. دووهەم: لە رووی سیاسیەوە چینی ئەکتیڤی ناوەند کاریگەریان لەسەر پرۆسەی سیاسی زۆر کەم و سنووردار بووە. سێیەم ئاستی پەروەردە لە کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاست لە خوارێ بووە. بە جۆرێك بەپێی ئامار، رادەی خوێندەڤانانی لە ئوزبەکستان ٣٢ ٪ لە قرقیزستان ٢٤ ٪ لە تاجیکستان و تورکمەنستان ٢٤٪ بووە. لە ئاکامدا وەها ئاستێکی نزم، بەردەوام ئاستەنگ بووە لە پێکهاتنی رێکخراوەو و حیزبی سیاسی لە ئاسیای نێوەڕاستدا.[٢] هەروەها هاوپێوەندی شوێندانەری رووناکبیرانی ئاسیای ناڤین لەم راستییەوە سەرچاوە دەگرێ کەئەوان بەرهەمی سیستمی سۆڤییەتی پێشوون.[٣] هەنووکە رووونـاکبیرانی سەربەخۆی بالتیك و گۆرجستان بە هۆی وریایی خوداگاهی خۆیان تا رادەیەك بەربەرەکانیان لەگەڵ پێدا گۆڕییە چەق بەستووەکانی سیستمی سۆڤییەتی پێشوو کردووە.

لە کۆتاییدا لە رووی مێژووییەوە سیاسەتەکانی وەها رووناکبیرانێك دەگەڵ رۆشنبیرانی کۆمارەکانی دیکە جیاوازی بەرچاویی هەبووە.[٤] ئەم هۆکارانەیە کە رووناکبیرانی ئاسیای ناڤین کەمتر ناچار بوون رێکخراو پێکبێنن تاکو لە رێگای وەها سازمانگەلێك خەبات بە دژی دسەلاتی سیاسی بژاردەکانی دەسەلاتدار بکەن.[٥]

**ب: ئەتنیك خوازی**

دابەشکردنی کۆمەڵگای سیاسی ئاسیای نێوەڕاست بە پێداگری لەسەر جیاوازییە ئەتنیکییەکان بە جۆرێك جێبەجێ کراوە کە پێشی بە پێکهاتنی تەڤگەرە دژبەرەکان لە ئاسیای

(1) L. Dienes Central Asia: Manpower and Economic poliey for the sovit Middle East opcit, pp 131 – 37.

(2) Mar the Brill oloctt, The Middle East "the communist party in centrol Asia," Journul, Pp17 – 31.

(3) Edward Allworth, Newcentral Asians in E. Allworth (ed) Centrol Asia: 120 " Years of Russian Rule, Duke university press, London, 1989.

(4) Jhon A. "Assessing The Soviet Nationalities Movements: Acritical Review" Armstrong, nationalities papers, vol 114, no, 1, Spring 1991, Pp, 1. 18.

(5) F. J. M. Feldbrugge, "samizdat and political Dissent in The sovet union", 1975 chapter seven



نێوەڕاست گرتووە. حیزبە سیاسییەکان و بنیاتە گشتییەکان بە شێوەی بەربڵاو لە دەوری گرووپە ئەتنیکی یەکانی جۆربەجۆری ناوچەیی رێکخراون. بە جۆرێك هەر ئەم بابەتە بووەتە هۆی ئەوەی تاکو گرووپگەلی نارازی لاواز پێکبێت. لاوازی وەها گروپگەلێك بووەتە هۆیی ئەوە تاکو رێبەرانی رێژیمەکانی ئاسیای ناوەندی هەر کاتێك بیانهەوێت گرووپەکانی ئاماژە پێکراو لە راستای ئامانجە رێفۆرمەکانی خۆیان بەکار بهێنن. رەگەز، ئاستەنگێکی سەرەکی کۆمەڵایەتییە لە ئاسیای نێوەڕاست لەنێوان ئەتنیکە خۆجێیی‌و رووسەکاندا. باشترین نموونە دەتوانین ئاماژە بە کۆماری قەزاقستان بکەین. پێکهاتەی حەشیمەتی (نزیکەی ٤٠٪ لەنێوان رووسەکان و قەزاقەکان) وەکو یەکێك لەو هۆکارە سەرەکییانە، کە پەرەگرتنی هەر جۆرە دامەزراوەیەکی کار تێکەر لەگەڵ نسکۆ رووبەروو کردووە. بۆ وێنە کاتێك رۆشنبیرانی هەر دوو رەگەز لە ساڵی ١٩٩٠ لە بیری دامەزراندنی حیزبێکی سیاسی یەکانگیر لەژێر ناوی "حیزبی دێموکراتێکی قەزاقستان" بوون کێشەی زمان بووە هۆی ئەوەی کە لەنێوانیاندا کێشەو گرفت بخوڵقێ. بەم شێوەیە کێشە ئەتنیکی یەکان بوو بەهۆی ئەوە تاکو لەنێوان رووسەکان (کە خاوەنی زۆرینەی بوون)و قرقیزەکان کە پێکەوە حیزبی دێموکراتی قرقیزستانیان دامەزراندبوو جیابوونەوە روو بدات[١].

بەمجۆرە قەومگەرایی لەنێو گرووپە نارازییەکان، بوو بە رێگر لە پەرەگرتنی هێزێکیی یەکگرتووی دژبەر، کە بتوانێت رەوتی خەباتی نارازیان بەدژی رێژیمەکان رێبەری بکات. بە پێچەوانە ئەندامانی هەر گرووپێك هەوڵیان دەدا تاکو پێداگری لەسەر بەرژەوەندییە قەومییەکانی خۆیان بکەن. بۆ وێنە لە ناو حیزبی دێموکراتی قەزاقستان رووسەکان جەختیان لە سەر پاراستنی بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆیان دەکرد. هەنووکەش قەزاقەکان خوازیاری بەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی خۆیانن.[٢]

لە کۆمارەکانی تاجیکستان و ئوزبەکستاندا، سەرکوت کردنی زۆربەی نارازیانی کۆمەڵگا بووە هۆی بچمگرتنی بنیاتە گشتییە نەتەوە خوازەکان. هەروەها نەبوونی حیزبی سیاسی رکەبەر، لانیکەم هەتا سەرەتای ساڵی ١٩٩٠ز بووە هۆی ئەوەی کە بنیاتە گشتیەکان (رەستاخیزو بیرلێك) لە بەرانبەر دەسەلاتداران سەرکەوتنێکی بنەڕەتی وەدەستبێنن، بۆ نموونە بەرپرسانی ئوزبەك بۆ بیروڕای حیزبی بیرلیك لەمەڕ بەرهەمهێنانی لۆلەو زمان... . ئیعتبارێکی تایبەتیان دادەنا[٣].

(1) "Perestroika in kazakhstn" Marthe Brill Olcott, cit. p. 73.

(2) Moscow news, no. 21, 3 june 1990. p. 5.

(3) "political Opposition in Uzbekistan" J. critchlow, pp. 17 – 19.

یان ڕێبەرانی حیزبی کۆمۆنیست لە تاجێکستان ئیزنیان بە ڕێبەری حیزبی ڕەستاخیزدا هەتا لە پێوەندی لەگەڵ نائارامییەکانی دووشەنبە لە ساڵی ١٩٩٠ لە گەڵ حکوومەت دانووساندن بکەن. هەوڵەکانی ئاماژە پێکراو بە گۆڕانی ستراتیژی حکوومەتەکانی ئوزبەکستان و تاجیکستان لەسەر ناسینی ڕێکخراوە ڕکەبەرەکان و ڕکەبەرایەتی لەنێوانیاندا باروودۆخێکی لاوازو، دابڕانی لەنێو گرووپەکانی ئاماژە پێکراو پێکهێنا.

سەرکوتی گرووپە دژبەرەکان لە ئاسیای نێوەڕاستدا بە چەندین هۆکار گرێدرا بوو: یەکەم: زۆربەی خەڵکی ئاسیای نێوەڕاست لە سیاسەتدا نەخشیان نەبوو خۆیان لە حیزبە سیاسییە دژبەرەکان و دامەزراوە گشتییەکان بە جیا لە قەڵەم دەدا. دیارە بەم شێوەیە کومەڵگا لە هەمبەر کارتێکەری لەسەر پرۆسەی سیاسیدا سەرکەوتن بە دەستناهێنێ. دووهەم پەروەردەی سیاسی وەها خەڵکانێك زۆر بەرتەسك بووە بە جۆرێك بەشداری سیاسی ئەوان زیاتر لەسەر کۆمەڵێك پرسی کاتی بووە، ئاشکرایە کە وەها کۆمەڵگایەك پەیڕەویان لە ئامانجە درێژ ماوەکانی حیزبە سیاسییەکان نەدەکرد. تەنانەت رووناکبیرانی ئەم کۆمەڵگایە بە شێوەی یەکسان لایەنگریان لە حیزبە سیاسییەکان نەدەکرد، زۆربەی پۆلێنی رووناکبیر بەهۆی ئەوەی کە گرووپە دژبەرەکان ڕێگای توندوتیژیانەیان گرتبووە بەر بە باشیان زانی کە پشتیوانی لە حکوومەت بکەن.

چاودێری بەردەوامی بژاردەکانی دەسەڵاتدار بەسەر پرۆسەی سیاسی، ڕێکخراوی حکوومیو ڕاگەیەنە گشتییەکان بووە هۆکارێك تاکو گرووپەکان خۆیان لەگەڵ ئامانجە سیاسییەکان حکوومەت ڕێك بخەن. ئەم مەسەلەیە یارمەتی بە پێکهاتنی پلۆرالیزمی سیاسی دەکات. بە جۆرێك ئاریشە گشتییەکان لە کەناڵێکی تایبەتی وە کانالیزە دەکرێت. بەم شێوازە دەسەڵاتداران بەهۆی ڕێکەوتن دەگەڵ گرووپە میانەرەوەکان و هاریکاری لەپێناو خەبات بە دژی گرووپە رادیکاڵەکان سەرکەوتن بەدەستدێنن تا پێگەی دەسەڵاتخوازی خۆیان بپارێزن. تەنیا هۆکارێك کە ئاستەنگە لە بەردەم دەسەڵتخوازانی ئاماژە پێدراو و خوازیاری گۆڕانکاری سیاسین لە ئاسیای نێوەڕاست، ئیسلامییەکانن.

### (٤ـ٥) ئیسلامگەرایی لە ناوچەدا

یەکێك لە سەرچاوە گرینگەکانی ناسەقامگیری سیاسی لە ئاسیای نێوەڕاستی سۆڤییەت ئیسلام بووە. بە باوەڕی زۆربەی شرۆڤەکاران، ئیسلام وەکو یەکێك لە تیۆرییە سیاسیو



مۆڕاڵییەکان لە ڕاستای ئیدئۆلۆژی ئایینیدا توانیوەتی خۆی وەکو تاکە هێزێك کە توانایی بەربەرەکانەی لەگەڵ دەسەڵاتخوازانی حیزبی کۆمۆنیستدا هەیە، بناسێنێت.[1] دەسەڵاتی ئیسلام لە سنوورەکانی دراوسێی ئاسیای نێوەڕاست بەتایبەتی ئێران و ئەفغانستان بووەتە هۆکارێك تاکو پێگەی ئیسلام و بە هێز بوونی بزووتنەوە ئیسلامییەکان لەناوچەکەدا دوو بەرانبەر بێت..[2] هێرشی توندی دەوڵەتی سۆڤیەت بۆسەر ئایین و هەروەها موسڵمانان دژایەتی کردنی توند لەگەڵ جێبەجێ کردنی ئەرکە ئایینییەکان، وێرانکردنی مزگەوتەکان، قوڵبەست کردنی زانایانی ئیسلامی و پەرەپێدان بەبێ نێوەرۆك کردنی ئایین لە خوێندگاو بڵاو کراوەکانی مەحەللییەکان نەك هەر نەبووە هۆی لەناوچوونی ئیسلام بەلکو باوەڕی خەڵك بە وەها ئایینێك دوو بەرابنەر بووو بواری بۆ بزاڤە دژبەرەکان خۆش کرد.[3] گۆرباچۆف بە مەبەستی دامرکاندنی وەها ژیلەمۆیەك سیاسەتی گلاسنۆستی گرتەپێش. ئەو بە توندی لۆمەی سیاسەتی ڕێبەرانی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاستی لە پێوەندی لەگەڵ گەشەپێدانی بیری دژە ئایینی دەکرد.[4]

سیاسەتی گلاسنۆست یارمەتییەکی زۆری بە گەڕانەوەی ئیسلام بۆ ئاسیای ناوەڕاستدا. بە جۆرێك لە پرۆسەی ڕیفۆرمدا، بیری ڕێبەرانی ئاسیای ناڤین لە پێوەندی لەگەڵ ئیسلام گۆڕانی بەسەر داهات و سیاسەتگەلێکی هێوریان بەڕێوە دەبرد. ئەوان بە باشیان دەزانی کە ڕێکخستنە ئیسلامییەکان بە شێوەی ڕەسمی دەرفەتی چالاکیان پێ بدرێ. بەم جۆرە ئیسلام لە ژیانی گشتیدا ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا.[5] لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٩، برگەیەکی نوێ لەلیبرالیزم لانیکەم، لە سێ وڵاتی ئاسیای ناوەندی دەرکەوت. لە سێ کۆماری ئوزبەکستان، قەزاقستان و تاجیکستان بە

(١) کتێبێکی زۆر لەم پێوەندییەدا نووسراوە، سەردانی ئەمانەی خوارەوە بکەن:

Bennigsen and Broxup. "The Islamic The Reat to The Soviete", Croom Helen, 1983.
Helen carrere Dencdausse, "Decline of an Empire The soviet Socialist Republics in Revolt, News Week Book, 1986.

(2) Muriel Atkin, "The survival of Islam in Soviet Tajikistan, Middle East Journal, Vol. 43, No. 4, Autuman 1989, PP. 604 – 180

(3) See Dencauss, Decline of on Empire, chaptersix.

(٤) گۆرباچۆف لە سەفەری خۆی بۆ تاشکەند (نوامبری ١٩٨٦) سیاسەتی دژی ئایینی مەحکووم کرد. سەردانی ئەم چاوگە بکەن:

Pravda Vostoka (Tashent), 25 November 1986

(5) J.Critchlow, Islam in Public Life: can This Be Soviet Uzbekistan, Report on The Ussr. 10 march 1990, PP.25-28

شێوەی فەرمی یاسەیەك لە پێوەندی لەگەڵ ئیسلام بەم جۆرەی خوارەوە پەسند کرا: "ڕێکخراویی حیزبی کۆماری: باوەڕمان بە ئازادی ئایینی‌و مافی یاسایی هەیە و ڕێزیان لێ دەگرین و رادەگەیەنین کە ئامادەی هاوکاری لەگەڵ ڕێکخراوە ئایینییەکانین ... ... هەروەها پەیرەوانی ئەو ئایینە مافی بەشداری لە چالاکی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی لەو وڵاتەیان هەیە".[١]

حکومەتی هەر وڵاتێك بە مەبەستی بەڕێوەبردنی ماددەی سەرەوە ئیزنیدا تاکو مزگەوتەکانی پێشوو بکرێنەوەو لەژێر چاودێری دەوڵەت مزگەوتی نوێش دروستبکرێن.[٢] جیا لەوە لە گۆڤارە فەرمییەکانیش وێنەی زۆر لە مزگەوتە ئیسلامییە گرینگەکان و کۆمەڵێك وەرگێران لە قورئانی کەریم بە زمانی خۆجێی بڵاو کرایەوە.[٣] هەروەها حکومەتەکان دەرفەتیاندا تاکو خەڵکانێکی زۆر سەفەری ماڵی خوا بکەنو لە مانگی پیرۆزی رەمەزاندا ئەرکەکانیان بەڕێوە ببەن و جێژنە ئیسلامییەکان بە شێوەیەکی رازاوە جێژن بگێرن.

لە ساڵی ١٩٨٩ بە شێوەی فەرمی پەسند کرا کە زانایانی ئایینی ناوچەکە خاوەنی رۆڵێکی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی بن. بۆ ئەم مەبەستە ئەوان بۆ گێڕانی وەها رۆڵێك لە رادیو و تەلەڤیزیون و رۆژنامەکاندا، دەرکەوتن وتار و نووسراوەکانیان زیاترلایەنە مۆراڵیەکانی دەگرتەوە. هەروەها زانایانی ئایینی راستەوخۆ لە دامرکاندنی ئاژاوە و خۆپیشاندانەکانی ناوچەکە وەکو پێکدادانەکانی فەراغنە و دووشەنبەو ویلایەتی ئوش دەورێکی ئاکتیڤیان هەبوو.[٤]

لە روانگەی هێندێك لە شروڤەکاران، وەها گۆڕانکارییەك بە مانای کارتێکەری مەکتەبی ئیسلام و بایەخی حکومەت بە وەها ئایینەکە. بژاردەی وڵاتانی ئاماژە پێکراو بە مەبەستی دامەزراندنی پێوەندی نزیك لەگەڵ زانایانی ئایینی ناچار بوون تاکو رەوایی سیاسی بە ئایین بدەنو رەستەکانی قۆرئان لە جێگای وشەکانی لنین و مارکس دابنێن.[٥]

---

(1) J.Critchlow, Islam in Public Life…"Op cit, P.24.

(٢) رادیۆی ئازادیبەخش (FBIS) لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١ رایگەیاند کە لانیکەم ٤٥٠ مزگەوتی نوێ لە ئاسیای ناوەندی درووستکراوە.

(3) A .Bohr. "Turkmenistan Under Perc Sroika: an Overview" Radio Liberty Research Bulletin. 23march 1990, PP 28-29.

(4) Y. Roi, The Islammic Influence On Nationalaism in soviet Central Asia, Op cit, P.55.

(5) J. critchlow, "Uzbekistan: Whatever Happened to Marxism Lenenism in Soviet Central Asia", Op. Cit, P.55.



وەها پاکانەیەك لەلایەن دەوڵەت زیاتر لەو راستایەدابوو کە لە دەست ئاریشە کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییەکان رزگارییان بێت. سیاسەتی پێکهاتنی ڕێکخراوە ئایینییەکان بە شێوەی فەرمی شوێندانەر بوو. بە جۆرێك حکومەتی هەر وڵاتێك توانی پشتیوانی خەڵك بۆ لای خۆی رابکێشێت و بەم شێوازە سەقامگیری کۆمەڵایەتی‌و پەیرەوی کردن لە دەسەڵاتخوازانی حاکم بسەپێنێ .[١]

هەڵبەت لە بارودۆخی ئێستادا ئیسلام وەکو هێزەکی رەکەبەر دژی حکومەتەکانی هەر وڵاتێك بە ئەژمار هاتووە. رەوا بوونی ئایین وەکو هێزەکی کۆمەڵایەتی پۆزەتیڤ بە جۆرێك دانەرێژراوە کە هەر ساتێك توانایی کارتێکەری هەیە لە سەر وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاستدا. زۆربەی راڤەکاران لەو بڕوایەدان کە پتەو بوونی بناژۆخوازی ئیسلامی لەنێوان نەتەوەکانی ئاسیای نێوەڕاست بە رادەیەکە کە دەبێتە هۆی پێکهاتنی دامەزراوی نوێی ئیسلامی.[٢]

حکومەتەکانی ئاسیای ناوەندی بە مەبەستی کۆنترۆڵ کردنی بناژۆخوازی ئیسلامی، چالاکی ڕێکخراوە ئیسلامییەکانیان یاساغکرد.[٣] هاوکات لەگەڵ وەها بڕیارێك، زانا ئایینییە رادیکاڵەکان بۆ وروژاندنی هەستی ئایینی خەڵك هەنگاویان دەنا تاکو بوارێکی لەبار بۆ چالاکی موسڵمانان برەخسێنن . هاتنە ئارای وەها رەوشێك لە تاجیکستان و ئۆزبەکستان و لە شەڕو پێکدادانەکانی ساڵی ١٩٨٩و ١٩٩٠ وەبەر چاو دەکەوێ.[٤]

لە تاجیکستان، گرووپە ئیسلامییە نافەرمییەکان لە هێز و پتەوییەکی زیاتربەهرەمەند بوون. بەپێی سەرژمێریك کە ئەنجامدراوە زیاتر لە ٨١ ٪ تاجیکییەکان موسڵمانن.[٥]

هەر بۆیە پشتیوانی گشتی موسڵمانان لە دەرکەوتنی حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی لەگەڵ قەدەغە کرانی لەلایەن حکومەتەوە لە ساڵی ١٩٩٠دا شایانی سەرنج بوو. راپۆرتی

---

(1) Y. Roi, The Islammic Influence On Nationalaism…", Opcit, PP.63-64.

(2) The red banner of Communism Mor The Green of Islam, "Isrestia, 5 October 19911991, G. melikyants, Islam in Central Asia" Isrestia, 11 October 1991.

(٣) تاجیکستان، ئۆزبەکستان و تورکمەنستان، لە سەرتای ١٩٩١ یاساگەلێك بۆ نافەرمی کردنی ئەو حیزبە سیاسییانەی کە پێکهاتەی ئایینییان هەبووە پەسند کرد.

(4) Moscow News, No. 32 1989, P.5 and Moscow, No. 51, 1990, 6-7

(5) L.Bashirov, "Islam V nashi dni" (Islam in our Day) Sloro Lektora, 1989, No, 1.P.33.

شرۆڤەکاران پێشاندەری ئەوەیە کە وەها حیزبێك دەیتوانی کۆمەڵێك میتینگی جۆراوجۆر بۆ رێکخستنی دژبەران و هێنانە ئارای خۆاستەکانی خەڵکی پێکبهێنن. لەم راستایەدا لە پشتیوانی حیزبەکانی رەستاخیزو دێموکراتێك بەهەرەمەند بوو.[1] لە فێوریەی ١٩٩٠، پتر لە دە هەزار خۆپێشاندەر لە دووشەنبە پشتیوانیان لە ویستەکانی حیزبی ئاماژە پێکراو کرد. ئاکامی دژایەتی بەربلاوی موسڵمانانەکان بە رێبەری وەها حیزبێك بوو بەهۆی دەست لەکار کێشانەوەی رێبەری تاجیکستان "مەحکەم ئۆف".

سەرچاوەی پتەو بوونی بزووتنەوە ئیسلامییەکان لە تاجیکستان دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆکار، یەکەم لەم کۆمارەدا مەکتەبی ئیسلام چەندین بەرابەر بەهێزترلەکۆمارەکانی دیکە کاری دەکرد، بە بۆچوونی هێندێك، وەها بابەتێك گرێدراو بوو بە پێوەندییە مێژووییەکانی ئیرانییەکان لەگەڵ خەڵکی تاجیکستان (لە کاتێکدا کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای ناوەڕاست بە رەگەز تورکن). جگە لەمە، خەڵك لە رێگای ئیسلامییەوە توانیان شوناسی نەتەوەیی خۆیان بهێننە گۆڕێ.[2] دووهەم سیاسەتی پارێزکارانەی رێژیم لە پێوەندی لەگەڵ دەرفەتدان بە چالاکی ئایینی، رێگای بۆ پێکهێنانی یەکگرتنی خەڵك لەگەڵ حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی خۆشکرد. بەرەبەرە پانتایی بەرەی ئاماژە پێکراو بەربڵاوتر بوو و حیزبەکانی دیکە وەکو رەستاخیزو دێموکراتیش دژی حکوومەتی تاجیکی هێرشیان کرد. تاکە کۆمارێك کە حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی رولێکی بەرچاوی تێدا بوو، ئوزبەکستانە. هەر وەکو تاجیکستان، دەسەڵتخوازان چالاکی حیزبی ناوبراو یاساغ و نا یاسایی راگەیاند. لەکاتێکدا حەشیمەتی ئوزبەکستان باوەڕەکی زۆریان بە ئایینی ئیسلام هەبوو، هەر بۆیە حکوومەتی ئوزبەکی هەولێدەدا تا بە هێندێك حەرەکەتی چاکسازی و بایەخدان بە لێژنەی زانایانی ئایینی، پێش بە هەر چەشنە جووڵانەوەیەك بە دژی حکوومەت بگرن.

هەروەها سەرۆك کۆماری ئوزبەکستان هەولێداوە تاکو لە ئیسلام بۆ بەهێز کردن و رەوا پێدان بە حکوومەتەکەی کەڵك وەربگرێت. بە جۆرێك (ئیسلام کەریم ئۆف) لە کاتی سوێند خواردن بۆ سەرۆك کۆماری لە ژانوییەی ١٩٩٢ دەستی خۆی لەسەر قۆرئان داناو سەفەریشی

(1) Bess Brown, The Islamic Renissance Party in Central Asia, “Radio Liberty Research Bulletin, 10 may 1991.

(2) Muriel Atkin, "The survival of Islam in Tajikistan" (3) J. critchlow, Middle East Journal, 1989, p. 606.



بۆ مەککە کرد. ناوبراو گرینگی دەدا بە پێوەست بوونی ئوزبەکستان بە ریکٚخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی، بەڵام لە هەمان کاتدا مەترسی گەشەسەندنی بناژۆخوازی ئیسلامی لە تاجیکستان و ئەفغانستانیشدا بە شێوەی واقعی هێنابووە بەرباس.

بوونی رێکخراوگەلی ئیسلامی نافەرمی لە کۆمارەکانی قەزاقستان و قرقیزستان بەو شێوەیە نەهاتبووە گۆڕێ. کۆمارەکانی ئاماژە پێکراو کارتێکەری تیۆری ئیسلامیان کەمتر لەسەر بووو بە شێوەی نەریتی ئیسلامیان وەکو پێناسەیەکی تاکتێکی لە بەرانبەر ئیمپریالیزمی کولتووری رووسیو تورکی کەڵکیان لێ وەردەگرت. بەم پێیە حکوومەتەکانی رێفۆرمخوازی ئاسیای ناوەندی پێشان بە پتەو بوونی جووڵانەوە ئیسلامییەکان گرتو تێدا سەرکەوتوو بوون.[1]

(1) Alexander Bennigsen and s. Enders Wimbush, Muslims of the soviet, (London G. Hurst and co, 1985), p. 5

## بەهرەی دووهەم (فەسڵی یەکەم)

## ئاسیای نێوەڕاست پاش هەرەسهێنانی یەکیەتیی سۆڤیەت

### "کودەتای ئووتی ساڵی ١٩٩١ی زایینی و کۆتایی دەورانی کۆمۆنیزم"

گۆرباچۆف لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٨٥ ـ ١٩٩٠ هەنگاوگەلێکی گەورەی لەپێناو چاکسازی سیستمی سیاسی و کاروباری ئابووری سۆڤییەت هەڵێنایەوە، بەڵام بەڕێوەبردنی چاکسازییەکانی ئاکامی باشی لێنەکەوتەوەو ئەم وڵاتەی تووشی قەیرانێك کرد کە لە ساڵی ١٩٩١ بووە هۆی لەبەریەك هەڵوەشانەوەی. ترس لە پەرەگرتنی نارەزایەتی گشتی لە بەرانبەر جێبەجێ کردنی چاکسازی ڕۆژ بە ڕۆژ بەرینتر دەبوو، تەنانەت نارەزایەتی لە بارودۆخی ئابووری لە هێندێك لە کۆمارەکانی سۆڤییەت لەگەڵ شکانەوە بەلای ناسیونالیزمدا تێکڵاو بە جووڵانەوەی سەربەخۆخوازانە ببوو. بەم شێویە، زۆربەی کۆمارەکان و لە سەرەوی هەموویان فیدراسیۆنی رووسیە- گەورەترین کۆماری یەکیەتیی سۆڤییەت، سەرپێچی کردن لە حکوومەتی ناوەندی دەستپێکرد.[1] ئەمە لە کاتێکدا بوو هێشتا زۆریەك لە کادرە باڵاکانی حیزب دژایەتیان لەگەڵ پەرەپێدانی کەشی کراوەی سیاسی گورباچۆف دەکرد. بەم پێیە مەترسی دژ کردەوەی نگەتیڤی ئەوان لە ئارادا بوو، هەروەها لەدەستدانی رۆژهەڵاتی ئەورووپاو دابەزینی ئیحتوبارو پرەستیژی جیهانی سۆڤییەت بواری بۆ نارازیانی نیزامی دابین کردبوو، لە رەوتی بیست و هەشتەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت کە بە کۆنگرەی کۆتایی ئەم حیزبە بە ئەژمار دێ، توندترین هێرشەکان بۆسەر سیاسەتەکانی گورباچۆف لەلایەن لیگاچڤ ئەندامی باڵای دەفتەری سیاسی حیزبی ئاماژەپێکراو هاتە ئاراوە، کە ناوبراو زۆر بە راشکاوی باسی هەرەسهێنانی یەکیەتیی سۆڤییەتی هێنا گۆڕێ. هەروەها لەم کۆنگرەیەدا کێشە لەنێوان گورباچۆف و بۆریس یەلیسن ئەندامی پێشووی دەفتەری سیاسیو لایەنگرانی خێرای

(١) مەحموودی تلوعی، لە لنین تاکوو گورباچۆف (تاران، ئینتشاراتی تاران، ١٣٧) لاپەرەی ٣٦٩



چاکسازی، سەرلەنوێ سەری هەڵداوە. بوریس یەلسین لەو سەردەمە وەکو سەرۆك کۆماری فیدراسیۆنی رووسیە هەڵبژێردرابوو خۆی بە پەیرەوی خەڵك و دەنگدەران لەقەڵەم دەداو لە پەیرەوی کردن لە حیزبی کۆمۆنیست رووی وەرگەڕاند. بە دوای ئەم کارەی یەلسین و ژمارەیەکی زۆر لە رێفۆرمخوازان، ریزەکانی حیزبی کۆمۆنیست بەجێ دەهێلن و رادەگەیەنن کە لە ستراکتۆری حیزبدا گۆڕانکاری تێدا ناکرێت. سیاسەتەکانی گۆرباچۆف، حیزبی کۆمۆنیست و بژاردەکانی سۆڤیەتی، تووشی دوو دەستەیی و جیابوونەوە کرد. دەرکەوتنی ناکۆکی قووڵ لەنێوان لایەنگرانی سیاسەتە چاکسازییەکانی گۆرباچۆف، ئەوانەی کە دژی رەوتی خێرای چاکسازی بوون، بواری بۆ کودەتای ئووتی ١٩٩١زخۆشکرد. پارێزەرانێك کە لە بیری پاراستنی یەکیەتیی سۆڤییەت و پێکهاتەی فەرمیدا بوون بە کەڵك وەرگرتن لە بارودۆخی ئاڵۆزی دەسەڵاتو سەرکەوتنی یەلتسین لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری لە ١٩ی ئووتی ١٩٩١دا دەستیان دایە کودەتا. ئەم کودەتایە لەلایەن پارل سەرۆك وەزیر، کریوچکۆف بەرپرسی کا. گ. ب، یازۆف وەزیری بەرگری، نایایەف جێگری گۆرباچۆف، هەروەها بسمەر تنبەخ وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەوکاتی سۆڤییەت دارێژراو و رێبەری دەکرا.

گورباچۆف لەو کاتەی کە لە کەنار دەریای رەش لە پشوودا بوو، لە هاوکاری کردنی کودەتاچییان خۆی بە دوور گرت و لەم نێوەدا یەلتسینیش لەبەر تیشکی پشتیوانی خەڵکیو بێبەرنامەی کودەتاچییەکان کەوتە بەربەرەکانێ لەگەڵیان. ئەم کۆدەتایە بەهۆی پشتیوانی نەکردنی گشتی و فەرماندەرانی سەربازی و بەرەنگاری یەلتسین لە بینای شوواری باڵای کۆماری رووسیەدا هاوکات لەگەڵ پشتیوانی خەڵکی بووبە بلقی سەر ئاو. ناوبراو پاش شکانی کودەتا پێشی بە چالاکی حیزبی کۆمۆنیستی گرت و گۆرباچۆفیش لە ٢٤ی ئووت لە پۆستی سکرتێری حیزب خۆی کێشایەوە. لە بیست و نوهەمی ئووتیش شوواری باڵای رووسیە حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەتی هەڵوەشاوە راگەیاند و لە ٦ی نوامبری هەمان ساڵدا تێکوشانی لەلایەن بوریسی یەلتسینەوە یاساغ راگەیاندرا.

بەم پێیە شکانی کودەتا خێراییدا بە رەوتی هەڵوەشانەوەی یەکێتی گەلانی سۆڤییەت، کۆمارەکانی ئەندامی ئەم یەکێتییەش لە ئاکامی بەهێز بوونی هەستی نەتەوەخوازی و سەربەخۆیی خوازی یەك بە دوای یەکدا سەربەخۆیی خۆیان رادەگەیاند.

هەڵبەت لە بەهاری ١٩٩١ گۆرباچۆف تێکۆشا گرێبەستێکی نوێ لەگەڵ کۆمارەکانی یەکێتی بەدەستبهێنیت. ئەم گرێبەستە کە لەلایەن کۆنگرەی نوێنەرانی گەلەوە پەسند کرا بەڵام لەلایەن

ڕێبەرانی کۆمارەکانەوە قەبووڵ نەکراو باسکردن لەو پێوەندییەدا درێژەی هەبوو. ریفراندومێك لە پێوەندی لەگەڵ مافی بەرابەری کۆمارەکان لە فیدراسیونی نوێ لە مارسی ١٩٩١ بەڕێوە چوو براو ١٦٪ لە دەنگدەران پشتیوانیان لەم پێشنیارە کرد. لەم ڕێفراندۆمەدا تەنیا ٩ کۆمار (ڕووسیە، ڕووسیەی سپی، ئوکراین، ئازەبایجان و پێنج کۆمارەکەی ئاسیای ناڤین) بەشداریان تێدا کرد. واژۆی پەیمانی کۆتایی یەکیەتی پاش وتووێژێکی درێژ ماوە لەنێوان ڕێبەرانی کۆمارەکان و گورباچۆف بۆ ٢٠ی ئووتی ١٩٩١ دوا خرا. لەم دەرفەتەدا پارێزکاران لە نامەیەکدا کە بڵاویان کردەوە داوایان لە بەرپرسانی حیزب و سوپا کرد کە بە تەواوی کەرەستەوە بەرگری لە یەکیەتی سۆڤییەت بکەن، ئەوان خوازیاری پاراستنی یەکیەتیی سۆڤییەت و پێکهاتە فەرمییەکەی بوون.

بە هەر شێوەیەك بوو گورباچۆف توانی، پێنجەمین پێش نووسی کۆنفدراسیون لە نوامبری ١٩٩١ بە ڕێبەرانی کۆمارەکان واژۆ بکات. کۆنگرەی نوێنەرانیش لەنێوان ٢ تاکو ٥ی سپتامبری ١٩٩١ هەڵوەشانەوەی خۆی ڕاگەیاند و بەم شێوەیە دەزگا سەرەکییەکانی چاودێری بەسەر کۆمارەکان بەروو لە نێو چوون ڕۆیشت. لە کۆتایدا لە حەوتی دسامبری هەمان ساڵ سەرکردەکانی سێ کۆماری سلاڤنشین واتە ڕووسیە، ئوکراین و ڕووسیەی سپی لە مینسك پێتەختی ڕووسیەی سپی پێکهاتنی چڤاکی وڵاتانی سەربەخۆیی هاوقازانج (cis [1]) و کۆتایی تەمەنی یەکیەتیی گەلانی سۆسیالیستی سۆڤیەتیان ڕاگەیاند.

پاشان ڕێبەرانی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەند لە ڕێکەوتی ٢١ی دسامبری ١٩٩١ لە میانەی دانیشتنێکدا لە عشق ئاباد ڕەزامەندی خۆیان بۆ پەیوەست بوون بە یەکیەتیی نوی ئاشکرا کرد. ئەم وڵاتانە بەردەوام لەگەڵ ئەرمەنستان، ئازەربایجان ومۆڵداڤی پروتۆکولێکیان بۆ پەیوەست بوون بە وڵاتانی سەربەخۆیی هاوقازانج واژۆ دەکرد.

هەرسهێنانی یەکێەتی گەلانی سۆڤییەت لە ڕاستیدا بە مانای شکستی سیاسەتی پرۆسترویکای گۆرباچۆفیش بوو، ناوبراو لە دوای ئەم ڕووداوە گەورە مێژووییە لە ٢٥ی دسامبری ١٩٩١ لەگەڵ دەست لە کارکێشانەوەی خۆی پێداگری لەسەر پێویستی درێژەدان بە چاکسازی دەربڕی.

بەم شێوەیە بوو کە سیستمی مارکسیستی- لێنینستی لە یەکیەتیی سۆڤییەتدا پاش ٧٤ساڵ (١٩١٧ ـ١٩٩١) تێکۆشانی بەردەوام بۆ وەدیهێنانی سۆسیالیزم بوونە قوربانی بەرزە فرییەکانی خۆیان و سەرنجام هەرەسیهێنا.

---

(1) Commonwealth of Independent states

## فەسڵی دووهەم:

# پێکهاتەی حکوومەتی، دامەزراوە مەدەنی و حیزبە سیاسییەکان لە وڵاتانی ئاسیای نێوەڕاستدا

### ١ـ قەزاقستان

#### (١ـ١). سیاسەت و حکوومەت لە ڕەوتی مێژوودا

قەزقەکان،[١] لە خێڵ و عەشیرە کۆنـەکانی تـورك‌و مـەغوول پێکهـاتوون کـە لـە چـاخی یەکەمی زایینییەوە، ڕەنگە زۆر پێشتریش، لەو شوێنەدا گیرسانەوە کە هەنووکە بە قەزاقـستان ناوی دەرکردووە. ئەمانە لە سەدەی شەشەم بەشێك لە دەرەبەگە تورکەکان یـان فیدراسـیونێکی لاوازی بیابانشینیان پێکهێنا.

بەم شێوەیە هەتا سەدەی هەشتەم دەوامیان هێنـا. قەرەخانـەکان لـە سـەدەی دەیەمـدا هـەتا دوازدەهەم بەسەر بەشی باکووری قەزاقستاندا (سمیرج)[٢] حوکمداریان دەکرد. هۆزەکانی قەرەخەتایی حکوومەتی قەرەخانەکانیان رووخانـد و پاشـان خۆشـیان یـەك بـە دوای یـەك لـە سـاڵی ١٢١٩-١٢٢١دا لەلایەن مەغولەکانەوە ریشەکێش کران. ئوردرا کوری گەورەی جووجی (کـە خـۆی منالّـە گـەورەی جـەنگیزە ) لـەنێوان سـەدەی سـێزدەهەمی زایینـی ئـوردوی سـپی لـە لقـی نیمـچە سەربەخۆییەکی"ئوردوون زێرین" لەسەرزەوی نێوان سیر دەریای سفلی‌و شاخەکانی ئالّەتو پێکهێنا.

(١) وشەی قەزاق (Kazakh) لەگەڵ قەزاق (cossach) کە لە فـارس بـە سـەربازانی هێرشـبەری رووسـیەی دەگۆترا جیاوازە، چونکە یەکەم بە ئەتنیکە تورکەکانی ئاسیای ناوەندی‌و دووهەم بە گرووپە ئەتنیکـەکانی بـە رەچەڵەك رووسی باشووری رووسیە کە لە باکووری چیاکانی قـەفقاز نیـشتەجێ بـوون دەگـوترا. ئـەوان لـەنێو گرووپەکانی شەڕکەرو یەکینە نیزامییەکان و لە داگیرکارییەکانی تەزارییەکان بەشداریان کردووەو لە ناوچەکانی ئازاد کراو بۆ وێنە لە قەزاقستان بە شێوەی کۆچبەرانی رووسی نیشتەجێ بوون.

(2) semireehje



"ئوردووی سپی" خێرا توانی کۆنترۆڵی خاکی سمێرج و زۆربەی خاکی رۆژهەڵاتی تورکستان بە دەستەوە بگرێت. هەر چەندە رێبەرانی "ئوردووی سپی" مەغول لە منـاڵانی جیـا نـەکراوە جەنگیز خان بوون. بەڵام زۆربەی دانیشتوانی ئەم شوێنانە عەشـیرەتە تورکـەکانیان پێکـدەهێنا کە دەرویشتن تاکو داهاتووی ئەم ناوچەیە بە دەستەوە بگرن.

دوو هێزی نوێی بە جێگای "ئوردووی سپی" هاتنە گۆڕێ: یـەکیان قـەومی نۆگـا لـە" ئوردووی زێریین"و ئەوەی دیکەیان ئوزبەکەکان بوون. قەومی ئوزبـەکی لـە سـاڵی ١٤٣٠-١٤٣١دا خوارەزمی داگیر کرد و تاکو ساڵی ١٤٣٧ توانی کەوشەنی حکوومەتی خۆی تاکو سـەرزەویەکانی نێـوان ئێـران و رووبـاری ئێرتـیش و سـیردەریا بگەیـەنێت. قەزاقـەکانی دانیشتووی ئەم ناوچەیە بەرە بەرە بـە ناوەکـانی "قەزاقـەکانی ئوزبـەك" ناسـران. لەگـەڵ هەمووی ئەوانیش "ئوردووی سپی" تا ئەوکاتە هێشتا بە تەواویی لەنێو نەچوو بووو شەڕی دەسەڵات هەروا درێژەی هەبوو. چـەند هۆزێـك لـە قەزاقـەکان لـەم ناوچـەیە بـۆ ناوچـەی دەرەبەگەکانی مەغولستان لە باکووری رۆژهەڵات کۆچیان کرد. لەو سەردەمەدا قەزاقـستان وەك بەشێك لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی دوهەمین کوڕی جەنگیزخان بە ئەژمار دەهات. کە بە شێوەی راستەخۆ وەکو وڵاتێکی سەربەخۆ و لـەژێر کـۆنترولّی خانـەکانی مەغوولـدا بـوو و زۆربەی دانیشتوانی لە عەشیرەتە تورکەکان و یـەك لـەوان قرقیزییـەکان بـوون. لـە سـاڵی ١٩٤٥ زایینی، دوو کەس لە میرەکانی "ئوردووی سپی" بەناوی جانی بەك و[١] گیری[٢] بۆ مەغۆلستان کۆچیان کرد ولە گەڵ خۆیان مەڕ و ماڵات و کۆمەڵێك هـۆز (کەزۆربـەیان لـە هۆزە تورکـەکان بـوون) هێنـان، مـیری مەغولـستان بـە گـەرمی بـەخێرهاتنیانی کـرد و کۆمەڵێکی زۆری زەوی لە رۆژئـاوای وڵاتەکـەی لـە کـەنار رووبارەکـانی چـۆ[٣]و تـالاس[٤] پێشکەشیانی کرد. ئەوان بناغەی سەرەکی حکوومەتیان پێکهێنا کە نـاوی دەرەبەگـەکانی قەزاقی بە خۆوە گرت. لە کۆتایی سەدەی پانزەیەم تا ئەو رادەیە بەهێز بوون کە دەیانتوانی کەوشەنی خۆیان تا ناوچەی قەبچاقە دەشتییەکان، کە پێشتر لەژێر کونترۆڵی ئوزبەکەکانـدا بوون، پتر بکەن. لە سەرەتای سەدەی شانزیەمی زایینیدا، پێشتر هۆزەکانی قەزاق بۆ وێنـە

(1) Dzhanibek
(2) Girey
(3) chu
(4) Talass

قەبچاقەکانو نایمانەکان،[5] ئوزونەکان و دالّتەکان[1] لەژێر فەرمانی حکوومەتی یەکگرتوویی قاسم خان (١٥١١-١٥١١) یەکیان گرت. ئەم سەردەمە تا رادەیەك سەقامگیر بووو لەگەڵ مردنی قاسم خان لەنێو چووو شەڕ لەنێوان عەشیرەتەکان جێگای خۆی دا بە سەقامگیری. بەو جۆرە حکوومەتی قەزاق بەرەو دابەش بوون رۆیشت، زۆربەی ئەو هۆزە نوێیانەی کە لە نزیك ئەوان نیشتەجێ ببوون و لە حاڵی رووخاندا بوون، بەرەو وڵاتی قەزاقەکان کۆچیان کرد. سەدەی حەڤدەیەم شاهێدی پێکهاتنی سێ‌هێزی جۆراوجۆر لەنێو قەزاقەکان بوو کە لە ئاکامدا سێ ئوردووی قەزاقی (جۆز)[2] سەربەخۆ لە یەکتر پێکهات: ئوردووی گەورە (ئاولوو)[3] لە سیمرچی، ئوردووی بچووك (کشی)[4] لەنێوان زەریاچەی ئاراڵ و دەریای خەزەر، ئوردووی میانە (ئوورتا)[5] لە ناوچەی ئەستێپی ناوەندی کاتێك کە جۆنگارین نوویراتاها[6] (کلوومووکەکان) لەنێوان سەدەی نوزدەیەم لە مەغۆلستانەوە دەست درێژیان کردە سەر ناوچەی قەزاقەکانەوە، ئەوان لە بارودۆخێکدا نەبوون کە بتوانن بە هاوبەشی خۆراگری بکەن کێشەی نێوان قەزاقەکان و ئوویراتەکان تاکو سەرەتای سەدەی هەژدەیەم درێژەی کێشا، لەو سەردەمەدا قەزاقەکان بۆ ماوەیەکی کورت یەکگرتوو بوون و شاهێدی کۆمەڵێك سەرکەوتن بوون، لەگەڵ هەموو ئەو مەترسییانە کە لە سەرئوویراتەکان بوون بە تەواوەتی لەنێو نەچوو بوون، تا ئەوەی کە لە ساڵی ١٧٨٥ی زایینی لەلایەن زنجیرەی منچۆ بە تەواوەتی لەنێو چوون. تاکو ئەم سەردەمە زۆربەی قەزاقەکان خۆیان بە پشتیوانی رووسەکان لە قەڵەم دەدا، ئوردووی بچووك لە ساڵی ١٧٣١، ئوردووی نێونج لە ١٧٤٠و بەشێك لە ئوردووی گەورە لە ساڵی ١٧٤٢ز چوونە ژێر سێبەری رووسەکان، پێوەندی نێوان رووسەکان و قەزاقەکان رۆژبەرۆژ پتر دەکێشرایە ناو بازنەی روسەکانەوە. قەزاقەکان لە نێوەی دووهەمی سەدەی هەژدەیەمدا بۆ دژایەتی کردن لەگەڵ وەها بارودۆخێك چەندین جار راپەڕین، هەر بۆیە تاکو نێوان سەدەی نۆزدەهەم وڵاتی ئەوان (جگە

(5) naimans
(1) Dulats
(2) Dzhuz
(3) Uou
(4) Kishi
(5) Orta
(6) Dzhungarain Oirots



لە بەشی رۆژئاوایی، کە پەیرەوی ئیمپراتۆری منچوو بوون) بە تەواوەتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی رووسەکانەوە. رووسەکان دەسەڵاتی خانەکانیان لەنێو برد: خانی ئوردووی نێوەنجی لە ساڵی ١٨٢٢داو خان ئوردووی چووك و دوو ساڵ دواتریش خانی گەورە لە ساڵی ١٨٤٨ تێك رووخان. حکوومەتی رووسیە لە ساڵی ١٨٥٤ لە "ورنوی" (دواتر ورنیو ئاڵماتا و ناوەندی قەزاقستان) پێگەکی سەربازیان دامەزراند. بەرەبەرە کۆچبەرانی رووسی روویان لە قەزافستان کردو قەزاقییەکانیان لە خاوەنداریەتی زیاتری زەویە پڕ پیتەکان بێبەش کردن. لە سەرەتایی سەدەی نۆزدەیەم بەشێك لە ئوردووی بچووك لە لقی سەرەکی جیابوونەوە و ئوردوویەکی نوێی بە ناوی ئوردووی بووکی[1] یان ئوردووی دەروونی پێکهێنا. بووکی، لاوترین کوڕی خان نوورعەلی، خانی ئوردووی چووکە، لە ساڵی ١٧٩٩ داوای لە بەرپرسانی رووسی کرد تاکو ئیزنی پێبدەن لەگەڵ قەومی خۆی لە ناوچەکانی نێوان ئوراڵ و لگا پاش چۆلکردنی ئوویرا تاها (کۆمیکەکان) لەوێ نیشتەجێ بن. ناوبراو لە ساڵی ١٨٠١ ئیزنی پێدرا تاکو بۆ نیشتەجێ بوون بەرەو رۆژئاوا بڕوات و لەگەڵ خۆی ٥٠٠٠ خێوەت (نزیکەی ٧٧٠و ٢٢ کەس)یشی لەگەڵ خۆی هێنا، دوای نیشتەجی بوونی نزیکەی ١٦٢٥ خێوەتی نیشتنی دیکەشی پێزیاد بوو. لەساڵی ١٨١٢ز فەرمانرەوایی بووکی وەکو خانی ئوردووی نوێ بوو بە فەرمی. سەرەتا ئەو خەڵکەی کە لەناوچەی ئورەنبوورگ نیشتەجێ بوون، هەڵبەت بە هۆی جێگورکێ کردنی بەردەوام و مەوداگەلی دورودرێژ، تا دەورووبەری سەدەی نۆزدەیەم کەم تا زۆر لەناوچەی ئاستراخان بۆ هەتا نیشتەجێ بوون و چوونە ژێر دەسەڵاتی ئەو ناوچەیەوە. لەو سەردەمەدا رادەی خێوەتەکانی بووکی ١٥٠٠٠٠ دانە، ئوردووی گەورە ١٠٠٠٠٠ دانەو ئوردووی ناڤین دەگیشتە ٤٠٦٠٠٠ دانەو ئوردوی بچوك دەگەیشتە ٨٠٠٠٠٠ دانە.

تەواوی قەزاقەکان لەماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام هێناو ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە کە، ئەو کارە بە هاوکاری رووسەکان بەڕێوەچوو. ئیسلام لەنێوان سەدەکانی حەوتەم و نۆهەم لەنێو کۆمەڵگای بوویی قزاقستاندا جی پێی خۆی کردووە. بە درێژایی چاخی شانزدەیەم ریش سپی هۆزەکانی قەزاق لەژێر کاریگەری نۆگایەکان، کە لەو سەردەمەدا پێکەوە هێزیکی هاوبەشیان پێكهێنابوو روویان لە ئیسلام کرد. لەگەڵ هەموو ئەوانیش بەشێکی زۆر لە هۆزەکانی بیاوان گەڕ نەرۆیشتبوونە ژێر سێبەری ئیسلامەوە. تەنیا

(1) Bukij

به هۆی گۆشاری له رادەبەدەری حکوومەتی رووسیه و پروپاگەندەی بەردەوامی ئایینی تاتارەکان بوو که قەزاقەکان روویان له ئیسلام کرد. ئارمانجی رووسەکان ئەوە بوو که هەستیان بەوە کردبوو که ئیسلام دەتوانێ وەکو هێزێکی پێشکەوتنخواز و یەکانگیر، هۆزەکان له دەوری یەکتری کۆ بکاتەوەو له ئاکامدا ئەوان دەتوانن به سانایی چاودێری بەسەر قەزاقەکاندا بکەن. دروستکردنی مزگەوت به شێوەکی بەرچاو پشتیوانی لێکراو بۆ هەر عەشیرەتێك پێش نوێژکاریکیان دەستنیشان کرد. تاتارەکان پێبەپێی ئەم بارودۆخە دەچوونه پێش و زمانی تاتارەکان وەکو زمانی فەرمی ئالْقەی نێوان بەرپرسانی رووسی و خەڵکی خۆجێی جێی گرت. هەنووکەش، ئایینی زۆرینەی خەڵکی قەزاقستان ئیسلامە که زۆربەیان سونیی‌و له لقی حەنفیەکانن. پاش ئیسلام، ئایینی ئورتۆدوکس زۆرۆترین لایەنگری لەنێوان سلاڤییەکاندا هەیە. بەڵام لەنێوان سەدەی نۆزدەیەم سیاسەتی رووسیه لەم بوارەدا حاڵەتێکی به پێچوانەی پێشووی به خۆیەوە گرت: دروستکردنی مزگەوت تەنیا به رێگائیزن پێدانی فەرمی جێبەجێ دەبوو، رادەی مامۆستایانی پێش نوێژ تا رادەیەکی بەرچاو کەم ببووو چالاکی ئایینی مەسیحییەکان چەند بەرابەر زیادی کرد بەڵام ئیسلام تا ئەوکاته به شێوەیەکی دیار لەنێوان قەزاقەکان به تەواوەتی جێگای خۆی کردبوو و ئەم خەڵکه لەبەرانبەر هەر چەشنه تەقەلایەك بۆ گۆڕینی ئایینەکەیان خۆراگریان دەکرد.

کۆمەڵێکی زۆر له قەزافەکان سەربه پۆلێنی ئەشراف و له ژێرساباتی پێداگۆژی بەرزی رووسەکاندا بوون و ئەم بابەته له روانگەی ئەوانەوە کاریگەری قووڵی بەجێ هێشتبوو. بۆ وێنه قەزاقەکان به پێچەوانەی ئوزبکەکان که میراتگری داب و نەریتی ئەدەبی مەزن بوون. خۆیان شتێکی ئەوتۆیان پێ نەبوو جگه له جۆرێك کولتوورکه رەگی له رێچکەی ژیانی عەشیرەتیاندا هەبووو زیاتر لەسەر بنەمای رێوشوێنی زارەکی بوو تاکو داب و نەریتی نووسراوە. لەم رووەوە قەزاقەکان پێشوازییان له کولتووری رووسەکان کردو بوون به لایەنگرانی ئەمەگناس، سێ کەس له مەزنترین نووسەرو بیرمەندانی ئەوکاتی قەزاقستان که وەك نموونەی دەمارگرژی کولتوورخوازی رووسی به حسێب دەهاتن: چۆکان وەلی خان ئۆف[1] (١٨٣٥ــ١٨٦٥)، ئەبرای ئاڵتین سەرین[2] (١٨٤١ ـ١٨٨٩)و ئابای کۆنان بایەف[3] (١٨٤٥ـ ١٩٠٤) بوون.

(1) chokan Valikanov
(2) Ibraj Altynsarin
(3) Abaj - kunonbajev



کۆنان بایەف له مێژووی قەزاقستاندا جێگایەکی تایبەتی هەیە، چونکه وەکو باوکی ئەدەبیاتی نوێی قەزاق چاوی لێ دەکەن، هەرسێی ئەمانە له چوارچێوەی زمانی ئەدەبی و هەروەها کولتووری گشتی و ژیانی رووناکبیری ئەتنییکی خۆیان رۆڵێکی زۆر گرینگیان گێڕا. بەتایبەتی ئاڵتی سەرین زۆر خوازیاری چاکسازی کولتووری بوو، جگه له دانانی چەند نێوەرۆکێکی وانەیی، خەریکی داهێنانی ئەلف و بێی زمانی قەزاقی له سەر بنەمای رێنووسی سیریلی رووسی بوو. بەڵام ئەلف و بێی گشتگیر نەبووو رێنووسی عەرەبی تاکو دەورانی حکوومەتی سۆڤییەت هەر درێژەی هەبوو، به هۆی پتر بوونی کۆچی رووسەکان‌و به چنگ هێنانی زەوی قەزاقەکان لەلایەن ئەوانەوە به تایبەت له ساڵەکانی ١٨٩٠ ـ ١٩١٠ بێزاری له رووسەکان لەنێوان له خەڵکی خۆجێی به جۆرێك پەرەی گرت که کۆمەڵێك راپەڕینی به دواوە بوو. گرینگترینی ئەم راپەرین گەله له ساڵی ١٩١٦به رێبەرایەتیی "ئامان گلای" بەڕێوە دەچوون. ئامانجی ئەم راپەڕینانه یاسای سەربازگیری بەزۆرەملەو، جیاوازی دانان لەنێوان سەربازە رووسەکان و غیرە رووسەکان بوو که به پەیوەیست بوون به شۆڕشی ١٩١٧ بواری بۆ سەربەخۆی خوازی پێکهێنا. پاشان قەزاقستانیش وەکو ناوچەکانی دیکەی ئاسیای ناڤین بوو بەگۆڕەپانی شەڕو پێکدادانی خوێناویی نێوان دەستێوردانی دەرەکی و سوپای سوور، سوپای سپی(به رێبەری کلچاك)و میلیۆن (بەرێبەری حیزبی ئالاش ـ ئووردا). له کوتاییدا هێزی سۆڤییەت له ساڵی ١٩٢٠ز لەم ناوچەیه جێگیر بوو. له رۆژی ٢٦ی ئوکتۆبری ١٩٢٠ز کۆماری خودموختاری سۆڤییەتی سۆسیالیستی قرقیز (قەزاق) وەکو بەشێك له کۆماری فدراتیوی رووسیه بوونی خۆی راگەیاندووە. پاش دیاریکردنی سنووری نەتەوەیی له ساڵەکانی ١٩٢٤ـ١٩٢٥ ز ویلایەتی سیردەریاو سیمرچی که سەرەتا به شێك بوون له کۆماری تورکمەنستان، پەیوەست بوو به کۆماری خودموختاری قەراقاڵپاق و له ساڵی ١٩٣٢ز ویلایەتی قەراقاڵیاق بوو به کۆمارێکی خودموختارو له ساڵی ١٩٣٦ له قەزاقستان جیا بووەوو پەیوەیست بوو به ئوزبەکستان. رۆژی ٥ی دسامبری ١٩٣٦ز کۆماری قەزاقیش گەیشته ئاستی کۆمارێکی یەکگرتوو. شەپۆلی کۆچ کردنەکان لەو سەردەمەدا هەر درێژەی هەبووە به جۆرێك که له دەیەی ١٩٢٠ بەشێکی زۆر له (گۆلاڵەکان) یان وردە بۆرژوا رووسەکان، دوورخرانەوە بۆ ئەو ناوچه که لەوێ جێگیر کراون. له هەمان کاتدا حکوومەتی ناوەندی هەوڵێکی زۆری بۆ جێگیر کردنی عشیرەته قەزاقەکان به مەبەستی کۆنترۆڵ کردنیانی دا. ئەم

هەولە بەتايبەتی لە دەيەی ١٩٣٠ بووە هۆی لەنێو چوونی زياتر لە مليۆنێك و نيو قەزاق و ئاوارە بوونی زياتر لە يەك مليۆن كەس بۆ وڵاتانی چين و ئەفغانستان و ئێران و توركيە. هۆكاری ئەم زيان و فەوتان و ئاوارە بوونە، خۆڕاگری قەزاقە كۆچبەرەكان لە بەرانبەر بە زۆر جێگير كردنيان، يان برسێيەتی، كە بۆ لاوازی لە بەرهەمهێنانی مەوادی خواردەمەنی لەلايەن عەشيرەتەكان دەگەڕێتەوە.

لەلايەكیترەوە دوورخستنەوەی نزيكەی يەك مليۆن بە رەگەز ئاڵمانیو هەروەها لەگەڵ سەدان هەزار كەسی دوور خراوە لە گشت قەومەكان لەلايەن ئەستالينەوە لە دەيەی ١٩٤٠ وەكو سزای خيانەت بە نيشتمان، بە درێژايی شەڕ، هەروەها كۆچكردنی شەپۆلێكیتری رووسەكان لە دەيەی ١٩٥٠ وەكو زيندوو كردنەوەی زەويەكانی دەستلێنەدراو نەك هەر جارێكی ديكە دوايين پاشماوەكانی زەوييە بە پيتەكانی جووتياری لەژێر چنگی قەزاقەكان دەركێشاو بووە هۆی زيانی ئابووری بۆ قەزاقەكان، بەلكو پێكهاتەی حەشيمەتی ناوچەكەی بە زيانی قەزاقەكان شكاندەوە. هەڵبەت ئامانجی سەرەكی مسكۆ لەم كارانە لكاندنی قەزاقستان بە رووسيە بوو. هەر بۆيە بە هۆی سەرنەكەوتنی پلانی زيندوو كردنەوەی زەوییو بێ بەهرە بوونی ئابووری ئەو حكوومەتە پاش ماوەيەك چاوپۆشی لەم پلانە كراو رەوتی كۆچكردن بەرەو لاوازی رۆيشت و پرسی لكاندنی قەزاقستان بە رووسيە هەڵوەشايەوە.

ئەم سەردەمە قەزاقستان لە رووی ئابوورييەوە لە چاو گەلانی ديكەی ئاسيای نێوەڕاست زۆر گەشەی كرد، چونكە قەزاقستان وەكو پشتيوان و بەرهەمهێنەری خوراك و دابينكەری مەوادی پيشەسازی سەرەتايی، ناوچەكانی ئاسيايی رووسيەی لە ئوراڵ و سيبری دياری كرابوو. بوونی رووسەكان و ئۆكرانييەكانو ئاڵمانييەكانيش دەبووە هۆی بەرز بوونەوەی ئاستی شارەزايی لەم كۆمارانەدا. بۆيە نيگەرانی قەزاقەكان لە زاڵ بوونی رووسەكان، هەروەها بيزارای ئەوان لەو كوشتارو ئاوارە بوونەی كە لەلايەن رووسەكانەوە بەسەرياندا هێنان، هيچ كاتێك رازی بوونێكی دەروونی قەزاقەكان لەو بارودۆخەی كە تێدا بوون دابين نەدەكرد. هەڵبەت بەهۆی ترسی هەڵقولاو لە پێشنەی سەركوتكەری حكوومەتی ئەم نارەزايەتييە دەرفەتی دەربڕينی پێنەدەدرا.

يەكەمين نيشانەی نارەزايەتی لە ساڵی ١٩٧٨ لە ئاڵماتا لە لايەن خوێندكارانی قەزاقی بە بيانووی زياتر وەرگێرانی رێژەی خوێندكاری قەزاقی بۆ زانكۆكان، كە بووە هۆی شەڕو پێكدادان



لەگەڵ رووسەكان. ساڵی دواتر لە تێسلينوگراد يەكێك لە شارەكانی ئەم كۆمارە خۆپێشاندانێكی بەربڵاو بە بيانووی دژايەتی كردن لەگەڵ دانی بەشێك لە خاكی قەزاقستان بە رەگەز ئاڵماتايەكانی دانيشتووی ئەوێ بەڕێوە چوو و ساڵی١٩٨٠يش لە ئاڵماتا بە بيانووی بە خاك سپاردنی تەرمی سەربازێكی موسڵمانی قەزاقی لە گوڕستانێكی ناموسڵمانان كە لە ئەفغانستان كوژرابوو كۆمەلێك تێكەڵچوون هاتەگۆڕێ .

لە ساڵی ١٩٧١ كەسێك بە ناوی دين محەممەد كۆنايەف لە سەردەمی ئەستاليندا هاتبووە ناو حكوومەتەوە پێشكەوتنێكی بەرچاوی كردبوو و لەو دەگمەن موسڵمانانە بوو كە ئەندامی فەرمی دەفتەری سياسی حيزبی كۆمۆنيست بوو، دواتر وەك كەسی يەكەمی حيزبی ئەوكۆمارە هەڵبژێردرا. ناوبراو بەدرێژايی ١٥ ساڵ دەسەڵاتداری بە سەرنجدان بە بوونی كولتووری دەسەڵاتداری عەشيرەتی لە قەزاقستان و لەگەڵ بوونی گەندەڵی حكوومەتی بێرژنێف، نەيتوانی پێش بە كەلك وەرگرتنی نارەوايی بەربڵاوی ماڵی كاربەدستانی دەوڵەتیو دابەشكردنی پۆستەكان لەسەر بنەمای پێوەندييەكانيان بگرێت. هەروەها بە سەرنجدان بە بێزاری روو لە زياد بوونی قەزاقەكان لە رووسەكان، نەيتوانی پێش بە جووڵانەوە روو لەگەشەی لايەنگرانی ژياندنەوەی شوناسی نەتەوەيیو ئيسلامی بگرێت. بە هاتنە سەركاری گورباچۆف لە ساڵی ١٩٨٥ دروشمی چاكسازی بنەڕەتی دژايەتی لەگەڵ گەندەڵی بووە سەرمەشقی پلانی نوێژەن كردنەوەی ئابووری و كۆمەڵايەتی، پرۆسترۆيكا و گلاسنۆست. لەگەڵ ئەويشدا روانينی ناوبراو بۆ پرسە نەتەوەييەكانی، كۆمەڵگای فرە نەتەوەيی سۆڤييەت لەگەڵ دێرينەكانی خۆی جياوازييەكی نەبوو بەردەوام باوەڕی بە گۆڕينی شوناسی نەتەوەكان بۆ ناو شوناسی سۆڤييەت بوو. گۆرباچۆف بە پشت بەستن بە گەندەڵیو بەرتيل خواردن... هەبوو لە قەزاقستان و بە گۆشارخستنەسەر حيزبی كۆمۆنيستی ئەم كۆمارە لە دسامبری١٩٨٦ بواری بۆ لابردنی كۆنايەف خۆش كرد و بە پێچەوانەی نەريتی پێشوو، كەسێكی رووسی كە جێگای متمانەی گۆرباچۆف بوو بە ناوی كۆلبين كە ئەزموونی كاری لەم كۆمارەدا نەبوو و ساڵانێك لە پۆستی جێگری شواردنادزێ لە گورجستان كاری كردبوو، بۆ ئەم پۆستە هەڵبژێردرا. ئەم كارە گەرچی رۆخسارێكی رووالەتی رێفورمخوازانەی هەبوو، بۆيە بە سەرنجدان بە بوارە مێژووييەكانی هێرشی رووسەكان و هەستی قەزاقەكان بۆ رووسەكان بووە هۆكاری گەشەسەندنی ئەم جۆرە بير كردنەوانە لەنێوان خەڵكی قەزاق، كە گۆرباچۆف هەنگاوێكی نوێی لە راستای دەسەڵاتی زياتری رووسەكان بەسەر قەزاقستان هەڵێنابوو.

له دەیەکانی دواییندا، قەزاقەکان هەستیان بەوە دەکرد کە وڵاتەکەیان لە لایەن مسکۆوە داگیرکراوە و بە شێوەی ناڕاستەخۆ لەلایەن رووسەکانی ناوەوەی وڵات بەڕێوە دەچێت. رەنگە ئەم هەستە گرینگترین بیانووی راپەرینی خوێندکارانی زانکۆ لە رێکەوتی ١٧و ١٨ی دسامبری ١٩٨٦لە ئالماتا بێت. لە یەکەمین دژ کردەوە بەم راپەڕینە دین محەممەدکۆنایەف کە قەزاقی بوو لە پۆستی یەکەمی سەرۆکایەتی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان وەلا نراو کەسێکی بە رەچەڵەك رووسی بە ناوی گنادی کۆلبین لە جێگای ناوبراو دانرا.[1] سەرکردەکانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت هۆکاری لابردنی کۆنایەف یان بە هۆی بەرتیل خواردن؛ خراپ کەڵك وەرگرتن لە سامانی دەوڵەتی و..... راگەیاند، بەڵام هێندێك لە بیرمەندان لەو بڕوایەدا بوون کە، کەسانێك کە لە دەزگای پر لە گەندڵی دەسەڵاتدار بەرژەوەندییان هەبووە؛ پەرەیان بەم جووڵانەوەیە داوە تاکو پێش بە هەوڵی مسکۆ بۆ لابردنی کۆنایەف بگرن.

قەزاقەکان لەو بڕوایەدا بوون کە دەبوایە بە هەموو کەم و کورییەکانەوە بەرگرییان لە نەزەربایف دا کردبا. چونکە ناوبراو سیاسەتێکی هێمنانەتر لە هەمبەر هێندێك لە ویستەکانی ناسیۆنالیستەکان وەك پەرەدان بە زمانی قەزاقی یان زیاترکردنی رێژەی وەرگیرانی خوێندکاری قەزاقی بۆ زانکۆکان و پێشگیری رێژەی لە سیاسەتی رووسەکان لە مەڕ بە تەواوەتی زاڵبوون بە سەرئەم کۆمارەدا گرتبووەبەر. بەم شێوەیە کۆنایەف وەکو هێمای نەتەوەیی بە ئەژمار دەهات و لابردنی ناوبراو و دانانی کەسێکی رووسی لە دەرەوەی قەزاقستان وەکو بێ رێزییەك بە شوناسی نەتەوەیی قەزاق بە ئەژمار دەهات. هەر بۆیە لە رۆژی پاش لابردنی کۆنایەف گرووپگەلی نارازی لە ئالماتا پێکهاتوو لە خوێندکاران وکرێکارانی لاو بە رێپێوان و کۆ بوونەوە لە پێش بینای حیزب، ئەم دروشمەیان دەگوتەوە کە قەزاقستان تەنیا هی قەزاقەکانە. تەنانەت داوای کورسیان لە نەتەوە یەکگرتووەکان و پەیوەست بوون بە چینو راگەیاندنی دۆستایەتی لەگەڵ ئەمریکا لەنێو دروشمەکانیان بەرچاو دەکەوت.

ئەم خۆپێشاندانە سێسەد هەزار کەسییە، پاش چەند کاتژمێر ئەم خۆپێشاندانە تێکەڵ بە توندوتیژیو هێرش کردن بۆ سەر بینا حکوومییەکان و هاووڵاتیانی رووسی و تێکهەڵچوونی

(١) حەسەن رەزەویی و عەلی رەحمانی، "شوك آلماآتا"، وەرزنامەی تۆێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندیو قەفقاز، ژمارەی یەکەم، ساڵی یەکەم، هاوینی ١٣٦١، لاپەڕەی ٢٠٧.



میلیشیاکان و هێزەکانی هاوردە لە مسکۆوە لەگەڵ خۆپێشاندەران بوو، وە بووە هۆی کوژرانی نزیکەی پەنجاە کەسیو قوڵبەست کرانی نزیکەی هەزار کەس.

لەگەڵ ئەوەیشدا لیژنێك لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ دۆزینەوەی چاوگەی رووداوەکە پێکهات، هۆکارگەلی وەکو پرسە ناسیونالیزمییەکان و پەروەردەی نەتەوەخوازی لاوان و پەرەسەندنی زمانی رووسی بەتایبەتی لەنێو دانیشتوانی باکووری قەزاقستان و کاریگەری ئیسلامی دەمارگرژانە لەسەر لاوان لە هۆکارەکانی نارەزایەتی ئەتنیکی بەئەژمار هاتووە و رێگا چارە بۆ ئەم کێشانە، بەربەرەکانێی توند لەگەڵ فێر کردن و پروپاگەندەی نەتەوەییو ئایینیو چڕترکردنی پەروەردەی لەرادەبەدەری کومۆنیستی پێشنیار کرا . هەر لەم راستایە بوو کە هێرشی بەربڵاوی پروپاگەندە دژی ئیسلامگەراییو نەتەوەخوازی لەلایەن گورباچۆف و راگەیانە گشتییەکان لە ساڵەکانی ١٩٨٦و ١٩٨٧ز دەستی پێکرد.

بۆ وێنە "پراودا" لە بابەتێکدا لە ساڵی ١٩٨٧ بوونی هەر چەشنە نیشانەیەك لە شارستانییەتی لە ئیسلامدا رەد کردەوە ئەوەی وەکو سیستمێکی بێ بەهای ناشارستانی بۆ نەفامەکان پێناسە کرد و گۆرباچۆفیش لە پەیڤێکدا لەتاشکەند لە ساڵی ١٩٨٦ رەخنەی لە نووسراوە ئایینییەکانی موسڵمانان بەتایبەتی لە ئاسیای ناوەندی گرت و هێرشی کردە سەر ئایینی ئیسلام و گوتی کە ئیسلام رێچکەی نوێی بۆ ژیان نییە.

لە ساڵی ١٩٨٩ بە سەرنجدان بە سەرهەڵدانی نارەزایەتی قەزاقەکان لە مەڕ دەسەڵاتی، سکرتێری یەکەمی بە رەگەز رووسی حیزبی کۆمۆنیست، بە ناچار نوورسوڵتان نەزیر بایەفیان کرد بە سکرتێری گشتی حیزب. گرینگترین گرفتی ناوبراو لە حکوومەتدا بە لەبەرچاو گرتنی بۆچوونەکانی قەزاقەکان وەکو دانیشتوانی رەسەنی وڵاتی قەزاقستان و بۆچوونی رووسەکانیش وەکو کۆمەڵگایەکی گەورەی ئەتنیکی کۆچبەر بۆ ئەم سەرزەویە بوو. هەروەها ئاکامی نەبوونی هاوسەنگی لەنێوان ئەم دوو گرووپە بووە هۆی لە مەترسی خستنی ئەمنییەت و تەناهی نێوخۆییو تەنانەت دابەش بوونی وڵات بە هۆی بانگەشەی خاوەنداریەتی خاك لەلایەن رووسییەوە. هەر بۆیە، لەگەڵ پەسند کردنی ئەوەی کە قەزاقستان دەبێ وڵاتی قەزاقەکان بێت هەوڵدرا هەتا کوو پێش بە شوناس نەتەوەی بگیرێ. رووسەکان بە سەرنجدان بەوەی کە سەربەخۆیی قەزاقستان ویستی هەر دوو دەستەیە واتە قەزاقو رووسییەکان. نەزیربایەف لە هەڵویستێکدا گوتی، قەزقستان هەم کۆمەڵگایەکی فرە نەتەوەییە هەم وڵاتی قەزاقەکانە.

ساڵی ۱۹۹۰ز ناوبراو وەکو سەرۆك کۆمار دیاریکرا و بە سەرنجدان بە لێهاتوویی کە پێشانی دابوو تەنانەت گرووپگەلە توند ئاژۆ نەتەوەییەکانیش پێیان وابوو کە ئەو تاکە کەسێکە دەتوانێ وڵات بە هێمنی بەڕێوەبەرێت هەربۆیە پشتگیریان لێ کرد، هەڵبەت هێندێك ڕەخنەشیان لێی هەبوو.

نەزەر بایەف لە دەستپێکی کاری خۆیدا بە پەیرەویی لە سیاسەتی ئابووری گۆرباچۆف و تەنانەت لە هێندێك شوێن بە توندروویيەکی لەرادەبەدەر، پشتیوانی لە بازاڕی ئازاد و خاوەنداریەتی تایبەت دەکرد. بە هاوئاهەنگییەکی زۆرکە لە نێوان ئەو و گۆرباچۆفدا هەبوو ئەو توانی بەرە بەرە بە پێچەوانەی سیاسەتی ناوەندگەرایی پێشووی مسکۆ چاودێرییەکی ڕێژەی بەسەر سیاسەتە ئابوورییەکانی قەزاقستاندا بکات. نەزەربایەف وەکو درێژدەرو ئەمەگناسی گۆرباچۆف تا پێش دارمانی سۆڤییەت لەو بڕوایەدا بوو کە هێز دەبێ لەسەر بنچینەی خشتەی کاتبەندی و لەسەر بنەمای داهێنانەکانی گۆرباچۆف و پەیمانی نوێی وڵاتە سەربەخۆنوێیەکان، بگوازێتەوە بۆ ئەم یەکیەتییە.

نەزەربایەف لەگەڵ داوای دەسەڵاتی چڕتر لەمەڕ چاودێری کردن بەسەر سەرچاوە ئابوورییەکانی قەزاقستان، بە توندی لەسەر ئەم گریمانەیە کە گواستنەوەی بازاڕی ئازاد دەبێ لەسەر بنەمای ڕۆڵی سەرەکی یەکیەتیی سۆڤییەت وەکو یەکەم گۆڕەپانی ئابووری بێت بەرگری دەکرد. وا پێ دەچێت پشتگیری نەزەربایەف لە پاشماوەی یەکیەتیی سۆڤییەت لە مەترسی بانگەشەی دەمارگرژە نەتەوەخوازە ڕووسییەکان لەمەڕ خاوەنداریەتی بەسەر بەشی باکووری ئەم وڵاتەدا سەرچاوەی گرتبێ . بۆچوونە ئابووری لیبرالیستانەی نەزەربایەف لەگەڵ بوونی ١٦٪ موشك بە کڵاوەکی ناوکی سۆڤییەت، لە پێگەکانی قەزاقستان، هەروەها هاو تەریب بوونی هەڵوێستەکانی ئەو لەگەڵ گۆرباچۆف بووە هۆی ڕاکێشانی سەرنجی حکوومەتەکان و ڕاگەیانە گشتییە ڕۆژئاواییەکان بەتایبەتی پاش ساڵی ١٩٩٠. لەگەڵ ئەوەیشدا جووڵانەوە نەتەوەییە سیاسییەکان لە قەزاقستاندا لە حاڵی پێکهاتندا بوون و لە هاوینی ١٩٩٠ز گرووپی یەکیەتیی دێموکراتێك پلانی خۆی لەمەڕ سەربەخۆی وڵات بڵاو کردەوە کە بەپێی ئەوە داوا کراوە دامەزراوە حیزبی و حکوومییەکان لە یەك جیا بکرێنەوەو بە دانی مافی وەك یەك بۆ هەموو هاوڵاتیان بوار بۆ پێکهاتنی بازاڕی ئابووری ئازاد دابینبکەن. لە بەرانبەر ئەم کارەشدا بۆ بەرگری لە هەڵوێستە حکوومییەکان باڵی کۆمۆنیستیش پێکهات.



لە ئاکامدا لە ئوکتۆبری ١٩٩٠دا پلانی سەربەخۆیی قەزاقستان لەلایەن شوورای باڵا بە لەبەرچاو گرتنی خاڵەکانی ئاماژە پێکراوو دانی مافی میراتی کولتووری بەقەزاقەکان وەك یەکەمین کۆماری نەتەوەیی‌و مافی کەڵك وەرگرتن لە زمانی ڕووسی بۆ ڕووسەکانی قەزاقستان پەسند کرا. بە دوای ئەمەدا یاساگەلێك لە بواری تایبەتی کردنی سەرمایەگوزاری دەرەکی پەسندکرا کە قەزاقستانی وەك پێشرەویی لیبرالیزمی ئابووری لە نێو کومارەکانی سۆڤییەت ناساند. هاوتەریب بوونی نەزەربایەف لەگەڵ گۆرباچۆف جۆرێك ڕکەبەرایەتی پێکهێنابوو وتەنانت بوونی ناوبراو دەگەڵ یەڵتسین لەسەر مەسەلەی قەرەباخ لە ڕاستیدا بەئاشکرا بوونی ڕکەبەرایەتی لە نێوان گورباچۆف و یەلسین بە ئەژمار دەهات. پاش کودەتای ئووتی ١٩٩١یش یەکێك لە وتەبێژانی یەلیسین ئەگەری بانگەشەی ڕووسی بۆسەر خاوەنداریەتی بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی قەزاقستان هێنایە ئاراوە. کە بووە هۆی گەشەسەندنی هێندێك تێکهەڵچوون لە قەزاقستان. بەڵام یەلتسین بە سەفەرێك کە پاش کودەتا بۆ قەزاقستان کردی، سنوورەکانی هەر دوو وڵاتی بە فەرمی ناساند و بواری بۆ هاوکاری لە داهاتوودا خۆشکرد.

لەگەڵ ئەوەیشدا بە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی کۆماری ڕووسیە کە بووە هۆی سەربەخۆ بوونی گەلانی دیکە، نەزەربایەف بە جۆرێك لەم پرسانە بێ ئاگا بوو، لە ڕاستیدا سەربەخۆیی بەسەرناوبراو داسەپا. لە یەکەمین قۆناخی پێکهاتنی کۆمەڵەی هاوقازانجەکان لە مێنسك، کە تایبەتی پێکهاتبوو لە گەلانی سلاڤی، ناوبراویان بۆ ئەو کۆبوونەوە بانگهێشت نەکردو لە ڕاستیدا ئەوە سەرکردەکانی گەلانی ئاسیای ناڤین بوون کە بە پێکهێنانی کۆبوونەوەیەك لە ئاڵماتا بە سەرۆکایەتی نەزەربایەف و خۆی بەسەر کۆمەڵەکەدا سەپاند.

بە دوای کودەتاو پاش هەڵوەشانەوەی حیزبی کۆمۆنیست، نەزەربایەف کەسانێك کە زۆر جێگای متمانەی نەبوون لایبردن و تریشچنکۆی بە ڕەگەز ئوکراینی کە زمانی قەزاقی دەزانی‌و زیاتر هەستی قەزاقی هەبوو کرا بە سەرۆك وەزیرو ئاسانبابەفی قەزاقی سەۆکی شوورای باڵا، کە خاوەنی کەسایەتێیەکی بەرزبوو بۆ پۆستی جێگری سەرۆك کۆماری دەستنیشان کرا تاکو پێش بە سەرهەڵدانی دژایەتی لەنێوان دوو ڕەگەزی ڕووس و قەزاق بگرێت، بە مەبەستی ناساندنی قەزاقستان وەك کۆمەڵگایەکی دێموکراتیك کە سەرنجی ڕۆژئاوا بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، حکوومەتی قەزاقستان دەستی بە دروستکردن حیزب و گرووپگەلی سیاسی کە لە ژێر چاودێری خۆیدا بێت کرد. بە هەڵوەشانەوەی حیزبی کۆمۆنیست حیزبی سوسیالیست

پێکهات کە زیاتر رووسەکان و قەزاقە ناکۆمۆنیستەکانی لە خۆی دەگرت، بەڵام لایەنگرانی نەزەربایەف دەبوون بە ئەندامی. لە پاڵ ئەوەدا کۆنگرەی خەڵکی قەزاقستان بە بیری قەزاق لە ئوکتۆبری ١٩٩١ پێکهات کە شاعیری ناسراوو هێمای نەتەوەیی قەزاق "ئولژاس سۆلێمانۆف" کە رابرویەکی لە مێژینەی هەبوو لە خەبات بە دژی زاڵبوونی کولتووری رووسی، هەروەها موختار شاهانۆف سیمایەکی ناسراوەی دیکە وەك جێگرانی سکرتێری حیزب هەڵبژێران. پێکهاتنی ئەم دوو حیزبە کۆنترۆڵ کراوە رەوتی پێکهاتنی گرووپە سیاسییەکانی لە قەزاقستان لاواز کرد. جیا لەوەیش نەزەربایەف لە مەڕ بۆچوونەکانی کە دەیگوت بۆ گەلی قەزاقستان هێشتا زووە سیستمی فرەحیزبی، ترسێکی نەبوو.

دوو حیزبی دیکە لە قەزاقستان بە کەڵك وەرگرتن لە کەشی کراوەی گلاسنۆست پێکهاتن کە پەرەگرتنی چالاکی ئەوانە بۆ نەزەربایەف مایەی نیگەرانی بوو، یەکەمیان بە ناوی ئازادی کە هەستی نەتەوەیی هەبوو هەڵبەت بە شێوەی یاسایی رێی پێدرابوو، دووهەمیان کە هێشتا مۆڵەتی یاسای پێ نەدرابوو ناسراو بە ئالاش کە هەستی نەتەوەیی‌و ئایینی هەیە. هەر چەندە ئەم حیزبە لە بڵاوکراوەکانیان رەخنەیان لە بارودۆخی هەبوو و دەسەڵاتی رووسەکان نەدەگرت، هەربۆیە جارێ هیچ یەك لەم حیزبانە رەخنەی توندیان لە نەزەربایەف نەدەگرد، یەکەم رەنگە ئەم دژایەتییە بە توندی لەلایەن حکوومەتەوە وەڵام بدرێتەوە و دووهەم لە روانگەی ئەوانەوە هێشتا کاتی لابردنی نەزەربایەف نەهاتیبێت چونکە نە ئەلترناتیڤێکی گونجاو لە ئاستی ئەوەی کە لەنێو رووسەکاندا دەسەڵاتی هەبێت نە قەزاقەکانیش هێشتا ئەو هێزو توانایان هەیە کە بتوانن بە گوشار خستنە سەر رووسەکان بیانخەنە بارودۆخێکی لاوازەوە.

نەزەربایەف بە درێژایی حکوومەتی خۆی لە گەڵ هەوڵدان لە پێناو راکێشانی رای رۆژئاواییەکان کە پابەندی دانی شوناسی ئەوروپایی ئاسیایی‌و جیاکردنەوە لە ئاسیای ناوەندی بوو، هەوڵیشی دەدا کە رێبەری ناوچەی ئاسیای نێوەڕاست بە دەست بێنێت. نەزربایەف پانتایی دەسەڵاتی خۆی زۆر فراوانتر لە ئاسیای ناڤین و قەفقاز لێکدەدایەوە. نێوبژیوانی کردنی قەزاقستان لەنێوان ئازربایجان و ئەرمنستان لەگەڵ یەلتسین لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١، هەروەها لە سپتامبری ١٩٩٢ز کە بە تەنیایی جێبەجێ کرا دەرخەری ئەومەیلەیە. هەڵبەتە لە پێوەندی لەگەڵ پرسی پێشوو نەك هەر رکەبەرایەتییەك لەگەڵ رووسەکان نەهاتە ئاراوە، بەڵکو رووسەکان خۆیان بە هێزی سەرەکی ناوچەکە لەقەڵەم دەدا، پێیان باش بوو کە بەهۆی بوونی کەشێکی



نگەتیڤی دژی رووسی لە قەفقاز راستەخۆ نەچنە گۆڕەپانی نێوبژیوانییەوە وبوونی قەزاقستان بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە بە گونجاوتر لێکدەدایەوە.

**(٢ـ١) وەرچەرخانە سیاسییەکانی هاوچەرخ:**

نوور سوڵتان نەزەر بایەف[١] لە ٢٢ ژووئەنی ١٩٨٩دا کرا بە جێنشینی کۆلبیین ـ لە ئاوریلی ١٩٩٠یشدا لەلایەن شوورای باڵای قەزاقستان وەك یەکەمین سەرۆك کۆماری ئەم وڵاتە هەڵبژێردرا. لە یەکەمین هەڵبژاردنی گشتی‌و ئازادی سەرۆك کۆماریشدا کە لە یەکی دسامبری ١٩٩١دا بەڕێوەچوو، نەزەر بایەف بەبێ دژایەتی و بە بەدەستهێنانی زیاتر لە ٩٨٪ دەنگەکان وەکو سەرۆك کۆماری قەزاقستان هەڵبژێردرا. لە دەی دسامبری هەمان ساڵدا ناوی ئەو کۆمارە لە "کۆماری سۆسیالیستی شوورایی قەزاقستان"[٢] گۆڕا بە "کۆماری قەزاقستان"[٣] دوابە دوای ئەوەیش قەزاقستان لە ١٦ی دسامبری ١٩٩١دا رێگای سەربەخۆیی تەواویی گرتەبەر.[٤] نوور سوڵتان نەزەربایەف لەلای خەڵکی قەزاقستان زۆرخۆشەویست بوو، بە جۆرێك هیچ سیاسەتوانێك هێزی بەربەرەکانێی لەگەڵ ناوبراودا نەبوو، تەنانەت رێبەری حیزبی ژلتۆکستان ـ حەسەن قازی ئەحمەد ئووفیش ناڕەزایەتی لە مەڕ لەسەرکار لابردنی دین محەممەد کۆنایەف لە سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان دەربڕیبوو، توانی ئیتووبارێك بۆ خۆی بەدەست بێنێت. بەڵام لە بەرانبەر نەزەربایەف نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت. لەگەڵ پشتیوانی گشتی خەڵك لە گۆرباچۆف حکوومەتی ناوبراو بە دەست کۆمەڵێك کەموکوڕییەوە ئازاری دەبینی کە زۆربەیان بە هۆی ئاکامی نالەباری سەربەخۆیی‌و پشتیوانی نەکردنی ماڵی لە قەزاقستانەوە سەرچاوەی دەگرت. چونکە یەکێك لە پێشهاتە نالەبارەکانی سەربەخۆیی ئەم کۆمارە هەر وەکو زۆربەی کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای ناوەڕاست بە مانای بڕینی هاوکاری بازرگانی مسکۆ بۆ

---

(١) نەزەر بایەف لە چمۆلقان لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٦٢ بووە بە ئەندامی فەرمی حیزبی کۆمۆنیست، ئەو لە ساڵی ١٩٩٠ تا ١٩٩١ بووە سەرکۆماری قەزاقستانی سۆڤییەت و پاش هەرەسهێنانی کۆمۆنیزم تاکوو ئێستاش هەر سەرکۆماری وڵاتی سەربەخۆی قەزاقستانە.

(2) the Kazakh Soviet Socialist Republic
(3) the Repubkic of kazarhstan
(4) the EIU, The country Repot: Kazakhstan political structure (London: the EIU Press, 1993), p. 10.

پشتیوانی لە ئابووری تاکە بەرهەمی ئەو ولاتە بوو، لە ئاکامدا قەزاقستان دەبێ حەشیمەتی روو لە زیاد بوونی خۆی بەبێ یارمەتی رووسیە بەخێو بکات، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە کۆماری قەزاقستان بۆ دامەزراندنی دامەزراوەی مەدەنی نوێ و پتەوتر کردنی بوراەکانی سەربەخۆیی خۆی پێویستی بە یارمەتییەکی زیاتر هەبوو، نەك هەر ئەمە بەڵکو کۆچی هەزاران تکنیسیەنی لێهاتووی ئەوروپایی کە زۆربەیان بە رەچەڵەك رووسی بوون، مەترسی قەیرانی ئابووری، داخرانی کۆمپانیاکان لەم ولاتەو زێدە بوونی بیکاری بە دواوەوە بوو.(١)

کۆماری قەزاقستان هەر وەکو کۆمارەکانی‌تری ئاسیای ناڤین، پاش بەدەستهێنانی سەربەخۆیی بەها نەریتییەکانی ولات، هەروەها پێکهاتەگەلی سیاسی سەردەمی سۆڤییەتی هەرمابوو. لێکولینەوەی بنچینەی یاسای سەرەکیو چۆنییەتی بەرێوەبردنی هەڵبژاردنەکانی قەزاقستان لە دەییەی رابردوودا بەڵگەیەکی روونە بۆ ئەم بانگەشەیە. جۆری پێکهێنانی حکوومەت لەنێوان کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندی یەك لەوان قەزاقستان و رادەی بەڵێنییەکانیان بۆ چاکسازیو ئازادییە سیاسییەکان جیاوازە. بە شێوەی گشتی ئەم کۆمارانە لە باروودۆخێکی تێپەراوو لە حالی گۆراندانو بەم پێیە چاوەروانی خێرا بۆ یەکسانی لە سیستەمی سیاسی ئەواندا لەگەڵ بەهاو بنچینەکانی دێموکراسی، تا رادەیەك ناسرووشتی وەبەرچاو دەکەوێت.

کۆمارەکانی ئاسیای ناڤین هەر وەکو ولاتانی هاو شێوەی خۆیان لە جیهانی سێهەمدا لە قۆناخی یەکەم بە دوای سەقامگیری سیاسییەوەن و پاشان گرینگی بە رەوتی ئازادی سیاسی دەدەن. ئەم کۆمارانە پاش لەبەر یەك هەڵوەشانەوەی یەکیەتیی سۆڤییەت هەوڵێکی بەرفەراوانیاندا بۆ پێکهینانی پێکهاتەیەکی یاسای نوێ. ئەوان بۆ دامەزراندن و جێگیر کردنی یاساو رێسا کەڵکیان لە سیستەمی رۆژئاواییەکان وەرگرت. لە قەزاقستانیشدا هەر وەکو کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای نێوەراست دامەزراوە سیاسییەکانیان لە دەیەی١٩٩٠وە بیچمی گرت. ئەم کۆمارە بە رێبەری نوورسولتان نەزەربایەف هەوڵی داوە کە خۆی لە رێوشوێنی حکوومەتەکانی خەڵك سالار نزیك بکاتەوە. بەڵام لەگەڵ بوونی پروپاگەندە بۆ گەشەی سیاسیو نۆژەن کردنەوەی گشت لایەنە ئابوورییەکان، هێشتا کۆمەڵگای قەزاقستان هەر وەکو کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای ناوەندی بە شێوەیەکی سەرەرۆیانە رێبەری دەکرێ. تەنانەت

(١) ساڵحی ئەبوولحەسەنی، قەزاقستان (تاران: ئینتشاراتی دەفتەری توێژینەوەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٦) لاپەرەکانی ١٢٨ ـ ١٢٧.



بژاردەکان و "نۆمەنکلاتۆرانی" سەردەمی یەکیەتیی سۆڤییەت جگە لە ئاقایەف هێشتا دەسەلاتیان بە شێوەی کۆن بە دەستەوەیە لەم نێوەدا نەزەر بایەفیش یەکێکە لەو کەسانەی مەیلی بۆروکراسیو زۆردارانەی هەیەو بە دوای نۆێژەن کردنەوەی ئابووری ـ سیاسی ولاتەکەی خۆیانن. باشترین بەڵگە بۆ ئەم بانگەشەیە گۆرینی سیستەمی پارلمانی قەزاقستان بۆ سیستەمی سەرۆکایەتی کە لەم ساڵانەی دوایی کەمکرنەوەی دەسەلاتی نوێنەرانی پارلمانی بە دواوە بوو. لەم جۆرە سیستەمە سیاسییەدا واتە سیستەمی سەرۆکایەتی، سەرۆك کۆمار چاودێری بەسەرناوەندەکانی دیکەی ولات وەکو ناوەندی یاسادانان دەکا، تا ئەو جێگایەی کە سەرۆك کۆمار مافی هەڵوەشانەوەی پارلمانیشی بۆ خۆی پاراستووە. نەك هەر ئەمە بەڵکو نەزەر بایەف بە بەرێوەبردنی راپرسییەکی گشتی لە ساڵی ١٩٩٥، ماوەی سەرۆك کۆمار خۆی تا ساڵی ٢٠٠٠ی زایینی درێژ کردەوە.(١) هەروەها یاسایی بنەرەتی قەزاقستان لە ئاگۆستی ١٩٩٥ خرایەبەر راپرسی گشتی. لەم یاسا بنچینەیەدا بە توندی لە رادەی هێز و دەسەلاتی پارلمانی کەم کردەوە و لە بەرانبەردا سەرۆك کۆمار هێزو دەسەلاتێکی زیاتری پێدرا.(٢) لەگەڵ ئەوەیشدا کۆمەڵگای قەزاقستان خاوەنی پێکهاتەی تایبەتی عەشیرەتیو ئەتنیکییە و خەڵك لە دەستنیشان کردنەکانی خۆیان تا رادەیەکی بەرچاو بەرژەوەندی قەومیو عەشیرەتی دەکەنە پێوانە نەك بەرژەوەندی نەتەوەیی؛ بە شێوەی گشتی چەمکی نەتەوەخوازیو بەرژەوەندی نەتەوەیی لە ئاسیای نێوەراست یەك لەوان قەزاقستان پاش تێکرووخانی سۆڤییەت؛ جیاوازی هەیە. لە سوێنگەیەکی دیکەوە سنوورە سیاسی یەکانی ولاتانی تازە سەربەخۆ بە جۆرێك گەلاڵەی دراێژراوە کە لەهەموویاندا پرسە ئەتنیکیەکان لە بەر چاو گیراوەو ئەم کارە بووەتە هۆی ئالۆزی و پێکدادانی قەومی لەناوچەکەدا. بەلام لەم رووە وە قەزاقستان لەنێوان کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندی خاوەنی ئالۆزترین و هەستیارترین پێکهاتەی ئەتنیکییە. بەجۆرێك ئەم ولاتە جێگاوو شوێنی پتر لە چەندین قەوم و نەتەوەیە کە لەم نێوەدا قەزاقەکان لەم ولاتە کەمینەن. ئەم پێکهاتە قەومییە بۆتە هۆی ئەوە تاکو رەوتی سەربەخۆیی خوازی لە قەزاقستان بە هێمنی برواتە پێشێ. بە پێی سەرژمێریە فەرمییەکان، قەزاقەکان نزیکەی ٤٤٪و روسەکانیش دەوروبەری ٣٨٪ حەشیمەتی قەزاقستانیان پێکهێناوە. رووسەکان زیاتر لە باکوور و رۆژهەلات و رۆژئاوای ئەم ولاتە ژیان دەکەن و خۆیان وەك کەمینە لە قەڵەم نادەن،

(1) Cnn Roport “Election watch: kozakhstan presidential Eiection” 2000, p. 2.

(٢) ئەبوالحەسەنی، پێشوو، لاپەرەی ١٣١.

به بەراورد لەگەڵ دوایین سەرژمێری، رادەی کۆچی بە رەچەڵەك رووسی بۆ کۆماری فدراتیوی رووسیە بەرز بووەتەوە، بە جۆرێك لەکاتی سەربەخۆیی قەزاقستان تاکو ژووئیەی ٢٠٠٠ نزیکەی ١/٥ ملیۆن کەس لە رووسەکان بەرەو رووسیە کۆچیان کردووە. هەروەها لەساڵی رابردوو تاکو مانگی ژووئیەی رادەی کۆچی رووسەکان لە قەزاقستانەوە نزیکەی ٢٤٠ هەزار کەس مەزەندە کراوە. لەسەر بنەمای هێندێك سەرژمێری تەنیا ٧٪ رووسەکانی ئەم وڵاتە دەتوانن بە باشی بە زمانی قەزاقی ئاخافتن بکەن لە کاتێکدا ئەوان نزیکەی ٣٨٪ حەشیمەتی قەزاقستانیان پێکهێناوە. لە سەردەمی سۆڤییەتدا تەنیا ژمارەیەکی کەم لە زانکۆکانی ئەم وڵاتە بە زمانی قەزاقی وانەی تێدا خوێندراوە و زمانی رووسی بە سەر هەموویاندا زاڵبوو، گۆڕانکاری لەم باودۆخە بووە هۆی گەشەی نەتەوەخۆازیی رووسی، لە کاتێکدا بەردەوامی ئەم مەسەلەیە دەبووە هۆی نارەزایەتیی قەزاقەکان. کێشەیەکی دیکە دەگرێتەوە بۆ پێکهاتەی نەتەوەیی قەزاقستانو تێکڵاو بوونی قەزاقەکانو مەغۆلەکان کە لە سینکیانگ و مەغۆلستان کولتووریو جۆغرافیاییەکی هاوبەشیان هەیە. بە سەرنجدان بە پەرەگرتنی نەتەوەخوازی قەزاقەکان؛ ئەگەری گەشەی ئەم هەستانە لەنێوان مەغۆلەکانی سینکیانگ و مەغۆلستانیش چاوەڕوان دەکرێت. کۆچی قەزاقەکان لە مەغۆلستانەوە بۆ قەزاقستانیش رەهەندێکی بەربڵاوتری بە خۆیەوە گرتووە. لە راستیدا ئەم پرسە کە شوناسی خەڵکی قەزاقستان وەکو وڵاتانیتری ئاسیای ناڤین نەك لە رێگای هەڵبژاردنێکی سرووشتییەوە، بەڵکو لە رێگای "گەڵاڵەیەکی دەستکردەوە جێبەجێ ببێت؛ ئەمڕۆکە بووتە هۆی چاوگی زۆربەی ئاڵۆزیەکانی ناوچەکە. بارودۆخ و پێکهاتەی ئەتنیکی لە قەزاقستان چەندین بەرامبەر گەشەی سەندووە بە پێکهاتنی رێکخراوگەلی نەتەوەخوازی قەزاقی، کە لەو بوارەدا دوو دەستە بەندی سەرەکی هەیە، یەکیان رێکخراوی ئەدینیستۆ (یەکیەتیی) ئەوەی دیکەیان رێکخراوی ئازات (ئازادی)، ئەم دوو رێکخراوە زیاتر تایبەتمەندی بزاڤێکی سیاسیان هەیە، لە کردەوەدا بوونەتە سەیوانی زۆربەی رێکخراوگەلی ناحکوومی لە قەزاقستان بەڵام هیچ یەك لەوانە لە پارلمانی قەزاقستان نوێنەریان نییە. ئەگەر چی لە پارلمانی قەزاقستان ژمارێکی بەرچاو لە قەزاقەکان هەن، گرینگی ئەم تەڤگەرانە بە سەرنجدان بە گەشە سەندنی مەیلی نەتەوەخوازانە لەم وڵاتە دەر دەکەوێت. بۆ چارەسەر کردنی ئەم پرسە حکوومەتی قەزاقستان لە ساڵانی دوایین زمانی لە پاڵ زمانی قەزاقی بە فەرمی ناسی، بە فەرمی ناسینی زمانی رووسی پشتیوانی کەمینەی گەورەی بە رەچەڵەك رووسەکانی ئەم وڵاتەی بە دواوە بوو. نەزەر بایەف بۆ پێکهێنانی هاوسەنگیو



پتەو کردنی یەکیەتیی نەتەوەیی لەم وڵاتە پشتیوانی پێویستی لە دامەزرانی حیزبی یەکیەتیی قەزاقستان کرد. کەسانێك وەك ئەلژاس سولێمان ئووف ـ شاعیری گەورەی قەزاقستان، هەروەها مۆختارشاخانۆف لە دامەزرێنەرانی ئەم حیزبەن. تاکو ژانوییەی ١٩٩٠ز موسڵمانانی قەزاقستان لە رێگای دامەزراوە ئایینییەکانی دیاریکراو لەلایەن سەرکردەکانی یەکیەتیی سۆڤییەت جێگیر لە تاشکەند رێبەری دەکران. بەڵام لەم رێکەوتەوە موفتی ئاڵماتا "رادیك ئاسانبای" خۆی وەکو رابەری موسڵمانی ئەم وڵاتە ناساند و سەربەخۆی خۆی لە تاشکەند راگەیاند. ناوبراو پشیگیری لە بزووتنەوی دژی ناوکی قەزاقستان دەکرد بەڵام هیچکات لە بەرهەڵستکارەکانی حکوومەت نزیك نەبووە. ئاسانبای لە ساڵی ١٩٩١ یەکەمین خوێندگای لە قەزاقستان دروستکرد و قورئانی وەرگێڕایەوە بۆ سەر زمانی قەزاقی. شایەنی گوتنە کە جێبەجێ کردنی پلانە سیاسییەکانی گۆرباچۆف ناسراو بە گلاسنۆست بواری پێویستی بۆ هەڵسوڕانی موسڵمانان لە ناوچەکەدا پێکهێنا. ئەوان توانیان پەرە بە هەستی بناژۆخوازانەی ئیسلامی بدەن، بە جۆرێك ئەم هەستە ئەمڕۆکە بۆتە گەورەترین نیگەرانیی رێبەرانی سیاسی ناوچەکە و باشووری ئەم وڵاتە یەکێکە لە ناوەندەکانی سەرهەڵدانی هزری بناژۆخوازیی. ئەم ناوچەیە بە هۆی نزیك بوونی بە شیوی فەرغانە، هەروەها بوونی کولتوورو ئایینی تا رادەیەك نزیك لەگەڵ ئیسلامگەراکانی ئوزبەکی و فەزای کراوەیی پێوەندی گرتن دەگەڵ دەوروبەری ناوەند بوونەتە هۆکارێك کە ئەم ناوچەیە ببێتە یەکێك لە ناوەندە بەربڵاوەکانی ئیسلامگەرایی لە ئاسیای نێوەڕاست.[1]

لە بەرانبەر چالاکی رێکخراوە ئایینییەکانی قەزاقستان کە بە شێوەی فەرمی لەم وڵاتە بوونیان هەیە؛ حیزبی ئیسلامی "ئالاش" هەڵکەوتووە. ئەم حیزبە کە لە بەهاری ساڵی ١٩٩٠ پێکهات لەلایەن حکوومەتەوە بە نایاسایی راگەیاندرا. حیزبی ئالاش ئەمڕۆکە بۆتە یەکێك لە رەخنەگرانی دەوڵەتی خوجێی ئاڵماتی. هێندێك لە بیرمەندانی رۆژئاوایی، لەو بڕوایەدان کە ئەم حیزبە خاوەنی هەستی شوێنیستی تورکی، هەروەها بناژۆخوازی ئیسلامییە. بە شێوەی گشتی، حکوومەتی قەزاقستان بۆ هەر چەشنە چالاکییەکی ئیسلام گەرایی لەناوچەکەدا دژکردەوەی نگەتیڤی پێشانداوە و ئەم هەڵوێستەیان بە مەبەستی پاراستنی تەناهی خۆیان و وڵاتانی دیکەی

(١) برات شمسا، "پەرەگرتنی ئیسلام گەرایی لە ئاسیای ناوەندی"، رۆژنامەی ئیتلاعات، ١١ی رەشەمەی ١٣٧٨، لاپەرەی ١٢.

ناوچەکە لەقەڵەم دەدا. بە جۆرێك حکوومەتی قەزاقستان لە بەرانبەر جووڵانەوەی ئەم دوایانەی ئیسلامگەرایانی چەکدار لە ئوزبەکستان و قرقیزستان؛ حاڵەتی نائاسایی راگەیاند و کۆمەڵێك هەڵوێستی لەو پێوەندییەدا گرتە بەر. تەنانەت نەزەر بایەف لە ئاخافتنێکی لە پارڵمانی قەزاقستان لە سپتامبری ٢٠٠٠ی زایینیدا گوتی، بۆ بەرنگاری لەگەڵ بناژۆخوازی ئیسلامی داوای زیاد کردنی بودجەی سەربازی کردە بوو، هەروەها داوای لە خەڵکی قەزاقستان کرد تا لە بەرانبەر ئیسلامگەرایی بەرەیەکی یەکگرتوو لەناوچەکەدا پێك بێنن.[1] هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بزانیین کە لە رووی مێژووییەوە، ئیسلام لە وڵاتی ئەمڕۆکەی قەزاقستان لە چاو ناوچەکانی دیکەی ئاسیای ناوەندی درنگتر هاتووە و تەنانەت لەگەڵ کولتووری خۆجێی ئەو وڵاتە تێکلاویەکی بەربلاویی لێ پێك نەهاتووە. لە وەڵامی راپرسییەکدا؛ قەزاقەکان کە خۆیان بە مسڵمان لەقەڵەم دەدا، کەمتر لە نیوەی حەشییەتی ئەم وڵاتەیان واتە نزیکەی ٤٧٪ پێکدەهێنا.

لەم رادەیەش تەنیا ژمارەیکی زۆر کەم لەوانە بڕیارو ئەرکە ئایینییەکانیان بەجێ دەگەیاند. یەکێکی‌تر لە ئاستەنگەکانی بەردەم پەرەگرتنی ئیسلام لە قەزاقستان پێکهاتەی ئەتنیکی بوو کە بە کورتی باسی لێوە دەکەین. لە ٧ی فێورییەی ١٩٩٤، شوورای باڵای قەزاقستان کە هەر بە شێوەی سەردەمی پێشووی یەکیەتی سۆڤییەت مابووەوە، ئاستنگی بۆ سەرۆك کۆماری ئەم وڵاتە پێکهێنا؛ چونکە پارلمانی قەزاقستان خۆی بۆ شەڕو پێکدادانە خوێناوییەکان کە لە مسکۆ لەنێوان پشتیوانانی پارلمانی رووسیە و لایەنگرانی سەرۆك کۆمار روویاندا، ئامادە نەکردبوو. بە دوای ئەم بشێوییانە، پارلمانی قەزاقستان لەلایەن حکوومەتەوە هەڵوەشایەوە و نوێنەرانی پارلمان بە شێوەی کۆ دەستیان لەکار دەکێشاندەوە. لە حەوتی مانگی مارسی ١٩٩٤یشدا یەکەمین هەڵبژاردنی پارلمانی فرە حیزبی لە قەزاقستان لە پاش سەربەخۆیی ئەم وڵاتە بەڕێوە چوو کە پاڵێوراوانی ئەم هەڵبژاردنە بە سەر سێ لیستەدا دابەش کران، حیزبە سیاسییەکان نزیکەی ٤٤٪، کاندیداتورو سەربەخۆکان نزیکەی ٤٨٪و لیستی سەرۆك کۆماریش نزیکەی ٨٪ .[2] لە کۆتاییدا لایەنگرانی نەزەربایەف لەم هەڵبژاردنەدا بە زۆرینەیەکی جێگای سەرنج سەرکەوتنیان بە دەستهێنا کە ٧٣/٥٢ لە سەدی دەنگەکانی خەڵکیان پێکدەهێنا. هەروەها لەم هەڵبژاردنە قەزاقەکان ٦٠ لە سەدی کورسییەکانیان بۆ

(1) BBc Radio, Cenfral Azian Zurvey, 1 septempar 2000
(2) Gregory Glesaon, Central Asian "Indigenous Democracyin central Asia," survery, 1996, Pp. 5-6.



خۆیان تەرخانکردبوو کە ئەم کارە بووە هۆی نیگەرانی رووسەکانی دانیشتووی قەزاقستان. چاودێرانی نێونەتەوەیی رەخنەیان لە دەستێوەردانی دەوڵەت لە پرۆسەی هەڵبژاردنەکەدا گرت. پاش پێکهاتنی پارلمان لە ١٩ی ئاوریلی هەمان ساڵ؛ رەخنە لە سیاسەتە ئابوورییەکانی حکوومەتی ترشینکۆ سەرۆك وەزیری بە رەچەڵەك رووسی قەزاقستان دەستیپێکرد. کە لە کۆتایدا بووە هۆی لەسەر کار لابردنی ناوبراو و ئاقاجان خواجە گولدین[1] بە جێنشێنی ئەو دیاریکرا. بە پەرەگرتنی پانتایی کێشەکان لە ساڵی ١٩٩٥ی زایینی پارلمان خۆی بوارد لە وەرگرتنی پێش نووسی بودجەی دەوڵەت و بەم شێویە لە ٦ی مارسی هەمان ساڵ دادگای یاسای بنەڕەتی بە بیانووی شکاندنی بڕیارەکان لە کاتی هەڵبژاردندا، پارلمانی ئەم وڵاتەی هەڵوەشاندەوە؛ چونکە ئەم دادگایە رایگەیاندبوو کە لە کاتی هەڵبژاردنەکەدا، یەکێك لە یاساکان "تاکێك"و "یەك دەنگ"[2] پێشل کراوە. هەڵبەتە نەزەربایەف لە سەرەتادا حوکمی دادگای یاسایی بنەڕەتی رەد کردەوە و لە بەرانبەردا ئەم دادگایە، بۆچوونەکانی ئەوی پەسند نەکرد، تا ئەوەی کە نەزەربایەف مل کەچی بڕیاری دادگابوو و هەڵوەشانەوەی پارلمان و چاکسازی لە یاسایی بنەڕەتیدا پەسند کرد.

یاسای بنەڕەتی نوێ کە لەلایەن نەزەربایەف ئامادە کرابوو، لە ئاگۆستی ١٩٩٥ خرایە بەر راپرسی گشتی کە ٩٠٪ خەڵك دەنگی پۆزەتیڤیان پێدا.[3] لەم یاسا بنەڕەتییەدا، شوورای باڵای قەزاقستان هەڵوەشایەوە و بە جێگای ئەو دوو پارلمانی "سەنا"و "نوێنەران" دیاریکران. لە پێنج و نۆیی دسامبری ١٩٩٥یشدا ١١٤ نوێنەری ئەم دوو پارلمانە لە رێگای هەڵبژاردنی گشتییەوە دیاری کران. لەنێوان ٤٧ ئەندامی پارلمان سەنا؛ ٤٠ کەسی بە شێوەی ناراستەوخۆ لەلایەن ئەنجوومەنە بیاڤی یەکان و ٧ کەس لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە هەڵبژێران، ٦٧ ئەندامی پارلمانی نوێنەرانیش لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێران. لەم هەڵبژاردنەدا ١١٠ چاودێر لە ١٤ وڵاتی جیهانو ١٠ رێکخراویی نێونەتەوەیی یەك لەوان رێکخراویی ئاسایشو هاوکاری ئەورووپا، ... . بەشداریان کرد.[4]

(1) Akezhen Kazheyeldin
(2) one person, on vote
(3) Jim " .snew states: Political Developments and Implicatlons For U. S. Interests ، Nichol. Centrol Asia Foreign Affails and national Defence Devision, 19 December 1996, Pp. 10 – 11.
(4) Cnn Report, op. cit…. p. 2

لە راپرسییەکی گشتیدا کە لە ٢٩ی ئاوریلی ١٩٩٥ بەڕێوە چوو خەڵکی قەزاقستان بۆ دووهەم جار دەنگیان بە درێژەی ماوەی سەرۆك کۆماری نەزەربایەفدا. بەم جۆرە ماوەی سەرۆك کۆماری ناوبراو تا ساڵی ٢٠٠٠ نوێ کرایەوە. نەزەربایەف ئەم کارەی بۆ درێژی رێفورم لە قەزاقستان بە پێویست زانیو جەختی لەسەر سیاسەتی پەیوەست بوون بە سیستمی بازاری ئازاد کرد. ناوبراو بە سەرنجدان بە پێکهاتەی قەومی قەزاقستان رێوشوێنی زۆر بەپارێزی دەگرتە پێش. لە هەمان کاتدا هێرشی توندی دەکردە سەر هێندێك لە سیاسەتەکانی سەردەمی یەکیەتیی سۆڤییەت. نەزەربایەف وەدیهاتنی ئابوورییەکی پەرەگرتوو لە قەزاقستان، سەقامگیری سیاسی لە وڵاتدا بە پێویستییەکی زۆر گرینگ لە قەڵەم دەدا. هەروەها ناوبراو لە سیاسەتە نێوخۆییەکانی بایەخێکی زۆری بە دوو خاڵی هەستیاردەدا، یەکێکیان رووسەکانی دانیشووی قەزاقستان بوون کە بەشێکی گەورەی لە هێزی کاری (پسپۆر)ی ئەم وڵاتەیان پێکدەهێنا هەر بۆیە لە گەشەسەندنی ئابووریدا بایەخێکی شایانی هەبوو. دووهەمیان، پێوەندی پێشە سازی باکووری قەزاقستان، لەگەڵ پێشەسازی رووسیە راستییەکی گرینگیدیکە بوو کە پێویستی پاراستنی پێوەندی باش لەنێوان ئەم دوو وڵاتەی دەردەخست.

پێش ئەوەیی خولی سەرۆك کۆماری نەزەر بایەف کۆتایی پێ بێت؛ ناوبراو لە هەڵبژاردنی ١٠ی ژانوییەی ١٩٩٩دا وەکو کاندیداتۆری "حیزبی یەکیەتیی گەلی قەزاقستان" بەشداری کرد و بە وەدەستهێنانی ٧٩/٧٨ لە سەدی دەنگەکان بۆ جارێکیتر بۆ ماوەی٧ ساڵی دیکە دەسەڵاتی گرتەوە دەست. لەم هەڵبژاردنەدا بە سەدان چاودێری دەرەکی چاودێرییان دەکرد؛ بەڵام گرووپە دژبەرەکانی حکوومەت؛ باڵی نەزەر بایەفی بە دانانی بەربەست گەلی سیاسیو یاسایی بۆ بەربژاردە رکەبەرەکان تاوانبار دەکرد. هەروەها لەم هەڵبژاردنە ئاغای "سەیك بۆلسین عەبدئەلدین" لە حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان، نزیکەی ١١/٧٠ی دەنگەکان، ئاغای "گانی گاسیوف"[1] ٤/٦١ دەنگەکان، هەروەها ئاغای "ئەنگلیس گاباسۆف"[2] دەوروبەری ٠/٧٦ لە دنگەکانیان بەدەستهێنا. بەڵام رکەبەری سەرەکی نەزەر بایەف واتە ئاقاجان خواجە گولدین،[3] سەرۆکی حیزبی کۆماری خوازی قەزەاقستان، لەلایەن لێژنەی ناوەندی هەڵبژاردن لە رەوتی رکەبەرایەتیدا وەلانرا.

(1) Gany kasymov
(2) Engles Gabbasov
(3) Akezhen kake Yeldin



لە ساڵی ٢٠٠٦ی زایینی خولی سەرۆك کۆماری نەزر بایەف کۆتایی پێ دێت و بەپێی یاسای بنەڕەتی مافی خۆپاڵاوتنی سەرلەنوێی نابێت. بەڵام لەسەر داواکاری حیزبی خەڵکی قەزاقستان کە لایەنگری سەرۆك کۆمارن؛ لە ٢٧ی ژووئەنی ٢٠٠٠ی زایینی گەڵاڵەیەك لەلایەن پارلمانەوە پەسند کرا کە نەزەر بایەف بە شێوەی هەمیشەیی بەسەر قەزاقستاندا حکوومەت بکات، یان بە واتایەکی تر وەکو رێبەرێکی لێهاتوو بمێنێتەوە؛ بۆ وێنە چاودێری بەسەر بەڕێوەبردنی وڵاتدا بکات و پلانەکانی خۆی بۆ جێبەجێ کردن بخاتە بەردەست دامەزراوە حکوومییەکانەوە. ناوبراو سەلاحییەتی هەیە بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی بڕیار بەسەردەوڵەت و خەڵك بدات لە پارلمان و کۆبوونەوەکانی تر ئاخافتن بکات هەروەها نەزەربایەف وەکو ئەندامی شواری تەناهیو سەرۆکی جڤاکی ئەتنیکەکان بمێنێتەوە و بۆ راگەیاندنی بارودۆخی نائاسایی لەم وڵاتەداو لابردنی و هێنانی بەرپرسانی حکوومی پێشنیارەکانی خۆی بەخاتە بەردەست سەرۆك کۆماری داهاتوو. ئەو یاسایە بۆ هەموو سەرۆك کۆمارەکانی داهاتووی کۆماری قەزاقستانە. تەنانەت لەسەر بنەمای یەکێك لە خاڵەکانی یاسای نوێ؛ هەموو ساڵێك دیاری یەکەمین سەرۆك کۆماری قەزاقستان لەلایەن نەزەربایەف بۆبە جێ گەیاندنی خزمەتگۆزاری بەسوود بە ئەو کەسانە دەبخشرێ.[1] پارلمان لە دانیشتنێکدا، ٥٧ کەس بەم یاسایە دەنگی بەڵێیان دا؛ ٣ کەسیش ناو و١٧ کەسیش لە دانی دەنگ خۆیان بوارد.[2]

لە کاتێکدا حیزبە دژبەرەکان؛ پەسند کردنی ئەم یاسایەیان لەگەڵ یاسای بنچینەیی بە ناتەبا لە قەڵەم دەدا، دادگای یاسای بنەڕەتی ئەم یاسایەی پەسند کرد. تەنانەت پاش پەسندکردنی ئەم یاسایە کۆمەڵێك لەو بڕوایەدابوون کە ئەگەر نەزەربایەف ئەم یاسایە پەسند نەکات دەبێتە هۆی زیاتر بوونی خۆشەویستی ناوبراو لە ناو خەڵکدا. پانزە حیزب و گرووپی دژبەری حکوومەت یەك لەوان حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان داوایان لە نەزەر بایەف کرد کە نەچێتە ژێر رکێفی ئەم یاسایەوە؛ بەڵام ناوبراو زۆر سەرسوڕ هێنەرانە، نەك هەر قەبوولی کرد بەلکو جەختی دەکرد تەنانەت رەنگە بۆ جارێکی دیکەش خۆی بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری بپالێوێت؛ نەزەر بایەف بۆ ئەم مەبەستە پاساوی دەهێنایەوە کە کاتێك یاسای بنەڕەتی قەزاقستان لە ساڵی ١٩٩٥ پەسند کرا ئەو تەنیا جارێك سەرۆك کۆمار بووە، بۆیە پەسندی ئەم یاسا تایبەتییە بەم واتایە

(1) BBC Radio, Centrol Asian survey, 16 June 2000
(2) BBC Radio, Centrol Asian survey, 27 June 2000

نییە کە لە پۆستی سەرۆك کۆماری خۆی دەکشێتەوە؛ نەزەربایەف تەنانەت داوای لە دادگای یاسای بنەڕەتیش کرد کە لەم پێوندییەدا بەرگری لە ناوبراو بکات. [1]

لە ساڵی ۱۹۹۹ی زایینی هەڵبژاردنی پارلمانی قەزاقستان لە دوو قۆناخدا بەڕێوەچوو، لە قۆناخی یەکەم کە بەرابەر بوو لەگەڵ ۱۷ی سپتامبر، ئەندامانی پارلمانی سەنا هەڵبژێردران کە چل ئەندامیان بە شێوەی ناڕاستەخۆ لەلایەن ئەنجوومەنە بیاڤییەکانەوە و ۷ کەسی تریش لەلایەن سەرۆك کۆمار دیاریکران. لە دەی ئۆکتوبریش قۆناخی دووهەمی هەڵبژاردنەکان واتە هەڵبژاردنی پارلمانی نوێنەران بەڕێوە چوو. کە ۸ ملیۆن لە حەشیمەتی ۱٥ ملیونی قەزاقستان تێدا بەشداریان کرد، لەم هەڵبژاردنەدا ٥٤۸ کەس بەستراوە بە ۹ حیزبی جیاوازی وڵات خۆیان پاڵاوتبوو کەدەبوایە لەم رادەیە ۷۷ کەسی بۆ پارلمان هەڵبژێردرابان، ئەمە لە راستیدا یەکەمین هەڵبژاردنی ئازادو فرە حیزبی بوو لە قەزاقستاندا کە تێدا بەشداران بەستراویی خۆیان بۆ حیزبە جۆربەجۆرەکان رادەگەیاندو خەڵك دیانزانی بە چ کەسێك و بە چ مەبەستێك دەنگ بدەن. جیا لە حیزبی کۆنی کۆمۆنیست؛ حیزبە ناسراوەکانیتر کە بەشداریان کردبوو، بریتی بوون لە حیزبی ئووتان[2] (میهن) کە ئەندامەکانیان لە کەسانی پلە بەرزی سیاسی بوون، حیزبی کۆماری خواز کە رێبەرەکەیان لە بەشداری کردن بێبەش کران؛ حیزبی مەدەنی بستراوە بە سەرۆك کۆماری کە ۹ خاڵیان وەکو گەلاڵەی سیاسی و ئابووری خۆیان دیاری کردبوو، لەم نێوەدا حیزبی کۆمۆنیستی لایەنگری زیاتر بوونی دەسەڵاتی پارلمان و دابەزینی دەسەڵاتەکانی سەرۆك کۆماریش بوون. لە هەڵبژاردنی ئاماژە پێکراودا زۆرترین کورسییەکانی پارلمانی نوێنەران رێکخراو گەلی سیاسی بەستراوە بە سەرۆك کۆمار یەك لەوان حیزبی ئووتان بە خۆیان تەرخانکرد.[3]

## (۳ ـ ۱) یاسای بنەڕەتی

یەکەمین یاسای بنەڕەتی کۆماری قەزاقستان لە ۲۸ی ژانوییەی ساڵی ۱۹۹۳ زایینیدا پەسند کرا. یاسای بنەڕەتی نوێی ئەم کۆمارە لە ۲۹ی ئاگۆستی ۱۹۹٥ خرایە بەر راپرسی گشتییەوە کە

(۱) رۆژنامەی ئیتلاعات، ۱۳۷۹/٥/۱۹

(2) otan party

(۳) حیسام ئەدین ئیمامی، "قەزاقستان و ئەزموونی نوێی دێموکراسی"، رۆژنامەی عەسری ئازادەگان ۱۳٦۷/۷/۲۰.



پتر لە ۹۰٪ خەڵك دەنگی ئەرێنیان پێدا. بەپێی ماددەی یەکەمی ئەم یاسا بنەڕەتییە؛ قەزاقستان وڵاتێکی دێموکراتێك و خاوەنی دەسەڵاتێکی خەڵکی بە سیستمێکی سێکۆلار کە لە چوارچێوەی کۆماریدا خۆی نیشاندەدات. ماددەی چوارەمی یاسای بنەڕەتی مافی دەسەڵاتداری بە هی خەڵکی قەزاقستان دەزانێ و بە راشکاوی باسی ئەوە دەکات کە هیچ تاك یان دامەزراوێك ناتوانێ وەها مافێك لە ئەوان وەربگرێت؛ بەڵام بە نوێنەرایەتی لەلایەن خەڵکەوە تەنیا پارلمان و ناوەندی سەرۆك کۆماری دەرەتانی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتیان هەیە.

لە بەشی چوارمی یاسای بنچینەییشدا ماف و ئازادی هاوڵاتیان باسی لێوە کراوە، بۆ سەرجەم هاووڵاتیان بەرابەری تەواوی ماف و ئازادییەکانی تاك و کۆمەڵایەتی بێ لەبەرچاو گرتنی رەگەز، زمان و نەتەوەو ئایین و ئایینزاکانو بیروباوەڕە سیاسییەکان گەرانتی کراوە. لە چاو پێدا خشاندنێکدا، هاووڵاتیانی قەزاقستان مافی دیاریکردنی شوێنی نیشتەجێ بوون یان جێگۆڕکێیەی ئارەزوومەندانیان هەیە و بێبەش کردنی هاووڵاتیان لەم مافە بە پێشێل کردنی یاسا لە قەڵەم دەدرێت؛ بەڵام بەپێی یاسا، هاووڵاتیان لە مافی دووجار هاووڵاتی بوون بێبەشن، تەنیا کاتێك کە بەگوێرەی رێککەوتنی نێوان حکوومەتەکان ئەم کارە جێبەجێ بکرێت. بەڵام رووسیە لە ساڵانی دواییندا هەوڵێکی زۆری بۆ هاووڵاتیانی رووسی لە قەزاقستاندا کە مافی نیشتەجێ بوونیان لە وڵاتی قەزاقستان بەدەست بێنێت. ئازادی بەیانو قەڵەم، ئازادی پێکهێنانی رێکخراوە و حیزبە سیاسییەکان، ئازادی هەڵبژاردن پیشە، ئایین، ئایین زاکان و ئامانجە سیاسییەکان، مافی پێکهێنانی رێپێوانی ئاشتییانە و هێمن و پەیوەست بوون بە یەکێتییە کۆمەڵایەتییەکان، مافی مانگرتن و بەڕێوەبردنی رێپێوانو..... بۆ هاووڵاتیان لەبەر چاو گیراوە، هەڵبەتە ئەم ماف و ئازادییانە دەبێ لە چوارچێوەی یاسای بنەڕەتیدا بێت، هەروەها هاووڵاتیانی ئەم کۆمارە بە شێوەی راستەخۆ، یان لە رێگای بژار کردنی نوێنەرانی خۆیان مافی بەشداری لە بەڕێوەبردنی وڵاتیان هەیە.

لە بەشی پێنجەمی یاسای بنەڕەتیشدا بۆ تەواویی هاووڵاتیان مافی خاوەندارییەتی لەبەرچاو گیراوە؛ بەڵام لە کاتی کەڵك وەرگرتن نابێ ببێتە هۆی تێکدانی ئاسایش و نەزمی گشتی وڵات.

لەم بەشەدا گەشە سەندنی چالاکییەکانی تاك یەك لەوانە پەروەردەی تایبەتی سەرنجی زۆری پێدراوە لەم رووەوە ئەرکە لە سەر دەوڵەت کە کەرستەکانی پێویست بۆ ئەم بەشە دابینبکات.

بەشی هەشتەمی یاسای بنەڕەتیش هەموو خاوەنداریەتی لە سیستمی ئابووری لە وڵاتدا بە فەرمی ناسیووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، سەرچاوە سرووشتییەکان بە شێوەی گشتی لەبەر دەستی دەوڵەتدا دەبێ؛ لە ماددەی ٤٩ی ئەم بەشەشدا چالاکی ئابووری بۆ هەموو خەڵکانی بیانی بە فەرمی ناسراوە. ماددەی هەشتەمی یاسای بنەڕەتی، زمانی قەزاقەکان وەکو زمانی فەرمی وڵات ناساندووە؛ بەڵام لە ساڵانی دواییندا زمانی رووسیش لەلایەن حکوومەتی قەزاقستان بە فەرمی ناسراوە. بە سەرنجدان بەوەی کە قەزاقستان لەنێوان کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندیدا؛ ئاڵۆزترین و هەستیارترین پێکهاتەی ئەتنیکی هەیە؛ بە فەرمی ناسینی زمانی رووسی بێ فەلسەفە نەبوو. ئەم کارە نەك هەر پشتیوانی کەمینەی گەورەی بە رەچەڵەك رووسی ئەم وڵاتەی بە دوواوە بوو بەلکو بە وتەی بیرمەندان، قەزاقستان شوێنگەی کۆبوونەوەی پتر لەسەد ئەتنیك و نەتەوەیە کە لەم نێوەدا قەزاقەکان لە ناو هەموویاندا کەمینەن، ئەم پێکهاتە نانۆرمە ئەتنیکییە بۆتە هۆی ئەوە تاکو رەوتی سەربەخۆخوازی لەم وڵاتەدا لاواز بێت. ماددەیەکی‌تر کە لە یاسای سەرەکی وەبەرچاو دەکەوێت؛ پەیویستە بە سیستمی هەڵبژاردنی وڵات. لەم ماددەیەدا هەموو هاوڵاتیان مافی هەڵبژاردنی نوێنەرانی خۆیانیان هەیە. لە ماددەی ١١٧یشدا بەڕێوە چوونی هەڵبژردن لە قەزاقستانی ئازاد و راستەخۆ ئاشکرا راگەیاندووە، و رێکخراوو دامەزەراوە سیاسییەکانیش بە شێوەی یاسایی ناودێر دەکرێن. دەرەتانی بەشداری لە هەڵبژاردن جەختی لەسەر کراوە. لە بەشەکانی نۆزدە و بیستیی یاسای بنەڕەتی پرسە ماڵییەکان، بەرگری و یەکریزی خاکی وڵات ئەسپێردراوە بە هێزە چەکدارەکان؛ بەڵام لە ماددەی ١٢٦دا کەڵك وەرگرتن لەم هێزانە بۆ سەرکوت و بەرتەسك کرنەوەی ماف و ئازادییەکانی هاوڵاتیان لەم کۆمارە یاساغ راگەیاندووە.

هەروەها یاسای بنچینەیی قەزاقستان پێداگری لەسەر بنەمای سیستمێکی سیاسی‌و سێکولار دەکات؛ بە جۆرێك لە ماددەی ٥٨ی ئەم یاسایە، پێکهاتنی ناوەند و رێکخراوگەلی ئایینی ئازاد کراوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوانی لە دەستێوەردان لە کاروباریی دامەزراوە حکوومییەکان دوورخستنەوە؛ هەروەها لەم ماددەیەدا جەخت لە سەر ئەوە کراوە کە حکوومەت نابێ پشتیوانی لە ئایینەکی تایبەت بکات و رێکخراوە ئایینییەکانیش نابی ئامانجی سیاسی بگرنە بەر. بەم پێیە لە کۆماری قەزاقستان پێکهاتنی رێکخراوی سیاسی لەلایەن ناوەندە ئایینییەکان قەدەغە کراوەو تەنانەت سەرۆك کۆماری قەزاقستان ـ نوورسوڵتان



نەزەربایەف ـ کە خۆی بە سێکولار لەقەڵەم دەدات و لە پەیڤێکدا ئەڵێت "... . ئێمە ئەمانهەوێت دەوڵەتێکی دێموکرات بە ئابوورییەکی ئازاد دروستبکەین کە دژی بناژۆخوازی ئیسلامی بێ ..... لە وڵاتی ئێمە ئایین و ئایینزای جۆراوجۆر هەیە، بەڵام هیچکام لەوانە فەرمی نیین"[(١)].

گۆڕینی یاسای بنەڕەتیش بە پێی ماددەی ١٢٩ تەنیا بە بەدەستهێنانی دوو لە سێی (٢له٣)ی دەنگی نوێنەرانی شواری باڵا ئیمکانی دەبێت. بەڵام بۆ رێفۆرم لە یاسای بنەڕەتی پێویستی بە پتر لە ٣ی دەنگی نوێنەران هەیە و لە کۆتایدا ماددەی شەشەمی یاسای بنەڕەتی، دەسەڵاتی دەوڵەت لەنێوان سێ دەسەڵات واتە دەسەڵاتی یاسادانەر و بەڕێوەبەر و داد دابەش کراوە. کە هەرکام لەوانە بە شێوەی راستەخۆ کار دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا هاوکاری یەکتریش دەکەن. لەم نێوەدا سیستمێکیش بۆ پاراستنی هاوسەنگی هەیە؛ بەم شێوەیە یاسای بنەڕەتی قەزاقستان رێوشوێنی دابەشکردنی هێزی پەسند کردووە کە لە درێژەدا هەرکام لەم سێ دەسەڵاتە بە شێوەی جیاو کورت تاوتوێ یان دەکەین.

ئەلف) ـ دەسەڵاتی یاسادانەر: لە ماددەی ٦٢ی یاسای بنەڕەتیدا پەسندکراوییساڵی ١٩٩٣؛ شوورای باڵای قەزاقستان تەنیا ناوەندی یاسادانانی ئەم وڵاتە بە ئەژمار دەهات و دەسەڵاتێکی بەربڵاویشی پێدرابوو تاکو ئەم شوورایە بتوانێت بە بەجێ گەیاندنی رۆڵی چاودێری لە بەرانبەر دەسەڵاتی بەڕێوەبەردا کار بکات. بەڵام بەهۆی دەستکاری لەم یاسا بنەڕەتییەدا لە ٢٩ی ئاگۆستی ١٩٩٥؛ شوورای باڵای قەزاقستان هەڵوەشێندرایەوە و بە جێگای ئەو دوو پارلمانی (سەنا)و (نوێنەران) بە کۆی ١١٤ نوێنەر پێکهات. هەروەها لە یاسای نوێی بنەڕەتی، لە هێز و دەسەڵاتی پارلمانی سەناو نوێنەران کەم کرایەوە و بەجێی ئەوە هێزو دەسەڵاتێکی زیاتر بە سەرۆك کۆمار درا؛ واتە ناوەندی سەرۆك کۆماری لە سەرەوەی ناوەندەکانی حکوومەت یەك لەوان پارلمانە؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، نوێنەرانی شوورای باڵای قەزاقستان بە چوونە ناو پارلمان بە دوور نەبوون (واتە مافی ئەوەیان هەبوو ببن بە ئەندامی پارلمانیش) کە لە ماددەی ٦٩ی یاسای بنەڕەتی جەختی لەسەر کراوەتەوە. بەپێی یاسای بنەڕەتی قەزاقستان پارلمانی ئەم وڵاتە خاوەنی ئەرکی جۆربەجۆرە کە بەچاوترینیان بریتییە لە؛ ١) دانانی یاساو چاودێری بەسەر جێبەجێ کردنیاندا، ٢) جێبەجێ کردنی هەر جۆرە گوڕانێك، یان چاکسازی لە یاسای

(1) Fred vonder, , op. cit, p. 6."Islam and Energy in centrol Asia"

بنەڕەتیدا، ٣) ڕاگەیاندنی لێبوردنی گشتیو بەڕێوەبردنی ڕێفراندۆم و هەروەها بڕیاردان لە پێوەندی لەگەڵ ڕاگەیاندنی شەڕ یان ئاشتی، ٤) واژۆی گرێبەستگەلی نێونەتەوەیی و ئاشکرا کردنی سیستمی ماڵیو دراوی وڵات، ٥) پەسندی ئەندامانی کابینەی حکوومەت و نوێنەرانی قەزاقستان کە لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە پێشنیار دەکرێت؛ ٦) گۆڕینی سنوورەکانی وڵات لە ڕووی دەرەکی و ناوەوە، هەروەها شیکردنەوەی فەرمی هەموو یاساکانی وڵات؛ ٧) هەڵبژاردنی قازییەکانی دادگای باڵا، داداگای یاسای بنەڕەتی، ئاشکرا کردنی سەرۆکی بانکی نەتەوەییو دادگای گشتی وڵات.

ب) دەسەڵاتی بەڕێوەبەر: ئەم دەزگایە لە وڵاتی قەزاقستان خاوەنی زنجیرە شێوازێکی تایبەتییە لە سەرەوەی ئەم دەسەڵاتە سەرۆك کۆمار هەڵکەوتووە، پاشان کابینەی دەوڵەت، سەرۆك وەزیرو ئەندامی دیکە و ڕێکخراوگەلی ناوچەییو ئیدارە بیاڤییەکان تێدا هەڵکەوتوون لەم نێوەدا سەرۆك کۆمار لە ڕێگای هەڵبژاردنی گشتیو بۆ ماوەیەکی ٧ ساڵە هەڵدەبژێرێت، وکەس ناتوانێ لە دوو خول بۆ ئەم پۆستە خۆی بپاڵێوێ . ماددی ٧٧ی یاسای بنەڕەتیش پێداگری لە سەر ئەوە دەکا کە سەرۆك کۆمار ناتوانێ بەرپرسایەتی حکوومییەکانی دیکەی وەئەستۆبێت؛ هەروەها نابێ بەشداری لە یەکیەتییە گشتییەکان یان چالاکییە ئابوورییەکان بکات. لەماددەی ٨٠شدا سەرۆك کۆمار خاوەنی پارێزراویی سیاسییە و بە پێی ماددەی ٨٢ لابردنی سەرەك کۆمار تەنیا بە دوو سێهەمی (٢ـ٣)ی دەنگی نوێنەران ئیمکانی هەیە.

یاسای سەرەکی قەزاقستان دەسەڵاتێکی فراوانی بە ناوەندی سەرەك کۆماری داوە، هەتا ئەوجێگایەی کە سەرەك کۆماری ئەم وڵاتە حوکمی یاسایی هەیەو جێبەجێ کردنی پێویستە، تەنانەت بە شێوەی فەرمی سیستمی سیاسی قەزاقستان سەرۆکایەتی ڕاگەیاندراوە واتە لە سەرەوە بوونی سەرۆك کۆمار بەسەر ناوەندەکانی وڵات یەك لەوان دەسەڵاتی یاسادانەر. لە ٥ی مارسی ١٩٩٧ نوور سولتان نەزەر بایەف، سەرۆك کۆماری قەزاقستان، بە دەرکردنی بڕیارێك ئاڵو وێری چەندایەتیو چۆنایەتی بەرفراوانی لە دامەزراوە حکوومییەکاندا پێکهێنا. بەپێی ئەم بڕیارە سیستمی بەڕێوەبەری حکوومەت لە ٤٧ ئورگانی سەربەخۆی ئیداری کرا بە ٢٤ ئورگان، لە ٢١وەزاروتخانە کرابە ١٤ وەزارەتخانەو لە ١٣ کۆمیتەی دەوڵەتی بووبە ٧ کۆمیتە و هەروەها ڕادەی فەرمانبەرانیش کەم کرایەوە. بەپێی پەسند کراوەکانی ١٩٩٥، وەزارەتی دەرەوە بە شێوەی ڕاستەخۆ چووە ژێر کۆنترۆلی سەرۆك کۆمار، هەروەها ناوەندی ئەستراتیژیك و ناوەندی



پلان داڕێژی ئەستراتیژیکی قەزاقستان وەکو دوو ئۆرگانی دەوڵەتی چوونە ژێر کۆنترۆلی ڕاستەوخۆی سەرۆك کۆمار. بە دەرکردنی ئەم بڕیارە لە دەسەڵاتی سەرۆك وەزیران کەم کرایەوە. بە وتەی نەزەربایەف گۆڕانکاری جێبەجێ کراو لە دەسەڵاتی بەڕێوەبەری وڵاتدا بۆ باشتر بەڕێوەبردنی دامەزراوە حکوومییەکان و پێش گیری لە تێچوویەکان کە بەم چاکسازییە سیاسیو ئابووری دێتە گۆڕێ. بەپێی مادەی ٧٨ یاسای بنەڕەتی؛ گرینگترین ئەرکەکانی سەرۆك کۆمار دەتوانین بەم جۆرە باس بکەین؛ ١) بەجێ گەیاندنی یاسای بنەڕەتی و یاساکانی دیکەی وڵات؛ هەروەها واژووی پەسندکراوەکانی پارلمان، یان بە پێچەوانە گۆڕین و چاکسازی. جێگای باسە کە ئەگەر نوێنەرانی پارلمان بە زۆرینەی دوو لە سێی (٢ لە ٣) دەنگ سەرلەنوێ هەمان یاسای پێشوو پەسند بکەن سەرۆك کۆمار ئەرکە لەسەری کە واژۆی بکات ٢) پێشکەش کردنی پلانە حکوومییەکان، ئاشکرا کردنی سیستمی ماڵی وڵات. ٣) دەرکردنی بڕیاری لێبوردنی گشتیو چارەسەر کردنی پرسە یاساییەکانی هاووڵاتیان. ٤) دانی خەڵاتی نەتەوەیی و پلەو پایەی بەرزی سەربازیو دیپلوماتی ٥) فەرماندەی گشت هێزە چەکدارەکان و دیاریکردنی فەرماندەکانی دیکەی نیزامی ٦) واژۆی گرێبەستە نێونەتەوەیی یەکان ئاشکرا کردنی ڕێچکەی سیاسەتی دەرەوە ٧) پێکهێنانی شوورای ئەمنی، بەجێ گەیاندانی ڕاپرسی گشتی لە بارودۆخی نائاساییدا. ٨) دیاریکردنی سەرۆك وەزیران و ئەندامانی تری حکوومی، هەروەها هەڵبژاردنی سەرۆکی کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەیی و نوێنەرانی دیپلۆماتێکی قەزاقستان، هەڵبەتە ئەو دیاریکردنە، دەبێ نوێنەرانی پارلمان پەسندی بکەن ٩) ناساندنی پالێوراوانی سەرۆکایەتی بە قازی دادگای باڵا، دادگای یاسای بنەڕەتی، دادگای باڵای لێکولەرو داواکاری گشتی وڵات، هەروەها ناساندنی سەرۆکی بانکی نەتەوەیی بە پارلمان تاکو ئەوان لەلایەن نوێنەرانەوە دەنگی متمانەیان پێ بدرێت.

لە زنجیرە شێوازی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری کاری قەزاقستاندا، پاش سەرۆك کۆمار هەیئەتی وەزیران کە لە بەشی چوارەمی یاسای بنەڕەتیدا ئەرکەکانیان دیاریکراوە قسەی دووهەم دەکات. بەپێی یاسا، هەیئەتی وەزیران لە بەرانبەر سەرۆك کۆمار بەرپرسیارن و ئەوان مافیان هەیە بە شێوەی کۆمەڵ یان تاك لە کاتی پێویستدا دەست لەکارکێشانەوەی خۆیان پێشکەش بە سەرۆك کۆمار بکەن. هەروەها هەیئەتی وەزیران لە بەرانبەر پارلماندا بەرپرسیارن و نوێنەرانیان ئەو مافەیان هەیە کە داوای ڕوونکردنەوەیان لێ بکەن. لە بەشی پانزەی یاسای بنچینەیشدا

ڕێکخراوگەلی ناوچەیی و ئیدارە ویلایەتییەکان ـ چوارچێوەی دەسەڵاتیان دیاریکراوە. بە مەبەستی ئاسانکاری لە کاروباری ئیداری وڵات، قەزاقستان دابەشکراوە بە ٢١ بەش کە بریتییە لە ١٩ویلایەت ٢ شار؛ هەرکام لەم ویلایەتانە خاوەنی شوورایەکی هەڵبژێراون.

کاربەدەستانی ئەم ناوچەگەلە لە بەرانبەر سەرۆك کۆمار بەرپرسیارن و سەرۆك کۆمار دەست نیشانیان دەکاو لایشیان دەبا؛ هەڵبەتە ئەم لەسەرکار لابردنە و دانانە دەبێ ڕەزامەندی پارلمان شوورای نەتەوەیی، یان پارلمانە ناوچەییەکانی لەگەڵ بێت. هەر حکوومەتێکی ناوچەیی ئەرکی بەربڵاوی وەئەستۆیە؛ یەك لەوان چاودێری بەسەر بودجەی ناوچەکان، پێشکەش کردنی خزموتگۆزاری فێرکاری و کۆمەڵایەتی، پاراستنی پاك و خاوەنی و هێندێك ... . هتد.

جێگای ئاماژەیە کە بە گشتی پێکهاتەی سیاسی هەرکام لەکۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست (یەك لەوان قەزاقستان) بەم شێوەیە: پێکهاتەی سیاسی حکوومەت لە چوارچێوەی سیستمێکی کۆماریدا بریتییە لە ناوچەکان؛**شارەکان،** شارۆچکەکان، کۆماری خودموختار، لە کۆتاییدا گوندەکان؛ هەڵبەتە ئەم دابەش کردنانە لە هێندێك شوێن جیاوازە، بۆ نموونە لە کۆماری قرقیزستان و تورکمەنستان، پێکهاتووە لەکۆمارگەلی خودموختاری و لە هێندێك لەکۆمارەکان بەجێی ویلایەت خاوەنی دابەشکردنی سیاسی خوموختارییە.

ج) ـ دەسەڵاتی دادوەری: لە فەسڵی ١٦ی یاسای بنەڕەتیدا، ئەرك و ڕاسپاردەکانی ئەو دەسەڵاتە بەیانکراوە. بەپێی ماددەی ٩٥ی هەر ئەم بەشە، دەسەڵاتی دادوەری لە کۆماری قەزاقستان لە دادگاگەلی جۆراوجۆر پێکدێت کە بریتییە لە: دادگای باڵا، دادگای نێوبژیوانی باڵا، دادگای یاسای بنەڕەتی، دادگای باڵای لێکولەر، دادگای گشتیو دادگاکانی خوارتر لەم ئاستە، کەواتە بێجگە لە دادگاکانی ژێر چاودێری یاسای بنەڕەتی هیچ کەس یان ناوەندێك مافی کاری دادوەری نییە، لە بە ڕانبەری ئەم ماددەیە دادگای باڵاو دادگای ناوبژیوانی باڵا، بەرزترین ناوەندی دادوەری وڵاتن. لەبەشی هەڤدەهەمی یاسای بنەڕەتیدا پێداگری لە مەڕسەربەخۆیی کاری دادگای گشتی وڵات کراوە کە لەلایەن سەرۆك کۆمارو بە پەسندی نوێنەرانی پارلمان بۆ خولێکی پێنج ساڵە هەڵدەبژێرێت. دانانی دادوەر لە ماددەی ١٠١ پەسند کراوە و ماددەی ١٠٢یش پێداگری لە سەر ئەوە کردووە کە قازییەکان ناتوانن لە هەمان کاتدا پوستی دیکەی حکوومییان هەبێت، یان بە دوای ئامانجی سیاسی خۆیانەوە بن. بە شێوەی گشتی یاسای بنەڕەتی دەسەڵاتی دادوەری و دادگاکانی لە قەزاقستان بە مەبەستی بەڕێوەبردنی دادپەروەری، دابینکردنی ماف و ئازادی هاوڵاتیانپێك هاتووە.



**(١ـ٤) حیزبە سیاسییەکان**

**١ـ حیزبی سۆسیالیستی قەزاقستان[١]**

ئەم حیزبە لە پاییزی ١٩٩١ واتە پێش سەربەخۆبوونی قەزاقستان پێکهات کە خاوەنی ١٤٠٠ ڕێکخراوی ناوچەیی و ٦٥ هەزار ئەندامە. حیزبی سۆسیالیستی قەزاقستان جەخت لەسەر دادپەروەری کۆمەڵایەتی، بایەخە مرۆیەکان، یەکیەتیی نەتەوەیی و پەرەگرتنی ئابووری ئەم وڵاتە دەکات. هەروەها ئەم ڕێکخراوە، پشتیوانی لە کرێکاران و گرینگی بە دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ ڕێکخراوە نێونەتەوەییە سۆسیالیستەکان دەدا.

**٢ـ کۆنگرەی گەلی قەزاقستان[٢]**

لە کۆتایی دسامبری ١٩٩١ واتە ماوەیەکی کورت پاش سەربەخۆیی قەزاقستان دامەزرا کە لە لایەن ئەلجاس سولێمان ئۆف، شاعیرو نووسەرو لە سیما ناسراوە کولتوورییەکانی ئەم وڵاتە ڕێبەری دەکرێ. لەنێوان دامەزرێنەرانی ئەم حیزبە، کەسانێك وەکو ڕێبەرانی بزاڤی ناوکی "نەوادا ـ سەمی پالاتنیسك"و بزووتنەوەی ئابووری "ئاراڵ ـ قەزاقستان ـ ئاسیا" وەبەرچاو دەکەوێت. کۆنگرەی گەلی قەزاقستان ئەندامەکانی پتر لە سێ هەزار کەسەو لە هەڵبژاردەکانی پارلمانی ١٩٩٥یەك کورسیان بە دەست هێنا بەڵام بەربژاردەکانی ئەم حیزبە لە هەلبژاردنی پارلمانی ١٩٩٩ لە جووم سەرکەوتیان بە دەستنەهێنا. کۆنگرەی گەلی قەزاقستان خۆی وەکو نوێنەرانی هەموو گرووپە ئەتنیکییەکان لەم وڵاتە ناساندووە و لەگەڵ تەواوی گرووپە دێموکراتێکەکان پێوەندی هەیە. بۆ وێنە گەلاڵەنی ئەم ڕێکخراوە بریتی یە لە سەرنجدان بە ژینگە، چالاکی ئازادی ئابووریو یەك لەوان گەشەسەندنی دامەزراوە تایبەتییە بازرگانییەکان.[٣]

**٣ـ حیزبی کۆمارخوازی ئازات (ئازادی)**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٢ بە یەکگرتنی سێ حیزبی ناسیۆنالیستی بەرهەڵستکار بە ناوەکانی، "تەڤگەری ئازات"، "حیزبی کۆماریخواز"و "حیزبی دێموکراتێکی نەتەوەیی ژلتۆکسان" پێکهاتووە. یەکێك لە کەسایەتییە هەڵکەوتووەکانی ئەم حیزبە ئاقاجان خواجە گۆلدین، سەرۆکی حیزبی کۆماریخوازی قەزاقستانە. ناوبراو لە ساڵی ١٩٩٨ بە هۆی لە ژێر پێنانی یاسای ئەو وڵاتە، سکاڵای یاسایی لەسەر تۆمارکرابەڵام لە وڵات چووە دەرەوە. خواجە

(1) the socialist partyof kazakhston
(2) the peoples congressparty of kazakhston

(٣) ئەبولحەسەنی، قەزاقستان، لاپەڕەی ٤٣. ‌*مەکی ومنۆکی: مادی و معنوی

گۆلدین لە ١٢ی ژوئیەی ٢٠٠٠ی زایینی لەم رۆم، پێتەختی ئیتالیا بە تۆمەتی تیرۆریست بوون لەلایەن پۆلیسی ئینتەر پۆلەوە قۆڵبەست کرا.(١) نەزەر بایەف پشتیوانی لە چالاکی حیزبی کۆماریخوازو هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری و پارلمانی ١٩٩٩ کرد. ئەم حیزبە یەکێك لە ئاکتیڤترین حیزبە سیاسییەکانی قەزاقستانە کە نزیکەی دە هەزار ئەندامی هەیە. حیزبی کۆماریخوازی ئازات بە درێژایی تەمەنی خۆی پلانی جۆراو جۆری بووە، بۆ نموونە هەوڵدان بۆ رێفۆرم لە ستراکتۆری وڵات و هێنانە ئارای حکوومەتێکی سەربەخۆ و دیموکراتێك؛ بەرگری لە یەکیەتیی نەتەوەیی و پشتیوانی لە ئازادی تاك و کۆمەڵایەتییەکانی هاوڵاتیان، دژایەتی لەگەڵ چەکە میکرۆبیلۆژیکەکانو پێشگیری لەتاقی کاری ناوکی؛ هەوڵدان بۆ دامەزراندنی سوپایەکی نەتەوەیی سەربەخۆ؛ ئامادە کاری بۆ بوارگەلی مەکیو مەنۆکی* بە مەبەستی بەرەودان بە گەشەو تواناکانی وڵات، دابینکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتی بۆ وێنە کەڵك وەرگرتنی یەکسان لە سەرچاوە و سامانییە سرووشتییەکانی وڵات لەنێو سەرجەم ئەتنیکەکاندا.(٢)

٤ـ رێکخراویی یەکیەتیی خەڵکی قەزاقستان. نوور سوڵتان نەزەر بایەف لە ساڵی ١٩٩٤دا بە مەبەستی سەرکەوتن لە هەڵبژاردنی داهاتووو بۆ بەدەستهێنانی پێگەی باشتر لە گۆڕەپانی سیاسی، ئەم رێکخراوەیەی دامەزراند کە خاوەنی ئامانجی گەورەی سیاسی و ئابوورییە. پاشان ناوبراو حیزبی ئووتانی (وڵاتی باوك) لە تێکەڵکردنی حیزبی دیموکرات و یەکیەتیی خەڵك پێکهێنا. ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنی پارلمانی ١٩٩٥دا، حەوت کورسی لە پارلمانی بۆ خۆی مسۆگەرکرد و لە هەڵبژاردنی ١٩٩٩یشدا ٢٢ کورسی بەدەستهێنا. بەرچاوترین ئامانج و پلانەکانی رێکخراوی یەکیەتیی خەڵکی قەزاقستان بریتیی بوون لە: چاکسازی سیاسی لە وڵاتدا؛ لابردنی ئاستەنگەکانی بۆرکراتێك و هاوکاری لەگەڵ دامەزراوەکانی سەرۆك کۆماری بۆ باشتر بەرێوەبردنی وڵات؛ پشتیوانی لە مافی خانە نشینان؛ منداڵانی هەتیوو، خوێندکاران، هەروەها پشتگیری لە چاکسازی ئابووری و پێکهێنانی کەشێکی لەبار بۆ پەرەگرتنی کۆمەڵایەتیو... شیاوی باسە کە ئەم یەکێتییە، ناوەندگەراو دژی ناسیۆنالیزمی توندرۆ بە پێچەوانە لایەنگری هاوسەنگی رەگەزی و ئەتنیکییە لە قەزاقستان.(٣)

(1) BBC Radip, Central Asian survery, 14 July 2000

* مادی و مەعنەوی

(2) BBC Radip, Central Asian survery, 27 may 2000

(٣) ئەبولحەسەنی، پێشوو. ل ٤٤.



**٥ـ حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان**

چالاکی ئەم حیزبە لە ئاگۆستی ١٩٩١ قەدەغە راگەیاندرا، بەڵام سەرلەنوێ لە مارسی ١٩٩٤ بە هەوڵی ژمارەیەك لە کۆمۆنیستە وەفادارەکانی پێشوو دامەزرایەوە و ناودێر کرا. رێبەرانی ئەم حیزبە لە پاش دانی بڕیاری نوێنەرانی پارلمانی دوومای رووسیە، پشتیوانیان لە هەمبەر پێکهێنانەوەی سەر لە نوێی یەکیەتیی سۆڤییەت کرد و کارە دژ کردەوەی توندی دادگای باڵای قەزاقستانی بە دواوە بوو. لەم رووەوە داواکاری گشتی وڵات پێشنیاری بە وەزارەتی دادوەری کرد کە پێش بە درێژی چالاکی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان بگرێت؛ چونکە ئەم جۆرە چالاکییانە ناتەبایان لەگەڵ یاسای بنەڕەتیو یاساکانی تری وڵاتدا هەیە، تەنانەت لە بەشێك لە ئامانجی ئەم حیزبە پێداگری لە سەر پێکهێنانی سیستمێکی سۆسیالیستی و دامەزوراندنی سەر لەنوێی یەکیەتیی سۆڤییەت کراوە، ئەمە بە پێچەوانەی ناوەڕۆکی یاسای بنەڕەتی و یەکیەتیی خاکی قەزاقستانە. داواکاری گشتی وڵاتیش لەم بوارەدا ئاشکرای کرد کاتێك، مۆڵەتی سەرلەنوێ چالاکی دەدرێتەوە بە حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان، کە ئەساسنامەی خۆی لەسەر بنچینەی یاسای بنەڕەتی دابرێژێت. و لە ئەنجامدانی کاری بە پێچەوانەی یاسای وڵات دوورەپەرێزی بکات. پاش ئاڵوێڕی پێویست لە ئەساسنامەی ئەم حیزبە، درێژەی بە کارو چالاکی خۆیدا. رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان "سریك بۆلسین عەبدالرەحمان"ە کە لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری ١٩٩٩لە نەزەر بایەف شکستی خوارد، بەڵام ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنەکانی پارلمانی ١٩٩٥ دوو کورسی و لەهەڵبژاردنەکانی پارلمانی ساڵی ١٩٩٩ سێ کورسی پارلمانی بەدەستهێنا.(١)

**٦ـ حیزبی گەلی ـ هاوکاری قەزاقستان**

ئەم حیزبە لە ٢٠ی فێورییەی ١٩٩٥ لە وەزارەتی دادی قەزاقستان ناودێر کرا. پاشان لە نوزدە پارێزگای وڵاتدا لقی کردووە کە سەرجەم ١٢٣٣ لقی ناوچەیی لێکەوتەوە، رێبەری حیزبی گەلی ـ هاوکاری قەزاقستان نەزەر بایەفە، کە ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنی پارلمانی ١٩٩٥ کورسی و لە هەڵبژاردنی پارلمانی ١٩٩٩ پانزدە کورسی بەدەست هێنا. گرینگترین ئامانج و پلانەکانی ئەم حیزبە دەتوانین بەم جۆرە باسی بکەین: پشتیوانی لە وەرزێران و فەرمانبەران، تایبەتی کردنی خاوەندارێتی زەوییو هەوڵ بۆ باش کردنی بارودۆخی کارو ژیان لە گوندەکان؛

(1) http: llwww. A: lekolkazahastan

بەرز کردنەوەی ئاستی بژێویی ژیانی خەڵك و پشتیوانی کردن لە بواری سیاسییەوە؛ لایەنگری لە خاوەنداریەتی تایبەت و سیستمی ئازادی ئابووری؛ دژایەتی لەگەڵ سەرەڕۆیی سیاسیو گرینگیدان بە پێوەندی نێوان ئەتنیکەکان لە قەزاقستاندا.

**٧ـ حیزبی دێموکراتی عەزمەت (هاووڵاتی)ی قەزاقستان**

رادەی ئەندامەکانی ئەوحیزبە زۆر کەمە، وەك تاکە حیزبێکی دژبەر لە وڵاتدا ناسراوە. حیزبی ناوبراو لە ساڵی ١٩٩٦دا لەلایەن کۆمەڵێك لە بژاردەکانی کۆمەڵگای قەزاقستان وەکو بزاڤێکی دژبەر ناسێندراو لە ساڵی ١٩٩٩ وەك حیزبێکی سیاسی بە شێوەی فەرمی ناودێر کرا.

لە حیزبەکانی دیکەی ئەم وڵاتە "بزووتنەوەی سلاڤەکان"و "حیزبی مەدەنی قەزاقستان"ـە.

بزووتنەوەی سلاڤەکان لە ساڵی ١٩٩٢دا بنیاتنرا. دامەزراوەکی فەرهەنگی کۆمەڵایەتییە. کە بە مەبەستی چاکسازی لە کاروباری کەمینەی گەورەی بە رەچەڵەك رووسی لە قەزاقستاندا چالاکی دەکا. ئەم بزووتنەوەیە نزیکەی ٣٠ هەزار ئەندامی هەیە. حیزبی مەدەنی قەزاقستانیش بە رێبەری "ئازات تورلی بگویچێر ناشەف" چالاکی دەکا ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنی ١٩٩٥دا دوو کورسیولە هەڵبژاردنی ١٩٩٩یش سێزدە کورسی بەدەست هێنا. جیا لەوانەش، بزاڤی قەزاقە ناسیۆنالیستە توندئاژۆکان"و "گرووپە ناسیۆنالیستە رووسی یەکان"و هەروەها "حیزبی وەحدەت" لە حیزبە سیاسییەکانی وڵاتی قەزاقستانن.[1]

**٢ـ ئۆزبەکستان**

**(٢ـ ١) سیاسەت و حکوومەت لە رەوتی مێژوودا**

خاکی ئوزبەکستان لە رووی مێژووی و کولتوورییەوە رابردوویەکی زۆر کۆنی هەیە کە بۆ چەند هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. شوێنەواری وەك "رێگای هەورێشم" وشکارۆکانی تاشکەند، سەمەرقەندو بۆخارا... . زیاتر لە سێ هەزار ساڵ خزمەتی مێژوویان هەیە و لانکەی فەرهەنگ وشارستانییەت بوون. دواتر بیابانگەڕانی تورك، پێکهاتووە لە تورکە توورانییە مەغوولییەکان ناوچەگەلێکی گەورەی ئاسیای نێوەڕاستیان داگیر کرد و تێیدا ئیمپراتۆرییەکی گەورەی مەرداریان پێکهێنا تا ئەوەی کە لە نێوان سەدەی هەشتەم ئەو بەشە

(1) Sergei Diachenko “political parties of kasak hstan in the Eleciton context” Journal of social and political sxudies, no. 4, Winter 2000, PP. 12 – 19.



لە بیاڤی شارستانییەتی ئێران لە لایەن عەرەبە داگیرکەرەکان دەستی بەسەردا گیراو ئیسلام بەرەبەرە تێیدا پەرە دەگرت. کەواتە مێژووی پێکهاتنی وڵاتی ئۆزبەکستانی ئەمڕۆکە، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ئیسلام. ئەم وڵاتە مێژوویییە لە چاخی پازدەهەمدا دەکەوێتە ژێر دەستی ئۆزبەکەکان، بەڵام بەردەوام بە بەشێك لە شارستانییەتی ئێرانی ـ ئیسلامی بە ئەژمار هاتووەو هیچکاتێك ناوچەیەکی سەربەخۆ نەبووە. بە واتایەکی دیکە ئەم وڵاتە کەوتە بەر دەستی تورکە ئۆزبەکییەکان، بەڵام بە بەشێك لە ئیمپراتۆریی ئێران بە ئەژمار هاتووەو خەڵکی ئۆزبەك هیچ کات بە تەواویی خۆیان لە شارستانییەتی ئێرانی بە جیا لە قەڵەم نەداوە. هەڵبەتە لەم وتەیە نابێ بەو جۆرە هەڵێنجێنین کە بە درێژایی مێژوو ئۆزبەکەکان لەگەڵ نەتەوە ئێرانییەکان هیچ ناکۆکی و کێشەیان نەبووەو هەمیشە لە ئاشتی و یەکگرتوویيدا بوون.

بە جۆرێك بە دەرکەوتنی حکوومەتی سەفەوی و بەرەوی سەپاندنی باوەڕمەندیی ئایینی بەرەبەرە بوارگەلێکی بۆ جیایی ئاسیای ناوەندی لە ئیمپراتۆری ئێرانیدا پێکهێنا. بەڵام ئەم جیاییە یەکلاییکەرەوە تەواو نەبووە. تا ئەو کاتەی ئیمپراتۆریی رووسیە بیچمی گرت و لە رەوگەی جۆراوجۆرەوە ناوچەگەلی بەربڵاو لە ئاسیای ناڤینی لە ئێران جیا کردەوەو چەسپاندنی بە خۆیەوە. بەم شێوازە ئۆزبەکستان کرا بە بەشێك لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی رووسیەی تەزاری و پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئێراندا پچڕاند.

یەکەمین هێزە سۆسیالیستییەکان لە نوامبری ١٩١٧ هاتەنە نێو ئوزبەکستانو لە سەرەتایی ساڵی ١٩١٨ کۆماری خودموختاری سۆسیالیستی تورکستان پێکهات. بەڵام بەهۆی سەرنەکەوتنی سۆسیالیستەکان لە بەرانبەری سوپای سپی و هێزەکانی بریتانیا، هەروەها هێزە نەتەوەییەکاندا، ئەم کۆمارە نەیتوانی درێژە بە مانەوەی خۆی بدات. تا ئەوەی کە سۆسیالیستەکان ساڵێك دواتر شوێن و پێگەی خۆیان بەدەستهێنا و لە ناوچەکەدا باری نائاسایان راگەیاند. پاشان لە ساڵی ١٩٢٢ یەکیەتیی گەلانی سۆڤیەتییان دروستبوو و لە ٢٧ ئوکتۆبری ١٩٢٤یش ئۆزبەکستان بوو بە یەکێك لەو کۆمارەنەی کە تاکو ساڵی ١٩٢٩ کۆماری تاجیکستانیش بەشێك لەو پێکهاتەیە بوو. بەم پێیە کۆماری ئاماژە پێکراو لەژێر ناوی سۆسیالیستی ئۆزبەکستان نێویی لێ دەبرا و لە ساڵی ١٩٢٩دا بەهێز بوو ئەم کۆمارە تاکو پێش ساڵی ١٩٩١ بەشێك بوو لەو پانزدە وڵاتانەی یەکیەتیی سۆڤیەتی پێشوو لە ساڵی ١٩٩١ سەربەخۆیی خۆی بەدەستهێناوە و وەك وڵاتێکی سەربەست ناسراوە. لە سەردەمی تەزارەکان، ئاسیای ناوەڕاست، بەتایبەت کۆماری ئوزبەکستان بواری پیشەسازی بە شێوەیەکی ئەوتۆ

پەرەیی نەگرتبوو، بەڵام بە هاتنە سەرکاری سۆسیالیستەکان و بەتایبەت بە تێپەڕاندنی دوو پلانی ٥ ساڵەی پەرەسەندن واتە لەنێوان ساڵەکانی (١٩٢٨ـ١٩٣٣) و (١٩٣٣ـ ١٩٣٨) ئەم ناوچەیە لە رووی ئابووری و پیشەسازییەوە بە شێوەیەکی بەرچاو گەشەی سەند. لە راستیدا ئەم گەشە ئابوورییە زیاتر بەهۆی هاتنی کەسانێکی پسپۆر لەناوچە جیاجیاکانی سۆڤییەتەوە بۆ ئوزبەکستان بوو. بەم پلانانە گۆڕانکارییەکی گشتی لەناوچەکە، بەتایبەت لە پێوەندی لەگەڵ خوێندن پێکهات؛ بە جۆرێك تا کۆتایی ساڵی ١٩٣٣ نزیکەی ٥٢/٥ لەسەد رادەی خوێندەڤان لە وڵات بەرز بووەوە؛ ئەم رەوتە پێشەڤەچوونێکی مەزنی بۆ سیاسەتوانانی سێکولار لە ئوزبەکستان پێکهێنا؛ بە جۆرێك بەربەرەکانێ لە بەرانبەر ئایین و ئایینزاکان و بەریان بە لای سۆسیالیستی، سیاسەتی گۆشار بۆسەر کەسایەتییەکان و خوێندنگا ئیسلامییەکانو هەروەها داخستنی مزگەوتەکان و لێکۆلینەوە لە زانایانی ئایینی، ... . بەشێك بوون لەو کارانە کە بەهۆی گەشەی سیاسی و ئابووری بەڕێوە دەچوو. ئوزبەکستان لە رووی پیشەسازییەوە لە ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانیدا زۆر جێی بایەخ بوو هەڵبەتە پاش شەڕ بە شێوەیەکی نەریتی تەنیا وەکو دابینکەری لۆکە لە یەکیەتیی گەلانی سۆڤیەت بەئەژمار دەهات.(١)

لە دەیەی ١٩٨٠ واتە لە دەورانی هاتنە سەرکاری گۆرباچۆف بوارگەلی پتر بۆ رەخنە گرتن لە کارکردو سیاسەتی سەرکردەکانی سۆڤییەت لە ئوزبەکستان هاتە ئاراوە. لەم دەورانەدا پرسگەلی جۆراوجۆر و لەوانە هەژاریو پرسە ژینگەییەکان و لایەنە مێژووییەکانی دیکەی ئوزبەکستان سەرنجی پێدەدرا و رەخنەیان لێدەگیرا. بۆ وێنە لە پرسە ژینگەییەکان کە بایەخی پێدەدرا، مەسەلەی ئاودێری لە رادەبەدەری زەوییە جووتیارییەکانی ئوزبەکستان بۆ هەرچی زیاتر بەرهەمهێنانی لۆکە، دەبوو هۆی بێکەڵك و لاواز بوونی زەوی و لە هەمووی خراپتر وشك بوونی دەریای ئاراڵ کە رۆلێکی سەرەکی لە ئێکولۆژی ناوچەکەدا هەبوو، چونکە لە سەرەتایی دەییەی ١٩٨٠ رادەی ئاویی دوو رووباری ئامووەدریاو ـ یەك بەدوای یەکدا جێحون و سێحون، گەیشتبووە نزمترین رادەی خۆی کە پێکهێنەرانی دەریای ئاراڵ بوون. لە ساڵی ١٩٨٨ گرووپێك لە رووناکبیرانی تاشکەند بزووتنەوەیەکیان لە چوارچێوەی حیزبی بیریلیك (وەحدەت) لە ئوزبەکستان

(١) حبیبوڵڵا ئەبولحەسەنی شیرازی، نەتەوەکانی ئاسیای ناڤین (تاران: دەفتەری توێژینەوەی سیاسیو نێونەتەوەیی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ١٣٧٠) لاپەڕەکانی ٧٣ ـ ٦٥.



پێکهێنا کە نێوەڕۆکێکی دژی کۆمۆنیستی هەبوو و بە خێرایی لەگەڵ حیزبی دەسەڵاتدار بەسەر ئەم کۆمارە، واتە حیزبی کۆمۆنیست ناکۆکیان لێ دروستبوو.

ئەم تەڤگەرە لە راستیدا یەکەمین جووڵانەوەی سیاسی ناکۆمۆنیستی ئوزبەکستان بەئەژمار دێت کە تا رادەیەك مەیلی نەتەوەخوازانەی هەبوو. بە جۆرێك چارەسەر کردنی کێشە سەرەکییەکانی حیزبی بیریلیك یان یەکگرتووی ئوزبەکستان بوو. هەڵبەتە بەم حیزبە دژی کۆمۆنیستو نەتەوەخوازە ئیحتووباری یاساییان پێنەدەدا. لەئاکامدا دامەزرێنەرانی نەیانتوانی نوێنەریان لە پارلماندا هەبێت؛ بە جۆرێك لە هەڵبژاردنی ١٨ی فێوریەی ١٩٩٠ ئیزن بە چالاکی ئەندامی حیزبی یەکگرتوو (بیریلیك) لە ئوزبەکستان نەدرا، بەم جۆرە زۆربەی پاڵێوراوانی حیزبی کۆمۆنیست لەم کۆمارەدا بۆ بەدەستهێنانی ٥٠٠ کورسی پارلمانی باڵای بێ رکەبەر مانەوە. لەم هەڵبژاردنەدا ئیسلام کەریم ئۆف وەکو سەرۆکی حیزبی کۆمۆنیستی ئوزبەکستانو شوکروا... . میرسەعید ئۆف وەکو سەرۆکی کابینەی دەوڵەت هەڵبژێردرا. هەڵبەت ساڵێك دواتر ئیسلام کەریم ئۆف بووبە جێگری سەرۆك کۆماری ئوزبەکستان. بەڵام بەجۆرێك ئاکامی هەوڵ و تەقەلای حیزبی نەتەوەخواز و ناکۆمۆنیستی بیریلیك گەیشتە ئەو جێیە کە لە ئوکتۆبری هەمان ساڵدا زمانی ئوزبەکی وەك زمانی فەرمی ئیداری ئوزبەکستان پەسند کرا.(١)

## (٢ـ٢) وەرچەرخانە سیاسیەکانی هاوچەرخ

لە ئاوریلی ١٩٩١ ئوزبەکستان و هەشت کۆماری پێشوی سۆڤییەت رەزامەندی دەربڕی لە مەڕ واژۆی گرێبەستێك بۆ گۆڕینی پێکهاتەی تەناهی ئەم یەکیەتییە، بەڵام لە ١٩ ئاگوستی هەمان ساڵدا واتە رۆژێك پێش واژۆ کردنی گرێبەستی نوێ، کۆمیتەی ویلایەتی تایبەت بە ئاڵۆزی لە مسکۆ دەستی دایە کودەتا؛ کەریم ئۆف سەرۆك کۆماری ئەوکاتی ئوزبەکستان، لە بەرانبەر کودەتاچیان هیچ دژکردەوەیەکی لە خۆی نیشان نەداو تەنانەت کۆمەڵێك لە رێبەرانی باڵە بەرهەڵستکارەکانیشی بە شێوەی کاتی قۆڵبەست کرد.

بەڵام کاتێك کودەتا شکستی خوارد ناوبراو حیزبی کۆمۆنیستی ئوزبەکستانی هەڵوەشاوە راگەیاند و حیزبی دێموکراتیکی گەلیش ناچار کرا بە گۆڕینی ناوی کە لە لایەن کەریم ئۆفەوە

(1) Eastarn Europe, Russia and central Asia, (London: Europa publications Ltd, 2002), Pp. 485 – 490

سەرۆکایەتیی دەکراو بەم شێوەیە بوو کە لە یەکی سپتامبری ١٩٩١ سەربەخۆیی ئوزبەکستان لە یەکیەتیی گەلانی سۆڤییەت بە فەرمی ناسراو لە ڕێگای راپرسییەکی گشتییەوە لە ٢٩ی دسامبری هەمان ساڵ پەسند کرا. لە دسامبری ساڵی ١٩٩١یشدا هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری لەم وڵاتە بەڕێوە چوو کە ئیسلام کەریم ئۆف بە بەدەست هێنانی ٨٦ لەسەدی دەنگەکان پۆستی سەرۆك کۆماری بەدەست هێنا. تاکە رکەبەری کەریم ئۆف لەم هەڵبژاردنەدا شاعرێك بە ناوی محەممەد سالح ـ ڕێبەری حیزبی ئێرەك (ئازادی) بوو. کە ١٢ لە سەدی دەنگەکانی بەدەستهێنا. ڕۆژئاوا، سیاسەتەکان و رابردووی کەریم ئۆفیان لە پێوەندی لەگەڵ لە ژێرپێنانی بەهاکانی مافی مرۆڤ مەحکووم کرد؛ لە هەمان کاتیشدا پێوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ ئوزبەکستان درێژەی پێدەدا و ئەم وڵاتەیان وەکو پەرژینێك لە بەرانبەر ئیسلامی سیاسی وڵاتانی وەکو ئێران، عەرەبستانی سعوودی و پاکستان لە قەڵەم دەدا.

کەریم ئۆف بۆ پەرەپێدانی بوارگەلی ئابووری و کۆمەڵایەتی وڵاتەکەی حکوومەتی تورکیەی وەك نموونە هەڵبژاردو لە چاوپێکەوتنە جۆراوجۆرەکانیدا لەگەڵ سەرکردەکانی ئەم وڵاتەدا ئۆگری خۆی بۆ ئەم جۆرە سیستمە پێشان دەدا. تورکیە وەکو مۆدلی وڵاتێکی ئیسلامی ڕۆژئاوایی، هەروەها ئاڵا هەڵگری شوناسی تورکیو پان تورکیزم بەتایبەت بە سەرنجدان بە ڕۆڵی مێژوویی ناسیۆنالیستە تورکەکان لە راپەڕین بە دژی سەماچییەکان پێگەیەکی تایبەتی لە پێوەندییەکانی ئوزبەکستان بە دەستهێنا. بەم ڕێگا چارەیە؛ کەریم ئۆف دوای قۆرۆخ کردنی دەسەڵات گۆشار گەلێکی قورسی خستە سەر ئیسلامی گەراکان، تا ئەو جێگایەی کە لە لایەن ڕێکخراوی مافی مرۆڤەوە رەخنەی توند لەم سیاسەتەی کەریم ئۆف گیرا. بەم شێوەیە ئەم سیاسەتانەی کەریم ئۆف بوون بە ئاستەنگ لە هەمبەر جێبەجێ کردنی چاکسازی سیاسیو پەرەدان بە دێموکراسی لە ئوزبەکستاندا. ناوبراو بۆ ئەوەی کە پاساو بۆ کارەکانی بهێنێتەوە شەڕی نێوخۆیی تاجیکستانی وەکو هۆکاری پەرەگرتنی هەستی ئایینی و ئەتنیکی لە قەڵەم دەدا کە ئەم نموونەیە دەتوانێ لە تەواوی وڵاتانی ئاسیای ناڤین یەك لەوان ئوزبەکستان دووپات بێتەوە. بە بیانووی ئەوەی کە سێ کەس لە ڕێبەرانی حیزبە دژبەرەکانی ئەم وڵاتە کە لە کۆنفرانسی مافی مرۆڤ لە پێتەختی قرقیزستان بەشدارییان کردبوو؛ بە تاوانی تێکدانو خەیانەت لەلایەن پۆلیسی ئوزبەکستانەوە قولبەست کران. چالاکی ڕێکخراوە سیاسییەکان، بەتایبەتی ڕێکخراوگەلێك کە خاوەنی هەستی ئیسلامیخوازیان هەبوو، لەلایەن حکوومەتی



کەریم ئۆفەوە لەگەڵ بەرتەسکییەکی لە رادەبەدەر رووبەروو دەبوونەوە بە جۆرێك کە حیزبی وەحدەت یان بیرلیك، هەروەها حیزبی ئازادی یان ئێرلێکی ئوزبەکستان پێش بە چالاکییان گیراو تەواویی راگەیاندنەکانی ئەم وڵاتە کەوتنە ژێر چاودێری کۆمیتەی ناوچەیی، کە لەلایەن ئورگانە دەوڵەتییەکانەوە دیاری دەکران.

ئەم گۆشارانە هەتا نیوەی ساڵی ١٩٩٣دا درێژەی کێشا: سەرەڕای ئەوەی کە کەریم ئۆف لەمەڕ ئازادی حیزبە سیاسییەکاندا بەڵێنی دابوو، تەنیا حیزبی گەلی دێموکراتێکی ئوزبەکستان و ڕێکخراوەکانی گرێدراو بە حکوومەت وەك حیزبی زێدی باوکی (سرزمین پدری) ڕێیان پێدرا لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوودا بەشداری بکەن. بە جۆرێك لە هەڵبژاردنی دسامبری ١٩٢٤ حیزبی دەسەڵاتدار واتە حیزبی گەلی دێموکراتێك و هاوپەیمانانی ٢٥٠ کورسی پارلمانیان بەدەستهێنا، لەم نێوەدا حیزبی خەڵکی دێموکرات ٦٩ کورسیو حیزبی زێدی باوکیش لە کوێ ٢٥٠ کورسی ١٤ کورسیان بەدەست هێنا، ١٦٧ کورسی ماوە لەلایەن حیزبە سیاسییەکانی دیکەی بیاڤییەوە وەرگێران. کە لە راستیدا ١٢٠ کەسیان بە ئەندامی حیزبی گەلی دێموکراتێك بەئەژمار دەهاتن. بەپێی راپۆرتەکانی راگەیاندرا ٩٤٪ ئەو کەسانەی مەرجەکانی دەنگدانیان هەبوو بەشداریان لە هەڵبژاردندا کردبوو، ئیسلام کەریم ئۆف خوازیار ئەوەیە کە خۆی وەکو بەربەستێك لە بەرانبەر مەترسی ئیسلامییەکاندا بناسێنێت. بە جۆرێك لە رۆژی یەکەمی مانگی مای ١٩٩٨ی زایینی لە کاتی دەستپێکی دادگایی کردنی ئیسلامگەراکان لە شیویی فەرغانەی راگەیاند کە..... ئامادەیە لە کاتی پێویستدا خۆی گولە بەسەر ئیسلام خوازەکانەوە بنێت....[1] بەم شێوەیە شێوازی مامەڵە کردنی کەریم ئۆف لەگەڵ دژبەران زۆر توند ئاژووانەو بە دوور لە پەرەنسیپە دێموکراتێکەکان بووە؛ بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە سەرکوتی خۆپێشاندانی خوێندەڤانانی زانکۆ لە لایەن پۆلیس لە سەرەتایی ١٩٩٢دا بکەین کە ٣٠ کوژراوی بە دواوە بوو.

لە ژانوییەی ١٩٩٥دا کەریم ئۆف رایگەیاند کە حکوومەتەکەی ئامادەیە کە ئەندێشەی جیاواز لە پارلمان وەربگرێت و کەلکیان لێوەربگرێت؛ بەم جۆرە لە فێورییەی هەمان ساڵدا حیزبێکی سیاسی نوێ بە نێوی حیزبی سوسیال دێموکراتی عەداڵەت دامەزرا. ئەم حیزبە لە

(١) ماری جگوا، "ئاسیای ناڤین": لە توتالیتاریزمی سوسیالیستی هەتا خان سالاری، وەرگێڕانی حوسێن کازم پوور، گۆڤاری "ترجمان سیاسی" ساڵی چوارم، ژمارەی ١، ڕێبەندانی ١٣٧٧ لاپەڕەی ٢٩.

یەکەمین راگەیاندنی خۆیدا دامەزراندنی پارلمانێکی راستەقینەی کردە ئامانجی سەرەکی خۆی؛ هەروەها لە مانگی ژووئەنی ١٩٩٥دا دوو رێکخراویی سیاسی نوێ یەکیان بە ناوی "حیزب دمکراتیێك احیا گران ملی"و ئەوی دیکەیان "جنبش خلق متحد" کە هەر دوو پەیوەست بوون بە حکوومەت و بە شێوەی فەرمی دەست بەکار بوون. لە هەمان ساڵدا واتە ساڵی ١٩٩٥ چەند کەس لە ئەندامانی حیزبی ئازادی بە تاوانی کودەتاو چالاکی نایاسایی قۆڵبەستو رەوانەی گرتووخانە کران. هەروەها لە مانگی مارسی ١٩٩٥دا کەریم ئۆف لە رێگای بەڕێوەبردنی راپرسییەکی گشتییەوە خۆی وەك سەرۆك کۆماری نوێ بە سەر خەڵکدا سەپاندەوەو لەم راپرسییە گشتییەدا توانی بە بەدەستهێنانی ٩٩/٦ لە سەدی دەنگەکان ماوەی سەرۆك کۆماری خۆی لە ساڵی ١٩٩٦ تاکو ٢٠٠٠ درێژ بکاتەوە. کەریم ئۆف بە مەبەستی پتەو کردنی پێگەی خۆی لە ساڵی ١٩٩٦ حکوومەتێکی یەکگرتووی پێکهێنا بەڵام زۆریەك لە سلاڤییەکان کە لە کەمینەدا بوون لە پەرەگرتنی نەتەوەخوازی هەستیان بە مەترسی دەکرد.

لە سەردەمی سۆڤییەتی پێشوو ئیسلام کەریم ئۆف،[1] کەسایەتی ناسراوی سیاسیو نەتەوەخوازی ئۆزبەکستان، ماوەیەك سەرۆك وەزیری ئەم کۆمارە بوو. ناوبراو قۆناخەکانی حیزبی لە سەردەمی بێرژنێفدا تێپەڕاند. سەرەتا وەکو کەسی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست هەڵبژێرا، پاش گۆڕانکاری لە سیستمی گشتی واتە لە ٢٤ی مارسی ١٩٩٠ پۆستی سەرۆك کۆماری ئۆزبەکستانی بەدەستهێنا.[2] ئیسلام کەریم ئۆف لە ساڵی ١٩٩٦دا بۆ کەمکردنی نارەزایەتییەکان، لە رێگای حیزبی دێموکراتی ئۆزبەکستانەوە پێشنیاری بە پارلمانی باڵای ئەم وڵاتە کرد هەتا ئەو رێکخراوانەی کە لەسەر بنەمای ئایین و نەتەوە پێکهاتوون پێش بە چالاکیان بگیرێ و هەموو حیزبەکانیش پابەندبن بەوەی کە لانیکەم خاوەنی ٥٠٠٠ ئەندام لە ٨ ناوچەی وڵاتدا بن هەروەها ئیزنی بە بڵاو کردنەوەی رۆژنامەو بەشداری کردن لە هەڵبژادرنەکان، بە هەموو هاووڵاتیانی وڵاتەکەی دا.

---

(١) ئیسلام عەبدوقانویچ کەریم ئۆف لە ٣٠ ژانوییە ١٩٣٨دا لە سەمەرقەند لە دایك بووە بڕوانامەی دوکترای لە زانستی ئابووریدا هەیە. لە ساڵی ١٩٨٣ کەریم ئۆف وەکوو وەزیری دارایی ئۆزبەکستان هەڵبژێردرا لە ژووئەنی ١٩٨٩دا کەریم ئۆف وەکوو سەرۆك کۆماری ئۆزبەکستان هەڵبژێرا پێشتر وەکوو سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئۆزبەکستان دیاری بکرێت.

(2) The EIU, The country Report: Tajikistan political structure, (London: the EIU, Press 1993), p. 14.



لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٧ جێگیری فەرمانداری نەمەنگان تیرور کراو٤ ئەفسەریش لە تێکهەڵچوونێك کە لە رۆژهەڵاتی ئۆزبەکستاندا هاتە ئاراوە، کوژران. حکوومەتیش لەم پێوەندییەدا کۆمەڵێك لە ئیسلامخوازانی بەستراوە بە گرووپگەلی وەهابی قوڵبەست کرد، بە گوێرەی راپۆرتە نافەرمییەکان، ئەم تیرۆرانینە پێوەندیی بە مامەڵە کردنی ماددە سڕکەرەکانەوە بووە، بۆیە ئەم کارە بیانوویەك بوو بۆ حکوومەت هەتا لەم رێگایەوە بزاوتە ئیسلامییەکان لەناوچەکەدا سەرکوت بکات. بەربەرەکانی حکوومەت لە بەرانبەر گرووپە ئیسلامییەکاندا تاکو ساڵی ١٩٩٨ز بەردەوام درێژەی هەبوو هەتا ئەوەی کە لە فێورییەی ساڵی ١٩٩٨دا وەزیری دەرەوەی ئۆزبەکستان داوای لە پاکستان کرد تاکو دەست لە پشتیوانی کردن لە گرووپە ئیسلامییەکان و راهێنانی ملیشیاکان هەڵبگرێت. حکوومەتی پاکستانیش بێ ئاگایی خۆی لەم کارانە دەردەبڕی. لەم پێوەندییەدا حکوومەتی کەریم ئۆف لە مانگی مای ١٩٩٩دا یاسایەکی بە پارلمان پەسند کرد کە هەر جۆرە چالاکی حیزب و جووڵانەوە ئایینی یەکان، بەتایبەتی وەهابییەکان بە مەترسییەك بۆسەر ئاشتیو تەناهی ئۆزبەکستان لەقەڵەم درا، تا ئەو جێی کریم ئۆف بە پارڵمانی راگەیاند کە ئامادەیە تەواوی ئەندامانی گرووپە بناژۆخوازە ئیسلامییەکان، خۆی ئیعدامیان بکات. لە مانگەکانی مای و جووڵای دادگا بڕیاری قوڵبەست کردنی هێندێك لە خەڵکانی جێگای گومانی ئیسلامی خوازی دەرکرد و یەکیانی بە تاوانی کوشتنی ٥ کەسو مەشق پێکردنی نیزامی بە وەهابییەکان لە ئەفغانستان مەحکووم بە مەرگ کرا. رێکخراویی مافی مرۆڤ لە ئۆزبەکستان رایگەیاند کە دەوڵەتی کەریم ئۆف تێدەکۆشێ کەشێکی ترسو توقاندن لەنێو گرووپگەلی ئایینی پێك بێنێت تاکو لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریو لە خولی چوارمی پارلمانی نەبنە تەگەرە بۆیی.

لە ژانوییەی ١٩٩٩دا لە دادگایەکی ئۆزبەکستان پێنچ کەس لە هەڵسوراونی وەهابی بە تۆمەتی هاوکاری لەگەڵ ئیمامی مزگەوتی تاشکەند هەوڵدان بۆ رووخاندنی حکوومەت، تاوانبار کران. کەچی رێکخراویی مافی مرۆڤ ئەم تۆمەتانەی بێ بناغە لەقەڵەم دا. لە ناوەراستی مانگی فێورییەی ١٩٩٩ لە تاشکەند زنجیرەیەك تەقینەوە روویدا کە نزیکەی ١٥کەس کوژراوی بە دواوە بوو. حکوومەتی ئۆزبەکستان رایگەیاند کە ئامانج لەم بومب دانانەوەیە تیرۆری ئیسلام کەریم ئۆف بووە. لەم راستایەدا حکوومەت یاساگەلێکی چڕوپڕتری دژی جیاخوازانی، توندرۆی ئایینی و بناژۆخواز هێنایە ئاراوە. بە جۆرێك

٢٢كەس بە مەرگ و كۆمەڵێكی دیكە بە زیندانی درێژ ماوە حوكم دران. لەنیوەی مانگی ئاگۆستی هەمان ساڵدا ٦كەس لە ئەندامی حیزبی ئیریك یان ئازادی ئوزبەكستان بە دانانی بومب تاوانبار كران كە دوو كەس لەوانە برای محەممەد ساڵح ـ رێبەری حیزبی ئاماژە پێكراو بوون. كەریم ئۆف پشتیوانی لە رووسیە لە مەڕ شەڕی جیاخوازانەی چیچان دەكرد؛ چونكە زۆرینەی چیچانییەكان موسڵمان بوون و خەباتەكەیان رەنگ و بۆی ئایینی بە خۆوە گرتبوو. كۆشكی كرملین رایگەیاند كە كەریم ئۆف و وەلادیمیر پۆتین سەرۆك كۆماری رووسیە، كۆمەڵێك وتوێژیان لە پێوەندی لەگەڵ هاوكاریو شەڕی دوولایەنە بە دژی تیرۆریزمی نێونەتەوەیی كردووە. رەنگە هەر بەم هۆیە بوو كە لەنیوەی نوامبری ١٩٩٩دا ناوچەی تاشكەند پێتەختی ئوزبەكستان پێنجسەد كەس بەنیشانە نارەزایەتی خۆپێشاندانیان بە رێوە برد كە لەنێو ئەوانەدا كۆمەلێك چیچانی بەرچاو دەكەوت. لە كۆتایی ئەم بەزمە راگەیندرا كە ژمارەیەك لەو كەسانەی كە لەلایەن هێزە ئەمنییەكانەوە كوژراون لە راستیدا ئەندامی جیاخوازی كۆماری چیچانی بوون كە لە رێگای قەزاقستانەوە هاتبوونە خاكی ئەم وڵاتەوە. لە ماوەی ئەم رووداوانە كەریم ئۆف رایگەیاند كە بۆ پێوەست بوون بە یەكیەتیی ئەوروپا دەبێت رێوشوێنی چڕوپڕتر لە بەرانبەر تیرۆریزمدا بگرینە پێش.

لە هەڵبژاردنی پارلمانی باڵای ئوزبەكستان كە لە نێوان پێنج هەتا نۆزدەی دسامبری ساڵی ١٩٩٩دا بەڕێوە چوو؛ حیزبی گەلی دێموكراتی ئەم وڵاتە رایگەیاند كە ٤٨ كورسی لە پارلمان باڵای بەدەستهێناوە هەر كام لەو رێكخراوە رادیكاڵە بیاڤیانە نەیانتوانی زیاتر لە یەك كورسی زیاتر بەدەستبێنێن. حیزبی ناسیونالیستی (فیدوكولار) بە بەدەستهێنانی ٣٤ كورسی و حیزبی زێدی باوكی (سەزمین پدری) ٢٠ كورسی؛ حیزبی سوسیال دێموكراتی عەداڵەت ١١ كورسیو حیزبی ناسیونالیستی ( تێكلانیش )١٠ كورسیان بەدەستهێنا كە بەسەر یەكەوە ١٨٤ كورسی لە كۆی ٢٥٠ كورسی نوێنەرانی پارلمانی باڵا لە یەكەمین خولی هەڵبژاردن چوونە ناو پارلمانەوە. دواتر لە پێنجی دسامبر خولی دووهەمی هەڵبژاردن بەڕێوەچوو كە لە كۆتاییدا حیزبەكانی ئاماژە توانیان ئەو كورسیانەش بەدەستبێنن. رادەی ئەو دەنگدەرانەی كە مەرجەكانی دەنگەكانیان هەبوو لە خولی یەكەمی ئەم هەڵبژاردنە ٩٣/٥ لەسەد راگەیەندرا. لەم هەڵبژاردنە تەواوی باڵەكان پشتیوانیان لە حكومەت كردو دەرەتانی چالاكیان بە گرووپە بەرهەڵستكارەكان نەدا.



هەڵبژاردنی سەرۆك كۆماریش لە ٩ی ژانوییەی ٢٠٠٠ی زایینی بەڕێوە چوو كە لەم هەڵبژاردنەدا ئیسلام كەریم ئۆف لە حیزبی "فیدوكورلا"[١]، هەروەها "عەبدولحەفیفی جەلال ئۆف"[٢] سكرتێری حیزبی دێموكراتیكی گەلی ئوزبەكستان ركەبەرایەتیان دەكرد. لەم نێوەدا ئیسلام كەریم ئۆف ٩١/٩ لە سەدەی دەنگەكانی بەدەستهێنا و سەركەوتنی بە دەستهێنا و جەلال ئۆفیش تەنیا توانی ٤/١٧ لە سەدی دەنگەكان بەدەست بێنێت. هەڵبەت پێشتر سەرچاوەیەكی ئاگادار سەركەوتنی سەرلەنۆیی كەریم ئۆفی بە زۆرینەی دەنگەكان شیمانە كردبووو گوتبوویان كاربەدەستانی ئوزبەكستان پرفیسۆر جەلال ئۆفیان تەنیا لەبەر دێموكراتێك پێشاندانی هەڵبژاردنەكە دەرفەتی بەشدارییان پێ دابوو. ١٢١ چاودێری نێونەتەوەیی چاودێریان بەسەر ئەم هەڵبژاردنەدا دەكرد[٣]. بە گوێرەی راپۆرتەكان ٩٥٪ كەسانی خاوەن مەرج بۆ دەنگەكان چوونە پێش سنووقی دەنگەدانەوە، هەر بۆیە رێكخراوی هاوكاریو تەناهی لە ئەوروپا، هەروەها حكوومەتی ویلایەتە یەكگرتووەكان بە چاوەی گۆماناوییەوە دەیانروانییە ئەم هەڵبژاردنەو بە نادێموكراتیكیان لەقەڵەم دا، كەریم ئۆف رۆژێك پێش هەڵبژاردنی سەرۆك كۆماری بڕیاری و دوورخستنەوەی شێخ سادق، رێبەری ئایینی ئوزبەكستانی دەركرد تاكو بەم شێوەیە وا بنوێنێت كە لەگەڵ گرووپە ئیسلامگەراكاندا رێككەوتوون. ئەمە لەكاتێكدا بوو كە ئیزنی بە حیزبە دژبەركان نەدا كە بۆ هەڵبژاردنەكان چالاكی بكەن .

لە مانگی دسامبری ٢٠٠٠ی زایینی یوری ئاگزامۆف، وەزیری بەرگری ئوزبەكستان لەسەر كار لابراو بە جێگای ئەو قەدیر غولام ئۆف هاتە سەركار، هەروەها ژمارەكی ترلە وەزیرانی كابینەی حكوومەت ئاڵو وێریان پێ كرا. لە مانگی ئوكتۆبری ساڵی ٢٠٠٠ی زایینییدا دادگای ئوزبەكستان بۆ پێراگەیشتن بە تاوانی دوانزە كەس لە تۆمەتبارانی بومب دانانەوە لە ساڵی ١٩٩٩ دەست بەكار بوو لە كۆتاییدا بەپێی بڕیاری دادگا لە مانگی نوامبری هەمان ساڵدا "تەخیر یوادو شۆف" رێبەری ئایینی تەڤگەری ئیسلامی ئوزبەكستان، هەروەها بەر پرسی باڵی سەربازی "جووم بووی خۆجیف"، ناسراو بە (جومعە نەمنەگانی) بە مەرگ مەحكووم كران. بەپێی هەمان بڕیاری دەركراو، دە تاوانباری دیكە لەوانە جوملە محەممەد

(1) the Fidokorlar party
(2) Abdulkfizjulolov.
(3) Vitaly naumkin, the Elrction of the president of Republic of Uzbekistan was conducted line with Internationol Norms" 11 januavy, Pp. 1. 2

سەلیم، ڕێبەری حیزبی ئازادی (ایرك)ی ئوزبەكستان بە ١٢ تاكو ٢٠ساڵ زیندانی مەحكووم كرا. هەروەها لە ژووئەنی ساڵی ٢٠٠١ی میلادی پتر لە ١٠ كەس لە خەباتگێرانی ئیسلامی بە تاوانی هەوڵدان بۆ ڕووخانی حكوومەت زیندانی كران. لە سەرەتایی دسامبری ٢٠٠١یش محەممەد سەلیم لەلایەن دادگاوە بێ تاوان ناسرا و ئازاد كرا، هەروەها لە كۆتایی ئاگۆستی هەمان ساڵدا ٢٥٠٠ كەس لە بەندكراوەكان بە هۆی دەیەمین ساڵوەگەری سەربەخۆیی ئوزبەكستان ئازاد كران. حكوومەتی ئوزبەكستان گوشارێكی بەربڵاویی خستە سەر كەمایەتیی فارس زمانەكانی وڵاتەكەی؛ بە جۆرێك وەزیری پەروەردەی ئوزبەكستان بڕیاری لابردن و كۆكردنەوەی كتێب و بڵاڨۆكە تاجیكەكانی لە سەرانسەری وڵات دەركرد. شیاوی باس كردنە كە لە دوو شاری گەورەی سەمەرقەند و بۆخارا كە بەشێكن لە خاكی ئوزبەكستان بە زمانی فارسیو تاجیكی دەدوێن و لە ڕووی كولتوور و شارستانییەوە خۆیان بە ئێرانی لەقەڵەم دەدەن تاجیكەكانی وڵاتی ئوزبەكستان خوازیاری زیندووراگرتن وگەشەدان بە كولتوورو شارستانییەتی ئێرانی لەم وڵاتەدان. تەنانەت لە سەردەمی سۆڤییەتی پێشووشدا بۆ فێر بوونی زمانی فارسی كتێبی فارسی لەوێدا وەك وانە دەگوترایەوە. تاجكیەكانی ئوزبەكستان لە ساڵی ١٩٩١دا ڕێكخراوێكی سیاسی و نافەرمیان بە ناوی"سغدیانا" (دەنگی تاجیك) بۆ چالاكییە كولتوورییەكانیان پێكهێناو ناوەندێكی كولتووریشان بۆ تاجیكەكان و فارس زمانەكان دامەزراند. تەنانەت ئوزبەكییەكان لەگەڵ بوونی جیاوازی زمانی؛ هاوپێوەندی خۆیان لەگەڵ فارسەكان زیاتر لە هەر ئەتنیكەكی دیكە لە ئاسیای نێوەڕاست لێكدەدایەوە.

ڕووداوی ١١ی سپتامبر لە ئەمریكا، بیانوویەك بوو بۆ كەریم ئۆف هەتا زیاتر گوشار بۆسەر گرووپە ئیسلامییەكان بهێنێت. بە جۆرێك لەم سەردەمەدا ئازادی چاپەمەنی بەرتەسكتر بوو و ڕێكخراوگەلێك وەكو حیزبی تەحریری ئیسلامی، كە ئامانجیان دامەزراندنی حكوومەتێكی ئیسلامی بوو لە ڕێگای ئاشتیانەوە، پێش بە چالاكیان گیرا. نزیك بە ٥ هەتا ٧ هەزار لە ئەندامانی جووڵانەوەی ئیسلامی ئوزبەكستان چالاكیان بۆ تاڵبان دەركرد. بەڵام لە ٤ی مارسی ٢٠٠٢ی زایینی حكوومەتی ئوزبەكستان ئیزنی بە یەكەمین هەیئەتی بەرگری لە مافی مرۆڤی لەم وڵاتە دا. كۆمەڵێك لە چاودێرانی سیاسی ئەم كردەوەی حكوومەتی كەریم ئۆفیان بۆ ڕەخساندنی بوار بۆ دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ ئەمریكاو ڕێكخراویی مافی مرۆڤ لێكدایەوە. بەڵام چاودێرانی مافی مرۆڤ ئاشكرایان كرد كە حكوومەتی كەریم ئۆف بۆ



سەركوتی بەرهەڵستكارن، ژن ومناڵی بەرهەڵستكاران قۆڵبەست و پاشان ئازاریان دەدا. ئوزبەكستان پێش داڕمانی یەكیەتیی سۆڤییەت، گەلێك تێكهەڵچوونی ئەتنیكی تێدا هاتە ئاراوە. بۆ وێنە؛ لە ساڵی ١٩٨٩دا لەنێوان ئوزبەكەكان و توركەكانی مەشكانی ئەم وڵاتە شەڕو پێكدادانی خوێناوی ڕوویدا كە نزیكەی ١٦٠ كەس لە هەر دوولا كوژران، كە زۆربەی كوژراوەكان لە توركەكانی مەشكانی بوون. ئەم تێكهەڵچوونە لە نزیك سنوورەكانی قرقیزستان ڕوویدا و بەم شێوەیە بووە هۆی گرژی و ئاڵۆزی لە نێوان پێوەندییەكانی هەر دوو وڵاتدا؛ تا ئەو جێگایەی سەرۆك كۆماری ئوزبەكستان لەم ناوچەیەدا باری نائاسایی (نیزامی) ڕاگەیاندو درێژەی بە مین چاندن لەم سنوورانەدا. بەم شێوەیە قرقیزستان سەرپێچی لە واژۆ كردنی ڕێكەوتنامەی نیزامی كرد؛ ئەم گرژییانە تاكو ئاوریلی هەمان ساڵ لەنێوان هەر دوو وڵاتدا بەتایبەت لەناوچەی سوخ و بارووك درێژەی كێشا.

لە ئاوریلی ساڵی ٢٠٠١ی زایینیدا لە ڕونیشتێك لەنێوان ڕێبەرانی وڵاتانی تورك زمانی ئازربایجان و توركیە، قەزاقستان و كۆماری قەرقیزستان، توركمەنستان، ئوزبەكستان ڕێكەوتنامەگەلێك لەپێناو دژایەتی لەگەڵ تیرۆریزم و قاچاخی ماددەسڕكەرەكان و هەروەها بۆ نوێكردنەوەی ڕێگای هەورێشم واژۆ كران. لەگەڵ ئەویشدا ئەم كۆمارانە لە هەوڵی پێكهێنانی كومیتەیەك بۆ چاو پێخشاندن بەسەر ڕەوشی ژینگەی ناوچەكەدا بوون، لەوانە نوێژنكردنەوەی ڕووباری ئاراڵ و گرینگی دان بە پاك و خاوەنی و تندروسی، هەروەها لە نوامبری ٢٠٠١ی زایینیدا ئوزبەكستان و قەزاقستان هێڵی سنووری خۆیان دیاری كردووو لەم بوارەدا پەیماننامەیەكیان واژۆ كرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئاریشە سنوورییەكان لەنێوان دوو وڵات سەرلەنوێ پەرەی گرت؛ بۆ وێنە لە ساڵی ٢٠٠٢ی زایینیدا لە دوو ئاوایی Baggsو Turkestants كۆمەڵێك تێكهەڵچوون هاتە ئاراوە، كە كاریگەری لە سەر ئاڵۆز كردنی پێوەندییە سنوورییەكانی هەر دوو وڵاتدا هەبوو. دانیشتوانی ئەم دوو ئاواییە لەژێر دەسەڵاتی ئوزبەكستاندا بوون بۆیە پێش سەربەخۆیی قەزاقستان دەبوایە بگەرابایەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی ئەم وڵاتە. بەڵام ئوزبەكەكان لەم كارە سەرپێچیان كرد و قەزاقستانیش بۆ پێشگیری لە تێكهەڵچوون، بە دوای چارە سەركردنی ئەم مەسەلەیەوە بوو، بەڵام خەڵكی ئەم دوو گوندە كۆماری قەزاقی "Baggs"یان ڕاگەیاند بۆ خۆیان سەرۆك كۆماریان هەڵبژارد تا ئەوەی كە

ئوزبەکەکان بەگرتنە پێشی هەڵسوکەوتی توندوتیژانەو راگەیاندنی باری نائاسایی لەم هەرێمەدا کۆتاییان بە کۆمارە بچووکە هێنا.[1]

ئوزبەکستان لە شەڕی نێوخۆیی تاجیکستاندا یارمەتی ئەم وڵاتەیدا لە مەڕ سەرکوتی ئیسلامخوازەکان. بە جۆرێك کەریم ئۆف داوای لە حکوومەتی تاجیکستان کرد لەگەڵ شەڕخوازە ئیسلامییەکان بە هیچ جۆرێك رێك نەکەوێت و لە ئاکامدا کۆمەڵێك گرووپی تاجیکی بە تەواوەتی لە پرۆسەی ئاشتەوایی وەلانران. لە ساڵی ۲۰۰۰ی زایینیدا دەستەیەك لە ئیسلامخوازانی تاجیکی دەستیان دایە چالاکی نیزامی دژی هێزەکانی حکوومەت. ئەوزبەکستان بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەم شەڕخوازانە کە گەیشتبوونە ۱۰۰ کیلۆمتری تاشکەند؛ بەهاوکاری تاجیکستان لە سەر سنووره هاوبەشەکاندا دەستیان بە چاندنی مین کرد تاکو پێش بە هاتنییان بگرن؛ نەك هەر ئەوە بەلکو لە مارسی ۲۰۰۱یشدا کاربەدەستانی ئوزبەکی ژمارەیەك لە هاووڵاتیانی تاجیکی کە لە کاتی شەڕە ناوخۆییەکاندا لە سنوور دەرباز ببوون بۆ وڵاتی خۆیان دیپۆرتیانی کردنەوە. ئەمە لەکاتێکدا بوو کە ئوزبەکستان لە ساڵی ۱۹۹۸دا راگەیاندبوو کە لە کێشە نێوخۆییەکانی تاجێکستاندا هیچ دەستێوەردانێك ناکا. و هەروەها بێلایەنی خۆی رادەگرێت. تەنانەت ئوزبەکستان لە ساڵی ۱۹۹۹دا رایگەیاند کە لە پەیمانی ئەمنییەتی cis دێتە دەرەوە تاکو بەم شێوەیە دژایەتی خۆی لەگەڵ بوونی رووسیە لە تاجیکستاندا رابگەیەنێت.

ئوزبەکستان لە پێکدادان و شەڕە نێوخۆییەکانی دراوسێی باشووری خۆی واتە ئەفغانستان بەردەوام نیگەرانی خۆی دەردەبڕێ و لەم نێوەشدا پشتگیری لە ژنراڵ رەشید دوستوم دەکرد کە کونترۆڵی بەشێکی زۆر لە باکووری ئەفغانستانی بە دەستەوە بوو. بە جۆرێك کەریم ئۆف پێوەندییەکی چڕوپڕو لەگەڵ ئەم شەڕکەرە بەتوانا ئوزبەکییە بە رەچەڵەك ئەفغانییەدا دامەزراندووە. ئوزبەکستان هێڵێکی سنووری بە درێژایی ۲۰۰ کیلۆمتر لەگەڵ ئەفغانستاندا هەیەو هەر بۆیە بۆ پێکهێنانی سنوورێکی ئەمنییەتی لە هەرێمە باشوورییەکاندا خۆی یارمەتی لە ژنراڵ دۆستەم وەردەگرت. هەڵبەتە ئەم کارە بووە هۆی نارەزایەتی رەبانی، سەرۆك کۆماری ئەوکاتەی ئەفغانستان.

---

(1) Eastem Europe, Russia and central Asia (London: Europa publecat ions ltd, 2002) Pp. 485 – 488.



و حکوومەتی ئوزبەکستانیش حاشای لە هەر چەشنە دەستێوەردانی نیزامی لە ئەفغانستان دەکرد. ئەم دەنگۆیانەی بێبناغە لە قەڵەم دەدا. حکوومەتی کەریم ئۆفیش لەم بوارەدا روونی کردەوە کە ئێمە تەنیا یارمەتی مرۆڤ دوستانە دەنێرین بۆ ئەفغانستان بەڵام دواتر کەریم ئۆف دانی بەوەدا نا کە یارمەتی گەلێکی نیزامی داوە بە ژنراڵ دۆستەم و ئەم یارمەتیانە بۆ پارێزگاری لە وڵاتانی ئاسیای ناڤین یەك لەوان ئوزبەکستان لە بەرانبەر هێزەکانی تاڵیباندا بووە. بە دوای شکستی هێزەکانی دۆستەم لە ساڵی ۱۹۹۷ گرووپە ئوزبەکییەکان لە نێوان سنوورەکانی ئەفغانستان و ئوزبەکستاندا زیاتر بوون و ئەم کارە بووە مایەی نیگەرانی حکوومەتی کەریم ئۆف. هەر لەم راستایەدا کەریم ئۆف گوتی کە حکوومەتی نوێی ئەفغانستان کاتێك بە یاسایی دەناسێت کە هەموو قەومەکان و گرووپە ئەفغانییەکانی تێدا بەشدار بووبن؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، پاش سەقامگیر بوونی حکوومەتی تاڵیبان لەنێوان دوو وڵات کۆمەڵێك رێککەوتن هاتە ئاراوە تاکو کاریگەری لە سەر دابەزینی ئاڵۆزییە سنوورییەکاندا ببێ.

لە ئاگۆستی ۲۰۰۱ی زایینیدا نەمنەگانی وەکو فەرماندەی هێزەکانی تاڵیبان دیاریکرا کە ناوبراو لە راستیدا سەرۆکی هێزە ئیسلامی خوازاە ئوزبەکییەکان بوو؛ لەهەمانکاتدا راگەیەندرا کە رێبەری بە رەچەڵەك سعوودی گرووپی ئەلقاعدە، وەك سەرۆکی هێزەکانی تاڵیبان هەڵبژێراوە. ئەم رووداوانە لە راستیدا ئەو هۆکارانە بوون کە پێوەندییەکانی دوو وڵاتی ئوزبەکستان و ئەفغانەستانی تێکدەدا. لەلایەکی دیکەوە، بە رووداني ۱۱ی سپتامبری تەنگەژەگەلێکی نوێ لەناوچەکەدا هاتە ئاراوە؛ ئەم کارە بووە هۆی باش بوونی پێوەندییەکانی ئوزبەکستان لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لەم نێوەدا ئەمریکا لە کۆماری ئوزبەکستان وەکو کەرەستەکی گۆشار، بۆ لەنێو بردنی گرووپە بناژۆخوازە ئیسلامییەکان کەڵکی وەردەگرت؛ بە جۆرێك کە ئەمریکا لە ۲۳ی سپتامبری داوای لە حکوومەتی کەریم ئۆف کرد کە بۆ هێرش بۆسەر ئەفغانستان چەند پێگەیەکی ئاسمانی خۆی بە هێزەکانی ئەمریکابدا، ئەوەیش بەڵێنی بە ئوزبەکستان دا ئەگەر مەترسییەك هەڕەشەی لە حکوومەتی ئوزبەکستان بکات ئەوە بە شێوەی راستەخۆ ئەمریکا پشتگیری نیزامی لێبکات. لە ئوکتۆبری ۲۰۰۱ی زایینیدا حکوومەتی ئوزبەکستان سەربازەکانی لە سنوورەکانی باشووری خۆی لەگەڵ ئەفغانستان جێگیر کرد. و پێشی بە هاتنی پەناپەرانی ئەفغانی بۆ ناو خاکی خۆی گرت، هەر چەندە ملیون ونیوێك لەوانە ئوزبەکی بوون، بەڵام حکوومەتی ئوزبەکستان تەنانەت ئیزنی گەیاندنی یارمەتییە مرۆڤانەی لە رێگای سنوورەکانی خۆیەوە بە ئەفغانستان نەدا.

هەروەها لە نوامبری ساڵی ۲۰۰۱ی زایینیدا لەنێوان ئەمریکا و ئوزبەکستان چەن گرێبەستی بازرگانی واژۆ کران کە لەم نێوەدا حکوومەتی ئەمریکا رەزامەندی خۆی بۆ دانی ١٥٠ملیۆن سلڤە بە کۆماری ئوزبەکستان راگەیاند تاکو بەسەر کێشە ئابوورییەکانیدا زاڵبێ. لە دانیشتنێکدا کە لە نێوان رێبەرانی وڵاتانی ئاسیای ناڤین پێکهات هەموویان داکۆکییان لەسەر پشتیوانی لە حکوومەتی نوێ دەربڕی؛ لەم پێوەندییەدا حکوومەتەکانی ئوزبەکستان و ئەفغانستان لە مارسی ۲۰۰۲ی زایینیدا لە پێناو ریشەکێش کردنی بەشێك لە تیرۆریزم و خەبات بە دژی مادده هۆشبەرەکان و لەناو بردنی جوولانەوەی IMY پەیمانامەیەکیان واژۆکرد. پێوەندییەکانی رووسیە لەگەڵ ئوزبەکستانیش کە یەکێك لە گرینگترین ئەندامەکانی CIS بوو، بە هۆی کۆچکردنی رووسەکانی دانیشتووی ئەم وڵاتە بەرەو ساردی رۆیشت. حکوومەتی کەریم ئۆف بەرە بەرە لە دانی مافی هاووڵاتی بوون بەم کەمایەتییانە ملکەچی دەکرد؛ لەکاتێکدا ئەوان خەڵکانێکی لێهاتووو لە پسپۆڕانی کۆمەڵگا بە ئەژمار دەهاتن، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لەنێوان ئوزبەکستان و رووسیە کۆمەڵێك رێکەوتنامەی حکوومەتی واژۆ کران. حکوومەتی ئوزبەکستان هەروەها چەند گرێبەستێکی کولتووری و بازرگانی لەگەڵ وڵاتی گەورەی چین واژۆی کرد؛ تا ئەو جێگایەی کە (جیان زمینگ) یەکەمین سەرۆك کۆماری چین بوو کە بۆ ئوزبەکستان سەفەری کردووە. ئوزبەکستان لە راستیدا بەشێکە لە ئەندامانی رێکەوتنامەی دژی تیرۆریستی کە بریتین لە: وڵاتانی رووسیە، تاجیکستان، تورکمەنستان و چین.

هەروەها دەبێ ئەوەش بزانین کە ئوزبەکستان تاکو پێش سەربەخۆیی هێزی نیزامی سەربەخۆیی نەبوو. بەڵام پاش سەربەخۆیی کۆی هێزە نیزامییەکانی ئەم وڵاتە لە ٥٠ هەزار تاکو ٥٥ هەزار کەس مەزندە کراوە.

لەم نێوەدا هێزی زەمینی نزیکەی چل (٤٠) هەزار کەس، هێزی ئاسمانی لەنێوان دە هەتا پانزدە هەزار کەسو، هەروەها هێزەکانی هەواڵگری و ئەمنی لەنێوان ١٧ تاکو ١٩ هەزار کەس مەزندە کراوە. بودجەی نیزامی ئوزبەکستان لە ساڵی ۲۰۰۰ی زایینی نزیکەی ٣٠٠ ملیۆن دولار بووە. هەڵبەت لە ژانوییەی ١٩٩٦دا ئەم وڵاتە بە ناتۆوە پەیوەست بوو و دواتریش حکوومەتی کەریم ئۆف لە ئاوریلی ١٩٩٩دا پەیماننامەی وڵاتانی هاوقازانجی واژۆ نەکرد.[1]

(1) The Europa World year Book 2002, (londn: Europa publicationsltd, 2003), Pp. 4336 – 4339.



### (٣ ـ ٢) یاسای بنەڕەتی

یاسای بنەڕەتی ئوزبەکستان لە ٨ی دسامبری ١٩٩٢دا لە پانزدەهەمین کۆبوونەوەی شوورای باڵای ئەم وڵاتە پەسند کرا؛ ئەم یاسا بنچینەیییە لە کۆدا لە پێشەکییەك، ٦ بەش، ٢٦ فەسڵو ١٢٨ مادده پێکهاتووە. بەپێی ماددەی ١٥ی یاسای بنەڕەتی؛ لە سەرەوە بوونی ئەم یاسایە بەسەر یاساکانی تردا بەبێ هیچ مەرجێك پەسند کراوە هەروەها لە بنچینەی ١٦دا هاتووە کە "هیچ بەڵگەیەك، یان دیکومێنتێك نابێ بە پێچەوانەی نێوەڕۆکی یاسای بنەڕەتی بێت".[1]

لە ماددەی یەکەمی ئەم یاسایەدا، کۆماری ئوزبەکستان وەکو وڵاتێکی دیموکراتیك پێناسە کراوە کە مافی وەکو یەکی هەموو هاوڵاتیان بە فەرمی ناسراوە و لە ماددەی حەوتەم، خەڵك وەکو تاکە سەرچاوەی بەڕێوەبەری هێزی حکوومی لەقەڵەم دراوە.

لەم نێوەدا ئەرکی حکوومەت تەنیا بۆ دابینکردنی ماف و ئازادییەکانی هاوڵاتیان و بۆ جێبەجێکردنی یەکسانییە.

بەپێی ماددەی دەیەم تەنیا مەجلیسی باڵای ئۆزبەکستانە کە مافی دانی بڕیاربە سەر خەڵکدا هەیە. بەپێی ماددەی پانزەهەمی یاسای بنەڕەتی، تواناو دەسەڵاتی ئۆزبەکستان لەنێوان سێ دەسەڵاتی یاسادانەر، بەڕێوەبەری و دادوەری دابەش کراوە کە پێکهاتەی ئەم سێ دەسەڵاتە بەشێوەی سەربەخۆ کار دەکەن بەڵام لە هەمان کاتدا هاوکاری یەکتری دەکەن و لە ماددەی حەوتەمدا بە وردی شیکراوەتەوە کە بەڕێوەبەری دەسەڵات بەسەر خەڵکدا تەنیا لە ئەستۆی ئەو دەزگایانەن کە لە یاسای بنەڕەتیو یاساکانی بەستراوە بەمانە لەبەر چاو گیراوەو جێبەجی دەکرێت کەواتە هەر جۆرە سنووربەزاندنێك لەم بوارەدا لێپرسینەوەی یاسایی هەیە.

**ئەلف: دەسەڵاتی یاسادانەر**

پارلمانی باڵای ئۆزبەکستان بەپێی ماددەی ٧٦ی یاسای بنچینەیی، تەنیا ناوەندی یاسادانەرو بەرزترین نوێنگەی دەسەڵاتداری خەڵکی ناسێندراوە. ئەم پارلمانە یاسادانەرە لە هەڵبژاردنی دسامبری ١٩٩٤ هاتووەتە ئاراوەو هەنووکە خاوەنی ٢٥٠ نوێنەرە کە بۆ ماوەی ٥ ساڵە لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێررێن. سەرۆك و جێگرانی پارلمانی باڵای ئۆزبەکستانیش لەلایەن ئەم پارلمانتارانەوە بۆ خولێکی پێنج ساڵە هەڵدەبژێررێن. بەپێی

(١) داود چەرمی، ئوزبەکستان، (تاران: چاپەمەنی دەفتەری توێژینەوەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٥٧) لاپەڕەی ٧٨.

یاسا، یەکێك لە جێگرانی سەرۆکی پارلمانی باڵا دەبێ لەنێوان نوێنەرانی ناوچەی خودموختاری قەرەقاڵپاغستان بێت.

مەرجەکانی خوازیارانی نوێنەرانی ئەم پارلمانە یاسا دیاریان دەکا کە پێویستە لانیکەم تەمەنی ٢٥ ساڵ بێت. پارلمانی باڵای ئۆزبەکستان هەمیشەییە و لەکاتی پێویستدا بەبوونی لانیکەم دوولەسەر سێی کۆی نوێنەران بەفەرمی دەناسرێت. بۆ پەسەندی یاسایش دەنگی زۆرینەی نوێنەرانی پارلمان پێویستە و مەرجەکانی پێویست و کاتی جێبەجێکردنی لە رێگای راگەیەنە گشتییەکان و بلاوکراوەکانەوە رادەگەیەنرێت. لە کۆبوونەوەکانی پارلمانی باڵای ئۆزبەکستان، کاربەدەستانی وەك سەرکۆمار، سەرۆکی وەزیران و هەیئەتی وەزیران، بەرپرسانی دادگای یاسای بنچینەیی‌و دادگای باڵای دادوەری، هەروەها دادوەری گشتی‌و سەرۆکی بانکی ناوەندی دەتوانن بەشداری بکەن، هەڵبەت ئەم بەرپرسانە لەگەڵ بەرپرسی بەرزی ناوچەی خودمۆختاری قەرەقاڵپاغستان کە بەپێی یاسای بنەڕەتی ئەم مافەشیان هەیە کە گەلاڵە یاساییەکان بۆ تاوتوێ بە پارلمانی باڵای ئۆزبەکستان پێشنیار بکەن.

بەپێی ماددەی ٨٨ی یاسای بنەڕەتی، نوێنەرانی پارلمانی باڵا پارێزراویی پارلمانیان هەیە. ئەم پارلمانە خاوەنی دەسەلاتێکی بەرفراوانە، لە پەسندی یاساوە بگرە تاکو دیایکردنی رێچکەی سیاسەتە دەرەکی و نێوخۆییەکان. ئەم دەسەلاتە لە ماددەی ٧٨ی یاسای بنچینەییدا بەشێوەی تەواو بەیان کراوە کە هێندێك لەوانە دەتوانین بەمجۆرە ناو بەرین:

١) پەسند چاکسازی یاسا ئاساییەکان، هەروەها خودی یاسای بنەڕەتیش.

٢)دیاریکردنی رێبازو رێچکە و پێوەندییە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی کۆماری ئۆزبەکستان

٢) پەسندکردنی پلانە درێژخایەنەکان و دانانی یاسای گۆمروك،

٣) بودجەی وڵات پاش پێشکەشکردنی لەلایەن پارلمانەوە و چاودێری بەسەر جێبەجێکردنیدا.

٤) پەسند کردنی بوددجەی وڵات پاش پێشکەش کردنی لە لایەن حکوومەتەوە وچاودێری کردن بە سەر شێوەی دابەشکرانی

٥) دەست نیشانکردنی کاتی هەڵبژاردنەکان وەکو هەڵبژاردنی سەرکۆماری و پێکهێنانی کۆمیسیۆنێکی هەڵبژاردن.

٦) هەڵبژاردنی دادوەری دادگای یاسای بنەڕەتی‌و دادگای باڵای دادوەری، هەروەها هەڵبژاردنی دادوەری دادگای باڵای کۆماری ئۆزبەکستان.



٧) پەسند کردنی بڕیارات و بڕیارەکانی سەرۆك کۆمار لە پێوەندی لەگەڵ دانان یان وەلانانی سەرۆك وەزیران و دادوەری گشتی ئۆزبەکستان و جێگرەکانیان، هەروەها دانان و لابردنی سەرۆکی کۆمیتەی پاراستنی ژینگەو سەرۆکی بانکی ناوەندی لەسەرداوای سەرۆك کۆمار.

٨) پەسند کردنی بڕیاراتی سەرۆك کۆمار لە بواری بەرگری شارستانی و راگەیاندنی باری نا ئاسایی، هەروەها لە پێوەندی لەگەڵ پێکهێنان یان هەڵوەشانەوەی وەزارەتخانەکان و دەزگا حکوومییەکان.

٩) پەسند یان هەڵوەشانەوەی رێکەوتنامە و گرێبەستە نێونەتەوەییەکان، هەروەها دانی خەلات و نیشانەکانی حکوومەتی

**ب: دەسەلاتی دادوەری**

دەسەلاتی دادوەری ئۆزبەکستانیش بەپێی بنچینەی ١٠٦ یاسای بنەڕەتی؛ سەربەستەو بەستراوە نییە بە هیچ دامەزراوەیەکەوە و لە چەند دادگا پێکهاتووە ئەم دادگایانە بریتین لە: دادگای یاسای بنەڕەتی (شوورای چاودێری)؛ دادگای باڵا، دادگای کاروباری ئابووری؛ دادگای باڵای دادوەری و لە کۆتاییدا دادگای کۆماری خودموختاری قەرە قالپاغستان، لقەکانی دادوەری ئۆزبەکستان بریتییە لە دادگا دادوەیەکانی ویلایەتی، هەرێمی، شارەکان، شارۆچکەکان؛ شاری تاشکەند. قازییەکانی ئەم دادگایانە، هەروەها لقەکانی دادوەری ئەوان بۆ خولێکی کاتی ٥ ساڵە هەڵدەبژێرین دادگاکانی یاسای بنەڕەتی کۆماری ئۆزبەکستان لە سەرۆك و جێگرەکەی، هەروەها قازیەکانی دادگا و نوێنەری ناوچەی قەرەقالپاغستان پێکهاتووە. ئەم دادگایە لە یاساناسان و کارناسانی سیاسی پێکهاتووە کە ئەرکی سەرەکی ئەوان دڵنیا بوون لە ناتەبا نەبوونی یاساگەلی ئاسایییە لەگەڵ یاسای بنەڕەتییەکان. هیچ یەك لە ئەندامانی دادگای یاسای بنەڕەتی مافی ئەندامەتی هاوکات لە پارلمانی باڵای ئۆزبەکستان و حیزبەکان و یان بزووتنەوە سیاسییەکانیان نییە و ناتوانن پۆستەکی‌تر کە سەرچاوەی ماددیان هەبێت، بە دەستەوە بگرن. قازییەکان دادگاکانیش لە چالاکی خۆیاندا سەربەست و خاوەنی مافی پارێزراون و دەبێ پەیرەوی لە یاسای بنەڕەتی بکرێت. بڕیاراتی دادگای یاسای بنەڕەتی لە کاتی بلاو کردنەوەدا بە گوشار گۆڕانی بە سەردا نایەت.

بەهەرحاڵ، ئەرکەکانی دادگای بنەڕەتی بەپێی ماددەی ١٠٩ی یاسای بنەڕەتیدا دەتوانین بەم شێوەیە باسی لێوەبکەین:

١ـ تاوتویَ و هاوئاهەنگ کردنی فەرمانەکانی سەرۆك کۆمار، یاسا ئاساییەکانی پارلمانی بالاّ، پەسندکراوە حکوومەتییەکان و ناوچەیی، گرێبەستەکان و پەیماننامە نێونەتەوەییەکان لەگەڵ یاسا بنەڕەتییەکان.

٢ـ تاوتویَ و چاودێری کردن بە سەر یاسای بنەڕەتی ئۆزبەکستان، هەروەها یاسای بنەڕەتی ناوچەی خودمۆختاری قەرەقاڵپاغستان و دژ نەبوونی لە گەڵ یاساگەلی ئەم وڵاتە

٣ـ شیکردنەوەی یاسای ئۆزبەکستان

یاسای باڵای ئۆزبەکستانیش بەرزترین ناوەندی دادوەری لە بواری لێکۆڵینەوەی مەدەنی، سزاییو ئیدارییە کە بڕیارەکانی لە سەرانسەری ئۆزبەکستاندا پێویستە جێبەجێ بکرێ. ئەم دادگایە مافی چاودێری کردن بەسەر چالاکی دادگای باڵای دادوەری و دادگا ناوچەییەکان و شارۆچکەکان و شارەکاندا هەیە. دادگای باڵای دادوەری و دادگا دادوەرییەکانی دیکەی دادوەری ئەرکی پێڕاگەیشتن بەسەر کێشە ئابوورییەکان و بەڕێوەبەری نێوان فەرمانبەران، کۆمپانیاکان و رێکخراوگەلی دیکە کە لەسەر بنەمای جۆراوجۆر خاوەندارییەتییان هەیە، دەکەن. بەگوێرەی ماددەی ١١٨ی یاسای بنەڕەتیش دادگای گشتی و دادگاکانی ژێر رکێفی، چاودێری بەسەر جێبەجێکردنی تەواو و یەکسان لە کۆماری ئۆزبەکستانیان وەئەستۆیە. هەروەها دەبێ ئەوەمان لە بەرچاو بێ کە دادگا ناوچەییەکان، قەزاکان، شارەکان و کۆمپانیاکان لەلایەن دادگای گشتی کۆماری ئۆزبەکستانەوە دەستنیشان دەکرێن و دادگای کۆماری قەرەقاڵپاغستان لەلایەن بەرزترین ئۆرگانی نوێنەرایەتی کۆماری قاڵپاغستان دیاریدەکرێ. ماوەی ئەرکی دادگاکان لەگشت ئاستەکاندا، ٥ ساڵە. جێگای وەبیرهێنانەوەیە کە دادگاکانو تەنانەت قازی دادگاکانی لە ئۆزبەکستان ناتوانن هاوکات لە پارلمانی باڵا، حیزبەکان و جووڵانەوە سیاسییەکان ئەندامەتییان هەبێو یان پۆستێکی دیکە کە سەرچاوەی ماددی هەبێ، هەڵبژێرن. بەپێی ماددەی سەدو سێزدە، پێڕاگەیشتن بە فایلەکان لە تەواویی دادگاکاندا دەبێ بەشێوەی ئاشکرا بەڕێوە بچێ، جیا لە هێندێك بواری تایبەتی کە یاسا دیاری بکا.

**ج) دەسەڵاتی بەڕێوەبەری**

دەسەڵاتی بەڕێوەبەری کۆماری ئۆزبەکستانیش لە سەرۆك کۆمار، سەرۆك وەزیران و ئەندامانی دیکەی هەیئەتی دەوڵەت، هەروەها دامەزراوەکان و رێکخراوگەلی بەستراوە بە ئەوان پێکدێ.



لەم نێوەدا سەرۆك کۆماری ئۆزبەکستان وەکوو نوێنەری یاسای وڵات لە سیستمی نێونەتەوەیی بە ئەژمار دێ، هەروەها سەرۆکایەتی هەیئەتی دەوڵەتی لە ئەستۆیە. بەپێی بەندی ١٩ی یاسای بنچینەیی، سەرۆك کۆمار بۆ ماوەیەکی کاتی پێنج ساڵە بە دەنگی راستەوخۆو لە هەمان کاتدا نهێنی خەڵك هەڵدەبژێردرێ و کەس ناتوانێ زیاتر لە دوو خول سەرۆك کۆمار بێ. پاڵێوراوانی سەرۆك کۆماری ئۆزبەکستان دەبێ هەموو مەرجەکانی پێویستیان هەبێ، بۆ وێنە دەبێ هاووڵاتی ئۆزبەکی بێ و ١٠ ساڵ پێش هەڵبژاردن بە شێوەی بەردەوام لە خاکی وڵاتەکەی نیشتەجێ بووبێ، هەروەها تەمەنی ٣٠ ساڵ کەمتر نەبێو شارەزای زمانی فەرمی وڵاتەکەی بێت. هەروەها بە گوێرەی ماددەی ٩١ی یاسای بنەڕەتی، سەرۆك کۆمار ناتوانێ هاوکات پۆستێکی دیکەی هەبێ، یان ئەندامی رێکخراوێکی تایبەت بووبێ، هەروەها ناتوانێ چالاکی ئابووری یان کارێك کە سەرچاوەی ماڵی ببێ، هەبێ. سەرۆك کۆمار خاوەنی پارێزراوییە، یاسا پشتگیری لێدەکا. هەروەها بەپێی یاسا سەرۆك کۆمار جێگوڕکێی دەسەڵاتی خۆی بۆ رێکخراوەکانی حکوومی یان بەرپرسانی دیکەی نییە و هەرکات بەهۆی نەخۆشی یان هەر هۆیەکی دیکە لە بەجێ گەیاندنی ئەرکەکانی وەدوا بکەوێ، پارلمانی باڵا لە رۆنشتنێکی نائاسایی و بە لانی زۆرەوە لە ماوەی دە رۆژ دەتوانێ لەنێوان ئەندامانی نوێنەران کەسێك وەکوو سەرۆك کۆماری کاتی هەڵبژێرێ. بەڵام دەبێ لە ماوەی سێ مانگ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری بەڕێوەببات. هەڵبەت دەبێ ئەوە رەچاو بکەین کە سەرۆك کۆماری ئۆزبەکستان پێش کۆتایی ماوەی خۆی ببێ بە ئەندامی هەتاهەتایی دادگای یاسای بنەڕەتی. بەپێی ماددەی ٩٣ی یاسای بنچینەیی، سەرۆك کۆماری ئۆزبەکستان ئەرکی قورسی وەئەستۆیە. کە بەرچاوترینیان دەتوانین ئاماژە بەمانەی خوارێ بکەین:

١ـ سەرۆك کۆمار لە کاتی سەرهەڵدانی کێشەی چارەسەرنەکراو لە پارلمانی باڵا کە باندۆری نەرێنی لەسەر رەوتی کارەکاندا هەبێ یان لە کاتی پەسندکردنی بەردەوامی یاساگەلێك کە دژایەتی لەگەڵ یاسای بنچینەییدا هەبێ دەتوانێ پارلمانی باڵا هەڵوەشێنێتەوە کە هەڵبەت هەڵوەشانەوەی ئەم پارلمانە لە بارودۆخی نائاساییدا بە قازانج نییە، پاش هەڵوەشانەوەی پارلمانیش دەبێ لە ماوەی ٣ مانگ هەڵبژاردنی دیکە بەڕێوەبچێ.

٢ـ فەرماندەیی گشت هێزەکانی چەکدارو دانان و لابردنی فەرماندەکان، هەروەها دانی پلەی نیزامی.

٣ـ دانی پەنابەری سیاسی، هەروەها دانی هێما ڕێزلێنانەکانی کۆماری ئۆزبەکستان.

٤ـ دەرکردنی حوکمی لێبوردن یان کەمکردنەوەی حوکمەکان.

٥ـ ڕاگەیاندنی شەڕ لەکاتی هێرش بۆ سەر کۆماری تاجیکستاندا هەڵبەت ئەم بڕیارە دەبێ پەسندی پارلمانی باڵایشی لەگەڵدا بێ.

٦ـ ئەنجامدانی دانووستاندن، هەروەها واژۆی گرێبەستەکانی کۆماری تاجیکستان لەگەڵ وڵاتانی دیکە.

٧ـ وەرگرتنی نوێنەرانی "ئاکرودیتە"و سەفیرەکان...، واژۆکردنی پەیماننامەکان، هەروەها لابردن و دانانی نوێنەرانی دیپلۆماسیو نوێنەرانی دیکە لە گشت وڵاتاندا.

٨ـ دانان و لابردنی سەرۆك وەزیران، جێگری یەکەم و جێگرانی دیکەو ئەندامانی دیکەی حکوومی، هەروەها دانان و لابردنی سەرۆکی دادگای گشتی وڵات و جێگرانی، هەروەها دامەزراندن یان هەڵوەشاندنەوەی وەزارەتخانەکان و ڕێکخراوە حکوومییەکانی دیکە، هەڵبەت هەمووی ئەم دانان و لابردنانە دەبێ پەسندی پارلمانی باڵای ئۆزبەکستانیشی لەگەڵدا بێ.

٩ـ پێشکەش کردنی ڕاپۆرتی ساڵانە لە بواری بارودۆخی نێوخۆیی و نێونەتەوەییدا بە پارلمانی باڵای کۆماری ئۆزبەکستان، هەروەها سەرۆك کۆمار دەبێ پاڵێوراوەکانی خۆی بۆ بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆکایەتی بانکی ناوەندی و سەرۆکایەتی کۆمیتەی حکوومی بۆ پاراستنی ژینگە، هەروەها بۆ بەدەستهێنانی سەرۆکایەتی دادگا جۆراوجۆرەکان لەم وڵاتە بە پارلمانی باڵا بناسێنێ. لەگەڵ ئەوەیشدا دانان و وەلانانی دادوەرانی ناوچەکان، شارەکانوشارۆچکەکان و دادگاکانی دادوەری ئۆزبەکستان لە ئەستۆی سەرۆك کۆمارە.

١٠ـ واژۆی یاسای بنەڕەتی ئۆزبەکستان، لەم بوارەدا دەبێ بڵێین کە سەرۆك کۆمار دەتوانێ یاسایەك کە ئەو لێی نارازییە بە دەستکارییەوە بیگەڕێنێتەوە بۆ پارلمانی باڵا، بەڵام هەرکات پارلمانی باڵا بە دوو لە سێی دەنگەکانی خۆی بڕیارو یاسای پێشووی پەسند کرد، سەرۆك کۆمار دەبێ واژۆی بکا.

١١ـ دانان و لابردنی دەسەڵاتداران و ڕێبەرانی ئیداری تاشکەندو ناوچەکانی دیکەی ئۆزبەکستان، هەروەها دانان و وەلانانی بەرپرسانی شارەکان و قەزاکانی ئەم وڵاتە، هەڵبەت هەمووی ئەم دانان و لابردنانە دەبێ پەسندی شوورای قەزای نوێنەرایەتی گەلی لەگەڵدا بێ.

١٢ـ پێکهێنانی ڕێکخراوی ئەمنی و نووسینگەی چاودێری حکوومی، دانان و وەلانانی بەرپرسانو بەکاربردنی دەسەڵاتەکانی دیکەی سەرۆك کۆماری.



لە بەندی بیستەمی یاسای بنەڕەتیشدا ئەرکەکانی هەیئەتی وەزیران و چۆنییەتی هەڵبژاردنیان دەستنیشان کراوە. هەیئەتی وەزیران لەلایەن سەرۆك کۆمارو بە پەسندکردنی پارلمانی باڵا پێکدێ. ئەندامانی کابینەی حکوومەتی ئۆزبەکستان لە سەرۆك وەزیران، جێگری یەکەم و دوو جێگری دیکەی سەرۆك وەزیران، هەروەها لە پانزە وەزیر پێکدێ. سەرۆکی حکوومەتی کۆماری خودموختاری قەرەقاڵپاغستانیش هاوکات ئەندامی هەیئەتی وەزیرانن. سنووری دەسەڵاتی هەیئەتی وەزیران یاسا دیاریدەکات. هەڵبەت نوێنەرانی پارلمانی باڵا مافی "ئیستیزاحی"وەزیرانیان هەیەو دەتوانن داوای ڕوونکردنەوە لە مەڕ پرسە جۆربەجۆرەکان لە وەزیران بکەن.

لە بەندی ٢١ی یاسای بنەڕەتی، دامەزراوە سیاسییە ناوچەییو بیاڤییەکانیش دەسەڵات و ئەرکەکانیان پێناسە کراوە. لە ماددەی ١٠١ ئەرکی کاربەدەستە ناوچەییەکان بەم شێوەیە باسی لێوە کراوە:

١ـ چاودێری بەسەر هەڵسووڕانی شوورای نوێنەرانی گەل و چارەسەرکردنی ئاریشە ماڵیو ناوچەییەکان.

٢ـ بەڕێوەبردنی یاساکانی ئۆزبەکستان و بڕیاراتی سەرۆك کۆماری.

٣ـ پارێزگاری لە ژینگەو بڕەودان بە پرسە کۆمەڵایەتی- ئابووری، ناوچە جیاجیاکانی وڵات.

٤ـ جێبەجێکردنی خزمەتگوزاری شاریو پەسندی ڕێسایەك کە دژی یاسای بنەڕەتیو یاساکانی دیکەی کۆماری ئۆزبەکستان نەبێ.

٥ـ وەرگرتنی بودجە بۆ ناوچەکان، دیاریکردنی سەرانەو خەسارە ناوچەییەکان.

٦ـ بەڕێوەبردنی یاساو دابینکردنی ئاسایشی هاووڵاتیان.

ماوەی دەسەڵاتی یاسایی نوێنەرانی شووراکان و کاربەدەستان ٥ ساڵە کە ماددەی سەدو دوو لە پێوەندی لەگەڵ دانانو وەلانانیان بەم جۆرە هاتووە:

١ـ بەرپرسانی ناوچەکانو شاری تاشکەند لەلایەن سەرۆك کۆمارو بە پەسندکردنی نوێنەرانی گەل دادەنرێن و وەلا دەنرێن.

٢ـ بەرپرسانی شارەکان، شارۆچکەکان، لەلایەن کاربەدەستانی ناوچەکان و بە ڕەزامەندی شوورای نوێنەرانی باڵای گەل، پێوەندیدار بەوانەوە دادەنرێن و لادەبرێن.

٣ـ بەرپرسانی ئیداری شارەکانیش لەلایەن فەرمانداری شارەکان و بە پەسندی شوورای نوێنەرانی گەل، پێوەندیدار بەوانەوە دادەنرێن و لادەبرێن.

٤ـ بەرپرسانی شارۆچکەکان لە ژێر چاودێری فەرماندارو لەلایەن بەرپرسی گشتی ناوچەکەو بە پەسندی شوورای نوێنەرانی گەل، پێوەندیدار بەوانەوە دادەنرێن و لادەبرێن.

٥ـ دانیشتووانی ناحییەکان، گشت پرسەکانیان لە ڕێگای کۆبوونەوەی جەماوەرییەوە بەڕێوە دەبەن.

ئەم دەزگا خۆبەڕێوەبەرە خۆجێییانە بۆ ماوەی دوو ساڵ و نیوو سەرۆك و دەستەی راوێژکارانی خۆیان هەڵدەبژێرن. لە ئەرك و پێکهاتەکانی گرێدراو بە سێ دەسەڵاتی ئۆزبەکستان کە بێنەدەر. یاسای بنەڕەتی هێڵی گشتی دیکەی بۆ پێوەندییە دەرەکی و نێوخۆییەکانی ئەم وڵاتە دیاری کردووە. بە گوێرەی ئەم یاسایە، ئۆزبەکستان خاوەنی سیاسەتی سەربەخۆیی نێوخۆیی و دەرەکییە، لە رووی نێوخۆییەوە یاسای بنەڕەتی ئۆزبەکستان بۆ گشت هاووڵاتیان یەکسانی ماف و ئازادی باری تاك کەس و کۆمەڵایەتی بەبێ گوێدان بە رەگەز، رەچەڵەك، زمانو ئایین و نەتەوە و بیرو باوەڕی سیاسی گەرانتی کراوە. بە جۆرێك کە لە بەندی شەشەمدا، پرسی هاووڵاتی بوون (تابعیت) باسی لێکراوە کە لە بەرچاو نەگرتنی شێوەی بەدەستهێنانی بۆ هەموو هاووڵاتیانی وڵات وەکوو یەك و بەرانبەر دیاریکراوە. بەپێی ماددەی بیست و یەکەم، کۆماری خودموختاری قەرەقاڵپاغستان وەك بەشێك لە کۆماری ئۆزبەکستان بە ئەژمار دێ. بەپێی ئەم ماددەیە لەگەڵ کەسانێك کە مافی هاولاتیان نییە بەگوێرەی ڕێسا نێونەتەوەییەکان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێ. وەها کەسانێك دەبێ تا ئەو کاتەی لە ئۆزبەکستانن پەیرەویی لە یاساکانی ئەم وڵاتەو ڕێککەوتننامەکانی نێونەتەوەیی پەسند کراوەیی ئەوان بکەن. لە بواری مافی ئازادی بیروباوەڕەوە لە ماددەی سیو یەکەمدا هاتووە کە "بۆ هەموو کەسێك مافی بیروباوەڕ گەرانتی دەکرێ، هاووڵاتیان مافیان هەیە کە پەیڕەویی لە بیرو باوەڕی خۆیان بکەن یان پەیڕەوی لە هیچ کام نەکەن". بەگوێرەی ماددەی چوارەمی یاسای بنەڕەتی، زمانی فەرمی وڵات تورکی ئۆزبەکییەو بۆ زمانەکان و گشت داب و نەریتە ئەتنیکەکانی ئاکێنجی لە ئۆزبەکستان رێز گرتنیان گەرانتی کراوە[1]. هەروەها لە یاسای بنەڕەتی جیا لە ئایین لە سیاسەت و کۆمەڵگایەکی سیکۆلار گەرانتی کراوە کە پێکهاتە ئایینییەکان لە دەوڵەت جیا لە قەڵەم دەدا. شایانی باسە کە پێش هەرەسهێنانی سۆڤییەت

(١) ئیلاهە کوولایی، یاسا سەرەکییەکانی فدراسیۆنی رووسیەو کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاست (تاران: بلاوکراوەی دادوەری، ١٣٧٧) لاپەڕەکانی ٥٧ ـ ٨٠



خەڵکی ئۆزبەکستان بێبەری بوون لە ئازادییە ئایینییەکان و هیچ تاکێك یان تاقمێك مافی دروستکردنی مزگەوت و بەجێ گەیاندنی ئەرکە ئایینییەکانیان نەبوو، بەڵام پاش سەربەستی ئۆزبەکستان، ئیسلام کەریم ئۆف رایگەیاند کە "سەرنجدان بە ئایین پرسێکی گرینگ، لە سیاسەتە نێوخۆیی و نێونەتەوەییەکانی ئێمە پێکدێنێ و ئێمە لە چالاکییەکانی خەڵك لە رەوگەی بەرزترین راگرتنی بەها ئەخلاقی و دەروونییەکان، پشتیوانی دەکەین". لەم رووەوە کەریم ئۆف لە کاتی یەکەمین هەڵبژاردندا سەردانی مزگەوتەکی تازە بینا کراو لە نەمنەگان کرد. هەروەها دوای سەربەستی بیناکردنی مزگەوت بە شێوەیەکی بەرچاو رووی لە زیاد بوون کرد، بە جۆرێك رێژەی ١٧٠٠ تا ١٧٣٠ مزگەوت لە وەزارەتی نێوخۆ ناودێرکراوە. بەڵام ئەم رەوتە زۆری نەکێشاو دوای ساڵی ١٩٩٨ بەدوای گەشەسەندنی هەڵسوڕانی ئیسلامی خوازان و کوژرانی دوو ئەفسەری حکوومەتی لە نەمنەگان چالاکی زۆربەی مزگەوتەکان بەرتەسك کرا. لەم بوارەدا یاسای بەرتەسك کردنەوەی ئازادییە ئایینییەکان و پێکهاتەگەلی ئایین زایی پەسند کرا. بەدوای جێبەجێکردنی ئەم یاسایە ژمارەیەك لە مزگەوتەکان دران بە خەڵکانی هەژارو هێندێکیش کران بە چاپخانە[1].

بە شێوەیەکی گشتی چالاکی ئیسلامییەکان لە ئۆزبەکستان لەژێر ناوی "رێکخستنی ئایینی فەرمی"و "رێکخستنی نافەرمی و بناژۆخواز" دەستپێکرد. دەستەی یەکەم سەر بە حکوومەت بوون پەیڕەویی لە سیاسەتەکانیان دەکرد. دەستەی دووهەم بناژۆخوازی ئیسلامین[2]، ئارمانجی چالاکی دەستەی دووهەم رووخاندنی حکوومەتی کەریم ئۆف[3]و پێکهێنانی حکوومەتیکی ئیسلامییە، بەم پێیە چالاکی بناژۆخوازانی ئیسلامی نایاسایی راگەیەندراوەو یاسا بەدوای رێبەرانیانەوەیە. لە ساڵانی رابردوودا ژمارەیەکی زۆریان قۆڵبەست، یان ئێعدام کراون.

(1) B. B. C, Radio, Central Asian Surrey, 17 July 2000

(2) Morthe Brillolcott, "Islamic Consciusness and National Ideology", in Anoushiran Ehteshami, from the Gulf to Central Asia, p. 20. See Also Alexiv. Malashenko, "the Eigttis: Anew Political Start for Islam", Russian Sorial Science Review, March 1993, P. 89

(٣) کەریم ئۆف بەردەوام لە ساڵی ١٩٩٢ مەترسی بناژۆخوازی دووپات دەکرد. سەردانی ئەم چاوگە بکەن:
BessBrown. "The Fallof Nabier", RFE/RL Resiarch Report vol. 1,NO. 38, 25 Septamber 1992, P. 14.

لە رووی سیاسەتی دەرەکیشەوە، ئۆزبەکستان وەك ولاَتێکی سەربەخۆ پێناسە کراوە کە لەسەر بناغەی یەکسانی مافی خاوەنداریەتی حکوومەتەکان، دووری کردن لە دەستێوەردان لە کاروباری نێوخۆیی ولاَتانی دیکە، هەروەها رێزگرتن لە مافی نێونەتەوەیی، پێکهاتووە. لە بەشی نۆیەمی یاسای بنەڕەتی بۆ گشت هاوولاَتیان مافی خاوەنداریەتی ئاماژەی پێکراوە، هەروەها بەپێی یاسا مافی کارو هەلبژاردنی کاری دلخواز، مافە کۆمەلاَیەتییەکان بۆ خانە نشینان و پەککەوتووەکان، مافی بەهرەمەندبوون لە خوێندنی بێ بەرانبەر تاکو ئاستی ناوەندیی، گەرەنتی کراوە. حکوومەتیش ئەرکە لەسەر شانی کەرەستەی خوێندن دابینبکاو پەرە بە رەوشی کۆمەلاَیەتی ـ ئابووری بدا. لە بەشی سێزدەهەمی یاسای بنەڕەتیشدا باس لە یەکیەتییە سڤیلەکان کراوە کە داگری یەکیەتییە کرێکارییەکان، حیزبە سیاسییەکان، ئەنجوومەنە زانستییەکان، رێکخراوەکانی لاوان و رێکخراوگەلی دیکە کە یاسا ریگای هەلسورانی پێداون.

هەلبەت لەم بەشەدا هاتووە کە رێکخراوەکان و بەرپرسانی حکوومی نابێ دەستێوەردان لە چالاکی یەکیەتییە کۆمەلاَیەتییەکان بکەن و لە بەرانبەردا ئەوانیش مافی دەستێوەردان لە کاروباری دەولەتیان نییە. لە یاسای بنەڕەتی ئۆزبەکستان، چالاکی راگەیەنە گشتییەکان ئازادەو یاسا چوارچێوەی کاری ئەوانی دیاریکردوە. ئەم یاسایە، داوا لە راگەیەنە گشتییەکان دەکا لە هەر چەشنە سانسۆرێك خۆیان بوێرن. لە بەشی دوانزەی یاسای بنچینەییشدا بناغەی ئابووری ولاَت لەسەر شێوازی جۆراوجۆر خاوەنداریەتی بنیاتنراوە. سەرچاوەی سرووشتییەکان بە شێوەی گشتی لە ژێر رکێفی حکوومەت دایە، بەلاَم لە هەمان کاتدا مافی خاوەنداریەتی تایبەتیش رەچاو کراوە. بە جۆرێك کە لە یاسای بنەڕەتیدا تەنیا لە هێندێك خالَی دیاری کراوو دەگمەن، خاوەنداریەتی تایبەتی بەرتەسك کراوەتەوە. بەشی شانزەهەمیش باسی لە پێکهاتەی ئیداری‌و نیشتمانی کۆماری ئۆزبەکستان دەکاو کە بریتین لە: ناوچەکان، شارەکان، شارۆچکەکان و گوندەکان، هەروەها کۆماری خودموختاری قەرەقالپاغستان. هەر جۆرە گۆڕانێك لەم دابەش کردنانەدا گرێدراوە بە رەزامەندی پارلمانی بالاَی ئۆزبەکستان. لەم نێوەدا بەشی حەڤدەیەمی یاسای بنەڕەتی تەرخانکراوە بە پرسی ناوچەی خودموختاری قەرەقالپاغستان. بە گوێرەی ئەم یاسایە کۆماری قەرەقالپاغستان بەشێکە لە خاکی ئۆزبەکستان کە هەر چەشنە گۆڕانێکی سنووری دەبێ رەزامەندی ئۆزبەکستانی لەگەلدا بێ. ئەم



کۆماری خودموختارە خاوەنی یاسای بنەڕەتی جیاوازە و کۆکە لەگەلَ یاسای بنەڕەتی ئۆزبەکستان. هەلبەت خەلکی قەرەقالپاغستان دەبێ پەیڕەوی لە یاساگەلی کۆماری ئۆزبەکستانیش بکەن. پێوەندییەکانی نێوان ئەم دوو کۆمارە لە چوارچێوەی یاسای بنەڕەتی ئۆزبەکستانداو لەسەر بنەمای گرێبەستەکان و رێککەوتننامەکانی دارێژراون. ئەم کۆمارە خودموختارە بەپێی ماددەی ٧٤ی یاسای بنچینەیی ئۆزبەکستان، مافی جیابوونەوەی لەم ولاَتەی هەیە.

بەپێی ماددەی ١١٧ی یاسای بنەڕەتی ئۆزبەکستان، هەموو هاوولاَتیانی ئەم ولاَتە کە تەمەنی گەیشتە ١٨ سالَ، مافی دەنگدان و بەشداری لە هەلبژاردنەکانیان هەیە، لەو رووەوە خاوەنی مافی بەرانبەرن، بەلاَم بەپێی ئەم یاسایە لە ئۆزبەکستان تاوانباران و زیندانییەکان مافی دەنگدانیان لە هەلبژاردندا نییە. لە بەشی ٢٥ی یاسای بنەڕەتی ئۆزبەکستان باس لە پرسە مالَی‌و دراوییەکان دەکا. بەپێی ماددەی ٢٢ بوودجەی ولاَت بریتییە لە بوودجەی نەتەوەیی، بوودجەی ناوچەکان و بوودجەی کۆماری قەرەقالپاغستان. لە ماددەی ١٢٣یشدا سیستمی سەرانەی ولاَت تەنیا ئەسپاردراوە بە پارلمانی بالاَی ئۆزبەکستان. لە کۆتاییدا بەپێی ماددەی ١٢٧، گۆرانکاری‌و چاکسازی لە یاسای بنەڕەتیدا تەنیا بە زۆرینەی ٢ لە ٣ی کۆی نوێنەرانی پارلمانی بالاَ دێتە ئاراوە. بە گوێرەی ماددەی ١٢٨یش چاکسازی و گۆڕینی یاسای بنەڕەتی دوای پێشنیارو لە ماوەی ٦ مانگدا لەلایەن پارلمانی بالاَی ئۆزبەکستانەوە جێبەجێ دەبێ. لەکاتی رەتی پێشنیارو لە ماوەی ٦ مانگدا لەلایەن پارلمانی بالاَوە هێنانەگۆڕی سەرلەنوێ تاکو سالێك مومکین نییە[1].

## (٤ ـ ٢) حیزبە سیاسییەکان و رێخستنە ئایینییەکان

### ئەلف: حیزبە سیاسییەکان

بە شێوەی گشتی ٩ حیزب لە ئۆزبەکستان هاتوونەتە گۆڕەپانی سیاسییەوە کە جیا لە چوار حیزبی بیرلیك، ئیرەك، حیزبی ئەلتەحریرو جوولاَنەوەی ئیسلامی ئۆزبەکستان، ئەوانی دیکە بە شێوەی فەرمی لە هەلبژاردنەکانی پارلمانی سالَی ١٩٩١ دەستیان بە هەلسووڕان کردووە کە بریتین لە:

(١) کولایی، پێشوو، لاپەڕەکانی ٧١ ـ ٨٠

## ١ـ حیزبی خەڵکی بیرلیك (وەحدەت)

ئەم حیزبە پێش سەربەخۆیی ئۆزبەکستان لە ساڵی ١٩٩٨دا، لەلایەن ئەندامانی ئاکادیمی زانستییەوە پێکهات و لەو سەردەمەدا تەنیا هێزی ئەڵترناتیڤی حیزبی کۆمۆنیست بە ئەژمار دەهات. لە سەرەتا ڕێکخراوێکی دژی سۆڤییەت بوو کە بە ئارمانجی سەربەخۆیی ئۆزبەکستان و بووژانەوەی کولتووری ئۆزبەکی پێکهات. لە خۆپیشاندانێك کە لە ساڵی ١٩٨٩دا لەلایەن حیزبی بیرلیك بەڕێوەبرا[١] پتر بەهۆی پێوەندی چەوسێنەرانەی ئابووری حکوومەتی ناوەندی (مسکۆ) دەگەڵ کۆمار بوو. گوشاری حیزب بووە هۆی چاکسازیی گەلێك لەلایەن کەریم ئۆفەوە[٢].

ڕێبەرانی هەنووکەیی ئەم جووڵانەوەیە عەبدولڕەحمان پۆلاتۆف مامۆستای زانستی کامپیۆتێر لە زانستگای فەنی مسکۆ، پاش نایاسایی بوونی چالاکی جووڵانەوە، سەرەتا چووە تورکیەو پاشان بەرەو ئەمریکا ڕۆیشت. تەڤگەری خەڵکی بیرلیك (وەحدەت) لەو بڕوایەدایە کە دێموکراسی لە سەرەوەی سەربەخۆییە، تاکو حکوومەت ڕێخۆشکەر نەبێ بۆ هاتنە ئارای دێموکراسی لە وڵاتدا، مەترسی سەرهەڵدانی بناژۆخوازی ئیسلامی هەیە. هەروەها ئەم بزووتنەوەیە باس لەوە دەکا کە لە بارودۆخێکدا کە پارلمانی وڵات بە شێوەی گشتی لەژێر چاودێری دەوڵەتدا بێ دێموکراسی جگە لە تراویلکەیەك واتایەکی دیکەی نییە.

حیزبی بیرلیك دوای دامەزراندن لەنێو خەڵکی ئۆزبەکستان بەتایبەتی لەنێو توێژی ڕووناکبیر، لایەنگرێکی زۆری لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە. تاکو نیوەی ساڵی ١٩٨٩ ڕێژەی لایەنگرانی ئەم گرووپە نزیکەی یەك ملیۆن کەس بوو. زۆر یەك لە چاودێران لەو بڕوایەدان کە بیرلیك دەیتوانی لە هەڵبژاردنی ١٩٩٥دا زۆرینەی دەنگەکان بەدەستبێنێ‌و لانیکەم بەرەیەکی بەهێزی دێموکراتیك لە پارلمانی کۆماری پێکبێنێ. بەڵام کەریم ئۆف لە ژووئەنی ١٩٨٩دا توانی پشتیوانی هێندێك لە ڕێبەرانی بیرلیك بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. بەڵێنیدا بەم ڕێبەرانە کە پشتیوانی لە هێندێك لە پرسە نەتەوەییەکان بکا بەو مەرجەی ئەم گرووپانە دەست لە دروشمە دژە کۆمۆنیستییەکان هەڵگرن[٣]. هەڵسووڕاوانی حیزبی بیرلیك لەو سەردەمەدا لە لایەن ساڵح

(1) a Bohr and T. Kocaoglu, "Birlks Stages Anotehr Democstration in Tashen", Reporton the Ussr, 16 June 1989, and G. Gleson, "Birlik", Repart on the Ussr, 15 Jun 1990 Critchlow, Uzbek… Loose". Reparton the Ussr, 22 september 1989

(2) J. Crithlow, "Newleade Softens Stance Towards Birlik" Repart on the Ussr, 26 September 1990

(3) Mehrdod Hoghoyeghi, Islam and Politicsin Central Asia, (London: Macmillan Press, 1995), P. 66



مەحموود ئۆفەوە (محەممەد ساڵح) ڕێبەری دەکران کە لە سێپتامبرو نوامبری ١٩٨٩دا لە بیرلیك جیابۆوەو دواتر حیزبی ئێرەکی دامەزراند.

بەرپرسانی حکوومەتی کەریم ئۆف، حیزبی بیرلیکیان بە هاریکاری کردن لەگەڵ هێزە دێموکراتەکانی ڕووسیە تاوانبار دەکردن[١]

بە گرینگیدان بە بەرتەسکییەکان، کۆمەڵێك لە هەڵسووڕاوانی سەربەخۆی لایەنگری بیرلیك لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتنیان بە دەستهێنا، تەنانەت چەند کەس لە ئەندامانی بیرلیك (کە وەك ڕێبەرانی بزووتنەوە ناوبانگی کەمتریان هەبوو یان هەر ناویان لە لیستدا نەبوو) توانیان بچنە پارلمانەوە بەڵام ئەوان نەیانتوانی لەنێو ٥٠٠ ئەندامی پارلمان کە زۆربەیان لایەنگری حکوومەت بوون کاریگەرییان هەبێ. بەم شێوازە بیرلیك توانی هێزی خۆی بەدەست بێنێتەوە و ڕێکخراوگەلی وەك لاوان و ژنان لەنێو بزووتنەوەکەیدا پێکبێنێ. بیرلیك یارمەتی بە دامەزراندنی حیزبی جووتیارانی ئازاد کرد. ڕۆژنامەو بڵاوکراوەو نامیلکەی ژێرزەمینی ئەم حیزبەیشی بڵاودەکردەوە[٢].

پاش تێکچوونی سۆڤییەت لە کۆتایی ساڵی ١٩٩١دا، سەربەخۆیی ئەم وڵاتە، هێزە بەرهەڵستکارانی حکوومەتی ئۆزبەکستان سەرکوت دەکران. لە نیوەی ساڵی ١٩٩٢دا، عەبدولڕەحیم پۆلاتف، ڕێبەری بیرلیك لەلایەن گرووپێکی نەناسراوەوە بە توندی وەبەر کوتەك و لێدان کەوت و کاپیلکەی سەری شکاو مێشکی زەبری لێ کەوت و بۆ نەخۆشخانە بەڕێکراو ئەم هێرشە لە ڕووبەڕووی بینای دادوەری ڕووی دا. پاش ئەم هێرشە بەرگریکردنی ناراستەوخۆی کەریم ئۆف لە قەولبەست کراوان، بە کردوە هێرش بۆ سەر نارازییان دەستیپێکرد. دەیان کەس لە لایەنگرانی بیرلیك ئاخێندرانە بەندیخانەکانەوە[٣].

لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٢دا پاش دووەمین هێرش بۆ سەر گیانی سەرۆك کۆمار، پولادئۆنۆف ـ نوێنەری پێشووی پارلمان و ئەندامی بەرەی دێموکراتیك، قۆڵبەست کرا. ناوبراو پاش دوو ساڵ و نیو، بە گوشاری ڕێکخراوگەلی نێونەتەوەیی ئازاد کرا.

(1) Darron rali, Banned Islamic Morement Ineреasingly Increasingly Active in Central Asia, See / internet Site
http:/www. transoospion. ru

(2) Hoghayeghi, Islam and Politicsin central Asia, p. 73

(3) Borisz. Rumer, "the potential For Political Instabilhy and Regiond Conflicts", in Ali Bonuzizi and Myron Weiner, The New Geopolitics of central Asia and Its Border Londs (Bloomington and Indianapolis: Indiana University Press, 1994), PP. 89-105

## ٢ـ حیزبی ئیرەك یان حیزبی ئازادی (ERK party)

ئەم حیزبە لە تەڤگەری خەڵكی بیرلیك جیابووەوە لە ساڵی ١٩٩٥ لە لایەن **محەممەد** ساڵح پێكهات. ئەم حیزبە بە پێچەوانەی تەڤگەری بیرلیك (وەحدەت) لەو بڕوایەدایە كە سەربەخۆیی ئۆزبەكستان لە بەرهەڤكردنی دێموكراسی پێویستترە. لەم ڕەهەندەوە ڕێبەری حیزب، **محەممەد** ساڵح لە كاتی ئەندامیەتی لە پارلماندا كەڵكی لە خەباتی پارلمانی واتێ چوونی هەر چی زیاتری نوێنەرانی حیزب بۆ پارلمان بۆ بردنەپێشی ئارمانجە سیاسییەكانی خۆی دەكرد.

**محەممەد** ساڵح پاش سەرنەكەوتنی لە هەڵبژاردنی سەرۆك كۆماریدا بەهۆی گوشاری حكوومەت سەرەتا چووە توركیە پاشان بەرەو ئاڵمان ڕۆیشت[1].

**محەممەد** ساڵح كە لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٥دا بەرچاوترین و بەهێزترین ركەبەری ئیسلام كەریم ئۆف بوو. لە یەكەمین دامەزرێنەرانی حیزبی بیرلیك و پاشان حیزبی ئیرەك بوو. **محەممەد** ساڵح لە ساڵی ١٩٤٩دا لە پارێزگای خوارەزم لە ڕۆژئاوای ئۆزبەكستان لە دایك بوو. پاش تەواوكردنی دواناوەندی لە ساڵی ١٩٦٦دا، چووە تاشكەندو بەهۆی سەرنەكوتنی لە چوون بۆ دامەزراوەی هونەری تاشكەند، چووە نێو ریزی سوپای سۆڤییەتەوە.

ناوبراو لەگەڵ سوپای داگیركەری سۆڤییەت بۆ چكسلۆواكی نێردراو بۆ ماوەی ٣ مانگ لە براتیلاوا ئەركەكانی سۆپای بەڕێوەدەبرد پاشان بۆ مەجارستان بەرێكرا. لە ساڵی ١٩٧٥ماوەی خزمەتی لە سوپادا تەووا كردو بۆ تاشكەند گەڕایەوە[2]. لە ساڵی ١٩٧٥دا، ساڵح وەك خوێندكاری پەیمانگای ڕۆژنامەوانی لە زانكۆی حكوومەتی وەرگیرا. ئەو بە درێژایی دەورانی خوێندنی دەستی بە هۆنینەوەی شیعرو وەرگێڕانی بەرهەمی ئەدەبی دەرەكی كرد.

ساڵح كاتێكی زۆری بۆ خوێندنەوەی "ئاگزیستانسیالیست"و بەرهەمەكانی ساتی، كامۆو كافكا تەرخانكردو تێزی كۆتایی خوێندنی لە بارەی "شێعری مۆدێڕنی فەڕانسە"یە. ساڵح بەشێك لەم بەرهەمەكانی بۆ سەر زمانی توركی ئۆزبەكی وەرگێڕاوەتەوە. لە هەمان كاتدا، بەرهەمی توركی "دەدەقوورقوت"و "یوونس عومەری" بۆ سەر زمانی ئوزبەكی وەرگێڕاوەتەوە وسەلماندوویەتی كە ئەوانە بەشێكن لە كولتووری ئۆزبەكی توركی. ساڵی ١٩٧٧ خاڵی وەرچەرخان بوو لە ژیانی (**محەممەد** ساڵح) دا. یەكەمین كتێبی شیعری لەلایەن خەڵكەوە بە باشی

---

(١) چەرەمی، پێشوو، لاپەڕەكانی ٩٩ ـ ٩٥

(2) Internet Source: Mirror: www. ummah. com/uzbakistan 2002-muslim Uzbakistan



پێشوازی لێكرا. ئەم بەرهەمە سەرەتای زەمەنێك لە شیعری ئۆزبەكی بوو كە بەناونیشانی "ڕێچكەی میتافۆرێكی" دەناسرێ. لە ماوەیەكی كورتدا ئەم كتێبە بە زمانی رووسی، ئۆكراینی، لیتوانی، ئەستونیو زاراوەكانی دیكەی توركی وەرگێڕدرایەوە. لە ساڵی ١٩٧٧، **محەممەد** ساڵح چوو بۆ مسكۆو بۆ ماوەی دوو ساڵ لە ئەنیستیتۆی باڵای ئەدەبی خەریكی خوێندن بوو. لە ساڵی ١٩٨٥دا ٥ بەرگی كتێبی شیعری بڵاوكردەوە و سێ كتێبیشی وەرگێڕایەوە. لە ساڵی ١٩٨٥دا، **محەممەد** ساڵح و هاوبیرە ڕووناكبیرەكانی لە نامەیەكدا بۆ گۆرباچۆف ڕەخنەیان لە كردەوەی حكوومەتی ئۆزبەكستان گرت كە بە چاوێكی سووك دەروانێتە بەها كولتوورییە نەتەوەییەكان. لە وەڵامی ئەم نامەیەدا، بەرهەمی ٥٣ نووسەرو شاعیری لاو كە ئەم نامەیان واژۆ كردبوو، قەدەغە كران. بەم پێیە، **محەممەد** ساڵح لە سەردەمی گلاسنۆست وەك زۆربەی ڕووناكبیرانی ناسیاسی بە پێچەوانەی ویستی خۆی هاتە ناو بازنەی سیاسەتەوە. ساڵح بەم جۆرە باس لەو سەردەمە دەكا: پێویستییە گرینگە سیاسییەكان پڕۆپاگەندەكان، خۆویستانەیە، بە پێچەوانە شیعر پێویستی بە زایەڵەی ئەوین و مرۆڤایەتی هەیە... . بۆیە ئێمە هاتینە ناو سیاسەتەوە، چونكە لە مێژووی هەر نەتەوەیەكدا، سەردەمێك هەیە كە دەبێ بۆ ئامانجە گشتییەكان دەست لە بەرژەوەندی تاك هەڵبگرین لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا. پاش ساڵی ١٩٨٥، ئێمە هاتینە نێو وەها سەردەمێكەوە. تا كاتی تێكچوونی یەكیەتیی سۆڤییەت، ئێمە بۆ سەربەخۆیی ئۆزبەكستان شەڕمان دەكرد، دواتر بۆ دابینكردنی دێموكراسی لە ئۆزبەكستان شەڕ دەكەین".

لە ماوەی ١٩٨٨دا **محەممەد** ساڵح وەك سەرۆكی یەكیەتیی نووسەرانی ئۆزبەكستان هەڵبژێردرا. یەكیەتیی نووسەران بوو بە ناوەندی نافەرمی دژبەرانی ڕێژیمی كۆمۆنیستی. **محەممەد** ساڵح و یەكیەتیی نووسەران بۆ وشیاركردنەوەی وڵات و پرسگەلی وەك ناچاركردنی دەوڵەت بۆ بە فەرمی ناسینی زمانی توركی وەك زمانی نەتەوەیی، بارودوخی ژینگە كە ڕێژیمی كۆمۆنیستی پێكی هێنابووو ئابووری تاكە بەرهەمی لۆكە كە خەڵك بەدەستییەوە دەیناڵاند، دەستیان دایە خەبات.

لە ئۆكتۆبری ١٩٨٨، كۆمیتەی ناوەندی حیزبی كۆمۆنیستی ئۆزبەكستان پێشنیاری بە **محەممەد** ساڵح كرد كە ئەندامەتی لەم حیزبەدا قبووڵبكا. ناوبراو ئەم پێشنیارەی ڕەت كردەوە و لە بەرانبەردا ڕێژیم، بۆ شكاندنی كەسایەتی ئەو لە ڕۆژنامەكاندا دەستی بە پڕۆپاگەندە كرد، بەڵام ئاكامی ئەم دنەدانە بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەكانی حیزبی كۆمۆنیست بوو.

خەڵکی ئۆزبەك و رووناکبیران لە دەوری محەممەد ساڵح کۆبوونەوەو پێشتیوانیان لێ دەکرد. ئەم هەڵوێست گرتنەی خەڵك ئەو دەرفەتەی بە محەممەد ساڵح و هاورێیانی دا کە لە ساڵی ١٩٨٩ تەڤگەر(اتحاد)ی خەڵکی (بیرلیك) پێکبێنێ.

بیرلیك یەکەمین جووڵانەوە بوو لە سەردەمی دەسپێکی حکوومەتی کۆمۆنیستی لە ئۆزبەکستاندا و وەك یەکەمین رێکخراوی سیاسی نافەرمی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست ناسراوە. لە ساڵەکانی ١٩٨٩ـ ١٩٩٠، رێژیمی ئۆزبەکستان بەهۆی دەسەڵاتی جووڵانەوەی بیرلیك ناچار بوو کۆمەڵێك چاکسازی بەفراوان بکا. لە هەڵبژاردنی پارلمانی ئەو کاتەدا، محەممەد ساڵح وەك پاڵێوراوی هەڵبژاردنی ئەساتیدی شاری تاشکەند ناسێندرا. ناوبراو ٨٩٪ دەنگەکانی بەدەست هێناو وەکوو نوێنەری خەڵك هەڵبژێرا. پەرەگرتنی خێرای جووڵانەوەی گەلی بیرلیك و بوونی بە رێکخراوێکی جەماوەری، بووە هۆی پێکهاتنی کێشەگەلی بەرفرە. بیرلیك بەرەبەرە لە رووناکبیران دوورکەوتەوە. ئەم تەڤگەرە پتر لە پێشوو بوو بە رێکخراوێك کە لە هەڵ تێکهەڵچوون لەنێو شەقامەکان بە دژی کاربەدەستانی فەرمی حکوومەتدا بوو. محەممەد ساڵح نیگەرانی خۆی لە پێوەندی لەگەڵ ئەم مەترسییە لە کۆبوونەوە گشتییەکانی حیزب لە ساڵی ١٩٩دا دەردەبڕی.

بەڵام رادیکاڵەکانی (توندرۆکان) حیزبی ئەویان بە کۆنسرواتیڤ تاوانبار دەکرد. لە ئاکامدا، محەممەد ساڵح لە بزووتنەوەکە جیابۆوە و حیزبی "ئازادی و دێموکراتیك"ی پێکهێنا. رێساو ئارمانجەکانی حیزبی دێموکراتیکی ئێرەك هەوڵدان بۆ دەستەبەر کردنی "سەربەخۆیی" بۆ ئۆزبەکستان بوو. محەممەد ساڵح ئەم راگەیەندراوەی لە پارلمان راگەیاند. پاش دوو رۆژ خەباتی پارلمانی، وێنەیەك لە راگەیەندراوەکە لە ٢١ی ژووئەنی ١٩٩٥ پەسند کراو وەك "راگەیەندراوی ئەرزی ئۆزبەکستان" راگەیەندرا. جیا لەم سەرکەوتنە، رێژیمی ئۆزبەکستان ئامادە نەبوو حیزبی ئێرەك وەك حیزبێکی فەرمی بناسێ.

ئێرەك لە ٥ی سێپتامبری ١٩٩١، پاش کودەتایەکی سەرنەکەوتووی ١٩ی ئاگۆست ناودێر کرا. یەك ساڵ و نیو دوای راگەیەندراوی یەکیەتیی ئەرزی، حیزبی ئێرەك بە خێرایی گەشەی سەندو لەنێو خەڵکدا خۆشەویستی بەدەستهێنا. ئەندامانی حیزبی بیرلیك و گرووپە سیاسییەکانی دیکە بەرە بەرە بە ئێرەکەوە پەیویست بوون. لەگەڵ هەوڵی رێژیمی ئۆزبەکستان بۆ بەستنی رەوگە پێوەندییەکانی ئەم حیزبە، لە دێسامبری ١٩٩١، حیزب توانی محەممەد ساڵح بە فەرمی وەك



پاڵێوراوی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری بناسێنێ. هەر بەو جۆرەی بەرهەڵستکاران چاوەڕوانییان دەکرد، لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا سەرۆك کۆمار بە خراپ کەڵك وەرگرتن لە پێگەی فەرمی خۆی، توانی بە گوشارو فێڵ کردن بە شێکی زۆر لە دەنگەکان بۆ خۆی کۆ بکاتەوە، هەروەها گشت رۆژنامە و راگەیەنە گشتییەکان پڕۆپاگەندەیان بۆ "کەریم ئۆف" دەکرد. لە خەباتێکی چل رۆژەدا، تەنیا ١٥ خولەك کاتی تەلەڤیزیۆنی بۆ محەممەد ساڵح تەرخانکراو ئەم کاتە کەمەیش وەبەر سانسۆڕ کەوت. سەرۆك کۆمار لە هەموو کەرەستە حکوومییەکان بۆ پڕۆپاگەندە بۆ خۆی کەڵکی وەرگرت لە کاتێکدا رکەبەری ئەو واتە محەممەد ساڵح هیچ جۆرە کەرەستەیەکی لە بەردەستدا نەبوو. حکوومەتی کەریم ئۆف رێپێوانە ئاشتیخوازانەکەی ئێرەکی شێواند. کۆمیسیۆنی هەڵبژاردنەکان بە تەواوەتی لەژێر رکێفی دەوڵەتدا بوون و سندووقەکانی دەنگ، بەپێی بۆچوونی چاودێرانی نێونەتەوەیی، دەستکاری کرابوون. لەگەڵ هەمووی ئەوانیش، لە یەکەم راگەیەندراوی ئاکامی هەڵبژاردنەکان، کە لە رادیۆی ئۆزبەکستانەوە بلاوبۆوە، ٣١٪ دەنگەکانی لە بەرژەوەندی محەممەد ساڵح راگەیەندرا، تەنیا کاتژمێرێك دواتر، رادیۆ رایگەیاند کە هەواڵی پێشوو هەڵە بووە، محەممەد ساڵح تەنیا ١٢/٦٪ دەنگەکانی بەدەستهێناوە. لە ئاکامدا، کەریم ئۆف سەرلەنوێ بۆ سەروك کۆماری هەڵبژێرایەوە. ناوبراو ١٨ رۆژ پاش هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری لە ١٦ی ژانوییەی ١٩٩٢ خۆپیشاندانی خوێندکارانی زانستگای نەتەوەیی لە تاشکەندی سەرکوت کردو لە درێژەی ئەم سەرکوت کردنانە ٢ خوێندکار کوژران، زۆر خێرا پاش ئەم رووداوە حکوومەت رێوشوێنی چڕوپڕتری بۆ سەرکوتی رێکخراوەکانی سەر بە ئێرەکی گرتەبەرو زۆربەی ناوەندەکانی حیزبی ئێرەك داخران.

لە سێی مارسی ١٩٩٢، بە رێبەری حیزبی ئێرەك، نوێنەرانی هێزە بەرهەڵستکارەکان "کۆبوونەوەی دێموکراتیکی ئۆزبەکستان"یان پێکهێنا. لەم کۆبوونەوەدا باس لەسەر هەڵوێستەکانی حکوومەت کرا. ١٥ کەس لە ئەندامانی سەربەخۆی پارلمان لەم کۆبوونەوانە بەشداریان کرد، پاش ئەم رۆنیشتنە، کەریم ئۆف پۆستی جێگری سەرۆك وەزیرانی بە محەممەد ساڵح پێشنیار کرد، هەروەها پێشنیاری تەرخانکردنی ٨ پۆستی دیکەی بە رێبەرانی حیزبی ئێرەکی کرد. محەممەد ساڵح و رێبەرانی ئێرەك لە مەڕ هەڵوێستەکانیان تونتر بوون. لە دووی جۆلای ١٩٩٢، بە نیشانەی نارەزایەتی دەربڕین لەمەڕ هەڵسوکەوتەکانی حکوومەت، محەممەد ساڵح دەستی لە نوێنەرایەتی پارلمان هەڵگرت.

له سەرەتای ئاگۆستی ١٩٩٢، پرۆفیسۆر دوكتور ئاتازاد ئارلۆپۆف، سكرتێری حیزب به تاوانی "هەوڵدان بۆ ڕێكخستنی كودەتا دژی حكوومەت" قۆڵبەست كرا. له مانگی دێسامبر، بڵاوكردنی ڕۆژنامەی حیزبی ئێرەك یاساغ كرا. ئەم هەڵسوكەوتانە، حیزبی ئێرەكی ناچار به هەڵسورانی نهێنیی كرد.

له ساڵی ١٩٩٣دا، هەڵسوكەوتەكانی حكوومەتی كەریم ئۆف دژی حیزبی ئێرەك چووه قۆناخێكی نوێوه. له مانگی ئاوریل، محەممەد ساڵح، سەرۆكی حیزبی ئێرەك به تاوانی "ڕێبەری كردنی كۆمیتەیەكی شۆڕشگێڕی" قۆڵبەست كرا. لەگەڵ ئەوەیشدا بەهۆی دژكردەوەی نێونەتەوەیی، ناوبراو له ٩ی ئاوریلی هەمان ساڵ ئازادكرا. پاش ئەم ڕووداوانە، دەرەتانی مانەوه له ئۆزبەكستان بۆ محەممەد ساڵح وەك ڕێبەری حیزبێكەی نەیار بەرتەسك كرایەوەو ناوبراو له نیوەی ئاوریلی ١٩٩٣ وڵاتی بەجێهێشت. ئەم كارەی ساڵح، كەریم ئۆفی له وەلانانی ئاستەنگ گەلێك كه حیزبی ئێرەك نوێنگەی بوو، پێداگرتر كرد. ئەندامانی پارلمانی حیزبی ئێرەك، لەوانه ئینجاماجان تورسونۆف، جەهانگیر محەممەد، ئیمام فەیزلەتیف، سەمەندەر قوقنانۆف، نەسروڵڵا سەعیدئۆف و موراد جەوازیف له پارلمان دەركران و دەسەڵات و ئیمتیازەكانیان لێسەندرانەوە. دانیشتنەكانی دادگا بۆ پێڕاگەیشتن به تاوانەكانی كەسی یەكەمی حیزبی ئێرەك ئاتازاد ئارییوف، ئەندامانی كۆمیتەی بەڕێوەبەری حیزبی ئێرەك، سەڵەوات عومەر زەقوف، سەرنووسەری ڕۆژنامەی ئێرەك، ئیبراهیم حەق ئەقولۆ نووسەری ڕۆژنامە، نەزەر ئەشانقول دەستپێكرد.

به كەڵكوەرگرتن لەدوور كەوتنەوەی ساڵح له ئۆزبەكستان، كەریم ئۆف بڕیاری وەلانانی ساڵحی له ڕێبەری حیزب دا، كەریم ئۆف شادی كەریم ئۆفی كه ئەندامی هەیئەتی بەڕێوەبەریی حیزبی ئێرەك و مامۆستای زانستگا بوو دیاریكرد، بەڵام له ٢٥ی سێپتامبری ١٩٩٣ له كاتی بەریوەچوونی كۆنگرەدا ئەندامانی كۆنگره شادی كەریم ئۆفیان له ژووری كۆنگره وەدەرناو سەرلەنوێ به تێكڕایی دەنگ محەممەد ساڵحیان بۆ سەرۆكایەتی حیزب هەڵبژاردەوە. وا بەرچاو دەكەوێ لەگەڵ دووربوونی ساڵح له نیشتمان، حیزبی ئێرەك بارودۆخێكی باشی هەبووە.

له سەرەتای ساڵی ١٩٩٣دا ڕۆژنامەی حیزبی ئێرەك سەرلەنوێ له مسكۆ بڵاوبۆوە. ئەم كاره سەرلەنوێ بووه هۆی هێرش كردنی حكوومەت بۆ سەر ئەم حیزبەو بنەماڵەی ساڵحو بنەماڵەی ساڵح له سنووری توركمەنستان دەست بەسەر كران. مەقسوود بكجان، براچووكەی



ساڵح، به تاوانی بەرنامەداڕشتن و بڵاوكردنەوەی ڕۆژنامەی ئێرەك قۆڵبەست كرا(ئەو له شاعیرانی لاوی ئۆزبەكستانه).

لەگەڵ هەمووی ئەم هەڕشەو سەركوتەكردنانەشدا، حیزبی ئێرەك ئێستاش درێژه به چالاكی خۆی دەدا. لەم بارودۆخەدا، محەممەد ساڵح و هاوكارانی بەدوای ئاڵترناتیڤێك بۆ حكوومەتی ئیسلام كەریم ئۆف بوون. ئەگەرچی ئەندامانی حیزب تووشی بەرتەسكییەكی توندن و زۆربەیان كەوتوونەته بەندیخانەوه بەڵام حیزبی دێموكراتیكی ئێرەك به ئاگا بوو لەم مەسەلەیەی كه ئۆزبەكستان، وەك كۆمارەكانی سۆڤییەتی پێشوو، له بارودۆخێكی دژواری گواستنەوەدان. لەو جێگای كه حكوومەت بەردەوام لەلایەن كۆمۆنیستەكانی پێشوو كۆنترۆڵ دەكرا، تا كاتی بوونی ئەم حكوومەته ئەنجامدانی چاكسازییەكانی جێی مەبەستی ئێرەك مومكین نییە. به وتەی ئێرەك كۆمۆنیستەكانی پێشوو دوورن له نوێگەری بۆیه ناتوانن میتۆدی بەڕێوەبردنی وڵات كه له سیستمی پێشوو ماوەتەوە، بگۆڕن، ڕەوشی هەمەلایەنەی خەڵك باش بكەن. بەم هۆیه پێویستی به بوونی هزرو باوەڕمەندی نوێ هەیە. حیزبی دێموكراتیكی ئێرەك جەختی لەسەر هەوڵەكانی دەوڵەت بۆ بەرهەڤ كردنی بازاڕی ئازاد دەكرد. داوای له حكوومەت دەكرد كه دەرەتانی بەشداریكردنی چالاكانه له بواری سیاسەت بۆ خەڵكی ئۆزبەكستان برەخسێنێ. ئەم حیزبه مافی مرۆڤی وەك بنەمایەكی سەرەكی له قەڵەم دەدا. ئۆزبەكستان گرینگترین ناوچەی ئاسیای ناوەندیەو پێشكەوتنو گەشەی ئۆزبەكستان كارتێكەرێكی سەرەكیو بناغەیی لەسەر چوار وڵاتی دراوسێی دادەنێ. ئەو سەقامگیریەی جێگای مەبەستی حكوومەتی ئێستای ئۆزبەكستان، به گوێرەی وتەی بەرپرسانی حیزبی ئێرەك، جۆرێك گەڕانەوه بۆ دواوەو پاشكەوتنی وڵات و ناوچەكەش پێشكەوتوویيەكی بەدواوه نابێ.

حیزبی ئێرەك له بەرنامەكەیدا ئارمانجەكانی بەم جۆره باس دەكا: سەربەخۆیی ئۆزبەكستان، سیستمی دێموكراتیكی فره حیزبی، بازاڕی ئابووری، كۆمپانیا تایبەتەكان و چاكسازییه سیاسییەكان.

له ڕوانگەی ئەم حیزبەوە، چاكسازییەكانی خوارەوه وەك یەكینەیەكی سەرەكی دەبێ لەبەرچاو بگیرێن:

١ـ پێكهێنانی حكوومەت، سوپاو كولتووری نەتەوەیی ئۆزبەكی.

٢ـ پێكهێنانی دامەزراوەی دێموكراتیك و سیستمی بەڕێوه بەری دێموكراتیك.

٣ـ دەستكاری لە سیستمی مووچەو دانانی ڕێژەی نرخ و سەرانەكان.

٤ـ تایبەتی كردنی زەویی كەلو پەلی بەرهەم كە هەنووكە لەژێر ركێفی دەوڵەت دایەو چاكسازی لە سیستمی بەڕێوەبەری كۆمپانیاكان.

٥ـ پەرەگرتنی بانك و بیمەو گۆڕینی سیستمی دەوڵەتی لە پێوەندی لەگەڵ بازاڕەگانی دەرەكی و بەرهەم.

٦ـ دامەزراندنی پێكهاتەیەكی یاسایی بە زووترین كات، وەك بەشێك لەژێرخانی نیزامێكی ئابووری بازاڕی ئازاد.(1)

**٣ـ حیزبی دێموكراتیكی گەلی ئۆزبەكستان (Peoples Democratic Party)**

پاش هەڵوەشاندنەوەی حیزبی كۆمۆنیست، لە پانزەی نوامبری ١٩٩١ حیزبی دێموكراتیكی گەلی ئۆزبەكستان جێی حیزبی كۆمۆنیستی گرتەوە. ئەم حیزبە كە هەنووكە حیزبی دەسەڵاتداری ئۆزبەكستانە، لە لایەن ئیسلام كەریم ئۆفەوە ڕێبەری دەكرێ. ئۆرگانی فەرمی ئەم حیزبە ڕۆژنامەی "ئۆزبەكستان ئاوازی"یە كە پشتیوانی لە سیاسەتەكانی دەوڵەت دەكا. خاڵی هاوبەشی حیزبی دێموكراتیكی گەلی ئوزبەكستان و بزووتنەوەی گەلی بیرلێك لە دژایەتی كردن لەگەڵ ئیسلامیخوازەكانە. هەنووكە ٤٨ كەس لە ئەندامانی ئەم حیزبە لە پارلمانی باڵای ئۆزبەكستان نوێنەرن. سكرتێری ئەم حیزبە عەبدولحافز جەلال ئۆفە(2).

**٤ـ حیزبی وەتەنی تەرەقیاتی**

حیزبی وەتەنی تەرەقیاتی پێش یەكەمین هەڵبژاردنی پارلمانی باڵای ئۆزبەكستان و لەلایەن یەكێك لە خزمەكانی سەرۆك كۆماری ئەم وڵاتە لە ١٠ی جوولای ١٩٩٢ دامەزرا. ئەم حیزبە بە هاتنە ئارای حیزبی عەدالەت پێگەی خۆی لەنێو نوێنەرانی پارلمان لەدەستدا. ئۆرگانی فەرمیان ڕۆژنامەی "وەتەن تەرەقیاتی"یە. ڕێچكەی حیزبی وەتەنی تەرەقیاتی بریتییە لە: دەستێوەردانی كەمتری حكوومەت لە ئابووری، گەشەی خێرا بەرەو لای بازاڕی ئازادو هاتنە سەركاری بژاردە ئابوورییەكان، هەروەها سەرمایەدارەكان و خاوەن پیشەسازییەكان.

لە كۆتاییدا پێویست وە بیرهێنانەوەیە كە بەپێی ماددەی ٥٧ یاسای بنەڕەتی ئۆزبەكستان، چالاكی حیزبە سیاسییەكان لەم وڵاتە ئازادە بەڵام لە هەمان كاتدا نابێ چەند بنەمایەك ببەزێنن، ئەم بنەما قەدەغە كراوانە بریتین لە:

(1) Ibid

(2) "Political Parties of Uzbekistan", see internet site: A:/eko/ uzbakistan/parties. htm



١ـ هەوڵدان بۆ تێكدانی ئاسایشی نەتەوەیی و یەكیەتیی خاكی وڵات.

٢ـ پەرەدان بە ئاریشە نەتەوەیی، ڕەگەزی، ئایینییەكان.

٣ـ گۆڕینی سیستمی یاسای هەبوو لە ڕێگای بە كارهێنانی توندوتیژییەوە.

٤ـ دەستدرێژی بۆ سەر سەرووەری و ئاسایشی خەڵك.

٥ـ دامەزراندنی هەر جۆرە حیزبی سیاسی لەسەر بنەمای ئایین و ئەتنیك.

٦ـ ئەنجام نەدانی چالاكی شاراوەو نادیار(1).

**٥ـ حیزبی ڕێنیسانسی نەتەوەیی تیكلانیش (Tiklanish Natinal Renessaince)**

ئەم حیزبە لە نۆی ژووئەنی ١٩٩٥ دامەزرا. ئەندامانی ئەم حیزبە پێكهاتووە لە ڕووناكبیران، هونەرمەندان، ئەدیب و زانست خوازەكان. حیزبی ناوبراو ١١كورسی لە پارلماندا هەیە. سەرۆكایەتی ئەم حیزبە لە ئەستۆی "ئیبراهیم كافۆرفە"و ناوەی ڕۆژنامەی فەرمییان "تیكلانیشی نەتەوە"یە"(2).

**٦ـ حیزبی سۆسیال دێموكراتی عەدالەت (Adalat Socialist Democratic Party)**

ئەم حیزبە لە ١٨ی فێورییەی ١٩٩٥ لە تاشكەند دامەزرا. ١١ كەس لە ئەندامانی حیزبی ئاماژەپێكراو لە پارلمانی باڵای ئۆزبەكستاندا نوێنەرن. سەرۆكی حیزب "ئورگۆن پولاتە" سكرتێری حیزب "تی. دامینۆف"و ناوی فەرمی ڕۆژنامەكەیان "عەدالەت"ە(3).

**٧ـ حیزبی فیداكاران (Fidakarlarorself – Sacrificers)**

ئەم حیزبە لە چواری ژانوییەی ١٩٩٩ دامەزراو زۆربەی ئەندامانیان هونەرمەندان، كرێكاران، بازرگانان، ڕووناكبیران و لاوان پێكی دێنن. حیزبی ئاماژەپێكراو ٥٤ كورسی لە پارلمانی بەدەستەوەیە لە ئاوریلی ساڵی ٢٠٠٠ لەگەڵ حیزبی وەتەنی تەرەقیاتی بەرەیان پێكهینا. سكرتێری حیزب ناوی "ئەختەم تورسونوف"ەو ناوی ڕۆژنامەی فەرمیان "فیدكەر یان (فیداكار)"و" وەتەن"ە(4).

(1) Ibid

(2) Political Parties of Uzbakistan", 25 December 1999, see Interner Site http:// A:/eko/ uzbakistan/parties. htm

(3) - http:/www. ummah. com/uzbakistan

(4) Ibid and see "Uzbek Election" in http://a:/eko/uzbekistan/bbu91429. htm

## ٨ـ حیزبی ئەلتەحریری ئیسلامی ئۆزبەکستان (Hizb-vl-tahriral-Islami=HTI)

لەگەڵ ئەوەی کە لەسەر حیزبی ئەلتەحریری ئیسلامی زانیارییەکی زۆر هەیە. بەڵام ئەم حیزبە لە ئاسیای ناوەندی نەناسراوە و لە روانگەی زۆربەی سیاسەتوانانی حکوومەتی ئۆزبەکستان، هێز، لێهاتوویی و بەرنامە بەرزە فرەییەکانی حیزبی ئەلتەحریری ئیسلامی بەو جۆرەکە پێویستە روون نییە.

حیزبی ئەلتەحریری ئیسلامی لە ساڵی ١٩٥٢ بناغەی لە لایەن باڵی فەلەستینی ناسراو بە "ئیخوان لمسلمین"دانرا. (باڵی سەرەکی ئیخوان لمسلمین لە ١٩٢٩ لە میسر دامەزرا. دامەزرێنەری حیزبی ئەلتەحریر ناوی تەفیەددین نەباحی[1] فەلەستینی بوو). نەباحی لە زانستگای ئەلئەزهەرو مامۆستای زانکۆی ئیلاهیات بوو. ناوبراو چالاکییە حیزبییەکانی بە سێ قۆناخ دابەشکرد:

١ـ پەروەردەو ناساندنی هزری کۆنی ئیسلامی.

٢ـ پێکهێنانی نەتەوە، کە لە رەوگەی پێکەوەژیان لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگای ئیسلامی پێکدێ

٣ـ بیچم گرتنی حکوومەتێك لەژێر چاودێری جێنشینی موسڵمان .[2]

کەسێکی دیکە بەناوی عەبدولکەریم زەلۆم ئەندامی دامەزرێنەرانی گرووپەکە بوو. دەستەی سەرەکی حیزب لە ئاڵمان (یان رەنگە لە وڵاتی ئوتریش (نەمسا) بوون. لقەکانی حیزبی ئەلتەحریر لە میسرـ توونیس، تورکیەو... چالاکییان دەکرد. ئارمانجی ئەم حیزبە دامەزراندنی جێنشین گەری بۆ جیهانی ئیسلامییە.

ئیدئۆلۆژی بنچینەیی ئەم حیزبە، لە ساڵی ١٩٨٩، لە کۆنفڕانسی نێونەتەوەیی لە میسوری ئەمریکا ئامادە کرا. بنەما سەرەکییەکانی ئەم هزرە تێکلاوێکە لە بناژۆخوازی ئیسلامیو دەستکەوتە پێشکەوتەکانی شارستانییەت. تێگەیشتنی ئەم حیزبە لە جیهاد، شەڕ بۆ جێنشین گەری، بڵاوکردنەوەی هزری ئیسلامیو ژیاندنەوەی سەرلەنوێی ئیسلامە. لە ساڵەکانی دواتر، ئیدئۆلۆژی سەرەکی چالاکی حیزبی ئەلتەحریرکە لە میسوردیدا باسی کرابوو، خۆی لە چوارچێوەی هەڵسووڕانی لقی ئۆزبەکستاندا پیشاندا[3].

(1) taghi-aldinal-Nabhani

(2) Seyyed Rassul Mousavi, "Islamic Morementsin Central Asia", Amu Darya, vol. 7, No. 14, spring 2003, P,33

(3) Internet http:/www. rferl. org. RFe/RL-may30,2002



رێکەوتی راستەقینەی دەرکەوتنی باڵی حیزبی ئەلتەحریر لەنێوان ساڵەکانی ١٩٩٥ تا ١٩٩٦دا باسی دەکرێ بەڵام کارتێکەری ئەم حیزبە لە ئۆزبەکستان لە ساڵی ١٩٩٢ەوە دەرکەوت.

لە ماوەی دەیەی ٩٠، لە وڵاتی ئۆزبەکستان گرووپگەلی بچووك و گەورە هاتنە ئاراوە کە بیروباوەڕی وەك حیزبی ئەلتەحریریان هەبوو. لە هەمان کاتدا، یەکەمین راگەیەنەکانی حیزبی ئەلتەحریر لە مزگەوتەکانی ئۆزبەکستان بڵاوبۆوە. هەڵسووڕاوانی ئیداری ناوچەیی لقی حیزبی ئەلتەحریر لە سەرەتای٩٠ەوە، دەستیپێکرد. ئامانجی یەکەم، پێکهێنانی گرووپی نهێنیی (ئەم مەسەلەیە دەرخەری ئەوە کە ئارمانجی حیزب رەگداکوتانە لە نێوخۆی وڵات بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ).

تۆیی یەکەمی پێکهاتەی ئەم حیزبە، شانەییە. هەر شانەیەك بریتییە لە پێنج تا حەوت کەس. بە بەرپرسی هەر شانەیەك پێیان دەگوت "مشەرەف". گشت ئەندامانی شانەکە تەنیا شانەی مشەرەفیان دەناسی کە ئەرشەد لە قۆناخی دواییدا جێی دەگرت. بەشداران لە شانەدا، زانست و زانیاری خۆیان لەمەڕ داب و نەریتەو مێژووی ئیسلام پەرە پێدەدەن و بەڵگەکانی ناوەوەی رێکخستن و رۆژنامەکانی حیزبی ئەلتەحریر لەنێو شانەدا دەخوێننەوە. ئەندامانی حیزب لەمەڕ پڕۆپاگەندە بۆ ئیسلام شارەزایی تەواویان هەیە. هەرچەند هێندێ جار وەك وتاربێژ چالاکی دەکەن و بە شێوەی سرووشتی لەنێو ئاخوندە فەرمییەکان کارتێکەریان کەمتر بووەو لە ئاکامدا ئاخوندە فەرمییەکان زۆر لەگەڵ ئەواندا نەبوون. دەبێ بە خێرایی بڵێین کە ئەندامانی شانە بە هیچ جۆرێك لە بواری نیزامییەوە، پەروەردە ناکرێن. حیزبی ئەلتەحریر زۆر دەروەستن بە مێتۆدگەلی ئاشتیخوازانە و لە مێتۆدی نیزامی کەڵك وەرناگرن بەم پێیە ئارمانجی سەرەکی حیزبی ئەلتەحریر دامەزراندنی جێنشینخوازی ئیسلامییە لە ناوچەی ئاسیای ناوەندی.

لەگەڵ ئەوەیشدا حیزب هەوڵنادا بۆ پێکهێنانی دەسەڵاتی ئیماراتی چاخەکانی نێوەڕاست (لە کاتێکدا حکوومەت وەها تومەتێك دەداتە پاڵ ئەم حیزبەوەو هەر ئیسلامی خوازێکی دیکە). ئارمانجی سەرەکی حیزبی ئەلتەحریر دامەزراندنی سیستمێکی کۆمەڵایەتی، سیاسیو ئابوورییە کە لەگەڵ رێوشوێنەکانی هەنوکە یەکدەگرێتەوە و دەستکەوتەکانی پێشکەوتووی کولتووری نائیسلامی لەگەڵ دابو نەریتە بەرچاوە ئیسلامییەکان واتە یەکسانی کۆمەڵایەتی، یەکیەتیی هێزە نامادییەکان و سرووشتییەکان، پاراستنی بنچینەی شەریعەتو... پێکەوە پەیوەست بکەن. ئەمە راستییەکە کەبە پێچەوانەی زۆر یەك لە بزووتنەوەکانی دیینی هاوتا لە

خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە. حیزبی ئەلتەحریر ترسی لە بۆچوونگەلی دەرەکی نەبووەو ئامادەیە لەگەڵ هەر جۆرە سیستمێکی هزری و ئیدئۆلۆژی دیکەیە بە مەبەستی راوێژکردن ئاڵوگۆری بیرو بۆچوونەکان دابنیشێ. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەمە بەو مانایە نییە کە حیزبی ئەلتەحریر پاشەکشێ لە بۆچوونەکانی دەکا. ئاشکرایە کە بناغەو چاوگی ئەم ئامانجە گۆڕینی رێژیمی ئۆزبەکستانە. ئەمە بەواتای کەڵك وەرگرتن لە کەرەستەی توندوتیژانە نییە. یەکێك لە رێگاکانی چالاکیان، پڕۆپاگەندەی چڕوپڕی ئیدئۆلۆژیانە بوو لەنێو موسوڵمانانداندا. چالاکی دیکەیان کارتێکەری لەسەر پێکهاتەی دەوڵەتیو نیزامی ئۆزبەکستانە کە بە شێوەی پەروەردەو ناسینی هەنگاو بە هەنگاوی بیروباوەڕی حیزبی ئەلتەحریر لەنێو بەرپرسانی دەوڵەتیو نیزامیدایە. دیارە هەنووکە نیشانەو دەرکەوتەکانی ئەم چالاکیانە بۆ هەموو لایەك ئاشکرایە. هۆیەکانی هاوکاری حیزبی ئەلتەحریری ئۆزبەکستان لەگەڵ گرووپە دژبەرەکانن بەو مەرجەیە کە ئەم هاوکارییە، حیزب لە گەیشتن بە ئارمانجە ستراتیژیکییە سەرەکییەکانی یارمەتی بدا[1].

کاتێك ئیسلام کەریم ئۆف رەخنەی لە دژبەرانی خۆی دەگرێ، زۆر جار ئەوانی بە لایەنگری کردن لە ئیسلامی خوازان، یان تەنانەت پشتیوانی لەوانە تاوانبار دەکرد. دوکتۆر عومران وەحید، وتەبێژی حیزبی ئەلتەحریر لە لەندەن لەو باوەڕەیە کە خەڵکی ئۆزبەکستان پشتیوانانی لە دامەزراندنی حکوومەتێك دەکەن لەسەر بنەمای تایبەتمەندییەکانی ئیسلامی[2].

لە هاوین و پاییزیساڵی ٢٠٠٠دا، حیزبی ئەلتەحریر لە پێکدادانەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە ئۆزبەکستان لە ناوچەی سەرخانی دەریای ئۆزبەکستان، بەشی بەتکانی قەرقیزستان لە ناوچەی فەرغانە بە شێوەی گشتی بەرگریان لە سنوورەکان دەکرد. تایر یوولڵداش لە رێبەرانی بزووتنەوەی ئیسلامی لەو بڕوایەدایە هەر چەند هیچکام لە ئەندامانی حیزبی ئەلتەحریر لە چالاکییەکانی نیزامی بەشدار نەبوون بەڵام هێندێ جار دەنگۆگەلێك لەمەڕ ئیمکانی دەستپێکی هاوکاری دەگەڵ HTIو IMUو یان تەنانەت تێکەڵ بوونیان بەگوێ دەگات. لەگەڵ هەموو ئەوانیشدا، بە هۆی دوو لایەنی لە حیزبی ئەلتەحریر HTI، ئەم یەکگرتنە بۆ ئەم گرووپە چارەنووس سازە، یان دەبێ گۆڕانکاری لە شێوازی میتۆدەکان قەبووڵبکەن و پێداگری لە "شەڕی پیرۆز" (جیهاد) بکەن یان بەرپرسایەتی ئۆپەراسیۆنی

(1) Europa Insight September 29, 2002-Internet Source: http/www. eurasianet. org
(2) Cenral Asia, "Islamic Mobilization and Regional Seeurity"ICG Asia Report. P. 8



سەربازی بزووتنەوەی ئیسلامی وەئەستۆ بگرن. حیزبی ئەلتەحریر بەریانێکی زۆری بۆ پەلەکردن لە بڕیاردان نەبوو. جگە لەوە، ئەم کردەوەیە دەتوانێ ببێتە هۆی لێك ترازانێکی دیکە لە حیزبی ئەلتەحریرو لاوازی بکا. لەبەر ئەوەی کە حیزب پێشتر ئەزموونی دوو جیابوونەوەی تاقیکردووەتەوە، یەکیان لە ساڵی ١٩٩٧دا، کە گرووپێك بە رێبەری ئەکرام یەجلەر لە حیزبی ئەلتەحریر جیا بۆوە، ئەوی دیکە لە ساڵی ١٩٩٩ روویداو "حیزبی النصرت" لە حیزبی ئەلتەحریر جیابۆوە. سەرکردەکانی حیزبی "النصرت" جەختیان لە سەر بەڕێوەبردنی ئۆپەراسیۆنی سەربازی چڕوپڕتر دەکردەوە و لەو بڕوایەدا بوون کە ئەگەر کردەوەو گوشارەکان بە سەر زانا ئیسلامییەکان لەلایەن حکوومەتەوە بەردەوام بێ، حیزب دەبێ لە بەرانبەر هێزی دەسەڵاتدار بەرەنگاری چەکدارانە دەستپێبکا. روانگەی حیزبی (النصرت) دەتوانین وەك ئامانجی راستەوخۆی کردەوەکانی تۆڕە شاراوەکانی ئۆزبەکستان لە قەڵەم بدەین کە بووە هۆی کەلێن و جیایی لە حیزبی ئەلتەحریرو دامەزراندنی بزووتنەوەیەکی رادیکاڵ لەنێو ئەندامانی ئەم حیزبەدا[1].

تۆڕە شاراوەکانی ئۆزبەکستان خوازیاری بەدواداچوونی چڕوپڕو قۆڵبەست کردنی ئیسلامی خوازانن، هەر چەندە ئەم جیاییە بووە هۆی لاوازبوونی ئیسلامی خوازانی ئۆزبەکستان بەڵام نەیانتوانی حیزبی ئەلتەحریر ناچار بە چاوپۆشی لە باوەڕەکانیان بکەن و گۆڕانێك لە کردەوەی سیاسی خۆیان پێکبێنن. راستییەکەی ئەوەیە کە بەرپرسانی ئۆزبەکی ناچارن بە شێوەی نافەمیدان بە حیزبی ئەلتەحریر وەك یەکێك لە دژبەرانی سەرەکی حکوومەت بنێن. هەتا رەنگە لەم رەوگەیەوە ناچار دەست بە پێوەندیگرتن لەگەڵ ئەواندا بکەن[2].

ئیسلام کەریم ئۆف دەستی لە دژایەتی کردنی حیزبی ئەلتەحریر هەڵنەگرتووە بەڵام بڕیاری ئەنجامدانی گوتارێکی بە پارێزەوە لەگەڵ لایەنگرانی ئەم حیزبەی داوە. شیاوی باسکردنە ئەم گوتارە لایەنی فەرمی نییە، بەڵکوو لەلایەن کومیتەی راوێژکارییەوە بەڕێوە دەچێ کە پراکتیك گەراکانی ئۆزبەکستان، نوێنەرانی زانا ئایینییە موسوڵمانەکانن[3]و زانایانی پێوەندیدار ئەندامی ئەوانن. ئەم کومیتەگەلە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ موسوڵمانان کردووەو کۆبوونەوە پێکدێنن و بۆ پشتیوانی نەکردن لە ئیسلامی خوازەکان هانیان دەدەن. لە هەمان کاتدا،

(1) http://www. hizb-ul-tahirir,org
(2) http://www. eaurasianet. org/resource
(3) http://www. kholifah. com

کومیتەکانی ئاماژەپێکراو لە ڕەوگەی ناسینی بارودۆخی دژبەرانیش چالاکی دەکەن. ئاکامی ئەم کردەوانە لە داهاتوودا دەردەکەوێ بەڵام لە ڕوانگەی حیزبی ئەلتەحریرەوە ئەم کردەوانە بە ئاکامێك گەیشتووەو حکوومەت ناچار بە گۆڕینی تاکتیکی خۆی بووە، لەگەڵ ئەوەی کە حکوومەتی ئۆزبەکستان لەگەڵ حیزبی ئەلتەحریر خاڵی هاوبەشی قەومی لە بەرچاو گرتووە بەڵام ئەم دەستەیە چوارچێوەی چالاکی خۆی تەنیا بە ئۆزبەکستانەوە کورت ناکاتەوە. بە پێچەوانەی تەڤگەری ئیسلامی ئۆزبەکستان کە لە دەستەی گرووپە تێرۆریستییەکانە. حیزبی ئەلتەحریر لە لایەن ئەمریکایشەوە خراوەتە ریزی گرووپە تیرۆریستەکانەوە. حکوومەتی ئۆزبەکستان ئەم حیزبە بە تیرۆریست و نایاسایی لە قەڵەم دەدا کە لەلایەن ئۆردون و وڵاتانی دیکەی ئیسلامی بودجەی ماڵییان دابیندەکرێ. هەروەها ئەم حیزبە لە لایەن حکوومەتەکانی قەرقیزستان و تاجیکستان نایاسایی ڕاگەیەندراوە. ئەم حیزبە لە قەرقیزستانیش چالاکی هەیەو لەلایەن هێندێك لە چین و توێژەکانی ئەم وڵاتە پشتگیری دەکرێ[1].

حیزبی ئەلتەحریر هەڵیداوە کە لە تاجیکستانیش چالاکی خۆی دەستپێبکا، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٠، حکوومەتی تاجیکستان ٥٠٠ تا ٦٠٠ کەس لە لایەنگرانی ئەم حیزبەی قۆڵبەست کرد. لەگەڵ ئەوەیشدا هێشتا ڕێژەی سەرکەوتنی حیزبی ئەلتەحریر روون نییە. بەڵام ئەم حیزبە یەکێکە لە فاکتۆرەکانی ژیانی سیاسی گشتی لە ئۆزبەکستان و تا ڕادەیەك لە وڵاتانی دراوسێشە. کاریگەری و کارتێکەری ئەم گرووپە تا ڕادەیەك بە ئەسپایی بەڵام پلە بە پلە دەڕواتە پێش و لە داهاتووی نزیکیش درێژەی دەبێ.

**٩ـ بزووتنەوەی ئیسلامی ئۆزبەکستان (movement of Uzbekistan)**

بزووتنەوەی ئیسلامی ئۆزبەکستان کە بەناوی حیزبی ئیسلامی تورکستان ناسراوە، حیزبێکی بناژۆخواز، نەتەوەخواز و جیایی خوازە. ئەم تەڤگەرە ئیسلامییە لە ساڵی ١٩٩٩ پێکهات.

ئەم گرووپە سەرەتا، ئارمانجی ڕووخاندنی حکوومەتی ئیسلام کەریم ئۆف و دامەزراندنی حکوومەتێکی ئیسلامییە. لە کاتی گۆڕینی ناوی خۆی بۆ حیزبی ئیسلامی تورکستان لە ژووئەنی ٢٠٠١دا، گرووپەکە ئامانجی سەرەکی دامەزراندنی حکوومەتی ئیسلامی لە ئۆزبەکستان و پاشان دامەزراندنی حکوومەتێکی ئیسلامی بۆ گشت ئاسیای ناوەندی کە

(1) Ibid



بریتییە لە قەزاقستان، قەرقیزستان، تاجیکستان، تورکمەنستان، ئۆزبەکستانو پارێزگای سین کیانگی چین[1].

بزووتەوەی ئیسلامی لە توندڕۆ میلیشیاکان پێکهاتووە کە بە شێوەی گشتی بە ڕەچەڵەك ئۆزبەکستانین بەڵام گشت نەتەوەو ئەتنیك و گرووپەکانی ئاسیای نێوەڕاست لە خۆ دەگرێ. ئەم گرووپە بەگشتی چالاکییە سەربازییەکانی لە ئاستێکی بەرتەسکدا بوو کە بریتی بوو لە مین چاندن، بارمتەگرتن و لە هەمان کاتدا، پلانیان بۆ هێرشی میلیشیاکان بۆ سەر قەرقیزستانو ئۆزبەکستان و تاجیکستان دادەڕشت. لەگەڵ ئەوەی کە، سەرەتای هێرشەکانی ئەم گرووپە تەنیا بۆ سەر ئۆزبەکستان بوو، بەڵام لەم دواییانەدا، ئۆپەراسیۆنی ئەم گرووپە نزیك سنوورەکانی قەرقیزستانیش بووەوە کە پێشاندەری پاوانخوازی ئەم گرووپە و ئاڵۆزکردنی سنوورەکانە. تەڤگەری ئیسلامی ئۆزبەکستان هێرشی بەربڵاوتری بەڕێوە بردووە بەڵام پاش هێرش کردن بەرەو لای گوندەکان و پاشەکشەیان دەکردەوە و بەجێی ئەوەی کە لە چیاکان خۆیان حەشار بدەن خۆیان وەك خەڵکی ئاسایی لێدەکرد. مەقەڕی سەرەکی ئەم گرووپە لە شیوی فەرغەنانە. دەبێ ئەوەمان لە بەر چاو بێ دەڤەری فەرغانە شوێنێکە زۆرترین ڕێژەی هەژاری لەخۆ گرتووەو لە ڕووی ئابوورییەوە یەکێکە لە دواکەوتووترین و بێبەشترین ناوچەی ئۆزبەکستان. لەگەڵ ئەوەی کە هەواڵەکان لە شوێن هێرشی بزووتنەوەی ئیسلامی بڵاودەبۆوە، لە ڕاستیدا ئیدئۆلۆژی ئەم گرووپە ئامادەکراو نییە و پتر لەسەر پێداگوژییە کولتووری ـ نەریتی ئیسلامی سوننەی حەنەفیو تا ڕادەیەك پشت بەستوو بە وەهابییە. بۆ ناسینی ئەم گرووپە جێی خۆیەتی کە بەتایبەتی لەگەڵ ڕێبەرانی سەرەکیو چالاکی ئەوان ئاشنا بین.

تاهیر یولداش: یولداش وەك سەرۆکی حیزبی عەداڵەتی ئۆزبەکستان هەڵبژێردراو لە فیورییەی ١٩٩٩ وەك یەکێك لە تاوانبارانی هێرش بۆ سەر گیانی کەریم ئۆف باسی لێدەکەن. لە مانگی مای ١٩٩٩ یۆڵداش مۆڵەتی دامەزراندنی فێرگەی پەروەردەی نیزامی لە باکووری ئەفغانستانی لە تالیبان وەرگرت.

جومعە نەمنەگانی: نەمنەگانی بەشداری لە شەڕی نێوخۆیی تاجیکستاندا کردووە. لە ئاگۆستی ١٩٩٩، ناوبراو گرووپێکی ٨٠٠ کەسی لە میلیشیای لە باشووری قەرقیزستان ڕێبەری کردو لەو ناوچەیە گوندێکی داگیر کردو چەند کەسێکی بە بارمتە گرتو هەڕشەی

(1) Internet: http:/www. rferl. org. RFE/RI-30may2002, Religoscope.

نیزامی لە حکوومەتی ئۆزبەکستان دەکرد. لە ئاگۆستی ساڵی ٢٠٠٠دا چەکدارانی بزووتنەوەی ئیسلامی، بە رێبەری تایر یۆڵداش لە باشووری ئۆزبەکستان لە ناوچەی کوێستانی تاشکەند کۆمەڵێك چالاکی نیزامیان کردو لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی باشووری قەرقیزستانیش کۆمەڵێك هێرشی قورسیان ئەنجامدا. لە جوولای ٢٠٠١ راپەڕیوەکان هەوڵیاندا کە ئێستگەی تەلەڤیزیۆنی قەرقیزستان کە بۆ قەرقیزستان و ئۆزبەکستان بەرنامەی بڵاو دەکردەوە، داگیری بکەن. نەمنەگانی تاکو ساڵی ٢٠٠١ پێگەی لە باکووری ئەفغانستاندا هەبوو. لە نوامبری ٢٠٠١دا یۆڵداش و نەمنەگانی هەردووکیان بە تاوانی مین چاندن لە فیورییەی ١٩٩٧ لە دادگای تاشکەندی ئۆزبەکستان لە نەبوونی ئەواندا بە مەرگ مەحکووم کران.

بزووتنەوەی ئیسلامی ئۆزبەکستان بوو بە بەشێك لە تۆڕی میلیشیای ئیسلامیو لەلایەن گرووپگەلی هاوتایی لە ئاسیای ناوەندی و باشووری پشتیوانی دەکران. رووسیە، چین و ئەمریکا لەو باوەڕەن کە تالبان، بە چێکردنی فێرگەی نیزامی و کەمپە نیزامییەکان یارمەتی ئەم گرووپەی داوە. بزووتنەوەی ئیسلامی، ئامانجی هاوبەشی بەربڵاوی لەگەڵ حیزبی ئەلتەحریردا هەیە، هەرچەندە حیزبی ئەلتەحریر لەمەڕ ئەم گرووپانە کەمتر لە مێتۆدگەلی توندوتیژانە کەڵك وەردەگرێ. تەڤگەری ئیسلامی لەلایەن لایەنگرانی بن لادەنەوە پشتیوانی ماڵیش دەکران.

شوێنگەی هەڵسووڕانی بزووتنەوەی ئیسلامی لە قەرقیزستان، ئۆزبەکستان و تاجیکستانە. ئەم گرووپە پێشتر لە شێوەی فەرغانە لە سنووری ئۆزبەکستان چالاکیان دەکردو لەلایەن دانیشتووانی خوجێیی پارێزگاری و پشتیوانی دەکران. بزووتنەوەی ئیسلامی، جگە لە باکووری ئەفغانستان و تاجیکستان، پێگەیەکی فەرماندەیی لە بەختانی قەرقیزستاندا هەیە. بۆ وێنە لە دێسامبری ٢٠٠٠، نەمنەگانی ٢٥٠ تا ٣٠٠ چریکی راهێنراوی بۆ کەمپی نوێ لە تاجیکستان گواستبۆوە.

رێژەی ئەم گرووپە نادیارە بەڵام چاوگە زانیارییەکان رێژەیان بە چەند هەزار کەسێك بەراوەرد کردووە. لەگەڵ هێرشی نیزامی بزووتنەوەی ئیسلامی ئۆزبەکستان، تۆڕەکانی ئەمنی قەرقیزستان لەو بڕوایەن کە ئەم گرووپە دەوریان لە قاچاخی ماددەی بێهۆشکەرەکان لە نێوان ئەفغانستان و ئاسیای ناوەندا هەیە.



بەپێی راپۆرتی تۆڕە ئەمنییەتییەکانی قەرقیزستان، جومعە نەمنەگانی کەسانێکی چەکداری بۆ چاودێری کردن بەسەرکاروانی قاچاخچییە ماددە سڕکەرەکان بەرەو قرقیزستان بەرێ کردووە تاکو لەم رێگایەوە سەرچاوەی ماڵی چالاکی نیزامی گرووپەکەیان دابینبکەن. بە سەرنجدان بەم بابەتە کە دوو لە سێی هێرۆئینی جیهان لە ئەفغانستان بەرهەم دەهێنرێ، سەرچاوە زانیارییەکان لەو بڕوایەدان کە چاوگی سەرەکی سەرچاوەی بزووتنەوەی ئیسلامیش، وەك گرووپی تاڵیبان، لە رێگای قاچاخی ماددە هۆش بەرەکانەوەیە.

**ب: رێکخستنی ئایینی**

رێکخستنی ئایینی لە ئۆزبەکستان بەسەر دوو رێکخراویی فەرمیی و نافەرمی دابەش دەکرێ. هەنووکە کاروباری ئایینی ئۆزبەکستان لەلایەن دوو رێکخراوی فەرمییەوە بەڕێوە دەچێ، یەکیان "ئیدارەی کاروباری ئایینی موسوڵمانانی ماوەرائەلنەهرە"و ئەوی دیکەیان "ئیدارەی بەها ئایینییەکان"ە.

**١ـ ئیدارەی کاروباری ئایینی موسوڵمانانی ماوەرائەلنەهر**

ئەم ئیدارەیە لە ٢٠ی ئۆکتۆبری ١٩٤٣ بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکە ئایینییەکانی موسوڵمانانی ئاسیای ناوەندیو قەزاقستان دامەزراو لە ساڵی ١٩٩٢ لە پێنجەمین کۆنگرەی موسوڵمانانی ناوچەی ئاسیای ناوەندیو قەزاقستان بۆ ئەم نێوە گۆڕدرا. ئیدارەی کاروباری ئایینی موسوڵمانانی ماوەرائەلنەهر سەرەتا رێکخراوێکی کۆمەڵایەتی بوو کە لە لایەن وەزارەتی دادەوە تۆمار کراو لە هەموو پارێزگاکان لقی هەبوو. ئەم ناوەندە ئەرکی دانی فتوا، چاپی بڵاوکراوە ئایینییەکان و دانان و لابردنی وتەبێژانی مزگەوتەکان لە ئۆزبەکستان وەئەستۆیە. دانان و لابردنی موفتییەکان لە ناوچەی ئاسیای ناوەندی تاکو ١٩٩٣ لە ئەستۆی ئەم ئیدارەیە بووە پاش ئەو رێکەوتە بە شێوەی سەربەست چالاکییان دەکرد. ئەم ناوەندە تەنیا لە پێوەندی لەگەڵ موسوڵمانان هەڵسووڕانی هەبووە.

**٢ـ ئیدارەی بەها ئایینییەکان**

ئەم ئیدارە لەسەر بڕیاری سەرۆك کۆمار لە مارسی ١٩٩٢ دامەزرا. لە راستیدا رێکخراوێکی حکوومییە کە ئەرکی هاوئاهەنگ کردنی پێوەندییەکانی نێوان کاروباری ئایینی لەگەڵ سازمانە دەوڵەتییەکان و تەنانەت دامەزراوەکانی نێونەتەوەییە. بەم پێیە ئیدارەی بەها ئایینییەکانی ئۆزبەکستان سیاسەتەکانی حکوومەت لە مەڕ کاروباری ئایینی بەڕێوە دەبا. یەکێك لە ئەرکەکانی دژایەتی لەگەڵ بێباوەڕی رێکخراوە حکوومییەکانە کە لە راستیدا بەمانای هەڵگرتنی شوێنەواری کۆمۆنیستی لە ئیدارە حکوومییەکانە.

ئەم ئیدارەیە پەیوەندی لەگەڵ گشت ئایینەکانی هەبوو لە ئۆزبەکستان پێوەندی ئەکتیڤی هەیەو نوێنەرانی گشت ئەوانەی لەخۆی گرتووە. لە راستیدا هانەی سەرەکی لە دامەزراندنی ئەم ئیدارە، لاوازکردنی ئیدارەی کاروباری ئایینی موسوڵمانانی ماوەرائەلنەهرە، چونکە لایەنی خەڵکەکەی پترە. لە گرینگترین بیاڤە زانستییەکانی ئەم وڵاتە دەتوانین ئاماژە بە "ئەنیستیتۆی باڵای ئیمام سمایلی بۆخار" لە تاشکەندو "خوێندنگەی میرعەرەب" لە بوخارا بکەین.

شیاوی ئاماژەیە کە لە ماوەی دەیەی رابردوودا دووگۆڕانکاری گەورە لە رێبەری رێکخراوەی بەڕێوەبەری زانایانی فەرمی موسوڵمانانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز رووی داوە. ئەم کارە پێشاندەری گۆڕانکاری سیاسی، ئایینی و کۆمەڵایەتییە لەم ناوچەیەدا بەتایبەتی لە کۆماری ئۆزبەکستان.

یەکەمین ئاڵوگۆڕ، گۆڕان لە رێبەری و دووهەمین ئاڵوگۆڕیش پەیوەستە بەدژایەتی لەگەڵ ناکۆجێیی لە پێکهاتەی ئیداری و ئایینی، ئەم راستیە پێشان دەدا کە سنووردارێژان لەنێوان ئیسلامی "فەرمی"و "نافەمی" واتای یەکەمی لەدەست داوە و بەجێگای ئەوە پرسی سیاسی بوون، یان یەکسانی گرووپە ئایینییەکان، کەوتوونەتە بەرباس.

یەکەمین گۆڕانی بەرچاو لە ساڵی ١٩٨٩ روویدا کە دواتر رێبەری دەستگای ئیداری ئایینی "شەمسەلدین قاری بابا قاریاباائۆف" جێگای خۆی بە "محەمەد سدیق محەمەد یوسف"دا. محەمەد سدیق کە خەڵکی ناوچەی نەمنەگان بوو لە تاشکەندو لە بوخاراو لیبی خوێندنی تەواو کردبوو بەدوای ئەمەدا لە فیوریەی ١٩٩٣ لە "کورلەتاری"(١) گشتی ئۆزبەکستان "موختار عەبدوڵلائۆف" لە رێگای هەڵبژاردن وەك رێبەری نوێی دەستگای ئیداری، ئایینی موسوڵمانانی ئۆزبەکستان لە جێی محەمەد سدیق دیاریکرا. هەڵبژاردنی موختار عەبدوڵلائۆف لە هێندێك رووەوە ناشیاویی مێتۆدی نەریتی دوو لایەنەی ئیسلامی فەرمی و نافەرمی لە سەردەمی سۆڤیەت وەبیر دەێنێتەوە. هەرچەند عەبدوڵلا ئۆف لە خوێندنگای میرعەرەب لە بوخاراو ئەنیستیتۆی تاشکەند خوێندوویەتی بەڵام ناوبرا ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵەی نەقشبەندییە. لە رووی مێژووییەوە کۆمەڵەی نەقشبەندی گرووپێکی ئەکتیڤی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای پێش سۆڤیەت و بە تایبەتی لەنێو خوێندەڤانان و بژاردەکانی کۆمەڵدا بوو. بۆیە پاساوەکانی "عەبدولجەبار

(1) kurultai



عەبدولوەحید ئۆف" رێبەری دەزگای ئیداری، زانایانی ئۆزبەکستان بەهۆی عەبدوڵلا ئۆف، هێندێك هەستی بناژۆخوازانەی لەنێو زانایانی ئایینی ئیسلامی فەرمی لاواز کرد.

لە کاتێکدا خۆی وەك ئیسلامییەکی میانەڕو پێشاندەدا بەڵام پشتیوانی لە لاگیری سیاسی هەیئەتی "ئەمناء"یش دەکرد(١).

**ج: رێخستنی نافەرمی و بناژۆخوازیی ئیسلامی**

لەپاڵ رێخستنە فەرمییە ئایینییەکاندا، بناژۆخوازە ئیسلامییەکانیش لە چوارچێوەی حیزب و رێکخراوەگەلی دیکە لە ئۆزبەکستان چالاکی دەکەن. هەرچەند حکوومەت چالاکی ئەوانی بە نایاسایی راگەیاندووە(٢).

هەروەك کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای ناڤین زانایانی ئایینی فەرمی پشتیوانیان لە بناژۆخوازی ئیسلامی نەدەکردو تەنانەت کێشەی ئایینی بەربڵاویش لە نێوانیاندا هەیە. لەو حیزبو رێکخراوە بەرچاوە ئیسلامییەکان کە لە راستیدا دژی حکوومەتن بریتین لە:

١- حیزبی دێموکراتیکی ئیسلامی.
٢- حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی.
٣- رێکخراوی یەکسانی ئیسلامی.
٤- حیزبی ئەلتەحریری ئیسلامی.
٥- جووڵانەوەی ئیسلامی ئۆزبەکستان(٣).

حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی، خوازیاری پێکهاتنی سیستمێکی ئیلاهییە لە ئۆزبەکستاندا. ئەم حیزبە دژی هەر چەشنە بیرۆکەی نەتەوە خوزانەیەو بە توندی دژایەتی لەگەڵ دەکەن. بە جۆرێك کە سکرتێری گشتی حزبی ژیانەوەی ئیسلامی لە لێدوانێکدا دەڵێ: "لە ئیسلامدا نەتەوە جێگایەکی نییە و ئەم ئایینە ئاسمانییە تەنیا لەنێوان موسوڵمان و کافر جیاوازی لە بەرچاو دەگرێ"(٤) رێژەوی ئەندامانی ئەم حیزبە لەنێوان ٤٠ هەتا ٥٠ هەزارکەس دایە.

(١) جۆئان گەراس، "پێناسەی کولتووری و ئایینی لە ئاسیای ناوەندی"، وەرگێڕانی مەحموود شووری، وەرزنامەی توێژینەوەی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ساڵی دووهەم، ژمارەی چوارەم، بەهاری ١٣٧٣ھ، لاپەڕەکانی ٩-٢١٧.
(2) the middele East (London), February1993, P36
(3) the Europa World Year Book 2002, (London:Europa Polications Ltd, 2003), p. 4337
(٤) سەید حوسێن سەیفزادە، "قەیرانی شوناسی نەتەوەیی لە وڵاتانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز"، وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ساڵی دووهەم، ژمارەی چوارەم، بەهاری ١٣٧٣ھ، لاپەڕەی ٧٧

حیزبی دادپەروەریی ئیسلامیش بە ڕێکخراوێکی خەڵکی بە ئەژمار دێت. بەتایبەتی لەلایەن لاوانەوە پشتگری دەکرێ. بە جۆرێك کە لەنێو ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە لاوانێکی زۆر هەن کە خۆیان وەکوو پارێزەرانی ڕەوشتی ئیسلامی دەناسێنن. حکوومەت چالاکی ئەم حیزبە ئیسلامییەی نافەرمی ڕاگەیاندووە و ڕێبەرانیانی قۆڵبەست کردووە. حیزبی ئەڵتەحریری ئیسلامی یەکێك لە حیزبە ئیسلامییەکانە. ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٨٠ چالاکی خۆی دەست پێکردووەو ئارمانجی سەرەکییان پێکهێنانی حکوومەتی ئیسلامی لە ئۆزبەکستان بە شێوەی جێنشینییە. ئەم حیزبە نزیکەی ٨٠ هەزار کەس ئەندامی هەیە. چالاکی حیزبی ئەڵتەحریری ئیسلامیش قەدەغە ڕاگەیەندراوەو دەستگیرکردنی ئەندامانیان درێژەی هەیە[1].

"جووڵانەوەی ئیسلامی ئۆزبەکستان"یش بە ڕێبەری تایر یۆڵداش خوازیاری پێکهێنانی حکوومەتی ئیسلامی لە ئۆزبەکستانە. ڕێبەری ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٢وە لە دەرەوەی وڵات ژیان دەکا. ئامانجی "لەنێوبردنی ڕێژیمی سیکۆلاری کەریم ئۆف و ئیجرا کردنی شەریعەتی ئیسلامییە لە ئۆزبەکستاندا"[2]. لە ساڵی ١٩٩٩ جومعە ئەمەنگانی لە فەرماندەیانی پلەی باڵای بزووتنەوەی ئیسلامی، خەباتی سیاسی خۆی لەگەڵ کەریم ئۆف دەستپێکردووە، ناوبراو هەنووکە نیشتەجێی کۆماری تاجیکستانە. حکوومەتی کەریم ئۆف هەر چەشنە دانووساندنێك لەگەڵ ئەم گرووپە ڕەت دەکاتەوەو تەنیا ڕێگای سەرکوتی تەواوی ئەندامانیان ئەم گرووپەی گرتووەتە بەر. لە ئاگۆستی ساڵی ٢٠٠٠ی زایینی نزیکەی سێ هەزار کەس لە خەڵکی تاشکەند بە مەبەستی دژایەتی لەگەڵ بناژۆخوازی ئیسلامی لەو شارە، هەیئەتێکی دژە تیرۆریستان پێکهێنا، بەتایبەتی حیزبی ئەلتەحریری ئیسلامی لەگەڵ نایاسایی بوونیشی، ئێستاش لە پارێزگای تاشکەند ئەکتیڤ ماوەتەوە.

هەنووکە حیزبی ئەلتەحریرو بزووتنەوەی ئیسلامی وەك دوو حیزبی توندڕۆ لە کۆماری ئۆزبەکستاندا بە ئەژمار دێن[3].

زیاتر لەوەی کە، ئەمڕۆکە ناوچەی فەرغانە لە ناوەندە بەهێزەکانی ئیسلامی خوازان لە ئۆزبەکستان بە ئەژمار دێ. ئەم ناوچەیە پاش دارمانی سۆڤییەت ناوەندی ڕاپەڕینو نائارامییەکانی ناو شارو ئیسلامی خوازەکان بووە کە لە سەردەمە جۆراوجۆرەکاندا

(1) B. B. C. Radio, Central Asian Surrey, 18joly2002
(2) B. B. C Word Service NEWS, 18 August 2000
(3) B. B. C Word Service NEWS, 29 August 2000



کەڵکیان لە تاکتیکی جۆر بە جۆری گرتووە، بە جۆرێك "کان. ئانی. سوبوکا" بە باشی باسی ئەو دەکات، "شێوی فەرغانە لە ڕاستای گەڕاندنەوە بۆ شوناسی نەتەوەیی خۆی دەڕوانێتە ئیسلام"[1].

### ٣ـ تورکمەنستان

#### (١ـ٣) سیاسەت و حکوومەت لە ڕەوتی مێژوودا

پێتەختی ئەم وڵاتە عشق ئابادە و لە شارە بەرچاوەکانی دیکە دەتوانین ئاماژە بە شاری مێژوویی مەرۆ بکەین. لە کۆتایی چاخی نۆزدەیەم ڕووسەکان سیاسەتی پاوانخوازانەی خۆیان لە وڵاتی هەنووکەی تورکمەنستاندا هێنایە ئاراوە، بەدوای ئەم سیاسەتانە بوو کە لە ساڵی ١٨٨١دا لەنێوان ڕووسەکان و تورکمەنەکاندا کۆمەڵێك شەڕی خوێناوی ڕوویدا کە بە شەڕی Tepegok ناسراوە. ئەم شەڕانە کوژرانی بیست هەزار کەسی لێ کەوتەوە کە بە سەرکەوتنی سوپای ڕووسەکان بەسەر ئەم وڵاتە کۆتایی پێ هات کە هەڵبەت ئەم کارە بە ڕەزامەندی بریتانیا جێبەجێ کرا. بەم شێوازە، ڕووسەکان زۆربەی تورکمەنەکانی خستە ژێر رکێفی خۆیەوەو ئەوانی لە تورکمەنەکانی دیکەی ژێر رکێفی بریتانیان جیاکردەوە. لە ڕەوتی شۆڕشی کۆمۆنیستی ١٩١٧یش، شۆڕشگێڕانی بلشویك زۆر هەوڵیاندا کە لە ناوچەی ئاسیای ناڤیندا لەوانە تورکمەنستان بە دەسەڵات بگەن، بەڵام خەڵکی خۆجێی زۆر کەم پشتیوانیان لێکردن نەك هەر ئەمە بەڵکوو حکوومەتی هەرێمی دژی بلشەویکیشی لەوبەری "کاسپین" پێکهێنا و بە گژ هێزەکانی ئینقلابیدا چوونەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، هێزەکانی بلشویك توانیان گشت ناوچەی ئاسیای ناڤین بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو لە ٣٠ی ئاوریلی ١٩١٨ کۆمارێکی خودموختاری سۆسیالیستی لە ناوچەکە پێکبێنن کە تورکمەنستانیش لەخۆ دەگرێ. هەر چەند لە مانگی ژووئیەی هەمان ساڵدا، ناسیۆنالیستەکان و دژە شۆڕشەکان بە هاوکاری هێزەکانی بریتانیا حکوومەتی بلشویکیان لە ناوچەکەدا ڕووخاندو حکوومەتێکی سەربەخۆو خۆجێییان لە عشق ئاباد دامەزراند کە لەلایەن پێگەیەکی نیزامی بریتانیاوە دەپارێزرا، بەڵام پاش کشانەوەی بریتانییەکان لە ناوچەکەدا ئەم حکوومەتە هەرێمییە بە

(١) بەرات شەمسا، "گەشەی ئیسلامخوازی لە ئاسیای ناوەندی"، ڕۆژنامەی ئیتلاعات، ١١ی ڕەشەمەی ١٣٧٨، لاپەڕەی ١٢

خێرایی تێکڕووخاو لە ساڵی ١٩٢٠ی زایینی سوپای سوور بە ڕێبەری ژنراڵ فرونز عشق ئابادی خستە ژێر ركێفی خۆیەوە.

شایانی باسە لەدوای ماوەیەك سۆڤییەتەكان كۆماری خودموختاری سۆسیالیستی توركستانیان لە ئاسیای نێوەڕاستدا هەڵوەشاندەوە و سنووری نوێیان لە ناوچەكەدا داڕشتەوە، لەم رووەوە لە ٢٧ی ئۆكتۆبری ١٩٢٤ی زایینی كۆماری سۆسیالیستی توركمەنستان هاتە ئاراوە كە بە بەشێك لە كۆمارەكانی یەكیەتیی سۆسیالیستی سۆڤییەت یەك لەوان كۆماری توركمەنستاندا دەستپێكرد. ئەم كارە بە زۆر نیشتەجێكردنی خەڵكانێك كە هەر بە شێوازی نەریتی خێلەكی مابوونەوە، جێبەجێ دەكرا. ئەم بە زۆر نیشتەجێ كردنە بە نۆبەی خۆی هەڵچوونی نیزامی دەورووژاند بەجۆرێك تاكو ساڵی ١٩٣٦ كۆمەڵێك شەڕی نافەرمی لە بەرانبەر هێزەكانی سۆڤییەتدا روویان دەدا. هەروەها لە ساڵی ١٩٢٨ی زایینیدا، ڕێبەرانی كۆمۆنیستی سۆڤییەت دژی دەسەڵاتداریی ئایین و دامەزراندنی بیچمە ئایینییەكان خەباتیان لە توركمەنستان دەستپێكرد. لەو ماوەیەدا گشت دامەزراوە ئایین زاكان بریتی بوون لە خوێندنگاكان و دادگاكان، مزگەوتەكان و شوێنە پیرۆزەكانی دیكە... داخران. جگە لەوە لە سەرەتای دەیەی ١٩٣٠دا رووناكبیران و زانایانی توركمەنی بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی سیاسی چڕتر خەباتیان دەكرد، كە زۆربەیان ئاخێندرانە بەندیخانەكان یان ئێعدام كران. ئەم پاكتاوە نزیك بە دەیەیەكی كێشا، تەنانەت كۆمەڵێك لە كاربەدەستانی حكوومیو بەتایبەتی ڕێبەرانی حیزبی كۆمۆنیستی توركمەنستانیشی گرتەوە، بە جۆرێك كە بەرپرسی هەیئەتی پارلمانی باڵای لە ساڵی ١٩٣٧ لەم پێوەندییەدا بە ئێعدام مەحكووم كرا. لە دەیەی ١٩٣٠ پەرەگرتنی پیشەسازی توركمەنستان لەچاو بەشی وەرزێری لاواز بوو، بە جۆرێك پڕۆژەگەلی سیستمی ئاودێری وەك تۆڕی كاراكیۆم و بەرهەمهێنانی لۆكەی لە كۆماری یەكیەتیی سۆڤییەت بڕەوی پێدرا. هەرچەند پێشهاتە ئیكئۆلۆژییەكانی بەسەر دەریاچەی ئاراڵ تراژدییەكی گەورەی بەجێ هێشت. هەروەها لە دەیەی ١٩٢٠، كۆچی رووسەكان بۆ ناوچەگەلی توركمەنەكان پەرەی گرت و ئەوان پۆستە سەرەكییەكانی ئەم كۆمارەیان بە دەستەوە گرت، تا شوێنێك رێژەی توركمەنەكان لەمەڕ كۆچبەرانی رووسی بۆ بەدەستهێنانی پۆستی حكوومەتی توركمەنستان بە خێرایی دابەزی بوو و ئەم كارە دژكردەوەی ژمارەیەك لە بەرپرسانی هەرێمی لێكەوتەوە، بە جۆرێك لە ساڵی ١٩٥٨دا بابایەف، ڕێبەری حیزبی كۆمۆنیستی توركمەنستان



پێشنیاری كرد، دەبێ توركمەنەكان پۆستی گرینگتر بەدەست بێنن تاكو ئەوان چارەنووسی خۆیان بەدەستەوە بگرن. ئەم پێشنیارەی بابایەف سەركردەكانی حیزبی كۆمۆنیستی سۆڤییەتی تووڕە كرد تا شوێنێك ناوبراو زۆربەی هاوكارانی لە حكوومەت دەركرد[1]. لە كۆتایی دەیەی ١٩٨٥یش بناغەییترین مەسەلەی كۆماری توركمەنستان لە رووی ئابووری، ژینگە و كولتوورییەوە شایانی هەڵسەنگاندنە. پێگەی توركمەنستان وەكوو دابینكەری كەرەستەی خاو ـ بەزۆری گازی سرووشتی و لۆكە- بۆ كۆمارە پێشكەوتووترەكانی سۆڤییەت بەتایبەت كۆمارە ئەوروپاییەكان جێگای پێزانین بوو بەڵام خەسارە ژینگەییەكانی هەروەها خەسارەتەكانی گرێدراو بە لەرادەبەدەر كەڵك وەرگرتن لە زەویی جووتیارییەكان بە تایبەتی هەڵگرتنی لە رادەبەدەری لۆكە ببوە تراژیدیایەكی خۆجێییو لەلایەن راگەیەنەكانی كۆماری توركمەنستان نارەزایەتی و مشت و مڕی لەسەر كرا. ئەم قەیرانی ژینگەیە لەگەڵ پرسی بەستراو بە زمان و مێژوو و كولتوور ببوە هۆی دڵساردبوونەوە لە یەكگرتنی توركمەنەكان لەگەڵ سۆڤییەت، هەر چەند دووربوونی جوغرافیایی ئەم كۆمارەو پێوەندییە زۆر نزمەكانی لەگەڵ بەشەكانی دیكەی سۆڤییەت پێشی بە هەر چەشنە هەوڵێكی یەكگرتووانە گرت، هەوەها دابەشبوونی بەردەوامی پێكهاتەی خێڵەكی ببوە هۆكاری ئەوە تاكو جووڵانەوەیەكی سەربەخۆ خوازانەی رەسەن وەك ئەو جووڵانەوەانەی كە لە شوێنەكانی دیكە هەبوون، لەم كۆمارە سەر هەڵنەدات. سەرنجنەدانی حیزبی كۆمۆنیستی توركمەنستان بە وەها پرسگەلێك، هەروەها گرینگی نەدان بە بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی ئازاد بووە هۆی ئەوە تاكو لە سێپتامبری ١٩٨٩ رووناكبیرانی توركمەن كۆبوونەوەیەك پێكبێنن و لەم بوارەدا بیر لە رێگا چارەیەك بكەنەوە.

ئەم رووناكبیرانە لە راستای وەها ئارمانجێكدا رێكخراوێك بەنێوی "ئاقازی بیرلیك"[2] یان دامەزران كە تێدا گرینگییان بە پرسگەلێكی وەك زمانی توركی، هونەرە خۆجییەكان، ئاریشە ئابوورییەكان و ژینگە دەدا. ئەم رێكخراوە واتە ئاقازی بیرلیك مانگێك پاش دامەزراندنی بە شێوەی فەرمی تۆمار كرا، هەرچەند لەگەڵ دژایەتی سەركردەكانی حیزبی كۆمۆنیست بەرەوڕوو بوو بەڵام لەبەر ئەوەی كە پشتیوانی لەم جووڵانەوەیە رۆژ بە رۆژ روو لە زیادبووندا بوو لە ژانۆیەی ١٩٩٥دا پێش بە چالاكییان گیرا.

(1) Ibid, P. 425
(2) Agybarilik or Unity Party

لە ساڵی ١٩٨٥ەوە ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیست لە پارلمانی باڵای تورکمەنستان زۆرینەی کورسییەکانیان بەدەستهێنا. سەفەر موراد نیازئۆفیش[1] وەکوو سکرتێری گشتیی حیزب بەرزترین پۆستی حکوومەتی تورکمەنستانی وەدەستهێنا. ناوبراو لە ساڵی ١٩٨٩ وەك سەرۆك کۆماری تورکمەنستانی یەکیەتیی سۆڤییەت هەڵبژێردرا. پاش سەربەخۆیی لە ٢١ی ژووئەنی ١٩٩٢ بە ٩٩/٥٪ دەنگەکان خولی سەرۆك کۆماری خۆی تاکو ساڵی ٢٠٠٢ نویێ کردەوە. جووڵانەوەی سەربەخۆیی خوازانە لە کۆماری تورکمەنستان لەچاو کۆمارەکانی دیکەی سۆڤییەت بە هۆکارگەلی جۆراوجۆر پاش کەوت، گرینگترینی ئەم هۆکارانە دەتوانین بەم جۆرە دەست نیشان بکەین: لاوازی جووڵانەوەکان و حیزبە سیاسییەکان، بەردەوامی رەوتی بڕیاردان بە شێوازی کوێخایەتی و خێڵەکی، لاوازی رابردووی مێژووی نەتەوەبوون، پەرەنەگرتوویی ئابووریو بەستراوەیی چڕوپڕی کۆماری تورکمەنستان بە حکوومەتی ناوەندی بۆ وەرگرتنی سۆبسید... هتد.

ئەم هۆکارانە لە راستدا بوونەتە هۆی ئەوە کە تەنەنات هێندێك لە رێبەرانی کۆماری تورکمەنستان بۆ مانەوە لە یەکیەتیی سۆڤییەت هەوڵبدەن، چالاکییەکانی نیازئۆف لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی یەکیەتیی سۆڤییەتدا، بۆ پاراستنی ئەم یەکیەتییە، یان دیاریکردنی قەوارەیەکی دیکە بۆ خۆیان بوو. باشترین بەڵگە بۆ ئەم شتە، لە مارسی ١٩٩١ی زایینیدا، ٩٥/٧٪ دەنگدەرانی تورکمەنستان خوازیاری پاراستنی یەکیەتیی

(١) سەفەر مورادئۆف لە ١٩ی فێورییەی ١٩٤٠ لە بنەماڵەیەکی کرێکار هاتە دونیاوە. ناوبراو لە ١٩٦٦ لە دامەزراوەی پۆل تکنیکی لینینگراد بوو بە ئەندازیارو لە ئیدارەی کارەبای "بزمین شایا" نزیك عشق ئاباد سەرقاڵی کار بوو، لە ساڵی ١٩٦٢ نیازئۆف بوو بە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست. لە ساڵی ١٩٨٥ کرا بە سەرۆکی شوورای وەرزێرانی تورکمەنستان، پاشان بوو بە سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیستی تورکمەنستان. پاشان لە ١٣ی ژانویەی ١٩٩٠ بوو بە سەرۆکی ئۆرگانی باڵای یاسادانان. لە ٢٧ی ئۆکتۆبری ١٩٩٠ ناوبراو وەك سەرۆك کۆماری سۆسیالیستی سۆڤییەتی تورکمەنستان دانرا. لەژێر رێبەری نیازئۆف لە ٢٧ی ئۆکتۆبری ١٩٩١ تورکمەنستان سەربەخۆیی بەدەستهێناو لە یەکیەتیی سۆڤییەت جیابۆوە. لە دووهەمین هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری کە لە ٢١ی ژووئەنی ١٩٩١ بەڕێوەچوو، نیازئۆف وەك سەرۆك کۆماری تورکمەنستان دیاریکرا. پاشان لەنێو تورکمەنەکانی جیهان نازناوی "تورکمەن باشی" واتە "رێبەری گشت تورکمەنەکان"ی پێ بەخشرا.



سۆڤییەت بە پێکهاتەیەکی نوێوە و چاوخشاندنەوە بەسەر ئەم پێکهاتەیە بوون. ئەم رێژەیە لەراستیدا بەرزترین رێژەی دەنگدەران لە هەمبەر کۆمارەکانی دیکەی یەکیەتیی سۆڤییەت بۆ پاراستنی ئەم یەکیەییە بوو[1].

## (٢ـ٣) گۆڕانکارییە سیاسییەکانی هاوچەرخ

حکوومەتی نیازئۆف لە هیچ کام لە راگەیەنە گشتییەکان نە لە کودەتای ساڵی ١٩٩٠ی رووسیە پشتیوانی کرد نە دژایەتی لەگەڵ کردن بەڵکوو لەم بوارەدا سیاسەتێکی پارێزەرانەیان گرتەبەر. هەڵبەت گرووپە دژبەرەکانی و رێکخراوی ئاقازی بیرلیك بە شێوەی گشتی دژی کودەتا بوون کە بووە هۆی قۆڵبەست بوونی هێندێك لە سەرکردەکانیان. لەگەڵ ئەوەیشدا، پاش شکستی کودەتا دیسان نیازئۆف لە دەسەڵاتدا مایەوەو رایگەیاند کە حیزبی تورکمەنستان بە پێچەوانەی کۆمارەکانی کە تێیدا حیزبی کۆمۆنیست هەڵوەشاوە راگەیەندراوە، وەك حیزبی دەسەڵاتدار دەمێنێتەوە. هەر چەند ئەم حیزبە لە مانگی دسامبری هەمان ساڵدا نێوی خۆی بۆ حیزبی دێموکراتیکی نەتەوەیی تورکمەنستان گۆڕی کە سەرۆکی هەیئەتی بەڕێوەبەریەکەی سەرلەنوێ نیازئۆف وەئەستۆی گرت. هەڵبەت لە ساڵەکانی سەرەتای دوای سەربەستی، کۆمەڵێك حیزبی دیکە وەك حیزبی دێموکرات، حیزبی ئاگزی بیرلیك (وەحدەت)و حیزبی دادپەروەری جووتیاران لەم کۆمارەدا پێکهاتن و دەستیان بە چالاکی کرد. بەڵام حکوومەتی نیازئۆف چالاکی ئەوانی یاساغ کردو زۆربەی لایەنگرانی قۆڵبەست یان دوورخرانەوە. نیازئۆف بۆ کۆنترۆڵی نەیارانی خۆی زۆر بە وردی دەجووڵایەوە. گرووپی دژبەری ئەو لەنێو حیزبدا زۆر لاواز بوون و لە بەراوەرد کردن لەگەڵ نیازئۆف توانایییەکی کەمتریان هەبوو. لە ١٨ی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٩١دا تورکمەنستان چووە ناو وڵاتە هاوبەرژەوەندییەکان کە پێکهاتووە لە چەند کۆماری سۆڤییەتی پێشوو، کە لە ٢٦ی ئۆکتۆبری هەمان سال خرایە بەر راپرسی گشتییەوە. بەڵام بەپێی راپۆرتە گشتییەکان، لەم راپرسییە گشتییەدا ٩٤/١٪ دەنگدەران دەنگیان بە سەربەخۆیی ئەم کۆمارەدا کەتێیدا ٢٧ی ئۆکتۆبری وەك رۆژی سەربەخۆیی نەتەوەیی دیاریکرا.

شایانی باسە کە لەنێو کۆمارەکانی ئاسیای ناڤین بەجێگەیاندنی سیاسەتی گلاسنۆست یان کەشی کراوەی سیاسی گۆڕباچۆف کەمتر لە تورکمەنستان بەرچاو کەوتووەو پێکهاتە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانی زۆر بە توندی بەرتەسك کراوەتەوە. بە جۆرێك تورکمەنستان یەکێك لە

(1) The Europan World Yaeare Book 2002, pp. 3993-3995

بەرتەسکترین سیستمەکانی چاودێری سیاسی لە ئاسیای ناوەندییە. کاروباری ئەم کۆمارە تاکو سەرەتای ساڵی ١٩٩٢ کە یەکیەتیی سۆڤییەت بە شێوەی فەرمی هەڵوەشێندرایەوە، لە چوارچێوەی "سیستمی سۆڤییەت"دا بەڕێوەدەچوو. واتە هەرچەند تورکمەنستان بە رواڵەت دامەزراوەی حکوومیو یاسا دانەری بوو، بەڵام کاروبارەکەی لە راستیدا لەلایەن راسپێراوانی جێی متمانەو هەڵبژێراوی بەرپرسانی ناوەندی مسکۆ لە چوارچێوەی گەڵاڵەیەکی کۆجێییو دەست نیشانکراوی دامەزراوەکانی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی سۆڤییەت بەڕێوە دەچوو[1]. نیازئۆف وەك رێبەرانی دیکەی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندی پاش تێکڕووخانی سۆڤییەت، سەقامگیری سیاسی بەسەر پەرەگرتنی دێموکراسی بە باشتر لە قەڵەم دەداو مەیلی بۆ لایٍ گەشەپێدان بە نیزامێکی سیکۆلار نیشاندەدا.

ناوبراو نیزامی سیاسی تورکیەی وەك نموونەیەکی لەبارو جێی پەسندی خۆی دەزانی، بەگشتی نیازئۆف رێچکەی نادێموکراتیك و پاوانخوازانەی گرتە بەر. ناوبراو بارودۆخی وڵاتەکەی بۆ هاتنەدی گەشەی سیاسی پێ باش نەبووو بەردەوام بەرژەوەندییە نەتەوەییو پەرەگرتنی ئابووری لە سەرەوەی گەشەی سیاسی لە قەڵەم داوە. بەم شێوازە، نیازئۆف بە پاڵپشتی سەرچاوەی نێوخۆیی، پێشگرتن بە گەشەی سیاسی کردە رێچکەی کاری خۆی، بەو جۆرە هەنووکە دەسەڵات لە تورکمەنستاندا لە پاوانی لایەنێکدایەو تەنیا نیاز ئۆف بڕیار دەدا. هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندی خێڵەکی تورکمەنەکان بەریانی سەرپێچی نەکردن لەسەرکردەکانەو بەردەوام خوازیاری دابینبوونی مووچەو ئاسایشی خۆیانن. کۆماری تورکمەنستان لەژێر ساباتی بەڕێوەبەری نیازئۆف لە سەردەمی تێپەڕبوونی ئابووری ـ کە شەپۆلی نائارامیو بشێوی زۆربەی وڵاتە سەربەخۆ نوێیەکانی لەخۆ گرتبوو ـ تەناهییەکی رێژەیی جێی سەرنجی بەسەر کۆمەڵگای تورکمەنیدا هێنایە ئاراوە. نیازئۆف بە دابەشکردنی پۆستە دەوڵەتییەکان لەنێوان هۆزەکان و هێنانەئارای رەزامەندی رێژەیی لەنێوان لایەنەکانی هێز، پیشانیداوە کە سیاسەتەکانی خۆی لەسەر بناغەی ناسینی کولتووری ناوچەکە جێبەجی دەکا. ناوبراو هاوکات لەگەڵ ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرۆك کۆماری و سەرۆك وەزیران، سەرۆکایەتی کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤیشی وەئەستۆیە.

(١) کۆمەڵە وتاری جوغرافیایی وڵاتانی ئاسیای ناڤین (تاران: ئینتشاراتی سەنتەری جوغرافیای وەزارەتی بەرگری)، لاپەڕەی ١٠١



ناوبراو هەوڵیداوە تاکو روخسارێکی دێموکراتیك و کراوە لەخۆی پیشانبدا. وەها هانەیەك ببوە هۆی ئەوە کە نیازۆف لە ئاوریلی ١٩٩٨ی زایینیدا ژمارەیەك لە زیندانییە سیاسییەکان ئازاد بکاو لە مارسی هەمانساڵیش نزیکەی ٢٥٠٠٠ زیندانی لە بەندیخانەکان ئازاد کران. سەرۆك کۆماری تورکمەنستان بەتوندی لەگەڵ هەر چەشنە جووڵانەوەیەکی سەربەخۆو دژی خۆی بەربەرەکانێ دەکات. هەرچەند پشتگیری گشتی لەو زۆر بەرچاوە بەڵام کۆمەڵێك رەخنەش لە هەمبەر دەسەڵاتخوازی لە سەرە. ناوبراو بۆ خۆدوورخستنەوە لە نارەزایەتی خەڵك وڵاتی وەك سەردەمی کۆمۆنیستی بەڕێوە دەبا، لەم وڵاتە ئاو، کارەباو گاز بە خۆڕاییە[1]. لە مانگی مای ١٩٩٩ی زایینی نیازئۆف بەڵێنیدا کە دەسەڵاتەکانی سەرۆك کۆماری کەم بکاتەوە، چوارچێوەی دەسەڵاتی دەزگاکانی یاسادانەرو دادوەر زیاتربکا. بەڵام ئەم بەڵێنیە تەنیا هەشت مانگ بڕی هەبوو، بە جۆرێك لە ٢٨ی دسامبری ١٩٩٩ لە کۆشکی "رۆحیت"، کوشکی نوێی بینکراو جێی کۆنگرەو کۆبوونەوەکان، سەرۆك کۆماری هەمیشەیی نیازئۆف و بە بەشداری پتر لە سێ هەزار کەس لە ئەندامانی شوورای بەرژەوندی گەلی، بەرپرسانی حکوومی، ریش سپییەکان و زانا ئایینییەکانی تورکمەنستان، گەڵاڵەی داڕێژراویان تاوتوێ کردو لە کۆتایی کۆبوونەوە سێ رۆژ دیاریکرا کە بە زیاد کردنی تێبینییەك بەپێی یاسای بنچینەیی، ئەم هەڵبژاردنە بە شێوەی تایبەتی بۆ "تورکمەن باشی" رەوایی هەبێ. ئەم رووداوە پاش سەربەخۆیی تورکمەنستان لە راستیدا گرینگترین رووداوی ئەم وڵاتە بە ئەژمار دێ[2].

کارێزما پەروەری نیازئۆف لە تورکمەنستان زۆر بەرچاوە، وێنەی ئەو لە هەموو شوێنێك وەبەرچاو دەکەوێ، لە شەقامەکان، گۆڕەپانەکان، فڕۆکەخانەکان و بەندەری کرانس دەسك لە قەراخ دەریای خەزەر بۆ نێوی تورکمەن باشی گۆڕانی بەسەر داهات کە تورکمەن باشی نازناوی سیاسی نایازئۆف بوو.

لە مانگی مای ١٩٩٩ زمانی تورکمەنی وەك زمانی فەرمی وڵات راگەیەندرا. لە راستیدا تورکمەنستان دوایین کۆماری سۆڤییەت بوو کەوتە ژێر سێبەری وەها یاسایەکەوە. بە جۆرێك لە هەمان ساڵدا بە خەڵکی تورکمەنستانیان راگەیاند کەڵك لە زمانی فەرمی وڵات بەجێی زمانی رووسی بگرن[3].

(١) رۆژنامەی ئیتلاعات، ١٣٧٨/١٠/٢٦

(٢) رۆژنامەی ئیتلاعات، ١٣٧٨/١٠/٢٧

(٣) حوسێن کەریمی، تورکمەنستان (تاران: دەفتەری توێژینەوەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٥)، لاپەڕەی ٦٤

شایانی باسە کە لە ساڵی ١٩٩٢ ڕێنووسی کۆنی عەرەبی لەگەڵ ڕێنووسی لاتین جێگۆڕکێی پێکرا کە ئەمەش لە ساڵی ١٩٤٠ لەگەڵ ڕێنووسی سریلیك جێگۆڕکێی پێکرا. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٣ ڕاگەیەندرا کە ڕێنووسی کۆماری تورکمەنستان بەرەبەرە لەگەڵ ڕێنووسی تورکی لەسەر بنەمای تورکی گۆڕانی بەسەردا دێ کە ئەم ئاڵوگۆڕە بە شێوەی فەرمی لە ژانوییەی ٢٠٠٠ی زایینی کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە.

لە ساڵی ١٩٩٨ کۆمەڵگا بەهۆی بەرزبوونەوەی گیرۆدەبوون بە مادده سڕکەرەکان، گەندەڵی کۆمەڵایەتیو تاوان لەگەڵ نیگەرانییەکی گشتی بەرەوڕوو بوو. سەرنجی سەرکردەکانی حکوومەتی تورکمەن یەك لەوان نیازئۆف بەدەوری مەعنەوییو گرینگیدان بە پەروەردەی ئایینی لە پێناو چاکسازی لە کۆمەڵگادا بەرز ببوو. بەتایبەتی نیازئۆف لە بەشێك لە کتێبەکەی "ڕۆحنامەی نیازئۆف" پرسەکانی مەعنەویی لەوانە هەڵسوکەوت و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بناغەی کولتوورو داب و نەریتی تورکمەنی تیشکی خستووەتە سەر. پێش ئەمەش واتە لە ساڵی ١٩٩٦ی زایینی نیازئۆف فەرمانی دابوو کە قورئان وەربگێڕدرێتە سەر زمانی تورکمەنی، هەرچەند کە ناوبراو لە مارسی ٢٠٠٠ی زایینی بڕیاری دابوو گشت ئەو چوارهەزار قورئانەی کە لەلایەن حاجی مەلا ئەحمەد وەرگێڕدرابوو ئاگری بدەن، نیازئۆف هۆی ئەم بڕیارەی گەڕاندەوە بۆ بوونی هەڵەی جۆراوجۆر لە وەرگێڕانی حاجی مەلا ئەحمەد[1].

لە کۆماری تورکمەنستاندا هەرچەندە بە هێمنیو ئەسپایی بەڵام بە شێوەی بەردەوام مەیل بۆ لای ئایین بەتایبەت لەنێو توێژی لاواندا، ڕوو لە زیادبوونە. بە جۆرێك لەبەرکردنی جلو بەرگی ئیسلامی لەنێو کچانی تورکمەندا ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ لایەنگری پتر دەبێ و بەشداری سەدان کچ بە جلوبەرگی ئیسلامی بۆ بەڕێوەبردنی نوێژی جەژنی ڕەمەزان لە ساڵی ١٩٩٩ لە مزگەوتەکانی عشق ئاباد دەرخەری ئەم ڕاستییەیە. بەڵام نیازئۆف دژایەتی لەگەڵ هەرچەشنە ئیسلامی سیاسیو بناژۆخوازی ئایینی دەکرد، بەو جۆرە کە ئەو لە ١٧ی دسامبری ١٩٩٩ی زایینی فەرمانێکی دەرکرد کە بەو پێیە تەواوی چالاکییە ئایینییەکان و ئایینزاکان لەژێر چاودێری ئیدارەی کاروباری ئایینیدا بێ. نیازئۆف لە ٢٨ی دسامبری هەمان ساڵیش کاتێك لەلایەن شووڕای بەرژەوەندی گەلی بە سەرۆکایەتی هەمیشەیی دیاریکرا، سووربوو لە سەر ئەوەی کە ئەو بە هیچ شێوەیەك دەرەتان بە پێکهێنانی حیزبگەلی ئایینی نادا[2].

(1) BBC. Radio Central Asian Surrey, 5 July 2000

(٢) ڕۆژنامەی ئیتلاعات، ١٣٧٨/١٠/٢٨، لاپەڕەی ١٢



لە ٢١ی دسامبری ساڵی ١٩٩١ تورکمەنستانیش لەگەڵ ١٠ کۆماری دیکە بەشێك لە واژۆکارانی بەیاننامەی ئالماتاتا بوو کە بەهۆی ئەم بەیاننامەیە CIS بە شێوەی فەرمی دامەزرا. ئەم بڕیارە دواتر لەلایەن شووڕای باڵای تورکمەنستان دەستکاری کرا. DPTیش بە سەر شووڕای وەرزێران و یەکیەتیی باڵای ئەم کۆمارە بە تەواوەتی زاڵبوو. ئەمە لە ڕاستیدا هەمان بارودۆخ بەبیر دێنێتەوە کە حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤییەت پێش تێکچوون تووشی ببوو، ئەم بارودۆخە لە ڕاستیدا کۆمەڵێك ڕەخنەی سەرەکی بەدواوە بوو کە لەوانە دەتوانین ئاماژە بە چاودێری کردنی چڕوپڕ بە سەر ڕاگەیاندنەکان، بەرتەسك کردنەوەی چالاکی هەڵسووڕاوانی دژبەرو سەرکوتی حیزبە سیاسییەکان، هەروەها ڕەخنە لەمەڕ بەرزبوونەوەی کارێزما پەروەری نیازئۆف بکەین.

ڕەخنەکان گەیشتە ئاستێك کە بووە هۆی دەست لەکار کێشانەوەی وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکمەنستان عەبدی کۆلیف لە مانگی ئووتی ساڵی ١٩٩٢دا. بەڵام بەو حاڵەش، پێکهاتەی کابینەیەك کە لە ١٨ی مای ساڵی ١٩٩٢ پێکهات پێش هەموو شتێك هێزی سەرۆك کۆماری پیشاندەدا، بە جۆرێك لەم کابینەیەدا نیازئۆف هەم ڕۆڵی سەرۆك وەزیرانیشی دەگێڕاو هەم ڕۆڵی فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی دەگێڕا. زێدەباری ئەوە ئاڵ و گۆڕی بنەڕەتی دیکە لەم قەوارەیە هەمان پێکهاتە نوێیی لێکەوتەوە، شووڕای باڵای تورکمەنستان دەبێ تێکەڵ بە هەیئەتی یاسادانانی ئەم کۆمارە ببێ، هەرچەند تاکو پێش خولی ٥ ساڵەی شووڕای باڵای تورکمەنستان کە لە ساڵی ١٩٩٥ هەڵبژێردرابوو، دەبوایە وەك پارلمانی کۆماری خوازان بمێنێتەوە. ئەمە لە کاتێکدا بوو ئەم شوورایە نێوی گۆڕدرا بە پارلمان. هەروەها شوورایەکی خەڵکی وەك دامەزراوەیەك بۆ بەشداری خەڵك پێکهات، ئەم شوورایە تەنیا دەبێ لە چوارچێوەیەکی چاودێری کاربکاو هیچ کات نابێ لە پانتایی هێزی سەرۆك کۆمار یان پارلمان کەم بکاتەوە. ئەم شوورایە دەبوایە لە ٥٠ نوێنەری پارلمان لەگەڵ ٥٠ نوێنەری هەڵبژێردراوی دیکە لە هەڵبژاردنەکانی بەشە جۆراوجۆرەکانی تورکمەنستانن دیاریبکرێ، ئەندامانی شووڕای پێشووی ڕاستەوخۆ لە نوامبری ١٩٩٢ هەڵبژێران. ئەم بڕیارە داگری ئەندامانی بەرچاوی کۆمەڵگای تورکمەنستانە وەك حکوومەتو سەرۆکی هەیئەتی بەڕێوەبەری دیوانی باڵاو کە سەرۆکایەتییەکەی وەئەستۆی سەرۆك کۆمارە. لە یەکەمین کۆبوونەوە کە لە نێوان دیسامبری هەمان ساڵدا، شوورا پلەی نیاز ئۆفی تاکو ژنراڵی بەرز کردەوەو بەردەوام دەسەڵاتی زیاتر دەکرد.

بەدوای وەها گۆڕانکارییەك ئەم ترسە دروستبوو کە مافی کەمینە ئەتنیکییەکانی نێو تورکمەنستان بکەوێتە مەترسییەوە. بە تایبەتی ئەم ترسە لەنێو دوو گرووپی گەورەی ئەتنیکی تورکمەنستان واتە رووسەکان و ئۆزبەکییەکان هەبوو کە بەدوای یەکدا ١٠ لە سەدو ٩ لە سەدی گشت حەشیمەتی ئەم کۆمارەی لە دەیەی ٩٠ پێکیان دەهێنا. چونکە لەو دیکۆمێنتەدا هاتبوو تەنیا تورکمەنەکان دەتوانن لە پۆستی حکوومی دابمەزرێن. نەك هەر ئەوە بەڵکوو زمانی رووسی ئیتر وەك کەرەستەیەکی پێوەندی نێوان قەومەکان کەڵکی لێ وەرنەدەگیراو زمانی تورکمەنی وەك زمانی فەرمی تورکمەنستان دیاریکرا. لەگەڵ ئەوەیشدا، تورکمەنستان ئەزموونی توندوتیژی لەنێو ئەتنیکەکان یان دەستێوەردانی ئایینی هەر وەك کۆمارەکانی دیکەی سۆڤییەت کە روویدابوو، هەبوو. لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەی خەڵکی تورکمەنستان موسوڵمانن، بەڵام یاسای سەرەکی سیکۆلاریزمی لەم وڵاتەدا بە فەرمی ناسیوە، مەسەلەیەك کە نیازئۆف بە توندی جەختی لەسەر دەکرد. تورکمەنستان لە کاتی سەربەخۆییەوە بە شێوەی حکوومەتێکی تاکە حیزبییە، بەڵام نیازئۆف لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٣ رایگەیاند کە ئیزنی چالاکی بە حیزبێکی دیکە بەنێوی حیزبی دادپەروەری جووتیاران دەدا تا وەك یەکەمین هەنگاو لە راستای پێکهێنانی سیستمێکی فرەحیزبیدا بێ. هەروەها لە دسامبری ١٩٩٤ هەڵبژاردن لە پارلمانی تورکمەنستان بەڕێوەچوو. بەپێی راپۆرتە هاتووەکان لەم هەڵبژاردنەدا ٤٩ نوێنەر لە ٥٠ نوێنەر بەبێ رکەبەر هاتنەوە ناو پارلمانەوە کە زۆربەیان ئەندامانی حیزبی دێموکراتیکی نەتەوەی تورکمەنستان بوون و ئەم حزبیە پەیوەستنە بە نیازئۆفەوە.

لەگەڵ بوونی راپرسی گەلی رواڵەتیو هەڵبژاردنی بێرکەبەر لە تورکمەنستان زۆربەی خەڵکی ئەم وڵاتە لەو بڕوایەدا بوون کە گرووپگەلی بەرهەڵستکارو دژبەرانی نیازئۆف لە تورکمەنستان بوونیان هەیە، بەڵام لە راستیدا وا نەبوو بەڵکوو ئەوان لە کۆمارەکانی دیکەی سۆڤییەتدا یەك لەوان رووسیە دوور خرابوونەوە، بە جۆرێك لە مانگی نوامبری ١٩٩٤ دوو ئەندامی رێبەری دژبەرانی حکوومەتی نیازئۆف کە دوور خرابوونەوە لەلایەن هێزەکانی پاراستنی رووسیەوە لە مسکۆ قۆڵبەست دەکرێن، حکوومەتی تورکمەنستان ئەم دوو کەسەیان بە پلان دارێژی بۆ کوشتنی نیازئۆف تاوانبار کردو داوای لە سەرکردەکانی رووسیە کرد کە ئەو تاوانبارە رادەستی وڵاتەکەی بکاتەوە. بەڵام گرووپە رووسیەکانی پشتیوانی مافی مرۆڤ بۆ پێشگیری لەم کارە دەستیان دایە رێپێوان و خوازیاری ئازادکردنی تاوانباران بوون و بەم شێوەیە



لە مانگی دسامبری ١٩٩٤ ئەوان ئازاد کران. لەگەڵ ئەوەیشدا، لە ژووئەنی ١٩٩٥ی زایینی دیوانی باڵای تورکمەنستان دوو کەس لە رێبەرانی دژبەر بە ١٢و ١٥ ساڵ زیندانی هاوکات کاری زۆرە ملێ لە کەمپەکاندا مەحکووم کرد. ئەوانی بە دەست تێدابوون لە پیلانی کوشتنی نیازئۆف تاوانبار کرد، بەڵام لە مانگی ژووئیەی هەمان ساڵ رێپێوانێکی گەورە لە عشق ئاباد لەلایەن گرووپە بەرهەڵستکارەکانەوە بەڕێوە چوو کە لە راستیدا یەکەمین رێپێوان و نارەزایەتی سیاسی لە تورکمەنستان پاش سەربەخۆیی ئەم کۆمارە لە ساڵی ١٩٩١ بووە. لەم رێپێوانە کە نزیکەی هەزار کەس بەشدار بوون، رەخنە لە گەشەنەسەندنی ئابووری وڵات، هەروەها چۆنییەتی رێبەری کردنی نیازئۆف و کارێزما پەروەریی نیازئۆف گیرا.

شایانی گوتنە کە لە مانگی ئووتی هەمان ساڵدا نیازئۆف لە بەرانبەر نائارامییەکانی مانگێك لەمەوپێشی تورکمەنستان - رێپێوانی ژووئیەی ١٩٥٥- دژکردەوەی نیشان داو ١٠کەس لە ٥٠ ئەندامی بەڕێوەبەری هەرێمی ئەم وڵاتەی لەسەر کار لابرد. لە مانگی ئۆکتۆبری هەمان ساڵ بە بەشداریکردن لە کۆبوونەوەیەکی شووراى گەلیدا، لابردنی ژمارەیەك لە ئەندامانی پلەبەرزی شوورای وەزیرانی راگەیاند. سەرۆك کۆماری تورکمەنستان لە کۆبوونەوەیەکدا سەرنجی هەموانی بۆ لای کەمکاریو کەم و کوڕیەکان لە ئیدارە حکوومییەکان راکێشا. لە هەمان مانگدا شوورای گەلی دووهەمین هێمای "قارەمانی تورکمەنستان" کە بەرزترین هێمای ئەم وڵاتەیە پێشکەش بە نیازئۆفی کرد، تەنانەت لە مانگی ژانوویەی ١٩٩٦دا ٢٧ کەس لە پێوەندی لەگەڵ خۆپیشاندانەکان کە لە مانگی ژووئیەی ١٩٩٥دا، زیندانی کران، هەرچەندە ٢٠ کەس لەوانە بەهۆی لێبوردنێکی گشتی ئازاد کران. هەروەها لە مانگی ژووئەنی ١٩٩٦یشدا نیازئۆف چەندین پۆستی بەرزی لە وەزارەتی بەرگری بە بیانووی گەندەڵی ماڵی و بەرتیل خواردن سەرلەنوێ دامەزراندەوە.

نەك هەر ئەمە بەڵکوو نیازئۆف وەزارەتی نەوت و گازی سەرلەنوێ دامەزراندەوەو ئاڵوگۆڕێکی بەرفرەی لە پرسیونێلیدا پێکهێنا. زیدەباری ئەوەش لە مانگی ژووئیەی هەمان ساڵدا سەرۆك کۆمار درێژەی بە لابردنی سەرکردە فەرمییە حکوومییەکان داو لەم راستایەدا دوو رێبەری بەڕێوەبەری هەرێمی لەسەر کار لابرد. لە مانگی ئووتی هەمان ساڵیشدا نیازئۆف ژمارەیەك لە بەرپرسانی فەرمی ناسراو لە وەزارەتی ناوخۆ بەهۆی درێژە کێشانی بشێوی لە بەندیخانەی مەروی (بەندیخانەی مەروی پێشوو) لە پۆستەکانیانی لابرد. لە ئاوریلی ١٩٩٧یشدا

سەرۆك كۆمار دادوەری گشتی ئەم وڵاتەی لەسەر كار لابردو فەرمانیدا گەڵاڵەیەكی سێ ساڵە بۆ هێنانە خوارەوەی ڕێژەی تاوان دابرێژن. لە مانگی ژووئەنی هەمان ساڵیشدا كۆمەڵێك لە ئەندامانی پلە بەرزی هێزی بەرگری و دادوەری لابرانۆ دانران، كە دیارە بەڕێوەچوونی ئەم پاكتاوە لە مانگی ژووئیە گەیشتە ئەوپەڕی خۆی.

لە سێپتامبری ١٩٩٧دا، سەرۆك كۆماری توركمەنستان بۆ چارەسەركردنی نەخۆشی دڵی سەردانی ئاڵمانی كرد. ناوبراو پاش چاكبوونەوە ئاڵوگۆڕێكی لە شوورای وەزیراندا پێكهێنا. لە فێورییەی ١٩٩٨یش نیازئۆف بە دەركردنی فەرمانی لێبووردنی گشتی حەوت هەزار زیندانی دیكەی بە بۆنەی ڕۆژی ئاڵای نەتەوەیی، هەروەها لەدایك بوونی سەرۆك كۆمار لە بەندیخانەكانی ئەم وڵاتە ئازاد كرد. ئەو لە هەمان كاتدا رایگەیاند كە بە نیازە پاش هەڵبژاردنی یاسایی دسامبری ١٩٩٩ زنجیرەیەك گۆڕانكاری لە یاسای بنەڕەتیدا پێكبێنێ، بۆ نموونە لە هێزو دەسەڵاتی سەرۆك كۆماری كەم بكاتەوەو بە پێچەوانە دەسەڵاتی پارلمانی ئەم وڵاتە پتر بكا، هەروەها رایگەیاند كە ئەو بە نیازە دەست لە پۆستی سەرۆك وەزیران هەڵبگرێو بیسپێرێ بە كەسێكی دیكە، پۆستێك هەرچەند تا ساڵی ٢٠٠٢ هەر لەبەر دەستی خۆیدا بوو.

پاكتاوی یەك لە دوای یەكی بەرپرسانی فەرمی وڵات لەلایەن نیازئۆفەوە تا مانگی مای ١٩٩٨ درێژەی هەبوو. راپەڕینێكی نیزامی گوماناویی و لەپێش داڕێژراو لە ڕۆژئاوای توركمەنستان كە لە سێپتامبری هەمان ساڵ ڕوویدا، بووە هۆی لاچوونی وەزیری بەرگری و ڕێخستنی سەلەنوێی ئەم وەزارەتە. بە جۆرێك كە لە هەمان مانگدا بەشێك لە فەرماندە نەتەوەییەكان لە پۆستی خۆیان لابران، هەروەها لە مانگی دسامبری ١٩٩٨دا، بەهۆی تێكچوونی رەشی هێمنی لە عشق ئاباد كۆمەڵێك كاربەدەست لەسەر كار لابران. لەوانە لابردنی پرسینۆلی وەزارەتی ئابووری و ماڵی تەنانەت لابردنی بەرپرسانی پۆلیسی ناو شارەكانو بەرپرسانی ئەمنی، لەگەڵ ئەوەیشدا كارێزما پەروەری سەرۆك كۆمار لە ساڵی ١٩٩٨ سەرلەنوێ بەرز بووەوە، بە جۆرێك كە لە مانگی ئۆكتۆبری هەمان ساڵ سێهەمین هێمای "قارەمانی توركمەنستان" درایە ناوبراو. هەڵبەت لە مانگی ئاوریلی ١٩٩٨دا نوێنەرێك لە ڕێكخراوی ئاسایش و هاوكاری ئەورووپا داوای لە نیازئۆف كرد كە هەشت هەزار زیندانی سیاسی كە بەشداریان لە ڕێپێوانی ژووئیەی ١٩٩٥ لە عشق ئاباد كردبوو ئازاد بكا،



نیازئۆفیش بۆ ئازادكردنی ئەوانە رەزامەندی دەربڕی. باس لەوە كراوە كە لە یەكەمین سەردانی فەرمی نیازئۆف بۆ وڵاتە یەكگرتووەكان، بیل كلینتۆن، سەرۆك كۆماری ئەوكاتی ئەمریكا، لەگەڵ ناوبراو لەپێوەندی لەگەڵ بارودۆخی مافی مرۆڤی توركمەنستان، هەروەها پێویستی بە چاكسازی سیاسیو ئابووری باس و وتووێژیان كردووە. دوای ئەم سەردانە ناسراوترین ڕێبەری دژبەرانی دوورخراوەی توركمەنستان واتە عەبدی كۆلێف بە شێوەیەكی چاوەڕوان نەكراو لە ئاوریلی ١٩٩٨دا گەڕایەوە وڵاتی خۆی. بەڵام هەر لە كاتی هاتنە ناوەوە بەتاوانی گێرەشێوێنی و گەندەڵی ئابووری قۆڵبەست كراو پاشان بەهۆی دەستێوەردانی رووسیە ئازاد كرا. دەگوترێ كە عەبدی كۆلێف خوازیارە پێش سەردانی نیازئۆف بۆ ئەمریكا چاوی بە نیازئۆف بكەوێ تاكو بە هەوڵی ئەو نیازئۆف ناچار بە چاكسازی سیاسیو هێنانە ئارای نیزامێكی دێموكراتیك بكا.

شایانی باسە لە گەڵ بوونی چاودێری چڕوپڕی حكوومەتی توركمەنستان بەسەر دژبەرانی سیاسی، لە مانگی ئووتی ١٩٩٦دا پتر لە سەد نوێنەر لە حیزبە نافەرمییەكان بە شێوەی نهێنی لە عشق ئاباددا كۆبوونەوەو لە كۆبوونەوەكەدا، حیزبی دێموكراتیكی كۆمەڵایەتی لە كۆی هێزەكان پێكهات، ئامانج لەم یەكگرتنە حیزبییە، یەك بوونی هێزە پرشو بڵاوەكان لە راستای دژایەتییەكی یەكگرتووانە لەگەڵ حكوومەتی نیازئۆف دا بوو.

لەپێناو كەمكردنی گوشاری ڕێكخراوە نێونەتەوەییەكانی مافی مرۆڤ، سەرۆك كۆماری توركمەنستان لە دسامبری ١٩٩٨ پێداگری لە سەر بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی داهاتووی پارلمانی ئەم وڵاتە لە كۆتایی ساڵی ١٩٩٩ دەكرد، بریاریدا كە دەبێ هەڵبژاردنەكە فرەحیزبی بێت و بەم پێیە چالاكی حیزبە سیاسییە نوێكان لەپێش هەڵبژاردن ئازاد كراو لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٩ نیازئۆف لە هەوڵێكی بەربڵاو بۆ سەلماندنی بەڵێنی خۆی لەمەڕ مافی مرۆڤ، دەرفەتێكی یاسایی بۆ سزای مردن دەستنیشان كرد كە ئەم خەڵك هەڵخەڵەتێنانەی لەگەڵ لێبووردنێكی چەند هەزاركەسی بەندكراودا درێژەی هەبوو. لە مانگی دسامبری هەمان ساڵ فەرمانی سزای مردنی راگرت و لە ئاكامدا توركمەنستان یەكەمین كۆماری ئاسیای ناڤین بوو كە سزای مردنی هەڵگرت، لە كۆتاییدا هەڵبژاردنی پارلمانی توركمەنستان لە ١٢ی دسامبری ساڵی ١٩٩٩ بەڕێوەچوو كە بەپێی راپۆرتە فەرمییەكان، نزیكەی ٩٩٪ بیاڤەكانی هەڵبژاردن لەم هەڵبژاردنە بەشدارییان كردبوو بەڵام بە پێچەوانەی لێدوانەكانی نیازئۆف و لەپێوەندی لەگەڵ فرەحیزبی بوونی هەڵبژاردنەكان و دامەزراندنی پۆلۆرالیزمی سیاسی كە پێشتر بەڵێنی دابوو، تەنیا

ڕێگایان بە حیزبی دێموکراتی تورکمەنستان دا کە لە هەڵبژاردن بەشداری بکاو تەنانەت ڕێکخراوی تەناهی و هاریکاری ئەورووپای (OSCE) لە چاودێری کردن بەسەر هەڵبژاردنەکاندا خۆی بوارد، بەو هۆیە کە دیکۆمێنتی تەواو بۆ دێموکراتیك بوونی هەڵبژاردنەکان لە ئارادا نییە. لە کۆتایی مانگی دسامبری هەمان ساڵدا پارلمانی هەڵبژێراو ریفۆرمی نوێی یاسای بنەڕەتی پەسند کرد کە بەم چاکسازییە ماوەی سەرۆك کۆماری نیازئۆفی بە شێوەیەکی دیارینەکراو درێژ کردەوە. ئەو بانگەشەکانی خۆی دووپات کردەوە کە بەڕێوەچوونی چاکسازی ئابووری و هینانە دی سیستمێکی دێموکراتیك گرێدراو بە بەردەوامی پلانی درێژخایەنی ١٠ساڵەیە. بەدوای ئەمەدا نیازئۆف لەو بڕوایە بوو کە نابێ چاوەوانی دروستبوونی حیزبە سیاسییە دژبەرەکان تاکو پێش ساڵی ٢٠١٠ بین، چونکە ئەم کردەوەیە کاتێك بە تەواوەتی دێتەدی کە هاووڵاتیانی تورکمەنی بگەنە ئاستی خودئاگایی سیاسی.

لەسەرەتای ژانویەی ٢٠٠٠دا تورکمەنستان بە شێوەی فەرمی ڕێنووسی لاتینی هەڵبژاردو لە هەمان کاتدا هەشت شاری ئەم وڵاتە وەك "کۆشکاو کراکی"سەرلەنوێ نێویان لەسەر دانرایەوە. هەروەها نیازئۆف یاسایەکی دانا کە تێیدا یەکەمین قۆناخی ریفۆرم لە پێکهاتەی بەڕێوەبەری تورکمەنستاندا، شیدەکردەوە. لە هەمان کاتدا نیازئۆف ژمارەیەك لە بەرپرسانی ناسراوی حکوومی بە بیانووی کەمکاری و نەبوونی شارەزایی لەسەر کار لابرد، لەوانە نوێنەری سەرۆك وەزیران، وەزیری وزەو پیشەسازی، هەروەها وەزیرانی کشت و کاڵ و کاروباری دەرەوە، پاشان هەمووبەرپرسانی فەرمی بۆ خولێکی تاقیکردنەوەی شەش مانگە هەڵدەبژێردران. نەك هەر ئەمە بەڵکوو لە ژووئەنی ٢٠٠٠ سەرۆك کۆمار دامەزراندنی شوورایەکی هاوبەشی بۆ چاودێری بەسەر خەڵکانی بیانی پەسند کرد، کە تێیدا دەسەڵاتی لێکۆڵینەوەی بە تورە ئەمنییەکانی تورکمەنستاندا کە هاتوچۆی ئەو خەڵکانەی کە سەردانی تورکمەنستان یان مەبەستی مانەوەی کاتییان هەیە، بکەن. جگە لەمەش گشت بەربژێرانی پۆستە گرینگەکان لە تورکمەنستان، دەبێ سێ پشت ڕەسەنایەتی تورکمەن بوونی خۆیان بسەلمێنن. لە مانگی ئووتی ٢٠٠٠یش دا یاسایەك دانرا کە بەو پێیە پۆلیسی دادوەری گشتی وڵات بە بێ مۆڵەتی نووسراوەی سەرۆك کۆمار یان شوورای وەرزیران مافی ئەوەیان نییە بچنە ناو ماڵی هاووڵاتیانەوە. لە کۆتایی ئۆکتۆبری هەمان ساڵیش سەرۆك کۆمار فەرمانی لێبووردنی گشتی بۆ ١٠هەزار زیندانی دەرکرد. لە کۆتاییدا لەنێوان فیەوریەی ٢٠٠١ ئیازئۆف ڕایگەیاند کە بە



نیازە کە لە ساڵی ٢٠١٠دا دەست لە کاروباری حکوومی هەڵبگرێ و خانەنشین بێت، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕێوشوێنی چڕوپڕتر بۆ پاڵێوراوانی داهاتووی سەرۆك کۆماری دیاریبکا.

پرسەکانی جێی سەرنجی ڕۆژئاواییەکان لە تورکمەنستان جیا لە ئابووری، بۆ لای تەوەرەکانی دێموکراسی، کەشی کراوەی سیاسی، ئاینو مافی مرۆڤ بوو، بە جۆرێك کە لە ٦ی ژانویەی ١٩٩٩دا هەیئەتێك لە ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا چاویان بە نیازئۆف کەوت کە مژاری وتووێژەکانی هەردوولا مافی مرۆڤ، ئازادییە سیاسییەکان، لەبەرچاوگرتن و جێبەجێکردنی یاساو لە کۆتاییدا کردنەوەی فەزای سیاسی بوو. بەدوای ئەم چاوپێکەوتنە، واتە دەرۆژ دواتر بە فەرمانی سەرۆك کۆمار سزای ئیعدام لەم وڵاتە هەڵگیرا، هەروەها بە هۆی گوشاری ڕۆژئاوا زانکۆیەکی مافی مرۆڤ، دێموکراسی لەژێر چاودێری سەرۆك کۆمار پێکهات. لەگەڵ ئەویشدا نیازئۆف تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٩ ڕاسپاردەکانی ڕێکخراوی ئاسایشی و هاوکاری ئەورووپای لە پێوەندی لەگەڵ دێموکراسیو دانی ئازادییە سیاسییەکان پشت گوێ خست.

لە ٢٨ی سێپتامبری ١٩٩٩ جارێکی دیکە هەیئەتێك لە ڕێکخراوی تەناهی و هاوکاری ئەورووپا بە سەرۆکایەتی "کێنت و ولبك"، وەزیری کاروباری دەرەوەی نوروێژ، سەردانی عشق ئابادیان کرد. ئەم وتووێژانەش وەك خولی پێشوو لەسەر تەوەرەکانی مافی مرۆڤ و ئازادییە سیاسییەکان بوو، وباسیان لەسەر چۆنییەتی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی پارلمانی ١٢ی دسامبری ١٩٩٩و چاودێری ئەم ڕێکخراوە بەسەر هەڵبژاردنەکاندا دەکرد. نیازئۆف لەم وتووێژانەدا بە ڕاشکاوی تەواوەوە خواستەکانی ئەورووپا لەمەڕ دێموکراسی لە وڵاتەکەی دا ڕەت کردەوە[1]. ناوبراو بە نوێنەرانی ئەورووپای گوت کە ئاریشە هەنووکەییەکان هی سەردەمی کۆمۆنیستەکانە و ڕۆژئاوا نابێ چاوەڕوانی ئەوەی هەبێ لە ماوەی ١٠ ساڵ دێموکراسی لە وڵاتێکی نوی جێگیر بێت. ئەو پشتیوانی لە سیاسەتی قۆناخ بە قۆناخ بۆ جێگیرکردنی دێموکراسی لەو لاتەکەیدا دەکاو لەو بڕوایەیە کە ڕاسپاردەکانی ڕۆژئاوا لەم پێوەندییەدا، تورکمەنستان بەرەو زەلکاوێکی خراپ دەبا. لە کۆتاییدا هەڵبژاردنی پارلمانی لە ١٢ی دسامبری ١٩٩٩دا لە کەشو هەوایەکی هێمن بە دوور لە هەر چەشنە کەش و هەوایەکی رکەبەریانە بەڕێوەچوو.

ڕێکخراوی ئاسایش و هاریکاری ئەورووپا لە بەرانبەردا نارەزایەتی لە مەڕ چۆنییەتی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکە پێشاندا و لە ناردنی هەیئەتێکی چاودێری، خۆی بوارد

(١) ڕۆژنامەی ئیتلاعات ٢٩/١٠/١٣٨٧، لاپەڕەی ١٢

هەڵبژاردنەکەی نادیموکراتیك لە قەڵەم دا. نیازئۆفیش لە دژکردەوەدا رەخنەی لەم هەڵویستەی ئەم ریکخراوە گرت، و گوتی ئەو ناخوازێ ولاتەکەی بە شێوەی رۆژئاواییەکان بەرێوە ببا. راگەیەنەکان و چاپەمەنی تورکمەنەکان هاودەنگ لەگەڵ سەرۆك کۆمار بەرێوەچوونی ئەم هەڵبژاردنەیان بە بێ هیچ چەشنە سەرپێچی کردنێك راگەیاندو ئەمەیان وەك سەرکەوتنێکی گەورە بۆ کۆماری تورکمەنستان و رێبەرەکەی لە قەڵەم دەدا[1].

لە هەمبەر ئەو بابەتانەی کە رۆژئاواو تورکمەنستان لە پێوەندی لەگەڵ دێموکراسیو ئایین مشتومڕیان لە سەر دەکرد وەها بەرچاو دەکەوێ کە نیازئۆف لە هەوڵی ئەوەیە کە دێموکراسی لە گەڵ داب و نەریت و کولتوورو ئایینی ولاتەکەی بگونجێنێ. رۆژئاواییەکان بەتایبەتی ئەمریکا پشتیوانیان لە دەسەلاتی ئایینی تورکمەنستان دەکرد، بەلام بە پێچەوانەوە بەردەوام رەخنەیان لە نەریتی بوونی دێموکراسی واتە سیستمێك لەسەر بنەمای داب و نەریتە خێلەکییەکان دەگرت. نیازئۆف لە ئاوریلی ساڵی ٢٠٠١دا، ئۆپێرو شانۆی باڵەی داخست، چونکە ئەوەی بۆ کولتووری تورکمەن بە نامۆ لە قەڵەم دەدا، ناوبراو بە پێچەوانەوە پەرەی بە موسیقای نەتەوەییو شانۆی درامی دا تاکو بەم کارەی هونەری نووسەرانی تورکمەن گەشە پێبدا. لە مانگی ژووئەنی هەمان ساڵیشدا یونیفۆرمێکی نوێ بۆ خوێندکارانی تورکمەنستان دیاریکرا.

لە مانگی ئۆکتۆبریش نیازئۆف چەندین بەرگ لە کتێبی رۆحنامە (Rukhnama)ی بلاوکردەوە. لە هەمان مانگ شوورای بەرزەوەندی گەل (Khalkmaslakhaty) پێنجەمین هێمای شانازی قارەمانی تورکمەنستانی بە سەرۆك کۆمار بەخشی.

لە جوولای ساڵی ٢٠٠١یشدا باتین بەندیف (Batyn Bandiyer) بەهۆی کەمکاری لە پۆستی وەزارەتی دەرەوە لابراو بەجێی ئەو رەشید مەرپۆف (Rashid Marpov) دیاریکرا. هەروەها لە کۆتایی هەمان ساڵدا وەزیری پێشووی دەرەوە شێخ موراد ئۆف (Shekhmuradov) لە پۆستی خۆی واتە نوێنەرایەتی گەلی چین لابرا، ناوبراو بەهۆی دەرکردنی بەیانێك بە دژی نیازئۆفی، بۆ مسکۆ دوورخرایەوە. هەڵبەت دەبێ بزانین کە شێخ مورادئۆف تەڤگەرێکی دێموکراتیکی بە ئامانجی وەلانانی نیازئۆفی پێکهێنا، لە سەرەتای

(١) رۆژنامەی ئیتلاعات ١٣٧٩/١/٣١، لاپەڕەی ١٢



فیەوریەشدا، نوور محەممەد حانازئۆف لە بالوێزخانەی تورکمەنستان دەستی لەکار کێشاندەوە تاکو پەیوەست بێ بەم جوولانەوە بەرهەلستکارە. لەنێوان ئەم مانگەشدا جێگری پێشووی سەرۆك کۆمار، خودای بەردی ئارازۆف (Khuday berdy arazov) کە لە تاراوگە ژیانی بەسەر دەبرد، پشتیوانی خۆی لەم جوولانەوەیە دەربڕی. لە مانگی مای هەمان ساڵیش ئالکساندەر دۆدۆئۆف (Aleksander dodonev) جێگری پێشووی سەرۆك وەزیران و بالوێزی تورکمەنستان لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پشتیوانی لەم جوولانەوەیەی کرد. لە دژکردەوەدا بەرپرسانی تورکمەنی بڕیاری لابردنی خامانۆف (Khamanov)یان داو ئۆرازۆف Orazovیشیان بە بیانووی گەندەلی لە سامانی حکوومی تاوانبار کرد. هەروەها دیسان نیازئۆف لە دژکردەوە بەم پشتگیریانە، ژمارەیەك لە بەرپرسانی وەزارەتی بەرگری یەك لەوان وەزیری بەرگری لەسەر کارلابرد، چونکە وەزیری بەرگری بە پلانگێڕی بە دژی نیازئۆف تاوانبار کرابوو، جیا لەوەیش سەرۆك کۆمار تەواو هێلە سنوورییەکانی ولاتی راستەوخۆ خستبووە ژێر چاودێری خۆیەوە تا هەر چەشنە پلانگێڕییەکی دژی خۆی سەرکوت بکا.

یەکێك لە بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەی تورکمەنستان "بێلایەنی هەمیشەیی"یە. بنەمایەك کە کاربەدەستان زۆر پێی دەروەستن، کۆمەڵەی ولاتە بێلایەنەکان لە دسامبری ١٩٩٥ لەلایەن سەرۆکی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە درووستبوو. دوو مانگ دواتر تورکمەنستان بوو بە ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە هەتا پێوەست بێ بە کۆمەڵەی بێدەروەستەکان. سیاسەتی بێلایەنی تورکمەنستان شێوازەکی دوو لایەنەی لەمەڕ ئەندامیەتی لە CIS هەبوو. سەرۆك کۆمار دژایەتی خۆی لەگەڵ هەموو رێکەوتنەکانی لە پێوەندی دەگەڵ کەوشەنی ولاتانی هاوقازانج راگەیاند، کە بەوانەیان دەگوت "هەیئەتی راوێژکاری". زێدەباری تورکمەنستان لە واژۆکردنی ژمارەیەك لە رێککەوتننامەکانی CIS کە بۆ هاوبەندی سیاسی، نیزامی، ئابووری بوو، خۆی بوارد. هاوپەیمانی گرینگی تورکمەنستان و شەریکی ئابووری ئەم ولاتە "رووسیە"یە. کە بە یەکێك لە ئەندامانی CIS بەئەژمار دێ. لە دیسامبری ١٩٩٢دا تورکمەنستان بوو بە ئەندامی کۆمەلەو کۆمەلێك گرێبەستی لەسەر بنەمای پەیڕەوی کردنی دوولایەنە لەگەڵ رووسیەدا واژۆ کرد کە ئەم گرێبەستە دەبووە هۆی پتەوبوونی پێوەندییەکانی هەردوو ولات، هەروەها پێش بە چوونەدەرەوەی رووسیەی لە کۆمەڵەی دەگرت.

هەڵبەت لەنێوان دوو وڵاتی رووسیەو تورکمەنستاندا کۆمەڵێك پێکدادانی بەربڵاو رووی دابوو، یەکێك لە گەورەترین هۆکارەکانی ئەم پێکدادانە دەگەڕێتەوە بۆ هەناردنی گازی سروشتی تورکمەنستان کە بە کەڵکوەرگرتن لە سیستمی بۆریی شوورا کە لەژێر چاودێری رووسیەدا بوو، دەبەسترایەوە.

لە ساڵی ١٩٩٣ دەست پێڕاگەیشتنی تورکمەنستان بۆ بازاڕە ئەوروپاییەکان لە رێگای ئەم سیستمەوە قەدەغە کرا، چونکە رووسیە بڕیاری دابوو گازی سرووشتی تورکمەنستان بە شێوەی راستەوخۆ بەڕێ بکا بۆ کۆمارەکانی قەفقازو یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤییەتی سۆسیالیستی پێشوو. بەڵام بەهۆی وەدواخستنی تێچوویی گازی هەناردە لەلایەن وڵاتانی وەرگرەوە، تورکمەنستان هەناردنی گازی وەدواخست و ئەم کارە خەسارێکی زۆری لە ئابووری ئەم کۆمارە لە ساڵەکانی ١٩٩٣ ـ١٩٩٥ دا. هەناردنی گاز بۆ ئۆکراین‌و قەفقاز لە ساڵی ١٩٩٦دا سەرلەنوێ دەستی پێکردووە.

لە مارسی ١٩٩٧یشدا سەرۆك کۆمار فەرمانی جیاکردنەوەی کۆمپانیای تورکمەنستانی لە رووسیە دەرکرد، چونکە فرۆشتن و هەناردنی ئەم کۆمپانیایە تایبەتی کراوە. رووسیەش لە دژکردەوە بەم کارە پێشی بە هێنانی گازی تورکمەنستان لە رێگای بۆڕی سەرەکی گرت. تەنانەت لە گەڵ ئەوەیشدا، ئامادەیی ئوکراین بۆ دانی قەرزەکانی بە تورکمەنستان، لەگەڵ کارشکێنییەکانی رووسیە لەم بوارەدا بەرەوڕوو ببو. لە کۆتاییدا لە دێسامبری ١٩٩٨ حکوومەتی تورکمەنستان لەگەڵ رووسیە لەسەر راگواستنی گازی سرووشتی رێککەوتن.

هەروەها لە مانگی فیەورییەی ساڵی ١٩٩٩ لەگەڵ ئۆکراین وەها رێکەوتنێك هاتە ئاراوە، بەڵام دیسان لە مانگی مای هەمان ساڵدا وەدوا خرا کە دواتر بووە هۆی دروستبوونی ئاریشە. بەڵام لە نوامبری ٢٠٠٠دا تورکمەنستان پاش وەرگرتنی پارە لە ئۆکراین، سەرلەنوێ هەناردنی گازی بۆ ئەم وڵاتە دەست پێکردووە. لە مانگی مای ٢٠٠١یشدا تورکمەنستان رەزامەندی خۆی بۆ هەناردەی ٢٥٠ هەزار میتری سێجا گاز بۆ ئۆکراین دەربڕی، کە ئەم پەیماننامەیە تا ساڵی ٢٠٠٦ درێژەی کێشا. بەڵام لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠١ حکوومەتی تورکمەنستان بە ناردنی گاز بۆ رووسیە دوودڵ بوو. لە ئاکامدا هەردوو وڵات لەسەر پارەکەی تووشی کێشەگەلێك هاتن، بەڵام بەو حاڵەشەوە لە فیەورییەی هەمان ساڵدا لەگەڵ ئیترا (ITRA) بە رێککەوتن گەیشتن. بە جۆرێك لە هەمان کاتدا تورکمەنستان گرێبەستێکی لەگەڵ ئیتراو



کۆمپانیایەکی وەزەی رووسیە زارو بێەژنێف (zarubezhnef) واژۆ کرد. ئەم کۆمارە بە پێچەوانەی وڵاتانی قەزاقستان، قرقیزستان و ئوزبەکستان لە مەڕ شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان بێلایەن بوو هەر بۆیە سوپای خۆی تێکەڵ بە هێزەکانی پاراستنی ئاشتی ناوچەی CIS نەکرد. تەنانەت عشق ئاباد بووە شوێنێك بۆ وتوێژی ئاشتی تاجیکستان.

لە سێپتامبری ساڵی ٢٠٠٠دا، دوو وڵاتی تورکمەنستان و ئوزبەکستان گرێبەستێکیان لە راستای دیاریکردنی سنوورەکانی خۆیان کە نزیکەی ١٨٦٧ کیلۆمەتر بوو، واژۆ کرد.

لە ساڵی ٢٠٠١یشدا بە فەرمانی فەرمی سەرۆك کۆمار نزیکەی ١٧٠٠ کیلۆمەتر لە سنوورەکانی تورکمەنستان حەساربەندی کرا. بەم حاڵە چوونەسەرەوەی چاودێری سنووری بووە هۆی سەرهەڵدانێکی کێشەی هەرێمی تاکو ژانویەی ٢٠٠٢ هەردوو وڵاتی تورکمەنستان و ئۆزبەکستان بڕیك پارەیان بۆ ئەو هاووڵاتیانەی کە خوازیاری بەزاندنی سنوور بوون دیار کرد. بەڵام لە سەرەتای ٢٠٠٢ کۆمەڵێك هەواڵ کە باسی لە تەقەکردن لەو کەسانەی بە شێوەی نایاسایی دەیانویست سنوورەکان ببەزێنن، بڵاوبووەوە.

تورکمەنستان لەنێوان ساڵی ١٩٩٥دا، لەگەڵ وڵاتانی دەوروبەری دەریای خەزەر واتە کۆمارەکانی رووسیە، قەزاقستان، ئێران و ئازەربایجان گرێبەستەکان لە پێوەندی لەگەڵ سەرچاوەکانی ئەم دەریایە لەوانە نەوتی خاو و گازی سروشتی واژۆ کرد. هەرچەندە کانزای دەریای خەزەر لەنێوان وڵاتانی بیاقی لە سەردەمی شوورا دابەشکرابوو.، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٢ ئەم وڵاتە خوازیاری دیاریکردنی سنوورێکی نوێ بوون. بە جۆرێك لە کۆبوونەوەیەك لەنوامبری ١٩٩٥دا بە بەشداری وەزیرانی دەرەوەی پێنج وڵاتی قەراخ دەریای خەزەرلە عشق ئاباد، پێتەختی تورکمەنستان بەڕێوەچوو، هەموویان لە سەر رێککەوتنێکی نوێ کۆك بوون. لە سەرتای ساڵی ١٩٩٧ دوو کۆماری تورکمەنستان و ئازەربایجان لەمەڕ پرسە نەوتییەکان دەستیان بە وتوویژ کرد کە ئەم جۆرە وتوویژە بەهۆی ئازەربایجان و کۆنسێرسیۆمی چەند کۆمپانیایەکی نێونەتەوەیی بەربڵاوتر بۆوە.

لە جوولای ١٩٩٧یش دا کاتێك ئازەربایجان رایگەیاند کە بەنیازە پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کونسێرسیۆمی کۆمپانیا رووسییەکان گەشە پێبدا بەڵام رووسیە پاشەکشەی لەم کارەکردو بارودەۆ ئاڵوزخەکە ببوو، بەڵام ئازەربایجان سوور بوو لەسەر پێکهێنانی سێهەمین کۆنسێرسیۆمی نەوتی. لە وڵامدانەوە بەم کارە تورکمەنستان لە مانگی دسامبری هەمان ساڵدا

کەرەستەکانی خۆی بۆ هێنانەدەرێ نەوت و گاز بەرەو دەریای خەزەر بەرێ کردو داوای لە ئازەربایجان کرد بەهۆی گەشەپێدانی پەیماننامەی ئازەری و چیرگ غەرامە بدا، کەلك وەرگرتنی بازەرگانی لەم پەیماننامەیە، لە کۆتایی مانگی نوامبردا جێبەجێ کرا.

لە ئۆکتۆبری ساڵی ٢٠٠٠دا قەزاقستان گرێبەستێکی لەگەڵ رووسیە لە راستای دەست نیشان کردنی سیستمێکی یاسایی لە دەریای خەزەردا واژۆ کرد. هەڵبەت بڕیار بوو کە ئەوان لەگەڵ وڵاتانی دیکەی کەنار دەریای خەزەر (ئازەربایجان، ئێران، تورکمەنستان) لەمەڕ نێوەرۆکی ئەم گرێبەستە کۆبوونەوەیەك بەرێوە ببەن. ئەم کۆبوونەوەیە سەرلەنوێ لە ساڵی ٢٠٠١ەوە دواخرا. هەرچەند ئەم کۆبوونەوەیە لە ئاوریلی ٢٠٠٢ لە عشق ئاباد بەسترا، بەڵام ئاکامێکی لێنەکەوتۆتەوە. هەروەها لە جوولای ٢٠٠١ تورکمەنستان و قەزاقستان پەیماننامەیەکیان لەسەر دیاریکردنی سنوورەکانیان واژۆ کرد. ئێران دەورێکی زۆر گرینگی لە دامەزراندنی پێوەندییەکانی دەرەوەی تورکمەنستان لەگەڵ وڵاتانی دەرەوەی cis گێراوە. لە ساڵی ١٩٩٢ کۆمەڵێك گرێبەست لە نێوان ئێرانو تورکمەنستان لە بوارە سیاسی، ئابووریو کولتوورییەکاندا واژۆ کراون، لەوانە دروستکردنی هێڵی ئاسن لەنێوان دوو وڵات لە ساڵی ١٩٩٦دا، هەروەها دروستکردنی هێڵی ئاسنی لەنێوان شاری تەجەن (Tejen)ی تورکمەنستان و مەشهەد لە باکووری رۆژهەڵاتی ئێران دا بووە. بە دامەزراندنی ئەم هێڵانە، هێڵی ئاسنی تورکمەنستان بە دوو ناوچەی خەلیجی فارسو شاری ئیستانبۆل پێوەند دران، هەروەها تورکمەنستان و ئێران گرێبەستێك لە راستای دامەزراندنی هێڵی بۆری گاز یان بە درێژایی ١٤٠ کیلۆمەتر لە نێوان کۆرپج لە باشووری رۆژئاوایی تورکمەنستان و کوردکویی هەڵکەوتوو لە باکووری رۆژهەڵاتی ئێراندا واژۆ کرد.

ئەم هێڵی بۆرییە کە گازی تورکمەنستان لە رەوگەی ئێرانەوە بە تورکیەو دواتر بۆ رۆژئاوای ئەورووپا دەنێرێ لە نێوان ساڵی ١٩٩٧دا تەواو بوو. ئەمە یەکەمین هەناردنی سەربەخۆی تورکمەنستان بوو کە لەو رێگایەوە خۆی لە ئابووری رووسیە جیاکردۆتەوە. جگە لەوەیش لە ئاوریلی ٢٠٠٢ دوو وڵاتی ئێران و تورکمەنستان کۆمەڵێك هاوکارییان لە بوارە زانستیو تکنۆلۆژییەکاندا لەگەڵ یەکتر دەستپێکرد لەوانە کۆمەڵێك توێژینەوەو پلانیان لەسەر یەکانەگیری بازرگانی ئابووری بەرێوەبرد.

هەروەها لە نوامبری ساڵی ١٩٩٩ی زایینی لە کۆبوونەوەی هەیئەتەکانی OSCE کە لە ئێستانبۆل بەسترا، سەرۆکەکانی کۆماری تورکمەنستان، تورکیە، ئازەربایجان و گورجستان



چاویان بە یەکتری کەوت و توێژینەوەو پلانگەلێکیان لەسەر دامەزراندنی هێڵێکی گاز بۆ تورکیە لە رێگای ئازەربایجان و گورجستانەوە کرد. لە ئۆکتۆبری ٢٠٠١یش ئەمریکا پشتیوانی لێبڕاوانە و هەمەلایەنەی خۆی بۆ ئەم پڕۆژەیە دەربڕی و هۆشداری بە حکوومەتی نیازئۆفدا تاکو توێژینەوە لەسەر پێشنیاری ئازەربایجان لەسەر هەناردنی گاز لە رێگای ئەم پڕۆژەیەوە بکا. شایانی باسە کە لە ساڵی ١٩٩٨دا پلانی تێپەڕاندنی هێڵی بۆری گازی ئەم وڵاتە لە رێگای خاکی ئەفغانستان و پاکستانەوە تاوتوێ کرا کە ئەم پلانە بەهۆی نەبوونی ئاسایش و بەهۆی شەڕی نێوخۆیی ئەفغانستانەوە دواخرا.

تورکمەنستان بۆ بووژاندنەوەی ئەم پڕۆژەیە پاش رووخانی تالیبان هێندێك هەوڵیداو تەنانەت لە کۆتایی ئاوریلی ٢٠٠٢دا نیازئۆف داوای لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی کرد کە بۆ دروست کردنی ئەم هێڵی بۆرییە هەوڵ بدات.

حکوومەتی کاتی ئەفغانستانیش پشتیوانی لەم پلانە کرد تەنانەت لە کۆتایی مانگی مای ٢٠٠٢ رێبەرانی سێ وڵاتی تورکمەنستان، ئەفغانستان و پاکستان رێکەوتنێکی فەرمیان لەسەر تاوتوێ و هەڵسەنگاندنی ئەم پلانەیان واژۆ کرد.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٠دا سەرۆك کۆماری تورکمەنستان بێلایەنی خۆی لەمەڕ شەڕی نێوخۆیی ئەفغانستان راگەیاند. دیارە تورکمەنستان رۆڵی سەرەکی لە پێوەندی لەگەڵ وتووێژی ئاشتیانە لەنێوان لایەنەکانی بەشەڕهاتووی ئەفغانییەوە گێڕاوە. لە ساڵی ٢٠٠١یش پاش هێرشی تیرۆریستی ١١ی سێپتامبر بۆ سەر ئەمریکا، حکوومەتی تورکمەنستان هەروا بێلایەنی خۆی پاراست و خوازیاری پێکهاتنی هێزێکی فرە رەگەزی بۆ شەڕ بە دژی تیرۆریزم بوو کە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان رێبەریەکەی وەئەستۆ بگرێ نەك ئەمریکا. هەروەها حکوومەتی نیازئۆف ئامادەیی خۆی راگەیاند کە تاکو یارمەتی مرۆییانەی خۆی لە رێگای زەوییو ئاسمانەوە پاش هێرشی ئەمریکا بۆ سەر تالبان و ئەفغانستان بگەیەنێ. نیازئۆف لەگەڵ دەربڕینی بێلایەنی خۆی بە هاتنی هێزەکانی ئەمریکا بۆ ئەفغانستان رازی نەبوو. بەڵام لە ئاوریلی ٢٠٠٢دا ئەمریکا لەمەڕ رۆڵی یارمەتی گەیاندنی مرۆیی بۆ ئەفغانستان، سپاسی تورکمەنستانی کرد. بەڵام هۆی سەرەکی یارمەتی نیازئۆف بە ئەفغانستان گواستنەوەی هێڵی بۆری بوو بۆ پاکستان کە لە رێگای ئەفغانستانەوە جێبەجێ دەبوو. هەڵبەت لە جوولای ٢٠٠٠ی زایینی سەرۆك کۆماری چین Jian zemin دوای

چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سەرکردەکانی تورکمەنستان لەگەڵ یەکتر لەمەڕ دامەزراندنی هێڵی بۆری لە تورکمەنستانەوە بۆ چین و ژاپۆن، وتووێژیان کرد.

لە مانگی سپتامبری هەمانساڵدا رێبەرانی تورکمەنستان و چین رێککەوتنێکیان لەسەر هاوکاری لە بواری وزەو گاز واژۆ کرد. هەروەها لە ئاوریلی ٢٠٠١ی زایینی رێبەرانی وڵاتە تورك زمانەکانی ناوچە وڵاتانی ئازەربایجان و تورکیە لەگەڵ چوار وڵاتی ئاسیای ناڤین بە سەرۆکایەتی ئۆزبەکستان گرێبەستێکیان لەمەڕ هاوکاری لە بواری خەبات دژی تیرۆریزم و قاچاخی مادده هۆشبەرەکان، هەروەها بووژاندنەوەی بازەرگانی SILK لەنێوان چین و ئەوروپا و پارێزگاری لە ژینگە واژۆ کرد. لەم نێوەدا تورکمەنستان بەهۆی رکەبەرایەتی لەگەڵ ئێران بۆ پتر بە دەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسیو ئابووری ناوچەکە، خوازیاری دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ تورکیە بوو کە ئەم پێوەندییە دەبووە هۆی لێك نزیك بوونەوەی رەگەزی و زمانی لە نێوانیاندا. لە نێوان ساڵی ١٩٩٢ حکوومەتی تورکمەنستان دەستی بە پێکهێنانی هێزی تەناهی نەتەوەیی کرد. کە ئەم هێزانە لەسەر بناغەی شوورای نیزامی پێشووو لە ژێر چاودێری رووسیەدا بوون. لە ئاگوستی ٢٠٠١ی زایینی ژمارەی سوپای تورکمەنستان گەیشتە نزیکەی ١٧٥٠٠ کەس، کە لە ناویاندا هێزێکی ئاسمانی بچووکی ٣٠٠٠ کەسی هەبوون، هەڵبەت حکوومەت دەیویست گاردێکی دەریایی بۆ قەراخ دەریایش پێکبهێنێ. لە ساڵی ١٩٩٣دا تورکمەنستان لەگەڵ رووسیەو بە هاوکاری قەزاقستان هێزێکی ئەمنی لە دەریای خەزەر بە فەرماندەیی رووسیە پێکهێنا. هەروەها تورکمەنستان یەکەمین کۆماری سۆڤییەتە کە بوو بە ئەندامی ناتۆ[1].

## (٣ـ٣) یاسای بنەڕەتی

یاسای بنەڕەتی کۆماری تورکمەنستان لە رێکەوتی ١٨ی مای ١٩٩٢ پەسند کراوە کە سەرجەم لە ١٨ پاژو ١١٦ مادده پێکدێ[2]. لە پاژی یەکەمی ئەم یاسایەدا، کۆڵەکە سەرەکییەکانی نیزامی سیاسی تورکمەنستان شرۆڤە کراوە و لە ماددەی یەکەمی ئەم کۆمارەدا تورکمەنستان بە وڵاتێك

(1) The Europa World Year Book 2002, PP. 3994-4007

(٢) تورکمەنستان لەنێوان وڵاتانی ئاسیای ناڤین یەکەمین وڵات بوو کە یاسای بنەڕەتی نوێی لەجێی یاسای بنەڕەتی کۆمۆنیزم دانا.



لەسەر بناغەی سیکۆلاریزم و خاوەنی دەسەڵاتداری گەلیو سیستمێکی دێموکراتیك پێناسە کراوە. بە گوێرەی یاسای بنەڕەتی مافی دەسەڵاتداری تەنیا پەیوەستە بە خەڵك و ئەوان مافی خۆیانە بە شێوەی راستەوخۆ یان بەهۆی نوێنەرانەوە ئاڵوویر لە یاسادا بکەن.

هەروەها بەپێی ماددەی پێنجەم، یاسای بنەڕەتی باڵاترین یاسای ئەم وڵاتەیە کە یاساکانی بە شێوەی راستەوخۆ دەخرێتە قۆناخی جێبەجێ کردنەوە. بەم جۆرە یاساو بەڵگە یاساییەکانی دژ بە یاسای بنچینەیی هیچ چەشنە بەهایەکیان نابێ. لە ئاکامدا گشت پێکهاتەکانی کۆمەڵگاو دامەزراوە حکوومییەکان دەبێ پەیڕەویی لە یاسای بنەڕەتی بکەن و بە گوێرەی یاسا دارێژرابێتن.

هەڵبەت کۆماری تورکمەنستان نۆرمەکانی جێگای پەسندی یاسا نێونەتەوەییەکان پەسند کردووە و ئەوانەی هاوتەریب لەگەڵ یاسای بنەڕەتی خۆی دانەوە. بە جۆرێك ئەم وڵاتە لە سیاسەتی دەرەکی خۆیدا رێسایەك وەك پێکەوە ژیانی هێمنانە، کەڵك وەرنەگرتن لە هێز، دەستێوەرنەدانی لە کاروباری نێوخۆی وڵاتانی دیکە رەچاوکردنی سیاسەتێکی سەربەخۆ لەمەڕ پێوەندییە نێونەتەوەییەکانی، پەسند کردووە.

لە ماددەی نۆهەمی یاسای بنەڕەتیدا، جەخت لەسەر هەموو جۆرە خاوەنداریەتییەك کراوە، لەوانە خاوەنداریەتی تایبەت بە زەویی و کەرەستەی بەرهەمهێنەکان، بەپێی ئەو مادده ئاماژە پێکراوە زەوتکردنی سامانی تاك قەدەغەیە، تەنیا سامانێك کە بە شێوەی نایاسایی بەدەست هاتبێ. تەنانەت بە گوێرەی ماددەی سی و پێنج، یەکیەتییەکان و هاووڵاتیان دەتوانن دامەزراوەی تایبەتی راهێنان بەپێی رێوشوێنەکانی دیاری کراو لە یاسادا دابمەزرێنن. لە ماددەی سێزدەهەمیشدا زمانی تورکمەنی وەك زمانی فەرمی وڵات باسیکراوە. بەپێی ماددەی ٢٨ی یاسای بنەڕەتی، هاووڵاتیان مافی پێکهێنانی رێکخراوی سیاسی و دامەزراوە گشتییەکانی دیکە لەسەر بنەمای بەریانی قەومی، رەگەزی و لەوانە ئایین و ئایینزاکان یاسایی نییە. هەڵبەت بەپێی ماددەی یانزەهەم، حکوومەت ئازادی و یەکسانی هەموو ئایینەکانی گەرانتی دەکات و هەر کەسێك مافی ئەوەی هەیە دینو ئایینی خۆی سەربەستانە هەڵبژێرێ و لە رێکخراو و بۆنەکانی پێوەندیدار هەڵسووڕانی هەبێ. بەڵام بەو حاڵەش ئەم وڵاتە دامەزراوە حکوومییەکان لەوانە نیزامی پەروەردەیی کۆمەڵگایە لە کاروباری ئایینیدا جیا دەکاتەوەو نیوەڕۆکی نائایینییان هەیە. بە واتایەکی دیکە سیستمی سیاسی تورکمەنستان لەسەر بنەمای سیکۆلاریزم دارێژراوە.

لە ماددەی چلی یاسای بنەڕەتیشدا، دەزگای دادوەری مافی باری تاك كەسی و كۆمەڵایەتی هاووڵاتیان گەرانتی دەكات. بە جۆرێك هەموو هاووڵاتیان خاوەنی مافی ژیانن، نابێ تاك لێی بێبەش بكرێ. سزای مەرگ بەپێی بڕیاری دادگا وەك كەرەستەیەكی پێویست بۆ سزادانی كەسانێك كە تووشی تاوانی گەورە هاتوون، جێبەجێ دەكرێ. نابێ كەس ئازاری جەستەیی بدرێ، تەنانەت بە بێ رەزامەندیی نەخۆشەكە تاقیكردنەوەی دەرمانی، یان تاقیكردنەوەكانی دیكە لەسەر جەستەی ئەو كەسە نایاساییە. هەروەها قۆڵبەستی هاووڵاتیان تەنیا بەپێی حوكمی دادگا یان بڕیاری دادوەر ئیمكانی هەیە. شوێنی نیشتەجێ بوونی هاووڵاتیان پارێزراوە و بەبێ مۆڵەتی یاسایی كەس ناتوانێ گەڕان و پشكنینی لە شوێنی نیشتەجێ بوونی هاووڵاتیاندا بكا. تەنانەت لە ماددەی ٤٢ی یاسای بنەڕەتیدا ئەعتراف وگرتنی تۆمەتباران لە ڕێگای گوشاری دەروونی یان جەستەییەوە بایەخی یاسایی نییەو بە گوێرەی ماددەی ٤١یش ئەگەر هاووڵاتیان لەلایەن دامەزراوە حكوومییەكان یان تایبەتەكانەوە خەساری مەكیی‌و مێنۆكیان (ماددی‌و معنوی) لێبكەوێ دەتوانن داوای قەرەبوو كردنەوەی خەسارەتەكەیان لە دادگا بكەن.

بەهەرحاڵ لە یاسای سەرەكی كۆماری توركمەنستاندا، یەكسانی ماف و ئازادییەكانی هاووڵاتیان بەبێ لەبەرچاو گرتنی رەگەز، نەتەوە، دین، ئایینزا، زمان، پێگەی كاری و باوەڕی سیاسی گەرانتی كراوە. بە جۆرێك بەپێی ماددەی حەوتەم، كەس لە مافی هاووڵاتی بوون بێبەش ناكرێ و ئەم مافانە بە گوێرەی یاسا "بەدەست دێ"، "دەپارێزرێ"، یان "هەڵدەوەشێندرێ"تەوە.

مافەكانی تاك و كۆمەڵایەتی هاووڵاتیانی توركمەنستان بە گوێرەی یاسا داگری كۆمەڵێك خاڵە كە بەرچاوترینیان دەتوانین بەم شێوەیە باسبكەین:

١ـ هاووڵاتیانی ئەم كۆمارە مافی بەدەستهێنانی هاووڵاتی بوون یان گۆڕینیان هەیە.

٢ـ ئازادی چاپەمەنی‌و پێوەندییە تەلەفۆنییەكان و پێوەندییەكانی دیكەی هاووڵاتیان بەبێ هیچ چەشنە سانسۆڕ یان پشكنینێك گەرانتی كراوە.

٣ـ مافی دەست پێڕاگەیشتنی یەكسانی بە خزمەت گوزاری حكوومی بەپێی لێهاتوویی‌و فێركارییە پیشەییەكانی خەڵك.

٤ـ ئازادی هەڵبژاردنی كارو دیاریكردنی شوێنی كارو مافی دابینكردنی ئاسایشی كار



٥ـ ئازادی كۆڕو كۆبوونەوەكان، ڕێپێوان و خۆپیشاندان.

٦ـ مافی كەڵك وەرگرتن لە ساغڵەمی بێ بەرامبەر لە دامەزراوە حكوومییەكان، هەروەها مافی كەڵك وەرگرتن لە خزمەتگوزاری كۆمەڵایەتییەكان لەكاتی پەككەوتوویی‌و نەخۆشی، نەبوونی كەس‌و كارو یان كاتی نەبوونی كارو زیان لێكەوتوویدا.

٧ـ مافی كەڵك وەرگرتن لە پێداگۆژی و فێركاری بێ بەرانبەر.

شایانی باسە لە ڕووبەڕووی پاژی هەشتەمی یاسای بنەڕەتی توركمەنستان، ماددەكانی ئەم یاسایە كە قەوارەی نیزامی كۆماری دەستنیشان دەكا، چاوپێخشاندن و ئاڵ و گۆڕی بەسەردا نایە. پەسندكردنی یاسای نوێ پێویستی بە وەرگرتنی دەنگی ٢ لە ٣ی دەنگی نوێنەرانی پارلمان هەیە. لە نێوان یاسای نەگونجاو یاسای بنەڕەتی لە دادگاكان، پشتیوانی لە یاسای بنەڕەتی دەكرێ. لە كۆتاییدا بەپێی ماددەی چوارەمی یاسای بنەڕەتی توركمەنستان، هێزو دەسەڵاتی یاسا لەم وڵاتە لە نێوان سێ دەسەڵاتی یاسادانەر، بەڕێوەبەری‌و دادوەریی دابەش كراوە كە پێكهاتەكانی بە شێوەی ڕاستەوخۆ كار دەكەن بەڵام چاودێری بەسەر یەكتردا دەكەن و بە كورتی لێرەدا شرۆڤەیان دەكەین.

ئەلف) دەسەڵاتی یاسادانەر: ئەم ناوەندە خاوەنی قەوارەیەكی دوو پارلمانییە، یەكیان شوورای بەرژەوەندی گەل و ئەوی دیكەیان پارلمانی نوێنەرانە كە سەرقاڵی یاسادانانە. هەڵبەت پارلمانێكی نافەرمی بەنێوی شوورای ریش سپییەكانیش هەیە كە لە یاسای بنەڕەتیدا باسی لێوە نەكراوە. دامەزرانی لەسەر بناغەی داب و نەریتە كۆنە ئەتنیكەكانی توركمەنە. ئەم پارلمانە واتە شوورای ریش سپییەكانیش ساڵێ جارێك كۆبوونەوە پێكدێنن و لەمەڕ پرسە گرینگەكانی وڵات ئاڵ و گۆڕی بیروڕا دەكەن. بەپێی ماددەی ٤٥ یاسای بنەڕەتیش شوورای بەرژەوەندیی گەل لە توركمەنستان بەرزترین دامەزراوەی نوێنەرایەتییە كە خاوەنی ٦٠ ئەندامەو لە ڕێگای بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی گشتی بۆ ماوەی ٥ ساڵ دەستنیشان دەكرێن. سەرۆكایەتی ئەم شوورایە لە دەستی سەرۆك كۆمارادایە، بەڵام كەسێكی دیكەش دەتوانێ ئەم بەرپرسایەتییە وەئەستۆ بگرێ.

شوورای بەرژەوەندی گەل لە سەركردە بەرچاوەكانی وڵات پێكدێن كە بریتییە لە: سەرۆك كۆمار، ئەندامانی پارلمانی نوێنەران، لە هەر بەشێك كەسێكە، سەرۆكی دادگای باڵا، هەروەها سەرۆكی دادگای باڵای ئابووری، دادوەری گشتی وڵات و ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیران،

سەرۆكی ئیداری پارێزگاكان، سەرۆكی شووراى شارەوانییەكان و لە كۆتاییدا بەرپرسانی شارەكان و گوندەكان. نوێنەرانی ئەم پارلمانە مووچە وەرناگرن.

بەپێی ماددەی ٥٠ی یاسای بنچینەیی گرینگترین دەسەڵاتەكانی یاسادانەر، دەتوانین ئاماژە بەو خاڵانەی خوارەوە بكەین:

١ـ بڕیاردان لەمەڕ پێویستی دەستكاری یان گۆڕینی لە یاسای بنەڕەتیدا.

٢ـ بەڕێوبردنی راپرسی گشتی لە دابەشكردنەكانی ئیداری، نیشتمانیدا.

٣ـ گۆڕانكاری لە سنوورەكانی وڵات، هەروەها دیاریكردنی هێڵە گشتییەكانی سیستم لە مەڕ پرسە جۆراوجۆرەكاندا.

٤ـ پەسند یان رەتكردنەوەی پەیماننامە پێوەندیدارەكان بە بەشداری لە یەكیەتییەكانو ئەنجومەنە نێونەتەوەییەكاندا.

٥ـ راگەیاندنی شەڕو ئاشتیو پرسەكانی دیكە.

٦ـ شوورای بەرژەوەندی گەل لانیكەم ساڵێك جاریَ بە بانگهێشتی سەرۆك كۆمار یان پارلمان، یان بە بانگهێشتی ١ لە ٤ی گشت ئەندامانی ئەم شوورایە كۆبوونەوە پێكدێنن.

پارلمانێكی دیكە كە توركمەنستان مافی دانانی یاسای هەیە، پارلمانی نوێنەرانە. ئەم پارلمانە خاوەنی ٥٠ نوێنەرە كە لە رێگای هەڵبژاردنێكی گشتی بۆ خولێكی پێنج ساڵە هەڵدەبژێردرێن. پارلمانی نوێنەران بە شێوەی راستەوخۆ سەرۆك و جێگرەكان، هەروەها كومیتەو كۆمیسیۆنەكانی خۆی هەڵدەبژێرێ، هەروەها لێهاتووی ئەندامەكانی هەڵدەسەنگێنن، جگە لەوەش ئەم پارلمانە بە شێوەی راستەوخۆ لێكۆڵینەوە لەسەر راستیو یاسایی بوونی هەڵبژاردنەكان دەكات. لە بەرانبەر ماددەی ٦٦ی یاسای بنەڕەتیشدا پارلمانی نوێنەران دەتوانێ مافی دیاریكردنی یاسا لە هێندێك بواری دیاریكراو بسپێرێ بە ناوەندی سەرۆك كۆمار، هەڵبەت ئەم جۆرە یاسایانە دواتر دەبێ نوێنەرانی پارلمان پەسند بكات. بەڵام لەگەڵ ئەویشدا لە بوارەكانی هێزی دادوەری، پەسندكرانی دەستكاری لە یاسای بنچینەیی، هەروەها لە بواری یاسای تاوانەكان و ئیداری و... هتد پارلمانی ناتوانێ دەسەڵاتی خۆی بسپێرێ بە دامەزراوەیەكی دیكە. بەپێی ماددەی ٧٢یش سەرۆكی پارلمانی توركمەنستان بە دەنگدانی شاراوە هەڵدەبژێردرێ، ئەو لە بەرانبەر پارلمان بەرپرسیارەو بە دەنگی لانیكەم ٢ لە ٣ی نوێنەرانی پارلمان لەسەر كار وەلادەنرێ.



شایانی باسە كە لە نەبوون یان لێنەهاتووی سەرۆكی پارلمان بۆ بە ئەنجامدانی ئەركەكانی، جێگری سەرۆكی پارلمان هێندێك لە دەسەڵاتەكانی جێبەجێ دەكا. جێگری سەرۆك كۆماریش بە دەنگدانی ئاسایی دەستنیشان دەكرێ. پارلمانی توركمەنستان خاوەنی لێژنەیەكی سەرۆكایەتییە كە لە سەرۆكی پارلمان، جێگری سەرۆك و بەرپرسی كۆمیتەو كۆمیسیۆنەكانی پارلمان پێكدێ. بەپێی ماددەی ٦٩یش نوێنەرانی پارلمان دەتوانن دوای روونكردنەوە لە لێژنەی وەزیران و بەرپرسانی دیكەی حكوومی بكەن و دوای وەڵامدانەوە لەمەڕ پرسە جۆراوجۆرەكان بكەن. نوێنەرانی پارلمان خاوەنی پارێزراویی پارلمانین و ئیمكانی دەركردنی ئەندامێكی پارلمان بە ٢ لە ٣ی دەنگی ئەندامان، جێبەجێ دەكرێ.

بە گوێرەی ماددەی ٦٨ی یاسای بنەڕەتی، مافی دانانی یاسای پارلمان لەلایەن سەرۆك و كابینەی وەزیران دیاریدەكرێ.

بەپێی ماددەی ٧١ی یاسای بنەڕەتی، نوێنەرانی پارلمان مافی ئەندامەتی لە لێژنەی وەزیران یان هەبوونی بەرپرسایەتی لە ئیدارەی پارێزگاكان، شارەكان و قەزاكانیان... دا نییە، یان ناتوانن پۆستگەلی دیكەیان هەبێ. لەماددەی ٦٤یشدا مەرجەكانی پارلمان لە كۆمەڵێك بواری دیاریكراودا پێناسە كراوە. یەكەم هەڵوەشانەوەی لە رێگای بەڕێوەبردنی راپرسیو دووهەم، هەڵوەشاندنەوەی لەلایەن خودی پارلمانەوە كە لەم كاتەدا ٢ لە ٣ی نوێنەران دەبێ پەسندی بكەن. بەجۆرە هەڵوەشاندنەوەی پارلمان، خۆهەڵوەشانەوەیشی پێدەڵێن. شێوەی سێهەمیش بەم جۆرەیە ئەگەر پارلمان، نەتوانێ دەزگاكانی پێوەندیداری خۆی پێكبێنێ و یان نەتوانێ لە ماوەی ١٨ مانگ دەنگی متمانە بداتە وەزیرانی نوێ دەكرێ لەلایەن، ناوەندی سەرۆك كۆمارییەوە هەڵبوەشێنرێتەوە. لە ماددەی ٦٧ گرینگترین دەسەڵاتەكانی پارلمان بەم جۆرە باسی لێوە كراوە:

١ـ شرۆڤەی یاسای بنەڕەتیو دەستكاری كردنی.

٢ـ راگەیاندنی بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنەكانی پارلمانی، سەرۆك كۆماری، هەروەها شوورای بەرژەوەندی گەل.

٣ـ بەڕێوەبردنی راپرسی گشتیو پێكهێنانی كۆمیسیۆنی ناوەندی هەڵبژاردنەكان.

٤ـ پەسندی بوودجەی وڵات و راپۆرتی جێبەجێ كردنی.

٥ـ پەسندی گەڵاڵەكانی حكوومی، یان رەتكردنی بۆ دەستكاری كردن.

٦ـ دانان و لابردنی سەرۆکی دادگای باڵای ئابووری و دادوەری گشتی وڵات.

٧ـ تاوتوێ پەسندکراوەکانی پارلمان و چالاکی ڕێکخراوە حکوومییەکان، کەلەگەڵ یاسای بنەڕەتیدا بگونجێ.

٨ـ بڕیاردان لەمەڕ توێژینەوە لە پێوەندی لەگەڵ ئەو پرسانەی کە لە یاسای بنەڕەتی یان یاساکانی دیکە پێشکەشی پارلمانی دەکات.

٩ـ دانی خەڵات و هێما شانازییەکانی وڵات.

ب) دەسەڵاتی بەڕێوەبەری: دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە تورکمەنستان لە ناوەندی سەرۆك کۆماری، ئەنجومەنی وەزیران و ڕێکخراوگەلی بەڕێوەبەری وڵات بەتایبەتی دەزگای بەڕێوەبەری هەرێمی پێکدێ. لەم ناوەندی دەسەڵاتە، سەرۆك کۆمار بەرزترین پلەی فەرمی وڵات و گرنگترین سەرچاوەی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی نەتەوەییە کە بەپێی یاسای بنچینەیی سەرۆك کۆمار، سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانیشە.

بەم شێوەیە، ناوەندی سەرۆك کۆماری لە تورکمەنستان ڕۆڵی سەرۆك وەزیرانیش دەگێڕێ. بە تاوتوێکردنێکی کورت دەتوانین بگەین بەم خاڵە کە سیستمی حکوومەتی لە تورکمەنستان سەرۆکایەتییە، واتە زۆربەی دەسەڵات و ناوەندەکانی هێز لە ناوەندی سەرۆك کۆماریدا کۆ بۆتەوە، هەر چەند لە ماددەی ٤ی یاسای بنەڕەتی ئەم وڵاتەدا جەخت لەسەر جێبەجێکردنی بنەمای جیایی هێز کراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا سەرۆك کۆمار هێزو دەسەڵاتێکی بەرفرەیی هەیە، بە جۆرێك کە سەرۆك کۆمار لەلایەك بە لابردن و دانانی بەرپرسانی گرینگی دادگا باڵاکانی وڵات و ئیدارەو چاودێری بەسەر هێزی دادوەریدا دەکا، لەلایەکی دیکە بەسەر کۆڵەکەکانی هێزی یاسادانەر زاڵە، چونکە سەرۆك کۆمار سەرۆکایەتی هەمیشەیی شوورای بەرژەوەندی گەل کە باڵاترین ناوەندیی یاسادانەری وڵاتە، وەئەستۆی گرتووە. نەك هەر ئەمە بەڵکوو بەپێی ماددەی ٦٨یش، مافی یاسادانان لە کۆماری تورکمەنستان جیا لە پارلمان دراوەتە ناوەندی سەرۆك کۆماریش، بە جۆرێك کە سەرۆك کۆمار دەتوانێ حوکم و بڕیارگەلێك بدا کە دەبێ ئەم لائەولا بڕیارەکەی جێبەجێ بکرێ، هەروەها ناوبراو دەسەڵاتی ڕەتکردنەوەی پەسند کراوەکانی پارلمان، یان هێزی گەڕاندنەوی ئەوانەی هەیە یان دەتوانێ لە کاتی پێویستدا پارلمانی تورکمەنستان هەڵوەشێنێتەوە.

سەرۆك کۆمار بە دەنگی ڕاستەوخۆی خەڵك بۆ ماوەیەکی پێنج ساڵ هەڵدەبژێردرێ، هەڵبەت هیچ کەسێك زیاتر لە دوو جار ناتوانێ ببێ بە سەرۆك کۆمار. مەرجەکانی



پاڵێوراوانی سەرۆك کۆماری بریتییە لە کۆمەڵێك خاڵی تایبەت کە گرینگترینیان، تەمەنی لانیکەم چل ساڵ و بە ڕەچەڵەك تورکمەن بێت. هەڵبەت یاسای بنەڕەتی لە هێندێك کاتدا لابردنی سەرۆك کۆماری تا پێش تەواوبوونی خولی سەرۆك کۆماری ڕەچاو کردووە، بە جۆرێك کە لە ماددەی ٦٠ی یاسای بنەڕەتیدا هاتووە کە ئەگەر سەرۆك کۆمار بەهۆی نەخۆشی توانای بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی نەبێ، شوورای بەرژەوەندی گەل دەتوانێ بە ڕێگەدان بە کۆمیسیۆنێکی پزیشکی سەربەخۆ و بە بەدەستهێنانی ٢ لە ٣ی دەنگی نوێنەرانی خۆی، سەرۆك کۆمار لەسەر کار لاببەن. هەروەها ئەم شوورایە دەتوانێ خوازیاری دەرکردنی نەدانی دەنگی متمانە بە سەرۆك کۆمار بێ و لەکاتی پێشێلکردنی یاسای بنەڕەتی، یان یاساکانی دیکەشد شوورای بەژەوەندی گەل دەتوانێ پرسی وەلانانی ئەو بخاتە ڕاپرسییەوە. پرسی دەنگی متمانە لەلایەن ١ لە ٣ی نوێنەرانی بەرژەوەندی شیاوی تاوتوێ کردنەو هەر چەشنە بڕیارێك لەم بارەیەوە دەبێ لانیکەم ٢ لە ٣ی نوێنەران پەسندی بکەن.

ئەرکەکانی سەرۆك کۆماری تورکمەنستان بەپێی ماددەی ٥٧ی یاسای بنەڕەتی بریتییە لە کۆمەڵێك خاڵ کە دەتوانین بەم جۆرە ئاماژە بە بەرچاوترینیان بکەین:

١ـ دیاریکردنی بوودجەی ساڵانەی وڵاتو دانەوەی ڕاپۆرت بە پارلمان بۆ پەسند کردنی.

٢ـ جێبەجێکردنی یاسای بنەڕەتی، هەروەها جێبەجێکردنی پەسندکراوەکانی پارلمان و یاسا ئاساییەکانی دیکەی وڵات، لەم بوارەدا. هەر کات سەرۆك کۆمار زانی پەسندکراوەکانی پارلمان بە قازانجی وڵات نییە، بۆ چاوپێخشاندنەوەو دەنگدانی دووبارە دەتوانێ بۆ پارلمانی بگەڕێنێتەوە.

٣ـ فەرماندەیی گشتی هێزە چەکدارەکان.

٤ـ دانان و لابردنی سەرۆکی دادگا باڵاکانی ئابووری و دادوەری گشتی وڵات بە ڕەزامەندی پێشووی پارلمان.

٥ـ بەڕێوەبردنی ڕێفراندۆم بەپێی حوکمی شوورای بەرژەوەندی گەل، هەروەها دانی خەڵات و هێما نەتەوەییەکانی ئەم وڵاتە.

٦ـ بانگەوازو پێکهێنانی شوورای بەرژەوەندی گەل کە بەپێی یاسا سەرۆکی ئەو بەشەش بە ئەژمار دێ، ئەم شوورایە بەهێزترین دامەزراوەی دەسەڵاتی یاسادانەرە لە تورکمەنستان کە سیاسەتە گشتییەکانی نیزام دیاری دەکا.

٧ـ دەستنیشان کردنی بەرپرسانی باڵوێزی وڵاتەکەی لە وڵاتەکانی دیکە.

٨ـ لێبوردن یان کەمکردنی سزای تاوانباران. هەڵبەت سەرۆك کۆمار مافی دانی دەسەڵاتی خۆی بە ناوەند یان کەسێکی دیکە نییە تەنیا لە بارودۆخی تایبەتی دەتوانێ هێندێك لە دەسەڵاتەکانی خۆی بدا بە سەرۆکی پارلمان.

لە زنجیرە قۆناخی دەسەڵاتی بەڕێوەبەریدا، دوای ناوەندی سەرۆك کۆماری، هەیئەتی وەزیران لە ریزی پێشەوەدایە، کە دیارە سەرۆکی هەیئەتی وەزیرانیش لەئەستۆی سەرۆك کۆمارە کە بە لانی زۆرەوە مانگێك پاش وەرگرتنی ئەم پۆستە دەبێ کابینە پێکبێنێ. سەرۆك کۆمار بەربژاردەکانی بە پارلمان پێشنیار دەکاو نوێنەران، لێوەشاوەیی کاندیداتۆرەکان تاوتوێ دەکەن و دەنگی متمانەیان پێدەدەن. هەروەها دەبێ بەرنامەی کاری هەیئەتی وەزیران لەلایەن پارلمانەوە پەسند بکرێ یان نوێنەران دەتوانن دەنگی متمانە بە کابینەکەی نەدەن، بەڵام ئەگر لە ماوەی ١٨ مانگدا دەنگی متمانە نەدەن بە کاندیداتۆرە دەست نیشانکراوەکان، سەرۆك کۆمار ئەم مافەی هەیە کە پارلمان هەڵوەشێنێتەوە. شایانی گوتنە کە کابینەی حکوومەت لە وەزیران و جێگرەکانی پێکدێ، کە سەرۆك کۆمار بەرپرسایەتییەکەی وەئەستۆیە. هەڵبەت ئەندامانی کابینەی حکوومەت ناتوانن لە هەمان کاتدا پۆستی دیکەیان هەبێ یان سەرقاڵی چالاکی ئابووری بن. دەزگا بەڕیوەبەریەکانی وڵات بۆ وێنە ناوەندە بەڕێوەبەریەکانی هەرێمیش بریتیە لە دەسەڵاتی بەڕێوەبردن کە هەرکام خاوەنی ماف و ئەرکی تایبەتین. گرینگترین ناوەندی بەڕێوەبردنی وڵات پاش کابینەی حکوومەت بریتییە لە بەرپرسانی پارێزگاکان، شارەوانییەکان و شۆوراگەلییەکان. هەموو بەرپرسانی پارێزگاکان وەك جێگری ئەنجومەنی وەزیران بە ئەژمار دێن. بەم پێیە بەرپرسانی پارێزگاکان بەشێك لە کابینەی حکوومەت بە ئەژمار دێن و لە بەرانبەر پارلماندا بەرپرسیارن. ئەرکەکانی بەرپرسانی پارێزگاکان و شارەوانییەکان بریتییە لە کۆمەڵێك خاڵی زۆر، کە لەوانە رێبەری ئۆرگانە حکوومییەکان لە شوێنی کار، چاودێری بەسەر جێبەجێکردنی نێوەڕۆکی یاسای بنەڕەتی پەسند کراوەکانی پارلمان و یاسا دیاریکراوەکان لەلایەن ناوەندی سەرۆك کۆماری لە چوارچێوەی دەسەڵاتی خۆیدا، هەروەها بەرپرسانی پارێزگاکان و شارەوانییەکان لە چوارچێوەی کاری خۆیان دەتوانن بڕیارو جێبەجێکردنی حوکمیش بدەن.

**ج) دەسەڵاتی دادوەریی:**

لە تورکمەنستان ناوەندێکی سەربەخۆ بەنێو دەسەڵاتی دادوەری بەو جۆرەی کە لە وڵاتانی دیکەدا بوونی هەیە، بەرچاو ناکەوێ. دەسەڵاتی دادوەری لەم وڵاتەدا لەراستیدا کۆیەکە لە



ناوەندە دادپەروەرییە پرش‌و بڵاوەکان کە تێکەڵ بە دەسەڵاتی بەڕێوەبەری بووە. خاڵی هاوبەشی هەموو ئەو دامەزراوانە ئەوەیە کە بە شێوەی راستەوخۆ لەژێر چاودێری سەرۆك کۆمار دان یان ئەوەی کە دەگوترێ دەسەڵاتی دادوەری لەگەڵ دەسەڵاتی بەڕێوەبەریدا تێکەڵ بووە[1]. بە گوێرەی ماددەی سەدی یاسای بنچینەیی، دەسەڵاتی دادوەری تورکمەنستان لەلایەن دادگای باڵا، دادگای باڵای ئابووری، دادگای نیزامی‌و دادگاکانی دیکە کە لەلایەن یاساوە دیاریکراون، بەڕێوە دەبرێ. ئەم دەسەڵاتە بەهۆی لایەنەکانی یاسای مەدەنی، دادوەری و ئیداری و سزا بەڕێوە دەچێ. بەپێی ئەم ماددەیە دامەزراندنی دادگاگەلێکی باڵاتر لە یاسا یان دامەزراوەکانی دیکە بۆ کاری دادوەری، یاساغ کراوە.

یەکێك لە پێکهاتە بەرچاوەکانی دەسەڵاتی دادوەری لە تورکمەنستان، وەزارەتی دادوەرییە. وەزیری دادوەری وەکوو بەرزترین پلەی ئەم وەزارەتخانەیە هەروەکوو وەزیرانی دیکە لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە پێشنیار دەکرێ بە پارلمان و دەنگی متمانە وەردەگرێ و ئەرکە لەسەر شانی راپۆرتی گشت گەلاڵەکانی خۆی بداتەوە بە سەرۆك کۆمار کە گرینگترینیان بەم شێوازەیە:

١ـ بەشداربوون لە ئامادەو دیاریکردنی یاسا بە شێوەی دانی رەشنووس گەلی یاسایی کە سەرەتا ئەم رەشنووسانە لە کابینەو پاشان دەبێ پارلمان تاوتوێ و پەسند بکا.

٢ـ هەڵسەنگاندنی خاڵە بەهێزو لاوازەکانی یاسا، ئاڵو گۆڕکردنیان.

٣ـ دانان و چاکسازی لە رێوشوێنی لێکۆڵەری دادوەر، هەروەها هەڵسەنگاندن و پەسندی لێهاتوویی قازییەکان.

٤- پێڕاگەیشتن بە ناوەندەکانی تۆمارکردنی ناو، هەروەها پێڕاگەیشتن بە ناوەندەکانی ئارشیڤ.

٥ـ دانانی بەشێك لە کادری دادگاکان، هەروەها توێژینەوەو پەسندی پەیڕەوی گشت وەزارەتخانەو کۆمیتە حکوومییەکان.

٦ـ تاوتوێکردنی یاسای دەسەڵاتی دامەزراندنی حیزب و رێکخراوە سیاسییەکانی دیکەی‌و تۆمارکردنیان، لەم بوارەدا دەبێ. بڵێین کە لە تورکمەنستان لە رووی یاساییەوە، هەر حیزبێك

(١) دەسەڵاتی دادوەری تورکمەنستان، وەرزنامەی توێژینەوەی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ژمارەی ١٠٠، ساڵی ١٣٧٤، لاپەڕەی ١٩٨

خاوەنی هەزار ئەندام بێ و بەرنامەکانی لەگەڵ یاسای بنەڕەتی ناکۆك نەبێ، دەتوانێ مۆڵەتی چالاکی وەربگرێ.

٧ـ تاوتوێی یاسای دەسەڵاتی پێکهێنانی ئەنجوومەنە ئایینییەکان و تۆمار کردنیان، بە سەرنجدان لە خاڵەکانی ئاماژەپێکراو دەتوانین بڵێین وەزارەتی دادوەری پتر ئەرکی بەڕێوەبەری وەئەستۆیە تاکو کاری دادوەری.

لە پاژی حەوتەمی یاسای بنچینەییشدا پرسە پێوەندیدارەکان بە ( ئیدارەی دادوەرییەوە) باسکراوە. ئەم ئیدارەیە لەژێر چاودێری دادوەری گشتی وڵاتدایە کە لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە بۆ ماوەیەکی پێنج ساڵە دادەنرێ. دادوەری گشتی لە بەرانبەر سەرۆك کۆمار بەرپرسیارەو ڕاپۆرتی چالاکی خۆی پێ دەداتەوە. هەروەها جێگری دادوەری شارەکان و قەزاکان لەلایەن دادوەری گشتییەوە هەڵدەبژێردرێ. گرینگترین ئەرکی ئیداری دادوەری بەپێی ماددەی ١١٥ی یاسای بنچینەیی، چاودێری وردو یەکسان بەسەر جێبەجێکردنی یاسایە لە چالاکییە پیشەییو بازرگانی، ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانو بابەتگەلی دیکە لەم چەشنە. سەرچاوەی یاساییش ڕەنگە پارلمان، ناوەندی سەرۆکایەتی کۆماری، ئەنجوومەنی وەزیران، دەزگا خوبەڕێوەبەرە هەرێمییەکان و بەرزتر لە هەموویان یاسای بنەڕەتییە. نەك هەر ئەمە بەڵکوو بەپێی ماددەی ١١١ی یاسای بنەڕەتی ئیداری دادوەری یاسای بوونی لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکان، تاوانەکانو بەڵگە پێوەندیدارەکان بەوانە تاوتوێ و چاودێری بەسەردا دەکرێ[1]. خاڵی کۆتایی ئەوەیە، لە کۆماری تورکمەنستاندا دەسەڵاتی دادوەری تایبەتی پێوەندیدار بە دادوەرەکان، بە گشتی سێجۆرن کە بریتین لە: دادگا گشتییەکان، دادگا ئابوورییەکان و دواتر دادگای نیزامی. لەم نێوەدا دادگا گشتییەکان لەژێر چاودێری ڕاستەوخۆی دادگای باڵا (دیوانی باڵای وڵات) ئەرکەکانی بەجێ دەگەیەنێ. ئەمانە دابەش دەکرێن بەسەر دادگای پارێزگاکان، شارەکانو قەزاکان. ئەو دۆسییانەی کە لە دادگا گشتییەکان پێی ڕادەگەن، لەکاتی پێویست بۆ پێداچوونەوە بۆ دادگای باڵا ڕەوانە دەکرێ. سەرۆکی دادگای باڵا لەلایەن سەرۆك کۆمار دەست نیشان دەکرێ. دادگا ئابوورییەکانیش بەسەر بەشی ماڵیو ئابوورییەکانی نێوان خەڵکانی حەقیقیو حقووقی پێ ڕاگەیشتن دەکا. ئەم دادگایانە لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵی دادگای باڵای ئابوورین و ئەم دادگایەیانەش لە کاتی پێویستدا وەك دادگا باڵاکان، سەرلە نوێ دۆسیە

(١) کولایی یاسای سەرەکی فیدراسیۆنی ڕووسیەو کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندی، لاپەڕەکانی ١٢٨ ـ ١٢٥



پێڕاگەیشتووەکان لە دادگا ئابوورییەکاندا تاوتوی دەکاو بڕیاری لە سەر دەدەن. سەرۆکی دادگای باڵای ئابووریش لەلایەن ناوەندی سەرۆك کۆمارەیەوە دیاری دەکرێ. دادگای نیزامی کۆماری تورکمەنستانیش لەژێر چاودێری دادگای باڵا، یان بە واتایەکی دیکە دیوانی باڵای وڵات چالاکی دەنوێنێنو بەسەر تاوانە نیزامییەکان ڕادەگەن.

لە تورکمەنستان دا قازی دادگاکان بۆ ماوەی پێنج ساڵ بۆ کاری دادوەری دیاری دەکرێن کە هەڵبەت خولی چالاکی ئەوانە دووبارە دەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر کارەکانیان جێی پەسند نەبێ، بە بڕیاری دادگا پاش تەواوبوونی خولی پێنج ساڵە، یان تەنانەت پێش ئەمەش لادەبرێن.

وەزارەتی داد کەسانی مەرجدار دەناسێنێ و سەرۆك کۆمار بڕیاری دانانیان دەردەکا. قازی دادگاکان جگە لە پیشەی مامۆستایی و توێژینەوە زانستییەکان مافی هیچ پیشەیەکی دیکەی نییە. هەروەها ئەوان لە ماوەی بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیاندا ناتوانن لە حیزبە سیاسییەکان یان گرووپەکانی دیکەی لەم بابەتە چالاکییان هەبێ. زێدەباری ئەوە کەسێك دەتوانێ ببێ بە قازی کە لانیکەم ٢٥ ساڵ تەمەن، ڕادەی خوێندەواری بەرزی یاساییو پێشینەیەکی باشی هەبێ، هەڵبەت لەش ساغی و باری دەروونی، هەروەها زاڵبوون بەسەر زمانی تورکمەنیو... هتد، لە مەرجەکانی دیکەی دادوەر بوونە.

## (٤ـ٣) حیزبە سیاسییەکانو ڕێکخراوە ئایینییەکان

سەرۆك کۆماری تورکمەنستان سەفەر مورادنیازئۆف، لەمەڕ دانان و دامەزراندنی دامەزراوە دێموکراسییەکان بەتایبەت حیزبەکان، ڕوانگەی ڕەهاو چەوسێنەرانەی خۆی بەسەر وڵاتەکەی خۆی دەسەپاند و جارناجارێکیش بە سەرنجدان بە بارودۆخ و گۆڕانکارییە نێوخۆییو دەرەکییەکان و گوشارە نێونەتەوەییەکان لەمەڕ دامەزراندنی ڕێکخراوەکان ڕوانگەگەلی جۆراوجۆری دەردەبڕی. بە جۆرێك لە دوایین وتەی ناوبراو لە ١٣٨٠/٥/٢٥، لەمەڕ ئازادی خەڵکی تورکمەنستان بۆ پێکهێنانی حیزب لەسەر بنەمای یاسا بەم جۆرە دوا:

"هاووڵاتیانی تورکمەنستان ئازادن لەم وڵاتەدا حیزب دابمەزرێنن و تەنانەت خەڵکانێك کە لە وڵاتانی دەرەوەن مۆڵەتی دامەزراندنی حیزبیان پێدەدرێ، بەڵام نابێ حیزبەکان بە شێوەی دەستکرد دابمەزرێن، چونکە لەم کاتەدا دەتوانین لە ماوەیەکی کورت دا ١٠ حیزب دروستبکەین لە کاتێکدا هیچ چەشنە بەرژەوەندییەك بە خەڵك ناگەیەنێ. ئێمە لە یاسای تورکمەنستان یاسای حیزبەکانمان هەیە، بەپێی ئەوە حیزبەکان دەتوانن دابمەزرێن بەڵام ئێوە

ناتوانن ئیزن بدەین گرووپێکی دژبەر، حیزب پێکبێنن و خەڵك بە لاڕێدا ببەن. لەگەڵ ئەوەی کە کۆمەڵگای تورکمەن ئامادەیی پێکهێنانی حیزب و گرووپی دژبەریان نییە"[١].

وتەکانی نیازئۆف لە کاتێکدایە بە سەرنجدان بە بارودرخی هەنووکەیی کۆمەڵگای تورکمەنستان، خوازیاران بۆ پێکهێنانی حیزب لە گۆرەپان نین.

ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا[٢] (OSCE) پێشتریش چەندین جار تورکمەنستانی بەهۆی نەبوونی کەشی سیاسی کراوە لەم وڵاتەدا، دێموکراسی و مافی مرۆڤ داوەتە بەر رەخنەوە[٣] بەڵام نیازئۆف بە خۆراگری لە بەرانبەر ئەم ڕێکخراوە ڕۆژئاواییانەدا گوتوویەتی: "ئەگەر کەسانێك، باس لە دێموکراسی دەکەن نێوەرۆکی دێموکراسییان بۆ دەرکەوتووە دەزانن کە ئێمە باشترین دێموکراسیمان هەیە".

سەرۆك کۆماری هەمیشەیی تورکمەنستان لەو بڕوایە دایە، کۆمەڵگای تورکمەنستان بۆ دامەزراندنی دێموکراسی بە شێوەی ڕۆژئاوایی ئامادەییان نییە. نیازئۆف بە گرنگیدان بەوەیکە هێندێك لە وڵاتانی دەرەکی دێموکراسی بەدوای خۆیاندا ڕادەکێشن، گوتی: "دێموکراسی ئەوەیە کە ئازادی خەڵكو یەکسانی لە کۆمەڵگا دابین بکا".

نیازئۆف لەو ئاخاوتنەدا بەم شێوە دەڵێ: "ئەوەی کە هەنووکە فەرمانڕوایانی تورکمەنستان بیری لێدەکەنەوە ئەوەیە کە لە کۆمەڵگای تورکمەنستاندا، چاکسازیو جووڵانەوە سیاسییەکان دەبێ بە ئەسپایی و قۆناخی جێبەجێ ببێو حیزبەکان خاوەنی رابردوویەکی پێویست بن، چونکە جگە لەمەش، پێکهێنانی حیزبەکان بەبێ لەبەرچاوگرتنی لێهاتووییان، کەڵکی نابێ".

بە باوەڕی نیازئۆف، حیزبەکان دەبێ جیا لە ئازادی، توانای سیاسییان هەبێ و بتوانن هێز پەروەردە بکەن. سەرۆك کۆماری تورکمەنستان لە هەمان کاتدا ئاریشەکانی هەبوو لە بنیاتنانی دێموکراسی و مافی مرۆڤ و دامەزراندی ڕێکخراوەکان لە وڵاتەکەیدا بە دەرئەنجامی کارکردی ڕێبەرانی سۆڤییەتی پێشوو لە ماوەی ٧٠ ساڵی رابردوو لە قەڵەم دەداو دەڵێ: "هیچ وڵاتێك ناتوانێ لە ماوەی ١٠ ساڵ گۆڕانی بەسەردا بێ ئەمە هەتا ساڵی ٢٠٠٨و ٢٠٠٩ درێژە دەکێشێ"[٤].

---

(١) هەواڵنێری کۆماری ئیسلامی لە عشق ئاباد ١٣٨٠/٥/٢٥

(2) Organization For Secrity and Copoerationin Europe

(3) htpp://www. hrw. org/Europe/Turkmenistan. php

(4) http://www. web. ommensty. org/web/ar2000web. nsf/countries/1cd



لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا نیازئۆف لە هەمبەر گوشارە بەربڵاوەکانی ڕۆژئاواداو ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لەمەڕ کردنەوەی کەشی کراوەی سیاسی وڵات بەرەنگاری کردووە، هەروەها پێداگری لەسەر تیۆری خۆی لە ڕاستای هەنگاو بە هەنگاو بۆ پیادە کردنی دێموکراسی دەکا.

هەروەها نیازئۆف لە هەمبەر چاکسازی لە تورکمەنستاندا بەمجۆرە دەڵێ: "چاکسازی لە تورکمەنستان قۆناخی گواستنەوەی کۆمەڵگا بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە ٢٠ ساڵ کاتی دەوێت و ئێمە بۆ هەموو کاروبارە حکوومییەکان لە ئەزموونی باوباپیرانی خۆمان کەڵك وەردەگرین".

نیازئۆف جەختی کردەوە کە ڕێکار بۆ پێکهێنانی حیزبەکان لە تورکمەنستان ئاوەڵایەو تەنانەت خەڵکانی نارازیش دەتوانن بەپێی یاسا حیزب پێکبێنن و نابێ بەدوای تێکدانی ئاسایشی خەڵك بن. نیازئۆف لەو بڕوایەدایە کە وڵاتەکەی هەروا لەگەڵ کۆمەڵێك پێشنیار بەرەوڕوویە کە خاوەنی ئەم پێشنیارانەیەو ماوەی گواستنەوەیان ئەزموون نەکردووە، لەگەڵ ئەوەی کە ئامادەی هاریکاری کردن لەو بوارەدا نین. ئەو لە پێوەندی لەگەڵ پڕۆپاگەندە بە دژی وڵاتەکەی بەم شێوەیە ڕای دەبڕی: "بە پێچەوانەی پڕۆپاگەندە بڵاوکراوە ڕۆژئاواییەکان و رووسیە، من هیچ بڕیارێکم بۆ زیندانی کردنی خەڵکانی سیاسی نەداوە و هیچ کەسێك بە تاوانی سیاسی لە گرتووخانەکانی تورکمەنستان بوونیان نییە.

نیازئۆف لە ساڵی ١٩٩١ لەمەڕ چاکسازی و تاودان بە دێموکراسی لە وڵاتەکەی گوتی: "ئەم گوشارانە لە کاتێکدا بۆ چاکسازی لەم وڵاتە دێتە ئاراوە کە هزری خەڵکی تورکمەن بۆ ئەم چاکسازییە ئامادە نییە".

نیازئۆف لە کۆڕی بەرپرسانی ڕێکخراوەکانی ئەندامی بزووتنەوەی نەتەوەیی ڕەستاخیزو حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستان و بەرپرسانی پارێزگاکانی وڵات لە بەرواری ١٣٨٠/١٠/٤ بەمجۆرە دوا: "ڕێژەی حیزبەکان ڕێگاچارەی سەرەکی یارمەتی بە خەڵك نییە". "حیزب دەبێ چاوگی خزمەت بە وڵاتەکەی بێ"و لە درێژەی ئاخاوتنەکەیدا بەم شێوە دوا: "لە زۆربەی وڵاتەکان دا کە حیزبەکان چالاکی دەکەن خەڵك برسی بوون، ژیانیان پڕ لە چەرمەسەری بەسەر دەبەن و هێندێك لە بەرپرسانی وڵاتەکان پۆز بە ڕێژەی حیزبەکانەوە دەدەن لەکاتێکدا لەگەڵ پرسی جۆراوجۆری گشتی بەرەوڕوون و نوێنەرانی حیزبەکان تەنیا قسە دەکەن".

بە باوەڕی نیازئۆف وڵاتەکەی پێکهاتەی کۆمەڵگای وڵاتەکەی نەریتییە و دەبێ بەرەبەرە بەرەو دێموکراسی هەنگاو هەڵبێنێ[1].

**ئەلف: حیزبە سیاسییەکان**

هەرچەند لە یاسای سەرەکی تورکمەنستاندا مافی دروستکردنی حیزبە سیاسییەکان گەرەنتی کراوە، بەڵام راستییەکی ئەوەیە کە حیزبی کۆمۆنیستی پێشووی تورکمەنستان لە گشت بوارو رەهەندە سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوورییەکانو هتد... بە کەڵك وەرگرتن لە شێوازو کردەوەی جۆربەجۆر کە لەلایەن باپیرانی خۆیان واتە حیزبی سۆڤییەت، پەروەردە کراون، هێشتا بەسەر کۆنترۆڵی سیاسی وڵاتی تورکمەنستان بالا دەستەو بە کەڵك وەرگرتن لە ئەزموونی چەندین ساڵەی تەشکیلاتی حیزبی، هەرچەند نێوی گۆڕیوە بەڵام هەمان نێوەڕۆك و بنیاتیان پاراستووە و لە تان و پۆی وڵاتی تورکمەنستاندا لە گشت بوارە جۆراوجۆرەکاندا، سەرکەوتوو و یەکەمینن.

تورکمەنستان تەنیا حیزبێکی یاسایی بەنێوی حیزبی دێموکراتی هەیە کە هەمان حیزبی کۆمۆنیستی پێشووە و سەرۆك کۆمار نیازئۆف سەرۆکایەتییەکەی وەئەستۆیە. ماددەکانی ١٦و ١٧ی یاسای بنەڕەتی تورکمەنستان تایبەتە بە ماف و ئازادیی خەڵکانی بیانی کۆماری تورکمەنستان. بەپێی ئەم دوو ماددەیە خەڵك لەسەر بنەمای یاسا خاوەنی ئازادی تەواون و هیچ کەس مافی ئەوەی نییە کەسێك لە ماف و ئازادییەکانی بێبەری بکا، یان رادە و سنووری بۆ دیاری بکا. ماددەی ١٧یەم بەتایبەتی جەخت لەسەر ئەم خاڵە دەکا کە هیچ جیاوازییەك لەنێوان خەڵکانی بیانی لەڕووی رەسەنایەتی، هەڵکەوتوویی، شوێنی نیشتەجێبوون، زمان، ئایین، باوەڕمەندی سیاسی و بەستراوەیی حیزبییەوە نییە، کە ئەم خاڵە بە سەرنجدان بە پێکهاتەی حەشیمەتی تورکمەنستان داگری هۆزو نەتەوە جۆراوجۆرەکانن کە ئایین و زمانی جۆراوجۆریان هەیە و لە بایەخێکی تایبەت بەهرەمەندن. ماددەکانی ٢٦ تاکو ٣٠، مافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکی بە فەرمی ناسیوەو ئازادی کۆبوونەوەکان، میتینگەکان، دامەزراندنی حیزبەکان و یەکیەتییەکان کە لە چواچێوەی یاسای سەرەکیدا کاردەکەن بە فەرمی دەناسێو شێوەی بەشداری سیاسی و کۆمەڵایەتی خەڵك دەستنیشان

(١) هەواڵگری کۆماری ئیسلامی، عشق ئاباد، ١٣٨١/١٠/٤



دەکا. لە راستیدا ئەم ماددانە بە جۆرێك دەسەڵاتی لە تورکمەنستان رادەگەیەنێ و دەلالەت لە کۆتایی سەردەمی نیزامی سیاسی یەکیەتیی سۆڤییەت دەکەن.

حیزبی دێموکرات کە تەنیا حیزبی حکوومی لە تورکمەنستاندایە نیازئۆف خولقێنەر و پێکهێنەریەتی و هیچ حیزبێکی دیکە لەم وڵاتە تا ئێستا نەیتوانیوە بە شێوەی فەرمی لەم کۆمارە مۆڵەتی هەڵسووڕانی ئازاد بەدەستبێنێ. لەم نێوەدا ئەگەر گرووپگەلێکیش هەبن کە خوازیاری دامەزراندنی حیزب بن و لە ترسی رەتکردنەوەی خواستەکەیان لەلایەن وەزارەتی داد و حکوومەتەوە لە کۆمارکردنی حیزبی خۆیان بواردەبێ. ئەم ترسە ئەوەندەیش بێهۆ نییە. چونکە رێبەرانی یاسای وڵات چەندین جار بێمەیلی خۆیان بۆ وەدواخستنی پرۆسەی فرەحیزبی کردنی وڵات نیشانداوە. بۆ وێنە سەرۆك کۆمار نیازئۆف لە پەیامی گرینگی خۆی بەبۆنەی کرانەوەی یەکەمین پارلمانی تورکمەنستانەوە لە ساڵی ١٩٩٢دا بەم جۆرە دەدوی:

"لەماوەی یەکەمین قۆناخی سەردەمی گواستنەوە، راگەیەنە گشتییەکان لە راستای پێشگیری لە ئەگەری گرژییەکان لەنێوان گرووپە ئەتنیکی و ئەو خێڵانەی کە لەم وڵاتە نیشتەجێن لەژێر چاودێریدا دەبن. ئەزموونی یەکەمی دراوسێکان پیشاندەدەن کە بڵاوبوونەوەی وتارو هەواڵەکان لەمەڕ مەسەلەکانی پێوەندیدار بە سنوورو خاکەوە دەبێتە هۆی بووژانەوەی هەستی نەتەوەیی و ئەمەگناسی بەهۆزی تایبەتی خۆیان، ئەم کارە شەڕو ئاژاوەی لێدەکەوێتەوە. ئێمە رێچکەیەکی دێموکراتیکمان بۆ کردنەوە و ژیانی خۆمان هەڵبژاردوە و لەم رێگایەوە ئێمە باوەڕی تەواومان بە ژیانێك و سیستمێکی فرەحیزبی هەیە. بەڵام لە قۆناخی گواستنەوەدا دەبێ زۆر خۆپارێز بین چونکە نیزامی فرەحیزبی دەتوانێ یارمەتی بە پەرەگرتنی هێزە دژبەرەکان و ئاڵۆزی نێوخۆیی بدا. ئیدئۆلۆژی دەوڵەت نابێ ئیدئۆلۆژیەکی تایبەت بە حیزبێك بێو ئارمانجی ئەو هێنانەدی بەرژەوەندییەکانی خەڵك بێ. بنەمای ئەم ئیدئۆلۆژییە یەکگرتوویی خەڵك و سەرۆك کۆمارە. پشتیوانی خەڵك لە حکوومەتی ئێمە زۆر گرینگ و حەیاتییە[1].

لە راستای ئەم بۆچوونانەی نیازئۆفدا، حکوومەتی تورکمەنستان لە هێندێك شوێنیدا بۆ پیشتگیری لە بەرزبوونەوەی نارەزایەتی کەڵکی لە توندوتیژی وەرگرتووە. بۆ وێنە "شێرکۆ عەلی نوورمۆرادۆف" شاعیری ناسراو کە لە هەڵسووڕانی حیزبی گەشەی دێموکراسی

(١) پەیامی نیازئۆف بەبۆنەی کردنەوەی یەکەمین پارلمانی تورکمەنستان، ١٩٩٢

تورکمەنستان ناچار کرا بۆ وڵاتی ئازەربایجان کۆچ بکا[١]. بە هەرحاڵ نیازئۆف لە چەندین بۆنە ڕایگەیاندووە کە کۆمەڵگای تورکمەنستان هێشتا ئامادەیی پلۆرالیزمی سیاسی نییە. بەڵام لە مانگی مای ٢٠٠١، جارێکی دیکە نیازئۆف باسی لە دانان و دامەزراندنی سیستمێکی فرەحیزبی لە تورکمەنستان دەکرد. ئەم واتانە کاتێك لەلایەن سەرۆك کۆمار بەیانکرا کە لە ناوبراو لە ڕێگای تەلەڤیزیۆنی نەتەوەیی بۆ خەڵکی تورکمەنستان دەدوا، نیازئۆف لەم ئاخاوتنەدا ڕایگەیاند کە هیچ چەشنە سنووربەندییەکی بۆ دامەزراندنی حیزبە سیاسییەکان لە تورکمەنستاندا نییە. بەڵام دامەزراندنی ڕێکخراوگەلێك لەسەر بنەمای چاوگ، ڕێوشوێنی ئایینی، نەتەوەیی یان خێڵەکی بێ، قەدەغەو مۆڵەتی دامەزراندنیان پێ نادرێ.

زێدەباری ئەو، سەرۆك کۆمار نیازئۆف بەڵێنییدا کە یاسایەك پێشتر لەلایەن وەزارەتی دادی وڵاتەوە بۆ دانی مۆڵەتنامەو پێکهێنانی حیزبێك لەسەر بنەمای واژۆی ١٠٠٠ کەسی هەڵوەشاندنەوەو لەمە بەدواوە ئەم ڕێژەیە دابەزی بۆ ٥٠٠ کەس.

بە هەرحاڵ تا نیوەی ٢٠٠١، هیچ تەڤگەرێکی بەرهەڵستکار یان ڕێکخراو لە وڵاتی تورکمەنستاندا تۆمار نەکراوە. تەنانەت حیزبی یەکسانی وەرزێران کە بە مۆڵەت و پەسندو پێشنیاری نیازئۆف لە سەرەتای سەربەخۆیی وڵات بڕیار بوو وەك باڵێك و حیزبێك لە پارلمان، مۆڵەتی چالاکی فەرمی و یاسایی هەبێ. هەنووکەش بۆ تۆمارکردن و وەرگرتنی مۆڵەتنامە لەلایەن وەزارەتی دادی وڵاتەوە ڕێگای پێ نەدراوە[٢].

نیازئۆف لە ٢٨ی دێسامبری ١٩٩٩، کاتێك لەلایەن شوورای بەرژەوەندی گەل بە سەرۆکی هەمیشەیی وڵات دیاریکرا، لە هەمبەر چالاکی حیزبەکان گوتی کە ناوبراو دەرفەتی پێکهاتن بە ڕێکخراوگەلی ئیسلامی بە هیچ شێوەیەك نادا.

لێرەدا پێویستە شرۆڤەی تاکە حیزبی فەرمی تورکمەنستان بکەین:

حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستان[٣]

لە ١٦ی دێسامبری ١٩٩١و لە کۆنگرەی بیست و پێنجەمی حیزبی کۆمۆنیستی تورکمەنستان (CPT)دا، حیزبی کۆمۆنیست، هەڵوەشاوە و ئەم حیزبە بە فەرمانی سەفەر

(١) ئایگۆرراتر، ئایا ئاسیای ناڤین دەتەقێتەوە؟ وەرزنامەی توێژینەوەی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ساڵی دووهەم، ژمارەی ١، هاوینی ١٣٧٢، لاپەڕەی ٢٠٣

(2) Reyional Surveys of the World, p. 427

(3) Democratic Party of turkmenistan



نیازئۆف گۆڕا بە حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستان و وەکوو تەنیا حیزبی یاسایی و فەرمی وڵات ناسرا.

نیازئۆف لە سەرەوەی هەرەمی ئەم ڕێکخراوە هەڵکەوتووە. ئەم ڕێکخراوە لە ڕاستیدا پێکهاتەو بناغەی تەشکیلاتی هەمان حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤییەتی هەیە. حیزبی دێموکراتی تورکمەنستان نوێنەرایەتیو لقی لە هەر پێنج پارێزگاو شارو قەزاکاندا هەیە. تەواویی بڕیاراتی حیزبی لە عەشق ئاباد دەدرێ. چالاکییە سیاسییە ناوچەییەکانی ئەم حیزبە قەدەغەو لەکاتی سەرپێچی لە بڕیاراتی ناوەند لەگەڵ کاردانەوەیەکی توند ڕووبەڕوو دەبن. حیزبی سیاسی هەنووکە لەم وڵاتەدا نییە. حیزبی دێموکراتیك، هێندێ جار ساڵانە کۆنگرەکانی بە شێوەی ڕێك و پێك بەڕێوەدەبا. ئەم حیزبە خاوەنی ٤٤٥ نوێنەرو لە ١٣ شارو ٤٢ شارۆچکە، نزیکەی ٣٠٠٥ ئەندامی سەرۆکی و ٧٥ هەزار لایەنگری هەیە.

لەم حیزبەدا ٤٧ ئەتنیك نوێنەریان هەیە کە ٨٠ لە سەدی تورکمەنەکانن. لە ساڵی ١٩٩٦ دووهەمین کۆبوونەوەی حیزب بەڕێوەچوو. ئەم حیزبە حەوتوونامەیەك بە نێوی "سیاست صحبت دانش" واتە "وتووێژە سیاسییەکان" بە زمانی تورکمەنیو مانگ نامەیەك بە زمانی ڕووسی بڵاو دەکاتەوە[١].

**- ڕێبەرایەتی حیزب**

ڕێبەرایەتی حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستان DPT لەژێر فەرمانڕەوایی بێئەملاو ئەولای سەرۆك کۆمار نیازئۆفە. لە مەڕ جێنشینی گریمانەیی بۆ سەرۆکی حیزب، ناتوانین هەنووکە گریمانەی کەسێك بکەین. چونکە لە بارودۆخی ئێستادا ناتوانین کەس وەك ئالتەرناتیڤ لەقەڵەم بدەین. لە بڕگەیەك لە زەمەن، وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی، بۆریس شێخ مورادئۆف وەك کەسی دووهەم و کەسایەتییەکی بەهێز لە کۆبوونەوە سیاسییەکان ناسراو بوو و کە دەیتوانی دوای نیازئۆف لە ئاستی حیزب و تەنانەت وڵاتیشدا بناسرێ، بەڵام بەرپرسانی دەزگای حکوومی ڕایانگەیاند کە شێخ موراد ئەرمەنییە و هەر ئەمە بوو بە هۆی سەرنەکەوتنی شێخ مورادئۆف. چاودێرانی سیاسی لەو باوەڕەدان لە پێوەندی لەگەڵ ڕێبەرایەتی و ئیدارەی ئەم حیزبەدا، لایەنە ڕاستییەکانی ڕێبەری حیزب بە شێوەی شاراوە ماوەتەوەو ڕاستییەکان دوای نیازئۆف دەردەکەون.

(١) حوسێن کەریمی، تورکمەنستان (تاران: ئینتشاراتی ناوەندیی توێژینەوەی سیاسی و نێونەتەوەیی، ١٣٧٩)، لاپەڕەکانی ٢١٥ ـ ٢١٤

### ـ گەلاڵەو ئارمانجەکانی حیزب

حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستان DPT لە ساڵی ١٩٩٤دا یاسانامەیەکی بلاوکردەوە کە لەم یاسانامەیەدا سیاسەتی حیزبییان بەم جۆرە باسدەکا: حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستان، پشتیوانی چاکسازی ئابووری و دێموکراتیکە لە وڵاتداو لەم بوارەدا هەنگاو هەڵدێنێ.

لەم بەیاننامەیەدا کردەوە حیزبییەکان بە شێوەی رەوایی باسیکراوە کە رەگی چاکسازی و دێموکراتیك بوونی وڵاتە. ئەم حیزبە بانگەشەی ئەوە دەکات کە وەك حیزبێك، پشتیوانی مافی مەدەنی خەڵك و هاووڵاتیان و پشتیوانی حکوومەتی یاساو یەکسانی ئەتنیکی لە تورکمەنستان دایە. لە یاسانامەی حیزبدا هاتووە کە رێبەرایەتی حیزب باوەڕی قووڵی بەگەیشتن بەم ئامانجانە هەیەو وەبیر دێنینەوە گەیشتن بەم ئامانجانە لە کورت ماوەدا وەدی نایەت و رایگەیاندووە هەنووکە ئازادی سیاسیو دێموکراتیك نزۆکە، نیازئۆف وەك سەرۆکی ئەم حیزبەیە، ئارمانجی سەرەتاییو خێرای ئەم وڵاتە لە ئێستادا پاراستنی هێمنی و سەقامگیری وڵات لە قەڵەم دەدا. ئەندامانی سەرەکیو رێبەرانی راستەقینەی ئەم حیزبە لە راستیدا رێچکەی حیزبی کۆمۆنیستی تورکمەنستانی پێشوویان لە بیرو ئیدئۆلۆژی خۆیاندا هێشتوونەتەوەو هیچ کات بەریانیان بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی ئازادو مەدەنی لەسەر بناغەی حکوومەتی یاساو لەسەر بنەمای ئیرادەی گشتی خەڵك و جیایی لە ناوەندی دەسەڵات یاسادانەرو دادوەری و بەڕێوەبەری نەبووە. رێچکەو ئەندێشەی رێبەرانی ئەم حیزبە لەسەر بنەمای رێوشوێنی حیزبی کۆمۆنیستەو نزیك بوونەوە لە بازاڕی ئازاد، هەروەها رێوشوێنی پێوەندیدار بە مافی مرۆڤ و شارستانییەتی قەبوول نییەو لەو بڕوایەدان جیایی هێز، کۆمەڵگای تورکمەنەکان بۆ لای بێسەرو بەریوئاڵۆزیو لەناوچوونی وڵات پاڵ پێوە دەنێ و رێگای گەیشتن بە سەربەستیو پێشکەوتن تەنیا بەهۆی هێزی و رێبەری نیازئۆف دێتە ئاراوە.

### ـ ئەندامەتی و وەرگیران لە حیزبدا

ئەندامەتی لە حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستاندا وەك ئیمتیازێکی تایبەت و سنووردار بە ئەژمار دێ. ئەم ئیمتیازە لە سەردەمی حیزبی کۆمۆنیستی پێشووی تورکمەنستاندا وەك دانی ئیمتیازێك بە ئەژمار دەهات. رێژەی ئەندامانی حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستان نزیکەی ٦٠٠٠٠ کەسی بەراورد دەکرێ کە بە شێوەی راستەوخۆ لەنێو حیزب دان بەڵام بارستایی گشتی ئەم حیزبە نزیکەی ١١٦٠٠٠ کەسی دەبێ.



ئەندامانی نوێ بە مەبەستی پەیوەست بوون بەم حیزبە پێویستی بە پشتگیری و پێشنیاری کەسانی جێی باوەڕ هەیە. ئەم پێشنیارو راسپاردانە لە سەردەمی حیزبی کۆمۆنیستیشدا باوی هەبوو. چونکە بۆ ناوەندیی حیزب مەرج و رەوتێکی درێژماوەی پێویست بوو کە ئەم رەوتەی وەرگرتنە بریتی بوو لە خولێکی تاقیکردنەوەی لێهاتووییو قۆناخی وەگرتنی کۆتایی بەدواوە بوو.

لە ساڵی ١٩٢٤دا نیازئۆف دەستی دایە بەرنامەیەکی سەرەکی لەمەڕ بەرفراوانکردنی رێژەی ئەندامانی حیزب و چالاکی ئۆرگانە سەرەتاییەکانی حیزبی لە ئاستە جۆربەجۆرەکانی وڵاتدا پەرەپێدا.

گشت ئەندامانی سەرەکی حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستان لە پۆستە هەستیارەکانی وڵاتدا بەتایبەتی لە بواری رۆژنامەکان و کەناڵە تەلەڤیزیۆنەکان، ئێزگە رادیۆییەکان رۆڵێکی سەرەکییان هەیەو پێگەیەکی تایبەتییان هەیە.

### ـ رۆڵو کارکردی حیزب

ئەرکی حیزب، پشتیوانی لە پلانەکانی دەرەکی و نێوخۆییەکانی سەرۆك کۆمارە. ئەندامانی حیزب بە نۆرە ٨٢و ٩٥ لە سەدی کورسییەکانی شوورای بەرژەوەندی گەلو پارلمانیان لە بەردەست دایە[1]. بەم پێیە حیزبی دێموکرات فاکتۆرێکی سیاسی سەرەکییە بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکانو هێنانەدی ئارمانجەکانی سەرۆك کۆمار. ناوەندی ئەم حیزبە لە شاری عشق ئاباده[2].

نیازئۆف لە بەرواری ٤/١٠/١٣٨٠ لەمەڕ رۆڵی ئەم حیزبە بەم جۆرە دەپەیڤێ:

"حیزبی دێموکراتی ئێمە لەم ماوەدا، واتە لە کاتی سەربەخۆییەوە، دەستێوەردانی لە کاروباری حکوومەت و پرسە یاساییەکان نەکردووەو رای زۆرینەی لە بەر چاو دەگرێ، حیزب بە بێ پشتیوانی ماڵی حکوومەت درێژەی بە چالاکی خۆی بە شێوەیەکی جێی شیاو داوە[3].

### ـ پێگەو بوودجەی حیزب

ئەم حیزبە وەك حیزبی دایك[4] لە وڵاتی تورکمەنستاندا ناسراوە کە دەسەڵات و باندۆری لە بن نەهاتووی بە سەر چالاکییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا هەیەو هەروەها باسکی سیاسی و

(1) http://www. broadlet. org/tm. htm
(2) Regional/survery of the World
(٣) هەواڵگری کۆماری ئیسلامی عشق ئاباد ١٣٨١/١٠/١٤
(4) Mother Party

پڕوپاگەندە و گەشەپێدەری چالاکی دەزگا حکوومییەکان لە تەواو شوێنەکانی وڵاتدایە. ئەم حیزبە وەك پشتیوان و دایکی حیزبە دژبەرەکان بە حسێب دێ بە مەرجێك ئەمەگناس بن بە سەرۆك کۆماری وڵاتی تورکمەنستان و یاسای سەرەکی وڵات. حیزبی دێموکراتی تورکمەنستان. بە شێوەی نەریتیو رێچکەی حیزبی کۆمۆنیستی پێشووی بەدەستەوە گرتووە. دروشم و پڕوپاگەندەی ئەم حیزبە بۆ پاراستنی بارودۆخی هەنووکە (preserving stabiliy) و ئاشتی مەدەنی (Civil Peace) و هەڤبەندی ئەتنیکی نێوخۆییە (Intertrhnic Accard).

پڕوپاگەندەی حیزب بەردەوام لەمەڕ گەورە نیشاندانی ئەم حیزب بووەو بۆ خۆ بە زل زانینی ئەم حیزبە دەتوانین ئاماژە بە دانی رێژەو بارستایی پێرسۆنێل و کادرەکانی ئەم حیزبە بکەین. بە جۆرێك تاکو ئێستا رایانگەیاندووە کە ئەم حیزبە ١٦٥ هەزار کەس ئەندامی هەیە. ئەمە لە کاتێکدایە رەخنەگران و نارازیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە زۆرینەی شارۆمەندانی تورکمەنستان لەسەر وەها حیزبێك زۆر کەمی زانیارییان هەیە.

لە پێوەندی لەگەڵ رادەی بودجە و تێچوویییەکانی حیزبی دێموکراتی تورکمەنستان هیچ چەشنە بڵاوکراوەیەکی ئاشکراو فەرمیی نییە.

بەڵام بە شێوەی گریمانەکراو مووچەیەکی دیاریکراوی لە ئاستە جۆراوجۆرەکاندا بە بەرپرسان و کادرەکانی حیزب دەدرێ[1] حیزبو رێکخراوە دژبەرو بەرهەڵستکارەکانی تورکمەنستان

**١ـ رێکخراوی یەکگرتووی گەل (ژێرزەوینی)**

بیرۆکەی دامەزراندنی رێکخراوی یەکگرتوویی گەل لە راستیدا لە سەردەمی سۆڤییەت و لە قۆناخە جۆراوجۆرەکاندا ئەم هزرانە لە بری هێندێك لە رووناکبیران رەنگی دەدایەوە. کەسانێك کە لە لوتکەی لیژنەی فەرمانڕوایی تورکمەنستاندا بوون چاوگو ئەندێشەکانی رێکخراویان خولقاندبوو کەسانێك وەك: نادر بای عەتاکەیف سەرۆك کۆماری تورکمەنستان لە سۆڤییەت لە ساڵی ١٩٢٤دا. قیقەر عەتابایەف سەرۆك وەزیرانی تورکمەنستان لە ساڵی ١٩٢٤، شاچە باتیرئۆف سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیستی تورکمەنستان لە سۆڤییەت لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٩ تاکو ١٩٧٥داو بە مەبەستی گەشەو پەرەپێدانی ئەندێشەی ئەم رێکخراوە لە ساڵەکانی ١٩٣٠ تاکو ١٩٥٠دا کەسانێك وەك: بەردی کربابایەف، بەکی سەعید ئۆفو کۆمەڵێکی دیکە هەوڵیان داو ساڵانێکی زۆر لە گرتووخانە شاراوەکانی

(1) http://www. lupinfo. com/country-guide-study/turkmenistan



(کا، گ، ب) ژیانیان بردە سەر. بۆ وێنە کەسایۆف کە لە تەواو یەکیەتیی گەلانی سۆڤییەت کەسێکی بەرچاوو رووناکبیر بوو لە ساڵی ١٩٧٥ بە هۆی ئەم ئامانج و ئەندێشەیەی (رێکخراو) کەوتە گرتووخانەو دواتر کوژرا.

ـ بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم رێکخراوە دەگەڕێتەوە بۆ پێش پرۆستریکا (کەشی کراوەیی سیاسی)

دوای راگەیاندنی پرۆسترویکا لە گشت یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤییەت هەستی سەربەخۆیی سیاسی بە تێپەڕبوونی کات پتر دەبوو. لە ساڵی ١٩٨٩، لە تورکمەنستان هەڵبژاردن بە مەبەستی پێکهێنانی شوورای باڵا یان هەمان پارلمان پێکهات و لەسەر بناغەی رێوشوێنی سیاسیو ئەوەی کە هەڵبژاردن لە کەشێکی کراوەی سیاسی رەنگی دێموکراتیك بە خۆوە بگرێ، هەوڵدرا لە گشت توێژەکان لەم هەڵبژاردنە وەك نوێنەر بەشداری بکەن کە لەم نێوەدا یەکێك لە کرێکارانی کارخانەی قەندی عشق ئاباد بۆ ئەم پارلمانە هەڵبژێردرا. ئەم کەسە ئاقا محەممەدئۆف بوو. لە قۆناخی بارودۆخی کراوەی سیاسی، لەلایەن حکوومەت شویۆنێك لە چوارچێوەی هەڵبژاردنەکان بۆ ئاخاوتنی نوێنەر دیاریدەکرا کە ئەم تریبوونە کەشێك بوو بۆ ئەندێشە راشکاوەکان.

یەکەمین بەردی بناغەی پێکهاتنی ئەم رێکخراوە بە رێژەیەکی کەم لە خوێندکارانی زانکۆو هەڵسووڕاوانی سیاسیو بە ئەندێشەو هزری دژی کۆمۆنیستی بیچمی گرت. بەڵام بە پێکهاتنی ئەم رێکخراوە تۆڕە ئەمنییەکانی نیازئۆف دەستیان دایە ناساندنی ئەندامان و مۆرە سەرەکییەکانی ئەم رێکخراوە. لە ساڵی ١٩٩٠ەوە نوور بەردی ئۆف وەك رێبەری رێکخراو هەڵبژێرا. یەکێك لە بەرنامە سیاسییەکانی رێکخراو سەربەخۆیی سیاسی و سەربەستی وڵاتی تورکمەنستان لە رووسیە بوو. دووهەمین ئامانجی سەرەکی رێکخراو ئازادی ئایین بوو.

بە تێپەڕبوونی زەمان و گوشاری دەزگا ئەمنییەکانی تورکمەنستان و گرتنی سەرکردەکانی ئەم رێکخراوە لەوانە مۆراد خۆجە مۆرادئۆف دەربازبوونی هێندێك لە ئەندامانی ئەم رێکخراوە یەك لەوان محەممەد موراد سەلامەت ئۆف بۆ مسکۆ ئەم رێکخراوەی لەگەڵ ئاریشەی ماڵیو هێز بەرەوڕوو کرد، هەروەها نەناسراوی لە ناو خەڵکدا، نەبوونی زانیاریی سیاسی ئەوان لەسەر ئەم رێکخراوە بەرهەڵستکارەیە کۆمەڵێك ئاریشەی دیکە بوون.

پێکهاتەی سەرەکی ئەم رێکخراوە لە ژوورنالیستەکان، نووسەران، شاعیران، پەیکەرتاشەکان، فەرمانبەران بوون و رادەی تەمەنیان لە نێوان ٢٥ تاکو ٤٠ ساڵدا بوو(١).

**٢ـ بزاوتی دێموکراتیکی خەڵکی تورکمەنستان:**

(The Democratic Movement of Turkmenistan Peoples)

ئەم تەڤگەرە دژبەرە لەلایەن بۆریس شێخ مورادئۆف سەرۆك وەزیرانی پێشوو، هەروەها وەزیری پێشووتری دەرەوەی تورکمەنستان دامەزرا(٢).

دوای ئەوەی کە بوریس شێخ مورادئۆف(٣) لە حکوومەتدا دەرکراو وەلانرا. ناوبراو جووڵانەوەی بەرهەڵستکاری دێموکراتیکی لە مسکۆ لە ژانوییەی ٢٠٠٢ پێکهێنا. شێخ مورادئۆف کە پێشتر رۆژنامەڤان بوو لە پێوەندییەکانی جێگای سەرنجی کە دەگەڕێتەوە بۆ پێوندی پێشووی لەگەڵ رۆژنامەڤانە رووسییەکان و بە کەڵك وەرگرتن لەم پتانسیەلە چاپەمەنییەکان تاوی بە هێرشی راگەیاندنی خۆی لە ناوەندی راگەیەنە گشتییەکانی رووسی بۆ سەر حکوومەتی نیازئۆف دەداو بەردەوام باسی لە هەڵبژاردنی دێموکراتیکی ئازاد، پێشێلکردنی یاسای بنەڕەتیو پێشێلکردنی مافی مرۆڤ دەکرد(٤).

شێخ مورادئۆف بۆ ماوەی ١٠ ساڵ رۆژنامەڤانی ئاژانسی هەواڵی تاسی(٥) لە هێندووستان و پاکستان بوو(٦).

**٣ـ حیزبی یەکیەتیی (ئاگزی بیرلیك) Agzy Birlik**

پێکهاتنی ئەم حیزبە بەرهەمی سەردەمی گلاسنۆستی گۆڕباچۆفە. حیزبی یەکیەتیی بە مەبەستی وشیار کردنەوەی خەڵکی تورکمەن لە بواری مێژوویی، کولتووری، زمانی باوك و باوپیرانی خۆی لە ساڵی ١٩٨٩دا پێکهات. رێبەری حیزب وەئەستۆی نوورەوەدی محەمەد ئۆفەو ناوەندەکەی لە عشق ئاباد پێتەختی تورکمەنستانە. ئەم حیزبە لە سەرەتاوە وەك ناوەندو هێزێکی ناسیاسی لە کۆماری تورکمەنستان ناسرا، بەڵام پاش سەربەخۆیی وڵاتی تورکمەنستان

(١) دەفتەری هەواڵنێری لە عشق ئاباد
(2) http://www. asasource. org/new
(3) Boris Shikh Murodov
(4) http://www. asasource. org/news
(5) Tass Agency
(6) http://www. eurasianet. org/depatmeentsinsight/articles



لە ساڵی ١٩٩١ حیزبی یەکیەتیی هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری دا، تا وەك حیزبێکی سیاسی لە گۆڕەپانی سیاسەت و دەسەڵات لە تورکمەنستان بیچم بگرێ، بەڵام هەروەك حیزبی گەشەی دێموکراتیکی (PDO) لە تۆمارکردنی خۆی سەرکەوتوو نەبوو(١).

هەرچەند قانوونی سەرەکی ساڵی ١٩٩٢ی تورکمەنستان مافە پێوەندیدارەکان بە ئازادییە ئایینییەکان و جیایی کەڵیسا لە حکوومەت، ئازادی تەڤگەرەکان، ئازادی شاردنەوەی نهێنییەکان، خاوەنداریەتی، سامانە تایبەتییەکانی پەسند کردووە، هەروەها لەم یاسای بنەڕەتییە لەمەڕ رێکخراوەکان و دامەزراوە گشتییەکان، مافی دامەزراندنی حیزبە سیاسییەکانو دامەزراوە گشتییەکانی دیکە کە لە چوارچێوەی یاسای بنچینەییو یاسا پەسندکراوەکانی وڵاتی تورکمەنستاندا چالاکی بکا گەرانتی کردووە، بەڵام لە یاسایەکی دیکەدا کە دواتر پەسند کرا، ئەو حیزبانەی کە بانۆری نەگەتیڤیان لە سەر کردەوەی خەڵك هەبێ ( The of Marals and Health)، هەروەها پێکهێنانی حیزبی ئەتنیکیو ئایینییەکان ( Formation of Ethnicro Religious) قەدەغە راگەیێندراوە. ئەم رەشنووسە مەرجدارە، دیکۆمێنتێکە کە حکوومەتی تورکمەنستان پێش بە چالاکی چەندین گرووپی گرت.

لە وەها کەشێکدا چالاکی بەرهەڵستکارانە لە تورکمەنستان لە بنچینەوە، کپ دەکرا. لەم رووەوە حیزبی ئاگزی بیرلیك کە لە ساڵی ١٩٨٩ ناودێر کرابوو لە خەڵکانی خوێندڤان پێکهاتبوو، گەلاڵەی حیزبیان لە سەر بنەمای کۆمەڵگایەکی دێموکراتیکی فرە حیزبی دارشت و ئەمە وێنەی مۆدێلی تورکیە بوو (Turkish Model).

حیزبی یەکیەتیی، بەرنامەی کار و چالاکی خۆی لەبابەت ئەو پرسانە کە توانایی و دەسەڵاتی نەتەوەیی، هەروەها رەوگەو ئەو مەسەلانەی کە ببێت بە ئەڵترناتیڤی میراتی سیاسی کۆمۆنیست، کۆکردبۆوە، بەڵام پاش راگرتن و یاساغ کردنی چالاکییەکانی لە ژانوییەی ١٩٩٠دا ئەندامانی ئەم حیزبە، گرووپێکی دیکەیان بە نێوی حیزب بۆ گەشەی دێموکراتیك دامەزراند کە لەم بنەڕەتەوە، لە هەمان ئەندێشەی حیزبی یەکیەتیی پێشوو سەرچاوە دەگرێ(٢).

حیزبی کۆمۆنیستی حکوومەتی تورکمەنستانیش بەدەست بەسەر داگرتن و راگرتنی گشت هەبووەکانی حیزبی یەکیەتیی (ئاگزی بیرلیك) گورزێکی توندی لە پەیکەری ئەم حیزبەدا بە

(1) World Encycnlopedia
(2) http://www. 1upinfo. country-quid-studyturkmenistan

جۆرێك کە لە رووی داراییەوە لەگەڵ تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر رووبەڕوو بۆوە کە لە ژانوییەی ١٩٩٠دا بە فەرمی پێش بە هەڵسووڕانی ئەم گرووپە گیرا[١].

حیزبی ئاگزی لیك بە شێوەی سرووشتی لەکاتی پێکهاتنییەوە لە تورکمەنستان لە هێنانەگۆڕی گرووپێکی بەرهەڵستکاری سیاسی خۆی دەبواردو رێچکەو حەرەکەتی خۆی بەلای کاروبارو پرسە نانۆرمە کولتووری و کۆمەڵایەتیو پرسە ئابوورییەکانەوە پاڵ پێوە دەنا حکومەتی ئەوکاتی بۆ پێشگیری لە درێژەی چالاکی ئەم حیزبە نوێیە لە سەرەتاوە پێشیان بە چاکسازی ئەم جوولانەوە گرت.

گرینگترین پلانەکانی حیزبی یەکیەتیی بووژانەوەی سەرلەنوێی هەستی نەتەوایەتیی تورکمەنستان بوو کە لەنێو گەڵاڵەکانی خۆی گونجاندبوو، ئەوە بوو کە دەستی بە بەڕێوەبردنی گرینگترین خۆپیشاندانەکان کرد. یەکەمین بزاوتی خۆی لە ١٤ی ژانوویەی ١٩٩٠ لە گۆگ تەپە (goktepe) کە شوێن و ناوەندی بەرەنگاری مێژوویی تورکمەنەکانە لە سەردەمی حکومەتی رووسیەدا، دەستپێکرد. لەم خۆپیشاندانە لەگەڵ هەڕەشەو گوڕەشەی بەرپرسانی حکوومی نزیکەی ١٠ هەزار کەس بەشدارییان لە رێز گرتن لە گیان بەختکردووەکانیان بە دەستی رووسەکان لەو شوێنە واتە "گوگ تەپە" کرد.

رۆژی دواتر لە کۆبوونەوەی بەرپرسانی حکوومی تورکمەنستان بزاوتی حیزبی خەڵکی ئاگزی بیرلیکیان نایاسایی راگەیاند و پێش بە هەڵسووڕانی ئەم حیزبەیان گرت[٢].

لە ژانوویەی ٢٠٠٠دا نووروەردی محەمەدئۆف، بە تاوانی خوێڕیگەریو هەوڵدان بۆ کوشتنی کەسێك لەلایەن تۆڕە ئەمنییەکانی تورکمەنستانەوە دەستبەسەر کرا. بەڵام هۆی راستەقینەی قۆڵبەستکردنی ناوبراو بەدوای وتووێژەکانی لەگەڵ دەنگی ئەمریکاو رادیۆی ئازادی کە تێیدا رەخنەی لە کردەوەکانی نیازئۆف و بەرپرسانی حکوومی گرتبوو، هاتە ئاراوە. محەمەدئۆف لە بەرنامەیەکی رواڵەتی تەلەڤیزیۆنی کە لەلایەن تۆڕە ئەمنییەکانی تورکمەنستانەوە رێکخرابوو، ناچار کرا کە داوای لێبوردن لە نیازئۆف بکاو پەژیوانی لە کردەوەکانی خۆی دەرببڕێ . پاشان لە دێسامبری ٢٠٠٠دا، لە بڕیاری لێبوردنێکی گشتی کە لەلایەن نیازئۆفەوە دەرکرا، محەمەد ئۆفیش وەبەر ئەم لێبورنە کەوت[٣].

(1) http://www. encartanmsn. com/encent/refpages/rearyical. aspx
(2) Regional Surveys of the World, Eastern Europe, Russia and Central Asia 2020, P. 44
(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو



### ٤ـ حیزبی سۆسیال دێموکراتیك (The Social Democratic Party)

لە ساڵی ١٩٩٦ ئەم حیزبە لە ناوەندی پێتەختی عەشق ئابادی تورکمەنستان دامەزرا. بەپێی زانیارییەکان، دامەزرێنەرانی ئەم حیزبە لە چەندین دامەزراوەو گرووپگەلی نافەرمی شاراوەی بچووك پێکهاتووە، بەڵام لەو کاتە بەدواوە هیچ چەشنە زانیارییو هەواڵێك لەوان بڵاونەکرایەوە، جگە لەوەی کە لە دەرەوە کۆمەڵێك خەڵك و کادرو لایەنگرانیان لە کۆبوونەوەی گرووپە یەکگرتووەکان بەشدارییان دەکردو نێوی ئەم حیزبەش بەشێك لە واژۆکەرانی راگەیاندنی گرووپی یەکگرتوو، لە دوایین لیستەکەدا هاتووە[١].

### ٥ـ حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی (The Party of Islamic Renassance)

ئەم حیزبە ئیسلامییە کە پاش تێکچوونی یەکیەتیی سۆڤییەتو بووژانەوەی سەرلەنوێی ئایینی ئیسلام لە وڵاتی تورکمەنستان، دوای تێپەڕبوونی ٧٤ ساڵ دەسەڵاتی بەهێزی ئیمپراتۆرییەکانی تێزاری و سۆڤییەت دروست بوو. هەرچەند بە شێوەی فەرمیو یاسایی تۆمار نەکراوە، بەڵام لە سەرەتای سەربەخۆییەوە چالاکی دەستپێکرد، بەڵام بە داخەوە بە هۆی ئەندێشەی نیازئۆف و یاسای بنەڕەتی وڵاتی تورکمەنستان کە وڵاتی تورکمەنستان بە لائیك لەقەڵەم دەدا، ئەم حیزبە ناچار بوو بە شێوەی نهێنی چالاکی بکا بەڵام لە کارکردو ژیانی هیچ زانیارییەك و هەواڵێك نییە[٢].

ئەم حیزبەش لە سەردەمی سۆڤییەتی پێشوودا ناو و ناوبانگی هەبوو بەڵام بەهۆی پێکهاتەی داپڵۆسێنەرانەی سۆڤییەت هیچ کات نەیتوانی وەك دوای سەربەخۆیی، خۆی بناسێنێ[٣].

### ٦ـ حیزبی گەشەی دێموکراتیك (The Party For Democratic Derelopment)

ئەم حیزبە لە دسامبری ١٩٩٠دا پێی نایە گۆڕەپانی سیاسییەوە. ئەندامانی ئەم حیزبە پێکهاتبوو لە رووناکبیران و خوێندەڤانان و دێموکراتەکان. ئەم حیزبە بەدوای یاساغ کرانی ناوی گۆڕدرا واتە لە بنەڕەتەوە هەمان حیزبی یەکیەتییە.

ئامانج و ئیدئۆلۆژی ئەم حیزبە بە گوێرەی بانگەشەی راگەیەنەکانی، بەرەو رەوگەو رەوتی ئەو حیزبە بەرهەڵستەکانی کە لە سەرانسەری ماوەی یەکیەتیی سۆڤییەتی پێشوو بیچمیان

(1) Regional Surveys of the World, P. 443
(2) http://inic. utxas. edu/menic/utaustincourse/oi/course
(3) Regional Surveys of the World, P. 444

گرتبوو، دارێژراوە. ئەم حیزبە لەلایەن "دوورودی مۆراد حاجی محەممەدئۆف" ڕێبەری دەکرا. ئەم حیزبە تاکو ساڵی ١٩٩١ بەو تەقەلایەی کە دابووی، نەیتوانی وەك دامەزراوەیەکی حیزبی خۆی تۆمار بکات، چونکە ئەم حیزبە وەکوو ڕێکخراوێکی ژێرزەوینی، چالاکییەکانی لە تورکمەنستان یاساغ کرابوو، هەنووکە هیچ چەشنە زانیارییەك لەسەر پێکهاتەو بنچینەی حیزبیو کارکردەکانی دیکەی لەبەردەستدا نییە. جیا لەوەیکە ئەم حیزبە لە دەرەوەی مسکۆیەو بۆ ماوەیەکی کورت بڵاوکراوەیەکی بەنێوی ئاتاوەتەن (Atawatan) بڵاوکراوەتەوە[(١)].

ڕەخنەی ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژی حیزب لەسەر پاوانخوازی و هێژمۆنیخوازی بێکۆتایی نیازئۆف و سەرکردە حکوومییەکانی دەسەڵاتدار داوای سەربەخۆیی چڕتر ببوو کە بووە هۆی قەدەغەکرانی ئەم حیزبە. حیزبی گەشەی دێموکراتیك کە هەر چەشنە چالاکی و کردەوەیەکی لە تورکمەنستان یاساغە لەگەڵ حیزبی یەکیەتیی پێکەوە لە مسکۆ ڕۆژنامەیەکیان بەناوی پشتیوانی دیناچ (Daynach) بڵاودەکەنە بەڵام بڵاوکردنەوەی لە تورکمەنستان یاساغە.

ئەم دوو حیزبە بەرهەڵستکارە لەبەرەیەك بەناوی کۆنفڕانسی گەنجە (Genjeh) هاوکاریی یەکتریان دەکرد تاکو ئەم یەکانگیرییە باندۆری ئەرێنی لەسەر ڕەوتی چاکسازی دێموکراتیك لە کۆماری تورکمەنستاندا هەبێ[(٢)].

ڕێبەری ئێستای حیزبی گەشەی دێموکراتیك دوروودی حاجی محەممەد ئۆفە[(٣)]، سکرتێری پێشووی ئەم حیزبە وەئەستۆی محەممەد موراد سەلامەت ئۆف بوو کە لە ترسی قۆڵبەست کران و گیرانی لەلایەن تۆڕە ئەمنییەکانی تورکمەنستانەوە بۆ وڵاتی ئازەربایجان هەڵات.

**٧ـ تاقمی هەلسینکی**

ئەم تاقمە بۆ هاوئاهەنگی لە نێوان کۆمەڵێك لە دژبەرانی حکوومەت و سەرۆك کۆماری تورکمەنستان، چالاکی خۆی دەستپێکردووە. ئەم تاقمە، لە هێزە بەرهەڵستکارەکان، حیزبەکان و بزاوتەکانی دیکە لە دەرەوە پێکهاتبوون و ناوەندەکەی لە ڕووسیەیە[(٤)].

ئەم گرووپە بە ئیلهام وەرگرتن لە ناوەندی فیدراسیۆنی نێونەتەوەیی هێلسینکی[(٥)] لەمەڕ مافی مرۆڤ و لە بۆنەکان و بارودۆخی نێونەتەوەیی و گوشارەکانی حکوومەتی تورکمەنستان

(1) World Encyclopedia
(2) http://ready. Rbe. sk. ca/turkmenistan,htm
(3) http://inic. vtexas. edu/menic/utautincourse/oi/course
(٤) بە گوتەی بەشەی تورکمەنی رادیۆی ئازادی گرێدراو بە ئەمریکا "تەلکسی چاپەمەنی" ١٣٨١/٩/١٠
(5) The International Helsinki Federation for Human Rights



لە پێوەندی لەگەڵ پێشێل کارییەکانی مافی مرۆڤ، بە شێوەی کۆبوونەوە لە شاری ڤیەن کۆمەڵێك کۆبوونەوە بەڕێوە دەبەن کە تەواوی ئۆپۆزیسیۆنی دژی حکوومەتی نیازئۆف لەم ڕۆنشتنە سیاسییەدا لەدەور یەکتری کۆدەبنەوەو گۆڕانکارییە نێوخۆییەکانی وڵاتەکەیان وەبەر ڕەخنەو تاوتوێ کردنو لە کۆتایی ڕۆنیشتنەکەدا ڕاگەیەندراوێك لەلایەن هەموو گرووپ و حیزبە بەشداربووەکانەوە واژۆو دەکەن و لە ئاستی نێونەتەوەییداو لە ڕێگای ڕادیۆی ئازادی بۆ هاووڵاتیانی نێوخۆی تورکمەنستان دەخوێندرێتەوە[(١)].

گرووپە بەرهەڵستکارە تورکمەنەکان لە ٣ تا ١٢ی ژانوویەی ٢٠٠٣دا لە ڤیەن کۆبوونوەیان پێکهێناو ئەم کۆبوونەوەیە بەدوای تیرۆری نیازئۆف و بارودۆخی نالەبار لەمەڕ درێژی کارو چالاکیان بوو و لە پێوەندی لەگەڵ قۆڵبەستکرانی شێخ مۆرادئۆف، هەروەها دەستبەسەرکردنی ٦١ کەسی دیکە لەمەڕ پلانی سەرنەکەوتووی شێخ مۆرادئۆف، ئەم گرووپە بیروڕایان ئاڵوێر دەکرد.

**٨ـ کۆمەڵەی کۆمیسیۆنی ١٥**

ئەم کۆمیسیۆنە لەلایەن بەرهەڵستکارانی حکوومەتی تورکمەنستان لە دەرەوەی وڵات بوونی خۆیان ڕاگەیاندووە. ئامانجی سەرەکی ئەم کۆمیسیۆنە کۆکردنەوەی بەڵگەو دیکۆمێنتی تاوانەکانی ڕێژیمی نیازئۆف بۆ دادگای نێونەتەوەییو پێڕاگەیشتن بە کاروباری تاوانەکانە. ئەم کۆمیسیۆنە بە هەوڵی سەفەر موراد ئەقلیم ئۆف، پێکهات و لەگەڵ پێشوازی کۆمەڵێك لە هاووڵاتیانی تورکمەنستان لە تاراوگەدا ڕووبەڕوو بۆوە.

هەروەها ئەم کۆمیسیۆنە خوازیاری پێڕاگەیشتن و ناردنی دیکۆمێنتی تاوانەکانی باتیربوساکەف "بەرپرسی کۆمیتەی ئەمنییەتی نەتەوەیی تورکمەنستان (KNB)"، ناق موراد ڕەجەب ئۆف "بەرپرسی بادیگاردی نیازئۆف"، قوربان بی بی عەتا جانوا "دادوەری گشتی تورکمەنستان"،

کاکا موراد بالی ئۆف "سەرنووسەری ڕۆژنامەی عەسگەر"و ئوونجیق موسائۆف سەرۆکی حیزبی دێموکراتیکی تورکمەنستان" بوون. بە گوتەی ئەقلیم ئۆف ئەم کۆمیتەیە لە ١٥ی دسامبر، ١٩ی مانگی ڕەزبەری ١٣٨١ لەگەڵ ڕێکخراوێکی لێبوردنی نێونەتەوەیی نیشتەجێ لە بریتانیاو ناوەندی مافی مرۆڤ لە ڕووسیەو ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لە سوئیسو هۆلەند،

(1) http://www. refer. org/naa/features/2002

هەروەها لەگەڵ ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانی تورکمەنستان لەوانە وەتەن، "ڕستاخیز"، کۆماری دیموکراتیکی گەلی تورکمەنستان بەردەوامو بە شێوەی ڕاستەوخۆ هاوکاریی باشیان پێکەوە هەیە[1].

### ٩ـ ڕێکخراوی مەقسەد (Maksat)

ئەم ڕێکخراوی خوێندکارییەش لەو ڕێکخراوانەیە کە لە ناوەندی خوێندکاریو زانستییەکانی وڵات ناسراوە. بەڵام لە پێکهاتەو ڕێچکەوو چۆنییەتی چالاکی ئەم ڕێکخراوە خوێندکارییە هیچ چەشنە هەواڵو زانیارییەك بڵاو نەکراوەو ئەم ڕێکخراوە خوێندکارییە هەروەك حیزب و ڕێکخراوەکانی دیکەی بەرهەڵستکار بە شێوەی نافەرمی و شاراوەو ژێرزەوینی چالاکی دەکا[2].

### ١٠ـ ڕێکخراوی خوێندکاری نەزەرییەت (Nazaryet)

لە زانستگاکان و زانستە ئاکادیمییەکان، هەر چەشنە چالاکی سیاسی کە ناتەبا لەگەڵ سیاسەتەکانی حکوومەت و نیازئۆف بێتە ئاراوە، لەلایەن تۆڕی ئەمنیو پۆلیسی وڵاتەوە بە توندی لەگەڵ بەڕێوەبەران و بڵاوکەرەوانی ئەم جۆرە هزرە سیاسیو ئەمنییانە بە توندی هەڵسوکەوتی دەگەڵ دەکرێ. ڕێکخراوی خوێندکاری نەزەرییەت، لەلایەن خوێندکارانی زانکۆوە دامەزرا، بەڵام لە چەندایەتی و چۆنایەتی ئەم ڕێکخراوە نهێنییە سیاسییە خوێندکارییە هیچ چەشنە زانیاری باوەڕپێکراو لە گۆڕێدا نییە. بەڵام لەنێو خوێندکارانی وشیاری زانکۆکانی تورکمەنستاندا ئەم ڕێکخراوە ناسراوە بەڵام لەبەر ئەوەی کە تۆڕە ئەمنییەکانی تورکمەنستان چاودێری چڕوپڕیان بەسەر ناوخۆ و پێکهاتەی زانکۆکانیاندا هەیەو بەکرێگیراو و سیخوری بێ ئەژماریان هەیە، لە کاتی ئاشکرا بوونی شوێن و ناوەندی کۆبوونەوە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم ڕێکخراوە بە توندی لە لایەن هێزەکانی ئاسایشەوە بە توندی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەن[3].

### ١١ـ حیزبی جووتیاران بۆ دادپەروەری (The Peasants Party for Justice)

پاش ئەوەی کە حیزبی دیموکراتیکی تورکمەنستان وەك ئاڵترناتیڤی حیزبی کۆمۆنیست هاتە گۆڕەپانی سیاسی وڵاتەوە، وەك حیزبی دایك چالاکی دەستپێکرد لەو کاتە بەدواوە هەر حیزبێکی دیکە کە بوونی خۆی ڕادەگەیاند وەك حیزبێکی بچووکتر (minor party) پێناسە دەکرا.

(١) بابەتەکە لە بەشی تورکمەنی ڕادیۆی ئازادی ١٣٨١/٩/٢٣ ئەلیکسی چاپەمەنی وەگیراوە

(2) World Encyclopedia

(3) Ibid



لە ڕاستیدا حیزبێکی بچووك کە بە شێوەی یاسایی لە تورکمەنستان نێوی هاتۆتە ئاراوە حیزبی جووتیارانە بۆ دادپەروەری. ئەم حیزبە تەنیا دژبەرێکی دەروەستە کە بە خێراییو لە ماوەیەکی کورتدا پاش سەربەخۆیی تورکمەنستان مۆڵەتی پێدرا کە خۆی تۆمار بکا. هەنووکە لە هەلو مەرجی ئەم حیزبە زانیاریو هەواڵێك نییە، وادیارە کە بەرەو هەڵوەشانەوەو لەناوچوون دەچێ[1].

بابەتەکانی شیاوی ئاماژە لە پێوەندی لەگەڵ ئەم حیزبەو شێوەی هاتنە ئاراوەو دروست بوونییەوە، دەبێ بڵێین دەستپێکردنی چالاکی ئەم حیزبە لەسەر پێشنیاری نیازئۆف بوو.

لە ساڵی ١٩٩٢ پاش فەرمانی نیازئۆف ئەم حیزبە وەك حیزب دژبەر تۆمار کراو ڕێبەران و کادرە سەرەکییەکانی تێکلاوێك لە بەڕێوەبەرانی حیزبی دیموکراتیك بوون[2].

ناوەندی ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٣ لە عشق ئاباد بوو. لە ساڵی ١٩٩٤ نیازئۆف ڕایگەیاند کە دەبێ بە زوویی مۆڵەتی تۆمار بە حیزبی دادپەروەری جووتیاران بدرێ بەڵام لە کردەوەدا، لەو ساڵەوە تا ئێستا واتە لە ساڵی ٢٠٠٣ ئەم بەڵێنییەی تورکمەنستان نەچووە قۆناخی جێبەجێ کردنەوە[3].

### ١٢ـ حیزبی بەرەی خەڵکی تورکمەنستان (The Popular Front of Turkmenistan)

ئەم حیزبە هەروەك حیزبەکانی دیکە لە وڵاتی نیازئۆف تەنیا باس لە نێویان دەکرێ بەڵام لە بارودۆخی ئەم ڕێکخراوە و شێوەی کارکردی هیچ زانیارییەك بە شێوەیەکی ئاشکرا بڵاونەکراوەتەوەو لە وڵاتی تورکمەنستان ئەم حیزبە بە فەرمی تۆمار نەکراوە. هەرچەند جارناجارێك لەمەڕ ڕێژەو ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە لەلایەن لایەنگرانی کە بەشێکیان خوێندکارەکان بوون لە کۆڕە نافەرمیو تایبەتییەکاندا باسیان لە ڕێژەیەکی لەرادەبەدەر دەکرد[4].

### ١٣ـ بەرهەڵستکارانی دیموکراتیکی یەکگرتوویی تورکمەنستان (Unifeid Democratic Opposition of Turkmenistan)

ڕێبەری ئەم بزاوتە بەرهەڵستکارە، عابدی قولی ئۆفە. عابدی یەکەمین وەزیری دەرەوەی تورکمەنستان دوای سەربەخۆیی بوو کە ئەم جووڵانەوە دژبەرەی بە دژی حکوومەتی

(1) World Encyclopedia

(2) http://www. upinfo. com. ycounty-quide-study/turkmenistan

(3) Regional Surrey of The World

(4) World Encyclopedia

تورکمەنستان لە مسکۆ پێکهێنا. ئەم بزاوتە لە یەکەمین تەڤگەرە دژبەرەکانی حکومەتی نیازئۆف لە دەرەوەی تورکمەنستان بەئەژمار دێ. هەنووکە عابدی قولی ئۆف لە سەرەکیترین و بەرچاوترین بەرهەڵستکارەکانی تاراوگە نشین بە ئەژمار دێ. بە باوەڕی رێبەری ئەم بزاوتە کە لە بەرواری ١٣٨١/١٠/٧ لە وتووێژێکدا گوتی:

"بزووتنەوەی دژبەران لە داهاتوودا پەرە دەگرێ چونکە نیازئۆف بە تاڵان کردنی سامانی حکوومەت، گشت خەڵکی تورکمەنی لەخۆی رەنجاندووە، تەنانەت کەسانی نزیکی خۆیشی لەم کارە پاوانخوازنەیەو سەرەڕۆیانەی وەزاڵە هاتوون کە ئەم نارەزامەندییانە یارمەتی بە گەشە کردنی جووڵانەوەی دژبەران دەدا"[١].

بەدوای هەوڵی تیرۆری سەرنەکەوتووی نیازئۆف، عابدی قولی ئۆف گوتی کە کردەوەی توندوتیژانە شەرمەزار دەکاو تەنیا رێگای هێنانە ئارای دێموکراسی لە وڵاتەکەیدا، گرتنە پێشی رێگای ئاشتیخوازانەو هێمنانەیەو خەڵك سالارییە. عابدی هەڵسوکەوتەکانی دوای هەوڵدان بۆ تیرۆری نیازئۆف کە بووە هۆی گرتن و قۆڵبەستکردنی بەردەوامی خەڵکی بێتاوان لەلایەن پۆلیس و وێرانکردنی ماڵی تۆمەتبارانەوە، مەحکووم کرد.

قولی ئۆف داوای لە کۆڕو کۆمەڵە نێونەتەوەییەکان و گشت حکومەتە دەرەکییەکان و رێکخراوە نێونەتەوەییەکانی ئەمریکاو رێکخراوی "OSCE"و دامەزراوە دێموکراسییەکان لە جیهان کرد کە یارمەتی بە دژبەرانی یەکگرتوویی تورکمەنستان بدەن بە مەبەستی وتووێژ لەگەڵ (نیازئۆف) داو تەنیا رێگای هێنانە ئارای دێموکراسی، ئاڵ و گۆڕی بیروڕاو بۆچوون لەگەڵ نیازئۆف، چاودێری کۆڕو کۆمەڵە نێونەتەوەییەکانە[٢].

### ١٤ـ حیزبی پێشڕەوی دێموکراتیك (The Democratic Prgrssive Party)

رێبەری ئەم رێکخراوە دژبەرە لە ئەستۆی دوردی مۆرادخۆجا محەممەدئۆفە کە لە فیەوریەی ساڵی ١٩٩٦ لەلایەن هێزە ئەمنییەکانی KNB تورکمەنستان بەدوای وتووێژێك لەگەڵ رادیۆی ئازادی تورکمەن قۆڵبەستو رەوانەی گرتووخانە کرا. دوردی مۆراد لە وتووێژێکدا لەگەڵ ئەم رادیۆیە رەخنەی توندی لە کارکردی نیازئۆف و دەزگاکانی دەسەڵاتدار گرتبوو.

هەنووکە ئەم حیزبە یەکێکە لە حیزبە دژبەرەکان کە لە دەرەوەی وڵات بە کارو چالاکییەکانی خۆی بە جۆرێك گوشاری سیاسی خستووەتە سەر حکومەتی تورکمەنستان.

(١) ناوەندی هەواڵنێری لە عشق ئاباد ١٣٨١/١٠/٥

(2) http://www. rferl. org/nca/fcatures/2003



لە کاتی سەفەری نیازئۆف بۆ ئەمریکا لە ساڵی ١٩٩٩، لەسەر داوای بەرپرسانی ئەمریکایی چەند کەس لە گیراوان و رێبەرانی حیزبە دژبەرەکان ئازاد کران کە یەك لەوان دوردی مۆراد بوو[١].

### ١٥ـ بزاوتی وەتەن The vatan (motherland) movement

ئەم بزاوتە کە پێکهاتووە لە دژبەران و خەباتگێرانی تورکمەنستانی و خەباتگێرانی سیاسی وڵاتانی دیکەی ئاسیای ناڤین، بە کۆبوونەوە لە وڵاتی سوئیس ناوەندی ئەم بزاوتە سیاسییەیان پێکهێناوە و چالاکییە یەکگرتووەکانی خۆیانیان بە شێوەی گشتی لە سوئێسەوە رێبەری دەکرد.

ئەندامانی دیکەی بەرهەڵستکار کە لە وڵاتانی دیکە (CIS)دان لە فیدراسیۆنی رووسیە بەرەی بەرهەڵستکاریان پێکهێنا. ئەم بزاوتە، بە ئیلهام وەرگرتن لە ئەندێشە سیاسیی‌ونارازی لە کردەوەکانی نیازئۆف و گوشارگەلێك کە بەسەر خەڵك و بژاردە سیاسییەکانی وڵات کە لە گرتووخانە نهێنییەکانی ئەم وڵاتەدا، زەبروزەنگی هێزە ئەمنییەکان کە هەموو جۆرە ئازاردانێکیان لە هەمبەر گیراوە سیاسییەکان و پێشێل کردنی مافی سەرەکی شارۆمەندان بە رەوا، لە قەڵەم دەدەن نارەزایەتیان دەردەبڕی. بەڵام بە هۆی ئەوەی کە ئەم تەڤگەرە، دژی حکوومەتی نیازئۆف و ئامانجی رووخاندنی حکوومەتە، لەنێو وڵاتی تورکمەنستان کەم کەس زانیاری لە تایبەتمەندییەکانی و کارکردی ئەم جووڵانەوەیە هەیە. هێندێ جار نێوی ئەم بزاوتە لە رۆنیشتنەکانی سیاسییەکانی مسکۆ و ژێنێو لە بەیاننامەکان و کۆمەڵەکانی دیکەی دژی حکوومەتی نیازئۆف، دێتە ئاراوە[٢].

### ـ تیرۆری نیازئۆف و رۆڵی بەرهەڵستکاران تێدا

لە چواری مانگی خەزەڵوەری ١٣٨١ی هەتاوی لەلایەن چەند کەسێکی نەناسراوەوە تەقە لە نیازئۆف دەکرێ، بەڵام چونکە پێش تەقەکردنەکە کە ئۆتومبیلەکی گاماز کە یەکێك بوو لە کەرەستەکانی هاتووچۆ پێکردنی تیرۆریستەکان، پلەدارێکی نیزامی نێوشار وەبەردەدادا و سەر رێگای پارێزەرانی سەرۆك کۆمار دەگرێ و تەقە دەست پێدەکا لە تەقەکردنی هێزەکانی پاراستنی سەرۆك کۆمار، دوو کەس لە جێبەجێکارانی تیرۆریستان برینداروو پاشان هەڵدێن، هەر بۆیە زیانێك بە سەرۆك کۆمار ناگا.

(1) http://www. Inf-hr. org/reports/ar99tuk. html

(2) Regional Surrey of The World, P. 443

دەگوترێ کە لەم کردەوەدا ١٦ کەس کە چوارکەسیان هاووڵاتی گورجستانی بوون دەستبەسەر دەکرێن و بەرێز نیازئۆف لە هەڵوێستێکی توندا، وڵاتی رووسیەی بە پشتیوان و داڵدەدەری بەرەی بەرهەڵستکارانی حکوومەتەکەی تاوانبار دەکات.

نیازئۆف لەم پێوەندییەدا قامکی تاوانی بۆ لای چوار کەس لە دژبەران (بوریس شێخ مورادئۆف، وەزیری پێشووی کاروباری دەرەوە، خودای بەردی ئەرازئۆف سەرۆکی پێشووی کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەیی، باڵی محەممەد حانائۆف سەفیری پێشووی تورکمەنستان لە تورکیەو ئیمام بەردی ئەقلیم ئۆف کە گوایە لە هاوبیرانی حانام ئۆفە) راداشت و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەو ئوتومبیلەی تیرۆریستەکان کەڵکیان لێوەرگرتبوو هی ئیمام بەردی ئەقلیم ئۆف بووە، ئەمە لە کاتێکدایە ئیمام بەردی ئەقلیم ئۆف لە کاتی تیرۆرەکە لە عشق ئاباد بووەو دەست بەجێ دوای ئەو هەوڵە تیرۆریستییە قۆڵبەست و لێپرسینەوەی لێکرا.

هەڵبەت لە پێوەندی لەگەڵ جێبەجێکردنی تیرۆرو ئەوەی کە ئەم کارە لەلایەن چ کەسانێکەوە پلانی بۆ دارێژراوە و جێبەجێ کراوە لێکدانەوەی جۆراوجۆر هەیە بەڵام دوو بۆچوونی سەرەتایی هەیە ئەویش ئەوەیە کە:

١ـ بەجێگەیاندنی ئەم تیرۆرە بەجۆرێك رەگی لەنێو جووڵانەوە دژبەرەکاندا هەیە.

٢ـ رەنگە ئەم تیرۆرە سیناریۆی سەرۆك کۆماری ئەو وڵاتە بێ، کە بەم کارە ویستبێتی کە بارودۆخ بۆ سەرکوتی دژبەران خۆش بکا. کە ئەمە دیارە لێکدانەوەی ئۆپۆزیسیۆنەو بەگشتی لە وتووێژەکاندا پێداگرییان لەسەر ئەم بۆچوونە دەکردەوە.

هەڵبەت یەکێك لە دژبەران بەنێوی قاقاجان بەکی ئۆف گوتبووی کە ئەم کارە لەلایەن کەسانێکەوە ئەنجامدراوە کە چیدیکە مۆاری ئەو هەموو چەوسانەوەیان نەدەکردو هەموو دەرگاکانیان لەسەر خۆیان بە داخراویی دەبینی و ئەم خەڵکانە لە بنەڕەتەوە ناتوانن خاوەنی تاقم و گرووپ بن.

بەڕێز سەردار "دردی ئۆف" وتەبیژی سەرۆك کۆماری تورکمەنستان پاش رووداوی تیرۆرەکە لەمەڕ کەسانی دەستگیرکراو رادەگەیەنێ گومان لێکراوانی دەستبەسەرکراو هەموویان لە دژبەرانی تاراوگە نشینن و لە بەرپرسانی پێشووی حکوومەت بوون. ناوبراو گوتی کە: لە رووسیە کۆمەڵێك لە سیاسەتوانان هەن کە لە پشتی دژبەرانی حکوومەتی تورکمەنستان راوەستاون و پشتگیری و داڵدەیان دەدەن.



لەم راستایەدا هەموو دژبەران بە شێوەی جیاجیا ئەم کردەوەیان (تیرۆر) لەلایەن خۆیانەوە رەتدەکردەوە و بانگەشەیان دەکرد کە ئەوان خوازیاری لابردنی نیازئۆفن لەسەر کورسی دەسەڵاتی تورکمەنستان، بەڵام بە شێوەی ئارام و هێدی و کەڵك وەرگرتن لە توندوتیژی بە دوایین رێگاچارە دادەنێن و بە راشکاوانە ئەم جۆرە کردەوانە رەتدەکەنەوە.

یەکێك لە دژبەران بەنێوی ئەقلیم ئۆف لەم پێوەندییدا گوتی: هیچ چەشنە پێوەندییەك یان دەستێداهەبوونێکی لەم رووداوەی تیرۆری سەرۆك کۆماردا نەبووە، ئەم کارە رەنگە بە ئەنقەست پێکهاتبێ‌و بە دروستکردنی سناریۆ لەلایەن کۆمەڵێك لە بەڕێوەبەران ئەم سناریۆیە رێبەری کرابێ. ناوبراو لە درێژەدا دەڵێ: ئەگەر ئێمە دژی بۆچوونەکان و هەڵسەنگاندنەکان و کارکردەکانی یەکێك (نیازئۆف)و یان کۆمەڵێك کەس بین، بەڵام هەوڵدان بۆ زەفەر پێگەیاندنی(تیرۆر) ناتوانێ واتایەك بگۆڕێ. بەرپرسانی رووسیە لە بەرانبەر نووسراوە باس کراوەکاندا لەلایەن هێندێك سەرچاوە حکوومییەکانی تورکمەنستانەوە لەسەر ئەگەری دەستێدابوونی کۆمەڵێك لە بەرپرسە پلە بەرزە رووسییەکان لە رێکخستنی زەفەر بردن بۆ گیانی سەفەر موراد نیازئۆف سەرۆك کۆماری تورکمەنستان هیچ چەشنە دژکردەوەیەکی فەرمییان نیشان نەدا. لە هەمان کاتدا سێرگی ئی ئەیوان ئۆف سەرۆکی فیدراسیۆنی پارلمانی باڵای رووسیە لە وتووێژێکدا گوتی: تاوانبارکردنی رووسیە لەمەڕ هەوڵدان بۆ کوشتنی نیازئۆف جیا لە شك و گومان هیچی دیکە نییەو لە راستییەوە بەدوورە.

هەر لەو راستایەدا، بەرپرسانی ئەمنی تورکمەنستان لە هەوڵی گرتنی هاووڵاتییەکی ئەمریکایی گومانی بەشداریکردن لە داڕشتنی تیرۆرەکەدا، ئەم بابەتە لە هزرمان پێکدێنێ کە رەنگە ئەم کارە لەلایەن ئەمریکاییەکانەوە پلانی بۆ دارێژرابێ هەڵبەت وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە هەمبەر ئەم کارەی حکوومەتی تورکمەنستان ناڕەزایەتی دەربڕیوە و رایگەیاند کە لە هەمبەر دەستگیرکردنی هاووڵاتی ئەم وڵاتە دەبوایە سەفارەتی ئەم وڵاتەیان ئاگادار کردبایە.

بە سەرنج دان بەم خاڵانە کە لەم نووسراوەیەدا ئاماژەی پێکرا وەها تێبگەین کە خەڵکی تورکمەنستان لەژێر زوڵم و زۆرداری حکوومەتی ئەم وڵاتەدان و ماوەیەکە نیشانەگەلێك لە ناڕەزایەتی لەم وڵاتەدا بەرچاو دەکەوێ کە بەرەو زیادبوون دەچێ.

بەڕێوەبردن و فەرمانڕوایی و سەرکوتکردنەکانی سەرۆك کۆمار، جیا لە خەڵکیش، کۆمەڵێك لەو خەڵکانەش لەخۆ دەگرێ کە لە حکوومەت دەرکراون.

خەڵكی ئەم وڵاتە لە رەوشی خراپی ئابووری ناڕازی و نیگەرانن و دەڵێن چۆن دەتوانرێ بەو مووچەی کە هێندێ جار لە مانگدا ناگاتە ٣٠ دۆلار ژیان بەسەر ببەنولە ئێشو ئازاری هێزە ئەمنییەکان وەزاڵە هاتوون. بەرهەڵستكاران بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دەبێ لەم راستایەدا خەڵك بە مافەکانی خۆیان ئاشنا بکرێن و لەم رووەوە هەموو هەوڵێك دەدەن، تەنانەت لە دوایین کۆنفرانسی بەرهەڵستكاران لە مسكۆوە بڕیار درا کە دژبەران بۆ گەڕانەوە بۆ وڵات هەوڵ و خەبات بکەن و سەرتا بەدوای ئەوەدان تاکو بوار بۆ ئەم مەبەستە لەنێو خەڵكدا خۆش بکن کە هەڵبەت لەم بوارەدا هێندێك لەو بڕوایەدان کە جیا لە دژبەران لە دەرەوە گرووپێکی دیکەش لەنێو خۆ بە شێوەی شاراوە چالاکی بکەن. ئەم گرووپە گۆڕانکاری شیمانەکراو لە وڵاتدا پێکبێنن.

بەڵام ئەوەی کە بەرچاوە تورکمەنستان لە قەیرانێکی تایبەتی سیاسی دایەو بارودۆخەکە نائاساییە، بە جۆرێك کە لە سەروبەندی کودەتاو گۆڕینی رێژیم دایە. یەکانگیری و هاوکاری هێزە دژبەرەکان یەکێك لە هۆکارە گرینگەکانی سەرکەوتنە، بەڵام ئەم پرسیارە لە زەیندا بیچمی گرتووە کە داهاتووی تورکمەنستان بەرەو کام ئاکار دەڕواو لە کۆتاییدا تورکمەنستان پاش نیازئۆف چی بەسەر دێ؟

**ب: رێکخراوە ئایینییەکان**

١ـ ئیدارەی "قازیات": ئەم ئیدارەیە کە پاشماوەی سەردەمی سۆڤیەتەو ئەندامان و هەڵسووڕاوانی موسوڵمانە سوننەکان لە خۆ دەگرێ، ئەمڕۆکە بەڕێوەبردنی بۆنە ئایینییەکان و دروستکردنی مزگەوتەکان، پەروەردەکردنی خوێندکاری ئایینی، ئەنجامدانی ئەرکە ئایینییەکان و کاروباری دیکەی لەم بابەتەی وەئەستۆیە. مزگەوتەکان و بیاڤە زانستییەکانی تورکمەنستان، لەژێر چاودێری ئەم ئیدارەدایە. پەروەردە ئایینییەکان بە شێوازی نوێ و جیاواز لە رێوشوێنە کۆنەکان پێشکەشی لاوان و خوێندڤانە ئایینییەکان دەکەن.

٢ـ ئیدارەی کاروباری دینی: ئەم ئیدارەیە بە بڕیاری سەرۆك کۆمار لە ژانوییەی ١٩٩١ دامەزا. ئەم ئیدارەیە تاکو ساڵی ١٩٢٤ بەرپرسی کاروباری ئایینی وڵات بوو بەڵام لە ئاوریلی هەمان ساڵدا، "شوورای ئایینی" بەجێگای ئەم ئیدارەیە دامەزرا.

٣ـ شوورای کاروباری ئایینی : ئەم شوورایە لە ئاوریلی ١٩٩٤دا دروستبوو. بەرپرسانی ٥ پارێزگای وڵات، وەزیری دادوەری، وەزیری راگەیاندن، کەشیشەکی ئەرتدۆکس و ئیمامی گشتی وەك ئەندامانی ئەم شوورایە بە ئەژمار دێن. بەڕێز ئەڵڵا موراد ئۆفیش نوێنەری حکوومەتە لەم شوورایە.



شوورای کاروباری ئایینی تورکمەنستان چاودێری بەسەر رێکخستنی گشت چالاکییە ئایینییەکانی ئیسلامیو نائیسلامی دەکا. ئەم شوورایە لە راستیدا ئاڵقەی نێوان حکوومەت و رێکخراوە ئایینییەکانە. لە بەرچاوترین ئەرکەکانی شوورای کاروباری ئایینی، دەرکردنی مۆڵەت بۆ ئەنجوومەنە ئایینییەکانە. هەڵبەت لە کۆماری تورکمەنستاندا جیا لە رێکخراوە ئایینییە فەرمییەکان کە لەژێر چاودێری حکوومەتدا چالاکی دەکەن، گرووپە بناژۆخوازە ئایینییەکانیش سەرقاڵی هەڵسووڕانن کە ناوەندی کۆبوونەوەو خەباتیان لە ناوچەی خوارەزم دایە. خوارەزم شوێنێکە بریتییە لە رۆژئاوای ئۆزبەکستان و رۆژهەڵاتی تورکمەنستان کە ئەم ناوچەیە گرینگترین شوێن لە جووڵانەوەی ئیسلامی سیاسی لە وڵاتی تورکمەنستاندا پێکدێنێ[1] و ئەوەی کە دەسەڵاتی حەفتا ساڵەی کۆمۆنیزم، گوشاری حکوومەتە سەرەڕۆکان و هەروەها پەرەگرتنی ئەندێشەی رۆژئاوایی خوازانە لەنێو نەوەی نوێ لە هۆکارگەلێکن کە ئاستەنگن لەپێش گەشەسەندنی ئیسلام لە تورکمەنستاندا. هەڵسەنگاندنێك کە خەڵكی ئەم وڵاتە لەسەر ئیسلام هەیانە بریتییە لە: کۆمەڵە نەریتگەلێك کە لە رەوتی ژیانی خەڵكدا بەردەوامە[2].

**٤ـ قرقیزستان**

**١ـ٤: سیاسەت و حکوومەت لە رەوتی مێژوودا**

وڵاتی ئیستای قرقیزستان لە ساڵی ١٨٧٦ بە شێوەی فەرمی پەیوەست بوو بە ئیمپراتۆری رووسیە. ئەم وڵاتە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبری ١٩١٧ شەڕی نێوخۆیی لەگەڵ هێزە دژە شۆڕشەکان ئەزموون کردووە. لەم شەڕەدا هێزە ئەمگناسەکانی رێژیمی پێشوو لەوانە سوپای سپی رووسیە، گرووپە چەکدارەکانی خۆجێیی (باسماچی) دژی بلشوییەکان و سوپای سوور شەڕیان دەکردو لە کۆتاییدا لەگەڵ شکست بەرەوڕوو بوون، بەدوای ئەم سەرنەکەوتنەی بلشویکەکان و سوپای سووردا هێزی خۆیان لە ناوچەکەدا رۆژ لەگەڵ رۆژ پتەوتر دەکرد. لە ساڵی ١٩١٨ کە بلشویکەکان کۆماری سۆسیالیستی خودموختاری تورکستانیان (ASSR) لە ناوچەی ئاسیای ناڤین و هەڵبەت لە دڵی یەکیەتیی سۆڤییەتدا پێکهێنا. قرقیزستانیش بەشێك لەم کۆمارە

(١) شەمسا، پێشوو، لاپەڕەی ١٢

(٢) کەریمی، پێشوو، لاپەڕەکانی ٢٢-٢٠

بوو. لەو کاتەدا رووسەکان دەستەواژەی "کارا قرقیز"یان بۆ جیاکردنەوەی قرقیزەکان و قەزاقەکان بەکار دەهێنا.

بەم پێیە رووسەکان لەو سەردەمەدا خەڵکی ئەم نیشتمانەیان بەناوی قرقیز ناودێر کرد. بەڵام لەساڵی ١٩٢٤ کۆماری ئێستای قرقیزستان بوو بە پارێزگای خودموختار کارا قرقیزو دواتر لەساڵی ١٩٢٥دا ئەم نیشتمانە ناوی بە پارێزگای خودموختاری قرقیز گۆڕدرا، پاشان لە فیەورییەی ١٩٢٦ کرا بە کۆماری سۆسیالیستی قرقیزستان. لە ماوەی دەیەی ١٩٢٠ کۆماری سۆسیالیستی قرقیزستان لەڕووی کۆمەڵایەتیو ئابووری گەشەی بەرچاوی بەخۆی بینی. ئەم گەشەسەندنە هاوکات لەگەڵ رەوتی چاکسازی زەویی لە سۆڤییەت کە بەدوای ئەمەدا زۆر یەك لە قرقیزەکانی رەشماڵ نشین ناچار کران روو لە ژیانی وەرزێری بکەن. بەڵام گەلاڵەی گشتی کرانی وەرزێری لە سەرەتای دەیەی ١٩٣٠ لەگەڵ دژایەتی توندی خەڵك بەرەوڕوو بوو کە لە ئاکامدا بووە هۆی بووژانەوەی تەڤگەری باسماچی. لەگەڵ سەرکوتی ناسیۆنالیزم و شوناسی نەتەوەیی لە سەردەمی ئیستالین (١٩٢٤ـ ١٩٥٣)، هێشتا زۆربەی لایەنە کولتوورییەکانی نەتەوەیی قرقیزستان پارێزراوە. ئەندامانی سەرەکی حیزبی کۆمۆنیستی قرقیز (KCP) کە بە کۆمۆنیستە نەتەوەخوازەکان ناسراوبوون، بە چڕی تێدەکۆشان تاکو رێژەی بەشداری خەڵك لە حکوومەتی خۆیاندا بەرز بکەنەوە، بەڵام لە کۆتایی دەیەی ١٩٣٠دا ئەم خەڵکە لە حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستان دەرکران و زیندانی، یان دوورخرانەوە. کۆماری سۆسیالیستی قرقیزستان (SSR) لە پێنجی دسامبری ساڵی ١٩٣٦ وەك هاوپەیمانی بێ ئەملاو ئەولای یەکیەتیی سۆڤییەت دەستنیشان کرا[١]. بەڵام بە هاتنەسەرکاری میخاییل گۆرباچۆف وەك رێبەری سۆڤییەت و دەسپێکی گەلاڵەکانی پرسترویکاو گلاسنۆست لەم وڵاتە کەشێکی نوێ لە ئاسیای ناڤین و لە یەك لەوان قرقیزستاندا هاتە ئاراوە. یەکەمین پێشهاتی ئەم کەشە نوێیە لە قرقیزستان بەدەست لەکارکێشانەوەی ئاسابالیف سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستان دەرکەوت.

جێنشینی ئاسابالیف، ئاباسامات ماسالیف ئەوەی بە فەسادی ئەخلاقی، سەرەڕۆو خزمگەرایی تاوانبار کردو زۆربەی کەس و کاری ئاسابالیفی لەسەر کارە حکوومییەکان لابرد.

(١) حەبیبوڵڵا ئەبولحەسەنی شیرازی، نەتەوەکانی ئاسیای ناوەڕاست (تاران: ناوەندی توێژینەوە و سیاسی و نێونەتەوەییەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٠)، لاپەڕەکانی ١٠٤-١٠١



بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەروەستی ماسالیف لەمەڕ سیاسەتەکانی گۆرباچۆف زیاتر لە هەوڵەکانی ئاسالیف بڕی نەکرد، بە جۆرێك کە سیاسەتی گلاسنۆست ئازادی چاپەمەنی گەڕانتی کردبوو ماسلیف رەخنەی توندی لەم سیاسەتە دەگرت، چونکە چاپەمەنی قرقیزستان لە ساڵی ١٩٨٨دا هەڵوێستی ئازادانەتری گرتبووە بەر[١].

هەروەها لە ژووئەنی ١٩٩٠دا لە ناوچەی پڕ حەشیمەتی فەراغنە هەڵکەوتوو لە پارێزگای ئووش لەنێوان ئۆزبەکیەکان و قرقیزەکاندا کۆمەڵێك تێکهەڵچوونی خوێناویی هاتە ئاراوە. بەپێی راپۆرتەکان لەم پێکدادانەدا پتر لە ٣٠٠ کەس گیانیان لەدەستداو لە هەمانساڵدا باری نائاسایی و تایبەتی راگەیەندراو بەم شێوازە سنووری ئۆزبەکستان ـ قرقیزستان داخرا. دەگوترێ کە ئەم پێکدادانە خوێناوییە بەهۆی قەیرانگەلی گرێدراو بە نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوون و داگیرکردنی زەویە بایەرەکان لە ناوچەی پڕحەشیمەتی فەراغنە لە پارێزگای ئووش بووە. ئووش لە ساڵی ١٩٢٤دا بە قرقیزستانەوە لکێندرا. لە کاتێکدا زۆرینەی دانیشتوانی ئۆزبەکییەکان پێکیان دەهێنا، تەنانەت لەم دواییانەدا خوازیاری حکوومەتی خودموختاری ئۆزبەك لە ناوچەکەدا بوون. بە هەرحاڵ، حەشیمەتی زۆرو کەمی زەوی و شوێنی نیشتەجێبوون بوو بەهۆی ئەوەی کە چەند گرووپێکی نافەرمی بە مەبەستی کەمکردنەوەی ئاڵۆزییەکانی گرێدراو بە شوێنی ژیان و داگیرکردنی زەوییە بایەرەکان لەم ناوچانەدا کۆمەڵێك کاربکەن. پارێزگاری قرقیزستان دژی پێکهاتنی ئەم جۆرە گرووپە نافەرمییانە بوون، لەگەڵ دژایەتی کردنی ناوبراو لە ساڵی ١٩٨٩دا کۆمەڵێك گرووپ بۆ ئەم مەبەستە پێکهاتن کە یەکێك لەم گرووپانە ناوی "ئاشار"ە تا رادەیەك لەلایەن بەرپرسانی حکوومییەوە پشتگیرییان لێ دەکراو زۆر خێرا توانیان رۆڵێکی سیاسی بەربڵاوتر بگێڕن. بەڵام گرووپێکی دیکە کە ناوی "ئووش ئایماقی" بوو، رێکخراوێك بوو لە شێوەی گرووپی ئاشار کە لە پارێزگای ئووش پێکهاتبوو.

ئەم گرووپە واتە ئووش ئایماقی بە چڕی تێدەکۆشا تاکو زەوییو ستارگە بۆ قرقیزەکان بەرهەڤ بکاو تەنانەت بۆ ئەم مەبەستە زەوییو زارێکی زۆری داگیر کرد، لە کاتێکدا زۆرینەی پێکهاتەی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە ئۆزبەکی بوون، پاشان لە ژووئەنی ١٩٩٠ لەسەر داگیرکردنی زەوییەکانی بایری ناوچەی ئووش لەنێوان ئۆزبەکییەکان و قرقیزەکان تێکهەڵچوونی

(1) http://www. kirgz. politics. com

خوێناوی روویدا که دەیان کەس لە هەردووك لا کوژران و بریندار بوون. کۆماری خوازانی ناوچەیی‌و گرووپە نافەرمییەکان، "ئووش ئاڵماقی"یان بە هەڵگیرسێنەری ئەم تێکهەڵچوونە تاوانبار کرد. گرووپە بەرهەڵستکارەکانی ناوچەی ماسالیف، رەخنەیان لە سەرکردەکانی حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستانیان بەهۆی بایەخ نەدان بە پرسە کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییەکانی ناوچەکە گرت. بەرپرسی حیزبی کۆمۆنیستی ئووش لە ناوچەی ئووش لە مانگی ئاگۆستی ١٩٩٠دا، ناچار بە دەست لەکارکشانەوە کراو، هەروەها بە هۆی کەم تەرخەمی سەرۆك کۆمار لە مەڕ ئەم مەسەلەیە بە توندی وەبەر رەخنەو گازەندەیان لێگرت [١]. لەگەڵ پەرەسەندنی دێموکراسی لە سەردەمی گۆرباچۆف، هەڵبژاردنی شوورای باڵای قرقیزستان لە فیەورییەی ساڵی ١٩٩٠ بە شێوەی نەریتی واتە وەك پێش سەردەمی گۆرباچۆف بەڕێوەچوو. لەم هەڵبژاردنەدا ٣٥٠ نوێنەر بۆ شوورای باڵای قرقیزستان هەڵبژێران کە زۆربەیان پاڵێوراوانی حیزبی کۆمۆنیستی ئەم کۆمارە بوون. لە ئاوریلی ساڵی ١٩٩٠ شوورای باڵای قرقیزستان، ماسالیفی وەك بەرپرسی دەفتەری شوورای باڵا دەستنیشان کردو زۆرینەی ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیستی قرقیز لە شوورای باڵاش دەنگی ئەرێنیان بە ناوبراو دا. بەڵام لە ئۆکتۆبری ١٩٩٠ی زایینی دا کاتێك کۆبوونەوەیەکی نائاسای شوورای باڵا بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار پێکهات.، بەهۆی توندوتیژی و پێکدادان لە ناوچەی ئووش، دەنگی متمانەیان بە ماسالیف نەدا [٢]، زێدەباری ئەوە، تاقمی نارین [٣] کە لە ژێر کۆنترۆڵی حیزبی کۆمۆنیستدا بوون لە پارلمان وەك باڵێکی دێموکراتیك خۆیان ناساندو بە پشتیوانی کردن لە رووناکبیران‌و لیبڕاڵە موسڵمانەکان رادەی قورسایی خۆیان بەرز کردەوە. تاقمی نارین لە ٢٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩٠ی زایینی عەسگەر ئاقایەف [٤] سەرۆکی ئاکادیمی زانستی قرقیزستانیان وەك یەکەمین سەرۆك کۆماری قرقیزستان هەڵبژارد، ئەمە لە کاتێکدایە

(١) پەروین مەعزەمی گودەرزی، قرقیزستان (تاران: دەفتەری توێژینەوە سیاسی و نێونەتەوەییەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ١٣٧٧)، لاپەڕەکانی ١٢١-١٢٠

(2) james charin "Democracy and Central Asia", Central Asia Surrey, No.5.1993, PP. 1-7

(٣) عەسگەر ئاقایف لەگەڵ تاقمی نارین بوو

(٤) عەسگەر ئاقایف لە ساڵی ١٩٩٤ لە ئاوایی گزل ـ بایراك لە ناوچەی کەمیین لەدایك بوو، ئەو خاوەنی بڕوانامەی بەکالێوریسی زانستی فەنییە. لە ئۆکتۆبری ١٩٩٠ ئاقایف وەك سەرۆك کۆماری قرقیزستان هەڵبژێرا.



کە هێشتا یەکیەتیی سۆڤییەت تێکنەچبوو وکۆماری قرقیزستان سەربەخۆیی بە دەست نەهێنابوو. بە هەرحاڵ ئاقایف بە پەلە خۆی کرد بە هاوپەیمانی سیاسەتوانان و ئابووری زانانی ریفۆرمیست، لەوانە رێبەرانی تەڤگەری دێموکراتیکی قرقیزستان. لە هەمان کاتدا کۆمیتەیەکی حکوومەتی بۆ چاکسازی ئابووری پێکهات و بەدوای ئەودا رێگای بۆ کۆمەڵێك گەلاڵەی کەرتی تایبەتی خۆشکرد. لە مانگی دسامبری هەمان ساڵیشدا ماسالیف دەستی لە بەرپرسایەتی شوورای باڵا هەڵگرت. هۆکاری سەرەکی شکستی ماسالیف لە بەرانبەر ئاقالیف ئەوە بوو کە زۆربەی سیاسەتوانانی کادری رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستان متمانەیان بە لێهاتوویی حکوومەتداری ماسالیف نەبوو، لەم رووەوە ئەوان بە باشیان دەزانی کە لەگەڵ هێزە بچووکە بزاوتە دێموکراتیکەکانی قرقیزستان کە بۆ ئاڵترناتیڤێکی لیبڕاڵی سیاسی کە هەردووك لا بتوانن هاوکاری بکەن، پەیوەست بن.

لەگەڵ دژایەتیکردنی حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستان بەتایبەتی ماسالیف لە نیوەی ساڵی ١٩٩٠ی زایینی شوورای باڵای قرقیز ناوی ئەم کۆمارەی لە کۆماری سۆسیالیستی قرقیزستانەوەیە بە کۆماری قرقیزستان گۆڕی. هەروەها لە فیەورییەی ١٩٩١ ئەم شوورایە ناوی پێتەختی قرقیزستانی لەفرۆنزەوە بۆ نێوی راستەقینەکەی خۆی واتە بیشکەك گۆڕی. شایانی باسە کە فرۆنز نێوی فەرماندەی سوپای سوور بوو کە لە شەڕە نێوخۆییەکاندا زۆربەی بەشەکانی ئاسیای ناڤینی رزگار کردبووو بەم هۆیە لە ساڵی ١٩٢٦ نێوی فەرماندەی رزگاریدەریان لەسەر شاری بیشکەك داناو گۆڕدرا بە فرۆنز. لە ١٩ی ئاگۆستی ١٩٩١ی زایینی کۆمەڵێك هەول درا لەپێناو لابردنی ئاقایف لە دەسەڵاتداری مسکۆو حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستانیش پێشگیری خۆی لەم کارە راگەیاند، بەڵام لە چاوپێکەوتنی ئاقایف لەگەڵ بۆریس یەلتسین ـ سەرۆك کۆماری ئەوکاتی رووسیە ئەم هەوڵانە لە گەڵ نسکۆ بەرەوروو بوون. لە ٢٠ی ئاگۆستی ١٩٩١ی زایینی ئاقایف بە شێوەی راشکاوانە دژی کودەتای مسکۆ هەڵوەستی گرت‌و رەخنەی لەو کارە گرت. هەر لەم راستایەدا ئاقایف فەرمانی یاساغکردنی چالاکی گشت حیزبە سیاسییەکانی لە وڵات راگەیاند. دوای سەرنەکەوتنی کودەتا لە مسکو واتە لە ٢٦ی ئاگۆستی ١٩٩١ ئاقایف‌و لایەنگرانی ئەندامیەتی خۆیان لە حیزبی کۆمۆنیستی قرقیز راگرت و دەستیان لە کۆمیتەی بەڕێوەبەری

حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستانیش هەڵگرت. شایانی باسە کە حیزبی کۆمۆنیستی قرقیز لە هەمان ساڵ هەڵوەشێندرایەوە بەڵام لە ساڵی ١٩٩٢ سەرلەنوێ پێکهاتەوە[١].

**(٢ـ ٤) وەرچەرخانە سیاسییەکانی هاوچەرخ:**

لە ٣١ی ئوتی ساڵی ١٩٩١ی زایینی شووڕای باڵای قرقیزستان دەنگی بە سەربەخۆی ئەم کۆمارە لە یەکیەتیی سۆڤییەت دا، پاشان عەسکەر ئاقایف، سەرۆکی ئاکادیمی زانستی قرقیزستان کە یەکێك لە دژبەرانی سیاسی سەردەمی سۆڤییەت بە ئەژمار دەهات، لە ١٢ی ئۆکتۆبری ١٩٩١ لە ڕێگای هەڵبژاردنی گشتیو بەدەست هێنانی ٩٥/٩ لە سەدی سەرجەم دەنگەکان بۆ سەرۆك کۆماری قرقیزستان هەڵبژێرا. ئاقایف کە لە هەڵبژاردنەکان تەنیا پاڵێوراوی سەرۆك کۆماری بوو لە راستیدا لە دەگمەن ڕێبەرانی یەکیەتیی سۆڤییەتە کە لەنێو ئەندامانی ڕێبەرانی پێشوو ڕۆڵێکی ئەوتۆی نەبووەو بە دروشمگەلی دێموکراسی و مافی مرۆڤ بە دەسەڵات گەیشت. ئاقایف بە جەختکردنی لەسەر پێویستی چاکسازی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری داوای لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی کردووە کە وڵاتەکەی بێلایەن بناسێنی. ناوبراو خوازیارە قرقیزستان ببێت بە سوئیسی ئاسیاوە[٢]. عەسگەر ئاقایف بۆ کردنەوەی فەزای کراوەی سیاسی هەوڵێکی بەرفراوانی دا. لەم کۆمارە گەشەی ئازادییە سیاسییەکان لەچاو کۆمارەکانی دیکە پتر بووە، بەڵام بەو حاڵەش، چالاکی حیزبەکان و گرووپە دژبەرەکانی حکوومەت لەگەڵ ئاستەنگەلێك بەرەوڕو و دەبێ. هەروەها لە ٢١ی دسامبری ١٩٩١ حکوومەتی ئاقایف لەنێو واژۆکەرانی ڕاگەیاندنی ئاڵماتا بوو کە کۆمەڵەی سەربەخۆی هاوقازانجیان (CIS) بە شێوەی فەرمی پێکهێنا.

حکوومەتی قرقیزستان پاش سەربەخۆیی لەگەڵ پتربوونی کردەوەی تاوان و بازرگانی ماددە بێهۆشکەرەکان بەرەوڕوو بۆوە، ئاقایف بەڵێنی خۆی بە دژایەتی کردن لەگەڵ ئەم دیاردانە ڕاگەیاندو لەگەڵ هەبوونی ڕەوشی خراپی ئابووری چاکسازییەکانی جێبی مەبەستی خۆی دەست پێکرد. ئەم چاکسازییە لەلایەن زۆرینەی خەڵکەوە پشتگیری لێدەکرا، بەڵام هێندێك گرووپ لە پارلماندا دژایەتییان دەکرد کە زۆربەی نارازییان خەڵکانی کۆمۆنیستی پێشووو

(١) بریل ئولکات، "سەربەخۆیی لەناکاو بۆ ئاسیایی ناوەندی"، وەرگێڕانی مێهدی ئەعیانی فەرد، وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ژمارەی ٤، بەهاری ١٣٧٢، لاپەڕەکانی ١٤٠-١٤١

(2) http://www. Russiantoday. com



ناسیۆناڵیستەکان بوو، هەتا ئەو شوێنەی لە نیوەی ساڵی ١٩٩٢دا حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستان بە ڕێبەری ماسالیف سەرلەنوێ بووژایەوە. لە ماوەی ساڵی ١٩٩٢ ڕووناکبیرانی قرقیزی لە ئەندێشەی ئەوەدا بوون کە پێکهاتەیەکی سیاسی نوێ پێکبێنن کە تێدا پارلمان دەسەڵاتی زیاتری هەبێ و بە پێچەوانە لە دەسەڵاتی سەرۆك کۆماری کەم بکرێتەوە. لە پاشان یاسای بنەڕەتی ئەم کۆمارە لە مانگی مای ١٩٩٣ی زایینی لە شووڕای باڵادا پەسند کراو لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٩٤، ١٩٩٦و ١٩٩٨ دەستکاریو گۆڕانکاری تێدا کرا، بە جۆرێك کە ئەمڕۆکە لە قرقیزستان پارلمان بەرزترین ناوەندی نوێنەرایەتییە[١].

حکوومەتی قرقیزستان کەوتبووە ژێر باندۆری نەتەوەخوازی قرقیزی و ئەمە لە کاتێکدایە کە حەشیمەتی ئەم وڵاتە لە ئۆزبەکیش پێکهاتبوون، بەڵام پێکهاتەی هەیئەتی حکوومەت بە شێوەی گشتی قرقیزییە. بەڵام لە یاسای نوێ تا ڕادەیەك نیگەرانی ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژی سلاڤەگان و گرووپە قرقیزییەکانی دیکەی قرقیزستان کە پێشتر مافی شارۆمەندییان بە باشی ڕەچاو نەدەکرا، دابەزاندووە. بە جۆرێك لەگەڵ هەوڵ و تەقەلای ناسیۆناڵیستەکانی ئەم کۆمارە، لە مانگی مای ١٩٩٣دا پارلمان دەنگی بە زمانی ڕووسی وەك زمانی پێوەندی نێوان خێڵەکاندا. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لە پێشنووسی یاسای بنەڕەتی ساڵی ١٩٩٢دا ئاماژەیەك بە زمانی ڕووسی نەکرابوو، سەرەڕای ئەوەی کە نێوی فەرمی ئەم وڵاتە لە کۆماری قرقیزستانەوە گۆڕدراو بوو بە کۆماری قرقیز کە ئەم نێوە کەمتر ڕەنگ و بۆی خێڵەکی و عەشیرەیی پێوە دیاربوو بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو بوار ڕەخساندنەشدا، دیسان ئاریشەو تێکهەڵچوونگەلی نەتەوەیی ـ ڕەگەزی لەم وڵاتەدا پەرەی گرتووە، بە جۆرێك کە لە نیوەی ساڵی ١٩٩٣دا شیمانە کراوە ١٤٥ هەزار ڕووسی تاکو ساڵی ١٩٩٨ خاکی ئەم وڵاتە بەجێ دەهێڵن، هەوڵەکانی ئاقایفیش بۆ هاندانی قرقیزەکان بەتایبەتی سلاڤەکان لەپێناو مانەوەیان لەم کۆمارەدا بێ ئاکام مایەوە، بەتایبەتی، جێگری یەکەمی سەرۆك کۆماری قرقیزستان، بەڕێز کۆزنسۆف، کە لە کەسایەتییە ناسراوەکانی سلاڤە لەناو حکوومەتدا، ڕایگەیاند کە بڕیاری داوە بگەڕێتەوە بۆ ڕووسیەو جیابوونەوەی خۆی لە حکوومەتی قرقیزی بە ڕاشکاوەی ڕاگەیاند. لە مانگی ژووئەنی ساڵی ١٩٩٤دا لە هەوڵێك بۆ پێشگرتن لە کۆچبەران کە زۆربەیان ڕووسین لە قرقیزستان، ئاقایف ڕایگەیاند کە لە کاتە بەدواوە لەو ناوچەیەی کە زۆربەی حەشیمەتەکەیان ڕووسی یان لە ڕووی

(1) Eastern Europe, Russia and Central Asia, PP, 230-232

ئابوورییەوە گرینگیان هەیە، زمانی رووسی دەبێتە زمانی فەرمی. هەروەها ئاقایف داوای لەو حکوومەت کرد کە دوایین ڕێکەوتی دیاریکردنی زمانی قرقیزی وەك زمانی فەرمی وڵات تاکو ساڵی ٢٠٠٠ وەدوا بخات و تەنانەت ئەم بەرواره دواتر تاکو ساڵی ٢٠٠٥ نوێ کرایەوە. نەك هەر ئەمە، بەڵکوو نوێنەرایەتی رووسەکان لە حکوومەتدا، بە شێوەی یەکسان گەرانتی کرا. لە مانگی مارسی ١٩٩٦ لەلایەن ژۆگۆر کۆکنیش هەوڵێکی کارتێکەرانە لەم بوارەدا ئەنجامدرا کە بووە هۆی دابەزینی رێژەی کۆچ رەویی سلاڤەکان، ئەم هەوڵە لە راستیدا هەر ئەو مۆڵەت بە خوێندنانە بە زمانی رووسی لە زانکۆی سلاڤی لە شاری بیشکەکدا بوو.

قرقیزستان بەهۆی ستراکتۆرێکی خێڵەکیو هەرێمی، سەرۆك هۆزو عەشیرەتەکان رۆڵی گرینگیان لە سیاسەتەکانی وڵاتدا گێڕاوە. هەروەها کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای ناڤین و رێبەرانی قرقیزستان، لە ساڵی ١٩٩٤ لە بەرانبەر پارلمانی ئەم وڵاتە تووشی قەیران و ناکۆکی بوون. پارلمان لە بەرانبەر سەرۆك کۆمار خوازیاری دەسەڵاتی پتر بوو کە لە ئاکامدا پتر بوونی دەسەڵاتی سەرۆك کۆمار بووە هۆی کۆتایی ناکۆکییەکانی نێوان پارلمان و دەسەڵاتی بەڕێوەبەریی عەسگەر ئاقایفیش بە پێچەوانە دروشمەکانی خەڵك سالارانەی، بە بەڕێوەبردنی راپرسییەکی گشتی خولی سەرۆك کۆماری خۆی تاکو ساڵی ٢٠٠٠ درێژ کردەوە. خولی سەرۆك کۆماری ئاقایف لە ئۆکتۆبری ٢٠٠٠ی زایینی کۆتایی پێهات. بەپێی یاسای بنچینەیی ناوبراو مافی خۆپاڵاوتنی بۆ سەرۆك کۆماری نییە. بەڵام دادگای یاسای بنەڕەتی ئەم وڵاتە بۆ هێشتنەوەی ئاقایف لە پۆستی سەرۆك کۆماری بەم جۆرە بەرگری لێدەکاو دەڵێ: چونکە یەکەمین خولی سەرۆك کۆماری پێش سەربەخۆیی وڵات بەڕێوەچووە ئەو دەتوانێ لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری ٢٠٠٠ی زایینیشدا بەشداری بکا.

دوای سەربەخۆیی قرقیزستان، ئاقایف بە بەڕێوەبردنی راپرسیگەلی جۆربەجۆر بەردەوام پەرەی بە دەسەڵاتخوازی لە رادەبەدەری خۆی داوە. هەروەها پرسەکانی وەك دابەشکردنی زەویی، خاوەنداریەتیی تایبەت، دامەزراندنی پارلمانی دوو ئەنجوومەنی، ئازادی چاپەمەنی، هەڵوەشاندنەوەی پارێزراوەیی پارلمانتارەکان لەرێگای بەڕێوەبردنی راپرسی گشتی جۆربەجۆر لەلایەن خەڵکەوە پەسند کراوە. بەدوای دوایین راپرسی کە لە ئۆکتۆبری ١٩٩٨ بەڕێوەچوو، ئاقایف دەسەڵاتی هەڵبژاردن و دەستنیشانکردنی زۆربەی بەرپرسایەتی پلە بەرزی وڵاتی بەدەست هێنا. عەسگەر ئاقایف لە سەرەتای سێپتامبری ١٩٩٤ی زایینی پارلمانی قرقیزستانی



هەڵوەشاندەوە. ناوبراو لە ٢٧ی ئۆکتۆبری ١٩٩٤ پێشنیاری خۆی لەمەڕ چاکسازی یاسای بنەڕەتیو دامەزراندنی پارلمانێك بە دوو ئەنجوومەنەوەو ١٥٠ ئەندام خستە بەردەم راپرسییەکی گشتییەوە. خەڵکی قرقیزستان دەنگی ئەرێنییان بە پێشنیارەکەی ئاقایف دا. ناوبراو دەیگوت کە ریفۆرم لە یاسای بنچینەیی‌دا بە شێوازی وڵاتە رۆژئاواییەکان پێویستە بەڵام هێشتا زووە بۆ قرقیزستان دێموکراسی تێدا جێگیر بکرێ. بەڵام دژبەران وڵامیان دەدایەوە کە ئەم پاساو دانە تەنیا بیانوویەکە بۆ دامەزراندنی پارلمانێکی دەستەمۆ و زیاتر بوونی دەسەڵاتی ئاقایفە. ئەوان هەروەها دەڵێن کە راپرسی گشتی بۆ یاسای بنەڕەتی کە بە فەرمانی ئاقایف بەڕێوە چووە، یاسای بنەڕەتی پێشێل کردووە، چونکە تەنیا پارلمان توانایی دەرکردنی بریاری بەڕێوەبردنی راپرسی گشتی هەیە. لەگەڵ بوونی ئەمجۆرە ناڕەزایەتییانەدا کاندیداتۆری عەسگەر ئاقایف لە خولی دووهەمی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری قرقیزستان پاش سەربەخۆیی لە ٢٤ی سێپتامبری ١٩٩٥ نوێ کرایەوە. لایەنگرانی ئاقایف پاساوی ئەم کارەیان بەم جۆرە دەدایەوە چونکە خولێك لە خولەکانی سەرۆك کۆماری ناوبراو پێش سەربەخۆیی قرقیزستان بووە، بەم پێیە ئەو دەتوانێ بۆ جاری سێهەم ناوی خۆی بۆ سەرۆك کۆماری تۆمار بکا. ئەم هەڵبژاردنە لە راستیدا یەکەمین هەڵبژاردنی رکەبەرایەتی قرقیزستان بووە لەدوای بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٩١. لەم هەڵبژاردنەدا ئاقایف بە بەدەستهێنانی ٧٥ لە سەدی دەنگەکان سەرکەوت. چاودێرانی نێونەتەوەیی کە کۆنترۆڵی هەڵبژاردنەکەیان دەکرد لەمەڕ پێشگرتن بە زۆرینەی کاندیداتۆرەکان و قۆرخ کردنی راگەیەنە گشتییەکانی قرقیزستان رەخنەیان ئاراستەی ئاقایف دەکرد.

لە ١٠ی فیەورییەی ١٩٩٦ ئاقایف پێشنیارەکانی خۆی لەمەڕ چاکسازی یاسای بنەڕەتیدا خستە بەر راپرسی گشتییەوە کە زۆرینەی خەڵك دەنگی ئەرێنییان دا. بەم شێوەیە دیسان هێزی ئاقایف زۆرتر بوو. لە سپتامبری ١٩٩٨دا سەرۆك کۆمار پێشنیارەکانی خۆی لەمەڕ چاکسازی یاسای بنەڕەتی، دامەزراندنی خاوەنداریەتی تایبەت بەسەر زەویی، بەرزکردنەوەی رادەی نوێنەرانی باڵا لە ٤٥ کەس بۆ ٦٧ کەسو هێنانە خوارێ رێژەی نوێنەرانی ئەنجوومەنی ئەم وڵاتە لە ٧٥ کەسەوە بۆ ٣٨ کەس، دانی ١٥ کورسی لە پارلمانی باڵا بە حیزبەکان و لابردنی پارێزراوەیی نوێنەرانی خستە بەردەم راپرسی گشتییەوە. هەروەها بەپێی پێشنیاری ئاقایف هیچ کەس یان ناوەندێك بۆی نییە تەگەرە بخاتە بەر کاری راگەیەنەکانەوە.

لە دوایی هەڵبژاردنەکان سولێمان ئیمان ئۆف، سەرۆکی کۆمیسیۆنی ناوەندی هەڵبژاردنەکانی قرقیزستان، ئاکامی کۆتایی راپرسی گشتی بۆ ریفۆرم لە یاسای بنەڕەتی وڵات بەم جۆرە راگەیاند کە نزیکەی ٩٦/٢ لە سەدی خەڵکانی مەرجدار بەشداریان لەم راپرسییەدا کردووەو دەنگدەران دەنگی ئەرێنییان داوە. سەرنجڕاکێشترین پێشنیاری ئاقایف لەم راپرسییەدا دامەزراندنی خاوەندارێتی تایبەت بوو کە ١٠٠٪ گوندنشینەکانی مەرجدار دەنگی ئەرێنییان پێدابوو. ئەم راپرسییە بە چاودێری نوێنەرانی ٣٠ وڵات و رێکخراوە نێونەتەوەییەکان بەڕێوە چوو[١].

لە دواین راپرسی کە لە ئۆکتۆبری ١٩٩٨ لە قرقیزستان بەڕێوەبرا، تێکڕای دەنگدەران دەنگی ئەرێنییان بە پێنج پێشنیارەکانی ئاقایف دا، کە ئەم پێنج پرسە بریتی بوون لە: جێبەجێکردنی دابەشی زەویی‌و پلانی خاوەندارێتی تایبەتی زەویی، ئازادی چاپەمەنی و هەڵوەشاندنەوەی پارێزراوەیی نوێنەرانی پارلمان، بێ بەش کردنی پارلمان لەمەڕ مافی دابەشکردنی رێژەی بوودجەکان بە بێ رەزامەندی حکوومەت.

ئاقایف دەیگوت کە ئەم راپرسییە نەك هەر بۆ چارەنووسی چاکسازییەکان بەڵکوو بۆ دواهاتی سیاسی ئەویش گرینگە. ئەم راپرسییە دەسەڵاتی بە ئاقایف دەدا کە زۆربەی بەرپرسانی پلە بەرزی وڵاتی دەستنیشان بکا، هەروەها بەدوای ئەم راپرسییەدا، ئەژماری نوێنەرانی ئەنجوومەنی یاسادانەر گەیشتە ٦٠ کەس و رێژەی نوێنەرانی پارلمانی میللیش بۆ ٤٥ کەس دابەزی. بەپێی راپۆرتە فەرمییەکان، ٩٦/٥ لە سەدی دەنگدەرانی مەرجدار لەم راپرسییەدا بەشدارییان کردو ٩٤/٥ لە سەد لەوانە پاڵپشتیان لە عەسگەر ئاقایف کرد. ئەم راپرسییە بەبێ چاودێری رێکخراوە نێونەتەوەییەکان و وڵاتە دەرەکییەکان بەڕێوەچوو.

لە ساڵی ١٩٩٨ وەزیری دادوەری، پێشی بە کاری کۆمیتەی مافی مرۆڤی قرقیزستان گرت و ئەوانی بە لەژێر پێنانی جاڕنامەی ساڵی ١٩٩٦ تۆمەتبار کرد. بەرپرسانی قرقیزی رایانگەیاند ئەم کارە بەهۆی کردەوە دژە حکوومییەکانی کۆمیتەی مافی مرۆڤ لەم وڵاتە بووە. بەڵام ئەم کۆمیتەیە بە گوشاری رێکخراوە نێونەتەوەییەکان سەرلەنوێ کاری خۆی دەستپێکردووە. هەروەها لەنێوان دسامبری ساڵی ١٩٩٨ دەرکەوت کە ژمارەیەك لە بەرپرسانی حکوومەتی قرقیز لەوانە سێ جێگری سەرۆك وەزیران بە تاوانی گەندەڵی ئەخلاقی و جنێودان بە حکوومەت دەستبەسەر

(١) بلاوکراوەی هۆبەی بازرگانی‌و پیشەسازی کانزای ئێران، ژمارە ٩، ئازەری ١٣٧٧، لاپەڕەی ٤٦



کران. ئەم کارە بوو بە هۆی چڕبوونەوەی خەباتی ئاقایف دژی گەندەڵی ماڵی‌و ئەخلاقی کە لە ئاکامدا ٣٨٣ لە بەرپرسانی حکوومی لە پۆستەکانیان لابران.

هەروەها لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٨دا سەرۆك کۆمار حکوومەتی هەڵوەشاندەوەو پاساوی بۆ ئەم کارەی ئەوە بوو کە حکوومەت تاکو ئێستا نەیتوانیوە ئاریشە ئابوورییەکانی وڵات چارەسەر بکاو بیر لە رێگا چارەیان بکاتەوە.

ئاقایف هەروەها خوازیاری پتربوونی دەسەڵاتی سەرۆك وەزیران بوو تاکو لەم رێگایەوە بتوانێ بۆ دانان و لابردنی وەزیرەکان و بەرپرسی باڵوێزخانەکان کە پێشتر لە دەسەڵاتی سەرۆك کۆماردا بوون، هەر خۆی بڕیاری لەسەر بدا.

لە کۆتایی مانگی مای ساڵی ١٩٩٩، یاسایەکی تایبەت بە هەڵبژاردنی نوێ هاتە ئاراوە کە ١٥ پۆست لە کۆی هەموو پۆستەکان بۆ گرووپگەلێك تەرخان کرا کە لانیکەم ٥٪ دەنگەکانیان بەدەستهێنابێ. هەروەها پارلمان بە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی ماڵی‌و دەرەکی‌و شەخسی لە کێبەرکێی هەڵبژاردنەکاندا یاساغ کردووە[١]. سەرەڕای ئەوەیش لەنێوان مانگی ژووئەنی هەمان ساڵدا بۆ پێکهێنانی حیزب و رێکخراوە سیاسییەکان یاسایەکی تایبەت داڕێژراو بە پیچەوانەوە پێش بە چالاکی ئەو حیزب و گرووپانەی کە مەترسین بۆ سەقامگیری و یەکیەتیی نەتەوەیی ـ عەشیرەتی قرقیزستان گیرا.

لە مانگی جوولای هەمان ساڵیشدا دوو حیزبی بەرهەڵستکاری نوێ دامەزران. یەکێك لەوانە حیزبی یەکسانییە کە لەلایەن جێگری پێشووی سەرۆك کۆمارو شارەداری بێشکەك رێبەری دەکرا، ئەوی دیکەیان حیزبی ئارنامیس (شکۆ یان شەرافەت)ە کە رێبەرییەکەی لە ئەستۆی فیلیکس کۆلۆفە. لەنێوان مانگی ئووتی هەمان ساڵدا لقێك لە حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستان پێکهات کە "کلارا ئاجیبکۆف" رێبەری دەکرد.

ئاجیبکۆف رایگەیاند کە رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستان واتە ئابسامات ماسالیف سەرپێچی لە ئیدئۆلۆژی ئەم حیزبەی کردووە، چونکە ناوبراو بەرگری لەو وەزیرانەی کردووە کە گەندەڵی ماڵی‌و ئەخلاقیان بووە. هەر لەم مانگەدا وەزیری بەرگری قرقیزستان "ماج گێن مۆرزاکان سوباتۆف" لەسەر کار لابراو سەرۆکی شوورای نەتەوەییان بەجێگای ئەو دانا.

(1) Kyrgyzstan Daily Digest. 30 May 1999

چاودێران هۆکاری لابردنی وەزیری بەرگریان بۆ کەمتەرخەمی ناوبراو لەمەڕ سەرکوت و چارەسەرنەکردنی ئاڵۆزییەکانی ناوچەی ئەوش لە مانگی ئاگۆستی ١٩٩٩دا گەڕاندەوە[1]. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ١٢ کەس لە پارێزگای ئووش لەلایەن هێزەکانی حکوومییەوە بە تۆمەتی هاوکاری لەگەڵ بناژۆخوازە ئیسلامییەکان و پیلان داڕشتن بە دژی سیستمی یاسایی تاوانبار قۆڵبەست کران.

لە ٢ی فیورییەی ٢٠٠٣ ڕاپرسییەك بەڕێوەچوو کە تێدا داوا لە خەڵك کرابوو، کە ماوەی سەرەك کۆماری عەسگەر ئاقایف لەساڵی ٢٠٠٥ دواییی دێت، لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە یا نا؟

ڕاڤەوانانی سیاسی لەو بڕوایەدان کە ئاکامی ڕاپرسی یاسای سەرەکی قرقیزستان ڕوانینی گشتی کۆمەڵگا پیشاندەدات و دوورە لەوەی کە مەبەستێکی بەرژەوەندییانەی لە پشت بێ. قرقیزستان بەردەوام لەمەڕ ناسەقامگیری زیان هەڵگرتر دەبوو[2].

گرووپ و حیزبە سیاسییەکان هەرکام بەرنامەو ڕوانگەی خۆیانیان هەیەو حکوومەتی عەسگەر ئاقایف وەك پێویست لە ڕاستای گشتی ئەم بەرنامەدا حەرەکەت ناکا، قرقیزستان لەچاو کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای ناڤین لە دێموکراسییەکی زیاتر بەهرەمەندە، گرتنە بەری شێوازی ڕاپرسی وەکوو مێتۆدێك بۆ ڕێکخستن و چارەسەرکردنی ئاریشە ڕوو لە پەرە گرتنە سیاسییەکان، گرینگی پێدراوە.

لە ڕوانگەی ئاقایفەوە، ڕاپرسی دووی فیورییە باشترین ڕێگا چارەو یارمەتی کردنە بە گەشە کردنی قرقیزستان. بەپێی ئامارە فەرمییەکان، دەوروبەری ٧٥ لە سەدی دەنگدەران پشتیوانییان لە یاسای بنەڕەتی نوێ کردووە. دەبێ سەرنج بدەین کە ئەم یاسایە لەلایەن کۆمیتەیەکەوە ئامادە دەکرا کە ئاقایف بۆ خۆی دەستنیشانی کردبوو. ٧٧٪ دەنگدەران لە ڕاپرسی دوایی بۆ مانەوەی ئاقایف لە پۆستی سەرۆك کۆماری تاکو ساڵی ٢٠٠٥ دەنگی ئەرێنییان دا. لە ئاکامدا، ئاقایف، ناچار دەبوو کە پێداچوونەوە بە سیاسەتە ئیدارەکانیدا بکات. لە هەمان کاتدا هێزە بەرهەڵستکارە شکست خواردووەکان داوای دەست لەکارکێشانەوەی ئاقایفیان دەکرد.

لەگەڵ هەموو ئەوانەش دا، ڕێبەرانی بەرهەڵستکار، شك و گومانیان لە مەڕ ئاکامی هەڵبژاردنەکاندا هەبوو، حکوومەتیان بە دەستێوەردان لە هەڵبژاردن تاوانبار کرد. بەپێی

---

(1) RFE/RL Kyrgyz News, 25 August 1999
(2) http://www. eurasia. insight. kyrghstan



ڕاگەیەندراوی کۆمیتەی مافی مرۆڤی قرقیز (HCHR) کە دژی دەسەڵاتی ئاقایفن کۆمەڵێك خاڵی نائاسایی بەرفراوان لەکاتی دەنگدانەکەدا بینراوە. هێندێك لە چاودێران لەو بڕوایەدان کە ئاکامی ڕاستەقینەی ڕێژەیەکە لەنێوان بانگەشەی ئامارە فەرمییەکان و بەرهەڵستکارەکانە، بەڵام لە هەمان کاتدا، چاوەڕوان ناکرێ کە بەڕێوەبردنی ڕێفراندۆم ڕەوشی سەقامگیری حکوومەت بەرەو ئاقارێکی ببا.

گرژی لە قرقیزستان کە لە کاتی دەستگیرکرانی نوێنەری کەمینەی پارلمان "عەزیم بەك نەزەرۆف" سێ مانگ درێژەی کێشا، چووە قۆناخی ناڕەزایەتی نیشاندانەوە بۆ یەکەم جار پۆلیس تەقەی لە خۆپیشاندەران کرد کە پشتیوانییان لە "عەزیم بەك نەزەرۆف" دەکردو لانیکەم شەش کەس کوژران. هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان لە ڕێگای هێزەوە، لەگەڵ شکست بەرەوڕوو بوو، ئەمە پیشاندەری لاوازی بەرپرسان و ڕۆڵی گرینگی ناڕازییانە. بەك نەزەرۆف پاش دەستگیرکردنی ئازاد کراو ئەمە کارێکی ژیرانە بوو لەپێناو هێورکردنەوەی وڵات. ناڕەزایەتییەکان زۆر بە خێرایی دوای قۆڵبەست کرانی لە ٥ی ژانویەی ٢٠٠٣ دەستی پێکرد. نوێنەرانی پارلمان و لایەنگرانی خۆپیشاندانەکان، هەروەها مانگرتنەکان لە پێتەخت و باکووری وڵات ـ هەرێمی ئەجلال ئاباد، (مەبەست هەمان هەرێمە کە دەنگیان دابوو بە بەك نەزەرۆف بۆ پارلمان) ئەم خۆپیشاندانەیان ڕێکخستبوو. ژمارەیەك لە خەڵك کە بەشداریان لە مانگرتنی خواردن کە چەند ڕۆژێك درێژەی هەبوو، کرد کە لە ئاکامدا لە ڕۆژی ٧ی فیەورییە بووە هۆی مردنی چالاکوانی ناسراوی مافی مرۆڤ "شرارلی نەزەر ئاقلو" کە لەلایەن ڕێکخراوگەلی مافی مرۆڤەوە شەرمەزار کرا. زێدەباری ئەوەش بنەماڵەی بەك نەزەرۆف، بە تاوانی پشتگیری کردن لە حکوومەت بۆ ماوەی چەند حەوتوو قۆڵبەست کران. ناڕازییەکان خوازیاری ئازادی بەك نەزەرۆف و نوێژەن کرانەوەی گشتی بوون. هەروەها لە هێندێك لە دروشمەکانیاندا ڕاستەوخۆ خوازیاری لاچوونی ئاقایف لە پۆستی سەرۆك کۆماریدا بوون.

ئەم ناڕەزایەتییە کۆمەڵایەتییە (گشتییە) لەلایەن نوێنەری کەمینەوە ڕێکخرابوو، کاتێك دەستیپێکرد کە لە تریبۆنی پارلمانەوە ڕەخنەی ئاراستەی سەرۆك کۆمار دەکرد (ئەگەرچی بە گشتی ئاکامی ڕاستەوخۆی وروژاندنی کەمینەی سیاسی نەبوو). دادوەری گشتی ٧ ساڵ زیندانی بۆ بەك نەزەرۆف براندەوە، کە بووە هۆی گرژی و ئاڵۆزی لە ناوچەکەو تا هەنووکوش وێنەی نەبووە، لە ١٧ی مارس، نزیکەی ٢٠٠ کەس لە

دانیشتووانی ئاوایی دراوسێی "بەك" ڕێپێوانێکی نارەزایەتییان لە ئاوایی کیزا بەرەو ناوەندی فەرماندەیی هەرێمی حکوومەت لە کەبرەن وەڕێ خست کە پۆلیس تەقەی لە خۆپیشاندەران کردو لە ئاکامدا ٥ کوژراوی لێکەوتەوە.

سەرکوتی خوێناوی خۆپیشاندەران بووە هۆی شلەژانی رەوشی سیاسی قرقیزستان. لە ١٨ی مارس سەرۆك کۆمار وتارێکی تایبەتی پێشکەشکردو داخ و کەسەری قووڵی خۆی لە کوژرانی خۆ پیشاندەران دەربڕی. لە هەمان کاتدا ناوبرا پڕۆپاگەندەیی هاوئاهەنگ، لەلایەن هێزە کەمینەکانەوە بە مەبەستی ناسەقامگیرکردنی رەوشی وڵات مەحکووم کردو ژیرانە لە ئاماژەکردن بە هەر چەشنە ناوێك خۆی بوارد. وەزیری ناوخۆ بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە کەڵکوەرگرتن لە چەکی گەرم لەلایەن پۆلیسەوە بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کردەوەی سەرەڕۆیانەی خەڵك بە جێ و لۆژیکانە بووە. (ئەگەرچی شایەت حاڵەکان روونیان کردەوە کە هەڵس و کەوتی خۆپیشاندەوران هێدی بووەو تەنیا بەرەو کەبرەن رۆیشن هەتا نارەزایەتی دەربڕن). کەڵك وەرگرتن لە کەرەستە نیزامییەکان بەهۆی کەمی بودجە بۆ دابینکردنی گازی فرمێسك رێژ و گوللە مەشقییەکان لە بوودجەی وەزارەتی ناوخۆ تاوتوێ کراو لە ١٨ی مارس وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، ریچارد بەوچێر نیگەرانی خۆی لەمەڕ بارودۆخی هەنووکەی قرقیزستان دەربڕی ئەم رووداوە بە نۆبەی خۆی پێوەندییەکی گرینگی لە بەرەی دژە تێرۆریستی ئاسیای ناڤیندا هەیە. ناوبرا وەبیری هێنایەوە کە ئەمریکا هەرچەشنە پێشێلکردنێکی مافی مرۆڤ قبووڵ ناکاو پاڵپشتی کردن لە مافی مرۆڤ یەکێکە لە هۆیەکانی شەڕ دژی تێرۆریزم. لە هەمان رۆژدا، دادوەری گشتی کە دۆسیەی بەك نەزەرۆفی وەئەستۆ بوو گوتی کە دادگاییکردنی بەکی بۆ ماوەیەکی نادیار وەدوا خستەوە.

رۆژی ١٩ی مارس خۆپیشاندەران لە کەبرەن چاویان بە کۆرمانێك باکیوی، سەرۆك وەزیر کەوت، هەر ئەو کەسەی خوازیاری ئاسایشی بوو و بەڵێنیی قەرەبووکردنەوەی ماڵی بە بنەماڵەی کوژراوەکان دا، هەر لەو کاتەدا ناوبراو گوتی لەبەر ئەوەی کە خۆپیشاندان کۆتایی پێدێت کاربەدەستان باری نائاسایی لە هەرێمی ئەجلال ئاباد راناگەیەنن. لە هەمان کاتدا کاربەدەستان پێش ئەوەی کە بەك نەزەرۆف بەڵێننامەی واژۆ کرد لە شوێنی مانەوەی (ئەو جێگایەی کە پەیوەست ببوو بە خۆپیشاندەران) ئازاد کرا. گرژییەکان تا رادەیەك کەم بۆوەو لەگەڵ ئەوەیشدا کاربەدەستان جەختیان دەکردەوە دادگایی بەك نەزەرۆف کە ئاکامێکی ئەرێنی بۆ ئاشتی لە وڵاتدا لێناکەوێتەوە، دەبێ دادگا رەوتی کارەکانی لە مەڕ دۆسیەی بەك درێژە پێبدا.



بەو جۆرەی کە دژبەران لە رێگای یاساییەوە لە هەمبەر قۆرخ کردنی گشت دام و دەزگا حکوومییەکانەوە لە لایەن نیز ئۆفەوە بێ هیوا ببوون، مەترسی گرتنە پێشی رێکاری نادێموکراتیك و رادیکاڵیانە لەنێو بەرهەڵستکاراندا هاتە ئاراوە یان لە هێندێکیان پەرە دەگرێ و ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە نوێنگەیەکی گشتی دوای تێکچوون لەنێو کۆمارەکانی ئاسیای ناڤیندا هەر وەك حکوومەتێکی دەسەڵاتخواز (ئۆزبەکستان) لە قرقیزستانیش گەشە بکا.

لە گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییانەی قرقیزستاندا، دەتوانین ئاماژە بە چالاکی بناژۆخوازە ئیسلامییەکان لە باکووری رۆژئاوای ئەم وڵاتەدا بکەین. ئەمە بووە هۆی بەرزبوونەوەی نیگەرانی کاربەدەستانی قرقیزی، هەر بۆیە ئەوان هەوڵیان دەدا بە هاریکاری کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای نێوەڕاست و رووسیە بەرەنگاری ئیسلامی خوازانی سەلەفی ببنەوەو پێش بە پەرەگرتنی چالاکییان لە ناوچەکەدا بگرن. هەروەها حکوومەتە ناوچەییەکان لە هەوڵی ئەوەدابوون چاوخشاندنەوە بەسەر سیاسەتەکانی خۆیاندا بکەن و لە پێوەندی لەگەڵ سەلەفی خوازی ئایینیو تیرۆریزم هەڵوێستی بە بڕشتر لەمەڕ ئەم هەزرە بگرنە بەر. شایانی ئاماژەپێدانە کە باکووری رۆژئاوای قرقیزستان بەهۆی دراوسێیەتی بە ناوچەی فەرغانەو بوونی کولتووری و ئایینی وەك یەك، بەردەوام لەژێر باندۆری ئەندێشەی ئیسلامی خوازی و بناژۆخوازانی ئایینیدا بووە(١).

## (٣ـ٤) یاسای بنچینەیی

یاسای بنەڕەتی کۆماری قرقیزستان لە دوازدەهەمین رۆنیشتنی کۆبوونەوەی شوورای باڵای ئەم وڵاتە لە ٥ی مای ١٩٩٣دا پەسندکرا. ئەم یاسا پەسندکراوەیش چوارجار خرایە بەر راپرسی گشتییەوە و کۆمەڵێك گۆڕانکاری تێدا کراوە. دوایین راپرسی گشتی کە بۆ ئەم مەبەستە کرا، لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٩٨ بوو کە ٩٤/٥ لە سەدی بەشداربووان دەنگی ئەرێنییان پێدا(٢).

یاسای بنەڕەتی کۆماری قرقیزستان بریتییە لە ٨ پاژو ٩٧ ماددە.

ماددەی یەکەمی، ئەم کۆمارە بە وڵاتێکی یەکگرتوو، خاوەنی دەسەڵاتێکی خەڵکیو لەسەر بنەمایا سێکۆلاریزم پێناسە کراوە کە دەبێ مافی یەکسانی بۆ گشت شارۆمەندان

---

(١) بەرات شەمسا، "پەرەگرتنی ئیسلامی خوازی لە ئاسیای نێوەڕاست"، رۆژنامەی ئیتلاعات، ١١ی رەشەمەی ١٣٨٧، لاپەڕەی ١٢

(2) Europe World Year Book 2002, P. 229

گەرانتی بکا، بەپێی ئەم ماددەیە، ئاخێزگەی سەرەکی دەسەڵات و فەرمانڕوایی حکوومی، هاووڵاتیانی ئەم وڵاتەن و بەم جۆرە حکوومەت تەنیا نوێنەری یاسایی ئەوانن. هەر لەم راستایەدا تەنیا ناوەندی سەرۆك کۆماری و شوورای باڵای ئەم وڵاتە مافی ئەوەیان هەیە کە لەلایەن خەڵکەوە بڕیار بدەن. هەروەها لەم ماددەیەدا، راپرسی وەك یەکێك لە کەرەستەکانی بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی خەڵکی دەژمێردرێ. بەپێی ماددەی دوانزەی ئەم یاسایەش گرێبەستەکان و هەموو نۆرمە یاساییە نێونەتەوەییەکان کە لەلایەن حکوومەتی قرقیزستان پەسند دەکرێ و بە بەشێکی تێکڵاو لە سیستمی یاسایی ئەم وڵاتە بە ئەژمار هاتووەو بە شێوەی راستەوخۆ جێبەجێ دەکرێ. لە ماددەی چوارەمی یاسای بنەڕەتیدا، هەموو جۆرە خاوەندارێتیەك لە نیزامی ئابووری وڵات رێی پێدەدەرێ.

لەم کۆمارە ئەگەرچی سەرچاوە سرووشتییەکان لەژێر خاوەندارێتی حکوومەتی دان، بەڵام لە هەمان کاتدا هەموو جۆرە خاوەندارێتی تایبەتی بە فەرمی ناسراوە. بەپێی ئەم ماددەیە دابەشکردن و مۆڵەت دان بە خەڵکانی یاسایی‌و ئاسایی جەختی لەسەر کراوە بەڵام کڕین‌و فرۆشتنی یاساغ راگەیێندراوە. لە ماددەی پێنجەمی یاسای بنەڕەتیشدا، زمانی فەرمی وڵات قرقیزییە بەڵام بایەخی زۆر دراوە بەزمانەکانی دیکە لەم کۆمارەداو لەوانە زمانی رووسی. بە جۆرێك ئاقایف بۆ فەرمی کردنی زمانی رووسی لە ساڵی ١٩٧٧ هەوڵێکی بەرفراوانی دا تا ئەوەی کە پارلمانی قرقیزستان لە مانگی مای ٢٠٠٠ زمانی رووسی وەك زمانی فەرمی لە تەنیشت زمانی قرقیزی بە فەرمی ناسی[1].

بەپێی ماددەی نۆهەم، کەڵك وەرگرتن لە هێزی سەربازی بۆ چارەسەرکردنی پرسە نێوخۆییەکانی قرقیزستان یاساغ کراوە و ئەم هێزە سەربازییانە تەنیا ئەرکی بەرگری کردن لە وڵاتیان لە ئەستۆیە. لە ماددەی هەشتەمیش گشت هاووڵاتیان مافی بەشداریکردن لە حیزبە سیاسییەکان و یەکیەتییە سڤیل‌و رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانیان هەیەو حکوومەت دەبێ ماف و بەرژەوەندییە یاساییەکان گەرانتی بکا. هەڵبەتە درێژەی لە ئەم ماددەیەدا هەڵسووڕانی حیزبە سیاسییەکان بەرتەسك کراوە، بە جۆرێك حیزبە سیاسییەکان لەسەر بنەمای ئایینی و نەتەوەیی یاساغ راگەیەندراوە. هەروەها رێکخراوە ئایینییەکان مافی گرتنەبەری ئامانج و ئەرکە سیاسییەکانیان نییە.

(1) B. B. C, Radio, Central Asian Surrey, 25 May 2000



بەرپرسانی نیزامی‌و دادو تەناهی نەتەوەیی قرقیزستان مافی ئەندامێتی یان لایەنگری کردن لە حیزبە سیاسییەکانیان نییە، تەنانەت چالاکی بەرپرسانی ئەو حیزبانەی، کە مافی بەشداری لە حیزبە سیاسییەکانیان هەیە، نابێ لە کاتی ئیداری و کاتەکانی کاری حکوومی بێ‌و چالاکی حیزبە سیاسییەکانی قرقیزستان لە وڵاتانی دیکەو بە پێچەوانە یاساغ و پێشی پێ گیراوە.

لە ماددەی ١٤ی یاسای بنەڕەتیدا لەگەڵ بیانییەکان و ئەو خەڵکانەی هاووڵاتی ئەو وڵاتە نین بەپێی پێوەرە نێونتەوەییەکان هەڵس‌و کەوتیان لەگەڵدا دەکرێ. هەڵبەت ئەو خەڵکانەی کە بارودۆخێکی تایبەتییان هەیە مۆڵەتی پەنابەری سیاسییان پێدەدرێ.

لە یاسای بنەڕەتی کۆماری قرقیزستاندا بۆ هەموو هاووڵاتیانی ئەم وڵاتە، یەکسانی ماف و ئازادی تاك و کۆمەڵایەتییەکان بەبێ سەرنجدان بە رەگەز، زمان، نەتەوە، ئایین و باوەڕمەندییە سیاسییەکان گەرانتی کراوە. بە چەشنێك بەپێی ماددەی ١٨ی ئەم یاسایە، داسەپاندنی هەر چەشنە سنووردارکردنی ماف و ئازادییەکانی یاسای بنەڕەتی قرقیزستان بۆ هاووڵاتیان تەنیا بەپێی یاساو حوکمی دادگا دێتە ئاراوە لە گرینگترین ماف و ئازادییەکانی یاسای بنەڕەتی قرقیزستان بۆ هاووڵاتیانی خۆی کە لەبەرچاو گرتووە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

١ـ رێزگرتن لە داب و نەریتەکانی خەڵك کە بە پێچەوانەی یاسای بنەڕەتی نەبێ.

٢ـ ئاسایشی تاك و مافی ئازادی، لەوانە ئازادی بەیان و نووسین، ئایین و ئایین زاکان، هەروەها ئازادی چالاکییە وێژەییەکان، هونەری، زانستی، ئازادی چاپەمەنی‌و ئاڵ و وێری زانیاری و راوبۆچوون، ئازادی هەڵبژاردنی پیشە و شوێنی نیشتەجێبوون، بەشداری لە مانگرتن و رێپێوانەکان، مافی بەڕێوەبردنی خۆپیشاندانی ئاشتیخوازانە دوور لە هەرچەشنە کردەوەی چەکداریانە.

٣ـ مافی بوونی خوێندنی بە خۆڕایی مافی کەڵك وەرگتن لە خزمەتگوزاری پزیشکی بێبەرانبەر لە نەخۆشخانە، دەرمانخانە حکوومییەکان، ئازادی چالاکی رێکخراوە فێرکارییە تایبەتییەکان و ناحکوومییەکان، مافی ئازادی هەڵسووڕانی ئابووری‌و کەڵك وەرگرتنی ئازاد لە کەرەستەکان و شت و مەك بۆ ئەنجامدانی هەر چەشنە چالاکییەکی ئابووری، مافی یەکسان بۆ دەست پێڕاگەیشتن بە خزمەتگوزاری حکوومی‌و کۆمەڵایەتی لە کاتی پیری و پەککەوتووی، نەخۆشی‌و لەدەست دانی هێزی کارکردن، یان لە کاتی بێکاری و نەبوونی کەس و کار، پارێزراو مانەوەی نووسراوەکان و پێوەندییە تەلەفوونی‌و پۆستەکان، رێزدانان بۆ ژیانی تاك‌و پاراستنی نهێنییەکانی تاك و بنەماڵە و کۆمەڵێك خاڵی دیکە لەم بابەتە.

لە سەرەوەی هەموویان، بە گوێرەی ماددەی حەوتی یاسای بنەڕەتی، فەرمانڕوایی لە کۆماری قرقیزستان لەنێوان سێ دەسەڵاتی بەڕێوەبەر، دادوەری‌و یاسادانەر دابەشکراوە، بەم پێیە پێکهاتەکانی حکوومی وڵات بە شێوەی سەربەخۆ کار دەکەن و بنەماکانی دابەشبوونی دەسەڵات لەبەرچاو گیراوە.

**ئەلف. دەسەڵاتی یاسادانەر**

دوای راپرسی گشتی ئۆکتۆبری ١٩٩٤ دەسەڵاتی یاسادانەری قرقیزستان لە دوو پارلمانی یاسادانەرو پارلمانی نوێنەرانی گەل بەکۆی ١٠٥ نوێنەر پێکهاتووە. بەدوای راپرسی ئۆکتۆبری ١٩٩٨یش رێژەی ئەندامانی ئەم دوو پارلمانە کۆمەڵێك گۆڕانی تێدا کرا، بە جۆرێك کە ژمارەی نوێنەرانی پارلمانی گەل لە ٧٠ کەس دابەزی بۆ ٤٥ کەس و بە پێچەوانە رادەی نوێنەرانی پارلمانی یاسادانەری ئەم وڵاتە لە ٣٥ کەسەوە بوو بە ٦٥ کەس. ئەم دوو پارلمانە پێکەوە پارلمانی باڵای قرقیزستان پێکدێنن. نوێنەرانی ئەم دوو پارلمانە بە دەنگی راستەوخۆی خەڵك و بۆ ماوەیەکی دیاریکراوی ٥ساڵە هەڵدەبژێردرێن کە تێکەڵاوێکە لە نوێنەرانی حیزبەکان، گرووپەکان، یان کاندیداتۆرە سەربەخۆکان. لەم نێوەدا بەهێزترین حیزبی بەرهەڵستکاری حکوومەت، حیزبی کۆمۆنیستی قرقیزستانە کە زۆرینەی پارلمانی بەدەستەوەیە.

بەپێی یاسای بنەڕەتی قرقیزستان شووراى باڵای ئەم کۆمارە بەرزترین ناوەندی نوێنەرایەتی هەمیشەییە. ئەم ناوەندە کاری یاسادانان و چاودێری بەسەر پارلمانی باڵای وەئەستۆیە. لە ماددەی ٥٦ی ئەم یاسایە، نوێنەرانی شووراى باڵا خاوەنی پارێزراویی تاك و سیاسین و تەنیا بە رەزامەندی ئەوان دەتوانرێ لێپرسینەوە لە نوێنەرانی پارلمان بکرێ. شووراى باڵا ناتوانێ پیشەی حکوومی هەبێ، یان لە دەزگا قەزاییەکان بەشداری بکا، یان سەرقاڵی کاری بازرگانی بێ. سەرۆکی شووراى باڵا بە دەنگی نهێنی دەستنیشان دەکرێ و لە بەرانبەر نوێنەرانی ئەم شوورایە بەرپرسیارەو بە دەنگی زۆرینەی ٢ لە ٣ی ئەوان لەسەر پۆستەکەی لادەبردرێ. لە ماددەی ٥٩ی یاسای بنەڕەتیدا، ئەرك و دەسەڵاتەکانی سەرۆکی شووراى باڵا بەم شێوەیە دارێژراوە.

١- رەزامەندنی دیسیپیلینی نێوخۆیی پارلمان و بەڕێوەبردنی دانیشتنەکانی شووراى باڵا.

٢- دەستنیشان کردنی پرسەکانی جێگای باس لە کۆبوونەوەکانی شووراى باڵاو لێژنەی سەرۆکایەتی.



٣ـ واژۆی بەڵگە و پەسند کراوەکانی شووراى باڵاو لێژنەی بەڕێوەبەری‌و ئەو خاڵانەی دیکە کە لە یاسای بنچینەیی پێی سپاردووە.

٤ـ هەروەها شووراى باڵا هێندێك لە کاروبارەکانی بە یارمەتی جێگرەکانی خۆی کە بە دەنگی نهێنی هەڵدەبژێردرێن، جێبەجێ دەکا.

سەرۆك، جێگرەکان و بەرپرسانی کۆمیسیۆنەکان، لێژنەی سەرۆکایەتی شووراى باڵا پێکدێنن و بەپێی ماددەی ٦٠ی یاسای بنەڕەتی، گرینگترین ئەرکەکانیان دەتوانین بەم جۆرە ئاماژە پێ بکەین:

١ـ لێژنە سەرۆکایەتی، کۆبوونەوەکانی شووراى باڵا دیار دەکاو هاوئاهەنگی لە نێوان کاری کومیتە و کۆمیسیۆنە کاتییەکان پێکدێنێ. لێژنەی سەرۆکایەتی بابەتەکانی پێوەندیدار بە رەشنووسی یاساکانی وڵات و پرسە گرینگەکانی دیکە رێکدەخا.

٢ـ لێژنەی سەرۆکایەتی دەقی یاسا پەسندکراوەکانی شووراى باڵاو بەڵگە پەسند کراوەکانی دیکە بڵاودەکاتەوە.

٣ـ لێژنەی سەرۆکایەتی لە بەرانبەر شووراى باڵا بەرپرسیارە.

لە ماددەی ٦١یش ئەرکەکانی کۆمیتەکان و کۆمیسیۆنە کاتییەکانی شووراى باڵا بەیان کراوە، بۆو وێنە کۆمیتە و کۆمیسیۆنە کاتییەکانی رەشنووسی یاساکان ئامادە دەکەن و چاودێری بەسەر جێبەجێ کردنی یاساو پەسند کراوەکانی پارلماندا دەکەن. هەروەها ئەو پرسانەی کە دەیگەڕێتەوە بۆ شووراى باڵا، سەرلەنوێ تاوتوێی دەکەن.

بەپێی ماددەی ٦٤ مافی یاسادانان لە ئەستۆی کۆمەڵێك دامەزراوەی سەربەخۆیە کە بریتین لە: نوێنەرانی شووراى باڵا ناوەندی سەرۆك کۆماری، دادگای باڵای ئابووری ئەم وڵاتەو دواتر گەلاڵەی سێسەد هەزار کەسی دەنگدەران، لەم نێوەدا دەسەڵاتی شووراى باڵا بەپێی ماددەی ٥٨ زۆر قورس و بەرفراوانە کە گرینگترینیان دەتوانین ئاماژە بەوانەی خوارەوە بکەین:

١ـ گۆڕین و دەستکاری یاسای بنەڕەتی پێداگری لەسەر یاساکانی وڵات و چاودێری بەسەر جێبەجێکردنیان.

٢ـ دیاریکردنی رێچکەی سەرەکی لە سیاسەتی نێوخۆیی وڵات و دەستنیشانکردنی پێکهاتەی حکوومەت.

٣ـ چارەسەرکردنی پرسە پێوەندیدارەکان بە خاك و ئیدارەو گۆڕانکاری لە سنوورەکانی وڵاتدا.

٤ـ هەڵبژاردنی سەرۆکی دادگای باڵا، هەروەها سەرۆکی دادگای باڵای ئابووری وڵات، هەڵبژاردنی جێگرو دادوەرەکان لەسەر داوای سەرۆك کۆمار.

٥- پەسندکردنی رێکەوتننامە نێونەتەوەییەکان و بڕیاردان لە هەمبەر پرسەکانی پێوەندیدار بە شەڕو ئاشتی

٦ـ راگەیاندنی باری نائاساییو بارودۆخی شەڕو بڵاوکردنەوەی فەرمانەکان کە لەم بوارەدا لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە رادەگەیەندرێ، بڕیاردان لەسەر کەڵك وەرگرتن لە هێزی چەکدار لە کاتی پێویست و لەسەر بنەمای رێککەوتنەکانی نێونەتەوەیی لە راستای بەرگری لە ئاشتیو ئاسایشی وڵاتدا.

٧ـ بڕیاردان لەمەڕ لابردنی کاربەدەستان لەسەر کۆمەڵێك خاڵی تایبەتی کە لە ماددەی ٥٢و بەندی یەکی ماددەی ٨١ی یاسای بنەڕەتیدا دەستنیشان کراوە.

٨- دەرکردنی فەرمانی راپرسی گشتیو لێبوردنی گشتی، دیاریکردنی رێکەوتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری، هەروەها دیاریکردنی سیستمی دراوی و پەسندکردنی بوودجەی وڵات

٩ـ دیاریکردنی بەرپرسو جێگرەکانی هۆبەی چاودێری بەسەر شوورای باڵا لەسەر پێشنیاری سەرۆکایەتی شوورای باڵا.

١٠ـ دانی خەڵات و هێماکانی حکوومی، هەروەها دیاریکردنی پلەی نیزامی و سیاسییەکان و گشت هێماکانی جێی شانازی وڵات.

١١ـ هەڵبژاردنی سەرۆکی دادگای یاسای بنەڕەتی، هەروەها هەڵبژاردنی جێگرو ٧دادوەری ئەندام لەم دادگایە لەسەر پێشنیاری سەرۆك کۆمار، هەروەها رەزامەندی دەربڕین لە پێوەندی لەگەڵ دیاریکردرنی دادوەری گشتی وڵات و سەرۆکی بانکی ناوەندی، هەروەها لە ماددەی ٥٢ی یاسای بنەڕەتیدا بەجۆرە هاتووە کە سەرۆك کۆمار لە کاتی ئەنجامدانی تاوان یان خەیانەت بە وڵات، تەنیا بە بڕیاری دادگای یاسای بنەڕەتیو بە دەنگی ٢ لە ٣ی نوێنەرانی شوورای باڵا لە پۆستی خۆی وەلا دەنرێ.

سەرەڕای ئەوەی کە لە بەندی ١ی ٨١دا هاتووە کە ئەگەر فەرمانبەرانی دادگای باڵا، دادگای یاسای بنەڕەتی، هەروەها دادگای باڵای ئابووری وڵات خەیانەت، یان تاوانێك ئەنجامبدەن، تەنیا بە زۆرینەی ٢ لە ٣ی دەنگی نوێنەرانی شوورای باڵا لە پۆستەکانی خۆیان وەلا دەنرێن.



**ب: دەسەڵاتی بەڕێوەبەری:**

بەپێی یاسای بنەڕەتی، جۆری حکوومەت لە کۆماری قرقیزستاندا سەرۆکایەتییە. لە حکوومەتی سەرۆکایەتیدا، سەرۆك کۆمار دەسەڵاتی زۆری بەدەستەوەیە، مافی ڤیتۆی پەسند کراوەکانی یاسادانان و تەنانەت دەسەڵاتی هەڵوەشانەوەی پارلمانیشی هەیە. سەرۆك کۆمار لەنێوان سێ هێزی وڵات هاوئاهەنگی پێکدێنێ. بڕیارات و هێلە گشتییەکانی سیاسەتی وڵات دەستنیشان دەکات. ئەو بەرزترین پۆستی بەڕێوەبەری وڵاتی وەئەستۆیە. سەرۆك کۆمار بە دەنگی راستەوخۆی خەڵك بۆ ماوەیەکی دیاریکراوی ٧ ساڵە هەڵدەبژێردرێ. ماددەی ٤٢ی یاسای بنچینەیی قرقیزستان سەرۆك کۆماری ئەم وڵاتەی لە نوێنەرایەتی لە شوورای باڵا، بەشداری لە حیزب و رێکخراوە سیاسییەکان، ئەنجامدانی هەر چەشنە چالاکی ئابووری یان بوونی پۆستێکی دیکە بێبەش کردووە.

لە ماددەی ٤٦ی یاسای بنچینەیی دەسەڵات و ئەرکەکانی سەرۆك کۆمار زۆر قورس و داگری کۆمەڵێك خاڵی بەرفراوانە کە دەتوانین بەرچاوترینیان بەم جۆرە باسی بکەین:

١ـ لەسەر داوای نوێنەرانی شوورای باڵا، سەرۆك وەزیران هەڵدەبژێردرێ و دواتر لەسەر پێشنیاری سەرۆك وەزیرو رەزامەندی شوورای باڵا ئەندامەتی دیکەی حکوومەت دیاریدەکات.

٢ـ دانان و لابردنی سەرۆك وەزیرو ئەندامانی دیکەی حکوومەت، هەروەها دانان و لابردنی دادوەری گشتی وڵات و بەرپرسی بانکی ناوەندی، هەڵبەت بە رەزامەندی شوورای باڵا.

٣ـ پەسندی بەرپرسانی ئیدارەی قەزاو شارەکان کە لەلایەن سەرۆك وەزیرو بە رەزامەندی شوورای هەرێمی پێشنیار دەکرێن، هەروەها لەسەر پێشنیاری سەرۆك وەزیرو رەزامەندی شوورای قەزاکان، بەرپرسانی ئیدارە دەوڵەتییەکان، پارێزگاکان و شاری بێشکەك هەڵدەبژێردرێ.

٤ـ سەرۆك کۆمار پاڵێوراوان بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك و جێگرەکانی دادگای باڵاو دادگای باڵای ئابووری وڵات، هەروەها دادگای یاسای بنەڕەتی و حەوت کەسی لیژنەی بەڕێوەبەری بۆ پەسندکردنیان، بە شوورای باڵایان دەناسێنێ. هەروەها سەرۆك کۆمار جێگری دادگا هەرێمییەکان و شاری بێشکەك و قەزاکان و شارەکان و جێگری دادگا ئابوورییەکانی هەرێمی و دادگا نیزامییەکانی وڵات بەپێی یاسای بنەڕەتی و یاساکانی دیکە و هەڵبەت بە رەزامەندی شوورای باڵا دادەنرێن و لادەبرێن.

٥ـ دانی مۆڵەتی پەنابەریی سیاسی، هەروەها دانی پلەو پایەی باڵای نیزامی هێما ئیفتیخارییە حکوومییەکان.

٦ـ بەڕێوەبردنی ڕاپرسی گشتی لەسەر پرسە گرینگەکانی حکوومی و مافی هەڵوەشاندنەوەی پارلمان پێش کۆتایی پێ هاتنی کاتی دیاریکراو.

٧ـ فەرماندەیی گشتی هێزە چەکدارەکان و دانان و لابردنی فەرماندەکانیان، هەروەها ڕاگەیاندنی شەڕو ئاشتی و ڕاگەیاندنی باری نائاسایی، لە کاتی کەتنە مەترسی ئاسایشی وڵات، هەڵبەت دەبێ ئەمانە ڕەزامەندی نوێنەرانی شوورای باڵایش لەگەڵدا بێ.

٨ـ واژۆی بڕیارەرکانی پارلمان دوای پەسندیان لەلایەن شوورای باڵاوە، هەروەها سەرۆك كۆمار دەتوانێ بەڵگەو بڕیاری باڵوێزخانەکان، کۆمیتەکانی حکوومیو دەزگای ئیداری قەزاکان لەکاتی سەرپێچی کردنیان لە یاسای بنەڕەتی و یاساکانی دیکەی وڵاتدا ڕابگرێ و هەڵیوەشێنێتەوە.

٩ـ بەڕێوەبردنی وتووێژ، هەروەها واژۆی ڕێکەوتنە نێونەتەوەییەکان دوای پەسندی شوورای باڵا.

شایانی ئاماژەپێدانە کە کاتێك سەرۆك كۆمار بەهۆی نەخۆشیی یان ئەنجامدانی تاوان و خەیانەت یان هەر هۆیەکی دیکە کە نەتوانێ ئەرکەکانی خۆی ڕاپەڕێنێ، دوای ڕاگەیاندنی بڕیاری دادگای یاسای بنەڕەتی، نوێنەرانی شوورای باڵا بە کۆکردنەوەی ٢ لە ٣ی دەنگەکانیان دەتوانن سەرۆك كۆمار لەسەر پۆستی خۆی لاببەن. لەم کاتەدا بەرپرسایەتییەکانی سەرۆك كۆمار دەگوازرێتەوە بۆ سەرۆکی شوورای باڵاو لە کاتی لێنەهاتوویی ئەم شوورایە بەرپرسایەتییەکان دەدرێتە سەرۆك وەزیران. هەڵبەت دواتر هەڵبژاردنی سەرۆك كۆمار دەبێ کەمتر لە سێ مانگ بەڕێوەبچێ.

دوای ناوەندی سەرۆك كۆماری، بەرزترین دەزگاکانی بەڕێوەبەری لە سەرۆك وەزیر، وەزیران و جێگری یەکەمی وەزیر، هەروەها بەرپرسی ئۆرگانە حکوومییەکان پێکدێ. ستراکتۆری حکوومەت لەم كۆمارە بە پێشنیاری سەرۆك وەزیران و لەلایەن سەرۆك كۆمارەوە دەستنیشان دەکرێ. زێدەباری ئەوەش سەرۆك كۆمار مافی بەڕێوەبەری کۆبوونەوەکانی هەیەو دەتوانێ چالاکییەکانیان کۆنترۆڵ بکا. بەپێی ماددەی ٧٣ی یاسای بنەڕەتی جگە لە دەسەڵاتی ئیداری و چاودێری کە بەپێی یاسا لە دەسەڵاتەکانی سەرۆك كۆمارو شوورای باڵایە، کاروبارەکانی دیکەی حکوومی لەلایەن لێژنەی وەزیران بەڕێوە دەچێ. لەم نێوەدا سەرۆك وەزیران خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆرو بەرفراوانە، بۆ وێنە سەرۆك وەزیر کاندیداتۆر بۆ پێکهێنانی لێژنەی حکوومەت بە سەرۆك كۆمار پێشنیار دەکاو سەرۆکی ئۆرگانە حکوومییە ناوچەییەکان و شاری بیشکەك بە سەرۆك كۆمار پێشنیار دەکا، یان دەتوانێ بەرپرسانی ئەو شوێنانە بە ڕەزامەندی شوورای شار و ناوچەکانی دایانبنێ و لایانبەرێ.



پاشان دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە ناوچەکان و شارەکاندا لە ڕێگای دامەزراوە خۆجێی و بەرپرسانییەوە بەڕێوەدەچێ و لە شارۆچکەکان و گوندەکان ئەم کارە لەلایەن کاربەدەستانی شوورای ناوچەکان ئەنجامدەدرێ. شایانی ئاماژەپێدانە کە بە مەبەستی ئاسانکاری لە ئیدارەی کاروباری حکوومیدا، کۆماری قرقیزستان بە ٤ ناوچەی لە یەك جیا دابەشکراوە کە بریتییە لە: ناوچەی ئیسك کۆڵ کە ناوەندەکەی پرژواسکە، ناوچەی نارین و ئووش کە ناوەندەکانیان هەر بەناوی خۆیانەوەیە نارین و ئووش، لە دواییدا ناوچەی تالاس کە ناوەندەکەی شاری بیشکەکە، هەروەها دەبێ بزانین کە ئەم کۆمارە خاوەنی ٦ ویلایەت، ٤٣ ناحیە، ٢١ شارۆچکە، ٣١ شار و ١٧٨٠ ئاواییە. لەم نێوەدا هەرێمەکانی کۆماری قرقیز بریتییە لە: چۆ، ئیسك، کۆڵ و تالاس، جەلال ئاباد و ئووشە.

بەپێی ماددەی ٨٥ی یاسای بنەڕەت شووراکان و ناوەندەکانی دیکەی ناوچەیی، لە چوارچێوەی شارەکان، شارۆکەکان و ئاواییەکان دەتوانن دادگای ریش سپییانی ئەتنیکیو دادگاگەلی نێوبژیوانی لەنێو خەڵکانێك کە دەسترۆیشتوون و خۆشەویستن، پێکبێنن. ئەم دادگا خۆجێییانە، ئەو دۆسییانە کە پێوەندیدارن بە ئاریشە بنەماڵەیی و پرسە شەخسییەکان تاوتوێ دەکەن، هەڵبەت هەردوولا دەبێ ڕەزامەندییان لەسەر نێوبژیوانەکە هەبێ. ئەگەر ڕەزامەندی هەردوولا نەبێ داواکارییەکە هەڵدەوەشێتەوە. دەبێ بزانین کە شوورا خۆجێییەکان ئەرکی قورسی دیکەشیان وەئەستۆیە، لەوانە بودجە خۆماڵییەکان پەسندو جێبەجێ دەکەن. شوورا خۆجێییەکان لە چوارچێوەی دەسەڵاتی خۆیاندا دەتوانن یاساگەلێکی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی بهێنە گۆڕێ، هەروەها شوورای ناوچەو شارەکان و شوێنگەکان دەتوانن بەرپرسانی حکوومی پێوەندیدار بە زۆرینەی دەنگ دابنێن و لاببەن، هەڵبەت دەبێ ئەوەمان لەبەرچاو بێ کە شوورا ناوچەییەکان بە شێوەی سەربەخۆو جیا لە ئیدارە حکوومییە ناوچەییەکان چالاکی دەکەن.

**ج ـ دەسەڵاتی دادوەری:**

سیستمی دادوەری کۆماری قرقیزستان لە دادگاگەلی جۆربەجۆر پێکهاتووە کە بریتییە لە: دادگای سەرەکی، دادگای باڵا، دادگای باڵای ئابووری، هەروەها دادگای خۆجێییەکان کە بریتین لە دادگای پارێزگاکان، شاری بیشکەك، شارەکان، دادگای ئابووری ناوچەکان، دادگا نیزامییەکان، دادگای سەرۆك خێلەکان. لەم نێوەدا دادگای یاسای بنەڕەتی باڵاترین ناوەندی دادوەرییە بۆ بەرگری لە نیزامی دادوەری و یاسای بنەڕەتی وڵات. ئەندامانی ئەم دادگایە

بریتییە لە سەرۆك، جێگرو ٧ دادوەر. دادوەرەکانی دادگاکانی یاسای بنەڕەتی بۆ ماوەی ١٥ ساڵ لەلایەن شوورای باڵاو پێشنیاری سەرۆك کۆمار دەستنیشان دەکرێن. ئەم دادگایە خاوەنی دەسەڵاتێکی بەرفراوانە، بۆ وێنە دادگای یاسای بنچینەیی یاسای بوونی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری رادەگەیەنێ، هەروەها لەمەڕ دانان و لابردنی سەرۆك کۆمار، دادوەرەکانی یاسای بنەڕەتی، قازییەکان، دادگای باڵاو دادگای باڵای دادوەری رای تایبەتی خۆیان پێشکەشدەکەن. بڕیاراتی دەزگا حکوومییەکان و بەڵگە یاساییەکانی وڵات لەکاتی دژایەتی لەگەڵ یاسای بنەڕەتیدا هەڵدەوشێنێتەوە. سەرەڕای ئەوە دادگای یاسای بنەڕەتی تەنیادامەزراوەیەکە کە ئەرکی شرۆڤەی یاسای بنەڕەتی هەیەو دوایین بڕیار دەداو دووبارە ناکرێتەوە. بەپێی یاسا، هاووڵاتیانی قرقیزی دەتوانن وەك دادوەری دادگای یاسای بنەڕەتی، ... هەڵبژێردرێن، بەو مەرجەی کە تەمەنیان لەنێوان ٢٥ تاکو ٧٠ ساڵ بێو هەروەها خاوەنی بڕوانامەی باڵای یاسایی و دەساڵ ئەزموونی کارکردنیان هەبێ. دادوەر لە پارێزراوەیی تاکەکەس بەهرەمەندە و بۆ پاراستنی سەربەخۆیی دەنگی کۆمەڵێك گەرانتی تایبەتی هەیە.

بەپێی ماددەی ٨٣ی یاسای بنەڕەتیش دادگای باڵای وڵات بەرزترین ناوەندی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری لە بوارە مەدەنییەکان، سزادان و ئیدارییەکانە. ئەم دادگایە چاودێری لەسەر چالاکی دادگاکانی بیشکەك، هەروەها چالاکی دادگا ناوچەییەکان، شارەکان و نیزامی وڵات دەکا. سەرەڕای ئەوە بەپێی ماددەی ٨٤ی یاسای بنەڕەتی، دادگای باڵای ئابووری وڵات لەگەڵ دادگا ئابوورییەکانی ناوچەکان پێکەوە یەکانێکی دادگای ئابووری کۆماری قرقیزستان بەرهەڤ دەکەن. هەر بەپێی ئەم ماددەیە، جیاوازی لەنێوان یەکانەکانی بەرهەم لەسەر بنەمای خاوەندارییەتی جۆراوجۆر لە دادگا ئابوورییەکان توێژینەوەیان لەسەر دەکرێ، زێدەباری ئەوە دادگای باڵای وڵات هەڵسووڕانە پێوەندیدارەکان بە دادگا ئابووری ناوچەکان دەخاتە ژێر چاودێرییەوە.

بەپێی ماددەی ٨٠یش دادوەرەکانی دادگای باڵاو دادگای باڵای ئابووری وڵات لەسەر پێشنیاری سەرۆك کۆمار لەلایەن شوورای باڵا بۆ خولێکی ١٥ ساڵە دیاری دەکرێن. هەروەها دادوەری دادگای قەزاکان لەلایەن سەرۆك کۆمارو بە راکێشانی رای شوورای باڵا لە خولی یەکەم بۆ ماوەی ٣ ساڵ لە خولی دوایی بۆ ماوەی ٧ ساڵ دەستنیشان دەکرێن.

بەپێی ماددەی ٨١یش لە کاتێکدا دادوەرەکانی دادگای یاسای سەرەکی، دادگای باڵاو دادگای باڵای ئابووری وڵات تاوان یان خەیانەتیان لێ رووبدا لەسەر رای دادگای یاسای



بنەڕەتیو بە زۆرینەی دەنگی ٢ لە ٣ی دەنگی نوێنەرانی شوورای باڵا لە پۆستی خۆی وەلا دەنرێ. هەروەها دادوەری دادگای قەزاکان لە کاتی نەخۆشی، سەرپێچی لە یاسا، بەڕێوەنەبردنی ئەرك، یان ئەنجامدانی تاوان، بەپێی فەرمانی دادگا لادەبرێن. شارۆمەندانی کۆماری قرقیز بە بڕوانامەی باڵای یاساییو لانیکەم ٥ ساڵ ئەزموونی کارو لانیکەم ٦٥ ساڵ تەمەن دەتوانن لە دادگای قەزاکان ئەرك بەڕێوە ببەن.

بەپێی ماددەی ٧٦، جێبەجێکردنی یەکسانیو وردی بەڵگە یاساییەکان لەلایەن دادوەری وڵاتەوە دەکەوێتە ژێر چاودێرییەوە. هەروەها بەپێی ماددەی ٨٩، ئەرکی سەلماندنی تاوان لێکۆڵینەوە لە پەروەندەی تاوانباران لە ئەستۆی دادوەرە. بەپێی ماددەی ٧٨یش ئەو کەسە لە هەر قۆناخێك لە لێکۆڵینەوەی دۆسییەکەی دەتوانێ بەرگری لە خۆی بکا بەڵام ئەگەر کەسێك توانای ماڵی بۆ وەگرتنی وەکیل لە دادگادا نەبێ، بەرگریکردن لە مافەکانی لەسەر ئەستۆی حکوومەتە.[1] کە لە سێ دەسەڵاتی کۆماری قرقیزستان تێپەڕبین، خاڵێك کە لە یاسای بنەڕەتی دەبێ سەرنجی پێبدرێ، سیستمی هەڵبژاردنی وڵاتە. لەم کۆمارەدا سیستمی هەڵبژاردن وەك هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری و نوێنەرانی پارلمان بە شێوەی دەنگی شاراوەی گشتی یان راستەوخۆ بەڕێوە دەچێ. بۆ نموونە پاڵێوراوەکانی سەرۆك کۆماری دەبێ مەرجەکانی خوارەوەیان هەبێ:

١ـ تەمەنی دەنگدەران نابێ لە ٣٥ ساڵ کەمتر بێ.

٢ـ زمانی فەرمی وڵات بزانن و تا کاتی هەڵبژاردن لانیکەم ١٥ ساڵ دانیشتووی کۆماری قرقیزستان بێ.

٣ـ رێژەی پاڵێوراوانی سەرۆك کۆماری بەرتەسك نییە، هەر کەسێك ٥٠ هەزار واژۆ کۆ بکاتەوە، دەتوانێ خۆی بپاڵێوێ بۆ سەرۆك کۆماری.

٤ـ ئاکامی هەڵبژاردنەکان دەبێ بەلانی زۆرەوە ٧ رۆژ دوای هەڵبژاردن لەلایەن دادگای یاسای بنەڕەتییەوە پەسند کرابێ[2].

لە کۆتاییدا پێویست بە ئاماژە کردنە کە چاکسازییەکان و تاوانەکان لە یاسای بنەڕەتیدا لەسەر پێشنیاری سەرۆك کۆمارو بە زۆرینەی ٢ لە ٣ی دەنگی نوێنەرانی شوورای باڵا، یان پتر

(١) کولایی، یاسا بنەڕەتییەکانی فیدراسیۆنی رووسیە و کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندی، لاپەڕەکانی ١٦٠ـ ١٣٣

(٢) مەعزەمی گودەرزی، پێشوو، لاپەڕەکانی ١٣٠ ـ ١٢٩

له ٣٠٠ كەسی له هاووڵاتیان دەكرێ بێتە ئاراوە. ئەم تاوتوێكردنە نابێ كەمتر لە ٣ مانگو زیاتر لە ٦ مانگ دوای پێشكەشكردن جێبەجێ بكرێ(١).

### (٤ـ٤) حیزبە سیاسییەكان

لە كۆماری قرقیزستان هەر وەك كۆمارەكانی دیكەی ئاسیای ناوەڕاست تاكو ساڵی ١٩٩٥، تەنیا حیزبی كۆمۆنیست بە شێوەی فەرمیو یاسایی ئاكتیڤ بوو. بەڵام دوای سەربەخۆیی لەم كۆمارە دەیان حیزبی سیاسی دەستیان كرد بە چالاكی كردن، كە لە روانگەی شرۆڤەوانەكان، قرقیزستان وەك فرە حیزبیو دیموكراتترین كۆماری ئاسیای ناڤین بە ئەژمار دێ. بەپێی زانیاری وەزارەتی دادوەری قرقیزستان ٢٧ حیزب تا ساڵی ٢٠٠٠ تۆمار كراون كە بە شێوەی كورتكراو باسی ئەم حیزبانە دەكەین.

**١ـ حیزبی كۆمۆنیستی قرقیزستان(٢)**

ئەم حیزبە لە سێپتامبری ١٩٩١ی زایینی بە شێوەی فەرمی ناودێر كرا، بەڵام ئاقایف پێشی بە هەڵسووڕانی ئەم حیزبە گرت تا ئەوەی كە لە ساڵی ١٩٩٢ حیزبی كۆمۆنیستی قرقیزستان سەرلەنوێ پێكهاتەوە. ئابسامات ماسالیف(٣) رێبەری ئەم حیزبەیە. ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنی پارلمانی هەڵسووڕانێكی بەربڵاویی لە خۆی نیشاندا، بە جۆرێك كە لە هەڵبژاردنی پارلمانی ساڵی ١٩٩٥ توانی دوو كورسی بەدەستبێنێ بەڵام لە هەڵبژاردنی پارلمانی ٢٠ی فیەورییەی ٢٠٠٠ زۆرترین كورسییەكانی بەدەستهێنا(٤).

گەڵاڵەو ئارمانجەكانی ئەم حیزبە بریتی بوو لە: پاراستنی یەكپارچەیی خاك، مافی یەكسانو هاوكاری دوولایەنەی خەڵك لەگەڵ كۆمەڵگای جیهانی. ئەم حیزبە لەلایەن كومیتەكانی بەڕێوەبەری و كۆنگرەكان ئیدارە دەكرێ. پێگەی كۆمەڵایەتی ئەم حیزبە كرێكاران، گوندنشینەكان، كرێكارانی رووناكبیر و خاوەنكارەكان و بێكاران و خانەنشینان پێكدێنێ. رێژەی ئەندامانی ئەم حیزبە ٢٥ هەزار كەسە. نێونجی تەمەنی ئەندامانیان لە نێوان ١٨ تاكو ٧٥ ساڵ دایە.

لەنێوان مانگی ئووتی ١٩٩٩دا، لقێك لە حیزبی كۆمۆنیستی قرقیزستان پێكهات كە "كلارا ئاجینكۆف" رێبەری دەكرد. ناوبراو لەو بڕوایەدا بوو كە رێبەری حیزبی كۆمۆنیستی

(١) كولایی، پێشوو، لاپەڕەكانی ١٦٠ ـ ١٣٣

(2) The communist Party of Kyrgyzstan
(3) Absamat Masaliyev
(4) http://www. rferl. org



قرقیزستان واتە ئابسامات ماسالیف سەرپێچی لە ئیدئۆلۆژی ئەم حیزبە كردووە بە جۆرێك چەنین جار بەرگری لە چەند وەزیرێك كە گەندەڵی ماڵیو مۆراڵییان هەبووە، كردووە.

**٢ـ حیزبی سوسیال دێموكرات**

ئەم حیزبە لە سێپتامبری ١٩٩٣ی زایینیدا لە دادگای كۆماری قرقیزستان تۆمار كراو مۆڵەتی هەڵسووڕانی وەرگرت. خولقێنەری ئەم حیزبە، جومعە بیك ئۆف، شارەداری بیشكەكە، كە پێشتر نوێنەری رووناكبیرە بژاردەكان لە دەزگای دەسەڵاتدا بووە. لەنێو ئەندامانی ئەم حیزبە چەندین وەزیر، پارێزگارو بەرپرسی ناحیەكان بەرچاو دەكەوێ. حیزبی سوسیال دێموكرات لە هەڵبژاردنی پارلمانیدا هەڵسورانێكی بەربڵاوی هەبووە، بە جۆرێك حیزبی سوسیال دێموكرات لە هەڵبژاردنی پارلمانی ساڵی ١٩٩٥ی زایینی توانی وەپێش حیزبەكانی دیكە بكەوێ. لەم هەڵبژاردنەدا ١١كەس لە هەڵبژێراوان ئەندامی حیزبی سوسیال دێموكرات بوون. هەشت كەس لە ئەندامانی پارلمان پشتگیرییان لە رێبازی ئەم حیزبە دەكرد. یەكێك لە ئەندامە ئەكتیڤەكانی ئەم حیزبە سەرۆكی ئەنجوومەنی یاسادانەری وڵات و ئەوەی دیكەیان جێگری پارلمانی گەلی قرقیز بوو. ئەم باڵە بریتییە لە ٢٢ كەس لە پارلمانتارانی ١٠٥ كەسەی ئەو وڵاتە. ئەندامانی ئەم حیزبە نزیكەی ٦هەزار كەسە(١).

**٣ـ حیزبی گەلی قرقیزستان**

ئەم حیزبە لە خەڵكی ترین حیزبەكانی وڵاتە كە لە ساڵی ١٩٩٥ تۆمار كرا. حیزبی گەلی قرقیزستان كە دینار یوسنۆف رێبەری دەكا لە هەڵبژاردنی سەرۆك كۆماری ساڵی ١٩٩٧ پشتیوانی لە عەسكەر ئاقایف كرد. ئەندامانی ئەم حیزبە نزیكەی ٢٦هەزار كەس بوو كە هەنووكە رێژەیان بۆ ٣٣هەزار كەس بەرز بۆتەوە. ئامانج و گەڵاڵەكانی ئەم حیزبە بریتییە لە: چاكسازی لە یاسای بنەڕەتی، یەكیەتیی دامەزراوەكانی سەرۆك كۆماری و حكوومەت.، گەڕانەوە بۆ پارلمانی یەك دەست، سەربەخۆیی راستەقینەی دادوەرەكان لە رێگای هەڵبژاردنی راستەوخۆ لەلایەن خەڵكەوەو...

**٤ـ حیزبی دێموكراتیكی پێشڕەوی قرقیزستان**

ئەم حیزبە ناسراوە بە "ئاركین قرقیزستان"(٢)و لەلایەن "ئۆرسون بای" رێبەری دەكرێ كە ساڵی ١٩٩١ تۆمار كراوە. بە جۆرێك رێبازی ئەم حیزبە، وڵاتپارێزی و دێموكراسییە. ئەم حیزبە

(1) http://www. rferl. org
(2) The Erkin Kyrgyzstan

لە هەڵبژاردنی پارلمانی ساڵی ١٩٩٥ دوو کورسی بەدەستهێنا. پێگـەی کۆمەڵایـەتی ئـەم حیزبـە گوندنشینەکان، رووناکبیران و خوێندکاران پێکی دێنن کە بارستاییان ١٢ هەزار کەسییە.

### ٥ـ تەڤگەری دێموکراتیکی قرقیزستان

ئەم حیزبە کۆنترین حیزبی سیاسی قرقیزستانە کە لە ساڵی ١٩٩٣دا ناودێر کراو بـەرزترین ئامانجی پشتیوانی لە دێموکراسی بۆ ئەم کۆمارەیە. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا هێزی ئەم حیزبە لاواز بووو زۆرینەی ئەندامەکانی پەیوەست بوون بە حیزبەکانی دیکەوە. تەڤگەری دێموکراتیك لەلایەن جیپار جەکشیف، ئەندامی پێشووی پارلمانی قرقیزستان رێبەری وەئەستۆی گرتووە. لـە هەڵبژاردنی ١٩٩٥ کورسییەکی بەدەستهێنا. گەڵاڵەکانی ئەم حیزبە بریتـی بـووە لـە گەشـەی کۆمەڵایەتی دێموکراتیـك، پێکهێنـانی حکومـەتێکی یاسـامەندو پـەروەردەیی کەسـایەتیو ئابوورییەکان. رێژەی ئەندامانی ئەم حیزبە ٥٠٠ کەسە.

### ٦ـ حیزبی ئاتا ـ ماکەن[1]

ئەم حیزبە لە رووناکبیرانی لاوو توێژی بازرگان لە ساڵی ١٩٩٢دا پێکهـاتووەو لەلایـەن عومەر بەیك تەك لە نوێنەرانی پێـشووی پارلمـان رێبـەری دەکـرێ. حیزبـی ئاتاماکـەن لـە هەڵبژادنی پارلمانی ساڵی ١٩٩٥، چوار کورسی بەدەستهێنا. ئەندامەکانی ئەم حیزبە پتر لـە دووهەزار کەسە.

### ٧ـ حیزبی ژیانەوەی نەتەوەیی قرقیزستان

ئەم حیزبە کە لە ئاسابا[2] ناسراوە، دوای دامەزراندنی لە ساڵی ١٩٩١ بەدوای گەشەدان بە کولتوورو ئیدئۆلۆژی ناسیۆنالیستی بوو. حیزبی ژیانەوەی نەتـەوەیی قرقیزسـتان کـە لەلایـەن بازار بایەف[3] رێبەری دەکرا، لە هەڵبژاردنی پارلمانی ١٩٩٥، سێ کورسی بەدەستهێنا. پێگەی کۆمەڵایەتی ئەم حیزبە تیئۆریسیۆنەکان و گوندنشینەکان پێکی دێنێ. رادەی ئەندامەکانی ئەم حیزبە ٣٧٥٠ کەسە.

### ٨ـ حیزبی وەرزێرانی کۆماری قرقیز

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٣ تۆمار کرا. رێبەری ئەم حیزبە ئارلین عەلی یووف بووو گەڵاڵـەکانی بریتی بوو لە دانانی چاکسازی جووتیاری، پشتیوانی لە ماف و بەرژەوەندییەکانی کرێکاران، بەشی

(1) Ata Maken
(2) Asaba
(3) Bazar Bayer



جووتیاران. ئەم حیزبە لەلایەن کۆمیتەی بەرێوەبەری و کۆنگرە ئیدارە دکرێ. پێگـەی کۆمەڵایـەتی ئەم حیزبە وەرزێران و پسپۆرانی جووتیاری پێکی دێنێ، رێژەی ئەندامەکانیان لە ساڵی ١٩٩٩ پـتر لە ٨٠٠٠ کەس بووەو نێونجی تەمنیان لەنێوان ١٨ تا ٥٥ ساڵەدایە[1].

### ٩ـ حیزبی جووتیاران و کرێکارانی قرقیزستان

لە ساڵی ١٩٩٤ دامەزرا. یوسن سەیدی کەف رێبەری دەکا. پلانەکانی حیزب بریتییـە لـە زاڵبوون بەسەر قەیرانە پیشەییەکان و پێشگیری لە فەنا بوونی ژێرخانـە شـارییەکانە. پێگـەی کۆمەڵایەتی ئەم حیزبـە وەرزێـرانن و رێـژەی ئەنـدامانیان نزیکـەی ١٢٣٠٠ کەسـەو نێـونجی تەمەنیان لە نێوان ١٨ تا ٥٥ ساڵە.

### ١٠ـ حیزبی ئانامیس (شکۆە یان شەرافەت)

لە ساڵی ١٩٩٩ نێوزەد کرا، فیلیکس کۆلف رێبەری دەکاو گەڵاڵە گشتییەکانی بریتییە لە خۆشگوزەرانی ژیانی خەڵکی قرقیزستان بە دامەزراندنی حکومەتێکی یاسامەندو دێموکراتیك و دڵنیابوون لـە بـارودۆخی راسـتەقینە بـۆ پێـشڤەچوونی ئـابووری، سیاسـیو کۆمەڵایـەتیو مەعنەویی لەسەر بنەمای تایبەتمەندییە مێژوویی‌و کولتوورییەکانی ئـەو کۆمـارە دایـە. ئـەم حیزبە گشت چین و توێژەکان لەخۆ دەگرێ ئەم حیزبە بۆ هەموو ناوچەکانی قرقیزستان نوێنـەری ناردووە. رێژەی ئەندامانیان ١١٠٠٠ کەس بەراورد کراوە. لە رووی پێگەوەو، ئەم حیزبە گـشت چین و توێژەکان لەخۆ دەگرێ.

### ١١. حیزبی عەمەل (کشوەری)

لە ساڵی ١٩٩٨ تۆمار کرا. ئاتۆربائۆف جۆمەرات سەرکردەیانە. ئامانج و گەڵاڵەکانی ئەم حیزبە بریتییە لە: بەردەوامی چاکسازییە سیاسییەکان، پێویـستی بـە بـوونی بەرێوەبـەرێکی لێهاتوو و بەهێز، پێویستی بە بوونی دارشتنی گەڵاڵە بۆ گەشەی ئـابووری بـازار، رێوشـوێن و پێوەرەکان بۆ بەکارهێنانی کردەوەی رەوتـی سـەرنەکەوتوو لـە پێوەنـدی لەگـەڵ لێنـەهاتوویی کەسایەتییە ئابوورییەکان. ئـەم حیزبـە لـە گـشت ناوچـەکان نوێنەرایـەتی هەیـە. بارسـتایی ئەندامەکانیان نزیکەی ٣٠٠٠ کەسە.

### ١٢ـ حیزبی دێموکراتیکی قرقیزستان

لە ساڵی ١٩٩٤ تۆمار کرا. لەلایەن تۆکۆن شالیلیف رێبەری دەکـرێ. پـلان و ئامانجـەکانی ئەم حیزبە بریتییە لە: هاندانی ژنان بۆ بەشداری بەربلاوی ژنان لە بەرێوەبەری کۆمەڵگاو وڵات،

(1) http://www. rferl. org. RFE/RL-30May20002

پتربوونی رۆڵی ژنان لە نووسینگەی هەڵبژاردنەکان و لە هەموو بوارەکانی بریاردەریدا. ئەم حیزبە لە رێگای شوورای بەرێوەبەرییەوە بەرێوە دەچێ. پێگەی کۆمەڵایەتی ئەم حیزبە نزیکەی ١٥هەزار کەسە. حیزبی ئاماژەپێکراو لە هەڵبژاردنەکانی پارلمانی ساڵی ١٩٩٥ تەنیا کورسییەکی بەدەستهێنابوو، لە کاتێکدا لە هەڵبژاردرنی پارلمانی ٢٠ی فێەوریییەی ٢٠٠٠ لە دوای حیزبی کۆمۆنیست زۆرترین کورسییەکانی پارلمانی بەدەستهێناوە[1].

**١٣ـ حیزبی ژیانەوەی مەعنەویی (ماناس ئاڵ)**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٥ تۆمار کراو لەلایەن عەلی سولتان عیش مۆف سەرکردایەتی دەکرێ. پلان و ئامانجەکانی حیزب بریتییە لە یەکیەتیی و دژایەتی لەگەڵ توندوتیژی خوازی خەڵکی قرقیز. هاوکاریو هاوئاهەنگی ئەتنیکی، گەشەی پەروەردەو کولتوورو بردنەسەری ساغڵەمی گشتی ئەم حیزبە لەلایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە بەرێوە دەچێ و پێگەی کۆمەڵایەتی ئەم حیزبە رووناکبیران و خاوەندارانی کۆمپانیا ئابوورییەکانی پێکیدێنێ. بارستایی ئەم حیزبە ٥٠٠ کەسو نێونجی تەمەنیان لە نێوان ١٨ تا ٧٠ ساڵدایە.

**١٤ـ حیزبی وەحدەتی قرقیزستان (پۆك)**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٤ تۆمار کراوە. رێکخەری شوورای ئەم حیزبە ئامان گۆلویی نورالیفە. گەلاڵەو ئارمانجەکانی ئەم حیزبە بریتییە لە: یارمەتی کردن بە دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی دێموکراتیك و حکوومەتێکی یاسایی، خەبات دژی شۆڤینیزم. ئەم حیزبە لەلایەن شوورایەکی سیاسی و کۆنگرەوە بەرێوە دەچێ. پێگەی کۆمەڵایەتی ئەم حیزبە رووناکبیرە تێکنۆکراتەکان و خاوەندارانی کۆمپانیاکانن، رێژەی ئەندامەکانی ئەم حیزبە ١٢٥٥٦ کەسەو نێونجی تەمەنیان لە نێوان ٢٢ تاکو ٦٠ ساڵەدایە.

**١٥ـ حیزبی پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی کرێکاران، بەشی پیشەییو جووتیاریو بنەماڵە کەم داهاتەکان لە کۆماری قرقیز (حیزبی پارێزگاری)**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٥ ناودێر کراو عەلی ئایتیکەف رێبەری دەکا. گەلاڵەو ئارمانجەکانی ئەم حیزبە بریتییە لە: چاکسازی راستەقینەی ئابووری لەسەر بنەمای گەشەی پیشەییو پاڵپشتی کردن لە ئابووری وڵات و بەرژەوەندیی کرێکارانی پیشەیی و جووتیاری. پشتیوانی لە بەرژەوەندی بنەماڵە کەم داهاتەکان و سامانی نەتەوەیی، دامەزراندنی

(1) http://www. iwpr. net,14march2002



کۆمەڵگای یاسامەندو دێموکراتیك و پێکهێنانی سیستمێکی ئابووری بە لاگیری کۆمەڵایەتییەوە. بەرێوەبردنی ئەم حیزبە وەئەستۆی کۆنگرەی باڵایە. پێگەی کۆمەڵایەتی ئەم حیزبە کرێکاران، وەرزێران، ئەندازیاران و پسپۆران و بەرپرسانی پیشەسازییەکان و کەرتە جووتیارییەکان پێکیدێنن. رێژەی ئەندامانی ئەم حیزبە ٦٧٠٠ کەس و نێونجی تەمەنیان ١٨ تاکو ٦٠ ساڵە(١).

**١٦ـ حیزبی کایران ئاڵ**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٩ تۆمار کرا. لەلایەن تۆکتۆباڵ مۆلکۆباتەف رێبەری دەکرێ. بەرنامەو ئامانجی ئەم حیزبە بریتییە لە: هێنانە گۆری بەرژەوەندییەکانی گەلی قرقیزستان و یارمەتیدان بە پێکهاتنی وڵاتێکی یاسامەندی راستەقینە، هەوڵدان بۆ دامەزراندن و بەردەوامی بارودۆخی لەباری پەرەگرتن و گەشەی ئابووری بۆ وەچەی تازە پێگەیشتوو، یارمەتیدان بە بووژانەوەی میراتی کولتووری گەلی قرقیزستان. ئەم حیزبە لە گشت شارەکاندا لقی هەیەو رێژەی ئەندامەکانیان ٣٠٠٠ کەسە.

**١٧ـ حیزبی تەعاونی کۆماری قرقیز (هاوکاری)**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٩ تۆمار کرا. رێبەری کردنەکەی وەئەستۆی تۆرگۆن بای ئانار کۆلۆفە. گەلاڵەو ئارمانجی ئەم حیزبە بریتییە لە: دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی لەسەر بناغەی گۆڕانکاری لە ژیانی سیاسی و مەعنەویی، دامەزراندنی حکوومەتێکی دێموکراتیکی سەربەخۆ، گەرانتی کردنی خۆشگوزەرانیو ژیانی پربەها بۆ شارۆمەندان. ئەم حیزبە لە گشت ناوچەکان لقی هەیە. رادەی ئەندامانی ئەم حیزبە ٧١٦١ کەسە.

**١٨ـ حیزبی یەکگرتوو و رەزامەندی گەلی ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٩ تۆمار کرا.**

رێبەری ئەم حیزبە ئارام جان ئەکبەرئۆفە. بەرنامە و ئامانجەکانیان: ئازادراگرتنی کۆمەڵگا لەسەر بنەمای یەکسانی کۆمەڵایەتی، ئازادی هاووڵاتیان و بروا بە یەکسانی راستەقینەی مافی گشت نەتەوەکان و گرووپە ئەتنیکەکانی ئاکێنجی لەوڵاتدا گەرانتی کردووە. لقەکانی ئەم حیزبە لە بیشکەك، جەلال ئاباد، ئووشیو چۆ هەڵکەوتوون. رێژەی ئەندامانی ئەم حیزبە ٦٢٥٠ کەسە.

**١٩ـ حیزبی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری گوندنشینان (وەرزێران)ی قرقیزستان (پفپەك)**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٩ تۆمار کرا. رێبەری ئەم حیزبە ئاسکنۆڵ ئایساکرۆفە. بەرنامەو ئارمانجی ئەم حیزبە بریتییە لە پشتیوانی لە بەرژەوەندییە سیاسی، ئابووری و کولتوورییەکانی

گوندنشینان. دڵنیابوون لە ئەمنییەتی خواردەمەنی قرقیزستان، ئیمکانی دەست پێڕاگەیشتنی خەڵکی گوندەکان بە گشت لایەنەکانی ژیانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری پێوەست و بۆ بەهێزکردنی ماف و ئازادییەکانی مرۆڤ. ئەم حیزبە لە سەرانسەری قرقیزستان لقی هەیەو بارستایی ئەندامەکانیان دەگاتە ٣٨ هەزارکەس.

**٢٠ـ حیزبی سیاسی شەڕوانانی ئەفغانستان و بەشداربووان لە خەباتی شەڕە نێوخۆییەکان**

ئەم حیزبە لەساڵی ١٩٩٤ تۆمار کراو "ئاکبۆکان تاشنناکبۆف" ڕێبەری دەکا. ئەم حیزبە بە مەبەستی یەکخستنی هاووڵاتیانی بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی یاسامەند و دێموکراتیك و بە لاگیری ئابووری و بازاڕ لەسەر بنەمای گرینگیدان بە هاوئاهەنگی تاك و ئەتنیکی چالاکی دەکاو پشتیوانی لە بەرژەوەندی شەڕوانان لە شەڕی ئەفغانستان و بەشدارانی شەڕە نێوخۆییەکان دەکا. لقە ناوچەییەکانی ئەم حیزبە لە بیشکەك، ئەسیك کوڵ، تالاس و ئووش هەڵکەوتوون. رادەی ئەندامانی ئەم حیزبە ١١٢٠٠ کەسە.

**٢١ـ حیزبی کۆماریخوازانی قرقیزستان (رەپەك)**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٩ ناودیر کراوەو لەلایەن گیازتۆکۆباف ڕێبەری دەکرێ. گەڵاڵەو ئارمانجەکانی ئەم حیزبە بریتییە لە ئازادی تەواوی یاسا، بە دوور لە رەگەز، نەتەوە، باوەڕمەندییە ئایینییەکان، یەکسانی پارێزگاری لە ژینگە (ئاو، هەوا، زەویی).

ئەم حیزبە لە هەموو ناوچەیەك لقی هەیە، بارستایی ئەندامانی ئەم حیزبە دگاتە ٥٥٠٠ کەس.

**٢٢ـ حیزبی کۆماریخوازی قرقیزستان، یەکسانی**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٩ تۆمار کراو ڕێبەری ئەم حیزبە چەنگتیر ئاستماتۆف نووسەری بەناوبانگی قرقیزە. گەڵاڵەو ئامانجەکانی ئەم حیزبە بریتییە لە: گەرانتی نوێخوازی هەمە لایەنەی ئابووری، لەبارترکردنی ئابووری لەگەڵ پێوانەی هەموو بارودۆخەکان، ئاسایشی ماڵی و دابەزاندنی نرخی هەڵاوسان، راکێشانی سەرمایەدانەرە دەرەکی و نێوخۆییەکان لە بەشی ئابووریدا. ئەم حیزبە لە هەموو دەڤەرەکانی وڵاتدا لقی هەیە. بارستایی ئەندامانی حیزب دەگاتە ٣٥ هەزارکەس.

**٢٣ـ حیزبی گەلی کۆماریخوازی قرقیزستان**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٢ تۆمار کراو بەك تەنتیف ڕێبەری دەکا. ئامانج و گەڵاڵەکانی ئەم حیزبە بریتییە لە: سەقامگیری ژیانی ئابووری- کۆمەڵایەتی و سیاسی



وڵات لەگەڵ گەشەی بەردەوام. بەڕێوەبەری ئەم حیزبە لەلایەن ناوەندێکی هاوئاهەنگ و کۆنگرەی حیزبی بەرەو پێش دەچێ. پێگەی کۆمەڵایەتی حیزب، رووناکبیران و خاوەندارانی حیزب پێکی دێنێ. بارستایی ئەندامانی حیزب دەگاتە ٣٥٠٠ کەسو نێونجی تەمەنیان ٢٥ تا ٧٠ ساڵە.

**٢٤ـ حیزبی سوسیال دێموکراتی قرقیزستان (سەد پەك)**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٣تۆمار کراو عەبدی قانی ئارکۆف ڕێبەری دەکا. ئارمانج و گەڵاڵەکانی حیزب بریتییە لە دەستنیشان کردنی گەڵاڵە سیاسییەکانی گەشەی قرقیزستان بە لاگیری کۆمەڵایەتی و بەپێوانە کردنی هۆکارە دەرهەستەکان و چاودێری بەسەر سیاسەتی بەڕێوەبەران لە ڕێگای بەرپرسانی حکوومی و لەسەر بنەمای یاسای بنچینەییە. ئەم حیزبە لە ڕێگای شوورای هاوئاهەنگی و کۆنگرەی حیزبی بەڕێوە دەچێ. پێگەی کۆمەڵایەتی حیزب، رووناکبیران، فەرمانبەران و بەرپرسانی ئەم حیزبە پێکیدێنێ. ڕێژەی ئەندامانی حیزب ٤٢٥٠کەسە و نێونجی تەمەنیان ٢٢ تاکو ٦٠ ساڵە[١].

**٢٥ـ حیزبی بووژانەوەی ئابووری کۆماری قرقیز**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٧ تۆمار کرا. ڕێبەری ئەم حیزبە والیێری خوونەیە. ئامانج و پلانەکانی حیزب بریتییە لە: ژیاندنەوەی ئابووری وڵات لە ماوەی خولی گواستنەوە، کەڵك وەرگرتن لە ڕێچکە سیاسییەکان لە راستای چاکسازی ئابووری. ئەم حیزبە لە چوئیسك کۆل، نایرەن، جەلال ئاواو بیشکەك لقی هەیە. ڕێژەی ئەندامانی حیزب ٢٢٧٥ کەسە.

**٢٦ـ حیزبی کرێکاران**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٧ دامەزرا. لەلایەن ئان ئامیل عومەر کانۆف ڕێبەری دەکرێ. پلان و ئارمانجەکانی حیزب بریتییە لە: هەوڵدان بۆ دەسەڵاتی راستەقینەی گەلی قرقیز، دامەزراندنی حکوومەتێکی یاسایی سەربەخۆ، هاندانی نوێگەرایی تاکەکەسی لەسەر بنەمای خاوەندارییەتی تایبەت، پاراستن و گەشەدان بە داب و نەریتە نەتەوەییەکان، یەکسانی لەگەڵ نەتەوەکان. ئەم حیزبە لقی لە ناوچەکان نییەو رادەی ئەندامانی نزیك ١٠هەزار کەسە.

(1) http://www. transcapspian. ru

## ٥ـ تاجیکستان

### (١ـ٥) سیاسەت و حکوومەت لە ڕەوتی مێژوودا

مێژووی تاجیکستان زۆر بە مێژووی ئۆزبەکستان دەچێ. هەردوو وڵات تا پێش پەیوەست بوون بە ئیمپراتۆری رووسیەوە لەژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری ئێرانییەکانی وەك هەخامەنشینەکان، سمانیا، سەلجووقیان، خوارەزمەکان و گورکانییەکاندا بوون. لە هێندێك بڕگەدا حکوومەتگەلی وەك هۆنەکان، قەراختاییان، مەغوولەکانو کۆمەڵێك لە شیبانییەکان بە بێ ئەوەی کە لەژێر دەسەڵاتی حکوومەت دا بن، بەسەر ئەم وڵاتەدا زاڵبوون. بە هەر شێوەیەك تاجیکییەکان لە ڕەوتی دەسەڵات لە ئاسیای نێوەڕاستدا ڕۆڵێکی بەرچاویان نەبووە و لەژێر کۆنترۆڵی خانانی فەرمانڕەوای "ماوەرائەلنەهر" لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەم نیشتمانەدا حوکمە خۆجییەکانیان بەڕێوە دەبرد. بەشێکی دیکەی تاجیکستان واتە پامیریش لەژێر دەسەڵاتی فەرمان ڕەوایانی "تەبەت" یان دا"بەدەخشان" دا بوون.

لەگەڵ هێرشی هونە تورکەکان بۆ سەر ماوەرائەلنەهر لە چاخی پێنجەمی زایینیدا کارتێکەری تورکان لە ناوچەکەدا پەرەی گرت و تاکو سەدەیەك پێش داگیرکاری ناوچەکان لەلایەن عەرەبە موسوڵمانەکانیش درێژەی هەبوو. لەگەڵ ئەوەی کە بەدوای جێگربوونی تورکان لە ماوەرائەلنەهر زمانی تورکی وەك زمانی گشتی خەڵك بە خێرایی لە ماوەرائەلنهر گشتگیر بوو، هەروەها زمانی فارسی سەرەڕای ئەوەی کە زمانی توێژێکی بەرچاوی ڕووناکبیرو زانستوانان لە سەرانسەری ماوەرائەلنهر بوو، پەرەی گرت. لەنێو خەڵکی پامیرو تاجیکستان کە ئاخێزگەو شوێنی لەدایك بوونی زمانی فارسی بوو تەنانەت دوای هەرەسهێنانی سامانییەکان و فەرمانڕوایی زنجیرەی تورکەکان وەك زمانی ئاخاوتنی خەڵك مایەوە.

جۆری ناونانی تاجیك هەمان جۆری لێك جیاوازی ناوچەکە لەگەڵ تورکەکاندا بووە. چونکە ئەم خەڵکە لە یەك شوێن جێگیر بوون و بیابانگەڕ نەبوون و دانیشتووانی ڕەسەنی ماوەرائەلنهر لەو تورکە کۆچەرو بیابانگەرانەی کە لە لایەن ئەو عەرەبانەی کە هاتبوونە ماوەرائەلنهرەوە بوون بە موسوڵمان. بەم هۆیە ئەوان ئیسلامیان قەبووڵ نەکردو پێیان دەگوتن تازیك یان تاژیك و عەرەبەکانیشیان بەم نێوە پێناسە دەکردو پاشان گۆڕانی بەسەردا هاتووەو لە پاشماوەی دیکۆمێنتەکان وشەی تازی زۆر بەرچاو دەکەوێ. چاوگی ئەم وشەیە گوایە لە وشەی "تی" نێوی هۆزی ناسراوی عەرەبە، کە "حاتەم تایی" سەردەمانێك سەرۆکایەتی دەکردو بەهۆی



پێوەندی لە مێژینەی ئێرانییەکان و شارەزابوون لە زمانیان لە ریزی یەکەم کۆچەرانی عەرەب بۆ ماوەرائەلنهر بوون. هەڵبەت لە هێندێك شوێنەواردا بۆ تاجیکەکان وشەی سارت کە بە ئەتنیکە جێگربووەکانی تورك و فارس دەگوترا، بەکار هێنراوە.

بەدوای دەستپێکی هێرشی رووسەکان بۆ ئاسیای ناڤین بەتایبەتی بە سەرنجدان بە نزیك بوونیان لە ئەفغانستان وەك سەرەتای کارتێکەریان لە هێندوستان بە ئەژمار دەهات. ئەم سەرزەوینە کە بەشێك لە میرنشینی بۆخارا بوو،و بە نیشانەی هاتنە ناوەوە بۆ ئەفغانستان لەقەڵەم دەدراو بایەخێکی تایبەتی بەدەست هێنا. رووسەکان لەنێوان سەدەی نۆزدەیەمدا ناوچەکانی باکووری ڕۆژئاوا واتە خۆجەند و دەورووبەریان داگیر کردو لە کۆتایی ئەم چاخەدا باکووری تاجیکستان بەگشتی کەوتە ژێر فەرمانڕوایی رووسەکانەوە. هەڵبەت ناوچەی پامیر لەنێوان سەدەی هەژدەدا کەوتە ژێر کۆنترۆڵی ئەفاغنەی زاڵ بەسەر باکووری ئەفغانستان، واتە بەلخ و قەندووزو بەدەخشان. بۆیە لە سەرەتای چاخی نۆزدەیەمدا ئۆزبەکەکان باکووری ئەفغانستانیان داگیر کردو پانتایی دەسەڵاتی خۆیان هەتا پامیر بەرفراوان کرد. میری بۆخارا کە دەستنیشانکراویی تەزار بوو لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا ئەم ناوچەیە، هەروەها باکووری ئەفغانستانی تاکو بەلخی بە پشتیوانی رووسەکان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

لێرەدا بوو کە ئینگلیسەکان هەستیان بە مەترسی کردو لە ڕێگای چیاکانی هەندو کەشی ئەفغانستانەوە بەرو لای باکووری ئەو وڵاتە لەشکر کێشییان کردو پامیریان خستە مەترسییەوە و سەرنجام سنووری نێوان ئەفغانستان و میرنشینی بۆخارا بەپێی ڕێکەوتنی نێوان رووسەکان و ئینگلیسەکان لە ساڵی ١٨٩٥ دیاریکراو لەو کاتەوە بە ڕووباری پێنج سنوور بە فەرمی ناسرا.

لە ساڵی ١٩٠٤دا رووسیە ڕاستەوخۆ فەرمانڕوایی خۆی لەجێی میری بوخارا بەسەر بەشی ڕۆژهەڵاتی تاجیکستان و پامیر سەپاندو بەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبری ١٩١٧ سوپای سپی بە سەرنجدان بە نزیکنەبوونی تاجیکستان و پامیر بەو ناوچەیە، بۆ ئامانجەکانی وەك پێگەیەك کەڵکی لەم ناوچەیە دەگرت.

دەست پێڕانەگەیشتنی ئەم ناوچەیە بە جۆرێك بوو کە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە پاش چەند مانگ هەواڵی ڕاپەڕینیان پێگەشت. جووڵانەوەی باسماچیش لە سەرانسەری ئاسیای ناوەندیدا بەتایبەتی لە تاجیکستان بە بایەخدان بە هەڵکەوتوویی جوغرافیایی خۆی بۆ خەبات ڕێکخست. هاتنی هێزەکانی ئینگلیس لە ڕەوگەی خوراسان و ئەفغانستان بۆ ئاسیای ناڤین

جووڵانەوەی دژە بلشویکی ئەم ناوچەیە کە پانتاییەکەی دەگەیشتە تاجیکستانیش خستە ژێر باندۆری خۆیەوە.

سوپای سوور سەرەتا لە ساڵی ١٩١٨ باکووری تاجیکستانی وەك بەشێك لە کۆماری خودموختاری تورکمەنستان راگەیاند. بۆیە بەشی رۆژهەڵات و ناوەندی تاجیکستان لەوانە ناوەندی تازە دروستکراو، واتە شاری "دووشەنبە" دوای سێ‌ساڵ شەڕو پێکدادانی بەربڵاو کەوتە ژێر دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکانەوە. سوپای سوور لە ١٩٢١ چووە ناوشاری دووشەنبەوەو دواتر لە ساڵی ١٩٢٥ەوە توانی دەستی بەسەر پامیریشدابگرێ. هەر بۆیە باسماچییەکان، تاکو ساڵی ١٩٣٥ لەم ناوچە کوێستانییە درێژەیان بە شەڕی چریکی دا، هێندێ جار لەلایەن میری پێشووی بۆخاراوە کە هەنووکە پەنای بردۆتە ئەفغانستان پاڵپشتی دەکران. لەگەڵ دابەشبوونی کۆماری تورکمەنستان لە ساڵی ١٩٢٤ تاجیکستان لەژێر ناوی کۆمارێکی خودموختار لە نێوخۆی کۆماری ئۆزبەکستاندا پێکهات و دواتر لە ١٩٢٩ەوە زێدەبوونی خوجەند کە پێشتر بەشێك لە ئۆزبەکستان بوو کۆماری تاجیکستان لەدایك بوو.

سیاسەتی سنووربەندی ئیستالین و دانی سەمەرقەندو بۆخاراو فەرغانە بە ئۆزبەکستان، هەروەها دانانی بەشە ئۆزبەك نشینەکان لە تاجیکستان و ناردنی کۆچبەرانی رووس بۆ تاجیکستان لەپێناو بەدەستهێنانی پۆستە هەستیارو گرینگەکاندا دوایی هات. هەربۆیە فەزای پێکهاتوو بەهۆی ئەم سیاسەتەوە لە تەنیشت باری خراپی گوزەرانیان و دەست پێ‌ڕاگەیشتنی مسکۆ بە تاجیکستان بەتایبەتی ناوچە گوندنشینەکانی بووە هۆکاری بەربەرەکانێ لە بەرانبەر کولتووری رووسی و هانابردنی هەرچی زیاتری ئەوان بۆ نەریتە ئایینییەکان و خێڵەکییەکانیان.

بە دەستپێکردنی هێرشی سوپای سوور بۆ ئەفغانستان لە ساڵی ١٩٧٩ەوە، رووسەکان بە مەبەستی دابەزاندنی ئاستی هەستیاریەتی موسوڵمانە ئەفغانییەکان،

سەربازو موچەخۆرە موسوڵمانە تاجیك و ئۆزبەکییەکانیان وەك پێشڕەوی هێزی مانەوە بەرو ئەو وڵاتە دەناردن. بەڵام لە ماوەیەکی کورتدا ئەم سەربازانە بە هەولێ بنەماڵەکانیان، باوەڕمەندی ئایینی خۆیان هەروەك جاران پاراستبوو، و خەباتی کەس و کاری خۆیان لە راپەڕینە ئایینییەکان دژی رووسەکان لەبیر مابوو، بۆیە زیاتر کەوتنە ژێر باندۆری موسوڵمانە شۆڕشگێڕەکان بەتایبەتی لایەنگرانی ئەخەوان ئەلموسلمینی ئەفغانستان و کاتی گەڕانەوە بۆ تاجیکستان روانینەکی نوێیان لە ئیسلام وەك دیاری بۆ



هاووڵاتیانی خۆیان هێنایەوە. لەدوای پەرەگرتنی ئەندێشەی ئیسلامی سیاسی لە دەیەی هەشتا گرووپە نهێنییەکانی لاوان لە شارەکان، بەتایبەتی لە ئاواییەکاندا پێکهاتن‌و قورئان و حەدیس فێربوونیان کردە پیشە.

لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەمی گۆرباچۆف ئەم گرووپانە دەرفەتێکی لەباریان بۆ پەرەدان بە ئەندێشەی خۆیان بەدەستهێنا و بەرەبەرە بناغەی بزووتنەوەی ئیسلامییان دامەزراند، ئەم گرووپە بەهۆی تێڕوانینێك بەدەر لە پرسە نەتەوەییەکان لە ماوەیەکی کورتدا لەگەڵ هاوبیرانی موسوڵمانی خۆیان لە کۆمارەکانی دیکەدا بەتایبەتی ئۆزبەکستان و داغستان پێوەندییان دروستکرد و رێکخراوی خۆیان وەك تەڤگەرێکی گشتگیر لە سەرانسەری سۆڤییەتی پێشوو پێکهێنا. هەڵبەت ناوکی سەرەکی ئەم بزاوتە زیاتر لەلایەن تاجیکییەکانەوە پشتیوانی دەکران. ئەم خەڵکانە بە راشکاوی ئێرانیان وەك وێنەیەکی باش لە شۆڕش و حکوومەت پێناسە دەکردو خومەینییان وەك رێبەری بزاوتە شۆڕشگێڕەکانی جیهان لە قەڵەم دەدا.

ئەم بزاوتە هێدی هێدی لایەنی خەڵکی بەخۆوە گرت. زانایانی ئایینی‌و سەرۆکی ئیدارەی دادوەران یان زانایانی تاجیکستان کە سەر بە ئیدارەی زانایانی تاشکەند بوو، بەنێوی قازی تورجان زادە بەرەبەرە مەیلی بۆ لای ئەم بزاوتە نیشاندا. لەنێوان کەسی ئاماژەپێکراوداو ئەم تەڤگەرە بەهۆی تێگەیشتنی خێرا لە پانتایی گۆڕانکارییەکان، هەروەها بەهۆی تێگەیشتنی لایەنگرانی بزووتنەوە لە پێویستی بەکارتێکەری ناوبراو لەناو سیستمی حکوومەتیدا، یەکانەگیرییەکی تا رادەیەك باشی هاتە ئاراوەو هەر ئەم کارەلە برەودان بە بزووتنەوەدا باندۆری خۆی هەبوو.

سەرەڕای ئەوە ئەم بزاوتە ئایینییە، رووناکبیرە نەتەوەگەراکانی تاجیکستانیش، بە مەبەستی ژیاندنەوەی کولتووری خۆیان کەڵکیان لە پروسترۆیکاو گلاسنۆست گرت.

سەرەتا بە داواکارییە کولتوورییەکان و دواتر بە هێنانەگۆڕی ویستە سیاسییەکان بەرەبەرە هاتنە گۆڕەپانەوە. ئەم گرووپگەلەش رووگەی بووژانەوەی ئاواتەکانی خۆیان لە ئێراندا دەدیت و بەهۆی ئۆگری بە ئێرانەوە لەگەڵ گرووپە ئایینییەکان هاوتەریب بوون. هەر بەم هۆیە یەکەمین هەنگاوەکانیان دوای پێکهاتن لە دوو گرووپی رەستاخیزو دێموکرات دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ ئێران و تەنانەت ئێرانییەکان تاراوگە بە مەبەستی هاوکاریکردنی ئەوان لە بواری کولتوورییەوە بوو.

## (٢ـ٥) وەرچەرخانە سیاسییەکانی هاوچەرخ

کۆماری تاجیکستان یەکێك لە کۆمارە گەشە نەکردووەکانی سۆڤییەت بوو، بەلاّم لەگەلّ ئەوەیشدا، سەقامگیری سیاسی ئەم کۆمارە تاکو پێش سەربەخۆیی لە نیوەی دووهەمی سالّی ١٩٩١ هیچکات نائارامی بە خۆیەوە نەدی و تەنانەت هەستی سەربەخۆخوازانە لەو کۆمارەدا لەگەلّ هەرەسهێنانی یەکیەتیی سۆڤییەتیش زۆر بەرچاو نەبووە، بەلاّم پاش هەرەسهێنانی سۆڤییەت سەقامگیری سیاسی لە کۆماری تاجیکستان بە شێوەی لەناکاو تووشی گۆڕانکاری هات، بەجۆرێك گرووپە ئەتنیکیو ئایینی، نەتەوەیی و سیاسییەکانی ئەم ولاّتە کە هەرکام خاوەنی هانەیەکی تایبەتی خۆیان بوون لەگەل یەکتردا تێکهەلّچوونو لە بەرانبەر بژاردە نەریتییەکانی خۆیان کەوتنە شەڕو پێکدادان و هەر ئەم کارە بووە هۆی ئەوە تاکو شەڕو پێکدادانی نێوخۆیی جوربەجۆر لە ناوچە جیاجیاکانی تاجیکستان تەشەنە بکا[1].

لە سێپتامبری ١٩٨٩ حیزبی ڕەستاخیزی تاجیکستان بە ئامانجی چاکسازی ئابووری پێکهات[2] کە ئەندامەکانیان بریتی بوون لە رووناکبیرانی شاری، سەرۆك کۆماری ئەوکاتی تاجیکستان، تاهیر مەحکەم ئۆف، لە نوامبری هەمان سالّ گەلاّلەو ڕێکخستنەکانی ئەم حیزبەی بە فەرمی ناسیو مەبەستی لەم کارەی "هاندانی فرە حیزبی"بوو لە تاجیکستاندا[3]. بەلاّم لە سەرەتای سالّی ١٩٩٠دا دەسەلاّتخوازان و فەرمانڕەوایانی ئەم ولاّتە دەستیان لە وەها سیاسەتگەلێك هەلّگرت[4]. هۆکاری ئەم کارە دەکرێ ئەوە بێ کە چین و توێژەکانی کۆمەلّگا لە رادەبەدەر پالّپشتیان لە گرووپە نەیارەکان دەکرد، بە جۆرێك لە ٢٩ی ژانوییەی ١٩٩٠ خەلّکی تاجیکستان بۆ پشتیوانی لە حیزبی ڕەستاخیز لە شاری دووشەنبە، پێتەختی ئەم ولاّتە، ڕێپێوانیان کردو خوازیاری دابەزینی دەسەلاّتی بڕۆکراسی حیزبی و حکوومی بوون، لە یانزەی فیەوریەی هەمان سالّیش نزیکەی سێهەزار کەس بە ڕێبەری حیزبی ڕەستاخیر لە شاری دووشەنبە کۆبوونەوەو ناڕەزایەتییان لە بارودۆخی خواردەمەنیو نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوون دەربڕی و خوازیاری دەست لەکار کێشانەوەی مەحکەم ئۆف بوون[5].

(1) Suzanne Crow, Informal Groups In Tajikistan: Will the hare a role, Report an the USSR, 23 February 1990, PP. 20- 23
(2) "Recorder of weekly Evemts", Report on the USSR, 17 December 1989, P. 27
(3) Soried News, 20 march 1989. P. 3
(4) The Economist, 3 February 1990
(5) Bess Brown, "disturbances in Tajikistan", Report on The USSR, 23 February 1991, PP. 32. 33



لەم نێوەدا مەحکەم ئۆف ئامادەیی خۆی بۆ دەست لەکار کێشانەوە ڕاگەیاند بەلاّم کۆمیتەی ناوەندی تاجیکستان دەست لەکارکشانەوەی ناوبراوی قبوول نەکردو فەرمانی بە سەربازەکاندا خۆپیشاندەران سەرکوت بکەن[1]. ڕاگەیەنەکانی ژێر دەسەلاّتی حکوومەتیش دژی حیزبە بەرهەلّستکارەکان چالاکییان دەکردو لە سێپتامبری ١٩٩٠ دا ئەنجوومەنی شوورای بالاّی تاجیکستان یاسایەکی بۆ ئەم مەبەستە هێنایە ئاراوە کە هەر کەسێك بوار بۆ ئاژاوە بڕەخسێنێو بوختان بۆ سەرۆك کۆمار هەلّبەستێ، بۆ ماوی ٦ سالّ دەستبەسەر دەکرێ.

حیزبە نەیارەکانیش لە دژکردەوەدا بە دژی حکوومەت یەکگرتوو بوون. بۆ وێنە لە ئاگۆستی ١٩٩٥ دوو حیزبی ڕەستاخیزو دێموکراتیکی تاجیکستان دژی حکوومەت یەکیان گرت و خۆپیشاندانێکی هاوبەشیان بەڕێوەبرد. لەم خۆپیشاندانەدا پتر لە ٢٠ هەزار کەس بەشدار بوون. خەلّك خوازیاری دەست لەکار کێشانەوەی مەحکەم ئۆف و هەلّوەشانەوەی شوورای بالاّو بەڕێوەبردنی هەلّبژاردنی نوێ بوون. بەدوای تەشەنەکردنی ناڕەزایەتی خەلّکیو هەروەها ناکارامەیی حکوومەتی ناوەندی لەمەڕ گەڕاندنەوەی هێمنیو سەقامگیری بۆ ئەم ولاّتە، مەحکەم ئۆف ناچار بوو سەرلەنوێ دەست لەکار بکێشێتەوە[2]. ئەنجوومەنی شوورای بالاّی تاجیکستانیش لە ٣١ی ئۆکتۆبری هەمان سالّدا دەست لەکار کێشانەوەی ناوبراوی پەسند کردو ئەسلاّن ئۆفی لەجێگای ئەو دانا.

ئەسلاّن ئۆف لە ٢٠ی ئۆکتۆبری ١٩٩١ گۆڕینی نیزامی سیاسی تاجیکستانی لەسەر بنەمای ڕێچکەی دێموکراسی پەسند کرد. هەروەها لە یەکەم کارەکانی گۆڕینی ناوی حیزبی سۆسیالیستی تاجیکستان بوو و خۆیشی لە سەرۆکایەتی ئەم حیزبە کێشایەوە.

ئەسلاّن ئۆف لە ٢٣ی ئۆکتۆبری هەمان سالّ فەرمانی هەلّوەشاندنەوەی حیزبی کۆمۆنیستی دا، بەدوای ئەمەدا شەڕو ناکۆکی لەنێوان پێشکەوتنخوازان و پارێزەرانی ئەم حیزبە روویدا. ئەم کارە بووە هۆی ئەوە کە هێزە دژبەرەکان دەرفەتی هەرچەشنە دژکردەوەیەکیان بۆ بڕەخسێ. هەر لەم ڕاستایە ئەنجوومەنی شوورای بالاّی تاجیکستان لە کۆبوونەوەیەکی نائاسایی فەرمانی ئەسلاّن ئۆفی لەمەڕ هەلّوەشاندنەوەی حیزبی کۆمۆنیستی وەدوا خست. تاکو سەرەتای

(1) Moscow News, March 1990, P. 5

(٢) لە ڕۆژی ١٤ی فەروریيە مەحکەم ئۆف لەگەلّ سەرۆك وەزیران "عەزەت خایەف"و سەرۆکی شوورای بالاّ "پالی یووف" لە تەلەڤیزیۆن دەست لەکار کشانەوەی خۆیان ڕاگەیاند.

ژانوویەی ١٩٩١یش حاڵەتی نائاسایی راگەیەندرا. بەم شێوەیە ئەسلان ئۆف پۆستەکەی خۆی دا بە سەرۆکی ئەنجوومەنی شوورای باڵای تاجیکستان واتە رەحمان نەبی ئۆف[١].

لە دژکردەوە بەم کارە سێ حیزبی دێمورات، رەستاخیزو ژیانەوەی ئیسلامی[٢] خەڵکیان بۆ نارەزایەتی دەربڕین و هاتنیان بۆ ناو گۆڕەپانی سیاسی بانگهێشت کرد[٣]. بەدوای ئەم بانگهێشتنە نزیکەی ٢٠هەزار کەس لە خەڵکی تاجیکستان لەپێش بینای ئەنجوومەنی شوورای باڵای ئەم وڵاتە دەستیان دایە نارەزایەتی و مانگرتن و خوازیاری هەڵوەشاندنەوەی باری نائاسایی و هەڵوەشاندنەوەی سەرلەنوێی حیزبی کۆمۆنیست و وەدواخستنی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری و بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی نوێ بۆ ئەنجوومەنی شوورای باڵاو بە فەرمی ناسینی گشت حیزبە سیاسییەکان بوون[٤]. بە پەرەگرتنی ئەم نارەزایەتییانە پارلمان ناچار بوو کۆتایی بە رەوشی نائاساییو جارێکی دیکە حیزبی کۆمۆنیست هەڵوەشێنێتەوە[٥].

هەروەها سێ حیزبی سەرەکی تاجیکستان بە فەرمی ناسران و مۆڵەتیان پێدرا تاکو نوێنەری خۆیان بۆ کۆمیسیۆنی هەڵبژاردنەکان بناسێنن[٦]. هەروەها بڕیار درا کە لە ٢٤ی سێپتامبری ١٩٩١ راپرسی گشتی لە هەمبەر هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی شوورای باڵای تاجیکستان بەڕێوەبچێ[٧].

بەڵام بەم حاڵێشەوە، کۆمۆنیستەکان توانیان رەحمان نەبی ئۆف لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری لە ٢٤ی نوامبری ١٩٩١دا سەرکەوتوو رابگەیەنن، ئەمە لە کاتێکدا بوو دوو حیزبی یەکگرتووی دێموکرات و ژیانەوەی ئیسلامی پشتیوانییان لە حکوومەتی خودانەزەرئۆف

(١) لە دووشەنبە هاتوچۆی خەڵك لە کاتژمێر ١٠ی شەوەوە قەدەغە راگەیەندراو وەها بارودۆخێك تاکوو مارسی ١٩٩١ درێژەی هەبوو. سەردانی ئەم ژێدەرە بکەن:

Moscow News, 13 April 1991. P4

(٢) ئەندامانی حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی یان رێنێسانسی ئیسلامی بەدوای پێکهاتنی پتر لە ١٠ هەزار کەسی راگەیەندرا سەردانی ئەم سەرچاوە بکەن:

Bess Brown, "Setback For Conservatives in Tajikistan", Report an The ussr P. 21

(3) "Weekly Record For Even" Report on The ussr 26 July 1990, P. 36

(4) Moscow News, 12 August 1990, P. 11

(5) Moscow News December 1990, P. 8

(6) Bess Brown, "Setback for conservative in Tajikistan", Report on The USSR, P. 21

(7) Weekly Record of Events", Report on The USSR, 4 october 1991, P. 34



دەکردو نزیکەی سێ لە سەدی دەنگەکانیان بەدەستهێنا[١]. هەروەها لە مانگی مەی ١٩٩٢دا کۆمۆنیستەکان بە سەرۆکایەتی سەنگەك سەفەرئۆف توانیان جارێکی دیکە "کەنجایەف" کە لەژێر گوشاری خەڵك و لە ٢٢ی ئاوریلی هەمانساڵدا ناچار کرابوو کە دەست لە کار بکێشێتەوە، لەجێی ناوبراو ئەکبەرشا ئەسکەندەرئۆف بوو بە جێنشینی سەرۆك کۆمار بەڵام بارودۆخی وڵات ئارام نەبوو[٢].

هەر بۆ ئەم مەبەستە ئەنجوومەنی شوورای باڵای تاجیکستان لە رۆژی ١٦ی نوامبری ١٩٩٣دا لە خۆجەند کۆبوونەوەیەکی پێکهێنا. لەم کۆبوونەوەیەدا ئەو کۆمۆنیستانەی کە ٩٧٪ نوێنەرانیان پێکدەهێنا لە بڕیارێکی نایاساییدا ئەسکەندەرئۆفیان لابردو ئیمام غەلی رەحمان ئۆف[٣]یان بۆ سەرۆکایەتی باڵا دەستنیشان کرد. دواتریش رەحمان ئۆف لە رێگای هەڵبژاردن بە شێوەی فەرمی بوو بە سەرۆك کۆماری تاجیکستانو حکوومەتێکیان پێکهێنا کە نەیاران تێدا بەشدار نەبوونو لەگەڵ بەدەسەڵات گەیشتنی ئەم حکوومەتە سیاسەتی یاساغ کردنی حیزبو چاپەمەنییەکانو قۆڵبەست کردنی بەرهەڵستکاران دەستی پێکردو

(١) بارەنەت رۆبین، "هۆکارو دواهاتەکانی شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان"، وەرگێڕانی فاتمە سوڵتان یەکتا، گۆڤاری توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندیو قەفقاز، ژمارەی ١٥، پاییزی ساڵی ١٣٧٥، لاپەڕەی ١٣٠

(٢) لە شەڕی نێوخۆیی کە لەنێوان ساڵەکانی ٩٣ ـ ١٩٩٢ لە تاجیکستان رووی دا نزیکەی ٣٠٠ هەزار کەس لە هاووڵاتیانی خۆی لەدەست دا. سەردانی ئەم سەرچاوە بکەن:

"شەڕ لەدوای شەڕ"، رۆژنامەی ئەیزوستیا، ١٩٩٧/٣/٥، هەروەها شادمان یوسف، تاجیکستان نرخی ئازادی، دەفتەری بڵاوکراوەی کولتووری ئیسلامی، ١٣٧٣، لاپەڕەکانی ٩١ ـ ٣٠٦

(٣) ئیمام عەلی شەریپیوچ رەحمان ئۆف لە ٥ی ئۆکتۆبری ١٩٥٢ لە ناوچەی کولاب دا لەدایك بوو. ناوبراو بڕوانامەی ئابووری لە زانکۆی حکوومی تاجیکستان دا وەرگرت. چالاکی پیشەیی ئیمام عەلی لە ساڵی ١٩٧١ وەك فەرمانبەری کارەبا لە شاری گۆرگان تەپە دەستی پێکرد. لە ساڵی ١٩٧٢ تاکوو ١٩٧٤ لە سوپای سۆڤییەت دا خزمەتی کرد. پاشان گەڕایەوە سەر پیشەی پێشووی خۆی. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٧٦ تا ١٩٨٨دا بەرپرسو سەرۆکی کومیتەی یەکیەتیی بازرگانی زەوییە هاوبەشەکان لە بەشی دنگارا بوو. لە ساڵی ١٩٩٢ وە وەك سەرۆکی کومیتەی بەڕێوەبەریی شوورای ناوچەی کولاب هەڵبژێرا. لە نۆزدەهەمین کۆبوونەوەی شوورای باڵای تاجیکستان، رەحمان ئۆف بۆ سەرۆکایەتی شوورا هەڵبژێرا. لە ساڵی ١٩٩٤ەوە لە رێگای هەڵبژاردنەوە بوو بە سەرۆك کۆماری تاجیکستان.

کۆمۆنیستەکان بە ڕێبەری بەرەی گەلی سەنگەك سەفەرئۆف بۆ سەرکوتی هێزە نەیارە نێوخۆییەکان هاتنە گۆڕەپانەوە[1].

لەم ڕێکەوتەوە شەڕو پێکدادانی خوێناویی لەنێوان حیزبە یەکگرتووەکان و گرووپە ئەتنیکییەکان لایەنگری بەنی ئۆف هاتە ئاراوە کە بووە هۆی بشێوی لە وڵاتدا. سەرەڕای ئەمە، لە تاجیکستان ناکۆکی عەشیرەیی‌و قەومیش هەبوو کە بارودۆخی وڵاتی ئاڵۆزتر کردبوو. بەنی ئۆف لەلایەن خێلەکانی نیشتەجێی کولابەوە پاڵپشتی دەکرا، بەڵام عەشیرەتی رکەبەرو دژی ئەو سەر بە شاری گۆرگان (قرقان) تەپە بوون کە ناوەندی شەڕە قورسە نێوخۆییەکان بوو.

لە نوامبری ١٩٩٢دا لەلایەن وڵاتە سەربەخۆو هاوبەرژەوەندییەکانەوە بە مەبەستی پاراستنی سنووری نێوان تاجیکستان و ئەفغانستان هێزی پاراستنی ئاشتی بە واتایەکی دیکە فرەرەگەزیان پێکهێنا کە داگری یەکانە سەربازییەکانی رووسیە، قەزاقستان، قرقیزستان و ئۆزبەکستان بوو. ئەم هێزە ئاشتی پارێزە هەرچەند رواڵەتێکی فرەرەگەزی هەبوو بەڵام لە بنەڕەتدا بە دەستێوەردانی رووسیە ناودێر کرا، بە جۆرێك ڕێژەی سەربازانی رووسی لەم بەرەیەدا دەگەیشتە ٢٥ هەزار کەس و بە شێوەی پرش و بڵاوەیی رووبەرووی هێزەکانی تاجیکستان و لایەنگرانیان دەبوونەوەو تەنانەت هێندێ جار لەنێو خاکی ئەفغانستانیش هێرشی دەکردە سەر هێندێك پێگە. لەم کاتەدا تۆڵە خوێناوییە ئەتنیکی‌و ئایینییەکان بەتایبەت لەلایەن هێزەکانی لایەنگری کۆمۆنیستەوە دەستیپێکردو ژمارەیەك لەنێو چوون و بێ‌سەرو شوێن کران. ڕێبەرە سیاسییەکانی دژبەریش بۆ ئەفغانستان‌و مسکۆو کۆمارەکانی باڵتیك هەڵاتن.

لەم راستایەشدا موجاهیدینی ئەفغانی دەستیان بە پەروەردەو راهێنانی ملیشیاکانی دژی حکوومەتی تاجیکستان بەتایبەتی هێزی ژیانەوەی ئیسلامی کردو تەنانەت هێندێك لە ناوچەکانی خۆیانیان پێدان. پاکستان و وڵاتە ئیسلامییەکانی دیکەش کۆمەڵێك یارمەتیان

---

(١) حەبیبوڵڵا ئەبووحەسەن شیرازی، تاجیکستان: سەقامگیری سیاسی و پێشگیری لە ناکۆکییە نێوخۆییەکان" گۆڤاری ئاسیای ناوەندی و قەفقاز،ساڵی هەشتەم، دەورەی سێهەم، ژمارەی ٢٧، پاییزی ١٣٧٨، لاپەڕەی ١١٠



پێشکەش کردن[1]. ئەم شەڕە نێوخۆییە لەنێوان بیست هەتا ٤٠ هەزار کەس کوژراوو بریندراری لێکەوتەوە. نزیکەی ٨٠٠هەزار کەسیش ئاوارەو بێ‌ماڵ و حاڵ بوون. یەکێك لە بانکە جیهانییەکان لە ئاگۆستی ١٩٩٤دا پێوانەی کردووە کە شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان دەوروبەری حەوت ملیۆن دۆلار زیانی ئابووری بە وڵات گەیاندووە.

لە کۆتاییدا بەنێوبژیوانی حکوومەتەکان و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان لە ٢٧ی ژووئەنی ١٩٩٧ ڕێککەوتنی ئاشتی لەنێوان لایەنە دەرگیرەکان هاتەئاراوە. پەسندکردنی ئەم ئاشتییە نەتەوەییە سەرچاوەگرتوو لە چەندین پێویستی سیاسی و نێونەتەوەییە، بۆ نموونە گوشاری دامەزراوە نێونەتەوەیی‌و ناوچەیی‌و ترس لەمەڕ بوونی تاجیکستان وەك هاوشێوەی ئەفغانستانی دووهەم، سەرنەکەوتنی حکوومەتی دووشەنبە، لەمەڕ سەرکوتی نەیاران و لاوازی لە چارەسەرکردنی ئاریشە ئابوورییەکان و لەگەڵ دانی یارمەتی بەربڵاوی رووسیە، هەروەها گوشاری ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان و ڕێکخراوە ناوچەیی‌و نێونەتەوەییەکان بۆ سەر رووسیە کە چیدیکە دەست لە کاروباری نێوخۆیی تاجیکستان وەرنەدات و واز لە پاڵپشتی کردنی حکوومەتی دووشەنبە بێنێ.

ئەم تەوژمە بە رادەیەك بوو کە حکوومەتی رووسیە لە کۆبوونەوەی سەرۆکەکانی ئاسیای نێوەڕاستدا رایگەیاند کە چیدیکە ئامادە نییە بەتەنیا بەرپرسایەتی ئاشتی‌و ئاسایش لەم ناوچەیەدا وەئەستۆ بگرێ، تەنانەت بۆریس یەلتسین، سەرۆك کۆماری رووسیە، گوشاری خستەسەر رەحمان ئۆف کە دانووساندن لەگەڵ دژبەران قبووڵبکا. بۆ ئەو مەبەستە ڕێگا چارەگەلی گونجاو بۆ پێشگیری لە تێکهەڵچوون بگرێتە بەر[2]. بەم شێوازە لەنێوان حکوومەتی دووشەنبەو بەرەی بەرهەڵستکاراندا کۆمەڵێك ڕێککەوتن هاتە ئاراوەو لە بواری سیاسی‌و یاساییدا ڕێککەوتنگەلێك واژۆ کران.

وتووێژەکانی ئاشتی لەنێوان حکوومەتی ئیمام عەلی رەحمان ئۆف و بەرەی دژبەران بە ڕێبەری سەید عەبدوڵڵا نووری لە ئاوریلی ١٩٩٤دا بە نێوبژیوانی ڕێکخراوی نێونەتەوەیی لە

---

(١) راجان مەنۆن: "ئەمنییەتی ئاسیای ناوەندی دوای دارمانی سۆڤییەت"، وەرگێرانی مەنوچهر شوجاعی، تاران: گۆڤاری ئیتلاعاتی سیاسی ـ ئابووری، ساڵی ١١، ژمارەی ٧و ٨ی خاکەلێوەو بانەمەڕی ساڵی ١٣٧٦، لاپەڕەکانی ١١١ تاکوو ١٠٤

(٢) ئەبولحەسەنی شیرازی، پێشوو، لاپەڕەی ١١١

مسکۆ دەستپێکرد. لەم خولە لە وتووێژەکاندا ڕێگاگەلی کۆتایی هێنان بە تێکهەڵچوونەکان لە دەوروبەری سنوورەکانی تاجیکستان- ئەفغانستان، هەروەها ئامادەکاری بۆ بواری گەڕانەوەی ئاوارەکانی شەڕ بۆ وڵاتانی خۆیان تاوتوێ کران.

خولی دووهەم و سێهەمی وتووێژە ئاشتیخوازەکان لە هەمان ساڵدا واتە ساڵی ١٩٩٤ لە وڵاتانی ئێران و پاکستان بەڕێوەچوو. لە دوو خولی دانیشتنەکەدا هەردوولا لەمەڕ ڕاگرتنی شەڕو ئاگربەس و دواتر نوێکردنەوەیی‌و پاشان دامەزراندنی کۆمیسیۆنێکی چاودێری بەسەر جێبەجێکردنی گرێبەستەکان ڕێکەوتن[١].

خولی چوارەمی وتووێژە ئاشتیخوازەکان لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٩٥ـ١٩٩٦ بەدوای یەکدا لە قەزاقستان، ئێران، تورکمەنستان، ئەفغانستان‌و ڕووسیە بەڕێوەچوو و لایەنە دەرگیرەکان لەمەڕ نوێکردنەوەی ئاگربەس، گۆڕینەوەی دیلەکانی شەڕ، پێکهێنانی ئاگربەسی نەتەوەیی‌و بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی ئازاد ڕێککەوتن[٢].

خولی پێنجەمی وتووێژە ئاشتیخوازەکانی تاجیکستان لە ساڵی ١٩٩٦ لە ئێراندا بەڕێوەچوو. لەم دانووساندنانەدا لە پێوەندی لەگەڵ ئامادەکردنی گەلاڵەیەك بۆ ڕاگەیاندنی لێبووردنی گشتی، چۆنییەتی پێکهێنانی کۆمیسیۆنی ئاشتی نەتەوەیی، بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن لە خولی گواستنەوەو پێداچوونەوە بە ستراکتۆری حکوومەت باسی لەسەر کرا و لەم بوارەشدا گەیشتن بە کۆمەڵێك ڕێککەوتن. بەم پێیە ڕەوتی ئاشتی لە تاجیکستان لە ساڵی ١٩٩٢دا دەستی پێکردو دواتر پاش بەڕێوەچوونی چەند خولەك وتووێژو دانووساندن لە کۆتاییدا لەنێوان لایەنە دەرگیرەکان، ئاشتی و لەیەك نزیك بوونەوە هاتە ئاراوە، هەڵبەت بەهۆی نەپاراستنی نێوەڕۆکی گرێبەستەکان و بێباوەڕی لە هەمبەر یەکتر هێندی جار گرووپە بەرهەڵستکارەکانی تاجیکستان لەگەڵ یەکتر دەرگیر بوون کە ئەم کارە تاکو ساڵی ١٩٩٧ درێژەی هەبوو، تا ئەوەی کە لە ٢٧ی ژووئەنی ١٩٩٧ ڕێکەوتنی ئاشتیخوازی گشتی لەنێوان لایەنەکان واژۆ کران کە زۆر جێگای بایەخ بوو[٣]. بە مەبەستی

(١) بڕوانا "دانوستانە ئاشتیخوازەکانی تاجیکستان"، مەشهەد: ڕۆژنامەی خۆراسان، ٨ی پووشپەڕی ١٣٧٦، لاپەڕەی ٢

(٢) بڕوانا "ڕێککەوتنی ئاشتی لە تاجیکستان دا"، ڕۆژنامەی ئیتلاعات، ٩ی پووشپەڕی ١٣٧٦

(٣) هەواڵنێری کۆماری ئیسلامی، "ڕۆژژمێری دۆسییەی ئاشتی تاجیکستان"، ڕۆژنامەی ئیتلاعات، ١٠ی جۆزەردانی ١٣٧٩، لاپەڕە ١٢



جێبەجێکردنی نێوەڕۆکی ئەم ڕێکەوتننامەیە چوار کۆمیسیۆنی تایبەت لە بواری سیاسی، نیزامی، یاسایی‌و پرسەکانی پێوەندیدار بە ئاوارەکان پێکهات تاکو بواری پێویست بۆ هێنانە ئارای وەها ئارمانجێك لە ماوەی ١٢ تاکو ١٨ مانگ لە داهاتوودا بەرهەڤ بکا.

بە جێبەجێکردنی بەندە نیزامییەکانی ڕێکەوتننامەی ئاشتی، دەبوایە گشت هێزە نیزامییەکان لە ماوەی قۆناخە تایبەتیەکاندا ئاوێتەی یەکتر بن و سوپایەکی یەکگرتوو پێك بێنن. هەر لەم ڕاستایەدا، سەید عەولا نووری ـ ڕێبەری بەرەی نەیاران ـ سوپای ژێر دەسەڵاتی خۆی هەڵوەشاندەوەو نزیك پێنج هەزار شەڕوانی تێکەڵ بە ڕیزەکانی حکوومی کردو نزیکەی ٢٧٠٠ کەسی سەرقاڵی پیشەی دیکە کرد. دواتر بەرەی دژبەران بوون بە هێزێکی سیاسی‌و لەدوای ئەمەش بواری ئازادکردنی هەڵسووڕاوانی حیزبەکانیش ئامادەکران[١].

بەشێکی دیکەی ڕێککەوتننامەی ئاشتیخوازانەی تاجیکستان پەیوەست بوو بە گەڕاندنەوەی ئاوارەکانی شەڕ لە ئەفغانستان و وڵاتانی دیکە کە بڕیار درا گشت ئاوارەکانی شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان بۆ ئەم وڵاتە دیپۆرت بکرێتەوە. بەڵام ژمارەیەك لەوانە بەرەو وڵاتانی هاوقازانج چوون لەگەڵ هەوڵەکانی حکوومەت و کۆمیسیۆنی ئاشتی ئەوانە هەر لەو وڵاتانەدا ماونەتەوە، شارەزایان هۆکاری نەگەڕانەوەیان بۆ بوونی قەیرانی ئابووری تاجیکستان گەڕاندووەتەوە.

خاڵە گرینگەکانی بەشی یاسایی ڕێککەوتنامەی ئاشتی تاجیکستان پەیوەستە بە لێبووردنی گشتی‌و ئازاد کردنی دیلەکانی هەردوولا، چاکسازی لە یاسای بنەڕەتی و یاسای حیزبەکان و هەڵبژاردنەکان، هەر لەم ڕاستایەدا کۆمیسیۆنی ئاشتی نەتەوەیی، ڕەشنووسی گەلاڵەی گۆڕینی یاسای بنچینەیی ئامادەو پێشکەش بە سەرۆك کۆماری کرد. بۆ وێنە خاڵەکانی ڕەچاوکراوو لە ڕەشنووسی لێکدانەوە و چاکسازی یاسای بنەڕەتی‌و بەرزکردنەوەی خولی سەرۆك کۆماری لە پێنج ساڵ بۆ حەوت ساڵ، دامەزراندنی دەسەڵاتێکی نوێی یاسادانەر پێکهاتوو لە دوو پارلمانی نەتەوەیی‌و نوێنەران (پارلمانی دوو ئەنجوومەنی)، ئازادی حیزبە ئایینی‌و نائایینییەکان بوو کە لەلایەن پارلمانی باڵای تاجیکستان پەسند کراو بەڕێوەبردنی ڕاپرسی گشتی دواین بڕیاری لەسەر درا. گرینگترین بەشی سیاسی ڕێکەوتنی ئاشتی ئاماژە پێکراو پەیوەستە بە ئەسپاردنی ٣٠٪ دەسەڵات بە بەرەی نەیاران. ئەم بەشە لە ڕێکەوتنەکەدا ئەگەرچی بە شێوەی تەواو بەڕێوە نەبرا

(١) بڕوانا "هەنگاوە لەرزۆکەکانی تاجیکستان، بەرەو ئاشتی، ڕۆژنامەی ئیتلاعات، ٢٤ی خاکەلێوەی ١٣٧٩

بەڵام بەو حاڵەشەوە نزیکەی ٣٠ پۆستی گرینگ و ٢٠ پۆست لە بەرپرسایەتی شارەکان و ناحییەکان درا بە بەرەی بەرهەڵستکاران. هەروەها بەرەی دژبەران پێداگرییان لەسەر لابردنی وشەی سێکۆلاریزم لە یاسای بنەڕەتیدا دەکرد بەڵام حکوومەت دژی لابردنی بوو. ئەم ناکۆکییە لە دواییدا بە هێنانەگۆڕی بەندێك لە یاسای بنەڕەتی لەمەڕ ئازادی چالاکی حیزبە سیاسییە ئایینییەکان چارەسەر بوو کە بەدوای ئەمەدا سەرەتا حیزبی بزووتنەوەی ئیسلامی گەورەترین گرووپی بەرە، دواتر حیزبی دێموکراتیك- باڵی ئاڵماتی دەستەی یەکگرتوو، دەستیان بە هەڵسووڕان کرد. چالاکی بزووتنەوەی ئیسلامیو حیزبی دێموکراتیك (باڵی ئاڵماتی) کەمتر لە دوو مانگ پێش هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری تاجیکستان دەستیپێکردو پێچەوانەی چاوەڕوانییەکان ئەم دوو جیزبە هەڵوێستی جیاوازیان لەمەڕ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری گرتە پێش، بە جۆرێك کە حیزبی بزووتنەوەی ئیسلامی پاڵپشتی خۆی بۆ دەوڵەت عوسمان، وەزیری ئابووری تاجیکستان کە بەپێی گرێبەستەکانی ئاشتی هاتبووە ناو حکوومەت دەربڕی، بەڵام حیزبی دێموکراتیك (باڵی ئاڵماتی) پشتیوانی لە خۆپاڵاوتنی ڕەحمان ئۆف دەکرد[1].

کۆمیسیۆنی ناوەندیی هەڵبژاردنەکانی تاجیکستان ناوی سێ خوازیاری بەربژاردەی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری بە بیانووی کۆنەکردنەوەی ١٤٥ هەزار واژۆ بۆ بەشداری لە هەڵبژاردن تۆمار نەکرد، ئەم سێ بەربژاردەیە بریتین لە: دەوڵەت عوسمان، پاڵێوراوی بزوتنەوەی ئیسلامی، سوڵتان قووەت ئۆف پاڵێوراوی حیزبی دێموکراتیك(باڵی تاران) و سەف ئەلدین تۆرێف پاڵێوراوی حیزبی دادپەروەریی. دواتر ئەم کەسانە لە دادگای باڵای تاجیکستان سکاڵایان بەرز کردەوەو دەیانگوت کە بەرپرسە ناوچەییەکان و کۆمیسیۆنی ناوەندی هەڵبژاردن لە هەمبەر چالاکی کۆکردنەوەی واژۆکاندا ڕێگر بوون. دادگای باڵای تاجیکستان سکاڵای دەوڵەت عوسمانی قبووڵکرد بەڵام سکاڵای دوو بەربژاردەکانی دیکەی پەسند نەکرد. کۆمیسیۆنی ناوەندیی هەڵبژاردنەکانی تاجیکستانیش بەپێی دەنگی دادگا، ناوی دەوڵەت عوسمانی بەبێ بوونی واژۆی ١٤٥ کەسی پێویست تۆمار کرد. بزووتنەوەی ئازادی لە دژکردەوە بەم کارە ڕایگەیاند کە کۆمیسیۆنی ناوەندی هەڵبژاردنەکان لەژێر گوشاری نێونەتەوەیی و بۆ دێموکراتیك نیشاندانی هەڵبژاردن نێوی دەوڵەت عوسمان ئۆفی وەك تەنیا ڕکەبەری ڕەحمان ئۆف تۆمار کردووە. نوێنەرانی بەرەی دژبەرانیش لە کومیسیۆنی ئاشتی بە نیشانەی ناڕەزایەتی دەستیان لە کار

(١) بڕوانا "ئاشتی تاجیکستان"، ڕۆژنامەی تەوسعە، ژمارەی ١٠٩، ٤ی ڕەزبەری ١٣٧٦، لاپەڕەی ٦



کشاندەوەو حیزبی بزووتنەوەی ئیسلامیش لەگەڵ دوو حیزبی دیکە کە ناوی پاڵێوراوەکانیان تۆمار نەکرابوون، هەڵبژاردنەکانیان بایکۆت کرد. دواتر سەید عەلی نووری ڕێبەری بەرەی دژبەران و سەرۆکی حیزبی بزووتنەوەی ئیسلامی، دوای هەوڵێکی زۆر کەلەلایەن ڕێکخراوی نێونەتەوەیی و وڵاتانی پارێزەری ئاشتی هاتە ئاراوە، بایکۆتی لە سەر هەڵبژاردنی سەروك کۆماری هەڵوەشاوە ڕاگەیاند. سەید عەبدوڵڵا نووری هاوکات لەگەڵ ڕاگەیاندنی هەڵوەشاندنەوەی بایکۆتی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری گوتی، حیزبی بزووتنەوەی ئیسلامی پاڵێوراوی لە هەڵبژاردنەکاندا نییەوناودێرکردنی دەوڵەت عوسمان نایاساییە و هەڵبژاردنەکان تەنیا بە بەشداری پاڵێوراوێك بەڕێوە دەچێ. لە کۆتایی هەڵبژاردنەکاندا کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن، دەنگەکانی دەوڵەت عوسمانی ٢/١١ لە سەدی گشت دەنگەکان و دەنگی ڕەحمان ئۆفی ٩٦/٩٧ لە سەدی تێکڕای دەنگدەران ڕاگەیاند و بەم جۆرە، ڕەحمان ئۆف بۆ ماوەی حەوت ساڵی دیکە وەك سەرۆك کۆماری تاجیکستان هەڵبژێردرایەوە[1].

لەنێوان ئۆکتۆبری ١٩٩٨، ئۆپەراسیۆنی هێزە حکوومییەکان دژی دوو باڵی دژبەر لە ڕۆژهەڵاتی شاری دووشەنبە بووە هۆی کوژرانی ١٣ کەسو قۆڵبەست کرانی ٦ بەرهەڵستکار. لە سەرەتای مانگی نوامبر شەڕێکی قورس لە دەوروبەری خۆجەند ڕوویدا کە وەك توندوتیژترین تێکهەڵچوون لەدوای ڕێکەوتننامەی ئاشتی ١٩٩٧ بە ئەژمار هاتوەو بەدوای ئەمەدا بۆ دەستەبەسەرکردنی هێزەکانی خودا بەردی ئۆف[2] لە دەوروبەری فڕۆکەخانە لەنێوان هێزەکانی حکوومیو بەردی ئۆف پێکدادان ڕوویدا کە لانیکەم ١٠٠ تا ٣٠٠ کەس کوژران (کە لەنێو کوژراوەکانیشدا سەربازی حکوومی بەرچاو دەکەون)و ٥٠٠ کەسیش بریندار بوونو کۆمەڵێك ئەفسەری پۆلیس بە بارمتە گیران. بەپێی ئەم ڕاپۆرتە، هێزەکانی خودا بەردی ئۆف دوای پێنج ڕۆژ تیکهەڵچوون تووشی نسکۆ هاتن. سەرۆك کۆمار ڕەحمان ئۆف، عەبدولمالك عەبدوڵڵای جانیفی بە هاندانی ڕاپەڕیوەکان تاوانبار کرد. دادگای تاوەنە جەناییەکان خێرا دەستی بە پێراگەیشتن بە دۆسییەی سەرۆك وەزیری پێشوو، هەروەها خودا بەردی ئۆف شارەداری پێشووی خۆجەندو برای عەبدوڵڵا جانیف، عەبدقانی جانیف، جێگری پێشووی سەرۆك کۆمار، نەسروڵڵا دۆست ئۆف کرد. حکوومەتی ئۆزبەکستان بۆچوونەکانی ڕەحمان کەریم ئۆفی کە گوایە سەروك

(1) CNN, "Election Watch: Tajikistan Parliamentary election", 2000, PP. 1-20
(2) Khudoberdiyr

کوماری ئۆزبەکستان، هاوکاری راپەڕیوەکانی داوەو بە توندی رەت کردەوە(دەگوترێ کە خودا بەردی ئۆف بەدوای سەرنەکەوتنی شەڕی راپەڕیوەکان پەنای بۆ ئۆزبەکستان بردووە).

لەنێوان نوامبری ١٩٩٨دا، پارلمانی باڵا دەستنیشان کردنی چەند ئەندامی یەکیەتیی دژبەران وەك ئەندامی شوورای وەزیران بۆ وێنە تورجانزادە وەك جێگری یەکەمی سەرۆکایەتی، "زەکیر وەزیرئۆف" وەك جێگری سەرۆك و دەوڵەت عوسمانی وەك وەزیری ئابووری و پێوەندییە بازرگانییە دەرەکییەکان پەسند کرد. پۆستە زیادییە نزمەکانی دیکەی حکوومەتی، لە دسامبردا بۆ بەرەی دژبەران تەرخانکرا. نووری لە دسامبردا رایگەیاند کە بەرەی دژبەران لە سەرەتای ١٩٩٩، چەك بە هێزە چەکدارەکانی دادەنێ و مۆڵەت دەدا بە حیزبە سیاسییەکان، لە چوارچێوەی رێکخراودا چالاکی بکەن. نووری هەروەها پێداگری دەکرد کە زۆرترین خاڵەکانی باسکراو لە رێکەوتننامەی ئاشتی ١٩٩٧، جێبەجێ کراوە.

لە ژانوویەی ١٩٩٩، وەزیری ناوخۆ راپۆرتێکی گرینگی لە پێوەندی لەگەڵ تاوانە چەکدارییەکان و قاچاخی مادده هۆشبەرەکان کە لە ساڵی رابردوودا روویان دابوو خستەڕوو بە جۆرێك کە رێژەی تاوانە چەکدارییەکان لە ساڵی ١٩٩٨ پتر لە ٨٠٪ راگەیەند. لەئاکامدا لە فیەوریەی ١٩٩٩دا سەرۆك کۆماری بڕیاری بەڕێوەچوونی رێوشوێنی چڕوپڕی ئەمنییەتی دەرکرد. لە سەرەتاکانی فیەوریەدا، رێکخراوێکی سیاسی نوێ، حیزبی گەشە و دادپەروەی بە سەرۆکایەتی رەحمەتوڵڵا زەهیر ئۆف"، لەلایەن وەزارەتی دادەوە ناودێر کرا. لە سەرەتای مارسەوە ناودێرکردنی حیزبە سیاسییەکان لەلایەن وەزارەتی دادەوە دەستیپێکرد. لە ٨ حیزبی تۆمارکراو تەنیا ٥ حیزب مۆڵەتی نوێیان وەرگرت. لە هەمان کاتدا، تاوانە جەنایییەکان دژی ئەندامانی رێبەری حیزبە بەرهەڵستکارەکان، بۆ نموونە نووری و تورجانزادە، بەپێی دێکۆمێنتی لێبووردنی گشتی ١٩٩٧ راگیراو بەم شێوەیە ٣٠٠ ئەندامی بەرەی دژبەران بۆ پۆستەکانی نزمی حکوومەتی دەست نیشان کران. لە کۆتایی مانگدا، دادگای باڵا ٧ کەس لە لایەنگرانی خودا بەردیئۆف بۆ ماوەی ١٠ تاکو ١٤ ساڵ زیندانی بەهۆی بەشداری لەشەڕو پێکدادانەکانی ئۆکتۆبری ١٩٩٧دا مەحکووم کرد. هەروەها لە مارسی ١٩٩٩وە رێبەری حیزبی سوسیالیزم، سەفەرعەلی کەنجایەف، لە دووشەنبە کوژرا. رەحمان ئۆف بڕیاری لێکۆڵینەوە لەمەڕ هۆی کوژرانەکەی دەرکرد. لەنێوان ئاوریلدا ٦ حیزبی سیاسی بە دەرکردنی راگەیەندراوێك، قامکی ئەم تاوانەیان بۆ لای بەرپرسانی



حکوومەتی درێژ کرد. لە هەمان کاتدا چالاکی حیزبی عومرانی و میهەنی[١] بۆ ماوەی ٦ مانگ راگیرا (سێهەمین حیزب بڕیار بوو لە مانگی مارسدا رابگیرێ).

لەنێوان مانگی مای ١٩٩٩دا، پارلمانی باڵا بڕیارنامەیەکی پەسند کرد کە بەو پێیە ٥٥٠٠ کەس لە خەباتگێڕانی ناڕازی کە خویان بە حکوومەت ناساندبوو، وەبەر لێبووردنی گشتی کەوتن. لە مانگی مای راگەیەندرا کە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری لە سەرەتای نوامبری ١٩٩٩دا بەڕێوەدەچێ، لە کاتێکدا هەڵبژاردنی پارلمانی کاتی بەڕێوەچوونی لە فیەوریەی ٢٠٠٠دا، تێناپەرێ. بە هەرحاڵ لە کۆتایی مای ١٩٩٩، رێبەری یەکیەتیی دژبەران لە NRC هاتەدەر. لەنێو داواکارییەکانیدا، بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی پارلمانی باڵا لە ١٩٩٩دا، پێش هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری و دەستنیشان کردنی خەڵکانێکی زیاتر لە بەرەی نەیاران لە پۆستە حکوومەتییەکانیاندا بوون (تاکو بتوانێ یەك لە سێی پۆستە حکوومییەکان، بەو جۆرەی کە لە رێکەوتننامەی ئاشتی ١٩٩٧دا شیمانە کرابوو بۆ خۆی تەرخان بکا). بە شێوەی تایبەتی بەرەی ناڕازییەکان خوازیاری دانانی فەرماندەی نیزامی خۆیان، میرزا زییائۆف[٢] بۆ پۆستی وەزیری بەرگری بوون. وتووێژەکان لە سەرەتای ژووئەنەوە دەستیپێکردو لەنێوەی ژووئەندا، سەرۆك کۆمار رەحمان ئۆف و "نووری" کاتیان بۆ جێبەجێکردنی نێوەڕۆکی رێکەوتنی ئاشتی ١٩٩٧ دیاریکرد. لە هەمان کاتدا، چوار ئەندامی بەرەی دژبەران لە پۆستە حکوومییەکاندا، دانران.

لە کۆتایی ژوئەنی ١٩٩٩، پارلمانی باڵا پێشنیارەکانی سەرۆك کۆماری لەمەڕ کۆمەڵێك ریفۆرم لە یاسای بنەڕەتی کە بڕیار بوو بسپێردرێ بە ریفراندۆمی نەتەوەیی لە مانگی سێپتامبر پەسند کرد. هەروەها راگەیەندرا کە وابڕیارە وەزارەتخانەیەك بۆ بارودۆخی نائاسایی‌و بەرگری شارستانی نوێ پێکبێ. لە کۆتای ژووئەنەوە دوو فەرماندەی بەرهەڵستکاری لایەنگری خودا بەردیف لە دادگای باڵا، بە تاوانی جەنایەت و رێبەری کردنی شەڕو پێکدادان لە راپەڕینەکەی خۆجەند لە نوامبری ١٩٩٨ مەحکووم بە ئێعدام کران. لە سەرەتای جوولای ١٩٩٩ەوە سەرۆك کۆمار رەحمان ئۆف، پێنج نوێنەری بەرەی دژبەرانی لە پۆستە حکوومییەکان دیاریکرد کە لەنێوانیاندا میرزا زییائۆف وەزیری بارودۆخی نائاسایی‌و

(1) Civil and Patriotic
(2) Mitzoziyoyev

بەرگری شارستانی دەبینرا (لەگەڵ ئەوەی کە پێشنیاری دیاریکردنی زییائۆف بۆ پۆستی وەزارەتی بەرگری رەت کرابوو بەڵام ناوبراو پلەی بەرز کرایەوە بۆ سەرلەشکری). لە هەمان مانگدا بەپێی راپۆرتێك کە سەرۆك کۆمار رایگەیاند کە ۲۱ پۆست لە ٦۹ پۆستی حکوومەتییەکان بۆ ئەندامانی بەرەی بەرهەڵستکار دەستنیشان کراوە. لەسەرەتای ئاگۆستی ۱۹۹۹ رێبەری بەرەی نەیاران رایگەیاند شەڕوانانی بە تەواوەتی تێکەڵ بە هێزە چەکدارە حکوومییەکان بووە. لەنێوان ئاگۆستی ۱۹۹۹دا، بڕیاری لابردنی بایکۆت لە سەر حیزبە دژبەرەکان و راگەیەنە گشتییەکان کە لە۱۹۹۳ سەپێندرابوو بەپێی رێکەوتننامەی نوێ لەنێوان حکوومەت و بەرەی دژەکان راگەیەندرا. لە سەرەتای سێپتامبری ۱۹۹۹ راگەیەندرا کە وا بڕیارە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری لە ٦ی نوامبر بەڕێوە بچێت. لەنێوان سێپتامبر کۆمەڵێك لە چالاکان کە شیمانە دەکرا سەر بە "حیزبی ئەلتەحریری ئیسلامی" بناژۆخواز بن، تاوانبار کران بە بڵاوکردەنەوەی بڵاڤوکی نەیارانی حکوومەت و هەوڵدان بۆ دامەزراندنی حکوومەتێکی ئیسلامیخواز. لە ٢٦ی سێپتامبر راپرسی گشتی بۆ چاکسازی لە یاسای بنەڕەتی، بەڕێوەچوو کە نزیکەی ۷۲٪ دەنگی ئەرێنییان بە چاکسازی دا(کە پێکهێنانی دوو ئەنجوومەنی یاسادانەر، نوێکردنەوەی ماوەی سەرۆك کۆماری لە ٥ ساڵ بۆ ۷ ساڵ و رەواییدان بە حیزبە سیاسییەکان کە رەگی ئایینییان هەیە). ۹۲٪ دەنگی بەشداربووان، خاوەنی مەرجەکانی هەڵبژاردن بوون. چەند حیزبێکی دژی چاکسازی یاسای بنەڕەتی بوون کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئەو یاسایانە، هێزی لە رادەبەدەر دەدا بە سەرۆك کۆمارو دەبێتە هۆی تووڕە کردنی جیاخوازەکانی ناوچەکە.

لە کۆتایی سێپتامبرەوە حیزبی رێنێسانسی ئیسلامی تاجیکستان نێوی خۆی بۆ حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی تاجیکستان (IRP) گۆڕیو بە شێوەی فەرمی لە وەزارەتی داد ناودێر کرا.

لەنێوان مانگی ئۆکتۆبر سەرلەنوێ بەرەی دژەکان بە شێوەی کاتی لە NRC کشانەوەو گوتیان کە بەڵێنیەکانی حکوومەت نەهاتووەتە دی. بەتایبەتی بەرەی بەرهەڵستکاران لە هەوڵی وەدواخستنی هەڵبژاردنی پێشەڕۆی سەرۆك کۆماریدا بوون، چونکە پێشی بە کێبەرکێ لە نیوان سێ پاڵێوراوی سەرۆك کۆماری بە گوێرەی پێوەرەکان گیرابوو. لە کۆتایی مانگ دادگای باڵا، داوای لە وەزیرانی ئابووری و پێوەندییەکانی دەرەوە و ئەندامانی حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی واتە "دەوڵەت عوسمان" کردبوو کە خۆڕاگری بکات. لەنێوان مانگی ئۆکتۆبر راگەیەندرا کە جێگری



یەکەمی سەرۆك وەزیران و جێگری رێبەری بەرەی دژبەران، ئەکبەر تورجانزادە بەهۆی هەڵسوکەوتی نەشیاوو دژایەتی لەگەڵ سیاسەتی حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی دەرکراوە.

لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری کە لە ٦ی نوامبری ۱۹۹۹دا بەڕێوەچوو، سەرۆك کۆمار رەحمان ئۆف سەرکەوتنی لە بەرانبەر تاکە نەیاری خۆی، واتە دەوڵەت عوسمان، بەدەستهێنا. بەپێی سەرچاوە فەرمییەکان، رەحمان ئۆف ۹۷٪ دەنگەکانی بەدەستهێنا. رێژەی بەشداری دەنگدەران نزیکەی ۹۹٪ راگەیەندراوە. بەهەرحاڵ نارازییەکان خوازیار بوون کە بەهۆی گوماناویی بوونی هەڵبژاردنەکە نوێکردنەوەی خولی سەرۆك کۆماری، نایاساییە. رێکخراوی تەناهیو هاریکاری ئەورووپا (OSCE) لە ناردنی هەر چەشنە لێژنەیەکی چاودێری، لەمەڕ لەژێر پێنانی رێوشوێنەکانی هەڵبژاردنی پێشوو، خۆی پاراست. بەدوای دەسپێکی کار، سەرۆك کۆمار رەحمان ئۆف لە ١٦ی نوامبری دەستی لە سەرۆك کۆماری کشاندەوە، لەگەڵ ئەوەی کە وەزیرەکان هەتا پێکهێنانی حکوومەتی نوێ لە کۆتایی دیسامبر لە پۆستی خۆیاندا مانەوە. "عەقیل عەقیلۆف" جێگری فەرمانداری لێنین ئاباد، وەك سەرۆك وەزیر دیاریکرا.

لە سەرەتای دسامبری ۱۹۹۹دا یاسای بنەڕەتی بە مەبەستی پێکهێنانی دەسەڵاتی یاسادانانی دوو ئەنجوومەنی لە رێگای پارلمانی باڵاوە پەسند کرا. هەروەها راگەیەندرا هەڵبژاردنی هەردوو پارلمانی سەناو شوورا بەدوای یەکدا لە ۲۷ی فیەوریيەو ۲۳ی مارسی ۲۰۰۰دا بەڕێوەدەچێ. لەگەڵ ئەوەی کە ٦ حیزبی سیاسی بۆ بەشداریکردن نێونووسییان کردووە، بەڵام ئەو باسی ئەوە دەکرا کە کۆمەڵێك لە حیزبە بەرهەڵستکارەکان لە کێبەرکێی هەڵبژاردنەکان بێبەش کراون (ناونووسی سەرلەنوێی حیزبەکانی دیکە، لە نیوەی مانگ دەستی پێ کرد ). لە کۆتایی دیسامبری ۱۹۹۹دا دوو بڕیاری ئێعدام بۆ بەشداربووان لە راپەڕینی ۱۹۹۸، لە شاری خۆجەند درا کە لە رێژەی ئێعدام کراوەکانی بۆ ٥ کەسی بەرز کردەوە. کۆمەڵێکی دیکە لە لایەنگرانی خودابەردی ئۆف بۆ چەندین ساڵ مەحکووم بە زیندان کران. لە کۆتایی ژانوییەی ۲۰۰۰ەوە دادگایی کردنی ٦٦ گومانلێکراوی لە شاری دووشەنبەدا دەستی پێکرد. لە نیوەی مانگی فیەوریيە، جێگری وەزیری ئەمنییەت، شەمسوڵڵا جابیرئۆف، لە هێرشێك کە ئامانج تیرۆری شارەداری دووشەنبە "مەحموود سەعید عەبدوڵڵائۆف" بوو، کوژرا. وا بەرچاو دەکەوێ کوشتنی ناوبراو هەوڵێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەلبژاردنی یاسادانان لە داهاتوودا بووە کە تێدا عەبدوڵڵائۆف کاندید کرابوو.

لە مانگی مای ٢٠٠١ دوو کەس بە تاوانی چاندنی بۆمب تاوانبار کران و مەحکووم بە ئێعدام کران. لە ٢٧ی فیەوریی‌ەی ٢٠٠٠ هەڵبژاردنی پارلمانی نوێنەرانی نوێ بەڕێوە چوو و حیزبی گەلی دێموکراتیکی تاجیکستان بە ڕێبەری سەرۆك کۆمار ڕەحمان ئۆف (POPT) لەگەڵ هاوپەیمانەکانی ٦٤/٥٪ گشت دەنگەکانی هەڵبژادن و ٤٥ کورسی لە ٦٣ کورسی بەدەستهێنا. حیزبی کۆمۆنیستی تاجیکستان نزیکەی ٢٠/٦٪ (١٣ کورسی) لە کاتێکدا حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی نزیکەی ٧/٥٪ (٢ کورسی) بەدەستهێنا. بەپێی سەرچاوە فەرمییەکان، نزیکەی ٩٣٪ بەشداربووانی مەرجداری دەنگدان، لە هەڵبژاردنەکان بەشدارییان کردووە. بەپێی بانگەشەی ڕێکخراوی ئاسایش‌و هاوکاری ئەورووپا (OSCE)و حیزبە دژبەرەکان پێشێلکاری لە بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکان هاتبووە ئاراوە. عەبدوڵڵا نووری سکاڵایەکی فەرمی ئاراستەی سەرۆك کۆمار ڕەحمان ئۆف، ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان و ئاسایش و ئەمنییەتی ئەورووپا کردو تێدا باسی ئەوەی کرد کە سەرۆك کۆمار لە بەڵێنییەکانی خۆی لە نوامبری ١٩٩٩دا کە پەیوەستە بە ڕێوشوێنی هەڵبژاردن کەم تەرخەمی کردووە. دووهەمین خولی دەنگدان لە ١٢ی مارسی ساڵی ٢٠٠٠ لە ١١ بیاقی هەڵبژاردن کە ٥٠ لە سەدی پێویستیی دەنگەکانیان بەدەست نەهێنابوو، جێبەجێ کرا. ئاکامی هەڵبژاردن لە سێ بیاقو لە خولی یەکەمی دەنگدان هەڵوەشاوە ڕاگەیەندرا. یەعقووب عەزیم ئۆف سەرۆك وەزیری پێشوو، وەك وەزیری ئابووری و پێوەندی بازرگانی دەرەوە بەجێگای دەوڵەت عوسمان دیاریکرا.

لە کۆتایی مانگ NRC هەڵوەشاوە. بەپێی دوایین بارودۆخ، ڕێککەوتننامەی ئاشتی ١٩٩٧ (کە هەڵبژاردنی یاسادانان لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠وە بەڕێوەچوو) نووری گوتی کە هێشتا هێندێك لەپرسەکانی وەکو وەرنەگرتنی پەنابەری تاجیك و مافی دانی ٣٠٪ی دەسەڵات بۆ نوێنەرانی بەرەی بەرهەڵستکاران لە حکوومەت چارەسەر نەکراو ماوەتەوە. بەهۆی کۆتایی کاتی دیاریکراو و کۆتایی کێشەو تێکەڵچوونەکان لە نێوان لایەنەکان لەمانگی مای ٢٠٠٠دا، هێزەکانی ئاشتی پارێزی ڕێکخراوەیی نەتەوەیەکگرتووەکان تاجیکستانیان بەجێ هێشت. لە کۆتایی ئۆکتۆبردا، سەرۆك کۆمار ڕەحمان ئۆف، ناساندنی دراوێکی نوێی "سومونی" بەجێگای روبلی تاجیکستان ڕاگەیاند.

لە کۆتایی دسامبری ٢٠٠٠ لەسەر داوای وەزارەتی داد، دیوانی باڵای وڵات چالاکی حیزبی دادپەروەری خوازی بە هۆی لە ژێر پێنانی یاسای حیزبەکان بۆ ماوەی ٦ مانگ ڕاگرت. ئەم



حیزبە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە هۆی ڕاگرتنی چالاکییەکانی دژایەتیکردن لەگەڵ سەرۆك کۆمار بووە لە کاتی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی یاسادانان. لە ئاگۆستی ٢٠٠١دا، ئەم حیزبە دوای سەرنەکەوتن لە ناودێرکردنی دووبارەی ئەندامەکانی هەڵبژاردنی تەحریم کرد. لە ژانوییەی هەمان ساڵدا هەشت ئەندام لە گرووپی بایکوت کراوی بناژۆخوازی ئۆزبەك (حیزبی ئەلتەحریر) بە ٦ ساڵ مەحکووم کران.

بەپێی ڕاگەیاندنی سەرچاوەی حکوومی زیاتر لەسەد خەباتکار سەر بە گرووپی شەڕخوازی ئیسلامی لە ساڵی ٢٠٠٠ قۆڵبەست کران. لەنێوان مانگی ژانوییەی ٢٠٠١، لە دەزگای حکوومیدا کۆمەڵێك گۆڕانکاری کرا کە تێیدا وەزارەتی ئابووری، بازرگانی و کۆمیتەی هەرێمی بۆ گرێبەستەکانی بازەرگانی جێگای خۆیدا بە وەزارەتخانەیەکی نوێی ئابووری‌و پێوەندی بازرگانی دەرەکی، بە ڕێبەری حەکیم سولی ئۆف. لە نێوان مانگی ئاوریلدا یەکەمین جێگری وەزیرانی نێوخۆ، حەبیب ڕەنگین ئۆف، تیرۆر کرا. ئەم کارە زۆر جێگای تێڕامان بوو کە تیرۆرەکە بە تۆڵەی هەوڵەکانی وەزیر بۆ خەبات دژی قاچاخچییەکانی ماددە هۆشبەرەکان بەڕێوەچووە. هەروەها لە ئاوریلدا کۆمەڵێك تەقینەوە ڕوویدا کە کوژرانی لانیکەم چوار کەسی لێکەوتەوە.

لە سەرەتای مانگی مای ٢٠٠١دا، حیزبی ژیانەوەی ئیسلامی بانگەشەی بۆ کۆمەڵێك لە ئەندامەکانی کە بەهۆی ئەندامبوون لە حیزبی ئەلتەحریرو کۆکردنەوەی چەکی بێمۆڵەت تاوانبار کرابوون، کرد. لە کۆتایی مانگی مای حیزبی نوێی گەشەپێدان (توسعە) پشت بەستوو بە باڵی پێشووی حیزبی دێموکراتی تاجیکستان، کە لە تاراندا پێگەی هەبوو، سوڵتان کواتەفی وەك سەرۆك هەڵبژارد. لە مانگی ژووئەن یەکێك لە فەرماندە دژبەرەکان بەنێوی ڕەحمان سەنگین ئۆف، حەوت ئەفسەری پۆلیسی بە بارمتە گرت. پۆلیسە ئەفسەرەکان دوای ئەوەی کە بەڵێنیی چاوخشاندنیان بۆ سەر کردەوە جینایەتکارەکانیان بە دژی هەشت کەس لە لایەنگرانیان کرد، ئازاد کران.

لە هەمان مانگدا شەڕکەرە پێشووەکانی بەرەی نەیاران و لایەنگرانی ڕێککەوتننامەی ئاشتی ١٩٩٧، ١٥ کەس لە ڕێکخراوی فریاکەوتن و چوار بەرپرسی ئەمنییەتی، لە پێوەندی لەگەڵ قۆڵبەست کرانی چوار کەس بە دوای کوشتنی سەنگین ئۆف بە بارمتە گرت و دوای سێ ڕۆژ ئازاد کران (چوار کەسی تاوانبار بە کوشتنی سەنگین ئۆف لە مارسی ٢٠٠٢دا مەحکووم بە ئێعدام کران).

هەروەها لە ژووئەنی ٢٠٠١دا هێزە ئەمنییەكانی تاجیكستان هێرشێكیان بە دژی تاقمێـك لە خەباتگێڕانی نارازی بە ڕێبەری ڕەحمان سەنگین ئۆف لە دەوروبەری شاری دووشەنبەدا دەست پێكرد. ڕاپۆرت درا كە نزیكەی ٢٦ كەس لە شەڕوان كوژراون و ٦٦ كەسیش قۆڵبەست كـراون. لە مانگی ئاگۆستدا، ڕەحمان سەنگین ئۆف، لەلایەن هێزە ئەمنییەكانــەوە كـوژراو لـە كۆتـایی مانگدا بەرپرسانی تاجیكی ڕایانگەیاند كە نزیكەی ١٥ كەس لـە لایــەنگرانی ئـازاد دەكـرێن. هەروەها لە مانگی جوولایدا، ڕاوێژكاری دەرەوەی سەرۆك كۆمار تیرۆر كرا.

تاجیكستان بە توندی ئەو سـاڵە تووشــی ویـشكەساڵی هـات و لـە مـانگی مـای ٢٠٠١ حكوومەت داوای یارمەتی مرۆییانەی لە ڕێكخراوی نەتەوەكان كرد بەڵام ڕێكخراوی نەتەوەكان گرینگییەكی ئەوتۆی بەم داوایە نەداو تەنیا ڕێكخراوێكی مرۆیی بە هانای ئەم داوایەوە هـات. هەڵوێستەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە نیـوەی مـانگی سـێپتامبرداو لـە پێوەنـدی لەگەڵ خەباتێكی دژە تیرۆریستی بە مەبەستی پێشگیری لە ڕێكخراوی ئەلقاعیدەو میوانـداری تاجیكستان لە ئەفغانییەكانی سەر بە ئەلقاعیـدەو تالیبـان، بانـدۆری خـراپ لەسـەر ڕەوشـی مرۆیانە و پێوەندییەكانی ئەم وڵاتە و وڵاتانی بەرەی دژە تیرۆر دادەنێ.

لــە ســەرەتای ســێپتامبری ٢٠٠١دا وەزیــری كــشت و كــاڵ، چـاپەمەنیو تـەناهی، عەبدولڕەحیم ڕەحیم ئۆف تیرۆر كرا. كەرامەتوڵڵا عەلی ئۆف وەك جێنشینی ئەو لە مانگی ئۆكتۆبر دیاریكرا. هەروەها لە مانگی سێپتامبردا، نزیكەی ١٩ هـەزار كـەس لـەژێر نـاوی لێبوردنی گشتی ئازاد كران، هەتا بەجۆرە دەیەمین ساڵوەگەڕی سەربەخۆیی تاجیكستان پیرۆز رابگیرێ. لە نوامبردا حیزبی وەحدەت (حیزبی یەكگرتوو) پێش ئەوەی كە بە فەرمی بتوانـێ ڕێكخراوی خۆی تۆمار بكا، دامەزراو ناچار بوو پشتیوانی لانیكەم هەزار كەسی لە مـاوەی دوو سێ مانگدا بەدەستبێنێ. لە دسامبردا راپۆرت درا كە ١٠ كەس بـە تـاوانی خیانـەت، تیرۆریست، ئاژاوەگێڕی و لایەنگری لـە ڕاپـەڕینی ١٩٩٨ لـە خۆجەنـد بـە ٨ تـا ٢٥ سـاڵ مەحكووم بە زیندانی كران.

لە ژانوییەی ٢٠٠٢دا، وەزارەتخانەی نوێی پیشەسازی پێكهات كـە بریتـی بـوو لـە شـەش كۆمیتەی حكوومی كە زەید سەعید ئۆف وەك وەزیری پیشەسازی دەستنیشان كرا. لە هـەمان كاتدا وەزارەتی دارایی حكوومەتی لێژنەی كۆكردنەوەی سـەرانەی دامەزرانـد كـە غـولام جـان بوبایەف وەك سەرۆكی ئەو بەشە دیاری كرا.



لە مـانگی مارسـی ٢٠٠٢دا، ئـەو پەیماننامـە گـشتییەی كـە لـە سـاڵی ١٩٩٦ حیزبـە سیاسییەكانی لایەنگری دەوڵەت و ڕێكخراوە ناحكوومییەكان واژۆیان كردبوو لەلایـەن یـەكێك لە نوێنەرانی حیزبی بووژانەوەی ئیسلامی بۆ یەكەم جار واژۆ كرا. لەم گرێبەستەدا پـشتیوانیان لە درێژەی ئاشتی كردووە و پێداگرییان لەسەر هەوڵەكانی ئاشتەوایی سـاڵی ١٩٩٩ سـەرلەنوێ كراوەتەوە بە جۆرێك ئەم هەوڵانە هەر درێژەی هەبێ.

لە پێوەندی لەگەڵ ڕۆڵی وڵاتە دراوسـێكان و هێـزە ناوچـەییەكان لـە راسـتای نەهێـشتنی قەیرانی نێوخۆیی لە تاجیكستان، سەرەتا باس لەسـەر سیاسـەتی خۆهەڵقورتانـدنی رووسـیەو ئۆزبەكـستان، هـەروەها دامـەزرانـدنی هێزێكـی ئاشـتی پـارێز بـە مەبەسـتی سـەقامگیریو ئەمنییەتی گشتی لە ناوچەكەدا دەكەین. دوای هەرەسـهێنانی بـەرەی یەكیـەتیی سـۆڤییەت، هێزە نیزامییەكانی رووسی لە تاجیكستان مانەوەو بە شێوەی ڕەسمی هەڵوێستێكی بێلایـەنیان گرتەبەر. بەدوای سەركەوتنی كۆمۆنیستەكان لە شـاری دووشـەنبە و لـە دسـامبری ١٩٩٢دا، ئەوان بە ئاشكرا پشتیوانییان لە هێزەكانی لایەنگری كۆمۆنیـستەكان لـە سـەركوتی نەیارانـدا دەكرد، حكوومەتی تاجیك بە شێوەیەكی بەربڵاو چ لە رووی نیزامی و چ لە رووی ئابووریـیـەوە بەستراوە بە رووسیە. لە ژانوییەی ١٩٩٣دا، رووسیە، قەزاقـستان، قرقیزسـتان و ئۆزبەكـستان بەڵێنییاندا كە بەرگری لە سنوورەكانی باشووری تاجیكستان بكـەن و بـەم شـێوازە پـشتیوانی حكوومەت لە بەرگری كردن لە سنوورەكانی نێوان تاجیك و ئەفغان درێژەی كێشا.

لە كردەوەدا هێزەكانی رووسی بۆ راوەدوونانی شەڕوانانی ڕاپەڕیوو بەرگری لە سـنوورەكانی CIS چوونە ناو خاكی تاجیكستانەوە، هەتا بەم جۆرە پارێزگاری لە بەرژەوەندییەكانی مـسكۆ بكرێ. لە مانگی ئاگۆست، رووسیەو حكوومەتەكانی ئاسیای ناوەندی (جگە لە توركمەنستان) ڕێككەوتننامەیەكیان لەمـەڕ دامـەزرانـدنی هێزێكـی ئاشـتی پـارێز و كۆمەڵـەی سـەربەخۆی وڵاتانی هاوقازانج لە دەوروبەری سنوورەكانی تاجیكستان و ئەفغانستان واژۆ كرد. تـا كۆتـایی مانگی دسامبر، هێزێكی ٢٥ هەزاركەسی كە زۆرینەیان بریتی بوون لە یەكینـە نیزامییـەكانی سوپای رووسیە لەگەڵ سەربازەكانی ئۆزبەكستانو قرقیزستان، قەزاقستان، تاجیكستان ڕەوانەی ناوچەكە كران.

لەگەڵ تێوەگلانی رووسیە لە شەڕی نێوخۆیی تاجیكستان، ئەم وڵاتە لە هـەوڵی نێوبـژیوانی لەنێوان حكوومەت و ڕێبەری بەرهەڵستكاران لە تاراوگەدا بوو. لە نێوانی ساڵانی ٩٥ــ١٩٩٤

پێوەنییەکانی کاربەدەستانی رووسی و رێژیمی رەحمان ئۆف، بەهۆی ناڕازی بوون لە رێکاری رێژیمی تاجیك بۆ وتووێژی ئاشتی و ناکۆکییەکانی پێوەندیدار بە رەوشی یەکیەتیی دراو بەرەو ئاڵۆزی رۆیشت. بە هەرحاڵ رووسیە لە ساڵەکانی ١٩٩٦و ١٩٩٧ چەندین جار میواندارى وتووێژەکانی لەژێر چاودێری رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ هێنانە ئارای ئاشتی لە تاجیکستان سەرئەنجام واژۆی گرێبەستی ئاشتەوای لە ژووئەنی ١٩٩٧ی لە مسکۆی لێکەوتەوە. لە ئاوریلی ١٩٩٩دا رووسیەو تاجیکستان گرێبەستێکیان لەمەڕ دامەزراندنی پێگەیەکی نیزامی رووسیە لەتاجیکستاندا واژۆ کرد، هەر لەو مانگەدا ٩ رێککەوتننامەی دوولایەنە، لەوانە پەیمانی یەکیەتییو هاوکاری واژۆ کران.

رێبەرانی ئۆزبەکستان، بەردەوام نیگەرانی خۆیان لەمەڕ ئەگەری سەرنەکەوتنی گرووپە دێموکرات ـ ئیسلامییەکان لە شەڕی نێوخۆیی تاجیکستاندا دەربڕی و پاڵپشتی نیزامی و سیاسی خۆی بۆ رێژیمی رەحمان ئۆف راگەیاند. لە ئۆکتۆبری ١٩٩٤دا، تاجیکستان و ئۆزبەکستان گرێبەستێکی هاوکارییان بە مەبەستی هاوئاهەنگی زیاتر بەتایبەت لە بواری سیاسەتی دەرەوەو ئاسایشی دوو لایەنە واژۆ کرد.

بەهەرحاڵ، حکوومەتی تاجیکستان بە رواڵەت رەخنەی لە کردەوەی حکوومەتی تاجیکستان لە مەڕ کەمینەی ئۆزبەکی لەو وڵاتەدا دەگرت و دەیگوت کە پۆستگەلێکی زۆر لە ئۆزبەکییە خوجێییەکان لەلایەن کولابییەکانەوە قۆرخ کراوە. لەگەڵ لۆمەکردنەکانی کەریم ئۆف سەرۆك کۆماری ئۆزبەکستان لەمەڕ نەرمی نیشان نەدانی رێژیمی تاجیك لە وتووێژ لەگەڵ نەیاراندا، ئۆزبەکستان درێژەی بە هاوکاری نیزامیو تەکنیکی بەرچاو بۆ بەرپرسانی تاجیك دا. بەدوای واژۆی رێککەوتننامەی ئاشتی لە ژووئەنی ١٩٩٧دا، رێبەرانی ئۆزبەکستان نیگەرانی دووبارەی خۆی لەمەڕ ئیسلامی کردنی تاجیکستان دەربڕی. پێوەندییەکانی دوو وڵات تا رادەیەك لە ساڵی ١٩٩٨دا، کە حکوومەتی تاجیك بەردەوام ئۆزبەکستانی بە دنەدانی راپەڕیوان لە تاجیکستان تاوانبار دەکرد، بەرەو ئاڵۆزی رۆیشت.

ئەم جۆرە تۆمەتانە بەتوندی لەلایەن ئۆزبەکییەکانەوە رەت دەکرایەوە. لە ئاگۆستی ١٩٩٩وە، کاتێك هێرش کرایە سەر باشووری تاجیکستان لەلایەن چەند فڕۆکەیەکی نەناسراو بۆ پاشەکشەکردن بە گرووپە ئیسلامگەراکان کە لە ناوچەی ئووشەوە هاتبوون بە پاڵپشتی قرقیزستان، کە دواتر تاجیکستان قامکی بۆ لای ئوزبەکستان راداشت، ناکۆکییەکان دەستی



پێکرد (لە بەرانبەردا رێژیمی ئۆزبەك دانی بەوەدا نا کە رەنگە هێزەکانی بە هەڵە کەوشەنی تاجیکستانی بۆردوومان کردووە). لە ئۆکتۆبردا نزیکەی هەزار دژبەری حکوومەتی ئۆزبەکستان لە قرقیزستانەوە چوونە ناو تاجیکستان کە بەهۆی یاساغ کرانی چالاکی لایەنگرانی ئیسلامگەرا لەلایەن بەرپرسانی ئۆزبەکییەوە. هەبوونی شەڕوانە ئیسلامییەکان پێوەندییەکانی تاجیك و ئۆزبەکی ئاڵۆزتر کرد. بە هەرحاڵ، حکوومەتی تاجیك داوای لە شەڕوانان کرد خاکی وڵاتەکەی بە جێ بهێڵن، هەر بۆیە زۆربەی شەڕوانەکان لە مانگی نوامبردا خاکی تاجیکستانیان بەجێهێشت. لە ئاوریلی ساڵی ٢٠٠٠دا، حکوومەتەکانی قرقیزستان و ئۆزبەکستان، بە توندی رەخنەیان لە حکوومەتی تاجیکستان گرت بەهۆی خۆبواردن لە دەرکردنی رێبەری یاخی بووان کە بانگەشەی ئەوە دەکرا پێگەیەکی هەمیشەیی لە تاجیکستان دەمەزراندووە. هێرشی چەکدارانە بۆ ناو خاکی دوو وڵات لەلایەن هێزە راپەڕیوەکان لە مانگی ئاگۆست دەستیپێکردەوە. لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٠ کەفوکۆڵی تەنگژەکان نیشتەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا، تێکهەڵچوونە توندوتیژەکان درێژەی هەبوو. لە مانگی مارسی ٢٠٠١دا لە وەڵامی بانگەشەی رێژیمی قرقیزستان لەسەر ئەوە کە تاجیکستان داڵدەی ٢٥٠٠ تیرۆریستی نێونەتەوەیی داوە، حکوومەتی تاجیك رایگەیاند کە لە وڵاتەکەی هیچ ئەندامێکی یاخیبووی سەر بە هیچ کام لە رێکخراوەکان، لە ناوچەی ژێردەسەڵاتی ئەودا نییەو بانگهێشتنی لە حکوومەتی قرقیزستان کرد کە بۆ دڵنیا بوون سنوورەکانی بە سەربکاتەوە. لەم کاتەدا لە نێوان ساڵی ٢٠٠٠دا ئۆزبەکستان سنوورەکانی خۆی لەگەڵ تاجیکستانی مین رێژ کردبوو، لە هەوڵێك کە بۆ پێشگیری لە دزەنەکردنی یاخییەکانی هێرشبەری ئیسلامی، دابووی، تاجیکستانی لە کردەوەکانی خۆی لە مانگی مای ٢٠٠١ ئاگادار کردبوو. لە کۆتایی مانگ بەرپرسێکی فەرمی سنوور، ئۆزبەکستانی بە پێشێل کردنی رێوشوێنە نێونەتەوەییەکان کە بە درێژایی سنووری ناوچە سنوورییە کوێستانییەکانی تاجیك ـ ئۆزبەك مین رێژ کردبوو تاوانبار کرد. هەروەها بینرا تاکو ئەو کاتە، گشت زیان لێ کەوتووان هاووڵاتی ئۆزبەکی و تاجیکی بوون.

بەهەرحاڵ لەگەڵ بوونی ئەم ئاڵۆزییانەش، کەمبوونی رێژەی هێرشە تیرۆریستییەکان پێوەندییەکانی هەردوو وڵاتی تا کۆتایی ٢٠٠١دا بەرەو باشی برد. سەرۆك رەحمان ئۆف لە مانگی دسامبر چاوی بە ئیسلام کەریم ئۆف سەرۆك کۆماری ئۆزبەك کەوت، لەگەڵ ئەوەی کە

هیچ چەشنە ڕێکەوتننامەیەکی سنووری نەهاتە ئاراوە، راگەیەندرا کە هاتوچۆی خەڵکی ناوچەی پەنجاکەنتی تاجیکستان و ناوچەی سەمەرقەندی ئۆزبەکستان دەبێ بکرێتەوە. هەروەها هەردوو سەرکردەکە کە بۆ هاوئاهەنگی لەپێناو خەبات دژی تیرۆرریزم، تاوان و قاچاخی ماددە سڕکەرەکان ڕێککەوتن. لە فیەوریيەی ٢٠٠٢، لە چاوپێکەوتنەکانی نێوان سەرۆك وەزیرانی تاجیکستان و ئۆزبەکستاندا، ڕێکەوتننامەیەکی ڕواڵەتی هاتوچۆی سنووری واژۆ کرا. بە هەرحاڵ هەواڵەکان لەمەڕ دامەزاندنی بەربەست گەلێك لە سەرەتای ٢٠٠٢ەوە لەلایەن هێزی تایبەتی سنووری ئۆزبەك بۆ هێنان و ناردنی شت و مەك و خەڵك درێژەی هەبوو. لە کاتێکدا دزەکردنی کۆمەڵێکی زۆر دەوو دەرمانی نایاسایی لە تاجیکستانەوە هەڕەشەی لە پێوەندییە سنوورییەکانی تاجیك و ئۆزبەکی دەکرد.

تاجیکستان پێش داڕمانی یەکیەتیی سۆڤییەت بە سەرنجدان بە خاڵە هاوبەشە مێژووییەکانی دەستی بە فراوانکردنی پێوەندییە دەرەکییەکانی لەگەڵ ئێراندا کرد. بەڵام لاوازبوونی دەسەڵاتی ناوەندی تاجیکستان لەساڵی ١٩٩٢ بە توندی بووە هۆی بەربەست لە بەردەم گەشەسەندنی پێوەندییە دەرەکییەکان. گرووپە دژە ئیسلامییەکان لەتاجیکستاندا بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئێران چەك و تەقەمەنی نیزامیو کەرەستە بۆ گرووپە ئیسلامییەکان لە تاجیکستان بەرهەڤ دەکا. بەڵام ئەم بانگەشەیە لەلایەن بەرپرسانی حکوومی ئێرانەوە کە تەنیا دانیان بە بەرهەڤ کردنی یارمەتی مرۆییو کولتووری دەکرد، ڕەت کرایەوە. لە جوولای ١٩٩٥و لە کۆتایی ١٩٩٦دا، سەرۆك کۆمار رەحمان ئۆف لە چاوپێکەوتنێکی لە تاراندا کۆمەڵێك گرێبەستی کولتووری و ئابووری و بەرگری واژۆ کرد. وتووێژەکانی ئاشتی بە سەرۆکایەتی ڕێکخراوی نەتەوەکان لەنێوان ڕێژیمی تاجیك و نوێنەرارنی بەرهەڵستکاران لە ساڵەکانی ١٩٩٦و ١٩٩٧ لە تاران درێژەی هەبوو. لە ئاوریلی ٢٠٠٢ تاجیکستان و ئێران ٩پرۆتۆکۆلیان لە بوارەکانی هاوکاری سیاسی، ئابووری و کاروباری کۆمەڵایەتی واژۆ کرد.

پێوەندییەکان لەگەڵ ئەفغانستاندا بەهۆی بێتوانایی ڕێژیمی ئەفغانستان بۆ پێشگیری لە هاتنی شەڕوانەکانی موجاهدینو ناردنی چەك و چۆڵ لە ڕێگای سنوورەکانی ئەفغانستانەوە بۆ نێو خاکی تاجیکستان ئاڵۆزتر کرد. حکوومەتی ئەفغانستان نکۆڵی لە هەر چەشنە بەشدارییەك لە قاچاخی چەکی دەکرد. ئەگەری ئەوە هەبوو کە چاوگی ناردنی چەك و تەقەمەنی نیزامی هی ڕێبەری موجاهیدینی یاخیبووی، حکمەتیار بووبێت کە لەو سەردەمەدا لە حکوومەتی



ئەفغانستان بەرپرسایەتی نەبووە. لە ئاوریلی ساڵی ١٩٩٣، ڕێژیمی تاجیکستان ناڕەزایەتی خۆی لەمەڕ بەرپرسانی ئەفغانی کە بانگەشەی ئەوە دەکرا ئەفغانییەکان هێڵی سنووری ئەفغانستانیان بەزاندووە و دەگوترێ کە یارمەتیو هاسانکاری بۆ پاشماوەکانی یاخی بووەکان دەکەن، دەربڕی. لە دێسامبردا بورهان ئەلدین ڕەبانی، سەرۆك کۆماری ئەفغانستان بە شێوەی ڕەسمی سەردانی تاجیکستانی کرد کە واژۆی گرێبەستی دۆستایەتیو هاوکاری دوو لایەنە، هەروەها ڕێکەوتننامەی هاوکاری ئابووری و ئاسایشی سنووری لێکەوتەوە. بە هەرحاڵ، ڕەبانی توانای کۆنتڕۆڵی باڵەکانی پشتیوانی ڕاپەڕیوە تاجیکییەکانی نەبووو بەزاندنی سنوورەکان هەر درێژەی هەبوو. لە ئاوریلی ١٩٩٠ ئەفغانستان بە توندی ناڕەزایەتی خۆی دژی لێدوانەکانی رووسیە لەمەر بوونێ پێگەی یاخیبووان لە ئەفغانستان دەربڕی. بە هۆی درێژەی تەنگژەکان، لەنێوان حکوومەتی تاجیك ١٩٩٦بە شێوەی کاتی لە دژکردەوەی داڵدەدانی ئەفغانییەکان لە هێزە بەرهەڵستکارەکان، سنووری لەگەڵ ئەفغانستانی داخست. سەرکەوتنی گشت لایەنەی هێزەکانی تاڵیبان لە ئەفغانستان لەو ساڵەدا، هەڕەشەی لە ڕەوشی رووخێنەرانەی ناسەقامگیری تاجیکستانی دەکرد. بەردەوام تاڵیبان لە باکووری ئەفغانستان پێگەی پتەوتر دەبوو، نیگەرانییەکی لە ڕادەبەدەر لە تاجیکستان و وڵاتانی دراوسێ، لەمەڕ شاڵاویی کۆچکردن بۆ ئەم وڵاتانە هاتە ئاراوە. لە جوولای ١٩٩٨، هاوکات لەگەڵ شەڕێکی قورس کە لە نزیك سنوورەکانی تاجیکستان و ئەفغانستان ڕوویدا، یەکانە نیزامییەکانی رووسی هێزێکی بێ شماریان لە سنوورەکانیان مۆڵدا. سەرلەنوێ ئۆپەراسیۆنی هێرشبەرانە لەلایەن تاڵیبان لە جولای ١٩٩٩، وای لە ڕەحمان ئۆف سەرۆك کۆمار کرد کە خوازیاری چڕترکردنی پاراستنی سنوورەکانی باشووری تاجیکستان بێت.

لە کاتێکدا شەڕ لە ئەفغانستان لە کۆتایی سپتامبری ٢٠٠٠ توندتر بوو، ڕێژیمی تاجیکستان بە شێوەیەکی کەم وێنە نیگەرانی خۆی لەمەڕ ویشکەساڵی شیمانەکراو، کە کۆمەڵێك لە پەنابەرانی لە پارێزگاکانی باشووری دەخستە ژێر باندۆری خۆیەوە دەربڕی و سنوورەکانی خۆی لەگەڵ ئەو وڵاتە داخست. لە کۆتایی نوامبر، پتر لە دەهەزار پەنابەری ئەفغانی لە دوورگە زەلکاوەکانی رووباری پیانج لە مەزری تاجیك ـ ئەفغان وەیلان ببوون. شەڕێکی قورس لە سەرەتای دسامبر لە نێوان سنوورپارێزانی رووسیەو هێزە ئەفغانییەکان هاتە ئاراوە.

ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان پێشنیاری بە تاجیکستان کرد کە ڕێ بە پەناخوازان بدا. بەهەرحاڵ، لە سەرەتای ژانوییەی ٢٠٠١، سەرۆك کۆمار ڕەحمان ئۆف ڕایگەیاند کە تاجیکستان ڕێ بە ئەفغانییە ئاوارەکان نادا، چونکە لەنێو ئەم پەنابەرانە ئەندامانی گرووپە شەڕوانەکانی تێدایە. بەدوای هێرشی تیرۆریستی هەمەلایەنە لە ١١ی سێپتامبری ٢٠٠١ بۆ سەر ئەمریکا، کە ئوسامە بن لادن، بناژۆخوازی ئیسلامی لەدایك بووی عەرەبستانی سعوودی و ڕێکخراوی ئەلقاعیدەی لێ بەرپرسیار کرا، یەکانە نیزامییەکانی سوپای ڕووسیە بە درێژایی سنووری تاجیك ـ ئەفغان بە نیشانەی هەڕەشە، لەدوای گرتنەبەری هێرشی نیزامی دژی ئەفغانستان لەلایەن ئەمریکاو هاوپەیمانانی، نیشتەجێ کران. سەرەتای دژکردەوەی تاجیکستان لەمەڕ خەباتی جیهانی دژی تیرۆریزم بە ڕێبەری ئەمریکا بە پارێزەوە بوو. لەگەڵ ئەوەی کە "ڕەحمان ئۆف" تامەزرۆیی خۆی بۆ لای هاوکاری لەگەڵ ئەمریکا دەربڕیبوو، وردەکارییەکان لەمەڕ ئەو هاوکارییانە کە چاوەڕوان دەکرا، جێبەجێ بێ، بڵاوکرایەوە. لە نیوەی دووهەمی سێپتامبر، هەواڵی هاتنی هێزەکانی ئەمریکا لە ڕاگەیەنە جۆراوجۆرەکان بۆ تاجیکستان بڵاوکرایەوە.

لە سەرەتای نوامبر، تاجیکستان ئیزنی کەڵك وەرگرتنی سێ شوێنگەی ئاسمانی خۆی بە ئەمریکاو سەربازەکانی ناتۆ دا. ڕێژیمی تاجیك نیگەرانی خۆی لەوە دەربڕی کە شاڵاوی پەناخوازان هەستی ئیسلام گەراکان لەم وڵاتە دەبووژێنێتەوە. بەم جۆرە سنووری تاجیك ـ ئەفغان، هاتوچۆی تێدا یاساغ کرا، ئەگەرچی پەنابەران سەرکەوتوو بوون بە شێوەی نایاسایی سنوور ببەزێنن. سەرکەوتنی هێزە فرە ڕەگەزەکان لە مانگی نوامبر، لە مەڕ ڕووخاندنی ڕێژیمی تاڵیبان گوشارەکانی سەر تاجیکستان بۆ ڕێگەدان بە پەناخوازانی ئەفغانی بۆ ئەم وڵاتە کەم بۆوە. هەروەها مەرگی ڕێبەری بزووتنەوەی بناژۆخوازی ئیسلامی ئۆزبەکستان "جومعە نەمنگانی" لە مانگی نوامبردا فاکتۆرێکە بۆ کەم بوونەوەی مەترسی بووژانەوەی بناژۆخوازی ئیسلامی لە تاجیکستان. بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە تەڤگەری بناژۆخوازی ئیسلامی ئۆزبەکستان چالاك مایەوەو لە ساڵی ٢٠٠٠، هەواڵەکان لەسەر پشتیوانی لە "حیزبی ئەلتەحریر" گەشەی دەسەند. سەرەڕای ئەوەش، قاچاخی ماددەی هۆشبەرەکان لە ئەفغانستانەوە بۆ تاجیکستان نیشانەی بوونی کێشەیەکی گەورەیە، هەرچەند حکوومەتی کاتی ئەفغانستان بۆ کۆنترۆڵ کردنی بەرهەمهێنانی ماددە هۆشبەرەکان هەوڵی زۆری دا.



هەروەها لە مانگی ئاوریل، گەڕانەوەی ئاوارە ئەفغانییەکانی نیشتەجێی سنووری تاجیك ـ ئەفغان دەستیپێکرد. تا کۆتایی مانگ، نزیکەی نۆهەزار لەو کەسانەی کە ئاوارە ببوون، گەڕانەوە بۆ شوێنی نیشتەجێی خۆیان لە ئەفغانستان.

لە مارسی ٢٠٠٠دا، مەشقی هێزەکانی سوپای یەکگرتوو، وەك بەشێك لە ئۆپەراسیۆنی هاوپەیمانان بۆ خەبات دژی تیرۆریزمی نێونەتەوەیی لە ناوچەکە لەلایەن وڵاتانی قەزاقستان، قرقیزستان، تاجیکستان، ئۆزبەکستان و ڕووسیە لە باشووری تاجیکستان دەستیپێکرد. لە مانگی مای ساڵی ٢٠٠١دا، وڵاتانی واژوکاری پەیمانی تەناهی کۆمەڵایەتی: ئەرمەنستان، بێلەڕووس، قەزاقستان، قرقیزستان، ڕووسیەو تاجیکستان، هێزێکی پڕچەکداری خێرایان بۆ خەبات دژی ئیسلامگەراکان لە ئاسیای ناڤیندا پێکهێنا. لە ژانوییەی ٢٠٠٢دا، ڕاگەیەندرا کە ئەم هێزە بۆ ئەنجامدانی هەرچەشنە بڕیارێك ئامادەن. کۆمەڵەی ئابووری ئاسیای ناڤین کە تاجیکستان لە مارسی ١٩٩٨ پێوەستی ببوو، لەلایەن ڕێکخراوی هاوکاری ئاسیای ناوەندی هەڵوەشایەوە. ئەم ڕێکخراوە بۆ ڕێکخستنی هەوڵی دژی تیرۆریستییەکانو، هەروەها بۆ درێژەی هاوکارییە ئابووریو سیاسییەکان پێکهات. لە میانەی دەیەی ١٩٩٠، تاجیکستان بەدوای پەرەپێدانی پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی ئاسیایی بەتایبەتی کۆماری گەلی چیندا بوو. لە ئاوریلی ١٩٩٦دا تاجیکستان هاوکات لەگەڵ ڕووسیە، قەزاقستان و قرقیزستان، ڕێکەوتننامەیەکی بەربڵاوی سنووریان لەگەڵ چین واژۆ کرد. ئەم ڕێکەوتننامەیە زێدە بوو بە واژۆکردنی گرێبەستێکی سنووری لە ئاگۆستی ١٩٩٩و ژانوییەی ٢٠٠٢دا. تاجیکستان گرێبەستێکی دیکەی بۆ چارەسەرکردنی پرسەکانی جێگای مشت و مڕی پێوەندیدار بە سنووری هاوبەشی دوو وڵاتەوە لە تەنیشت "گۆڕنۆی بەدەخشان"، لەگەڵ وڵاتی چیندا واژۆ کرد.

هەروەها لە ئاوریلی ١٩٩٧دا ڕێکەوتنێکی شاراوەی سەربازی واژۆ کرا. لە ژووئیەی ٢٠٠٠، "کۆبوونەوەی شانگهای"( چین، قەزاقستان، قرقیزستان، تاجیکستانو ڕووسیە) لە شاری دووشەنبە بەڕێوەچوو، ئامانج لەم کوبوونەوەیە دامەزراندنی سنوورێکی یەکگرتووی دژی تیرۆریستی بە مەبەستی بەربەرەکانێ لەگەڵ هێرشە چاوەڕوان نەکراوەکانی سنووری لەلایەن میلیشیا ئیسلام گەراکان و قاچاخچیانی ماددە هۆشبەرەکان بوو.

لەنێوان ساڵی ٢٠٠١ هەر کە ئۆزبەکستان بوو بە ئەندامی ڕێکخراوی هاوکاری شانگهای، گرێبەستی نێوان وڵاتان بەنێوی "گرێبەستی شانگهای بۆ خەبات دژی تیرۆریزم، جیایی خوازیو

توندئاژۆیی" واژۆ کران. لە کۆبوونەوەیەکی نائاسایی و چاوەڕواننەکراو لە مانگی ئۆکتۆبردا، ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە ڕەزامەندی خۆیان بۆ دامەزراندنی ناوەندێکی دژە تیرۆریستی دەربڕی.

لە ژانوییەی ٢٠٠٢دا ڕاگەیەندرا کە لە ئاکامی هاوکاری نزیکی تاجیکستان لەگەڵ هاوپەیمانان بە ڕێبەری ئەمریکا بە دژی تیرۆریزمی جیهانی، ئەو ئابلۆقەیەی کە لە ساڵی ١٩٩٣ لەلایەن ئەمریکاوە لەمەڕ گواستنەوەی کەرەستەی بەرگری بۆ تاجیکستان سەپابوو، هەڵوەشاوەتەوە. تاجیکستان لە فیەوریەی ٢٠٠٢ بۆ بەشداری لە هاوکاری نیزامی بە مەبەستی گەیشتن بە ئاشتی تێکەڵ بە ناتۆ بوو[1].

### (٣ـ٥) یاسای بنەڕەتی

یاسای سەرەکی تاجیکستان لە ٦ی نوامبری ١٩٩٤ خرایە بەردەم ڕاپرسی گشتییەوەو دواتر پەسند کرا. یاسای بنچینەیی ئەم کۆمارە پێکهاتووە لە پێشەکییەک، دە پاژو سەد مادە. بەپێی ماددەی ١٠، ئەم یاسایە ڕەوایی تەواوی هەیە، پەسندکراوەکانی کارکردیی ڕاستەوخۆیان هەیەو ڕێساو بەڵگەکانی یاسایی ئەگەر بە پێچەوانەی یاسای بنەڕەتی بێ، بەهای خۆیان لەدەست دەدەن. هەڵبەت ئەگەر یاساکانی کۆماری تاجیکستان لەگەڵ جاڕنامەی یاسایی نێونەتەوەیی کە بەشی تەواوکەری سیستمی یاسایی ئەم کۆمارە پێکدێنێ، یەکنەگرێتەوە، کەڵک لە دیکۆمێنتە نێونەتەوەییەکان دەگیرێ.

بە گوێرەی ماددەی یەکەمی ئەم یاسا بنەڕەتییە، وڵاتی تاجیکستان خاوەنی دەسەڵاتێکی گەلی و دێموکراتیکەو سیستمی سیاسی ئەم وڵاتە کۆماری، سیکۆلارو یەک پارچەیە. لە ماددەی پێنجەم، مافی بەرابەری هەموو شارۆمەندان و ئازادی بۆ تاک و مافە کۆمەڵایەتییەکانیان بەبێ سەرنج دان بە ڕەگەز، زمان، ڕەچەڵەک و ئایینیان لەلایەن حکوومەتەوە گەرانتی کراوەو بە گوێرەی ماددەی چوارەم، دەستێوەردانی حکوومەت تەنیا بە مەبەستی دابینکرانی ماف و ئازادییەکانی خەڵک، پارێزگاری لە یاسای سەرەکی‌و یەکیەتیی خاک مۆڵەتی پێ دراوە. ماددەی حەوتیش باس لە پێکهاتەی ئیداری کۆماری یاسا دەکا، کە داگری پارێزگاکان، شارەکان، هەرێمەکان و گوندەکان، هەروەها پارێزگای کوێستانی خودموختاری بەدەخشانە.

(1) The Europe World Year Book 2002, PP. 3841 – 3853



لە ماددەی شەش یاسای بنەڕەتی تاجیکستانیش تەنیا ئاخێزگەی دەسەڵاتی حکوومی‌و ڕەوایی سیاسی خەڵکە و قۆرخ کردنی دەسەڵات بە گەورەترین تاوان بە ئەژمار دێ، هەربۆیە هیچ تاک یان گرووپێک نابێ دەسەڵات بۆ خۆی پاوان بکا. لەم ماددەیەدا تەنیا دەرفەت دراوە بە سەرۆک کۆمارو نوێنەرانی پارلمانی باڵا کە نوێنەرایەتی هەموو پێکهاتەی وڵات بکەن، بەپێی ماددەی نۆیەمیش دەسەڵات و فەرمانڕەوایی سیاسی وڵات لەنێوان سێ دەسەڵاتی یاسادانەر، بەڕێوەبەرو دادوەر دابەشکراوە بەم شێوازە بناغەی جیایی هێز لە یاسای بنەڕەتی تاجیکستان لە بەرچاو گیراوە. پارلمانی کۆماری تاجیکستان لە ڕێکەوتی ١٠ی دسامبری ١٩٩٩ کرا بە دوو ئەنجوومەن کە بریتییە لەئەنجوومەنی سەفلی (نوێنەران)و ئەنجوومەنی باڵا (نەتەوەیی). یەکەمین هەڵبژاردنی فرە حیزبی تاجیکستان بۆ دیاریکردنی نوێنەرانی هەردوو ئەنجومەن لە ٢٧ی فیەوریەو ٢٣ی مارسی ٢٠٠٠ بەڕێوەچوو. هەڵبەت تاکو پێش ئەم ڕێکەوتە تاجیکستان خاوەنی پارلمانێک بەناوی پارلمانی باڵا (نەتەوەیی) بوو. پارلمانی باڵا یان نەتەوەیی ئەم وڵاتە خاوەنی ٣٣ نوێنەرە کە ٨ کەس لەوانە بە شێوەی ڕاستەوخۆ لەلایەن سەرۆک کۆمارەوە دەستنیشان دەکرێن و ئەندامەکانی دیکە لەلایەن ئەنجوومەنە هەرێمییەکانەوە هەڵدەبژێردرێن.

پارلمانی نەتەوەیی تاجیکستان پارلمانێکی هەمیشەیی نییەو لە ساڵدا لانیکەم دوو جار کۆبوونەوە پێکدێنێ. ئەم پارلمانە لە ڕەوتی یاسادانان ڕۆڵی گرینگ دەگێڕێ. بە گوێرەی یاسای بنەڕەتی نوێی تاجیکستان لە کاتی مردن، یان دەست لە کارکێشانەوە یان لابردنی سەرۆک کۆماری ئەم وڵاتە، سەرۆکی پارلمانی باڵای نەتەوەیی تا کاتی هەڵبژاردنی داهاتوو جێنشینی ئەو دەبێ.

ئەنجوومەنی نوێنەرانی تاجیکستانیش خاوەنی ٦٣ نوێنەرە کە ٤١ کەس لەلایەن خەڵک و ٢٢ کەسی دیکەیان لە لیستی حیزبەکان هەڵدەبژێردرێن[1]و بەپێی ماددەی ٤٨ی یاسای بنەڕەتی، ئەم پارلمانە بەرزترین سەرچاوەی نوێنەرایەتی‌و دەزگای سەرەکی یاسادانەری تاجیکستان بە ئەژمار دێ. نوێنەرانی ئەم پارلمانە بە دەنگی ڕاستەوخۆی خەڵک و بۆ ماوەی ٥ ساڵ هەڵدەبژێردرێن. بەپێی یاسای بنەڕەتی ئەو هاووڵاتییانەی لانیکەم ٢٥ ساڵ تەمەنی

(١) ئیلاهەی کولایی، یاسا بنەڕەتییەکانی ڕووسیەو کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاست، (تاران، بڵاوکراوەی دادگوستەر، ١٣٧٧)، لاپەڕەکانی ١٠٤ ـ ٨٥

هەبێ، دەتوانن خۆیان بۆ ئەم پارلمانە بەربژێر بکەن. سەرۆکی پارلمان بە زۆرینەی دەنگ و دەنگی شاراوەی نوێنەران دەستنیشان دەکرێ. سەرۆکی پارلمان جێگرێکی سەرەکیو چەندین جێگری دیکەی هەیە کە لە کاتی نەبوونی سەرۆکی پارلمان ئەرکەکانی ئەو رادەپەڕێنێ. لەم نێوەدا دەبێ یەکێك لە جێگرەکانی سەرۆکی پارلمانی نوێنەران سەر بە پارێزگای خودموختاری بەدەخشان بێ. ماددەی پەنجاونۆ پارێزراویی نوێنەرانی پارلمانی لەبەرچاو گرتووە. پارلمان ونوێنەران دەسەڵاتێکی بەرفراوانی هەیە، لەوانە: دانان و پەسند کردنی یاساکان، بەڕێوەبردنی ریفراندۆم و هەڵبژاردنی دادوەرانی دادگای باڵا، سەرۆك کۆماریش وەك نوێنەری فەرمی وڵات، هەروەها گشت ئەندامانی کابینەی ئەو دەبێ لەلایەن پارلمانی نوێنەرانەوە پەسند بکرێن. کاندیداکانی دادگای باڵایش لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە بە پارلمان پێشنیار دەکرێ، هەروەها دیاریکردنی نێوەڕۆکی گەڵاڵە ئابوورییەکانیش دەبێ پارلمانی پەسندی بکا.

به گوێرەی یاسای نوێی هەڵبژاردنی تاجیکستان ٢٢ کورسی لە ٦٣ کورسی پارلمانی نوێنەرانی ئەم وڵاتە بەشی حیزبەکانەو ئەو شەش حیزبەی کە مافی بەشداری لە هەڵبژاردنی پارلمانی نوێنەرانیان هەیە، دەتوانن لیستەیەکی ٢٢ کەسی لە بەربژاردەکانی خۆیان پێشکەش بە کۆمیسیۆنی ناوەندی هەڵبژاردنەکان بکەن. هەرکام لەو حیزبانە بۆ بەدەستهێنانی کورسییەك لە پارلمان دەبێ لانیکەم ٥ لە سەدی دەنگی خەڵکی تاجیکستان لە هەڵبژاردنەکانی حیزبی بەدەستبێنن و بەم جۆرە ٢٢ کورسی ئاماژەپێکراو بە بەراوردی ئەو دەنگانەی کە حیزبەکان بە دەستیدێنن دابەشدەکرێن. هەڵبەت یاساکانی تاجیکستان دەبێ لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە واژو بکرێن کە ئەگەر ئەو رەزامەندی لەسەر یاساکە نەبێ لە ماوەی ١٥ رۆژ بە بەڵگەی بەهێزەوە بۆ پارلمانی باڵای دەگەڕێتەوە، ئەگەر پارلمانی باڵا یاسای پەسندکراو جارێکی دیکە بە لانیکەم ٢ لە ٣ی دەنگەکان پەسند بکا، سەرۆك کۆمار ئەرکە لەسەری واژۆی بکا. دەبێ بیلێین کە ئەگەر سەرۆك کۆمار لەکاتی دیاریکراو یاساکە نەگەڕێنێتەوە، ئەرکە لەسەری واژۆکردنی جێبەجێ بکا.

دەسەڵاتی دادوەری تاجیکستانیش بەپێی یاسای بنەڕەتی سەربەخۆیەو چەندین دادگا لەخۆی دەگرێ. لە فەسڵی هەشتەمی یاسای بنەڕەتی تاجیکستان دەسەڵات و ئەرکی دادگاکانی ئەم وڵاتە پێناسە کراوە کە بریتییە لە: دادگای یاسای بنەڕەتی، دادگای باڵا، دادگای باڵای ئابووری، دادگای نیزامی، هەروەها دادگای پارێزگای کوێستانی خودموختاری بەدەخشان، هەروەها دادگای پارێزگاکان، شاری دووشەنبەو شارەکان و ناوچەکان.



لە ماددەی ٨٤ خولی بەڕێوەبەری دادوەرەکان ٥ ساڵ دەستنیشان کراوە. بە گوێرەی ماددەی ٨٥، ئەو هاووڵاتیانەی کە تەمەنیان لەنێوان ٣٥ تا ٦٠ ساڵ بێو لانیکم ٥ ساڵ پێشینەی کاری دادوەرییان هەبێ دەتوانن وەك دادوەری دادگای باڵا، دادگای نیزامی، دادگای پارێزگاکان و شاری دووشەنبە هەڵدەبژێردرێن و کەسانێك کە تەمەنیان لەنێوان ٢٥ تا ٦٠ ساڵدا بێ و لانیکەم سێ ساڵ ئەزموونی دادوەریان هەبێ دەتوانن وەك دادوەری شارەکان و ناوچەکان هەڵبژێردرێن.

دانان و لابردنی دادوەری ئەم دادگایانەش لەلایەن سەرۆك کۆمارەوەو بە پێشنیاری وەزیری دادوەرییەوە دێتە ئاراوە. لەم نێوەدا دادگای یاسای بنەڕەتی لە ٧ کەس پێکدێ کە یەکێك لەوانە نوێنەری ناوچەی خودموختاری بەدەخشانە. دادوەرانی ئەم دادگایە لەنێو مافزانان دیاری دەکرێن کە کەمتر لە ٣٠ ساڵ و زیاتر لە ٦٠ ساڵ تەمەنیان نەبێو پتر لە ١٠ ساڵ ئەزموونی کاری دادوەرییان هەبێ. دادوەری دادگاکان مافی ئەوەیان نییە ئەرکی حکوومی وەئەستۆ بگرن یان بەدوای پرسە سیاسییەکانەوە بن(ماددەی ٩٠).

پارێزراویی دادوەریش لە ماددەی ٩١ ئاماژەی پێکراوە, لە بەشی نۆیەمی یاسای بنەڕەتیش، دەسەڵات و ئەرکەکانی دادوەری گشتی باسی لەسەر کراوەو سەربەخۆیی کاری گەرانتی کراوە. دادوەری گشتی لەلای پارلمانی باڵاو سەرۆك کۆمار بەرپرسایەتی هەیە کە بۆ ماوەی ٥ سالە دیاری دەکرێ. بەپێی ماددەی ٩٣، دادوەری گشتیو دادوەرەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو کۆنترۆڵ و چاوێری بەسەر جێبەجێکردنی وردو یەکسانی یاساکان لە سەرانسەری تاجیکستانیان وەئەستۆیە. دادوەرەکان مافی ئەندامەتی لە حیزب یان رێکخراوی سیاسیيان نییەو ناتوانن پیشەیەکی دیکەیان هەبێ، یان سەرقاڵی چالاکی ئابووری بن.

فەسڵی پێنجی یاسای سەرەکی تاجیکستانیش تەرخانکراوە بە حکوومەت و دەسەڵاتی بەڕێوەبەری. دەسەڵاتی بەڕێوەبەری حکوومەتی کۆماری تاجیکستان بریتین لە: سەرۆك وەزیر، جێگری یەکەمی سەرۆك وەزیران، جێگرەکانی دیکە، وەزیرەکان و بەرپرسانی سەرجەم دەزگا حکوومییەکان. لەم نێوەدا سەرۆك کۆماری تاجیکستان بەرپرسایەتی حکوومەت و دەسەڵاتی بەڕێوەبەری وەئەستۆیە. ناوبراو بە شێوەی راستەوخۆ لەسەر بناغەی دەنگدانی گشتی بۆ ماوەی حەوت ساڵ دەستنیشان دەکرێ. پاڵێوراوی دیاریکراو دەبێ پتر لە نیوەی دەنگەکان بەدەست بێنێ تاکو بتوانێ بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری خۆی بپاڵێوێ. بە گوێرەی ماددەی ٦٨ی یاسای بنچینەیی، سەرۆك کۆمار مافی ئەنجامدانی چالاکی دیکەی نییە. لە ماددەی ٧٢یشدا، جەخت

لەسەر پارێزراویی سەرۆك كۆماری كراوە بەڵام لەكاتی لەژێرپێنانی بەڵێنیەكانی و ئەنجامدانی تاوان، پارلمانی باڵا دەتوانێ بە سەرنجدان بە لێكولینەوەكانی دادگای یاسای بنەڕەتیو كۆمیسیۆنی تایبەتی پارلمانی باڵاو بە پشتیوانی ٢ لە ٣ی نوێنەران، سەرۆك كۆمار لەسەر كار لابەن. هەڵبەت پرسی لەژێر پێنانی سوێندو ئەنجامدانی تاوان لەلایەن سەرۆك كۆمار دەبێ لانیكەم لە لایەن ١ لە ٣ی نوێنەران باس بێتە گۆڕێ تاكو لێكۆڵینەوە لەسەر تاوانەكانی بكرێ. لە دواییدا بەپێی ماددەی ٧١ی یاسای بنەڕەتی، لەكاتی مردن یان دەست لەكاركێشانەوە یان لابردن و ئەستاندنەوەی دەسەڵاتی سەرۆك كۆماری تاكو هەڵبژاردنی سەرۆك كۆمارێكی نوێ، ئەرك و بەرپرسایەتییەكانی دەكەوێتە سەر شانی سەرۆكی پارلمانە باڵا. لەم كاتەدا ئەركەكانی سەرۆكی پارلمانی باڵاش دەكەوێتە ئەستۆی جێگری یەكەمی. پاشان لە ماوی ٣ مانگدا دەبێ هەڵبژاردنی سەرۆك كۆماری نوێ بەڕێوەبچێ.

ئەندامانی حكوومەت مافیان نییە ئەركێكی دیكە وەئەستۆ بگرن، یان سەرقاڵی كاروباری ئابووری بن. فەسڵی شەشی یاسای بنچینەیی تاجیكستان باس لە ڕێكخراوە ناوچەییەكان و ئیدارە هەرێمییەكان و بازنەی دەسەڵاتەكەیان دەكا. سەرۆكی بەشەكان لە بەرانبەر سەرۆك كۆماردا بەرپرسیارن (ماددەی ٧٨). بە گوێرەی ماددەی ٧٧یش، نوێنەرانی پارلمانی هەرێمییەكان بۆ ماوەیەكی پێنج ساڵە هەڵدەبژێردرێن. بۆ وێنە ئەركەكانی نوێنەرانی هەرێمەكان بەم شێوازەیە:

١ـ پەسندكردنی بوودجەی هەرێم و دانی راپۆرت لەو پێوەندییەدا، هەروەها تاوتوێ كردنی كەرەستەكانی گەشەی ئابووری ـ كۆمەڵایەتی هەرێمی.

٢ـ دیاریكردنی رادەی سەرانەو هەرێمی بەپێی یاسا.

٣ـ دیاریكردنی شێوازی ئیدارەكردنی سامانی گشتی بەپێی یاسا.

٤ـ پەسندكردنی بڕیارە یاساییەكان لە سنووری دەسەڵاتی خۆیان.

بەرپرسانی پارێزگای خودموختاری بەدەخشان، پارێزگاكان، شاری دووشەنبە، شارەكان و قەزاكان لەلایەن سەرۆك كۆمارەوە دادەنرێن و لادەبرێن و بۆ پەسند كردنیان بە شوورای نوێنەرانی خەڵك پێشنیار دەكرێن.

بە گوێرەی فەسڵی حەوتی یاسای بنەڕەتیش، پارێزگای كوێستانی خودموختاری بەدەخشان، بەشێكی تێكەڵاوو لەیەك جیانەكراوەی تاجیكستانە و بەپێی ماددەی ٨٣



دەسەڵاتی ئەم پارێزگایە بۆ كاروباری كولتووری و كۆمەڵایەتی و ئابووری، یاسای سەرەكی دەستنیشانی دەكا.

لە فەسڵی دەیەمدا، بوار بۆ گۆڕینو چاكسازی لە یاسای بنەڕەتی رەخساوە. ئەم كارە لەسەر پێشنیاری سەرۆك كۆمار یان لانیكەم ٢ لە ٣ی نوێنەرانی خەڵكی تاجیكستان جێبەجێ دەكرێ. پێشنیاری گۆڕین یان چاكسازی لە یاسای بنەڕەتی سێ مانگ پێش راپرسی گشتی لە بڵاڤۆكەكاندا بڵاودەكرێنەوە و بەڕێوەبردنی راپرسی گشتیی لەسەر داوای ٢ لە ٣ی نوێنەرانی خەڵك دێتە ئاراوە. هەڵبەت بەپێی ماددەی ١٠٠ی یاسای سەرەكی، قەوارەی كۆماری حكوومەت، بنەمای دێموكراتیو سیكۆلاربوونی سیستمی حكوومەت و یەكپارچەیی خاكی وڵات گۆڕانی تێدا ناكرێ.

بەپێی ماددەی دووی یاسای بنەڕەتی تاجیكستان، زمانی فەرمی وڵات فارسی تاجیكییە و زمانی رووسیش وەك زمانی هاوبەشی نێوان نەتەوەكان ناسێندراوە. هەموو ئەو ئەتنیكانەی كە لەم كۆمارەدا دەژین دەتوانن بە زمانی دایكی خۆیان قسە بكەن. هەروەها بەپێی ماددەی ٢٦ی یاسای بنەڕەتی، بەڕێوەبردنی ئەركە ئایینییەكان ئازادە بەڵام نیزامی سیاسی تاجیكستان لەسەر بنەمای جیایی دین لە سیاسەت دامەزراوە و ماف بە دامەزراوە ئایینییەكان نادا كە دەستێوەردان لە كاروباری حكوومیدا بكەن[١].

دینی فەرمی وڵات ئیسلامە كە زۆرینەیان سوننەن. هەڵبەت كەمینەیەكی گەورەیش لە شیعەكانی ئیسماعیلییە و دوازدە ئیمامیو تەنانەت جوولەكەش لەم وڵاتەدا ژیان دەكەن. لە تاجیكستان پێڕاگەیشتن بە كاروباری ئایینی لەژێر چاودێری ئیداری ئەوقافە. هەروەها ئیدارەی ئەوقاف لە كۆمارەكانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقازدا لەژێر چاودێری ئیدارەی زانایانی ئایینییە كە ناوەندەكەی لە شاری تاشكەند، پێتەختی ئۆزبەكستانە، هەروەها زمانی فەرمیشی ئۆزبەكی راگەیەندراوە. ئەم دامەزراوە ئایینییە لەژێر ناوی ئیسلامی حكوومیو فەرمی لە سەردەمی یەكیەتیی سۆڤییەت پێكهاتوون. لە سەرەوەی ئەم ئیدارەیە موفتی گەورە جێی گرتووە. بە نوێنەرانی ئەم ئیدارەیە لە هەر پێنج كۆماری ئاسیای ناڤیندا پێیان دەڵێن "قازی" كە لە راستای ئارمانجەكانی ئیدارەی ئەوقاف ئەركەكانیان بەڕێوە دەبەن. لە ساڵی ١٩٩٨ ئیدارەی ئەوقاف لەژێر چاودێری قازی تورجان زادە بوو كە لە وڵاتی ئوردون خوێندنی تەواو كردبوو.

(١) كولایی، پێشوو، لاپەڕەی ٩٢

ئیدارەی ئەوقافی تاجیکستان لەلایەن ڕێکخستنی ئایینی ئاسیای ناڤین و قەفقاز لە تاشکەند هاریکاری ماڵی و سلفە وەردەگرێ، هەروەها لەلایەن ولآتانی پاکستان، عەرەبستان، لیبی و ئوردون هاریکاری دەکرێن و مەرج بۆ هاوکاری ولآتانی دەرەکیش "دووری لە چالاکی سیاسی" راگەیەندراوە. سەرەڕای ئەوە ١٠٤ مزگەوتی فەرمیو ٢٨٠٠ مزگەوتی بچووك و نافەرمی لە ناوچە و شارەکانی تاجیکستان لەژێر چاودێری ئیدارەی ئەوقاف چالاکی دەکەن.

زانایانی ئایینی مزگەوت و وتاربێژانیش کە لەژێر چاودێری ئەم ئیدارەیەن پەرە بە کارتێکەرییان لە سەرانسەری تاجیکستاندا دەدەن. خوێندنگاکانیش لەلایەن ئیدارەی ئەوقافەوە بەڕێوە دەبرێن کە گرینگترینیان بریتین لە:

١ـ "مەعهەدی عالی"، کە لقێکە لە زانکۆی نێونەتەوەیی ئیسلامی پاکستان کە لەلایەن وەهابییەکانەوە بەڕێوە دەچێ. لەم خوێندنگایە نزیکەی ١٤٢ خوێندەڤان سەرقاڵی خوێندنن.

٢ـ خوێندنگایەك لە خۆجەند بە ١٠٠ خوێندەڤانەوە.

٣ـ خوێندنگای مەولانا یەعقووبی چەرخی لە شاری دووشەنبە بە ١٣٠ خوێندکار.

ئیدارەی ئەوقافی تاجیکستان حەوتوونامەی "مەنبەری ئیسلام" دەردەکا کە لە ڕۆژانی هەینی بە ڕێنووسی سیریلیك بڵاودەبێتەوە. دوای هاتنە سەرکاری بەرەی گەل قازی تورجان زادەیان لەسەر پۆستەکەی لابردو بەجێگای ئەو موفتی شەریف زادەیان وەك بەرپرسی ئیدارەی ئەوقافی تاجیکستان دیاریکرد. جیا لە ئیدارەی ئەوقاف دەستەی ئیسماعیلییەش بە ڕێبەری کەریم ئاقاخان لە ناوچەی بەدەخشانی تاجیکستاندا یەکێکی دیکەیە لە گرووپە ئایینییەکانی ئەو کۆمارە.

هەروەها لە ماددەی دوانزەی یاسای بنەڕەتی تاجیکستاندا مافی خاوەندارییەتی هەیە کە گەرانتی جێبەجێ کردنیان لەسەر ئەستۆی حکوومەتە. بە جۆرێك کە حکوومەت هەڵسووڕانی ئازادی ئابووری و سەرمایەدانان و پاراستنی هەموو جۆرە خاوەندارییەتییەك لەوانە خاوەندارییەتی تایبەتی گەرانتی کردووە.

بەم پێیە کەس مافی ئەوەی نییە کەسێك لە مافی خاوەندارییەتی بێبەش یان سنووردار بکا. هەڵبەت سەرچاوە سرووشتییەکانی تاجیکستان مۆڵکی حکوومین و حکوومەت کەڵك وەرگرتنی بەسوود لەو سەرچاوانە لە راستای بەرژەوەندی خەڵك گەرانتی کردووە. هەروەها حکوومەت دەتوانێ قەرەبووی تەواویی خەسارەکانی داگیرکردنەکان بکا.



لە یاسای بنەڕەتی تاجیکستان کە تێدا ئاماژە بە مافی تاکی و کۆمەڵایەتی کراوە، دەتوانین بەم جۆرە گرینگترینیان باسبکەین، مافی خاوەندارییەتی و ئازادی هەڵسووڕانی ئابووری، مافی هەبوونی شوێنی ژیان و پاڵپشتی لە هاووڵاتییە بێ کەس و کارەکان، مافی کارکردن و ئازادی هەڵبژاردنی کار، دانی خزمەتگوزاری بێ بەرانبەری پزیشکیو کۆمەڵایەتی، دابینکردنی ساخڵەمیی و گەشەپێدانی وەرزشی گشتیو راهێنانی لەش، پشتیوانی دادوەری و تەنانەت خوێندنی بە خۆڕایی لە هەموو بوارەکانی خوێندن، گەرانتی مافی هەموو شارۆمەندان لە کاتی پیربوون یان کەم ئەندامی، نەخۆشیو لەکار کەوتوویی، هەروەها نەبوونی سەرپەرشت، هەروەها بە گوێرەی یاسای سەرەکی دەستێوەردان لە ژیانی تایبەتی خەڵك و داگیرکردنی سامانی تاوانبارەکان یاساغە. جیا لە هێندێ جار کە لە یاسا ئاماژەی پێکراوە.

هاووڵاتیانی تاجیکی لە تاراوگە لەلایەن حکوومەتەوە پشتیوانی لێدەکرێن. کۆماری تاجیکستان بە خەڵکانی بیانی کە مافی مرۆییەکانیان پێشێلکراوە، مافی پەنابەری سیاسییان پێدەدا.

### (٤ ـ ٥) حیزبە سیاسییەکان

دوای هاتنە سەرکاری گۆرباچۆف و راگەیاندنی کەشی کراوەیی سیاسی لە تاجیکستانیش سەرۆك ولآتانی دیکەی کۆمارەکان، کۆمەڵێك حیزبی سیاسی جۆراوجۆر دەرکەوتن، هێندێك لەو حیزبە سیاسییانە لە ماوەی ساڵەکانی پاش سەربەخۆیی لەلایەن ڕێژیمەوە نایاسایی لە قەڵەم دران و بێبەش بوون لە رکەبەرایەتی سیاسی. گرینگترینی ئەو حیزبانەی کە لە تاجیکستان پێکهاتوون بریتین لە:

١ـ حیزبی گەلیو دێموکراتیکی تاجیکستان

٢ـ حیزبی کۆمۆنیست

٣ـ حیزبی دێموکرات

٤ـ حیزبی تەڤگەری ئیسلامی

٥ـ حیزبی رەستاخیز

٦ـ کۆمەڵەی لەعلی بەدەخشان

٧ـ حیزبی سۆسیالیستی تاجیکستان

٨ـ حیزبی دادپەروەریخواز

٩ـ جوولانەوەی یەکگرتوویی نەتەوەیی‌و ژیانەوەی تاجیکستان بە ڕێبەری ئیمام عەلی ڕەحمان ئۆف

١٠ـ حیزبی یەکگرتوویی نەتەویی بە ڕێبەری عەبدولمەلەك عەبدوڵڵا جانوف

١١ـ حیزبی بووژانەوەی سیاسی‌و ئابووری بە ڕێبەری وەلی جان بابایەف

١٢ـ حیزبی شارۆمەندی و وڵاتپارێز، بە ڕێبەری باباخان محەممەد ئۆف

١٣ـ حیزبی جووتیاری بە ڕیبەری حکمەتوڵڵا نەسرەدین ئۆف

١٤ـ حیزبی دادپەروەری و گەشەسەندن بە ڕێبەری ڕەحمەتوڵلا زائیرئۆف

١٥ـ کۆنگرەی یەکبووی گەلی تاجیك بە ڕێبەری سەیفوڵڵا سوورەیف

١٦ـ حیزبی سۆسیالیستی خۆجەند بە ڕێبەری خاتوو حاجی ئوورا

لێرەدا بە کورتی باس لە سەر هێندێك لەو حیزبانە دەکەین:

**١ـ حیزبی گەلی‌و دێموکراتیکی تاجیکستان (حیزبی دێموکراتیکی خەڵك)**

ئەم حیزبە سەرەتا لە ساڵی ١٩٩٤دا بەنێوی حیزبی گەلییەوە بە سەرۆکایەتی عەبدولمەجیدی دەستویف جێگری پێشووی پارلمانی باڵای تاجیکستان دامەزرێندرا. دواتر ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٧دا ناوی نوێی "گەلی دێموکراتی"ی بۆ خۆی هەڵبژارد کە ڕەحمان ئۆف سەرۆکایەتی وەئەستۆ گرتبوو. لەم حیزبەدا کەسایەتی گەلی بەرچاو لەنێو سیاسەتوانان، ئەندازیاران، پیشەسازی‌و جووتیاری، بیرمەندان‌و لایەنگرانی زانست و کولتووردا بەرچاودەکەوێ. گرینگترین ئارمانج و گەڵاڵەکانی حیزبی گەلی دێموکراتیکی تاجیکستان بەجۆرە ئەتوانین ئاماژەی پێبدەین.

١- ڕزگار کردنی وڵات لە قەیرانە کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییەکان لە ڕێگای پێکهێنانی هێزێکی نوێوە.

٢- پشتیوانی لە ماف و ئازادییەکانی تاك بەپێی بنەمای نێونەتەوەیی و یەکانگیرییەکان لەنێو هەموو هاووڵاتیانی تاجیکیدا.

٣- پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی دێموکراتیك و سیکۆلار، لە بەرچاوگرتنی مافە نێونەتەوەییەکان و دەروەست بوون لە بەرانبەر بەها مرۆییەکاندا[1].

(١) ڕۆئیا مۆنتەزەمی، تاجیکستان، (تاران: دەفتەری توێژینەوەی سیاسی‌و نێونەتەوەییەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ساڵی ١٣٧٤)، لاپەڕەکانی ١٦ تاکوو ٢٠



**٢ـ حیزبی کۆمۆنیستی تاجیکستان**

ئەم حیزبە میراتگری حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی سۆڤییەتە کە سەرلەنوێ لە ساڵی ١٩٩٢ ناودێر کرا. ڕێبەری ئەم حیزبە شادی شەبدوولف، نوێنەری پێشووی پارلمانی تاجیکستانە. حیزبی کۆمۆنیستی تاجیکستان هەنووکەش خوازیاری ژیانەوەی یەکیەتیی سۆڤییەتەو ئەمە بە بەشێك لە ئارمانجی خۆی لە قەڵەم دەدا.

ئەم حیزبە لە سەردەمی شەڕە نێوخۆییەکانی تاجیکستاندا پشتیوانی لە ڕێژیمی ئەم وڵاتە دەکردو لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری ساڵی ١٩٩٩یشدا بە شێوەی فەرمی ڕەحمان ئۆفی وەك پاڵێوراو ناساند[1].

حیزبی کۆمۆنیستی تاجیکستان لەمەڕ بەهرەمەندبوون لە میراتی سامانی سەردەمی یەکیەتیی سۆڤییەت لەگەڵ حکوومەت ناکۆکی هەیە. ئەم ناکۆکییانە بووە هۆی ئەوەی کە ڕەحمان ئۆف بە دەرکردنی فەرمانێك سامانەکانی ئەم حیزبەی "نەتەوەیی" ڕاگەیاند. سکرتێری ئەم حیزبەش لە دژکردەوەدا ئەم فەرمانەی بە پێچەوانەی یاسای بنچینەیی لە قەڵەم داو لە دادگای یاسای بنەڕەتیدا بە دژی سکاڵای بەرز کردەوە.

چاودێرانی سیاسی لەو بڕوایەدان کە ئەم حیزبە لەنێو خەڵکانێکدا لایەنگریان زیاترە کە لە سەردەمی یەکیەتیی سۆڤییەتدا کاربەدەست بوون و بەم هۆیەوە بە باشی یادی سەردەمی سۆڤییەت دەکەنەوە[2].

تاکو ساڵی ١٩٩٢ بڵاوکراوەکانی حیزبی کۆمۆنیستی تاجیکستان بریتیی بوو لە ڕۆژنامەی جمهورییەت بە زمانی تاجیکی و "نارۆدونایان گازتا" (ڕۆژنامەی خەڵك) بە زمانی ڕووسی بووە. لە ساڵی ١٩٩٢یش دا "چنەوای ڕەنجبەر" بە زمانی فارسی تاجیکی و "گۆلۆسی تاجیکستان" (دەنگی تاجیکستان) بە زمانی ئۆزبەکی دەردەچوون.

دوای کۆنگرەی بیست و دووی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی سۆڤییەت، ئامانج و بەرنامەکانی حیزبی کۆمونیستی تاجیکستان بەم جۆرە ڕاگەیەندراوە:

١ـ پارێزگاری لە سەربەخۆیی خاکی تاجیکستان و یەك پارچەیی خاکی ئەم وڵاتە

(١) ئیتلاعات، ١٣٧٨/١٢/٢٥

(٢) مۆنتەزەمی، پێشوو، لاپەڕەی ٦١

٢ـ بڕوا بە جیایی دین لە سیاسەت و دامەزراندنی بناغەی دێموکراسی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی

٣ـ دامەزراندنی پێوەندی ئاشتیخوازانە لەگەڵ دراوسێکان و وڵاتانی دیکەی جیهاندا بەتایبەتی دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ رووسیەو ئێراندا بەهۆی هاوبەشیگەلی کولتووری

٤ـ لەپێش گرتنی گەڵاڵەیەکی ئابووری کە تێکڵاوێك بێ لە ئابووری پلان داڕێژراوو بازاڕی ئازاد، واتە لە هەمان کاتدا پشتیوانی لە تایبەتیکردنی یەکانەکانی وەبەرهێنان و سەرمایەدانان بکا، هەروەها خوازیاری دەستێوەردانی حکوومەت لە کاروباری ئابووریشە.

### ٣ـ حیزبی دێموکرات

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٥ بە رێبەری شادمان یوسف لە کەسایەتییە ناسراوە سیاسی و کولتوورییەکانی تاجیکستان دامەزرێندرا. ئارمانج و گەڵاڵەکانی ئەم حیزبە بەم شێوازەی خوارەوە دەستنیشان کراوە:

١ـ دامەزراندنی نیزامی پارلمانی لە تاجیکستان و پشتیوانی لە ماف و ئازادییەکانی شارۆمەندانی ئەم وڵاتە بەبێ سەرنجدان بە ئایین، نەتەوەو کولتووریان.

٢ـ ئەنجامدانی چاکسازی ئابووری لە راستای بایەخدان بە خاوەندارییەتی تایبەت، دابەشکردنی زەویی لەنێوان جووتیاراندا و گۆڕانکاری لە پێکهاتەی ئابووری تاکەبەرهەمی.

٣ـ دژایەتی لەگەڵ بوونی سوپای رووسیە لە وڵاتانی تاجیکستان و دامەزراندنی پێوەندی ئاشتیخوازانە لەگەڵ وڵاتانی دیکەی جیهان.

حیزبی دێموکراتی تاجیکستان هەتا هەنووکەش زۆرترین گۆڕانی لە هەڵوێستە سیاسییە تایبەتییەکانی خۆی، هەروەها ئاڵوگۆڕ لە نێوخۆییدا پێکهێناوە. لە جەریانی تێکهەڵچوونە نێوخۆییەکانی تاجیکستانیشدا ئەم حیزبە چووە ریزی هێزە نەتەوەیی و ئیسلامییە بەرهەڵستکارەکانی رێژیمەوە. لە ساڵی ١٩٩٣ دادگای باڵای تاجیکستان چالاکی ئەم حیزبە و هەروەها حیزبە نەیارەکانی دیکەی قەدەغە کرد. ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٤ دابەش بوو بەسەر دوو باڵ کە ئەم دوو باڵە ناسراون بە باڵی تاران و باڵی ئاڵماتی.

### ١ ـ ٣) حیزبی دێموکرات (باڵی تاران)

ئەم باڵە کە لەلایەن شادمان یوسف رێبەری دەکرێ لەکاتی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری و راپرسی گشتی یاسای بنەڕەتی و دەسەڵاتداری حکوومەتی تاجیکستانی پەسند کردو بەم هۆیە مۆڵەتی هەڵسووڕانی فەرمی وەرگرت. دوای ماوەیەك ئەعزەمی ئەفزەلی بوو بە رێبەری ئەم باڵە



لە حیزبی دێموکراتدا. ئەم باڵەی حیزبی دێموکرات واتە باڵی تاران لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری ١٩٩٩ تاجیکستاندا بەڕێز سوڵتان قووەت ئۆفی وەك پاڵێوراوی خۆی دەستنیشان کردو بە یەکەمجار رەخنەی لە سیاسەتەکانی رێژیمی تاجیکستان گرت. قووەت ئۆف لەلایەن کۆمیسیۆنی ناوەندی هەڵبژاردن ناودێر نەکراو لەئاکامدا باڵی تاران هەڵبژارردنی سەرۆك کۆماری بایکۆت کردو ئەم هەڵبژاردنەی بە نایاسایی لە قەڵەم دا. دوای هەڵبژاردن سەرۆکی دادگای تاجیکستان راگەیاند کە حیزبی دێموکراتیکی ئەفزەلی بەهۆی پێشکەش نەکردنی واژۆی راستەقینەی هەزارکەسی لە ئەندامە سەرەکییەکانی هەڵوەشاوەتەوەو بەم شێوازە باڵی تاران لە بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی پارلمانی نوێنەران لە فیەورییەی ٢٠٠٠دا بێبەش کرا.

### ٢ ـ ٣) حیزبی دێموکرات (باڵی ئاڵماتی)

ئەم حیزبەش وەك حیزبی تەڤگەری ئیسلامی لە چوارچێوەی رێککەوتنەکانی ئاشتی تاجیکستان دەرفەتی هەڵسووڕانی فەرمی وەرگرت. ئەم باڵە لە حیزبی دێموکرات واتە باڵی ئاڵماتی لە یەکەمین کۆبوونەوەی خۆیدا دوای دەستپێکی سەرلەنوێی چالاکی، محەممەد رووزی ئەسکەندەرۆف لە فەرماندەیانی پێشووی یەکیەتی بەرهەڵستکارانی تاجیك و بەرپرسی کۆمپانیای خزمەتگوزاری شاری لە تاجیکستان بە جێگای "جومعە بایی نیازئۆف" بۆ سەرۆکایەتی حیزب دیاریکرا.

ئەم حیزبە بە یەکێك لە حیزبە دژبەرەرکانی رێژیمی تاجیکستان بە ئەژمار دێ بە پێچەوانەی باڵی دیکەی حیزبی دێموکرات (باڵی تاران) لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریدا پشتیوانی لە کاندیداتۆری ئیمام عەلی رەحمان ئۆفی کرد، لەگەڵ حیزبە دژبەرەکانی دیکە رێك نەکەوت. ئەم حیزبە پاش هەڵوەشانەوەی باڵی تاران ناودێر کراو مۆڵەتی چالاکی بۆ بەشداری لە هەڵبژاردنی پارلمانی لە فیەورییەی ٢٠٠٠ بەدەستهێنا. حەوتوونامەی "عەدالەت" کە لە دووشەنبە بڵاو دەکرایەوە ئۆرگانی ئەم حیزبەیەو لە بڵاوکراوە ناوچەییەکانی بریتییە لە: "ئاریانا"، "بامداد"و "شەهادەت" کە هەڵوێستەکانی فەرمی باڵی ئاڵماتی بەیان دەکا[1].

### ٤ـ حیزبی جووڵانەوەی ئیسلامی

حیزبی تەڤگەری ئیسلامی لە سەردەمی یەکیەتیی سۆڤییەت بە شێوەی شاراوە دامەزراو دەستی بەکار کرد. ئەم حیزبە لە سەرەتاوە سەر بە حیزبی بزووتنەوەی ئیسلامی سۆڤییەت بوو

---

(١) مۆنتەزەمی، پێشوو، لاپەڕەی ٦١

که دوای گەشەکردنی هەستی پان تورکیزم لەو باڵەی تاجیکستان، لەم حیزبە جیا بۆوە. حیزبی بزووتنەوەی ئیسلامی تاجیکستان دوای سەربەخۆیی ئەم وڵاتە لە ٢٦ی ئۆکتۆبری ١٩٩١ بە ڕێبەری محەممەد شەریف هەممەت زادە بە شێوەی فەرمی مۆڵەتی چالاکی وەرگرت و هاتە نێو گۆڕەپانی ڕکەبەرایەتی سیاسییەوە. ئەم حیزبە لە سەرەتادا وەك ڕکەبەری ئیدارەی ئەوقافی تاجیکستان بە ئەژمار دەهات کە لەلایەن تورجان زادەوە ڕێبەری دەکرا. ڕێبەری تەڤگەری ئیسلامی سەید عەبدوڵڵا نووری، جێگری یەکەمی ئەو "حاجی ئەکبەر تورجان زادە"و سکرتێری گشتی حیزب سەید عومەر حوسەینییە[1].

دوای هەڵوەشانەوەی ئەم حیزبە لایەنگرانی دەستیان بە شەڕی چەکدارانە لەگەڵ ڕژێم لە ناوچە سنوورییەکانی ئەفغانستان و بەدەخشاندا کرد. لە ناوچەی مسچا لە باکووری تاجیکستانیش قۆڵێك لە بزووتنەوەی ئیسلامی بە ڕێبەری محەممەد یوسف فازڵ، وتاربێژی مزگەوتی ئێقباڵ لە ناوچەی مسچا، چالاکی دەکەن. مانگنامەی "نەجات" ئۆرگانی ئەم حیزبەیەو لە ساڵی ١٩٩٩ەوە هەڵسووڕانی ئەم حیزبە ئازاد کراوەو لە ٢٧ی پووشپەڕی ١٣٧٨دا ئارمانج و بەرنامەی حیزب پەسند کراو دواتر لەلایەن وەزارەتی دادی تاجیکستان ناودێر کرا. حیزبی تەڤگەری ئیسلامی لە هەڵبژاردنی پارلمانی ٢٧ی فیەورییەی ٢٠٠٠دا، دوو کورسی پارلمانی بەدەستهێنا[2].

بەم جۆرە دەتوانین ئاماژە بە ئامانجەکانی ئەم حیزبە بکەین:

١ـ پارێزگاری لە یەکیەتیی خاکی وڵات.

٢ـ دامەزراندنی سیستمێکی پارلمانی و کۆمەڵگایەکی ئازادو دێموکراتیك، مافێك کە لەسەر بنەما بەها بەرزە ئایینی، نەتەوەیی و زانستە مرۆییەکان پێکهاتبێ.

٣ـ بەرێوەبردنی چاکسازی و گۆڕینی سیستمی ئابووری لە راستای سەرنجدان بە نیزامی ئابووری بازاڕی ئازاد

٤- دامەزراندنی پێوەندی نزیك لەگەڵ وڵاتە ئیسلامییەکانداو خەبات لەگەڵ هزرە کۆمۆنیستییەکان دا[3].

---

(١) حاجی ئەکبەری تورجان زادە لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری ساڵی ١٩٩٩ی زایینی پشتیوانی لە ڕەحمان ئۆفی کردو ڕەخنەی لە هەڵوێستی بزووتنەوەی ئیسلامی گرت. هەر بەم هۆیەش لە حیزبی بزووتنەوەی ئیسلامی دەرکرا

(٢) ڕادیۆ BBC، تاوتوێی ئاسیای نێوەڕاست، هەواڵی کاتژمێر ٧ی پاشنیوەڕۆ، ٢٥ی ژووئەنی ساڵی ٢٠٠٠

(٣) ڕادیۆ BBC، تاوتوێی ئاسیای نێوەڕاست، هەواڵی کاتژمێر ٧ی دوانیوەڕۆ، ٢٧ی ژووئییەی ساڵی ٢٠٠٠



حیزبی بزووتنەوەی ئیسلامی تاجیکستان گەلاڵەی خۆی لەسەر بنەمای "جهان بینی" ئیسلامی، یاسای بنەڕەتی کۆماری تاجیکستان، دێکۆمێنتە یاساییەکانی دیکەو مەرجە نێونەتەوەییەکان دادەڕێژێ و جێبەجێیان دەکا. بونیاتنانی کۆمەڵگای یاسایی، شارستانییەت، کۆمەڵایەتی و دێموکراتیك کە تێدا گشت ماف و ئازادییە سرووشتی، سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی شارۆمەندان دابینبکرێ ئامانجی سەرەکی حیزبی تەڤگەری ئیسلامی تاجیکستانە. ئەم حیزبە دیاردەی نەرێنی ناوچەگەرایی، قەوم گەری، درووستکردنی کێشە نێونەتەوەییەکان و سەرەڕۆیی سیاسیو ئایینی ئیدانەو لەسەر بنەمای داب و نەریتە نەتەوەیی و بەها ئایینییەکان و هانی هەموو ئەتنیکەکانی دانیشتووی تاجیکستان بۆ پێکەوە ژیانێکی ئاشتییانە دەکات. ئەم حیزبە ئەساسی فرەحیزبی بە ئازادی سیاسی و فرە هزری لە قەڵەم دەداو بە جۆرێك کە ئەوەی بە نیشانەی حکوومەتێکی یاسایی و دێموکراتیك پێناسە دەکا.

ڕێبەرانی ئەم حیزبە لەو باوەڕەدان کە تاجیکستان سەربەخۆ بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خۆی لەگەڵ گشت وڵاتانی جیهان پێوەندییەکی باشی سیاسیو ئابووری و دیپلۆماتیکی هەبێ. لەم بوارەدا ئەولەوییەت بەو وڵاتانە دەدرێ کە هاوبەشی کولتووری و مێژوویيان هەیەو لە ریزی بەرژەوەندیە نەتەوەییەکان بە ئەژمار دێن.

**٥ـ حیزبی ڕەستاخیز**

بزووتنەی گەلی ڕەستاخیز لە سێپتامبری ١٩٨٩دا دەمەزرێندراو ئەندامەکانی لە ڕووناکبرانی شاری پێکدێن. ڕێبەری ئەم حیزبە پرۆفیسۆر تایر عەبدولجەبارە کە لەکاتی شەڕی نێوخۆیی تاجیکستانەوە لە تاراوگە ژیان بەسەر دەبا. دوای شەڕی نێوخۆیی هەڵسووڕانی حیزبی ڕەستاخیز نایاسایی راگەیەندراو ڕێبەرانی ئەم حیزبە لەگەڵ حیزبەکانی ناڕازی دیکە یەکیان گرت و بەرەی بەرهەڵستکارانی حکوومەتی تاجیکستانیان پێکهێنا. بە دەستپێکردنی چالاکی گرووپەکان و حیزبەکانی دیکە لە ساڵی ١٩٩٩دا ڕێ بە چالاکی ئەم حیزبەش دراو محەممەد شەریف هەممەت زادە، جێگرو نوێنەری ئەم حیزبە لە پارلمانی ئەم وڵاتەدایە. ئۆرگانی ئەم حیزبە حەوتوونامەی "ڕەستاخیز"ە دەتوانین بەم جۆرە ئاماژە بە ئامانج و پلانە سەرەکییەکانی ئەم حیزبە بکەین:

١ـ پەرەدان بە بیری نەتەوە خوازای لە چوارچێوەی گەشەدان بە زمانی فارسی وەك زمانی فەرمی وڵات.

٢ـ دژایەتی لەگەڵ ئەندێشە توتالیتاریستییەکان و دامەزراندنی نیزامی پارلمانی لەگەڵ پۆستی سەرۆك وەزیری.

٣ـ باوەڕمەندی بە ئایینی ئیسلام وەك یەكێك لە خاڵە پێکهێنەرەکانی کولتوری نەتەوەیی.

٤- سەربەخۆیی ئابووری و تایبەتیکردنی پیشەسازی لە بەرژەوەندی کرێکاران و دامەزراندنی نیزامی ئابووری بازاڕی ئازاد

٥ـ ئەولەوییەت دان بە دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی هاوکولتووری وەك ئێران، ئەفغانستان و پاکستان.

**٦ـ حیزب یان کۆمەڵەی لەعلی بەدەخشان**

ئەم حیزبە چالاکی ڕەسمی خۆی لە مانگی مای ١٩٩٢ دەستپێکرد و لەلایەن ئاتابەك ئەمیر بیك ئۆف ڕێبەری دەکرێ. ئەندامانی ئەم حیزبە لەلایەن کەسایەتییە بەرچاوە زانستی، سیاسی و کولتوورییەکانی دووشەنبە لەوانە ئەکبەرشا ئەکەندرئۆف پێکی دێنن. حیزبی لەعلی بەدەخشان نزیکەی سێ‌هەزار ئەندامی هەیەو لەلایەن زۆربەی هەرە زۆری پامیرییەکانەوە پاڵپشتی دەکرێ‌و ئۆرگانی فەرمی ئەم حیزبە حەوتوونامەی "باختەر"ـە. بەرنامەو ئارمانجەکانی ئەم حیزبە بەم جۆرە دەتوانین باسی بکەین:

١ـ خودموختاری زیاتر بە ناوچەی بەدەخشان و باشتر کردنی ئاستی بژێوی ژیانیان.

٢ـ باوەڕمەندی بە جیایی دین لە سیاسەت و دامەزراندنی حکوومەتێکی دێموکراتیك لە تاجیکستان.

٣ـ دامەزراندنی پێوەندیی لەگەڵ خەڵکی پامیری ئەفغانستان و چین.

٤ـ دابەشکردنی زەوییەکان و کۆمپانیاکان لەنێوان وەرزێران و کرێکاراندا

٥ـ دژایەتی لەگەڵ سیستمی سەرۆك کۆماریو باوەڕمەندی بە نیزامێکی ڕێبەرایەتی گشتی

**٧ـ حیزبی سۆسیالیستی تاجیکستان**

ئەم حیزبە لە ئاگۆستی ساڵی ١٩٩٦ بە ڕێبەری سەفەر عەلی کۆنجایەف یەكێك لە کەسایەتییە بەرچاوە سیاسییەکانی تاجیکستان بناغەی دانرا. بەشێك لە چاودێرانی سیاسی هۆکاری سەرەکی دامەزراندنی ئەم حیزبەی بۆ دژایەتیکردنی کۆنجایەف و گرووپێك لەوانەی کە ڕۆڵی کاریگەریان لە هێنانە سەرکاری ڕێژیمی ڕەحمان ئۆفدا هەبووە، گەڕاندەوە. سەفەر عەلی کۆنجایەف لە ساڵی ١٩٩٩ لە شاری دووشەنبە تیرۆر کرا. بە فەرمانی ناوبراو زەبرێکی کاریگەر



لە حیزبی سوسیالیست درا. ئەم زەبرە بە ڕادەیەك بوو کە حیزبی سوسیالیست لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری ١٩٩٩ نەیتوانی هەڵوێستێکی سەربەخۆ بگرێتە بەر، هەرچەند دەگوترێ ئەم حیزبە پشتیوانی لە ڕەحمان ئۆفی کردووە، دوای مردنی کونجایەف کوڕەکەی شێر عەلی کونجایەف، بەڕێوەبەری حیزبی وەئەستۆ گرت. ئەندامانی حیزبی ئاماژەپێکراو پتر لە ٢٤ هەزار کەس دەبن.

حیزبی سۆسیالیستی تاجیکستان حیزبێکی ئەنترناسیونالییە، هەموو کەسێکی لەخۆیدا جێ دەکردەوە، واتە بێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەز، نەتەوە، ڕەچەڵەك، زمان، باوەڕمەندییە ئایینییەکان و پێگەی کۆمەڵایەتییەکان.

حیزبی سۆسیالیستی تاجیکستان لەسەر ئەو بڕوایەدایە کە دامەزراندنی ڕێژێمێکی دێموکراتیك، یاسایی، ئایینی، گەشەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان، شارستانییەت، دابینکردنی گشت دەسەڵاتداری خەڵکی، ڕێزدانان و پاراستنی ماف و ئازادییە مرۆییەکان ئەمانە کاتێك دێتە ئاراوە کە هاووڵاتیان دەرفەتی ڕاستەقینەی بەشداری ئاکتیڤیان لە ڕەوتی ئامادەو پەسندکردنی بڕیارات لە بەرژەوەندی خویاندا هەبێ.

**٨ـ حیزبی دادپەروەریخواز**

ئەم حیزبە یەكێك لە حیزبە نوێکانی تاجیکستانە کە لە فیەورییەی ساڵی ١٩٩٦دا دامەزرا. حیزبی دادپەروەریخواز کە لەلایەن عەبدولڕەحمان کەریم ئۆف ڕێبەری دەکرێ، لەنێو خەڵکدا زۆر ناسراو نین و لەنێو ئەندامانیدا، خەڵکانی ناسراوی سیاسی نابینرێ. ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری ساڵی ١٩٩٩ سەیفەلدین تورەیفی وەك پاڵێوراوی خۆی ناساند و کەوتە ڕیزی نەیارانی ڕەحمان ئۆفەوە، بەم حاڵەش کەسایەتی تورەیف زۆرتر وەك پاڵێوراو بوو تاکو کەسێکی دژبەری گرینگ و کارتێکەر. ئەم حیزبە لە پلانی خۆیدا هەروەك حیزبەکانی دیکە جەختی لەسەر دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی دێموکراتیکی کردووەو گرینگییەکی تایبەتی بە پەروەردە نیشانداوە. لە هەڵبژاردنەکانی تاجیکستان پاڵێواوانی حیزبی عەدالەتخواز لە چوونە ناوەوە بۆ ناو پارلمانی نوێنەران بێبەش کران.

**٩ـ حیزبی جووڵانەوەی نەتەوەیی تاجیکستان**

سەرۆکی ئەم حیزبە حاکم شا محەبەت ئۆفە کە ئەو بڕوایەدایە کە گەلاڵەی حیزبی تەڤگەری نەتەوەیی تاجیکستان بۆ سێ قۆناخی پەرەگرتنی تاجیکستان داڕێژراوە.

قۆناخی یەکەم: ڕێگا سەرەکییەکانی وەدەستهێنانی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان، ئاشتەوایی گشتیو گونجان لەنێو ولاّتدا، بەردەوامیو پتەوکردنی سەربەخۆیی تاجیکستان.

قۆناخی دووهەم: جێبەجێکردنی پلان بە سەرنجدان بە بنەماو بۆنە سەرەکییەکانی و گۆڕینی تاجیکستان لە ولاّتێکی جووتیارییەوە بۆ ولاّتێکی پێشکەوتووی پیشەسازی کە هەنووکەش زۆر لە دیاردە کۆنەکانی کۆمەڵگای تێدا بەرچاو دەکەوێ.

قۆناخی سێهەم: بەکردە کردنی گەلاّڵەکان و شێوازی لابردنی بەرەبەری قەیرانە سیستمییە جیهانییەکان و تێپەڕین بەسەر چڕبوونی سەقامگیری و هاوتەریبی تاجیکستان کە لە ڕێگای گەشەی پیشەسازییەوە روو دەدا.

ئامانجی سەرەکی چالاکی حیزبی نەتەوەیی تاجیکستان دامەزراندنی ڕێژیمێکی یاساییو کۆمەڵگای مەدەنییە کە تایبەتمەندییە مێژووییو کولتووریەکانی ولاّت لە بەرچاو بگرێ، ژیانی ئاسودەیی کۆمەلاّیەتی و ئابووری، گشت دانیشتووانی کۆمار گەرانتی بکاو ڕێزو بەها بۆ هەر شارۆمەندێك بەبێ لەبەرچاوگرتنی رەگەز، رەنگی پێست، نەتەوە، پێگەی ئەو لە کۆمەڵگا، زمان، ئایین، لەسەر بنەمای دێموکراسی دابنرێ.

حیزب بایەخێکی زۆر بۆ پتەوکردنی پێوەندییەکانی دوو لایەنە لەگەڵ رووسیە دەدا، چونکە رووسیە بە شەریکی سەرەکی ئیستراتیژکی ژێئۆپۆلیتیکی خۆیان دەزانێ. هەروەها دامەزراندنی پێوەندییەکی دوو لایەنەی پتەوو درێژخایەن لەگەڵ ولاّتانی ئاسیای ناوەندیو کۆمەڵگای هاوبەرژەوەندی بایەخێکی تایبەتی هەیە.

ولاّتی ئێمە دەبێ لە سیاسەتی دەرەکی خۆیدا هەوڵ بۆ هەرچی زیاتر لەناوبردنی ئالۆزییەکان لە ئەفغانستان بدا. بڕەودان بە هاوکاری هەمە لایەنە لەگەڵ ئێران بایەخی زۆر گرینگی دەبێ چونکە گەلی ئێمە لەگەڵ ئەوان کولتوورو مێژووی هاوبەشیان هەیە. هەروەها لە سیاسەتی دەرەکی ئێمەدا دەبێ گرینگی بە ولاّتانی ئاسیای، بەتایبەتی ولاّتانی بەشی باکووری و باشووری، ئەورووپای رۆژئاوا، قاڕەی ئەمریکاو ولاّتە ئیسلامییەکان بدرێ.

تاجیکستان دەبێ بەشداری لە چالاکی ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان واتە ڕێکخراوی نەتەوەکان، ڕێکخراوی ئاسایش و هاریکاری ئەوروپا، ڕێکخراوی کۆنفڕانسی ئیسلامی و... بکا.

بۆ گەشەی خێرا، کەڵك وەرگرتنی زیاتر نەك هەر لە هێزی نێوخۆیی ئابووری، بەڵکوو لە کەرەستە چالاکە ئابوورییەکانی دەرەکیش پێویستە.



حیزبی تەڤگەری نەتەوەیی تاجیکستان لایەنگری ئابووری گشتی جیهانی، لابردنی ئاستەنگە حکوومییەکانە بۆ باشکردنی رەوشی ژیانی خەڵك و دابینکردنی ئاشتی، بازرگانی نێونەتەوەییە

حیزبی بزووتنەوەی نەتەوەیی تاجیکستان وەك گشت ڕێکخراوە دێموکراتی و کۆمەلاّیەتی و سیاسییەکان بۆ راکێشانی رای زۆرینەی خەڵك و بۆ هێنانە ئارای ڕێژیم و کۆمەڵگایەك بە گوێرەی بەها سەرەکییەکانی گەلاّڵەی ئاماژەپێکراو، خەبات بو هاوئاهەنگی نیوان کولتووری کۆنی خەڵکی تاجیکستان و شارستانییەتی گشت جیهان دەکا.

بلاّوکراوەی ئەم حیزبە ناوی "جوولاّنەوە"یە (هەنووکە بلاّونابێتەوە). ئەم بلاّوکراوە لەکاتی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری لە نوامبری ١٩٩٩ وێنەکانی رەحمان ئۆف، سەرۆك کۆماری ئێستای تاجیکستان، دەوڵەت عوسمان، پاڵێوراوی سەرۆك کۆماری و قوەت سوڵتان کە دەیهەویست خۆی بەربژێر بکا بۆ سەورۆك کۆماری، لە تەنیشت یەکتر بلاّو دەکردەوە. هەروەها لە میانەی هەڵبژاردنی پارلمانی لە سێپتامبری ٢٠٠٠دا، شیعرێك بە نێوەڕۆکێکی تاڵی کۆمەلاّیەتی و بەشێوەی کۆمیدیا لەمەڕ نوێنەرانی پارلمانی پێشوو چاپ و ئەوانی بە گیانلەبەرێك وەك مانگا شوبهاندبوو.

**١٠ـ حیزبی دادپەروەری و گەشەسەندن**

ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٩٢ لەکاتی کۆبوونەوەکانی خەڵك لە گۆڕپانی دووشەنبە وەك هێزی سێهەم هاتبووە گۆڕەپانەوە، بەلاّم لە رەوتی رووداوەکان نەیهێشت ئەم بیرە بچێتە بواری پراکتیکەوە لەژێر پێنانی دادپەروەری کۆمەلاّیەتی لە تاجیکستان هانایەکی دیکەی دامەزراندنی حیزب بوو.

حیزبی ئاماژەپێکراو لە ٨ی فیورییەی ١٩٩٨ لە وەزارەتی دادپەروەری تاجیکستان تۆمار کراو شوێنی هەڵسووڕانی ئەم حیزبە زیاتر لە ناوچەکانی سەر بە ناوەند، خۆجەند، ختلاّن، دووشەنبە، حەسارو نۆرەسەن زادەیە. کەسایەتی سیاسی بەناوبانگ لەم حیزبەدا ئەندام نین و سەرمایەداران و خاوەندارانی کۆمپانیاکان پشتیوانییان لێ ناکەن.

حیزبی عەدالەتو گەشەسەندن بە ڕێبەری رەحمەتوللاّ لە قۆناخێکی زۆر هەستیارو ئالۆزی مێژوویی تاجیکستاندا هاتنە ناو گۆڕەپانی سیاسەتەوە. ئەم حیزبە داوا لە هاوولاّتیانی تاجیکی دەکا بۆ بەکردەکردنی ئارمانجەکانی خۆی بەبێ لەبەرچاوگرتنی جنس، رەچەڵەك، زمان، بیروباوەڕی ئایینی، هاوکاری ئەم حیزبە بکەن. حیزبی دادپەروەری و گەشەسەندن

چالاكی خۆی لە چوارچێوەی یاسای بنەڕەتی و یاساكانی دیكەی وڵات، هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی ماف و گرێبەستە نێونەتەوەییەكانی دەستپێدكا...

حیزبی ئاماژەپێكراو ئارمانج و گەڵاڵەكانی تایبەت بە خۆی وەك بنەمای كاری خۆی داناوە كە لە بەرچاوترینیان دەتوانین ئاماژە بەم خاڵانەی خوارێ بكەین:

١ـ دامەزراندنی دادپەروەری، ئازادی و دەسەڵاتی گشتی، لەم راستایەدا حیزبی عەداڵەت باوەڕی بە دێموكراسی و دامەزراندنی سیستمێكی پارلمانیو هێنانە ئارای یەكیەتیی نەتەوەیی، مافی وەك یەكی هاوولاتیان و دەسەڵاتێكی یاسامەند هەیە.

٢ـ یەكخستنی كۆمەڵگا، نەهێشتنی هەژاری و نایەكسانیو ئەولەوییەتی مافو دێموكراتیزە كردنی نیزامی هەڵبژاردن.

٣ـ رێزگرتن لە مافی مرۆڤ، پاراستنی بەها كولتووریو نەتەوەییو ئایینییەكانی خەڵك، پاراستنی مافی شارۆمەندیو دابینكردنی پرسە كۆمەڵایەتییەكان وەك پێڕاگەیشتن بە منالانی هەتیوو بەساڵداچووان.

٤ـ پارێزگاری لە ژینگەو لەبەرچاوگرتنی مافی وەك یەكی ژن و پیاو، هەوڵدان بۆ كۆمەڵگایەك كە بیری جیاواز تێدا ئازاد بێ و گەرانتی ئازادی و مافی تاك كەس و كۆمەڵایەتییەكان.

ئیستراتیژیی كردەیی حیزب بە مەبەستی پێشكەوتن، پەرەدانی دێموكراسی، كۆمەڵگایەكی مەدەنی، دابینكردنی یەكسانی، ئازادی و خوشگوزەرانی هاوولاتیان، ژیاندنەوەو پتەوكردنی ناوەندەكانی دەسەڵاتداری حكوومەت. شێوازی بەڕێوەبەری لە تاجیكستان دەبێ بەم جۆرەی خوارێ بێت:

١ـ ئیستراتیژی كۆمەڵگای مەدەنی، هاریكاری كۆمەڵگای مەدەنی لەسەر بنەمای پرەنسیپی ئازادی، رێزگرتن لە جیابیران و تێگەیشتنی كۆمەڵگا لە هەمبەر ئەم پرسەو داهاتووی گەلی تاجیكستان.

٢ـ ئیستراتیژی گەشەی سیاسی، دامەزراندنی حكوومەتێكی یەكگرتووە، كەرتی تایبەتی و نیزامی و رێكخراوە ناحكوومییەكان.

٣ـ ئیستراتیژی گەشەی یاسایی جێبەجێكردنی دادپەروەری، ئازادی و بەرابەری.

٤ـ ئیستراتیژی گەشەی ئابووری:

ئەلف: پەرەی هەمەلایەنە



ب: گەشەی بازرگانییە بچووكەكان و نێونجییەكان.

پ: هەناردنی هەمەلایەنە بەپێی پاشكەوتەكان.

ت: راكێشانی توریزم (گەشتیار).

٥ـ ئیستراتیژی سیاسەتی ناوچەیی، نەهێشتنی ئابڵۆقەی نێوخۆییو دەرەكی لە سەر تاجیكستان، بە تایبەتی ئەو ناوچەیەی لە تاجیكستان كە كوێستانی بێو هەرێمێكی وشك هەبێ

٦ـ ئیستراتیژی گەشەی ئیدئۆلۆژی، دابینكردنی یەكسانی بەها مرۆییەكان، ئارمانی ریالیست خوازی و دادپەروەری خوازی، هاوولاتی بوون و خاوەنی ولات بوون وەك ئیدئۆلۆژی گشتی نەتەوەیی.

٧ـ ئیستراتیژی پەرەپێدان بە دەسەڵاتی مرۆڤ و هێزی كۆمەڵایەتی، دامەزراندنی رەوشی گونجاو بەهۆی گەشەو لێهاتوویی خەڵك و كەڵك وەرگرتنی باش لەو لێهاتووییە.

٨ـ ئیستراتیژی بەڕێوەبردنی حكوومەت و شێوازی ئیدارەكردنی دێموكراتیكی كۆمەڵگا كە داگری دابەشكردنی راستەقینەی حكوومەت و چالاكی راستەقینە، دوورەپەرێزی لە ناوەندگەریەتی.

**١١ـ حیزبی سوسیال دێموكراتی تاجیكستان**

رەحمەتوڵلا زائەرئۆف، دوای یاساغ كردنی چالاكی حیزبی دادپەروەریو گەشە، حیزبی سوسیال دێموكراتی لە ساڵی ٢٠٠٠ یان لە كۆتایی ساڵی **١٣٧٩** دامەزراند. وەزارەتی دادیش بەهۆی ئەوەی كە چواركەسی لە ئەندامانی حیزب بۆ ناودێركردنی حیزب، خۆیان بە ئەندامی حیزب لە قەڵەم نەدابوو، لە تۆماركردنی ئەو حیزبە خۆی پاراست.

حیزبی سوسیال دێموكراتی تاجیكستان حیزبێكی سیاسییە كە هاوولاتیانی كۆماری تاجیكستان لەسەر داوای خۆیان بەبێ لەبەرچاو گرتنی جنس، رەچەڵەك و زمان و نەتەوە، شوێنی لەدایك بوونیان، یان باوەڕمەندی ئایینی جیاوازیەكانی دیكە بە كردەكردنی ئامانجەكانی لە دەوری خۆیدا كۆدەكاتەوە.

ئامانجەكانی حیزبی سوسیال دێموكراتی تاجیكستان بریتییە لە:

١ـ پرۆپاگەندە بۆ پرنسیپ و بیرۆكەی دادپەروەری كۆمەڵایەتی، خەبات بۆ دامەزراندنی نیزامێكی حكوومی كۆمەڵایەتی راستەقینەی دێموكراتیك و یاسایی و كۆمەڵگایەكی مەدەنی لە تاجیكستان.

٢ـ کۆکردنەوەی هێز و کەرەستەکانی حیزبی سوسیال دێموکراتیکی تاجیکستان بۆ هاریکاری و چالاکی بەکەڵکی بەرهەڵستکاران لەگەڵ ئۆرگانە حکوومییەکان و یەکیەتییە گشتییەکان بە مەبەستی دابینکردنی گەشەو سەقامگیری کۆمەڵایەتی‌و دێموکراتیك و چاکسازییە سیاسییەکانی کۆماری تاجیکستان.

٣ـ پێکهێنانی رێبەری گشتی و ئیرادەی سیاسی هاوولاتیان لە راستای کەڵك وەرگرتنی باش لە هێزی مرۆیی‌و پاشکەوتەکان، دابینکردنی دادپەروەری جنسی لە بەرێوەبەری حکوومیدا.

٤ـ هێنانە ئارای بارودۆخێك کە لە راستای بەهێزکردنی ئاڵترناتیڤی سوسیال دێموکراتیك لە کۆمەڵگادا، بیرۆکەی پارلمانتاریزم و فرە حیزبی لە سەر بنەمای رێزگرتن لە ئەندێشەی تایبەتی تاکەکەسی‌و یەکتر موار کردن

**١٢ـ حیزبی جووتیاری تاجیکستان**

حیزبی جووتیاری تاجیکستان بە رێبەری حکمەتوڵلا نەسرەلدین ئۆف لە دژوارترین قۆناخی مێژوویی تاجیکستاندا هاتە گۆڕەپانی سیاسی ئەم ولاتەوە. لە دوایین ساڵەکاندا ئابووری تاجیکستان تووشی قەیرانێکی قوول بوو. بەرهەمهێنانی لۆکەو بەرهەمەکانی جووتیاری بە شێوەیەکی بەرچاو دابەزی و نەبوونی خواردەمەنییەکان زۆر بە باشی هەست پێ‌دەکرا. رووداوەکانی ساڵانی ١٩٩٢ ـ ١٩٩٣ هۆکاری ئەم قەیرانە ئاماژە پێکراوانە بوون.

بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمهێنانی جووتیاری و دابینکردنی مەوادی خۆراکی خەڵکی تاجیکستان گەلاڵەیەکی گونجاو بۆ سەربەخۆیی خۆراکی تاجیکستان بەرهەڤکراوە. حیزبی جووتیاری تاجیکستان ئامانج و ئەرکی خۆی لە قۆناخی یەکەم پێشگیری لە دابەزینی وەبەرهێنانی بەرهەمە جووتیارییەکان و دابینکردنی بارودۆخی گونجاو بۆ گەیشتن بە خۆبەرێوەبەری لە بەشی وەرزێری لە چوارچێوەی ئابووری ئازاددا لە قەڵەم دەدا.

ئیستراتیژی چالاکی حیزبی جووتیاری تاجیکستان لە راستای پەرەپێدان بە گەشەو برەویی کۆمەڵگای مەدەنییە و ئامانجەکانی بریتییە لە: دابینکردنی مافی وەك یەك، پاراستنی یەکریزی و ئاشتی‌و ئازادی، بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشگوزەرانی گشتی.

ئیستراتیژی گەشەسەندنی بریتییە لە: دامەزراندنی حکوومەتێکی یەکگرتوو، تێکۆشان بۆ دێموکراسی، دانی مافە سەرەکی و مادییەکانی خەڵك. هەڵبەت لە تەنیشت ئەم حیزبانە، گرووپگەلی جۆراوجۆری دیکەش لە تاجیکستاندا هەن کە گرینگترینیان "کۆمەڵەی ئاریانەی کەبیر"ە.



دوای دەرکەوتنی گرووپ و رێکخراوگەلی جۆراوجۆر لە تاجیکستاندا گرووپێك لە ناسیۆنالیستەکانیش بەناوی "رێکخراوی کوورشی مەزن" بە هەستی ئێرانچییەتی پێکهات. ئەم رێکخراوە واتە رێکخراوی کوورشی کەبیر لە سێپتامبری ١٩٩١ نێوی خۆی بۆ "ئاریانای کەبیر"ی گۆڕی. بەلاَم لە ئەساسنامەکەیاندا گۆڕانکاری پێك نەهات.

ئامانجی ئەم رێکخراوە یەکخستنی خەڵکی فارس زمان لە ولاتانی تاجیکستان و ئێران و ئەفغانستان دایە. حەوتوونامەی "سامان" کە ئۆرگانی دامەزراوەی زمان و ئەدەبیاتی تاجیکە، روانگەکانی ئەم گرووپەیش بلاَودەکاتەوە. لە بلاَوکراوەکانی دیکەی ئەم رێکخراوە مانگنامەی "مێهر" ١ لە ٤ی بابەتەکان بە رێنووسی سیریلیك و سێ بەشەکەی تر بە زمانی فارسی بلاَودەکاتەوە. چالاکانی ئەم رێکخراوەش دوای شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان قەدەغە کرا.

## فەسڵی دووهەم

## پرسی شوناس‌و قەیرانە ئەتنیکی ـ نیشتمانییەکان

پرسی شوناس لە چەندین بەشی زانستی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی هاتووەتە ئاراوەو بۆتە هۆی ئافراندنی دەیان گریمانە. بەم شێوازە کە شوناس، پرۆسەیەکی فرەرەهەندی بووە بە تێگەیشتنی یەك لایەنە لەمەڕ بەشێکی تایبەتی لەو مەسەلەیە ناتونێ راڤەیەکی گشتگیری لێبکەوێتەوە. لەلایەکی دیکەوە گۆڕانە بەرفراوانەکان لە هەردوو ئاستی تاك و بە کۆمەڵدا، شوناس پێکدەهێنن گۆڕانکاریگەلێکی وەك بواری دەروونی تاك، پەروەردەی بنەماڵەیی ئایین، قەومییەت، شوێنی جوغرافیایی، مێژووی هاوبەش و ئەزموونە کۆمەڵایەتییە نەتەوەیی و تاکییەکان، چینی حیزب، تەمەن ژینگە و داب و نەریتەکان لە دوایین ڕێکخستنەکانی شوناسدا رۆڵ دەگێڕن. شوناسی مرۆڤ لە سەرچاوەی جۆربەجۆرەوە سەرچاوە دەگرێ‌و تاك لەپاڵ ئەو توخمە جۆراوجۆرانە کە واتا بە ژیانی دەبەخشێ، دەتوانێ بە پلەو پایەیەکی هاوتایی کەسایەتی بگات[1].

یەکێك لە سەرچاوەکانی شوناسی پێدەر، شوناسی نەتەوەییە، پێشینەی نەتەوە بە واتای نوێکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەیەم لە ئەورووپادا کە لەدوای شەڕی سێ‌ساڵەو بەستنی گرێبەستی "وەستڤالیا" سیستمی نوێی واتایی فرەیی بەخۆوە گرت[2]. یەکە جوغرافیایە پرش‌و بڵاوەکان بوونە وڵاتگەلی سەربەخۆو چوونە ژێر دەسەڵاتی پادشاکان. بەدوای شۆڕشی فەڕانسە

(١) بۆ زیاتر ناسینی گشتی پرسە دەروونناسییەکانی ناسنامە سەردانی ئەو سەرچاوانە بکەن:

- Erik. H. Erikon, "Identity and The Cycle", Psychological Issues, No, 1, 1959
- The Concept of Tdintity in Race Aelatios: Notes and Daedous, (No, 95), 1966, PP. 145-177
- Maurice, R. Stein, et. al, Identity and Anxiety (New York: Free Press, 1960

(٢) شاپووری رواسانی، "نێوەڕۆکی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای مەدەنی لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراویدا چییە؟" زانیاری سیاسی‌و ئابووری، ژمارەی ٥و٦، ڕێبەندان‌و رەشەمەی ١٣٧٦، لاپەڕەی ١٢



چەمکەکانی "حکوومەتی نەتەوەیی"، "دەسەڵاتی خەڵکی"و "نەتەوەگەرایی" بە کردەوە بێنراو تەنیا لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا بوو کە هەستە نەتەوەیی و نەتەوەخوازییەکان بەواتای نوێ گەشەی سەندووە جێی کردەوەو قەوارەی بە ژیانی تایبەتی‌و کۆمەڵایەتیدا.

پێش ئەم سەردەمە ئەمەگناسی تاکەکان پتر لە چوارچێوەی بەهاو هەستە ئەتنیکی و هۆزو خێڵەکییەکان، لە ئاستێکی بەربڵاوتردا، هەست بە گرێدراویی بە دەسەڵاتی فەرمانڕوایی ئیمپراتۆرییە نیزامی یان دەسەڵاتە ئایینییەکان کورت دەکرایەوە. بەهەرحاڵ بەهۆی فرەچەشنی فرەیی نەتەوەکان بەسەر توخمە پێکهێنەرەکانی نەتەوە بەتایبەتی توخمە سەرەکییەکانی، بۆچوونێکی لێ نەکەوتووەتەوە. کەس دڕدۆنگی لەوە نییە کە نەتەوە جۆرێك لە پێکهاتەی مرۆڤە کە دەرفەتی پەیوەست بوونی زۆر یان کەمی بەردەوامی کۆمەڵێکی زۆر لە مرۆڤەکان پێك دەهێنێ و ئەندامەکانی بۆ شوناسێکی نوێ ئامادە دەکا کە زۆر بەرزترە لە شوناسی ئەتنیکی، خێلی و عەشیرەتییەکان.

ئەوڕۆکە کۆمەڵگای تازە سەربەخۆکان لەگەڵ سیستمێکی نێونەتەوەیی تایبەتی بەرووڕوون کە ئەندامە پێکهێنەرە "حکوومەتە نەتەوەییەکانە"و ئەمە بەم واتایەیە کە ئەم کۆمەڵگایە هەرچی خێراتر قەیرانی هەڵقولاو لە گواستنە بۆ سیستمی "شوناسی نەتەوایەتی" تێپەڕ بکەن. ئەگەر کێشەی شوناسی لە گۆشە نیگای بیچمگرتنی "شوناسی نەتەوایەتی"یەوە بخرێتە بەر توێژینەوە بۆمان دەردەکەوێ گشت وڵاتانی هەنووکەی جیهان لە قۆناخێك لە مێژووی خۆی لە مێژووی هاوچەرخدا لەگەڵ قەیرانی شوناسی نەتەوایەتیدا بەرووڕوون و چارەنووسەکەیان تا رادەیەکی زۆر لە پێوەندی چارەسەرکردنی ئەم قەیرانەدا بوون و دەبێ سەرنج بدەین کە واتای نەتەوە لە سەردەمی هاوچەرخدا راستەوخۆ لەگەڵ واتای نوێگەرایی لە پێوەندی دایە، بەو واتایە کە ژمارەیەك لە خەڵك کە لە نیشتمانێکدا کۆبوونەتەوەو بەدەستهێنانی ژیانێکی باشترو بەهرەمەندبوون لە بەرهەمە شارستانییەتییە نوێیەکان خەریکی خۆڕێکخستنی بەربڵاوی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و کولتووری دەبن و بە دامەزراندنی حکوومەت‌وتەشکیلاتی ئیداری و حکوومی تێدەکۆشن و پلانێکی نوێ بۆ داهاتوویەکی باشتر داڕێژن. لەم واتایەدا، نەتەوە بەگشتی لە کۆمەڵێکی هەراو بە ئەژمار دێن کە هەست و خوخدەکانیان بە یەکترەوە گرێداوە. پلەگەلێك لە باوەڕ بە یەکترو ئارمانجە هاوبەشەکان لە نێوانیاندا بیچمی گرتووە. بە کورتی ئەوەی کە پێکهێنانی نەتەوە بەستراوە بە بیچمگرتن و یەکانەگیری شۆناسی گشتی نوێ

واتە شوناسی نەتەوایەتییە. کەوابوو گرینگترین پرسی کۆمەڵگا سەربەخۆ نوێیەکان ئەوەیە کە حەزو وەفادارییە ناوچەییەکان لە زۆربەی بوارەکاندا بۆ لای بەرژەوەندی بەربڵاو و گشتییەکان پاڵ پێوە بنرێ. ئەم کۆمەڵگایە خاوەنی هەستە نەتەوەییەکان دەبن.

هەڵبەت هەستە نەتەوەییەکانیش هەم هۆکاری یەکگرتوویی‌و هەم جیاکەرەوەن و بە واتایەکی دیکە تێخی دوو دەمە کە دەتوانێ گرووپەکان تێکەڵی یەکتر بکات و هەم هەستە جیایی خوازییەکان لە نێوانیاندا بخولقێنێ. هەر بۆیە یەکێك لە مەترسیدارترین و هەستیارترین ئەرکی بژاردە سیاسی‌و کولتوورییەکانی کۆمەڵگا سەربەخۆ نوێیەکان ئەوەیە کە توخمەکانی شوناسی ئەتنیکی و نەتەوەیی بە چەشنێك تێکەڵ بکەن و پێداگرییان لەسەر بوارگەلێ بکەن کە مەترسی نەکەوێتە سەر یەکگرتوویی و یەکڕیزی نەتەوەیی.

خاڵی جیگای تێڕامان لە ڕەوتی شوناسی لە دۆزی کۆمەڵگا سەربەخۆ نوێیەکاندا، ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی پلان داڕێژان و بڕیاردەرە سیاسی و کولتوورییەکانی ئەم چەشنە کۆمەڵگایانەیەو زۆربەی لێکۆڵەران بە ڕادەیەك گرینگی بە پلان داڕێژی و دەستێوەردان لەم پرۆسەیە دەدەن کە گوایە دەکرێ نەتەوەیش وەك ڕێکخراوێکی ئیداری پێکبهێنرێ.

چەمکی نەتەوەسازی خۆی دەربڕی ئەم شێوە بیرکردنەوەیە. بە هەرحاڵ ئەگەر قەبووڵ بکەین کە توخمگەلی وەك زمان، مێژوو، ئایین، داب و نەریت، ڕەگەز، نیشتمانی، وێژە، سیستمی حکوومەتی[1] لە گرینگترین هۆکارەکانی بەخشینی شوناسی یەکگرتوویی بە ئەژمار دێن دەتوانین بانگەشەی ئەوە بکەین بە هەر ڕادەیەك لە کۆمەڵگایەکدا ڕێژەی هاوبەشییەکان لە هەرکام لەو هۆکارانەی ئاماژە پێکراو زیاتر بێ، هەروەها هەرچی بارستایی پتر هۆکارەکانی سەرەوە لە کۆمەڵگایەکدا هەبێ، چارەسەرکردنی کێشەی شوناس ئاسانتر دەبێ بەڵام نابێ وا تێبگەین کە بەردەوامی و پتەوی شوناسی نەتەوایەتی بەگشتی گرێدراوە بە گشت هاوبەشییە بەرزەکانەوە.

لە پراکتیکدا بەشداری بەهێزی هێندێك لە هۆکارەکانی ئاماژە پێکراو دەتوانێ بوارێکی گونجاو لە پێکهێنانی نەتەوەو زاڵبوون بەسەر ئاڵۆزییەکانی شوناس بڕەخسێنن. چارەسەر کردنی کێشەی شوناس تا ڕادەیەك دەکەوێە ژێر باندۆری دیاریکردن و پلاندارێژی بژاردە سیاسی و

(١) ویلیام فیرحال، زمان، شوناس، وتووێژ لە ئاسیای ناوەندی و قەفقازی باشووریدا، مانگنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ژمارە ٢٦، هاوینی ١٣٧٨، لاپەڕەی ٨



کولتوورییەکانەوە. چونکە دەستنیشان کردنی هەڵە یان پێداگری لە ڕادەبەدەری لەسەر چەند هۆکار ڕەنگە بە جێگای ئەوەی یەکگرتوویی بخولقێنێ بە خێرایی جووڵانەوە جیاییخوازەکانی لە ناوەندی بەدواوە دەبێ[1].

لە کۆمەڵگا سەربەخۆ نوێکاندا یەکێك لە خێراترین کردەوەکانی حکوومەتە نوێیەکان گۆڕینی هێماو ناوە پێشووەکان و ناساندن و بڵاوکردنەوەی هێماو ناوە نوێیەکانە لە چوارچێوەی شوناسی نەتەوایەتی نوێ دایە. هەروەها دەبێ بەهاکان، ئوستوورەکان، کەسایەتییەکان، دروشمە نەتەوەییەکان لە ڕێگای پەروەردە فەرمییەکان، ڕەشنووسەکان و ڕاگەیەنە گشتییەکانەوە لەنێوان چین و توێژە جۆراوجۆرەکان و گشت ناوچەکانی وڵاتدا بناسرێ و پڕۆپاگەندی بۆ بکرێ. بوونی زمانێکی هاوبەش دەتوانێ ئەم پرۆسەگەلە ئاسان و خێرایی پێدەبەخشێ. هەستە هاوبەشەکان لەنێو خەڵك، گرووپەکان و ئەتنیك و نەتەوەکاندا بەهێز بکا. سەرەڕای ئەمەش لە سەردەمی دوای سەربەخۆییدا ڕادەو فرەچەشنی پێوەندییەکان بە شێوەیەکی بەرچاو پەرە دەستێنێ کە خۆی نیشانەی ئاڵۆزبوونی پێکهاتەی کۆمەڵگاو فرەچەشنی پتری ڕۆڵەکان، هەروەها بەرزبوونەوەی کردەوەی بەرانبەرانە و هاوپێوەندی بەرانبەرانە لەنێو خەڵك و گرووپ و دامەزراوەکان دایە "دانکوارت ڕاستو" ڕۆڵی زمانی لە کۆمەڵگادا لەگەڵ ڕۆڵی دراو لە ئابووریدا بەراورد دەکا، ئەمە بەو واتایەیە کە دراو بەردەوام کۆمەڵگاکانی هەنووکە هۆکاری پێوەندییە ئابوورییەکانە و زمانی هاوبەشیش هۆکاری پێوەندییە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکانە. ئەم ڕۆڵە بێگومان لە کۆمەڵگا سەربەخۆ نوێیەکاندا کە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووری و ئابووری نوێی پێویستە و پێوەندییەکان لە ئاستی نێوان تاك و گرووپدا پەرە دەستێنێ پتر یەکلاکەرەوەیە. لەگەڵ ئەوانەشدا، ڕۆڵی هاوپێوەندی هێنەری یەکگرتوویی هۆکارەکانی دیکەی وەك مێژوو، داب و نەریت، ئایین و کەلەپوور تا ڕێژەیەکی زۆر لەنێو گرووپدا هەیەو بوونی زمانی هاوبەش، زمانی نەتەوەییە[2].

(١) سەید عەلی ئەسغەر کازمی، "هزری وەرزی کولتوورو شارستانییەت سازی"، زانیاری سیاسی ئابووری، ژمارەکانی ٩و ١٠، پووشپەڕو گەلاویژی ١٣٧٨، لاپەڕەی ١٣

(٢) سەید عەلی مورتەزەویان، "قەیرانی شوناسی نەتەوایەتی: ڕۆڵی زمان و ڕێنووسی هاوبەش لە نوێژەن کردنەوەی شوناسی نەتەوەیی"، وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای نێوەڕاست و قەفقاز، ساڵی چوارەم، ژمارەی ٩، بەهاری ١٣٧٤، لاپەڕەی ٤

به قبوولکردنی ئەم راستییە کە پێوەندییەکی نزیك لەنێوان زمان و شوناسی نەتەوەییدا هەیە، ئێستا باشتر دەتوانین تێبگەین کە سیاسەتە زمانییەکانی رێژیمی سۆڤییەت تا چ رادەیەك لە لاوازو دابەشی شوناسە نەتەوەییەکان لە ئاسیای ناوەندیدا کاریگەرییان هەبووە. بە جۆرێك دەتوانین سیاسەتەکانی حکوومەتی کۆمۆنیستی بەرامبەر بە نەتەوە غەیرە رووسەکان وەك دژایەتی لەگەڵ نەتەوە و بە رووسی کردندا کورت بکەینەوە. ئەم جوولانەوەیە هێدی هێدی لە شۆڕشی ئۆکتۆبرەوە دەستیپێکردو لە سەردەمی رێژیمی ئێستالین رادیکاڵتر بۆوە، دەسەڵاتدارانی دیکەی سۆڤییەتی پێشوو هەر ئەو سیاسەتە گشتییەیان گرتە بەر.

دۆزی نەتەوەکان لەسۆڤییەتدا، لەڕاستیدا پرسی شوناسی سیاسی بوو(1). گرینگترین پرسیار لە دڵی ئەم مەسەلەیەدا ئەوە بوو کە خەڵکی سۆڤییەت چۆن پێوەندی سیاسی خۆیان لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤییەت پێناسە و روون بکەنەوە؟ لەم پێوەندییەدا پێنج بابەت جێگای گرینگی پێدانە:

بابەتی یەکەم ئەوەیە سۆڤییەتی پێشوو بە واتای تەواوی وشە، ئیمپراتۆرییەك بوو. ئیمپراتۆرییەکان خاوەنی تایبەتمەندییەکی هاوبەشن. لە هەموو ئیمپراتۆرییەکاندا ئەتنیك، رەگەزو گرووپێك لە سنووری هێز و ساماندا جێیان گرتووە و ئەتنیك و گرووپەکانی دیکە لە پەراوێزدا هەڵکەوتوون و لە هەمبەر ناوەندەوە ناچارن گوێڕایەڵ و جێبەجێکاربن. ئیمپراتۆرییە کۆنەکانی ئێرانی، رۆم، یونانییەکان و ئیمپراتۆرییەکانی هاوچەرخ عوسمانی و بریتانیا هەموویان لە تایبەتمەندی سەرەوەدا هاوبەشن. دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە لەگەڵ هاوبەشی ئاماژەپێکراودا، چۆنییەتیی هاوبەشی ناوەندو دەوروبەر پێوەندی فەرماندەران لەگەڵ فەرمانبەران لە ئیمپراتۆرییە جۆربەجۆرەکان لەرووی پێکهاتەگەلی تایبەتەوە هەرکام لەوانە جیاوازییان لەگەل یەکتردا هەبوو. بەڵام یەکەم هەموویان فرە نەتەوەنو دووهەم ئەتنیك و گرووپێك لەچاو ئەوانی دیکەوە بەهایەکی زیاتری هەیە. سێهەم ئیمپراتۆرییەکان بۆ پێوەندی نێوان ناوەند و دەوروبەر، ناچاری خولقاندن و داڕشتنی تیۆرییە تایبەتەکان، یان بە پێکهێنانی بارودۆخێکی کۆمەڵایەتیو ئابووری بۆ دانیشتوانی ئیمپراتۆرییەکانن. چوارەم کەرەستەگەلی تایبەت بۆ داسەپاندنی پێوەندییەکانی ئاماژەپێکراو پێویستە. هێندێك لە ئیمپراتۆرییەکان شێوازێك لە گوشاری توندوتیژانە واتە هێزی سەربازی و گوشارگەلی هێمن واتە کولتوور بەکار

---

(1) بۆ باس لەسەر تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی ئیمپراتۆری سۆڤییەت سەردانی ئەم سەرچاوەیە بکەن:
Robert Conquest, The Last Empire: Nationality and The Soviet Future (Stanford: Hoover Institution press, 1986)



دەهێنن. لەم چوارچێوەیەدایە کە شوناسی سیاسی هاوبەشی دانیشتووانی ئیمپراتۆرییەکان دێتە گۆڕێ. سۆڤییەتیش وەك ئیمپراتۆرییەك لەم رێچکەیەدا بێبەش نییە.

دووهەمین مژار لە پێوەندی لەگەڵ ناسینی پێوەندی شوناسی سیاسیو ئیمپراتۆری سۆڤییەت پێویستی بە سەرنجدانە، گرێدراویی جوغرافیایی تایبەت بە ناوەندی ئیمپراتۆری و وڵاتەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری سۆڤییەت بووە. هەموو ئیمپراتۆرییەکان بەمجۆرە نەبوون. بۆ وێنە وڵاتانی بیاڤی فەرمانڕوایی ئیمپراتۆرییە ئەوروپاییەکان واتە بریتانیا، فەڕانسە، پۆرتەغالو ئیسپانیا لە هەموویان لە قاڕەی ئاسیا، ئافریقاو ئەمریکاداهەڵکەوتوو بوون.

گرێدراوی جوغرافیایی ئیمپراتۆری سۆڤییەت لەگەڵ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیدا، تێکەڵبوونی ئەتنیکی تایبەتی بەدواوە بوو. رووسەکان و غەیرە رووسەکان لە چوارچێوەی بەرینی سۆڤییەتدا بە جۆرێك تێکەڵبوون کە تا رادەیەك هەموو ناوچەکانی ئەم قەوارەیە، سیمایەکی فرەنەتەوەییان هەبووەو ئێستاش هەموویان بەگشتی نێوەڕۆکی فرە نەتەوەییان بەخۆوە گرتووە. زایەڵەی ئەم گرێدراوییە و تێکەڵبوونە ئەتنیکییانە، لە چڕوپڕبوونی پرسی شوناسی سیاسیدا بوو. لە تەنیشت رەوشی ئاماژەپێکراودا، بێگومان رووسەکان، بارودۆخی بەرزتریان هەبوو. پاراستنی ئەم سەروەرییە لە کردەوە تیئۆریدا، لە ناوچەیەکدا کە تێکلاویی نەتەوەیی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیو ئابووری لەیەك دانەبڕاون، گەیشتن بە یەك شوناس دەبێتە هۆی کردەیەکی ئاڵۆز.

سێهەمین بابەتێك کە دەبێ راڤەی دیاردەی شوناسی سیاسی لە سۆڤییەتی پێشوودا لە بەرچاو بگیرێ، واتایی ئیدئۆلۆژی مارکسیستی- لێنینیستی بوو. ئیمپراتۆرییەکان نێوەڕۆکێکی دەسەڵات تەوەرو نەتەوەییانەیان هەبووەو کۆبەند لە چوارچێوی نەتەوەیەك زاڵ بەسەر نەتەوەکانی دیکەدان. لە سەردەمی سۆڤییەتدا، ئیدئۆلۆژی مارکسیستی- لێنینیستی، لە رووی تیئۆرییەوە لە دژایەتی لەگەڵ بناغەی پاراستنی ئیمپراتۆریدا جێی دەگرت. چونکە ئیدئۆلۆژی مارکسیستی- لێنینیستی، بانگەوازێکی جیهانی هەبوو و لەگەڵ سرووشتی ئینتێرناسیۆنالیستی خۆیدا، دژی سنووربەندی رەگەزی، پوانگەلی و نەتەوەیی بوو. چۆنییەتی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە واتە پاراستنی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری لەگەڵ ناوەندیەتی قەومی رووس، پەرەدان بە ئیدئۆلۆژی مارکسیستی- لێنینیستی، وەك قەیرانێکی هزری و کردەیی گەورەی بۆ کرملێن بە ئەژمار دەهات و ئاڵۆزییەکانی ئاکامی

شوناسی سیاسی لە سۆڤییەتدا زیاتر دەکردو چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە بەستراوەیی چڕی بە بارودۆخی هەمەلایەنانەی سۆڤییەت و شێوازی تاکی ڕێبەرانی سوڤییەت هەبوو. شێوازەکانی لێنین، ئێستالین، خرۆشچۆف، بێرژنێف و گۆرباچۆف جیاوازییان لە چارەسەرکردنی پرسی نەتەوەیی.[1]

چوارەمین بابەت لەمەڕ ناسینی ئاکامی شوناسی سیاسی کە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی لە چارەسەرکردنی پرسی شوناسدا هەیەو ڕۆڵی پێکهێنەرانە و کارتێکەرانەی ئێستالینییە[2].

ئەو داڕێژەری سەرەکی سیاسەتە ئەتنیکیو نەتەوەییەکانی سۆڤییەت لە سەردەمی دوای کۆمۆنیزمدا بوو. ئێستالین گورجی بوو، وەك رووسەکان هەڵسوکەوتی دەکرد. ئەو هەر وەك ڕێبەرانی دیکەی سۆڤییەت، پێداگری لەسەر یەکسانی گەلان دەکرد بەلام لە کردەوەدا میراتی ئیستالین لە بواری مەسەلەی نەتەوەکانەوە بە دوو تایبەتمەندی دەتوانین بناسین.

تایبەتمەندی یەکەم: نیشتمانی کردنی پرسی نەتەوەکانو شوناسی ئەتنیکییە. ئەو بە کردەوە تورکستانی گەورەی رووسیەی دابەش بەسەر کۆمارگەلی جۆراوجۆرو ناونیشانی ئەم کۆمارانەی وەك کۆمەڵێکی دیاریکراو لە قەومەکان یەکسان کرد. تەنیا دانی بە پێنج کۆماری نەتەوەییدا نا تورکمەنستان، تاجیکستان، قەزاقستان، ئۆزبەکستان و قرقیزستان. ئەوانی دیکە لە نێوخۆی ئەم وڵاتانەدا وەك ئەتنیکی جۆراوجۆر، بێبەش کران لە وڵات و حکوومەتی سەربەخۆو لە پراکتیکدا جۆرێك دژکردەوەی شوناسی نەتەوایەتی هاتە گۆڕێ. ئاکامی وەها بابەتێك بووە هۆی ئاڵۆزتربوونی نێوەڕۆکی شوناسی سیاسی بەتایبەت ئەگەر وادابنێین کە ئێستالین ناوچە خودموختارەکان و کۆمارە خودموختارەکانی بەنێوی هێندێك لە نەتەوەکان لەنێو کۆمارە سەربەخۆکاندا ڕێکخست. بۆ وێنە کۆماری خودموختاری نەخجەوان بە زۆرینەی ئازەری لە ناو ئەرمەنستان جێی گرت و کۆماری خودموختاری قەرەباخ بە زۆرینەی ئەرمەنی

(١) بۆ باسی ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی ئیدئۆلۆژی لە چوارچێوەی ئیمپراتۆری سۆڤییەتدا بڕوانن بە:

Hanes Adometi, Russia asa "Great power" in World Affair: Images and Reality", International Affairs (Condon) vol. 77, No. 1 (January 1995), PP. 33-56

(٢) بۆ ناسینی ڕۆڵی ئیستالین لە دروستکردنی پێکهاتەی پرسی نەتەوەییەکان لە سۆڤییەت سەردانی ئەم سەرچاوە بکەن:

Richard Pipes, The Formation of The soviet un



لەنێو کۆماری ئازەربایجاندا جێیان گرت و ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هەموو خەڵك وەك هاووڵاتی سۆڤییەت یەکسان لە قەڵەم دەدران[1].

تایبەتمەندی دووهەم: پرسی نەتەوەکان لە سەردەمی ئێستالیندا دەبێ لەسەر کارتێکەرییەکانی شەڕی دووهەمی جیهانی بەدوایدا بگەڕێین. ئێستالین کە خۆی گورجی بوو، وەك گشت وڵاتانی دەرگیر لە شەڕ بە دژی ناسیۆنالیزم داو پێداگری لەسەر بەرگری لە وڵاتی دەکرد. ئەم مرۆڤانە کە بەرهەمی نیوسەدە دەسەڵاتداری سوسیالیزم لە قەڵەم دەدرێن دەبێ لە گرێدراویی نەتەوەکان دوور بخرێتەوەو بیریان لە بەرژەوەندییەکانی سوسیالیزم بکردبایەتەوە. بۆیە شوناسی سیاسی ئەوان نەدەبەسترایەوە بە خاك و حکوومەتەکانی کە لەوێ لێی بوون، بەڵکوو لە پێوەندی لەگەڵ سوسیالیزمدا پێناسە دەکران[2].

لە کۆتاییدا، لە سەردەمی ئێستالین، شوناسی نێوەڕۆکی نیشتمانی بەخۆوە گرت، بە جۆرێك چارەنووسی هاوبەشی هەموو نەتەوەکانی سۆڤییەت هاتە بەر باس و نەتەوەکان دابەش کران بەسەر باش و خراپ. لە کۆبەندا پڕۆسەی شوناسی لە رابردووش ئاڵۆزتر بوو، بەڵام قەوارەی ئیداری دامەزراو لەلایەن ئێستالینەوە تاکو دوایین چرکەکانی ژیانی سۆڤییەت هەر مابوو، هەنووکەش ئاسەوارەکانی ئەم پێکهاتەیە لە سنووردانانەکانی نێوان ئەم کۆمارانەی دەوروبەری سۆڤییەتدا ئاشکرایە.

دوای ڕۆڵی ئێستالین، پێنجەمین مژار تێگەیشتنی ئێمە لە ئاکامی شوناسی سیاسی لە سۆڤییەتدا بەرز دەکاتەوە، سەرنجدان بە واتای "مرۆڤی نوێی سۆسیالیستی"یە. ئەم واتایە کە بەپێی بنەمای تیئۆریکی ئاکامی شوناسی سیاسی لە ئاستی سۆڤییەتدا دەهێنێتە بەر باسەوە. بە گشتی لە دەیەکانی کۆتایی ئەو سیستمەدا زیاتر ئاوڕی لێ درایەوە. بە گوێرەی ئەم واتایە، دوایین ئارمانجی حکوومەت و کۆمەڵگای سۆڤییەت، بۆ خولقاندنی مرۆڤگەلێك تەرخان کرا کە

(١) بۆ دابەشکردنی ئیداری و سنوورییەکانی نێوخۆیی سۆڤییەتی پێشوو سەردانی ئەم سەرچاوەی خوارەوە بکەن:
Jerry Hough and Merle Fainsod, How The soviet is Governed (Cambridge: Harvard University Press, 1979), PP. 480-517

(٢) بۆ توێژینەوە لەسەر باندۆری شەڕی دووهەمی جیهانی لەمەڕ ناسنامەی گشتی لە سۆڤییەتداو ڕۆڵی ئیستالین لەم پێوەندییەدا سەردانی ئەم چاوگە بکەن:

Richard Little, Governing The Soviet Union (New York Longman, 1989), PP.257-289

"نوێ"و "سوسیالیزم" بێ. ئەم مانایە کە گرێدراویی بە زلهێزێکی جیهانی بەدواوە بوو، تا رادەیەك بەخشێنەری شوناس بووە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە لە رێگای حیزبی کۆمۆنیستەوە دەرەتانی بەشداری نەتەوە جۆراوجۆرەکان لە تەنیشت یەکەوە تا رادەیەك دێتە دی، بەڵام بەو جۆرە نەبووو هەموو خەڵك بەگشتی خۆیان بە هاووڵاتی سۆڤییەتی بزانن[(١)].

واتای مرۆڤی نوێی سویالیستی، بنەمای هزری، پێداگۆژی نوێ، کولتوور، هونەرو بنەماو ئاکارە کۆمەڵایەتییەکان بە ئەژمار دەهات و هەموو کردە کولتوورییەکان بە شێوەیەك لە خولقاندنی وەها مرۆڤێك چالاکیان بکردبایە. بۆ وێنە سینەماکانی سۆڤییەت فیلم گەلێکیان بڵاودەکردەوە کە بتوانێ لە پڕۆسەی مرۆڤی نوێی سوسیالیستیدا بەشدار بن، بەڵام لە کردەوەدا مرۆڤی نوێی سۆسیالیستی نەك هەر پێی لەسەر گۆڕەپانی بوون نەنا، بەڵکوو کەلێنە کۆمەڵایەتییە بەرفراوانەکان لە کۆمەڵگای سۆڤییەت درووستبوو کە بە هێمنی پتر لە رادەی چاوەڕوانکراو لە سەردەمی بێرژەنیف و لە کۆتاییدا هەرەسهێنانی لە سەردەمی گۆڕباچۆڤی بەدواوە بوو[(٢)].

لە کۆی باسەکاندا لەمەڕ شوناسی سیاسی لە سەردەمی سۆڤییەت گەیشتن بەم روانگە ئاساییە کە کۆمۆنیستەکان دوای نزیك بە حەفتاو چوارساڵ حکوومەت، لەگەڵ بانگەشە تیئۆرییەکانیان، نەیانتوانی پرسە نەتەوەییەکان، هەروەها مەسەلەی پێناسەی سیاسی چارەسەر بکەن. ئەوان تەنیا پرسی ناسنامەیان ئاڵۆزتر کرد. لە هەمان کاتدا ناتوانین لەم خاڵەدا کەمترخەم بین کە میکانیزم و کەرەستەی هزری و پراکتیکی پێویست بۆ دامەزراندنی جۆرێك شوناسی گشتی بەرهەڤ کرا. بەدوای رووخانی سۆڤییەتی پێشوو، شوناسی گەورەی ئیمپراتۆرخواز، تووشی لەبەریەك هەڵوەشانەوەی پێکهاتەیەك هات و لە ئاکامداو پرش و بڵاوی لە سێ ئاستی سیاسی گشتگیرداو بێ توانایی ئیدئۆلۆژی مارکسیست ـ لێنینیستی لە دابین کردنی بارودۆخی یەکسان و پەرەو گەشەی کۆمەڵایەتی و لاوازبوونی هێزی سەرکوت و

(١) بۆ باس لەسەر پێکهێنانی "مرۆڤی نوێی سوسیالیستی" سەردانی ئەم چاوگە بکەن:
Richard Little, Governing the Sariet Union (New York: Longman, 1989), PP. 257-289

(٢) بۆ سەرنجدان بە بەردەوامی پێکهاتەی ئیستالینی لە تەنیشت شێوازی جۆراوجۆری جێنشینەکانی ئیستالین لەمەڕ پرسە نەتەوەییەکان سەردانی ئەم چاوگە بکەن:
Sweryn Bailer, Stalin’s Successors: Leadership, Stability and change in the Soriet Union Cambridge: Harvard University Press, 1980), pp. 207-226



هێزی نیزامی، لە کۆتاییدا بووە هۆی لەیەك بڵاوبوونەوەی شوناس لە کۆمارەکانی دەوروبەری سۆڤییەت لەدوای ساڵی ١٩٩١دا.

بە واتایەکی دیکە دینامۆ سەرەکییەکانی پاراستنی ئەم ئیمپراتۆرییە واتە "هێزی نیزامی"و "ئیدئۆلۆژی مارکسیستی"، کارامەیی خۆی لەدەستدا. تێشکانی شوناس و لە یەك جیابوونەوەی چینە شوناسییەکان لە زەمەنی دوای هەرەسهێنانی سۆڤییەتدا، بە راڤەی سێ ئاست لە بەریەك هەڵوەشانەوەی شوناس روونتر دەبێتەوە:

ئاستی یەکەم، هەڵوەشانەوەی ناسنامە لە ناوەندی ئیمپراتۆری سۆڤییەت واتە بازنەی ئیسلامییەکان، بە شێوەی گشتی و رووسەکان بە شێوەی تایبەتییە. لە ناوەندی ئیمپراتۆری سۆڤییەتی پێشوو واتە لە بازنەی بە رەچەڵەك سلاڤی کە بە زۆری رووسەکان و بیلەرووسەکان و ئۆکرانییەکان لەخۆ دەگرێ، جێیان گرتبوو. بە دوو شێوە لەم ناوەندەوە دابڕانی پێناسە هاتە ئاراوە. شێوەی یەکەمی ترازان لە نێو ئیسلامییەکاندا بووە ئەوەی دیکە گۆمانێکی ئاشکرا کە ناسیونالیزمی ئۆکراینی لەگەڵ ناسیونالیزمی رووسیدا ناکۆکیو دژایەتییان هەیە.

جۆری دووهەمی لە یەك بەربوون لە ناوەندەوە، درزتێکەوتنی شوناسی نێوان رووسەکان بوو. پێشتر وا لێکدەدرایەوە کە رووسەکانی دانیشتووی سوڤییەت شوناس و چارەنووسێکی هاوبەشیان هەیە. بەڵام ئەم شوناسە هەنووکە کەلێنی تێکەوتووەو لە وڵامی رووسییەك کێ بوو؟ چ تایبەتمەندییەکی هەیە؟ شێوە وڵامێکیان نییە. کێشەی شوناسی رووسی، لە پرسە بنەماییەکانی رووسیە هەنووکەیە[(١)].

لانیکەم لە سێ بەشی شوناسی رووسیدا، لەچاو رابردوو، تووشی درزتێکەوتنێکی قووڵ هاتووە.

بەشی یەکەم، چوارچێوەی تاکییە. لەپاڵ مێژووی هاوبەش و کولتووری رووسی، پێناسەکردن لە شوناسی هاوچەرخی رووسی لەگەڵ شك و گومان رووبەروو دەبێتەوە. فرەبەریانییەکان، گرووپەکان، حیزبەکانو تەنانەت قەوم و نەتەوەکانی نێو فیدراسیونی رووسیە، شکان لەم بەشەدا پێشاندەدەن ئایا چیچانییەك کە لە فیدراسیونی رووسیەدا دەژیت و بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی مسکۆ، بە بەشێك لە هاووڵاتیانی رووسی لە قەڵەم دەدرێن، رووسین؟

(١) بۆ باسەکانی پێوەندیدار بە شوناسی رووسی ئێستاو بەریانە جۆراوجۆرەکانی شوناس سەردانی ئەم چاوگە بکەن: ئیلاهەی کولایی، "ژیانەوەو گەشەی هەستە نەتەوە خوازانە لە رووسیە، زانیاری سیاسی ـ ئابووری، ساڵی هەشتەم، ژمارەی ٨٠ ـ ٧٩ (خاکەلێوەو بانەمەڕی ١٣٧٣).

ئایا ژێرنۆفسێکی رێبەری حیزبی لیبراڵ دێموکراتی رووسیە، رووسییە کە خوازیاری بەربڵاوکردنی سنوورەکانی رووسیە هەتاکو خەلیجی فارسە یان سۆلوژنیسین، نووسەری شاری رووسی کە پەرگرتنی سنوورەکانی رووسیە تاکو ئاسیای ناوەراست و قەفقاز لە چاخی هەژدە بەم لاوە لە دیاردەیەکی شەرمەزاری بۆ رووسیە پێناسە دەکا؟[١]

بەشی دووهەم تێکشکانی پێناسەی رووسی، لە شکان و تێکڕووخانی سەر ئیداری دەردەکەوێ. وا بەرچاو دەکەوێ کە لێکدانەوەی دامەزراوە ئیدارییە جۆربەجۆرەکانی رووسیە لە واتای پێناسەی رووسی جیاوازیان لەگەڵ یەکتردا هەیە. لێکدانەوەکانی سوپای رووسیە لە واتاو رۆڵی رووسیەو شوناسی رووسی، جیاوازە لەگەڵ لێکدانەوەی دامەزراوەکانی دیکەی ئیدرای ئەم وڵاتەدا. تامەزرۆیی بە واتای بەربڵاو لە شوناسی رووسی و نێوەرۆکێکی فەرمی لە نێوان باڵەکانی ناو سوپادا جێگای تێرامانی تایبەتییە.

سێهەمین بەشی تێکشکانی شوناسی رووسی، رەنگێکی نێونەتەوەیی هەیە. شوناسی نێونەتەوەیی سۆڤییەت، پێشتر رۆڵێکی جیهانی بۆ ئەم وڵاتە بەدواوەیە. ئایا رووسیەی هەنووکە خاوەنی هەر ئەو شوناسە نێونەتەوەییە یان ئەو شوناسە رۆڵێکی دیکە بە خۆیەوە بگرێ؟ وڵام بۆ ئەم پرسیارە بەخشینی شوناس، مەرجێکە بۆ هەڵسەنگاندنی بەریانە سیاسییەکان لە ناوەوەی رووسیەو پرسیارگەلی زۆر جیاواز بەیانگەری دارمانی یەکگرتوویی راوو رێکەوتن، لەراستیدا تێکشکان لە شوناسی نێونەتەوەیی رووسیە دایە.

لە دووهەمین ئاست، واتە ئاستی ناوچەیی، شکان و رووخانی شوناسگەلێکی جۆراوجۆر بەرچاو دەکەوێ. دەبێ ئەوە بڵێین کە رووخانی سۆڤییەت، بووە هۆی کرانەوەی ناوچەیەك کە نزیکەی سەدەیەك بەسەر ناوچەکانی دەوروبەر داخرابوون. "دیاردەی کرانەوەی ناوچەیی" لە دەوروبەری سیبری تاکو چین، ئاسیای ناوەندی، دەریای خەزەر، قەفقاز، سنوورەکانی رۆژهەڵات و باکووری ئەوروپا لە خۆ دەگرێ. لەم ناوچەگەلەدا، پێشاندەدا کە شۆناسی پێشوو لایەنی گشتگیری هەیەو گۆڕدراوە.

(١) بۆ ئاگاداربوون لە روانگەکانی سۆلوژ نتسین سەردانی ئەم سەرچاوە بکەن:
سەید عەلی کازم سەجادپوور "گەڕانەوەی سۆلوژنتسین بۆ رووسیە: دەرکەوتنی ناسیۆنالیزم دوورنگار"، ئیتلاعات، ١٣٧٣/٣/١٦



رووی یەکەمی شوناسی ناوچەیی، گەڕانەوە بە جۆرێك تێگەیشتنی هاوبەشی لەنێو کۆمارەکانی ناوچەیەك کە لەنێو سۆڤیەتی پێشوودایە ئەم شوناسەیە لەناوچەی باڵتیك پترە لە ناوچەکانی دیکە. سەرنجدان بە شوناسی بە کۆمەڵ لە ئاسایی ناوەندیش لەم پێوەندییەدا جێی دەگرێ. ئەم سەرنجە ناوچەییە نابێ بە واتای رێکەوتن لەمەڕ شوناسی ناوچەیی لە قەڵەم بدرێ.

رووی دووهەم شوناسی ناوچەیی، گەشەسەندنی پێوەندی نێوان ناوچەکانی سەرێ لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەر لە دەرەوەی سوڤییەتی پێشوویەکە هەم لە رووی پێکهاتەیی جۆغرافیاییو هەم لەرووی پێوەندییە مێژووییو کولتووری، شوناسە هاوبەشەکان سەرچاوە دەگرێ. پێوەندی کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاست لەگەڵ ئەیالەتی سین کیانگ چین، ئەفغانستان و ئێران، بەیانگەری بوونی شوناسێکی سەربەخۆی ناوچەییە. پێوەندی قەفقاز لەگەڵ ئێران و تورکیە، پێوەندی کۆماری مۆلداویی لەگەڵ رۆمانیو پێوەندی کۆمارەکانی بالتیك لەگەڵ وڵاتانی بیاڤی باکووری ئەوروپا، نیشانەکانی دیکەی تەشەنەی شوناسە ناوچەییەکانە[١].

بە سەرنجدان بە تەشەنەی شوناس گەلێك، ناتوانین چاوپۆشی لەم نیشانانە بکەین کە لەم یەکگرتنە ناوچەییانە، جۆرێك لە شکان و ئاڵۆزی پێوەندییە شوناسییەکان هەیە. هەرکام لەم ناوچەگەلە لە رووی مێژوویی، درێژەدەری سرووشتی ناوچەو بیاڤگەلی دەوروبەری خۆیان بوون. بەڵام نزیکەی سێ دەیە دەسەڵاتی ئیمپراتۆری رووسیە یان سۆڤییەت، پێکهاتەیەك لە پێوەندییە ئابووریو ئیداریو کۆمەڵایەتی لەگەڵ مسکۆ بەرهەم هێناوە کە بە هیچ شێوەیەك لە بارودۆخی ئیستادا ئیمکانی لە یەکترازانیان نییە. لەلایەکی دیکەوە کرانەوەی ناوچەکان، ئیمکانی گەڕانەوە بە جۆرێك لە شوناسی مێژوویی و کولتووری دابین کردووە. کۆی دوو پێوەند، واتە پەیوەندی پێکهاتەی ئابووری- ئیداری و پەیوەندی مێژوویی- کولتووری، رووناهیەك لە کێشەکان و ئاڵۆزییە شوناسییەکانە.

سێهەمین ئاستو دوایین ئاستی لە یەك بڵاوبوونەوەی شوناس، ئاستی نەتەوەیی لەخۆ دەگرێ. هەرکام لە کۆمارەکانی سۆڤییەتی پێشوو، لەگەڵ کۆمەڵێك پرسی شوناسیدا بەروڕوون کە هێندێکیان پاشماوەی ریشەی پێکهاتەی ئیستالینی لە زەمەنی سۆڤییەتدا هەیە. سێ هێما دەتوانین لە یەك دابڕانی شوناسی نەتەوەییدا لە چوارچێوەی کۆمارەکان

(١) جۆ، ئان، گراس. گراس. گۆڤاری توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز

دەبینین. جێگای ئاماژەیە کە رەوشی هەر کۆمارێك لەگەڵ کۆمارەکەی دیکە، بەتایبەتی پرسە شوناسییەکان لەگەڵ یەکتردا جیاوازن، بەلاّم لە توێژینەوەیەکی گشتی، دەتوانین نیشانەگەلی گشتی ببینین.

هێمای یەکەم لێکترازانی نەتەوەیی لە نێوەڕۆك و شوناسی واتای شوناسی نەتەوەیی شاراوەیە. بەو جۆرەی کە هێماکانی رۆیشتن، نێوی هەرکام لە کۆمارەکانی هەنووکە، بەگشتی گرێدراوە بە ناوی قەومێکەوە. هەموو کۆمارەکان لەگەڵ کێشەیەکی تایبەتی لەم بوارەدا دەست و پەنجە نەرم دەکەن. شوناسی ناسنامەی قەزاقی، بە سەرنجدان بە حەشیمەتی گەورەی رووسەکانی دانیشتووی ئەم کۆمارە- یەکێك لە نیشانەکانی لێکدابڕانە. پێداگری کۆماری فیدراتیۆی رووسیە بە دانی مافی هاوولاّتی رووسیە بۆ نزیکەی ٢٥ رووسی دانیشتووی کۆمارەکانی سۆڤییەت، روونکەرەوەی کێشەی پێناسی شوناسی نەتەوەیی لەم کۆمارانەیە.

نیشانەی دووهەمی لەیەك پچڕانی نەتەوەیی، لە تەشەنەی پێناسە دژەکان لەنێو نەتەوەو قەومێك دایە. شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان، کە شەڕێك لەنێوان نەتەوەیەکە، لە رەگی هۆکارگەلی جۆراوجۆردا لەوانە پێناسەی خۆجێییدا هەیە، گرێدراویی بە شارەکانی خۆجەندو کولاب، ریزبەندییەکانی ناوچەگەلی باکووری و باشووری، بە گوێرەی کۆی توێژەرەکانی کاروباری تاجیکستان، یەکێك لە ناکۆکییە سەرەکییەکانی تاجیکستانە. دەرکەوتنی شوناسی خۆجێیی لە چوارچێوەی توندوتیژانەو نیزامی، بەیانگەری نەبوونی یەکگرتوویەکی نەتەوەییە.

دەتوانین سێهەمین نیشانەی لێکدابڕان لە دیاردەی سنوورییەکان بەدوایدا بگەڕێین کە سنووری نێوان کۆمارەکانی پێشوو، کە نێوەڕۆکێکی دەستکردی هەیەو میراتی ئێستالینە. زۆر ئەو خەڵکانەی کە لە یەك نەتەوەدان بەلاّم بە دابەشکردنێکی ئیداری و تەنانەت لە یەك ناوچەی جوغرافیایی جیا بوونەتەوە. ئابخارییەکان باشترین نموونەی ئەم پارچە پارچە بوونانەن. هێندێکیان لە بیاڤی ئیداری رووسیەو بەشێکیان لە بیاڤی ئیداری گورجستاندا جێیان گرتووە. لە کردەوەدا ئەم دابەشکردنە یەکێك لە هۆکارەکانی شوێندانەر لە شەڕە نێوخۆییەکانی گورجستاندا جێیان گرتووە. لە کردەوەدا ئەم دابەشکردنە یەکێك لە هۆکارەکانی شوێندانەر لە



شەڕە نێوخۆییەکانی گورجستاندا بوو. ئەم لێکدابڕانە باندۆر لەسەر چۆنییەتیی رەوتی شوناسی نەتەوەییەکاندا هەیە[1].

بەم پێیە بوونی هەرجۆرە لێکترازانی ئاشتی هەڵنەگر لە کۆمەڵگا بۆتە بەربەست لە پەیوەست بوون بە یەکگرتنێکی گشتی لەمەڕ ئارمانجەکانی ژیانی سیاسی و پێش بە ئامادەکردنی چوارچێوەکانی پێویست بۆ یەکتر پەسندکردنی بەشداری و رکەبەرایەتی دەکاو یارمەتی بە دامەزراندنی نیزامی سیاسی دوور لە رکەبەرایەتی دەکا. ئەم دەستە شەق بردنانە رەنگە ئابوورییەکی "پوانگەلی" خۆجێیی، ناوچەییو قەومیو کولتووری و یان "جیاکردنەوەی شارستانی" بێ. بێگومان وەها جیاییەك پێش بە ئامادەکردنی شوناسی نەتەوەیی یەکگرتووش دەگرێ و رەنگە ببێتە هۆی تەنگژەو ئاڵۆزی قووڵ لە نێوان قەومو گرووپەکان. فرە گرووپی قەومی، زمانی و ئایینی بێشك دەتوانێ ئاستەنگەلێك بێ بۆ یەکڕیزی نەتەوەییو گەشەی سیاسی. کۆمارەکانی ئاسیای ناڤینیش دوور نین لەم شتانە. فرە لایەنییەکانی کۆمەڵگا لەم ناوچەیە بە درووستبوونی ئاڵۆزی شوناس خۆی نیشانەی بەردەوام بوونی پێکهاتەی دەسەلاّت خوازی حکوومەتەکانە.

(١) سەید محەممەد کازم سەجادپوور، "لێکدابڕانی شوناس لە کۆمارە بەجێماوەکانی سۆڤییەت" وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ژمارەی ٩، ساڵی چوارەم، بەهاری ١٣٧٤، لاپەڕەکانی ٣٣ - ٢٣

# پاژی سێهەم

## ناوچەی ئاسیای ناڤین لە سیستمی نێونەتەوەییدا

### ژێر سیستمی ناوچەی ئاسیای نێوەڕاست و بەشەکانی

لە تاوتوێ کردنی گۆڕانکارییە ناوچەییەکانی ئاسیای ناڤیندا، دەتوانرێ بە کەڵك وەرگرتن لە پرسە تیۆرییەکانی ئەم بیاڤە، بەتایبەتی تیۆری ژێر سیستەمەکان، یەکانگیرییەکی پێویست بە توێژینەوەکراوەکان بدرێ. بەم پێیە ئاسیای ناوەندی وەك سیستمێکی بچووکی ناوچەیی لە قەڵەم دەدرێ، چونکە دراوسێتییەك لەنێوان کاراکتەرەکان و بەشە جۆربەجۆرەکانی لە ئارادایە، هەروەها تەشەنەی هەر چەشنە گۆڕانێك (لەگەڵ سەرهەڵدانی دەرگیرییەکی ئەتنیکی) دەتوانێ بەشەکانی دیکەی ناوچەی ئاسیای ناڤین بخاتە ژێر باندۆری خۆیەوە. نەك هەر ئەمە بەڵکو لە رووی نێوخۆیی و دەرەکیشەوە وەك یەکانێکی لە یەك جیا پێناسەی کراوە و کاراکتەرە ناوچەیی و دەرەوەی ناوچەییەکانیش رۆڵی تێدا دەگێڕن. بە نوینگە هەڵگرتن لە دابەشکراوە سیستمە ناوچەییەکان بە سێ بەشی کانتۆری و ئیشپیگەڵ، دەتوانین ناوچەی ئاسیای ناڤین لەسەر ئەم بنەما دابەش کردنەی خوارێ وەبەر توێژینەوە بدەین.

ئەلف) بەشی ناوەند یان ناوك: کۆمارەکانی قەزاقستان، قرقیزستان، ئوزبەکستان، تورکمەنستان و تاجیکستان لەخۆ دەگرێ.

ب) بەشی دەوروبەر: وڵاتە ناوچەیەکان، رووسیە، تورکیە، ئێران و چین، ئەفغانستان، دەگرێتە خۆی.

ج) سیستمی دەستێوەردەر: هێزەکانی دەرەوەی ناوچەکە وەك ئیسرائیل، هێند، پاکستان، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، وڵاتە ئەوروپاییەکان و هێندێك لە رێکخراوەکانی دەرەوەی ناوچە وەك ناتۆو رێکخراویی ئاسایش و هاریکاری ئەوروپا لەخۆ دەگرێ. لێرەدا بە چڕی



گرینگی زیاتر بە بەشی(ب)ی ژێری ئەم سیستمە، کە ئەو پێنج کۆمارەی لە بەشی پێشوودا باسی لێ کرا دەدەین. لەم بەشەدا بە شێوەی کورتکراویش ئاماژە بە گرینگترین کاراکتەرەکانی بەشی دەوروبەرو سیستمی دەستێوەردان و دەرەوەی ئەم ناوچەیە دەکرێ.

#### فەسڵی یەکەم

#### ١ـ رووسیە ئاسیای نێوەڕاست و دەوروبەری

دوای رووخانی سۆڤییەت و پێکهاتنی کۆمەڵەی وڵاتە سەربەخۆ و هاوقازانجەکان[١](cis) رووسیە سیاسەتی دەرەکی خۆی لە دوو تەوەر "دەرەوەی نزیك"[٢] و "دەرەوەی دوور"[٣] وەبەر سەرنجدا، کە لە دیکۆمێنتی "واتای سیاسەتی دەرەکی فیدراسیونی رووسیە" کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٢دا پەسند کرا رەنگی داوەتەوە. لەنێوان ئامانجەکانی پێوەندییدار بە سیاسەتەکانی رووسیە لە هەمبەر دەرەوەی نزیك کە ئاسیای ناوەندیش لەم چوارچێوەیەدا پێناسە دەکرێ تەوەرەکانی خوارێ پێداگریان لەسەرکراوە:

١- قوولکردنەوەی هاریکاری سیاسی ـ نیزامی و ئابووری لەگەڵ وڵاتانی تازە بە سەربەخۆیی گەیشتوو لە چوارچێوەی cisو بەو شێوەیەی کە لە بنەڕەتدا پێوەندی دوولایەنەی هەیە، ٢- گەشەپێدان و بەهێز کردنی پێکهاتەی cis، ٣ـ بە ئەنجام گەیشتن لە گرێبەستەکان لەپێناو پشتیوانی لە مافی شارۆمەندە رووسییەکان لە هەمبەر هەرکام لە وڵاتانی تازە بە سەربەخۆیی گەیشتوودا ٤ـ پاڵپشتیو پارێزگاری بە کۆمەڵ لە سنوورەکانی cis، ٥ـ پێکهێنانی هێزەکانی پارێزەری ئاشتی cisو هتد. ...[٤]

#### ١ـ رۆژئاوا خوازان (ئاتلانتیك خوازان)[٥]

بەریانی رۆژئاوا خوازانە لە مێژوویی رووسیەدا دیاردەیەکی لە مێژینەیەو کۆنە. لە سەردەمی پیتری گەورەوە هێندێك لە رووناکبیران و سیاسەتوانان، رزگاری وڵاتی خۆیان لە

---

(1) Commonwealth of Independent states

(2) Near Abroad مەبەست لە دەرەوەی نزیك، کۆمارەکانی سۆڤییەتی پێشوویە

(3) Far Abroadمەبەست لە دەرەوەی دوور، وڵاتانی دیکەیە

(4) sergei Gertsky, "Russia,s Policiy Toward central Asia", see Internet site http: ll www. CA – C. org, 1997.

(5) Atlanticsrs.

نزیك بوونەوەی لە رادەبەدەر لە رۆژئاواو و کەڵك وەرگرتن لە نموونە رۆژئاواییەکان لێکدەدایەوە. لە سەردەمی دوای سەربەخۆیی رووسیەدا، لایەنگری لە چاکسازی چڕوپڕی رۆژئاواخوازانەو داخوازی یەکدەست بوونی ئابووری رووسیە لە ئابووری جیهانی سەرمایەداری، بە درێژەی ئەم بەریانە لەقەڵەم دەدرێ. ئەندەر کۆزیرئۆف سیاسەتی دەرەکی لایەنگری رۆژئاوا بە رەنگدانەوەی هزری گشتی رووسیە لەسەر دەزگای دیپلۆماسی زانیوەو، ئازادی کردەو خۆ بەڕێوەبەری سیاسەتەکانی رووسیەش پێی لەسەر داگیراوە. ناوبراو رووسیەی بە نۆڕمەکانی رێکخراوی نەتەوەکان و رێکخراوی ئاسایش و هاریکاری ئەورووپا بە دەروەست لەقەڵەم داوە، خوازیاری وەرگرتنی رووسیە لە گرووپی حەوت وڵاتی پیشەسازی جیهان و کرانی ئەو گرووپە بۆ هەشت وڵاتی پیشەیی بوو.

هەوڵەکانی کۆزیرئووف بۆ هاوئاهەنگی و هاریکاری کردەیی لەگەڵ رۆژئاواو ئەمریکا لەگەڵ سەرکەوتن رووبەڕوو نەبوو. سەرکەوتنی حیزبی لیبراڵ دێموکرات بە بەریانی توندئاژۆی نەتەوە خوازانە بە رێبەری "ولادیمێر ژێرونۆفسکی" لە هەڵبژاردنە پارلمانییەکانی دسامبری ١٩٩٣ بووە ئاستەنگێکی گەورە لە پێش جێبەجێ کردنی سیاسەتی دەرەکی رۆژئاواگەری لە رووسیەدا. لە راپۆرتی شوورای سیاسەتی دەرەکی و بەرگری رووسیە، یەکانەگیری ئیستراتیژیك لەگەڵ رۆژئاوا رەت کراوەتەوە و لە هەمبەر ئابڕوی سیاسی، متمانە بەخۆو شەرافەتی رووسیە هۆشداری درا، هەروەها جەخت لەسەر پێویستی گەشەی پێوەندییەکان لەگەڵ وڵاتانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هێند و پاکستان کراوە.[1]

### (٢) سلاڤگەراکان (نەتەوەخوازە تۆندئاژۆکان)

سلاڤخوازەکانی رووسیە لە سەردەمی چاکسازییەکانی پیتری گەورە، رێزەکانی خۆیانیان پتەو کرد. ئەوان لە سەدەی نوزدەیەم لە دوای شوناسی جیا بۆ رووسیە، جیایی رۆژهەڵات و رۆژئاوایی جیهان و لە هەمانکاتدا ئالڤەیەك لەنێوان ئەم دووانەدا بوون، لە رەوانگەی نەتەوەخوازانی ئێستادا، لێکچوونێکی زۆر لەنێوان رووسیە و سلاڤخوازانی سەدەی نۆزدەیەم دەبینرێ. نەتەوەخوازانی ئیستاش بە سەرنجدان بە بووژانەوەی هێزی جیهانیی رووسیە، خوازیاری گۆڕان لە سیاسەتەکانی دەرەوەی کۆزیرئۆففدا بوون. بە بۆچوونی ئەوان، گەلاڵە چاکسازییەکان لە

(1) Rodric Braith wraite, Russianreqlities and western policy, survival, vol. 36, no. 3, (Autumn 1994), p. 13.



رووسیە، ئەم وڵاتە دەباتە ریزی وڵاتانی پلە دووی جیهان و دابینکەری بەرژەوەندییەکانی رۆژئاواوە. ئەوان دانی یارمەتی رۆژئاوا بە رووسیە ئەگەر بێتە دی، لەپێناو کۆنترۆڵی وڵاتی لێکدەدەنەوە. لە روانگەی نەتەوەخوازانی رووسیەوە هاریکارییە ئەمنییەتییەکانی رووسیە لەگەڵ رۆژئاوا تەنیا کەرەستەیەکە بۆ دزەکردنی رۆژئاوا بۆ نێو رووسیە و پەلە کردن بۆ لەناو بردنی ئەوان. رۆژئاوا لەم رێگایەوە دەستێوەردان لە کاروباری نێوخۆی رووسیەدا دەکا. ئەوان هەوڵەکانی رۆژئاوا لە هەمبەر تێکهەڵچوونە ناوچەییەکان لەنێوخۆ و دەرەوەی پاشماوەیی کۆمارەکانی دوای لەبەر یەك هەڵوەشانی یەکیەتیی سۆڤییەت لە پێناوی بەدەستهێنانی چەك و تەقەمەنی پێشووی سۆڤییەت لەقەڵەم دەدەن. نەتەوەخوازان سەرنجی رۆژئاوا گەراکان بۆ پەیوەست بوونی بە ناتۆ وەك خاڵی کۆتایی ئابلوقەی رۆژئاوا لەسەر رووسیە لێکدەدەنەوە. لە روانگەی ئەوانەوە "نەزمی نوێ جیهانی" ئەمریکا واتایەتی جیا لە پەژراندن و پایسڤ بوون لە هەمبەر زاڵبوون بەسەر جیهاندا نییە. ئەم گرووپە تایبەتمەندی بەرچاوی رووسیە لە بەستراوە نەبوونی بە رۆژهەڵات و رۆژئاوا بە سەرەتایەك بۆ چاوپێداخشاندنەوە بەسەر سیاسەتی رۆژئاوا خوازانەی کۆزیرئۆف لەقەڵەم دەدا. باندۆری هزری سلاڤخوازی یان نەتەوەخوازی لەسەر سیاسەتی دەرەکی رووسیە لە راستیدا دەتوانرێ بە قۆناخێکی نوێ لە سیاسەتی دەرەکی بە ئەژمار بێنن. لە ئەنجامی رووبەڕوو بوونەوەی دووما لەگەڵ سیاسەتەکانی یەلتسین، ناوبراو ناچار بوو سەرۆك وەزیری کابینەکەی بە نێوی ئیگۆر گێدرا کە ریفۆرمخوازی رۆژئاواگەرا بوو، لەسەر کار لاببات و بە جێگای ئەو ویکتۆر چێرنۆمێردین لە دیسامبری ١٩٩٢دا بۆ سەرۆك وەزیر هەڵبژێرێ. مانگێك دواتر، یەلتسین بە رەخنە گرتن لە هێرشی ئەمریکا بۆسەر ئێراق، لە بەرانبەر ئەمریکادا هەڵویستی گرت. لە ماوەی ساڵی ١٩٩٢، ناوبراو فەرمانی فرۆشتنی چەك و تەقەمەنی بە ئێران دا. هەروەها مسکۆ بەشێوەیەکی چالاکتر دەستێوەردانی لە ئاریشەکانی دەرەوەی قەفقازو شەڕی نێوخۆیی تاجیکستاندا دەکرد. وێرای ئەم وەرسووڕانە نەتەوەخوازانە، ناکۆکی یەلتسین لەگەڵ دەسەڵاتی یاسادانەر درێژەی بوو و بووە هۆی تێکهەڵچوونی سەربازی لە سپتامبری ١٩٩٣دا. بەڵام لەکاتێك دوومایەکی نەتەوەخوازترو کۆمۆنیستتر لە سپتامبری ١٩٩٣دا پێکهات، یەلتسین بەجێی بەرەنگاری، هاوکاری هەڵبژاردو ئەم پرسەی رووسیەی بۆ قۆناخی سێهەم لە سیاسەتی دەرەکیدا پاڵ پێوەنا.[1]

(1) Robert O. Freedman, Russia and Irean: Tactical Allance, SAIS Review, (summer – Fall 1997), p. 95

**٣ـ ئوراسیا خوازان[1] (ناسیۆنالیستە پارێزکارەکان)**

ئەم گرووپە بە لە بەرچاوگرتنی تایبەتمەندییە ژئیوپۆلۆتیکەکانی رووسیەو میراتی مێژوویی، رۆڵی جیاوازی رووسیە وەبەر سەرنج دەدەن. روانینی "سەرگەئیی ئێستانگویج" راوێژکاری پێشووی یەلتسین لەم راستایەدا شایانی ئاماژەیە. ناوبراو لە گۆڤاری "بەرژەوەندی نەتەوەیی" پێویستی رووسیە بە رەسەنایەتییەکی مێژوویی هێناوەتە بەرباس کە بەرزترە لە هەلپەرستییەکی ناسیۆنالیستیو جەخت لەسەر دەوری رووسیە وەك ئاڵقەیەك لەنێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا دەکا. باندۆری تیۆرییەکانی تۆلستۆیی و داستایوڤیسکی لەسەر ئەم گرووپە زۆر بەرچاوە. پاش لەبەر یەك هەلوەشانەوەی سۆڤییەت و شك وگۆمانەکان لە هەمبەر شوناسی نەتەوەیی رووسیە، ئورئاسیا خوازان هەولیاندا بە پێداگری لەسەر میراتی مێژووی رووسیە بە شێوەیەك جیاوازی ئەمە لەگەڵ ولاتانی دیکەی جیهان زەق بکەنەوە. ئەوان بە روانینی ئایدیال خوازانەی مێژووی ولاتی خۆیان، ئەوەیان بە هێرشی بەردەوامی دەرەکی لێکدەدایەوە، هێرشەکانی مەغولەکان،هەتا ناپلئۆن و هیتلەر لەلایەن ئوراسیا خوازان بایەخی پێدەدراو پێویستی یەکگرتووی پتەوی نەتەوەیی بۆ پاراستنی خەلکی ئەم ولاتە لە نەتەوەوە قەومە جۆربەجۆرەکان باسی لێدەکرێ. بە بۆچوونی ئوراسیا خوازان، رووسیە ناتوانێ کەلك لە مۆدێلی ئازادی خوازانەی رۆژئاوا لە ئابووریو سیاسەت وەرنەگرێ. بەلکو دەبێ بە دوای رێگایەك جگە لەوە بێ. ئێستا نگویچ بەریانی رۆژئاواخوازانەی (تاتلانتیك گەرا)ی لە سیاسەتی دەرەکی رووسیەدا بە زیان بۆسەر بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەم ولاتە لێکدەداتەوە. ناوبراو لەم چوارچێوەدا گرینگی پێداگری چڕ بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە ئەتنیکییەکانی رووسیەی وەبەر سەرنج داوە. بارودۆخی رووسەکانی دانیشتووی کۆمارەکانی دەوروبەریش لە پەرەپێدانی ئەم بەریانەدا کاریگەری جیددی هەبووە. بوونی نزیکەی ٢٥ ملیۆن رووسی لە "دەرەوەی نزیك" کە نزیکەی نیوەی ئەوان لە ئوکراین ژیانیان بەسەر دەبرد ئاستی گرینگی هەستیار بوونی نەتەوەخوازی بەرز کردەوە. دوای هەلبژاردنی پارلمانی دووماو سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان لە سالی ١٩٩٥دا، سەرۆك کۆمار بە جێبەجێ کردنی ئالوگۆڕگەلێك، هێندێك لە کەسایەتییە سەرەکییەکانی رۆژئاواخوازو ریفۆرم خوازی ئابووری بازاڕی لەسەر کار لابرد، لەبەرچاوترین کەسایەتییەکان، ئەندەر کۆزیرئۆف بووکە لە ئوکتۆبری ١٩٩٠دا بەرپرسایەتی

(1) Eurasianests



وەزارەتی کاروباری دەرەوەی لەئەستۆ بوو، یەلتسین، یوگنی پریما کۆفی وەك وەزیری کاروباری دەرەوە دەستنیشان کرد.

لێرەدا پێویستە ئامانج و بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی رووسیە لە ئاسیای ناوەندیدا لە دوو بڕگەی جیاوازی سەرۆك کۆماری یەلتسین و پوتیندا لێکبدەنەوە:

**ئەلف) سەردەمی یەلتسین**

بە دوای لەبەریەك هەلوەشانەوەی سۆڤییەت، سیاسەتی دەرەکی رووسیە لە ئاسیای ناوەڕاست بە سێ بەش زەمەنی دابەش دەبێ.

١ـ لە سەردەمی یەکەم (١٩٩١- ١٩٩٢) بە هۆی سەرلێ شێواویی هەلقولاو لە هەرەسهیان و رکەبەرایەتی لەنێوان هێزە پارێزکارەکانی (دووما)و ریفۆرمیستەکانی (سەرۆك کۆماری) رووسیە، نەیتوانی بناغەی سیاسەتێکی دەرەکی دیاری کراو و ریالیستانە لەناوچەی ئاسیای ناوەڕاست داربرێژی. لەم سەردەمەدا نەك هەر حکوومەتی رووسیە بەلکو ئاندرە کۆزیرئۆف،وەزیری کاروباری دەرەوەیش لە دانانی سیاسەتێکی یەکانە لە ناوچەکەدا سەرکەوتوو نەبوو، چونکە سەرەکیترین پرس بۆ سیاسەتوانە رووسییەکان پەرەپێدانی پێوەندی لەگەڵ رۆژئاوادا بوو.

بەلێکترازانی یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤییەت، رووسیە تووشی کۆمەلێك هەرەشەی نوێ ببوو کە ئاسایشی وەمەترسی دەخست. ترس لە تێکهەلچوونە سەربازییەکانی نێوان ولاتە سەربەخۆ نویکان[1]، بووە هۆی نووسینی رەشنووسی تیۆری نیزامی رووسیە لە مانگی مای ١٩٩٢دا. وەها تێکهەلپرژانگەلێك بە واتای هەڕەشە بۆ تەناهی رووسیە و سەقامگیری نێوخۆی ئەم ولاتە بە ئەژمار دەهات. شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان کە لە بەهاری ١٩٩٢دا گەیشتبووە لوتکەی خۆی، سەرەنجی رووسەکانی بۆ هەڕەشەی بناژۆخوازی راکێشا. هەر لە هەمان سالدا بە دەسەلات گەیشتنی ئیسلامگەراکان لە تاجیکستان مەترسی یەکگرتنی حکوومەتەکانی تاجیکستان و ئەفغانستان (حکوومەتی رەبایی) هاتبووە ئاراوە. هەروەها مەترسی دامەزرانییەکانەگیریەکی ئیسلامی سیاسی لە سنوورە باشوورییەکانی سۆڤیەتیی

(1) Boris z. Rumer, the potential forpolitical Instability and Regionalconflicts, (Indianapolis Indiana University Press, 1994), Pp. 89 – 105.

پێشوو کە لە پاکستانەوە دستی پیٚدەکردو لە ئاسیای ناڤین و تورکیە کۆتایی پیٚدەهات لە ئارادا بوو.[١] لەگەڵ گەشە کردنی بناژۆ خوازی لە ناوچەکە، ویلیام مالّی و ئەمین سیکل دوو شرۆڤەوانی دەرەکی بەم جۆرە شرۆڤەیان دەکرد: "حکوومەتی یەلتسین هەستی بە مەترسی کردووە کە رووسیە کارتێکەری خۆی لە بەرژەوەندی لەگەڵ وڵاتانی دیکە لەدەست بدا. بۆیە توانای بەجیٚ گەیاندنی مکانیزمی چاودێری لەسەر حکوومەتە ئاماژە پێکراوەکان، هەر وەك سەردەمی پێشوو نابیٚ و ئەمە مەترسییەکی گرینگە بە دژی ئاسایشی نەتەوەیی رووسیە و تەواوی خاکەکەی،[٢] بەم جۆرە دەسەڵاتدارانی رووسیە سوور بوون کە پێش بە کاراکتەرە ئیسلامییەکان بۆ ناوچەکەو پێکهێنانی فیدراسیۆنی ئیسلامی بگرن.

رێبەرانی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندیش ئاماژەیان بە مەترسی بناژۆخوازی ئیسلامی چ لەنێو خۆ چ لە دەرەوەی سنوورەکانی وڵات دەدا.[٣] و رووسیەیان خستە ژێر گۆشارەوە کە چالاکتر لەگەڵ مەسەلەکە هەڵسوکەت بکاو لە پێوەندیدا خوازیاری سیستمێکی ئەمنییەتی بە کۆمەڵ بوون، سەرۆك کۆمار ئەسکەر ئاقایۆف گوتی کە نێوەرۆکی ئوراسیا بە رووسیە گرێدراوە و ئەگەر رووسیە هێزی جیهانی لەدەست بدا، لەسەر قرقیزستانیش کارتێکەری نەخوازراویی دەبیٚ، بۆیە ئێمە دەبیٚ یارمەتیی ژیانەوەی سەرلەنویٚ رووسیە بدەین.[٤] لەلایەکی دیکەوە، کۆچی بەربڵاوی کەمینەی رووسی لە کۆمارەکانی ئاسیای ناڤین بۆ ئەم وڵاتە دەتوانیٚ ئاستی قورسایی ئاریشەکانی رووسیە بباتە سەریٚ. بۆیە بیردۆزییەکانی سیاسەتی دەرەکی مسکۆ لەسەر ئەم بناغەیە کە پاڵپشتی لە دە ملیۆن کەمینەی رووسی بکەن و لە کاتێکدا ژیان و خۆشگوزەرانیان کەوتە مەترسییەوە لەناوچە، کەڵك لە هێزی نیزامی وەرگرن. بە

---

(١) رۆژنامەی ئیزوستیا نووسی بووی کە حکوومەتەکانی ئاسیای نێوەڕاست شوێنێکی لەبارە بۆ بناژۆ خوازانی ئیسلامی ئیزوستیا، ١٨ی فێورییەی ١٩٩٢.

(2) Willam Marley and Amin Saikal, Russiain search of its Future, (newyoek: Cambridge Uninersity press, 1995), Pp. 142 – 157.

(٣) ئیسلام کەریم ئووف بەردەوام لە هاوینی ١٩٩٢دا، راگەیاندبوو کە ئەم وڵاتە لەلایەن بناژۆخوازی ئیسلامی تاجیکستانو ئەفغانستان هەڕەشەی لێدەکریٚ.

بڕوانن بۆ ئەم سەرچاوەیە:

Bess Rrewn, "tadjikistan: the fall of nabiev", RFE/ RL Research Reprember 1992, p. 14.

(4) Interpax, 15 July 1992, F Bis – sov – 92 – 138, 17 July 1992, p. 59.



پەرەسەندنی شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان و تەشەنە کردن بۆ وڵاتانی دیکەی ئاسیای ناوەڕاست، رووسیە هەستی بە مەترسی کرد بە جۆرێك حکوومەتی یەلتسین نیگەرانی خۆی لە مەڕ ژیانی ٣٥٠ هەزار کەسی کەمینەی رووسی لە تاجیکستان دەربڕی. راپۆرتە گەیشتووەکان باسی ئەوە دەکەن کە هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٩٢ز، لانیکەم سەد هەزار کەسو ساڵی دواتری پتر لە دووسەد هەزار کەس کەمینە لەویٚ بەرەو رووسیە کۆچیان کردو لەگەڵ کێشەی نیشتەجیٚ بوونو سەقامگیربوون رووبەڕوو بوون. هەر ئەم مەسەڵەیە بووە هۆی ئەوە تاکو مسکۆ بایەخێکی تایبەتی بە سیستمی تەناهی بە کۆمەڵ بداو لەم سیستمەدا لەپێناو پارێزگاری لە ژیانی کەمینەی رووسیە توانی کەڵك لە هێزی کۆمارەکانی دیکە لەم پێوەندییەدا بگریٚ بەو جۆرەی کە لە تاجیکستاندا ئەم کارەی بەڕێوەبرد. زێدەباری ئەمە، رووسیە توانی کەڵك لە هێزی کۆمارەکانی دیکەی لەم پێوەندییەدا بگریٚ هەتا ناوچەکە هەنگاو بەرەو سەقامگیری بهاوێژێت.

هەروەها، رووسیە دەگەڵ وڵاتانی نویٚ هاوسنوور بوو کە ئیمکانی مەترسی تەشەنەی مادده هۆشبەرەکان، هاتوچۆی نائاسیایی قاچاخچییەکان و. .. .. هەبوو. بەم پێیە ئاسیای ناوەندی سەلەنویٚ لەبەر هۆکاری ئەمنییەتی گرینگی تایبەتی بۆ مسکۆ هەبوو هەتا سیاستێکی یەکانگیرتر بەڕێوەببا.

٢ـ دووهەمین سەردەمی داڕشتنی سیاسەت لە رووسیە لە ئاسیای ناوەڕاستدا لە ساڵی ١٩٩٣ تاکو ساڵی ١٩٩٥، کە دەتوانین وەك "دەرەوەی نزیك" ئاماژەی پێبدەین. لەم سەردەمەدا رووسیە نیگەرانی لەدەستدانی دەسەڵاتی خۆیی لەناوچەکە لە بەرانبەر هێزەکانی دەرەوەی ناوچەکە بووە، بە جۆرێك کە گۆزیرئووف جەختی دەکرد کە ئەم بۆشاییە دەسەڵاتە دەبیٚ خێرا پڕ بکرێتەوە. نیگەرانی ئاماژە پێکراو بووە هۆی هاوپێوەندییەکی نویٚ لەنێوان سیاسەتوانە رووسییەکان لە رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ پرسەکانی ناوچە بۆ پێشگیری لە دەسەڵاتی خەڵکانی دیکە لەم بۆشایەی ئەم وڵاتەدا بوو. لەم ئاراستەیەدا رووسیە جارێکی دیکەی بۆلای تێڕوانینی نەریتی خۆی واتە تێڕوانینی ئیستراتیژیکی، کە لەسەر بناغەی بەدەست هێنانی سەرلەنویٚ هێزو زاڵبوون بەسەر ناوچەکانی پێشوودابوو هەنگاوی دەهاویشت. لەم تێڕوانینەی ژیانەوەی ئیمپراتۆریدا بە کەڵك وەرگرتن لە کەرەستەی سیاسی ـ ئابووریو تەنانەت نیزامیش هاتە گۆڕیٚ و ئەو سیاسەتوانانەی کە لەو بڕوایەدا بوون کە رووسیە هێشتا خاوەنی بەرژەوەندی تایبەتییە لە ئاسیای ناڤینداو دەبیٚ

به شێوەی چالاك لە ناوچە بوونی هەبێ و پێش بە کاریگەری هۆکارە دەرەکییەکان لەم ناوچەیە بگرێ. خاڵی رووبەڕووی تێڕوانینی ئووراسیای روانگەی ئاتلانتیك خوازی بوو لە بووژنەوەی ئیمپراتۆری لەسەر بنچینەی رووبەڕوو بوونەوە و ناکۆکی لەگەڵ نۆرمە دێموکراتیکە رۆژئاواییەکانی ئەرێنی لێکدەدایەوە. لایەنگرانی روانگەی ئاماژە پێکراو لەو بڕوایەدا بوون کە سیاسەتی دەرەکی رووسیە دەبێ بەدوای پەرەدانی پێوەندی لەگەڵ رۆژئاوادا بێ‌و خۆی لە ئاریشەکانی کۆمارەکانی دیکەی بەتایبەتی ئاسیای ناوەندی وەردات. ئەوان پشتیوانیان لە دامەزراندنی بەرەیەکی سلاڤی لە نەبوونی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا دەکرد بەڵام هۆیەکانیان جێی رەزامەندی نەبوو. بۆیە سەرەتای ١٩٩٣دا تووشی نسکۆ هاتن. یەلتسین لە سووڕانێکی سیاسیدا لە روانگەی ئاتلانیك خوازی بە بەریانی ئوراسیایی بەم جۆرە دوا، کاتی ئەوە هاتووە کە جموجۆڵی خۆمان بەرەو لای بەشی رۆژهەڵاتی دەستپێبکەن. لە بەرانبەریشدا وەزیری دەرەوەی رووسیە پشتیوانی لە تیۆری "دەرەوەی نزیك" کردو پێنج هۆی خوارێی بە هەندی لێکدایەوە:

١- ئیستراتیژی رووسیە لەسەر بنەمای پاراستنی یەکپارچەیی خاکی فیدراسیونی رووسیەوە هەر چەشنە پێکدادان و تێکهەڵچوونێك لە سنوورەکانی دەوروبەر دەتوانرێ وەك مەترسییەك بە دژی رووسیە لەقەڵەم بدرێ، بۆیە رووسیە ئەرکە لەسەرشانی پێش بەم تێکهەڵچوونانە بگرێ.

٢- ئامانجی رووسیە، دروستکردنی پشتوێنێکی بەرگری لە دەرەوەی سنووری دراوسێ باشەکانییەتی.

٣- مسکۆ خۆی بە پارێزەری رەوایی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی یەکیەتیی سۆڤییەتی پێشوو، زامنی سەقامگیری سیاسی و نیزامی ناوچەکە ناساندووە. ئەوە پێویستی بەوە هەیە کە رووسیە بە بەرپرسایەتیگەلێکی تایبەتی ئەمنییەتی وەك رێبەری ناوچەکە بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکییەکانی ناوچە، ناردنی هێزەکانی پاراستنی ئاشتی‌و دابینکردنی ئاسایش لە سنوورەکانی ئوراسیا، دوای سۆڤییەت وەئەستۆ بگرێ.

٤- مسکۆ بەرگری لە مافی کەمینە رووسییەکان و کۆمەڵی رووسی زمانەکان کە لە تاراوگە ژیان بەسەر دەبەن، دەکا.



٥- رووسیە تێدەکۆشێ تاکو یەکانگرییەکی پتر لە رێکخراوەی کۆنسەی وڵاتە سەربەخۆو هاوقازانجەکان پێکبێنێ هەتا لە داهاتوودا ببێت بە رێکخراوێکی کاریگەرتر لەپێناو پاراستنی قازانجەکانی روسیەدا.(١)

بە گشتی بە زاڵبوونی بەریانی ئوراسیایی، قازانجە نەتەوەییەکانی رووسیا لە ئاسیای ناوەڕاست بەم جۆرە دەستنیشان دەکرێ:

١ـ کەڵك وەردەگرتن لە کانزاو پاشکۆ زەوینییەکانی ئاسیای نێوەڕاست هێندێك لە سیاسەتڤانانی رووسی هەنووکە وەك زینۆیەف وا دەزانن کە رووسیە وەك سەردەمانی پێشوو پێویستی بە پاشکۆ زەوینییەکانی ئاسیای ناڤین و قەفقازە و لەم پێوەندییەدا دەبێ لانی زۆری قازانجەکان بۆ خۆی تەرخان بکات. رووسیە هێشتا ناچار بە ناردنی نەوت و مەوادی خاوەو بەهاکەی لە ناوچەکانی ئاسیای ناوەڕاست‌و قەفقازدا هەروەها کەمتر لە بازارە جیهانییەکانە. لەلایەکی دیکەوە، کەرەستە رووسییەکان لە بازاڕە جیهانییەکاندا لەگەڵ کێشەی رکەبەرایەتی‌و بە سەرنجدان بە دابەزینی چۆنایەتی بەرەو روو، مسکۆ دەتوانێ بە دروستکردنی مەوادی خاوی ئەم ناوچەگەلە بە کالاو بەرهەمەکانی جێی پێویستییان، ئەم ناوچەیە بە بەرهەمە رووسییەکانی، بەستراوە بە ئابووری خۆی بهێڵێتەوە. لە رابردوویشدا، ئەم سیاسەتە بەجۆرێك پلانی بۆ دارێژرابوو کە هەم رووسیەو هەم کۆمارە ئاماژە پێکراوەکان کەڵکیان لە بەرژەوەندییەکەی وەردەگرت و هەنووکە وەها سیاسەتێك دەتوانێ وەك هاوکاریگەلی دوو لایەنەی ئابووری لەنێوان دوو وڵات بێتە گۆڕێ کە هەر دوو لایەن کەڵکی لێ وردەگرن.

٢ـ پاراستن و پشتیوانی لە مافی ١٠ ملیۆن رووسی نیشتەجێ لە ئاسیای ناوەندیدا بە هەڵگیرسانی شەڕە نێوخۆییەکان ـ یەك لەوان لە تاجیکستان ـ کەمینەی رووسی کۆچیان کردو قورسایی کێشەکانی رووسیە پتر بوون. زێدەباری ئەوە رووسیە ناچار بوو، ٢٥ هەزار سەربازی رووسی رەوانەی ناوچەکە بکا، هەتا سەرقاڵی شەڕی پارتیزانی بن. باڵی دژبەری تاجیکستان کە لەلایەن ئەتنیکە تاجیك و موجاهیدینە هاوکێشەکانی ئەفغانستان پشتیوانیان لێ دەکردو وا بەرچاو دەکەوت بۆ درێژەی شەڕ تاکو چەند ساڵی دیکە بەڕادەی پێویست هێزی بەرەنگاری

---

(١) بڕوانن تێزی دوکتورای حەبیب لڵا ئەبولحەسەنی:

H. A. shirazi, the dyami cs of political stability in post- soviet Tajikistan, (Sydney university,1997), Pp. 193- 207.

هەبێ، بۆیە رووسیە گەیشتە ئەو ئاکامەی کە ئەگەر دژبەرانی رێژیمی تاجیکستان هەرلەوێ پێشیان پێ نەگیرێ، لەسەر سنوورەکانی رووسیە دەمێننەوەومسکۆ لەگەڵ ئاریشەی لە رادەبەدەری ماددە هۆشبەرەکان لەم ناوچەیەوە بۆ فیدراسیونی رووسیە رووبەڕوو دەبێ. بە سەرنجدان بە وەها ئاریشەیەك، رووسیە رێبەرانی ئاسیای ناوەڕاستی خستەوە ژێر گۆشارەوە کە پارێزگاری لە مافی کەمینەی رووسییەکان بکا، ئەگینا مسکۆ لە هەر چەشنە یارمەتییەك خۆی دەبۆێرێ.

### ٣ـ گرینگی چەکە ناوەکییەکانی قەزاقستان بۆ رووسیە

قەزاقستان وەك تاکە وڵاتی خاوەنی چەکی ناوکی لە ئاسیای نێوەڕاستدا ناسراوە، رووسیە دوای لەبەر یەك هەڵوەشانی یەکیەتیی سۆڤییەت هەولیداوە کە چەکەکان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. خوێندنەوەیەك هەیە رەوتی سەرلەنوێی یەکریزی ئیستراتیژیکی رووسیە بەرە بەرە پێکدێتەوە. ئەم رەوتە لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٥دا بە مەبەستی بەدەستهێنانی کەشێکی هاوبەشی نیزامیو ئیستراتیژیك دەستپێکردو لە ژانوییەی هەمان ساڵدا بە بەیاننامەیەکی هاوبەش لەنێوان رووسیەو قەزاقستان لەسەر بنەمای پێکهێنانی هێزێکی نیزامی هاوبەشی توندوتۆڵ درێژەی هەبوو. پاشان ٢٦ی مای ١٩٩٥دا، رێککەوتننامەیەك لە هەمبەر جێگر کردنی هێزە سنوورییەکانی رووسیە لە سنوورەکانی دەرەوەی نێوان رووسیە، رووسیەی سپی، قەزاقستان، قرقیزستان، ئەرمەنستان، گورجستان و تاجیکستان لە منێسك واژۆ کرا. رێبەرانی رووسیە جەختیان دەکرد کە وا بڕیارە کۆمەڵی حکوومەتە سەربەخۆ هاوقازانجەکان پشتیوانی هاوبەش و کارتێکەر (بە رێبەری رووسەکان) لە سنووورەکانی وڵاتە ئاماژە پێکراوەکاندا، کەڵك وەرگرتنی هاوبەش لە رێکخراوە نیزامییەکان و ئۆپەراسیونی هاوبەشی بەرهەمهێنانی کەرەستەکان پەسند بکەن.(١) وەها پرسێك دەرخەری ئەوەیە کە رووسیە هێشتا رازییە بە گێڕانی رۆڵی برای گەورەتر و بە سەرنجدان بە قازانجە هاوبەشەکان، لەنێوان کۆمارەکانی CIS هەیە دەتوانرێ وەك پاراستنی ئاشتیو ئارامی لەناوچەکە لێکبدرێتەوە. ئاشکرایە کە بۆ ئامانجی بەرگری و چاودێری بەسەر هەڵێنجانی چاوگە دەوڵەمەندە ژێرزەوینییەکان کە لە هێندێك لە کۆمارەکانی پێشوو هەن سەرقاڵی پاراستن یان دامەزراندنی پێگە نیزامییەکان دەبێ.

---

(١) بەلك و برایت و تاناکا، "بەرژەوەندی نەتەوەیی رووسیە" وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ساڵی هەشتەم، خولی سێهەم، ژمارەی ٢٣، پاییزی ١٣٧٧، لاپەڕەکانی ٥٧ ـ ٥٦.



### ٤ـ کۆنترۆڵی بناژۆخوازی و جووڵانەوە توندڕۆکان

بۆشایی سیاسی ـ ئیستراتیژیکی پێکهاتوو بە هۆی نسکۆی ئیدئولۆژی کۆمۆنیزمو پڕوپاگەندەی توندی رۆژئاوا دژی رادیکالیزمی ئیسلامی، رووسیەی هێنا سەر ئەو باوەڕەی کە بناژۆ خوازی وەك مەترسییەکی گەورە بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی لەقەڵەم بداو لەم پێوەندییەدا رێوشوێنی ئەمنییەتی تایبەتی لەبەرچاو بگرێ. لە وەها تێڕوانینێکدا، ئاسیای ناوەندی وەك گۆڕەپانێکی رووبەڕوو بوونەوە و گەمەیەکی گەورە، وێنا کراو بوو، کە بەردەوام دەیتوانێ لەلایەن وڵاتە ئیسلامییەکانەوە هەڕەشەی لێ بکرێ. تەنانەت لە سەردەمی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان، مسکۆ وەك مەترسی جیهانی ئیسلام لە سنووره باشوورییەکانی بۆ یەکریزی حکوومەتی سۆڤییەت و تەناهی خۆی دەڕوانی. بەرژەوەندی رووسیە لەگەڵ ناسیۆنالیزم کە لە حاڵی پەرەگرتنی ئەتنێکی- سەرزەوینی کە هێندێك جار لەلایەن ئیسلامگەرا توندڕۆکانەوە دەورووژێندران لە دژایەتیدا بووو هەر ئەمە بووە هۆی لاوازیی کەمینەی رووس لە وڵاتە تازە بە سەربەخۆیی گەیشتووەکان، ئەم بۆچوونە کە باشوورێکی خەسار هەڵگر رەنگە بەرژەوەندی رووسیە بخاتە مەترسییەوە هێشتا هەر ماوە. مەترسی ئاڵۆزی لە تاجیکستان، ئەم ترسەی لەنێوان سیاسەتوانانی رووسی پێکهێنا کە رەنگە لەم ئاڵۆزییە ببێ بە شەڕێك لە شێوەی شەڕی ئەفغانستان، یان بە دامەزراندنی حکوومەتێکی ئیسلامی لە تاجیکستان و مەترسی پەرەگرتنی باندۆری بناژۆخوازی ئیسلامی بێتە ئاراوە. بۆیە جەخت لەسەر بوونی ئەمنییەت لە سنوورە باکوورییەکان کراوە هێزە رووسییەکان بۆ ئەم مەبەستە نێردران بۆ ناوچەکە. دوای دامەزراندنی سەقامگیری لەناوچەکە، لایەنگرانی تێوری ئوراسیا پێشنیاریان کرد کە نابێ بە گشتی دژایەتی لەگەڵ ئیسلامدا بکرێو دەبێ بپارێزرێ و کۆنترۆڵ بکرێ و لە کاتی پێویستدا لە دەسەڵاتی کەم بکرێتەوە. لەلایەکی دیکەوە، ئەم تێڕوانینە لەلایەن ئاتلانتیك خوازانیش هاتە ئاراوە کە بەسەرنجدان بە هاوشێوەبوونی قازانجەکان، رۆژئاوا هێز بە رووسیە دەدا تا بە نوێنەرایەتی جیهانی رۆژئاوا، مەترسی بناژۆخوازی ئیسلامی سنووردار بکا. هەر بۆیە رووسیە بە دوای ئەوەیە کە هەڕەشەی ئیسلامی وەك بواری رەوایی پێدان لە پێناو دەستێوەردان لە کەوشەنی ژێر دەسەڵاتی پێشووی خۆی لەژێر ناوی "تیۆری نوێی مۆندۆسکی" بەکار بێنێ. سیاسەتی دەرەکی رووسیە بە دوای متمانە لە گەیشتن بەم ئاکامەی، کە ئیسلامی سیاسی ناگاتە ئەو ئاستەی کە بەرژەوەندی ئەوان بخاتە مەترسییەوە و زیان بە دەسەڵاتی ئەوان نەگەیەنێ.

**٥ـ بەردەوامی کۆمەڵەی وڵاتە سەربەخۆ و هاو قازانجەکان نوێکردنەوەی هاوگرتوویی ئابووری، سیاسی ـ ئیستراتیژیك لەناوچەکە.**

لە ٨ی دسامبری ١٩٩١دا کۆمەڵەی وڵاتە سەربەخۆو هاوقازانجەکان (CIS) بە بەشداری وڵاتانی ئوکراین رووسیە، بیلەرووس، مۆلداویی، قەزاقستان، ئوزبەکستان، قرقیزستان، تاجیکستان و ئەرمەنستان پێکهات، ئەم کۆمەڵەیە لەسەر بنەمای دوو روانینی سەرەکی لەلایەن ئوکراین‌و رووسیە بوو، ئوکرانییەکان لەو بڕوایەدا بوون کە پێکهاتنی CIS کەرەستەیەکە بۆ تێپەر بوون لە قۆناخی گواستنەوە بەرەو سەربەخۆیی کۆمارەکان، لە کاتێکدا رووسەکان لەو بڕوایەدا بوون کە CIS یەکیەتییەکە هاوئاهەنگی و رێك و پێکی پێوەندییە ئابووری، سیاسی و نیزامی، کۆمارە بەجێ ماوەکانی دوای رووخانی وەئەستۆیە و رووسییەش بە شوێن باشتر کردنی پێوەندییەکانی نێوان ئەم کۆمارانە دایە. ئابووری پاشماوە لە نیزامی گەلاڵە دارێژی کۆکراو لە سۆڤییەتی پێشوو لە ئاسیای ناوەندیدا، بووە هۆی بەستراوەییەکی چڕی ئەم وڵاتانە بە یەکتر. مسکۆ بە هاریکاری کردنی روو لە زیاد بە ئاسیای ناوین، هەوڵیداوە هەتا پێش بە پاشکەوتوویی ئەم ناوچەیە بگرێ و دوای رووخانیش بە مەبەستی پاراستن و بەردەوامی کۆمەڵەی وڵاتە سەربەخۆ هاوقازانجەکان، سوبسیدگەلێکی زۆر(بەبڕی نزیك ٥ تریلیۆن رووبل) یارمەتیداوە. قەرزە ئاماژە پێکراوەکان پێشان دەدەن کە هێشتا ئەم کۆمارانە گرێدراون بە رووسیەوەو دەبێ لەگەڵ رووسیە هاریکاری ئابووری نزیکیان هەبێ. هەروەها رێبەرانی ئاسیی ناوەندی پێوەندی لەگەڵ مسکۆیان، بە پاراستنی ئەمنییەت و پێگە و دەسەڵاتی خۆیان لێکدەدایەوە لەم پێوەندییەدا چەندین جار ئاماژەیان بە نوێ کردنەوەی هاوپێوەندی سیاسی- ئیستراتیژیك لەناوچەکەدا کردووە.

بەسەرنجدان بە ئامانجەکانی سەرێ و لە درێژەی باسەکەدا لە پێوەندی دەگەڵ دووهەمین خولی دارشتنی سیاسەتی رووسیە لە ئاسیای ناڤیندا لە ساڵەکانی (١٩٩٣ـ ١٩٩٥) دەبێ بزانین هەڵویستی رووسیە لەگەڵ رۆژئاوا لە ساڵی ١٩٩٣دا گۆرانی بەسەردا هات کە دەیتوانی دەگەڵ بەرژەوەندی رووسەکان لە دژایەتی دابێ. "یوگنی پرسیمائووف" لە راپۆرتێکدا بۆ رێبەرانی رووس ئاماژەیدا کە حکوومەتە رۆژئاوایی‌و ئیسلامییەکان لە هەوڵی پەرە پێدان بە باندۆری خۆیانن لە ناوچەکانی سۆڤیەتی پێشوودا.

حکوومەتەکانی ئاسیای ناوەراست بەتایبەتی تاجیکستان و ئوزبەکستان کەوتنە ژێر کاریگەریە ئالۆزەکانی ئەفغانستانەوە و ئەمە بە گوێرەی دنەدانەکانی وڵاتانی دەرەوەی



ناوچەکە هاتووەتە ئاراوە. لە هەمان ساڵدا راگەیەنراوە فەرمییەکانی رووسیە لە پێوەندی لەگەڵ ناوچەکانی پێشتری ژێر دەسەڵاتی سۆڤییەت پتر رووی نیزامی بە خۆیەوە گرت. رووسیە چیدیکە توانای درێژەدانی بە سیاسەتێکی ئاکتیڤ‌و دەستێوەردانە نەبوو. بۆیە کەلێنێك لەنێوان ئامانجەکانی ئەم وڵاتەو تواناکانی هاتبووە گۆرێ. سیاسەتی رووسیە لەهەمبەر شەڕی تاجکستان (١٩٩٣ ـ ١٩٩٥) گەشەی وەها کەلنێنێك پتر دەردەخا. وەها پرسیك بووە هۆی ئەوە هەتا رووسیە پاڵپشتی لەلایەنێکی دەرگیر لە شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان بکاو بە شێوەی چڕوپڕ پشتیوانی بکا هەتا بە مانەوەی رووسیە گرێدراوبن. لەم ساڵانەی دواییدا رووسیە بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە لە سیاسەتێکی هێرشبەرانە (زاڵ بوونی نیزامی) رووی کردە سیاسەتێکی هێمنانەتر (وتووێژ). رەنگە بە دەسپێکردنی شەڕی چیچان لە ساڵی ١٩٩٤دا، رێبەرانی سیاسی- نیزامی رووسیە هەستیان بە خاڵە لاوازەکانی ئەم وڵاتە کرد. رووسەکانی بەرە بەرە حکوومەتی تاجیکستانیان خستە ژێر گۆشارەوە کە دانووستاندن دەگەڵ هێزە بەر هەرڵستکارەکان بکاو لە کۆتایدا پەیماننامەی ئاشتی لە ژووئەنی ١٩٩٧دا لە نێوان لایەنەکان واژۆ کران.

٣ـ خولی سێهەم سیاسەتی دەرەکی رووسیە لە ئاسیای ناڤین لە ساڵی ١٩٩٦وە دەست پێدەکا کە ناسراوە بە خولی گەڕانی کردەیی بۆ دانی رێگا چارەی، چارەسەر کردنی کێشەکان. لە ژانوییەی هەمان ساڵدا، یوگنی پریماکۆف وەك وەزیری کاروباری دەرەوەی رووسیە دەست نیشان کرا تاکو سیاسەتی نوێ لەسەر بناغەی روانین و گەمە بە ئاکامی کۆی جەبری سفر، درێژە پێبدا. بەسەرکەوتنی سەرلەنوێ یەلتسین لە هەڵبژاردنی سەرەککۆماری و هاتنە سەرکاری ریفۆرم خوازانی وەك "ئاناتۆلی چۆبایس" و" بۆریس نەمتسۆف" لە مارسی ١٩٩٧ بەریان بەرەو هەڵبژاردنی ئیستراتیژی ئابووری لە هەمبەر وڵاتانی ناوچە بەهێز بوو. رێژیمی نوێ لەگەڵ پێداگری بەسەر یەکانییەتی گەشەی ئابووری و رێفۆرمە ئابوورییەکان لە رووسیە، لە دەرفەتە پێش هاتووە ئابوورییەکان و پەرەسەندنی پێوەندییە ئابورییەکانی لەگەڵ وڵاتانی هەڵکەوتوو لەم ناوچەیە (باکوور و رۆژهەڵاتی رووسیە) کەمتەرخەمیان نەکرد.

بە شێوەی گشتی سیاسەتی دەرەکی رووسیە لەمەڕ ناوچە، لە ساڵی ١٩٩٦دا بووبە روانێنێکی ژیئوئۆکۆنۆمیستی‌و رێبەرانی رووسیە بەو ئاکامەی گەیشتن کە سەردەمی یەکیەتییەکانی فرە لایەن بەسەر چووە پێویستە بۆ بەرەنگاربوونە لە باندۆری رۆژ لەگەڵ

رۆژی رۆژئاوا، چالاکانە بەشداری لە گەلاڵە ئابوورییەکانی ناوچەکەدا بکەن. بەڵام رووسیە لە رووی ئابوورییەوە توانای پێویستی بۆ رکەبەرایەتی لەگەڵ رکەبەرە بەهێزەکانی دیکەی لەناوچەکەدا نییە. بۆیە تاکە رێگای کاریگەری ناوچە کەڵك وەرگرتن لە کۆنترۆڵی رێگاکانی هاتووچۆی سەرچاوە وزەکانە کە لەم وڵاتانە دایە. لەلایەکی دیکەوە، کاراکتێرە نۆییەکان لەوانە گرووپە ماڵیو ئابوورییەکان، خاوەنداریێتی پیشەسازییە گەورەکان، کۆمپانیای گازو نەوت و رێبەرانی هەرێمیی ئەم وڵاتە، دەچنە ناو گۆڕەپانی سیاسەتی دەرەکی رووسیە کە هێندێ جار بە شێوەی سەربەخۆ لە دەرەوەی بازنەی رێژیمی رووسیەدا چالاکی دەکەن. ئەم کارە بووە ئاڵۆزی و راوەستانی سیاسەتی ئەم وڵاتە لە هەمبەر ناوچەکەدا. لەلایەکی دیکەوە، ئاسیای ناوەڕاست لە دوو رووەوە، ئیستراتیژیك و ئەمنییەتی جێگای نیگەرانی رووسیە بووە. تاجیکستان و ئۆزبەکستان، هەڵکەوتوو بە درێژایی سنوورەکانی ئەفغانستانەوە زۆر خەسار هەڵگرە لە هەمبەر رووداوەکانی ئەم دواییانەی ئەم وڵاتەدا، وبە هۆی کۆمەڵێك تێکچڕژاوی و بەستراوەیی ئەمنییەتی، هەروەها لە رووی سنوورییەوە لە بەرانبەر یەکتردا بەربەستن. تاجیکستان کە دوای شەڕی نێوخۆیی لە رووی سیاسییەوە روخێنەرو لاواز مایەوە و بوو بە هاوپەیمانی سەرەکی رووسیە لە ئاسیای ناویندا. ئوزبەکستان لە ترسی بناژۆ خوازانی ئیسلامی، کۆمەڵێك ئاڵۆزی لەناوچە کە بەتایبەت لە پێوەندی لەگەڵ تاجیکستان و قرقیزستان پێکهێنا. کاتێك بەرە بەرە تاجیکستان هاریکاری ئەمنییەتی خۆی لەگەڵ رووسیە راگرت و دواتر لە ئاوریلی ١٩٩٩دا لە "پەیمانی ئەمنییەتی بە کۆمەڵ" هاتە دەرو هاوکاری خۆی لەگەڵ ئەمریکا پەرەپێداو نیگەرانی ئیستراتیژیکی رووسیەش روولە زیاد بوون چوو.

رووخانی رێژیمی تالیبان مەترسی دەرەکی بۆسەر وڵاتانی ئاسیای ناوەندی دابەزاند و بووە هۆی بەرزبوونەوەی رەوشی ئەمنی گشتی لەناوچەکەدا. بەم حاڵەوە، ئەم کارە وەك تەنگەژەیەك بۆ سیاسەتی رووسیە هاتە گۆڕێ. کاتێك ئەمریکا رێبەری نوێژنکردنەوەی ئەفغانستان وەئەستۆ گرت و هاوکاری ئەمنییەتی وەك بەشێك لە پلانی هاوپەیمانی نێونەتەوەیی دژی تیرۆریزم پەرە پێدا، رووسیەی وەلانا. لە هێندێك بواردا، ئەمریکا ئەرکی چاودێری بەسەر هێزە جولێنەرە ئەمنییەکانی وەئەستۆ گرت. لە کاتێکدا ئەمریکا رەوشی ئەمنی گشتی لەناوچەکەدا بەرز کردەوە پێگەی ژیئوئەستراتیژیکی رووسیەی ئاڵۆزتر دەبوو.



**ب: سەردەمی پۆتین.**

بە هاتنە سەرکاری پۆتین لە ساڵی ٢٠٠٠دا سیاسەتی دەرەکی رووسیە بە کەڵك وەرگرتن لە دوو روانگەی ئاتلانتیك خوازان (لیبراڵەکان)و نەتەوە خوازە توندئاژاوەکان پلان داێژی بۆ کرا. بە سەرنجدان بە تێوریيە نوێیەکانی سیاسەتی دەرەکی رووسیە، ئەم وڵاتە بە ناسینی پرۆسەی بە جیهانیبوون و ئاکامەکەی ـ بەهێزبوونی بەستراوەیی دوولایەنە لە جیهان و نێونەتەوەیی بوونی هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگای پێشکەوتوو ـو باروودۆخ و رەوشی، نیزامیو نێونەتەوەیی بە دوای دانوستاندن لەگەڵ گشت وڵاتانی جیهانیو بەهێز کردنی دەوری رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان و چالاك کردنی مافە نێونەتەوەییەکانە.

لە روانگەی رووسیەوە رێ خۆشکردنی هەلومەجی لەباری نێونەتەوەییو بەشداری چالاك و کاریگەری رووسیە بەستراوە بە پەرەسەندوویی نێوخۆی رووسیەوەو مەرجی یەکەم بۆ گەیشتن بە پەرەسەندوویی و دابینکردنی ئەمنییەتە. بۆیە وا دیارە ئەم وڵاتە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە ئەمنییەکانی ناچارە دەگەڵ ئەمریکا، ناتۆو یەکیەتیی ئەورووپا هەڵبکا.

بارودخی دوای ١١ی سپتامبر کۆمەڵێك ئەرکی نوێی لە سیاسەتی رووسیە هێنایە ئاراوە. ئەگەرلە داهاتوودا، رووسیە خوازیاری گێرانی نەقشی گرینگتر بێ لە پرسە ئەمنییەکانی ئاسیای ناوەندی، دەبێ بسەلمێنی کە بۆ وڵاتانی ئاسیای نێوەڕاست بەکەڵك دبێت، لە کاتێکدا کاراکتەرە دەرەکییەکانی دیکە ئامادەی هاریکاری کردنن. چەندین هێزی دەرەکی و رێکخراوە نێونەتەوەیی لە ئاسیای ناوەندی خەریکی دانووستانن و حکوومەتەکانی ناوچەکە لە پێناوی بردنە سەرێی پێوەندییەکانیان لەگەڵ جیهانی رۆژئاوا زۆر چالاکتر بوون. ئەم بارودۆخە نوێیە، ئەرکی زیاتری لە هەمبەر سیاسەتەکانی کاراکتەرێکی ئاکتیڤ دەخاتە روو کە تێدەکۆشێ وتەیەکی بۆ گوتن لەناوچەکەدا هەبێ. لەم بارودۆخە نوێیەدا، رووسیە دەبێ بە هاوپەیمانێکی وەك تاجیکستان و وڵاتانی دیکەی ناوچەکە بسەلمێنێ کە کاراکتەرێکی لێهاتووو بە کەڵکە. لەکاتێکدا پێوەندییەکانی رووسیە و تاجیکستان لە ناوچەیە بێ هاوتا بوو، بەڵام بەردەوامی ئەم پێوەندییە ناتوانێ لە درێژماوەدا جێگای چاوەڕوانی بێ. تەنیا حکوومەت گەلێك یان رێکخراوگەلێك دەتوانن حکوومەتەکانی ئاسیای ناوەڕاست لە بەرانبەر هەڕەشەی بناژۆخوازی یارمەتی بدەن،کە رۆلێکیان لە مەڕ پاراستنی ئاسایشی خۆیان لە داهاتووی ناوچەکەدا هەبێ. هەڵبەت سیاسەتی نوێی پۆتین لە ئاسیای نێوەڕاستدا کۆمەڵێك رەخنەی لەنێوخۆیی رووسیە

هێنایە گۆڕێ. بارودۆخی نوێ، ئەم پرسیارەی هێنایە ئاراوە کە گەلۆ گۆڕان لە سیاسەتی ڕووسیە لە ئاسیای ناوەندیدا بەردەوامە یان تاکتیکییە؟

لە سەردەمی پۆتیندا پرسی تیرۆریزم، بیانوویەك بوو بۆ ڕووسیە لە پێناو ڕەواییدان بە بەریانی ئەم ولاّتە لە هاوپێوەندی نیزامی نەك هەر لە ئاسیای ناوەندی بەلکو لەگەڵ گشت کۆمەڵەی ولاّتە سەربەخۆ و هاوقازانجەکان. لە کۆبوونەوەی شووڕای باڵای بەرگری cis لە مای٢٠٠١ لە (باکۆ)، سەرگەئی ئەیوان ئۆف وەزیری بەرگری ڕووسیە لە پێش گرتنی "سیاسەتێکی یەکگرتووی بەرگری" بۆ گشت ولاّتانی cis لە ژێر ئاڵای خەبات بە دژی تیرۆریزمی پێشنیار کرد. ناوبراو ڕایگەیاند کە گشت ولاّتانی cis لەگەڵ هەڕەشەی تیرۆریستی بە نێوەڕۆکێکی وەکیەك بەرەو ڕوون و ئەم ولاّتە ئامادەیی تەواو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ تیرۆریزم هەیە، بەلاّم پێشنیارەکەی سەری نەگرت.

پێداگری ڕووسیە بۆ خەبات دژی تیرۆریزم کەرەستەیەك بوو بۆ ڕازی کردنی ولاّتانی ئاسیای نێوەڕاست لە هەمبەر پەیوەست بوون بە هاریکاری بە کۆمەڵ، بە ڕێبەرایەتی ڕووسیە، لە ساڵانی ٢٠٠٠و ٢٠٠١دا ڕووسیە سەرنجی بەرەولای هەڕەشەی ئەفغانستان و سنوورەکانی ئاسیای ناوین بوو. بەرە بەرە ڕووسیە جلمێری کۆنترۆڵی لەدەستدا لە کاتێکدا لە هەوڵی ڕاکێشانی پشتیوانی ولاّتانی ئاسیای ناڤین لە بەرانبەر تاڵیباندا بوو بە پەرەدان بە دەستێوەردانەکانی لە ئەفغانستان لە بیری ئەوەدا بوو کە ئۆزبەکستان لە چوارچێوەی هاریکاری ئەمنییەتی cis جیا بکاتەوە و تاجیکستانیش هەر لەژێر باندۆری خۆیدا بهێڵێتەوە.

پلانی کاریی دژە تیرۆریستی پۆتین لە ساڵی ١٩٩٩دا هەوڵێکی لێبڕاوانە لە پێناو بەرز کردنەوەی ڕۆڵی ڕووسیە لە ئاسیای ناوەندی و دابینکردنی بارودۆخی ئەمنییەتیدا بوو. تاکو سپتامبری ٢٠٠١ ئەم هەوڵە لەگەڵ سەرکەوتن ڕووبەڕوو نەبووو ئەزبەکستان لە ڕوانگەی ڕووسیە نزیك نەبوو و ڕەوشی ئاسایشی ناوچەکە ئاڵۆزتر و ڕووسیەش باندۆری خۆی لەسەر ناوچەکە لەدەست دابوو.

بە دوای هێرشە تیرۆریستییەکان بۆسەر ئەمریکا، پۆتین لە وتووێژیکی تەلەفوونی لەگەڵ جۆرج بووش لە گەڵ دەربڕینی هاوخەمی ولاّتەکەی، بە مافی ڕەوای ولاّتی ئەمریکای زانی کە سزای تیرۆریستەکان یەك لەوان ئوسامە بنلادن و ڕێکخراویی ئەلقاعیدە و ڕیژیمی تاڵیبان بدا. لە بەرواری ١٣ی سپتامبری ٢٠٠١، ڕووسیەو ناتۆ بە دەرکردنی بەیاننامەیەکی هاوبەش



هێرشە تیرۆریستیەکانیان مەحکووم کرد. ڕووسەکان لە هاوکاری کردنی نزیکتر دەگەڵ ویلایەتە یەککگرتووەکان چاوەڕوانی پتریان هەبوو.

وەلاّمی لێبڕاوانە و پشتیوانی هەمەلایەنە لە ڕووسیە، لە پەرچەکردارەکانی ئەمریکا بوو، بە خێرایی دەرکەوت کە ڕووسیە بە هۆی نارەزایەتییەکی زۆر لەنێوخۆ، بە شێوەی ڕاستەوخۆ بەشداری لە ئۆپەراسیۆنی سەربازی لە ئەفغانستان لەگەڵ سەربازە ئەمریکاییەکان ناکات. هەروەها، لە نێوان یەکە نیزامییەکانی ڕووسیە دژایەتی جیددی لە پێوەندی لەگەڵ هاوڕێییەتی لەگەڵ ویلایەتە یەککگرتووەکان لە ڕاستای کەڵك وەرگرتن لە ولاّتەکانی ئاسیای ناڤین هاتە ئاراوە.

لە ١٤ی سپتامبری ٢٠٠١، سەرگەئی ئەیوانۆف وەزیری بەرگری ڕووسیە ڕایگەیاند: ئاسیای ناڤین لەناوچەیەکە کە پەیمانی ئەمنییەتی بە کۆمەڵی، کۆمەڵەی ولاّتە سەربەخۆ هاوقازانجەکان تێدا هەڵکەوتووە. من هۆکارێك نابینم ئەگەری ئەوە هەیە جا بە هەر هۆکارێك، ناتۆ لە ڕۆڵی جێبەجێکاری ئوپەراسیۆن لە ولاّتەکانی ئاسیای ناوەڕاست کە بە ئەندامی کۆمەڵەی ولاّتە سەربەخۆو هاوقازانجەکان بە ئەژمار دێن، چالاکی بکا.(1)

ولاّتانی ئاسیای ناوەندی خوازیاری هاریکاری لەگەڵ ئەمریکادا بوون. لە ١٦ی سپتامبری٢٠٠١، عەبدولعەزیز کاملۆف وەزیری دەرەوەی ئۆزبەکستان ڕایگەیاند کە ئامادەی هەر چەشنە هاوکارییەك لەگەڵ ئەمریکا بۆخەبات دژی تیرۆریزم (لەوانە کەڵك وەرگرتن لە خاکی ئۆزبەکستان بۆ هێرش کردن بۆسەر کەمپە تیرۆریستییەکان لە ئەفغانستان)دا دەبێ. ناوبراو هاوکاری لەگەڵ ئەمریکای بە بیرهێنایەوە و جەختیشی لەسەر ڕاوێژ کردن لەگەڵ ڕووسیەی دەکرد. لە ٢٤ی سپتامبری ٢٠٠١ پۆتین ڕایگەیاند کە ڕووسیە و هاوپەیمانانی لە ئاسیای ناوەندی دەرفەتی کەڵك وەرگرتن لە کریدۆرە ئاسمانیو فڕۆکەخانەکانی خۆی (بۆ گرووپە زانیاری و فریاکەوتنەکان)بە ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی دەدا. بەلاّم ئەوان نابێ لەپێناو ئوپەراسیۆنە سەربازییەکان کەڵك لەو شوێنانە وەربگرن. سەرگەئی ئەیوانۆف، وەزیری بەرگری ڕووسیە، لە ٢٦ی سپتامبری ٢٠٠١دا ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە ڕووسیە و ولاّتانی ئاسیای ناوەندی کریدۆرە ئاسمانییەکانی و فڕۆکەخانەکانیان بۆ کەڵك وەرگرتن لەلایەن ئەمریکاییەکانەوە،

(1) O RT Vremia Program, 14 septemper, 2001 IIAR – TASS, 14 septemper, 2001/ Jamestown manitor, Lssue 170 – 18 september, 2001

کردووەتەوە. راگەیاندراوی دەرچوو ئاکامی راوێژکردنە چڕوپڕەکانی بەرپرسانی رووسیە و وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست بوو.[1] کاتێك کە سەرۆك وەزیرانی کۆمەڵەی وڵاتە سەبەخۆ هاوقازانجەکان لە رێکەوتی ٢٨ی سپتامبری ٢٠٠١ کۆبوونەوە، ئەوان ئەم بۆچوونەی پۆتینیان رەتکردەوە. هەرچەندە پۆتین لە ئاخاوتنەکانی خۆی لە بەرواری ٢٤ سپتامبر تەنیا ئوپراسیۆنی زانیاری، مرۆییانەو فریاگۆزاری هێنابەرباس و بە ئاشکرا دەریبڕی کە نابێ هێچ کردەوەیەکی هێرشبەرانە لەم وڵاتانەوە ئارستەی وڵاتانی دیکە بکرێ، بەڵام شێوازی ئاخافتنی ناوبراو بەهەستو سۆزەوە بوو. پێشتر سەربازانی ئەمریکا لە مەشقە نیزامییەکانیان دەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناوەندی لە چوارچێوەی پلانی هاوبەش بۆ ئاشتی ناتۆ بەشدارییان کردبوو. بەڵام ئەوەیان بە تەواوەتی جیاواز بوو. لە رابردوودا مسکۆ بەردەوام سیاسەتێکی جیاواز لە سیاسەتەکانی لە هەمبەر رۆژئاواو لە ئاسیای نێوەڕاست بەکار دەبرد چونکە ئاسیای ناوەندی وەك ناوچەیەك بۆ قازانجی رووسیە لەبەرچاو گیراوەو هێزە دەرەکییەکان دەبوایە لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا بن. پۆتین چاوەڕوانی لە ئەمریکا هەبوو کە ستراکتۆرە ئەمنییەکان بە رێبەری رووسیە لە چوارچێوەی "پەیمانی ئەمنییەتی بە کۆمەڵ"[2] cst بۆ هاوئاهەنگی لەگەڵ کردەوە تیروریستیەکان لە ئاسیای ناوەڕاستدا کەڵکی لێ وەربگرێت کە ئەم چاوەڕوانییە بە هیوا بڕوا مایەوە.

لە بەرانبەردا، ئەمریکا بە شێوەی راستەخۆ پێوەندی لەگەڵ ئوزبەکستان، قرقیزستان و تاجیکستان دامەزراند. کاتێك بوردومانی ئەفغانستان لە ١١ی ئوکتۆبری ٢٠٠١ دەستی پێکرد بە روونی شاراوەییەکی نوێ لە سیاسەتی دەرەوەی رووسیە هاتە بەرباس. نە citو نە cst هیچکام رۆڵی راستەخۆی لەبەرەی دژە تیروریستی بە رێبەری ئەمریکایان نەگێڕا.

زێدەباری ئەوە، هاوکات دەگەڵ باندۆڕی روو لە زیادبوونی ئەمریکا لە ئاسیای ناوەڕاستدا، رووسیە کۆمەڵێك هەوڵی لە پێناو پەرەسەندنی هاریکارییە فرە لایەنەی لە چوارچێوەی cst لەمژاری خەبات دژی تیرۆریزم درێژەی پێدا. باس وتووێژەکانی کۆبوونەوەکانی cst وەك بارودۆخی نوێی پاش ١١ی سپتامبر لێکەوتەکانی لەسەر بیاڤی بەرپرسایەتی cst، رۆڵی رووسیە لە خەباتی جیهانی دژی تیرۆریزم، هاوئاهەنگی وڵاتانی ئەندامی cst لە هاوپەیمانی بە سەرۆکایەتی ئەمریکادا بوو. بە

(١) نیگۆر ئەیوانۆف وەزیری دەرەوەی رووسیە گوتی: "سەرۆك کۆمار پۆتین لەم باسەدا لەگەڵ رێبەرانی ئاسیای ناوەندی رێکەوتبوون" ئینتر فاکس، ١٦ی سپتامبری ٢٠٠١.

(2) the collective security treaty



دەسپێشخەری تاجیکستان لە رۆژەکانی ٨و ٩ی ئوکتۆبری ٢٠٠١دا کۆبوونەوەیەکی تایبەتی پێکهاتوو لە کۆمیتەی وەزیرانی شوورای ئەمنییەتی نەتەوەیی cst لە پێناو وتووێژ لە مەڕ باس لەسەر بارودۆخی ئاسیای ناڤین و کردەوە هاوبەشەکان بۆ خەبات بە دژی تیرۆریزمی نێونەتەوەییو بناژۆخوازی ئیسلامی لە شاری دووشەنبە پێکهات. راگەیاندنی کۆتایی دانیشتنەکە رەنگدانەوەی ئامانجی پلانی cst وەك بەشێك لە کردەوە نێونەتەوەییەکانی بە سەرۆکایەتی ئەمریکا بوو بە جۆرێك کە وڵاتانی ئاسیای ناوەندی دیکۆمێنتی رێگا چارەی هاوبەشی cst بگرنە بەرو هاوکات هاوکاری ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی بکەن. بەشداری لە هێزەکانی دژکردەوەی خێرا cst درێژەی هەبوو، هەرچەند دامەزراندنی راستەقینەی تاکو ساڵی ٢٠٠٢ درێژەی کێشا. ناوەندی لێکوڵینەوەی دژە تیرۆریستی cst لە مسکۆ کێشەی لە بەردەم جێبەجێ کردنیدا هەبوو، قازانجی سەرەکی رووسیە بۆ وڵاتانی ئاسای ناڤین، هێنانە ئارای ئەوان بۆ ناو هاریکاری ئەمنییەتی، دابەزاندنی بەهای چەك و کەرستە نیزامییەکان بوو. دوای ئەوەی کە دانیشتنی تایبەتی رێبەرانی cst لە سەرەتای ٢٠٠٢ (یەکەمین دانیشتنی رێبەرانی دووای ١١ی سپتامبر) بەڕێوەچوو، رووسیە رێگاچارەیەکی نوێی بۆ هاتنی ئەمریکا بۆ ناوچەکە هێنا گۆڕێ. مژاری ئەم دانیشتنە تایبەتییە، ئوپەراسیۆنی نیزامی ئەمریکا لە ئەفغانستان و بوونی هێزی سەربازی ئەم وڵاتە لە ئاسیای نێوەڕاستدا بوو، کەشو هەوای نوێ تێکچڕژاوبوو کاتێك ولادیمێر پۆتین راگەیاند کە نابێ دەربارەی بوونی هێزە سەربازییەکانی ئەمریکا لە گورجستان و ئاسیای ناڤین نیگەران بین. "ئەمە کارەسات نییە (ئەگەری بوونی سەربازی ئەمریکا لە گورجستان)و نایشتوانێ وابێ. بۆچی بوونی هێزەکانی ئەمریکا لە ئاسیای ناوەندی دەکرێ ببێ، بەڵام لە گورجستان موارِ* ناکرێ.

ئەم بابەتە سەرلەنوێ لە کۆبوونەوەی cst لە مانگی مای دووپات بۆوە کاتێك کۆبوونەوەی کۆمەڵەی شوورای ئاسایشی بە کۆمەڵ بەڕێوە چوو، والری نیکولانکۆ[1] راگەیاند کە بوونی سەربازانی ناتۆ لە خاکی سۆڤیەتی پێشوو لە هاوکێشەی خەباتی دژی تیرۆریستی هاوبەش، لۆژیکییە. رووسیە خۆی لەگەڵ بارودۆخە نوێیەکانی ئاسیای ناڤین دەگونجاند.[2]

* موارِ: تەحموول کردن

(١) Valey nikolaenkp

(٢) لنایانسن، "رووسیە و ئاسیای ناوەندی دوای ١١ی سپتامبر"، وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندیو قەفقاز، ژمار ٤١، بەهاری ١٣٨٢، لاپەرەکانی ١٨٨ ـ ١٨٣.

هەنووکە رووسیە هەوڵدەدا کە پەرە بە cst بدا. لە دەیەمین ساڵی پێکهاتنی cst لە مانگی مای ٢٠٠٢، شەش وڵاتی ئەندام لە راگەیاندراوێکی هاوبەشدا، جەختیان لەسەر بەرز کردنەوەی پێگەی ئەم رێکخراوە و سەرلەنوێ رێکخستنەوەی و تەشکیلاتی دەکردوو هەروەها خوازیاری بە فەرمی ناسینی لەلایەن رێکخراویی نێونەتەوەیی وەك رێکخراوێکی ناوچەیی بەپێی پاژی ١٣ی جارنامەی رێکخراویی نەتەوەکان بوون. ئەرکەکانی cst تایبەتی بۆ هەڕشەکانی دەرەکی کورت نەکراوەتەوە بەڵکو بەرگری لە بەرانبەر هەڕەشە نوێیەکان لە هەمبەر ئاسایشی نەتەوەیی، ناوچەیی و نێونەتەوەیی وەك تیرۆریزم، قاچاخی مادده هۆشبەرەکان و چەك و تەقەمەنی رێکخستنی تاوانیش لەخۆ دەگرت. راگەیاندنی هاوبەشی cst وەك رێکخەری میکانیزمی سیاسەتە دەرەکی و نیزامییەکان و حکوومەتەکانی ئەندام، هەروەها وەك ئاڵقەی پێوەندییەکان لەگەڵ جیهانی دەرەوەی ناساند، هەروەها پێداگری لەسەر ئەوە دەکا کە لە پێوەندی نیزامی ـ سیاسی لەنێوان وڵاتانی ئەندام لەسەرەوەی پێوەندییەکانی ئەو وڵاتانەن، کە تێدا ئەندام نین. ئامانجی رێکخراویی ئاماژە پێکراو، گەورە کردنەوەی cst و کردنی ئەم رێکخراوە بە شەرییکەکی بەهێز بۆ رۆژئاوا لە کاتێکدا هاوکات پشتیوانی لە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست دەکا.

"وادیم لۆکۆ" باڵوێزی رووسیە ئەم بارودۆخەی لەرستەیەکدا شیکردەوە و گوتی رۆژئاوا دەبێ cst وەك شەریکێك لە پێناو هاوکاری لە ئاسیای ناوەڕاستدا قەبووڵبکا: "خولی ئۆپەراسیۆنی دژە تیرۆریستی لە ئەفغانستان ئەم بیانووەی بەرۆژئاوادا کە چاوخشاندنێکی سەرلەنوێ بە پێکهاتەی ئەمنییەتی ناوچەکەدا هەبێ تاکو لە خەباتی دژە تیرۆریستی سەرکەوتوو بێ و چالاکییەکانی سەقامگیری ئاسیای ناوەندی و ناوچەکانی دەوروبەری لێبکەینەوە. بە لەبەرچاوگرتنی پەیامی ئەمنییەتی بە کۆمەڵ و رێکخراوی هاوکاری شانگهای، ئۆپەراسیۆنی دژە تیرۆریستی پێشوو دەریخستووە کە بە قازانجی رۆژئاوا نییە کە پێکهاتە ئەمنییەتییەکانی دامەزراو لە یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو لەبەرچاو نەگرێ. ئەوانە بە چڕی هاتوونەتە گۆڕێ وەك پاڵنەرێکی بەهێز و بە کەڵك بایەخی پێدەدرێ."[١] هێشتا نە ئەمریکاو نە ناتۆ خوازیاری پەرەپێدانی پێوەندییە رێکخراوییەکان دەگەڵ cst نین. وڵاتانی ئاسیای ناوەندی، لە پێوەندی دوولایەنە لەگەڵ وڵاتە ئەوروپاییەکان بە شێوەی سەربەخۆ کار دەکەن. بە شێوەی گشتی، ئامانجە سەرەکییەکانی رووسیە

(١) و. لۆکۆ، "رۆڵی پێویستی رووسیە لە خەبات بە دژی تیرۆریزم" ئینترنشناڵ ئەفروز، ساڵی ٤٨، ژمارە ١٧ ساڵی ٢٠٠٢، لاپەڕەی ٥٩.



لە ئاسیای ناوەڕاست و پێوەندی دامەزراندن لەگەڵ ئەمریکا، لە سەردەمی سەقامگیری رێژەیی، هەنووکە بە شێوەی خوارێ کورت بێژی دەکەن:

١ـ پاکانە حێسبی رووسیە لەگەڵ بزووتنەوەی تاڵیبان، یەکێك لە ئامانجەکانی رووسیەو هاوپەیمانانی لە ئاسیای ناوەڕاست و پێش گیری لە تەشەنەی قەیرانی ئەفغانستان بۆناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەمنییەتی رووسیە بوو، ئاشکرایە کە هەتا لەناوبردنی وەها ناوەندێکی مەترسیهێنەر، پاساو هێنانی پێویست بۆ مانەوەی هێزە رۆژئاواییەکان لە ناوچەکە دەمێنێتەوە.

٢ـ کاتبەندی سەرلەنوێی دانەوە و تەنانەت لێ خۆش بوون لەهێندێك لە سلڤەکانی رووسیە کە قەرزار بوو بە دامەزراو، ماڵی و تەرخانکراو نێونەتەوەییەکان.[١]

٣ـ دواخستنی بڕیاردان لەمەڕ پەیوەست بوونی هێندێك لە وڵاتە سەربەخۆ هاوقازانجەکان بە ناتۆ، بەتایبەتی وڵاتانی دەوروبەری دەریای باڵتیك وەك ئوکراین کە دەگەڵ رووسیە سنووری هاوبەشی هەیە.[٢]

٤ـ مسکۆ لە رێگای بەشداریکردن لە ئۆپەراسیۆنی خەبات دژی تیرۆریزم دەتوانێ هیوادار بە پاراستنی پێگە نیزامیو ئیستراتیژیکەکانی خۆی لە ئاسیای ناوەڕاست بێ.[٣]

٥ـ بەرەنگاری خێراو بێ نیگەرانی لەگەڵ هەر چەشنە جموجۆڵێکی ئیسلامی لەنێو خۆ، بە سەرنجدان بەوەی کە ئەم وڵاتە پتر لە ٢٠ ملیۆن موسڵمانی هەیە.

٦ـ تێکشکاندنی خەباتکارە چیچانەکان بە کەڵکوەرگرتن لە پشتیوانی تەواوی نێونەتەوەیی[٤] و خەبات بەدژی چاوگەکانی بەهێز کردنی هزرو کەرەستەکانی ئیسلامی خوازان[٥] کە چیچان بووەتە جێی نیگەرانی و ئاریشە بۆ رووسیە، بە هاوکاری دارای رۆژئاوا.

(١) هەر لەم پێوەندییە بەشی جێگای سەرنج لە قەرزەکانی ئەم وڵاتە لە ناوەند رۆژئاوایان لە چوارچێوەی کولوپی پاریس و لەندن بەرە بەرە درانەوە.

(٢) ئەندامیەتی رووسیە پرسی گوشاری رۆژئاوا بۆسەر رووسیە لە هەمبەر وەپێش کەوتنی ئەندامەیەتی وڵاتە سەربەخۆ نوێکان و رۆژهەڵاتی ئەوروپا تا ماوەیەك دابەزاند.

(٣) لەم پێوەندییەدا رووسیە لە رووی سەربازییەوە هێزی خۆی لە تاجیکستان بۆ رادەیەکی بەرچار بەرز کردەوە

(٤) رووسیەو بەرژەوەندییەکانی شەڕ لەگەڵ تیرۆریزم- ماڵپەری ئەنتێرنێتی ئەلجەزیرە— حوسینی -رۆژنامەی حەیاتی نوێ- بی تا.

(٥) ئەحمەد رەشید رۆژنامەوان و لێکولەر، بۆ زانیاری پتر سەردانی ئەم چاوگە بکەن: بابەتی سەرهەڵدانی گەشەی ئیسلامی گەریانی لە ئاسیای ناوەندی، رۆژنامەی هەمشەری، ١٣٨١/٤/١٣ لاپەڕەی ١٥.

٧ـ بەرگری لە مافی بە رچەڵەك رووسەكان.

٨ـ نوێژەنكردنەوە و بردنەسەری رەوشی ئابووری وڵات.

٩ـ پاراستنی سەرۆكایەتی لە كۆمەڵەی سەربەخۆی هاوقازانجەكانی cst.

١٠ـ رووسیە لەو بڕوایە دایە كە راستییەكانی زاڵ بەسەر ناوچەكە، ئەمریكا دێنێتە سەر ئەو بڕوایە كە ناتوانێ بۆ درێژماوە لە ناوچەكەدا بمێنێتەوە چونكە پێكهاتەی ئەتنیكی ـ كولتووری و سیاسی ئەم وڵاتە بە رادەیەكی پێویست لە بوارگەڵ و وزەگەلی سەرهەڵدانی ناكۆكییەكانی تێدا بەدی دەكرێ كە لە درێژ بوونەوەدا دەتوانێ ببێتە هۆی نیگەرانی بۆ ئەم وڵاتە. دواترخۆیان بەو ئاكامەی بگەن كە كۆتایی بێنن بەم بوونە و لە كاتی سەرهەڵدانی وەها بارودۆخێكدا یەكەمین وڵات كە ئەم وڵاتانە پێویستییان پێ دەبێ، رووسیەیە.

## ٢ـ توركیە

توركیە زۆرتر خۆی بە وڵاتێكی ئەورووپای لەقەڵەم دەدا تاكو ئاسیایی، لە كاتێكدا تەنیا بەشێكی بچووكی خاكی ئەم وڵاتە لە قارەی ئەورووپادا هەڵكەوتووە، بەشێكی زۆر لە كارناسان، توركیە لە رووی جوغرافیایی سیاسیو ژئوپۆلۆتیكی بە پردێكی پێوەندی لەنێوان ئەورووپاو ئاسیا پێناسە دەكەن. سەركردەكانی توركیە بەم روانینەوە تێدەكۆشن تاكو لە بوارە ئابووریو ناوچەییەكان و بەتایبەتی لە پلانەكانی نەوت و گازی دەریای خەزەر رۆڵێكی سەرەكی بگێڕێ. لە راستیدا لە روویەكەوە توركیە وەك هێزی دەرەوەی سنوور بۆ ئاسیای ناوەڕاست بە ئەژمار دێ، چونكە ئەم ناوچەیە لە رێگای توركیەوە دەتوانێ بە ئەورووپاو رۆژئاوا پێوەست بێ.

لە چاوپێداخشاندنێكی گشتیدا، ئیستراتیژی توركیە لە ئاسیای ناوەندیو تەنانەت قەفقازیش بۆ دەسپێڕاگەیشتن بە ئامانج و قازانجە ئابوورییەكان دەتوانین لە چەند خاڵدا چڕ بكەینەوە، یەكەم دەستڕاگەیشتن بە بازارێكی بەربڵاویی بەكاربردن، دووهەم جێبەجێ كردنی رۆڵی پێوەندی بۆ سەرمایەگوزاری رۆژئاواو سێهەمیش كەڵكوەرگرتن لە هێزی كاری كەم بەهاو مەوادی خاوی ناوچەكە، هەروەها یارمەتیكردنی بە پلانەكانی ئاوەدانكردنەوەو بەشداری لە پرۆژەكانی نەوت و گاز كۆمەڵێك لە كارەكانی توركیەیە لە ئاسیای ناوەندی، یارمەتی بە دامەزراندنی هێڵی بۆرییەك كە گازی توركمەنستان لە رێگای ئێران و توركیەوە بەرێ دەكا بۆ ئەورووپا. وێڕای ئەوە، هاریكاری و سەرمایەدانان لە وڵاتانی ئاسیای ناوەندی لەپلانەكانی دیكەی توركیە لەم ناوچەیە دایە كە لە راستای ئەم كارانە هێندێك كاری كردووە: بۆ وێنە لە



بواری پێداگۆژی، راهێنانی دیپلۆماتەكان و بانكداران، بەڵام گەورەترین كاری دامەزراندنی بانكی "ئەگزێم" لە پێناو پەرەدان بە كاروباری بازرگانی بوو. هەروەها بە سەرنجدان بە پرۆژە درێژماوەكانی وڵاتانی ناوچەكە، یەكێك لە گرینگترین كارەكانی ئەنجامدارو لەم بوارەدا، سەرمایەدانانە لە بابەت پلانە هاوبەشەكان لە مەڕ دامەزراندنی بانكەكان. لەم پێوەندییەدا كۆمپانیایەكی هاوبەش لەلایەن بانكی ئەگزیمی توركیەو بانكی پەرەو نوێژەن كردنەوەی ئەورووپا لە راستای گواستنەوەی تەكنۆلۆژیاو یارمەتییە تكنیكییەكان بۆ ئەم وڵاتە دامەزرا. هەروەها توركیە هێندێك پشتیوانەو یارمەتییە داراییەكانی بۆ ئەم ناوچەیە تەرخان كرادووە.

توركیە بە پەرەسەندنی پێوەندییە ئابووریو بازرگانیو كەڵكوەرگرتن لە دەرفەتەكانی سەرمایەدانان لە ئاسیای ناوەندی تامەزرۆیی بەرفراوانی نیشان داوە، توركیە لە ساڵی ١٩٩٠ تاكو ١٩٩٧ی زایینی پتر لە پێنج ملیارد دولار سەرمایە لەم ناوچەیە خستووەتە گەڕ، بەڵام بەهۆی ئەوەی كە توركیە لە راستای دابینكردنی ویستەكانی ئەم وڵاتانە نەجووڵاوەتەوە، لەئاكامدا شوێنەوارێكی جێی رەزامەندی لە یارمەتییە مالییەكانی دەر نەكەوتووە.[1]

هەنووكە ئامانجی توركیە ئامادەكردنی لە رادەبەدەری هێنان و راكێشانی ئابوورییەكانی ئاسیای ناوەندی و قەفقازە بۆ ناو ئابووری جیهانەوە تێدەكۆشن تاكو یارمەتی بە دامەزراوە كردنی ئابووری بازاڕی ئازاد لەم ناوچەیەدا بكەن. هەر لەم راستایەدا ئاژانسی هاریكاریە نێونەتەوەییەكانی "تیكا"ی لە ساڵی ١٩٩٢ لەم وڵاتەدا دامەزراند.[2]

لە روانگەی توركییەوە، ئاسیای ناوەندی لە راستیدا وەك ناوچەیەكە بۆ تێكەڵبوونی خۆی دەگەڵ یەكیەتیی ئەورووپاو رۆژئاوایە. توركیە لە هەمبەر وەرنەگێڕانی ئەم وڵاتە لە یەكیەتیی ئەورووپاداو چاوەڕوانی لە پشت دەرگا داخراوەكان، سەرەنجی بۆ لای بیاڤەكانی دیكەی دەرەكی راكێشراوە. یەك لەوانە گەشەسەندنی رۆژ دەگەڵ رۆژی پێوەندییە ئیستراتێژیكییەكانی لەگەڵ ئەمریكاو ئیسرائیل، روانین بە رۆژهەڵات و گرینگیدان بە بەهێزكردنی پێوەندییە ئابووریو سیاسی و كولتوورییەكانی لەگەڵ وڵاتانی ناوچە بەتایبەت ئاسیای ناوەڕست و قەفقاز" سەركردەكانی توركیە بە سەرنجدان بە پێوەندییە ئەتنیكیو

---

(1) Philips Ropins, "Between sentiment and selr interest: Turkey policy toward Azabaijan and the central Asia", Middle East Journal, vol, 43, n. 4, 1993, p. 608.
(2) news post, April 1992, p. 2.

ڕەگەزییەکانی خۆی لەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناڤین لە هەوڵی ئەوەدایە کە یەکیەتیی ئەورووپا لە ڕۆڵی سەرەکی تورکیە ئاگادار بکاتەوە، تاکو ببێت بە ئەندامی ئەم یەکیەتییە. بەم پێیە ڕوانینی تورکیە بۆسەر ناوچەکە ڕوانینێکی تاکتیکییە و سەرکردەکانی ئەم وڵاتە بە سەرنجدان بە پێگەی ژیئوپۆلوتیك و پێگەی نێونەتەوەیی خۆی لە هەوڵی گێڕانی ڕۆڵی گەورەتر لە ئاسیای ناوەڕاستە. لەلایەکی دیکەوە، ئابوورییە گەشە نەکەوتووەکانی ئەم ناوچە و بەهرەمەند بوون لە بازارگەلی نوێ و گانگای نەوت و گاز وەك دەرفەتێك و تێکەڵییەك بۆ ئابووری لە حاڵی گۆڕانی تورکیەدا بووە و هەم ئەم کارە بایەخی پتری لە بوونی ئەم وڵاتە لە ئاسیای ناوەندیدا بەخشیوە. بە جۆرێك باندۆری تورکیا لە یەکەم مانگەکانی دوای سەربەخۆیی وڵاتانی ئەم ناوچەیە زۆر بەرچاوە، نوینگەی سیکۆلاریزم بەریانی بەلای ڕۆژئاوا دانی بەڵێنی دڵفراوانە بە کۆمپانیا ڕۆژهەڵاتییەکان، هەستێکی تایبەتی لە ئاسیای ناڤیندا پێکهێنا بوو، ئاوێتە بوو لەگەڵ ناسیۆنالیزمی ئەتنیکیش.

سولەیمان دەمیرەڵ، سەرەك کۆماری پێشووی تورکیە لە کۆنفرانسێکی چاپەمەنیدا ڕاگەیاند کە "تورکیە جەخت لەسەر ئەوە دەکا تاکو کەشێکی ئاشتەوایی و ئارام لەسەر بناغەی هاریکاری و بەرپرسایەتی هاوبەش لەناوچەکەدا پێکبێنێ". تورکیە لە بوارە ئابوورییەکاندا ئاکتیڤ بووە، بۆ وێنە بونیادێکی هاوکاری ئابووری، کولتووری، پەروەردەییو تەکنیکی بۆ یارمەتیدان بە وڵاتە تورك زمانەکان دامەزراندووە. ئامانج لەم دامەزراوە بەرزکردنەوەی ئاستی پێوەندی وڵاتانی ناوچەکە هەروەها یارمەتیدان بە ئەوانە هەتا بتوانن پەرە بە پێکهاتەی سیاسی خۆیان بدەن، خۆیان باسەکانیان دابڕێژن، هەروەها گرفتەکانی پێوەندییدار بە بانکداری، بیمە و بازرگانی دەرەکی، بودجەو نیزامی ماڵیاتی خۆیان لە قۆناخی تێپەڕەوە بگۆڕن بۆ بازاڕی ئابووری ئازاد.[١]

نموونەی ڕوونی هاریکاری ئابووری تورکیە لەگەڵ ئاسیای ناوەندی، سلڤەی یەك ملیارد دۆلاری بانکی ناوەندی هەناردە و هاوردەی تورکیە "ئەگزیم بان"ە، کە تەرخانکراوە بۆ وڵاتانی ناوچەکە. کە لەم ڕێژەیە ٢٠٠ ملیۆن دۆلار بۆ ئوزبەکستان و ٩٠ ملیۆن دۆلار بۆ تورکمەنستان و ٥٠ ملیۆن دۆلار بۆ تاجیکستان لەبەرچاو گیراوە. لە ڕاستیدا وڵاتانی دواکەوتووی ئاسیای

(١) "داهاتووی کۆمەڵەی هاوقازانجەکان"، ڕاپۆرت، ناوەندی توێژینەوەی ئیستراتیژیکییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ژمارە ٣٣، لاپەڕەی ٨.



ناوەندی لە سەرەتای ساڵەکانی سەربەخۆیی وەك وڵاتێکی سەرکەوتوو دەیڕوانییە تورکیە کە توانی بوونی ئابوورییەکی پەرەگرتووی لەسەربناغەی تێکەڵاوییەك لە بەدەستهێنان و بازرگانیو دێموکراسیو جیایی ئایین لە سیاسەت دامەزراوە کە ئەم کارە ڕێگای بۆ سەرمایەدانان و ئاکتیڤ بوونی دیپلۆماسی تورکیە دەکردەوە. بەڵام بە خێرایی ڕێبەرانی ئاسیای تێگەیشتن کە لەمەڕ توانایی ئابووری تورکیە زۆر زێدەڕەویی کراوە، چونکە ئەم لە وەها ڕەوشێکدا نییە کە بۆ ڕزگار کردنی ئابووری پاشکەوتوویی ئەوان هاریکاری سەرکیان بکا. لە ئاکامدا ئەم گەشبینییە لە سەرتای مانگەکانی دوای سەربەخۆیی ناوچەکە بە پان تورکیزم دامرکایەوە. و حکوومەتەکانی ناوچە بە دوای یارمەتیدەری باشتربوون. لە ڕاستیدا ئەو پرسانەی کە ئەم وڵاتانە لەگەڵی ڕووبەڕوون، بە ڕادەیەکی نەك تورکیە بەڵکو هیچ وڵاتێکی دیکە ناتوانێ بە تەنیا هەوڵی چارەسەر کردنیان بدا. هەر بۆیە نابێ لە ڕێژەی توانایی ئابووری تورکیە زێدەڕەویی بکرێ، بەڵام ئەم وڵاتە دەتوانێ بە پاڵپشتی سەرمایە و تەکنۆلۆژی ڕۆژئاوا ڕۆڵێك وەئەستۆ بگرێ و لە درێژماوەدا دەسەڵاتێك لەناوچەکە بەچنگ بێنێ. بەڵام تاکو هەنووکە ژمارەیەکی کەم لە کۆمپانیا ئەمریکاییو ئەورووپاییەکان لە ڕێگای تورکیەوە بۆچوونە ناو بازاڕەکانی ئاسیای ناڤین بەریانیان پێشانداوە.

بە شێوەی گشتی لە بەراورد کردنێکی کورتدا لەسەر باندۆری ئابووری تورکیە دەتوانین بڵێین کە بە سەرنجدان بە ئامانج و قازانجەکانی ئەم وڵاتە، بوونی تورکیە لە ئاسیای نێوەڕاست شوێنەوارێکی نەگونجاو و جۆرە ڕەکەبەرایەتییەکی لەگەڵ ئێران پەرەپێداوە. بەڵام بە گرینگیدان بە سەرهەڵدانی بوارەکانی هاوکاری ناوچەیی تورکیەو ئێران لە چوارچێوەی ڕێکخراوی هاریکاری ئابووری (ئیکۆ) تا ڕادەیەك شوێنەواری نالەباری ڕەکەبەرایەتی دابەزیوە. هەروەها ئێران بە کەڵکوەرگرتن لە تایبەتمەندییەکانی زۆرترین هەوڵی لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی داوە. کەواتە هەرچەندە ئەم وڵاتانە نموونەی حکوومەتی تورکیە بەباشی لەقەڵەم دەدەن بەڵام لێك نزیکی لە ڕووی جوغرافیاییو بوونی سنووری دوور و درێژ، هاوبەشی مێژوویيو کولتووری، دەست پێراگەیشتنی بە ئاوایی ئازاد لە تایبەتمەندییەکانی ئێرانە. ئەم دوو تایبەتمەندیە واتە دراوسێتی جوغرافیاییو هاوپێوەندی کولتووری و مێژووی لەگەڵ خەڵکی ئاسیای ناوەندیو بەتایبەت تورکمەنستان و تاجیکستان و ئوزبەکستان لە پەرەسەندی هاریکارییەکانی ئێران لەگەڵ ئەم وڵاتانە ڕۆڵی گێڕاوە. وێڕای جیاوازی بۆچوونەکانی نێوان تورکیەو ئێران و ڕکەبەرایەتی بۆ

کارتێکەری لە ناوچەکە ناتەبایی لە بەرژەوەنـدی ئـەم دوو وڵاتـە لەگـەڵ یـەکتر لـە ئارادانییـە و هیچکامیان خوازیاری سـەرلەنوێ دارِشـتنەوەی سـنوورەکانی ناوچـەکە نـین. بـەڵام رەنگـە بـەو حاڵەشـەوە گوشـارە نێوخۆییـەکان و هێنـدێك کـردەی ژیرانـەی خـەڵکانی هـەرێمی لەوانەیـە قازانجەکانی دوو وڵات بخاتە بەرانبەر یەکتر.[1] ئێـران تامـەزۆیی سـەرمایەدانانە لەسـەر بنـەمای وشیاری نەتەوەیی لە وڵاتانی تازە بە سەربەخۆیی گەیشتوو ئاسـیای ناوەندیدایـە. ئاشـکرایە کـە ئیسلام بەشێکی گرینگ لە گەشەسەندن رابوونی نەتەوەیی‌و هەستکردن بە شـوناس، پێکـدێنێ و بژاردەکانیش بە مەبەستی رەوایدان بە خۆیان هانی ئەوان دەدەن زێـدەباری ئـەوە، بەڵگەگـەلێکی زۆر لە گۆڕێ دایە کە تورکیـەو ئێـران لەناوچـەکە بەتایبـەتی لـە بـواری ئـابووری هاوبـەش زۆر هەوڵدەدەن. نیشانەی پتەوی ئەم هەوڵە هاوبەشی دەوڵەت لە پەرەپێـدانی پانتـایی چـالاکییەکانی رێکخراوی هاریکاری ئابووری (ئیکۆ) رێککەوتن لەمەڕ هێندێك پرۆژەی گرینگە. تورکیەو ئێـران بەریانیان دوای تێپەڕبوون لە ساڵەکانی سەرەتای کاری هاوبەشی ئـەم وڵاتانـە پێـشان داوەو ئـەم بەریانییە لە دامەزراندنی سەقامگیری لەناوچەکەدا نەخشی هەبووە، بەڵام بەم حاڵەوە رێژەیەك لـە رکەبەرانەی نێوان ئێران و تورکیە لەهەمبەر بوون و باندۆر لەسەر وڵاتـانی ئاسـیای ناوەنـدی لـە ئارادا بووە، لەم نێوەدا پێگەی نێونەتەوەیی‌و هاوتەریبی تورکیە لەگەڵ رۆژئاواو ئەمریکاو هاوڕێ لەگەڵ بوارە هاوبەشییەکانی زمانی و رەگەزی لەگەڵ ئاسیای ناوەندی، بارودۆخێکی لـەبارتری لـە پێش ئەم وڵاتەدا داناوە.

روداوەکانی ئەم دواییانە لەناوچەکە ئەم بوارەی بۆ تورکیە رەخساندووە کە پەرەی بـە رۆڵـی خۆی بدا، ئەم مژارە هاوڕێ لەگەڵ بێ‌مـەیلی یەکیـەتیی ئـەوروپا بـۆ وەرگرتنـی ئەندامیـەتی تورکیە، رەنگە ببێتە هۆی ئەوەی کـە تورکیـە لـە پێوەندییـەکانی لەگـەڵ وڵاتـە تورکەکانـدا پێداگری پتری هەبێ. روونـە کـە تەنانـەت ئەگـەر تورکیـە بـە ئەنـدامی یەکیـەتیی ئـەوروپا وەربگیرێ، ئەم وڵاتە دوایین پلەی لەنێو وڵاتانی ئەندامدا دەبێ، بەڵام دەتوانێ لـەنێو یەکیـەتیی وڵاتانی تورك نشین، لە پلەی یەکەم و رۆڵی رێبەری بەهەرەمەندی هەبێ، هەڵبەت ئـەم خاڵانـە لە ئەگەرەکانەو قورسـایی پێویـست بـۆ گرینگیـدانی ئـەوروپا بـە تورکیـەی نییـە.[2] پرسـە

(1) Vnal Cevikoz, Europan Integration and new Regional cooperation Initiative, NATO Review, n. 3, June 1993, p. 52.

(٢) مەحکووم ئۆف، "ئاسیای ناوەندی لە هاوکارییە بەرانبەرە ئابووریەکان"، وەرزنامەی توێژینەوەی ئاسـیای ناوەڕاستو قەفقاز ساڵی پێنجەم، ژمارە ١٦ (زستانی ١٣٥٧) لاپەڕەی ٣ ـ ١٨٢.



ئابورییەکان یەکێك لـە گـرینگترین بوارەکـانی رکەبەرایـەتی ئێـران و تورکیەیـە لـە ئاسـیای نێوەڕاست، هەر دوو وڵاتی ئێران و تورکیە وەك بازارێکی گونجـاو دەڕواننـە ئـەم ناوچـەیە کـە بواری باش بۆ سەرمایەدانان تێدا بەدی دەکرێ. ئەگەر رەکەبەرایەتی ئێران و تورکیە لە ئاسیای ناوەندی گشت لایەنە لەقەڵەم بدەین، تەوەری سەرەکی ئـەم رەکەبەرییـە بەرژەوەنـدی ئـابووری دیاریـدەکا. بـەڵام خـاڵی سـەرەکی لێرەدایـە کـە دەبـێ توانـایی ئـابووری و رێـژەی هێـزی سەرمایەدانانی ئەم وڵاتانە لەبەرچـاو بگـیرێ. ئـەو گۆڕەپانـە، کـە رکەبەرایـەتی بەرژەوەنـدی ئابووری دەستنیشان دەکا. لە گۆڕەپانی رکەبەرایەتی ئابووری لەگەڵ قورسایی گرێبەسـتەکان و چالاکی کۆمپانیاکانی تورك و ئێران لە رووی رێژەی بازرگانی‌و تەجارەتەوە بە هۆی دەراوسـێی جوغرافیای لە پێشترە. بەڵام لە رووی سەرمایەدانان، ئێران لە بارودۆخێکداییە کە بتوانـێ لـەم وڵاتانە سەرمایەی پتر، وەگەر بخات.

پێوەندییەکانی ئێـرانو تورکیـە لـە سـەرکەوتنی کۆمـاری ئیـسلامییەوە تـا لەبەریـەك هەڵوەشـانی یەکیـەتی سـۆڤییەت، جۆرێـك هاوپێوەنـدی ئیـدیولۆژیك ئاوێتـە لەگـەڵ هاریکاریگەلی بە کەڵکی ئابووری و بازرگانی بوو. بەڵام لـەکاتی هەرەسـهێنانی سـۆڤییەت ئەم دوو وڵاتە بوون بە گرینگترین رکەبەرانی یەکتر، لەم نێوەدا تورکیە بە کـەڵکوەرگرتن لـە پێوەندی نزیکی خۆی لەگەڵ ئەمریکاو ئیسرائیل نەك هەر رێکخـراوی هاریکـاریی ئـابووری (ئێکۆ)ی تووشی جیابوونەوە کرد بەلکو تێدەکۆشێ بە گرتنە پێش سیاسەتە تایبەتییـەکانی خۆی پێوەندگەلێکی پتەو بۆ هێنانە دی بیرۆکەی پان تورکیزم لەناوچەکەدا پێکبێنـێ. هـەر بۆیە وەك وڵاتێك کە رۆڵی ئاڵقەی پێوەندی نێـوان وڵاتـانی دەرەوەی ناوچـە وەك ئـەمریکاو ئیسرائیل دەگێڕێ. کە ئەم کارە بە زیانی رووسیەو ئێران کۆتایی پێدێت. بە جۆرێك یـەکێك لە سەرکەوتووەکانی تورکیە واژۆی رێکەوتننامەی دامەزراندنی بۆرییەکانی گەیاندنی نەوتی باکۆ- جیهان،بە بەشداری سەرۆك کۆماری ئەوکاتی ئەمریکا بووە.[1] لە راستیدا ئـەمریکاو ئیسرائیل بە ئامانجی درێژەی سیاسەتی لاواز کردن و ئابلۆقە بۆسەر ئێران درێـژە بـە بـەهێز کردنی رۆڵی تورکیە لەناوچەکەدا دەدەن. هەر بۆیـە ئـەمریکا ناڕەزایـەتی خـۆی لەهەمبـەر دامەزراندنی هێڵی بۆریی نەوت و گازی ئاسیای ناوەندی کە لە ئێرانەوە بۆ تورکیەو دواتر بۆ

(1) Dlivier Weber, "Tuquie: unenouvelle Puissanceregionale en Asie Centrale" nouveaux mendes, n 3. Aout 1993, Pp. 27 – 35.

ئەورووپاو رۆژئاوا بگۆازرێتەوە دەبڕیوە، هەر چەندە رێگای ئێران کورتترین و لە رووی ئابووریشەوە کەم تێچووترین رێگەیە.

تورکیە بانگەشەی ئەوە دەکا کە وەك ولاّتێکی نموونە بۆ ناوچەکە بەژمار دێت و بۆیە دەتوانێ یارمەتی ولاّتانی تورك زمانی ئاسیای ناوەندی بۆ پێوەست بوون بە ئابووری جیهان بکات. بە هەرجۆرێك تورکیە لەگەڵ تەقەلایەکی زۆر لەسەر رێگای کارتێکەری خۆی لە ئاسیای ناوەندی لەگەڵ کۆمەڵێك بە هیوایش رووبەڕوو بووە. بۆ وێنە لە دوای دانیشتنی سەرکردەکانی تورکیەو ولاّتانی ئاسیای ناوەندی لە ئانکارا لە ئوکتۆبری ساڵی **١٩٩٢**ی زایینی بیرۆکەی پان تورکیزم کە لەلایەن تورکیەوە دارێژرابوو لەگەڵ تەنگژە رووبەڕوو بوو. چونکە حکوومەتە تازە بە سەربەخۆیی گەیشتووەکانی ئاسیای ناوەندی نیشانیاندا کە لە گەڕان بە دوای ئەڵتەرناتیڤ بۆ رووسیە بە پارێزەوە دەڕواننە دەسەلاّتی تورکیەوە. بەم حاڵەش، تورکیە دەستی لە هەوڵە جۆربەجۆرەکان بۆ دەسەلاّت و کارتێکەری پتر بەسەر ئەم ناوچەیەدا هەڵنەگرتووە.

زێدەباری ئەوە، هێندێك ئاستەنگی دیکە کە لەسەر رێگای باندۆری تورکیە بۆسەر ئاسیای ناڤین هەیە کە گەورەترینیان لە جۆری ژیئوستراتیژیکە، چونکە تورکیە جیا لە چەند مایلەك سنووری هاوبەش لەگەڵ کۆماری خۆدموختاری نەخجەوان لە بیاڤی قەفقاز، هیچ رێگایەکی دیکەی بە کۆی ولاّتە تورکزمانەکانی ئاسیای ناوەندیدا نییە. لە روویەکی دیکەوە تورکیە دەروازەی چوونی بۆ ناوچەی ئاسیای ناوەندی و ناوچەی قەفقازە. لە گەڵ ئەوەشدا بەربەستە جوغرافیاییەکان لە رووی ئابووری و سیاسیشەوە پێوەندی تورکیە لەگەڵ ئاسیای ناوەندی سنووردارە. ئابووری تورکیە بە هۆی بەرزبوونەوەی هەڵئاوسانی دراویی‌و بێکاری ناتوانێ بۆ ولاّتانی ناوچەکە سەرنجڕاکێش بێ. هەروەها تورکیە بەردەوام بەکۆگای چەك‌و تەقەمەنی‌و کەرەستەی دەستی ئەمریکا لەناوچەکە بە ئەژمار هاتووە و ئەندامەتی ئەو لە پەیمانی ناتۆ قورسایی سیاسی ئەوتۆی بۆی بەدواوە نەبووە. نزیکی تورکیە بە رۆژئاوا رۆڵی ئاڵقەی پێوەندی ئەم ولاّتەش بۆ رێژیمەکانی ئاسیای ناوەندی بایەخێکی ئەوتۆی نەبووە، چونکە ئەوان بە باشیان زانیوە کە بە شێوەی راستەوخۆ لەگەڵ حکوومەتەکان و کۆمپانیا رۆژئاواییەکان لە پێوەندیدا بن.

لەبەریەك هەڵوەشانی سۆڤییەت و دەرکەوتنی بوارگەلی نوێی ژیئوپۆلۆتیك لە ئاسیای ناڤین سەرنجی زۆربەی ولاّتانی ناوچەکەی بۆلای خۆی راکێشا. لەم نێوەدا تورکیە بە حوکمی



پێوەندیگەلی ئەتنیکی ـ ئایینی خۆی لەگەڵ زۆربەی ولاّتانی تازە بە سەربەخۆیی گەیشتووی ئاسیای ناوەندی، زۆرترین بەریانی بۆ پەرەپێدانی پێوەندی لەگەڵ ئەم ناوچەیە لە خۆی نیشاندا،[(١)] چاوپێکەوتنە بەردەوامەکانی بەرپرسان و هەیئەتە تورکەکان لە ساڵی **١٩٩٢**ی زایینی لەناوچەکە شاهیدی بۆ ئەم مژارەیە. تورکیە بە دوای ناوچەیەکی ئارامە کە لە ئەورووپای ناوەندی دەستپێدەکا و لە چین کۆتایی پێ دێت، ئەمە پرۆسەیەکی درێژماوەیە کە لەلایەن تورکیەوە بۆ گەیشتن بەم قوناخە درێژەی هەیە. لە روانگەی بژاردەکان و بڕیاردەرانی تورکیە ئامانجەکانی مەبەست تەنیا لە رەوگەی پان تورکیزم پان ئیسلامیزم نایەتە دی، بەلکو بە هاوپێوەندی پشتیوانی ولاّتانێك کە لەمەڕ پرسە گرینگەکان رێککەوتبن، بەدەستدێت.[(٢)] بەم جۆرە تورکیە بە دوای هەرەسهێنانی سۆڤییەت بە چڕی تێدەکۆشا تاکو باندۆرێکی نوێی لەم ناوچەیەدا بەدەست بێنێ. ئەم ولاّتە بە هەڵکەوتن لەتەنیشت قەفقاز، لێکچوونە رەگەزی و ئەتنیکییەکان لەگەڵ ئاسیای ناوەڕاستدا، گەشەسەندن لە رووی کۆمەلاّیەتییەوە، هەروەها بوونی هێزێکی پیشەسازی پسپۆر، پێگەیەکی گونجاویی بۆ جێبەجێ کردنی ئۆپەراسیۆن لە ئاسیای ناڤین و قەفقازدا هینابووە گۆڕێ.

لەلایەك بوونی بژاردە تورکزمان و سێکۆلارەکان لە زۆربەی ولاّتانی ئاسیای ناوەڕاست کە بوون بە پشتیوانی ئیمپراتۆری عوسمانی، هۆکارێکی گرینگە لە گەشە سەندنی باندۆری تورکیە لەم ناوچەیەدا.[(٣)]

هەر بۆیە حکوومەتی ئانکارا بۆ دەست پێڕاگەیشتن بە بیاڤێك لە ئاسیای ناوەندیدا زۆرترین چالاکی خۆی- بە تایبەتی لە دەیەی ١٩٩٠ی ز، چڕ کردبووەوە سەر بواری کولتووری و بەئامانجی هاوپێوندی و تەنانەت بۆ دژایەتی لەگەڵ بناژۆ خوازی ئایینی دروشمی "پان تورکیزمی" بەرز کردبۆوە. دروشمێك کە هاتنە ئارای بە بۆچوونی زۆربەی شارەزایانی سیاسیی

---

(١) بۆ زانیاری پتر لەسەر پێوندی مێژوویی تورکیە لەگەڵ ئاسیای ناوەڕاست سەردانی ئەم سەرچاوانە بکەن:
Mehet saray, "Political Economic and cultural Relations Between Turkeyandcentral Asian Republics," Eurasian studies, vol 1, no 2 (sum 24) Pp. 47 – 52.

(2) Johan waltner, "Turkeyand Turkik Republics" Mceen. East Monitor, Vol. 1, no 2, 1992, p. 38.

(٣) جەلیلی رەوشەندڵ، "رۆڵی پان تورکیزم لە هاپێوەندی ناوچەیی، توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندی‌و قەفقاز، ژمارەی ١٦، ساڵی پێنجەم (زستانی ٧٥)، لاپەڕەی ٧٩.

پەیوەستە بە هۆکاری جۆربەجۆرەکان، لەوانە فرە زاراوەیی لە زمانی تورکی، بەربڵاوی جوغرافیایی، لاوازی ئابووری و هاوئاهەنگ نەبوونی لەگەڵ تیۆری پێوەندییە نێونەتەوەییەکان لۆژیکیانە نانوێنێ. بە سەرنجدان بەگۆڕانکارییەکانی سەدەی پێشوو بەتایبەتی گۆڕانە نوێیەکان کە لە دەیەی رابردوودا روویان دابوو، زێدەباری دوو بەریانی ئاتا تۆرکیستە نەرێتییەکان کە پێداگری لەسەر بەرەو رۆژئاوا چوون دەکەن، هەروەها ئیسلامخوازان کە لایەنگری لە پێوەندی دامەزراندن لەگەڵ وڵاتە موسڵمانەکان و رۆژهەڵات دەکەن. سێهەمین گرووپ بە ناوی پان تورکیزمەکان هاتنە گۆڕەپانەوە کە تێکەڵاوە لە ئەندێشەکانی ئاتاتورك و میراتی ئەتنیکی تورکەکان و لە هەوڵی بەدەستهێنانی رێگا چارەیەك بۆ قەیرانی شوناسی تورکیەن و ئەو گرووپە سەدەی داهاتوو بە سەدەی تورکەکان شیمانە دەکەن و بە خەستی کەوتوونەتە ژێر باندۆری وەرچەرخانەکانی ئاسیای ناڤین.[1]

سەرکردەکانی تورکیە لەم بوارەدا خۆیان وەك "برای گەورەتر"ی تورك لە ئاسیای نێوەڕاست و تەنانەت بۆ هەموو رێبەرانی تورکەکان لەقەڵەم داوە. بە جۆرێك کە لەساڵی ١٩٩٢ی زایینیدا وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیە لە باکۆ گوتی کە "ئێمە بە دوای ژیاندنەوەی ئەندێشەی پان تورکیزمین و بە فەرمی رادەگەیەنن کە پێکهێنانی ئیمپراتوری تورك لە دورگەری کەریمە تاکو سین کیانگی چین و گرێدانی گشت ئەتنیکە تورکەکان بە کۆماری تورکیە ئامانجی سەرەکی تورکیەیە".[2] ئەم سیاسەتەی تورکیە واتە ژیانەوەی پان تورکیزم بە سەرنجدان بە راستییەکانی هەبوو زۆرتر وەك ئەفسانەیەکە تاکو راستییەکی بەرهەست، بە جۆرێك کە هێندێك لە لێکۆڵەوەرەکان لەو بڕوایەن کە ئیمپراتۆری تورك، یان بە واتەیەکی دیکە بووژاندنەوەی پان تورکیزم بە سەرنجدان بە راستییەکان هەبوو لە ئاسیای ناوین، پتر لە تراویلکەیەك دەچێ.[3]

بە شێوەی گشتی دەتوانین بڵێین کە هانەگەلی تورکیە بۆ کارتێکەری لە ئاسیای ناڤین دەتوانێ ئەوە بێ کە لەنێو وڵاتە ئیسلامییەکان لەوانە ئاکتیڤترین وڵاتەکان بەدوای

(١) پیروز موجتەهدزادە، "لە کەنداوی فارسەوە تاکوو خەزەر، لە ئیدە ژئوپۆلوتیکەکان تاکوو واقعییەتی ئێرانی" زانیاری سیاسی ئابووری، ژمارە ١١٠ — ١٠٩ (رەزبەرو خەزەڵوەری ١٣٧٥) لاپەڕەکانی ١٥ ـ ٢.

(٢) رۆژهەڵاتی ناڤینی تورکمان، ئاواتی ئانکارا، ئەبرار، ژمارە ١٠٠٧، ١٣٧١/٢/١٤ لاپەڕەی ١٦.

(3) shireen T. Hunter, "the Muslim Republics of the Former Union: policy challenges for the united states", Washington guarterly, Vol. 15 (3), summar, Pp. 57 – 71.



دەرفەتگەلی نوێ لە راستای کەڵکوەرگرتن لە پێوەندییە ئەتنیکیو رەگەزییەکانە. تورکیە ناتوانێ لەم ناوچەیەدا کە وەك دەرفەتێکی نوێ لەپێناو پێگەی نێونەتەوەیی خۆی لێی دەڕوانی لێی تێپەڕ بێ، تورکیە، ئاسیای ناوەندی و قەفقاز بە بەشێك لەناوچەی فەرمانڕەوایی کولتووری و مێژوویی خۆی لەقەڵەم دەدا؛ تورکیە وا لێکدەداتەوە کە رەنگە بە ورووژاندنی هەستی ئەتنیکی بتوانێ بەسەر ناوچەکەدا زاڵبێ، و سەرنموونەی حکوومەتی خۆی کە بناغەیەکی نیزامی سێکۆلارە بەسەر ناوچەکەدا پەرە پێبدا، هەر لەم پێناوەدا چالاکییە کولتوورییەکانی تورکیە لەم کۆمارانەدا پانتایەکی بەرفراوانی لەخۆ دەگرێ، لە گرینگترینی ئەم چالاکییانە بایەخدان بە تەلەڤیزیۆنە تورکزمانەکانی وڵاتانی ئاسیای ناوەندیە لەلایەن تەلەڤیزیۆنی تورکیەوە، هەروەها دانانی ئەلف و بێی لاتینی بە شێوازی تورکی لە جێگای ئەلف و بێی سیرلیکی و وەرگرتنی هەزاران خوێندکاری ئەم کۆمارانە لە زانکۆکانی تورکیە، لە راستیدا ئامانجێك کە تورکیە بەدوایەتی دامەزرانی کۆمەڵەیەکی کولتووری تورکزمان لە چینەوە تاکو باڵکان، زمان هۆکاری سەرەکییە لە دامەزراندنی ئەم پێوەندییە. سیستمی لائیکی تورکیە تێکەڵ بە کولتووری دژە ئایینی بووە،هەروەها بووەتە نموونەیەکی گۆنجاو بۆ رێبەرانی ئەم کۆمارانە. بەم پێیە پلانەکانی تورکیە لەپێناو برەودان بە دەسەڵاتی خۆی لەناوچەکەدا نەك هەر لە لایەن دەسەلاتدارانی ناوچەکە بەلکو لەلایەن رۆژئاوایەکانیش پشتگیری هەمە لایەنە دەکران. هەڵبەت ئەم پلانانەی تورکیە تاکو کاتێك جێی پەسندی رۆژئاواو فەرمانڕوایانی ناوچەکەیە کە تەنیا رۆڵی پێشگرتن بە دژەی ئێران بگرێ.

زێدەباری ئەوەیش، باندۆری تورکیە لەناوچەکەدا تەنیا بە مانای بوونی حکوومەتی لائیك نییە بەلکو باندۆری گرووپە ئایینییەکانو گەلی تورکیە کە گرینگی بە شوناسی تورکی و ئیسلامی خۆیان دەدەن، پەرەپێدەداوە،هەروەها کارتێکەری گرووپە موسڵمانەکانی دژبەری رێژیم لەم کۆمارانەدا پەرە دەستێنێ. تورکیە بۆ کارتێکەری زیاتر خۆی چالاکیگەلێك لە شێوەی پروپاگەندەی ئایینی، پەروەردە کردنی مامۆستایانی ئایینیو وبڵاوکردنەوەی بڵاڤوکە ئایینییەکان لەلایەن ئیدارەی ئەوقافەوە جێبەجێ دەکا کە دەتوانێ ببێتە هۆی بەهێز کردنی بەریانە ئایینیو ئیسلام گەرایی لە نێو خەڵکدا. لە راستیدا زۆرترین کەرەستەی باندۆری تورکیە لەناوچەکەدا لە رووی کولتوورییەوە بووە. ئەم وڵاتە لەو بڕوایەدابوو کە بتوانێ لەم بیاڤەدا دەسکەوتگەلی پتر بەدەست بێنێ، بەڵام تەنیا دەستکەوتیان کۆمەڵێك کاناڵی

سەتەلایت و گۆڕینی ئەلف و بێی سیریلیکی بوو کە ئەلفو بێی لاتین لە هێندێك لە ولاتان جێگای گرت. بەلام ئەم کەنالە سەتەلایتیانەو گۆڕینی ئەلف و بێیش نەیتوانیێ زاراوەگەلی جۆربەجۆری ئاسیای ناوەندی و قەفقاز نزیك بکا لە زاراوەی تایبەتی تورکی ئێستامبۆلی، تاکو ئەو جێگایە کە یەکەمین چاوپێکەوتنی سەرکردەکان لە ئانکارا ـ لە ساڵی ١٩١٢ ناچار بوون لە وەرگێڕە رووسییەکان وەك زمانی پێوەندی کەلکوەربگرن. تەنانەت باڵوێزخانەکانی تورکیە لە کۆمارە نوێیەکان نەیانتوانی کەسانێك بدۆزنەوە کە زمانی تورکی ئێستانبوولی بزانێ.(١)

بە بڕوای کۆمەڵێك کەس،ئاسیای ناوەندی، تورکیە ٭تەفزیلێ دەدا بە سەر ولاتانی دیکەدا، چونکە بەریانی رۆژئاوایی هەیەو پێداگری لەسەر جیایی ئایین لە سیاسەت دەکا، بەلام ئەم شکانەوەیە ئەندازەیەکی هەیە. ناتوانێ لەوە زیاتر برەویی هەبێ، چونکە ئێرانیش گۆڕەپان بۆ تورکیە بەجێ ناهێڵێ، بە بۆچوونی یەکێك لە لێکۆڵەران "... بەڕای سەرکردەکانی کۆماری ئیسلامی باندۆری لە رادەبەدەری تورکەکان لە ئاسیای ناوەندی بۆ سەر تەناهی ئێران مەترسیهێنەرە و دەبێتە هۆی گەشەی هەستی نەتەوەگەرایی‌و هاتنە ئارای جیابوونەوەی بەشێك لە خاکی ئێران .....""(٢) کەواتە بەگشتی تورکیە بۆ دانانی باندۆری کولتووری خۆی ئاستەنگەلێکی حاشاهەڵنەگری لە پێشە. لە راستیدا ولاتانی ناوچەکە بە گشت ئاسیای ناڤین و قەفقازەوە پێش ئەوەی کە لە تورکیەوە نزیك بن، بە بەشێك لە بیاڤی شارستانییەتی ئێرانی- ئیسلامی بەئەژمار دێن‌و لەگەڵ ئێراندا هاوگرتوویی کولتووری و مێژووی چەند هەزار ساڵەی هەیە. بەلام بەداخەوە هێندێك لە ولاتەکان لەوانە ئەمریکا سیاسەتی تەریك خستنەوەی ئێران و بە هێز کردنی رۆڵی ترکیەیان لە ناوچەکەدا گرتە بەرو تەنانەت رێبەرانی کۆماری ئیسلامیش نەیانتوانیوە یان نەیانویستووە کە کەڵك لە کەشێکی کولتووری وەربگرن تاکو ولاتانی ناوچەکە کە زۆرینەیان سونەن، بۆلای خۆیان رابکێشن، ئەو بارودۆخە ئەم دەرفەتەی بە تورکیە دەدا کە لەناوچەکەدا رۆڵێکی کاراتر بگێرێ و پەرە بە کارتێکەری خۆی بدا(٣). هەروەها ئاکامی دەسەلاتی رووسیەی تەزاری، هەروەها هەفتا ساڵ دەسەلاتی کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەت واتەگەلێك

(١) جەلیل رەوشەندڵ، "رۆڵی پان تورکیزم لە هاوپێوەندی ناوچەیی"، پێشوو.

(2) shiree T. Hunter, op. Cit.

(٣) محەمەد رەزا مەلەکی "پێوەندییەکانی تورکیەو ئیسرائیل و باندۆری ئەوان لەسەر ئاسیای ناڤین و قەفقاز"، توێژینەوەکانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز، ژمارە ٢٤ (زستانی ١٣٧٧) لاپەڕەکانی ٤٨و ٥٠.



وەك "تورك" لاواز بووە و هەنووکە رابردووی خەڵك پێناسە ئەتنیکی‌و ناوچەییەکانی خۆیان وەك تورکمەن و ئوزبەکیان بەسەر شوناسی ئیسلامی تورکی تەفزیل دەدەن. پێوەندییە نزیکترە ئابوورییەکان لەناوچە لە هەمبەر پرسی شوناس لەم کۆمارانەدا بە بایەخترە. ئەم پرسانە بوونەتە هۆی رکەبەرایەتی لەنێوان تورکیە و ئێران بۆ دەستپێڕاگەیشتن بەسەر ناوچەکەدا. زێدەباری ئەمەش، لە ولاتانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز نزیکەی ٢٥ ملیۆن رووسی ژیان دەکەن کە زۆرینەیان لە ئاسیای ناوەندین، بە جۆرێك کە نزیکەی ٣٨٪ حەشیمەتی قەزاقستان رووسین و لە تورکمەنستانیش دەوروبەری ١٠٪ لە حەشیمەتی رووسین، لە کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای ناوین وەك چلمیرکی گوشار، هێزی پان تورکیزم بەرەو لاوازی دەروا.

دژکردەوەی توندی سەرکردەکانی تورکیە لە بەرانبەر ئیسلام گەراکان پێشاندەری نیگەرانی ئەوانە لەهەمبەر گەشە و تەشەنەی ئیسلام و بناژۆخوازی ئایینییە. بە واتایەکی دیکە ئەوان خوازیاری پێشگیری لە گەشەی ئیسلامی راستەقینە و چوونە سەری ئاستی گشت لایەنەی، خۆیان لە ولاتانی ئاسیای ناوەندین. لە چوارچێوەی سیاسەتی دەرەوەی ئاماژە پێکراوی رێبەرانی رێژیمی تورکیە لە دوو بابەتی ئەتنیکی و زمانی هاوبەش کەلکوەردەگرن. بەجۆرێك کە سولێمان دەمیرەل سەرۆك کۆماری پێشووی تورکیە لە گەشتێکی کە بۆ پێنج ولاتی ناوچەکە لە ساڵی ١٩٩٢دا کردی، لەمەڕ هاوپێوەندییە زمانی‌و ئەتنیکییەکان لە عیشق ئاباد- پێتەختی تووکمەنستان بەم جۆرە ئاخاوتووە، "..... جیهانی نوێ تورك دێتە مەیدان و لەدایك دەبێ‌و هاریکارییەکانی تورکیە لەگەڵ کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندی دەبێتە هۆی پێرۆزیی ئەم لەدایك بوونەو بوونی شارستانییەت، کەلتوور و زمانی هاوبەش هۆکاری هاوپێوەندییە...".(١) هەر چەندە ئەم ناچەیە لە رووی زمان‌و کولتوور کۆمەڵێك هاوبەشیان لەگەڵ ولاتی تورکیە دایەو تا رادەیەك ئەتنیکە تورکەکان ئاخێزگەیەکی هاوبەشیان هەیە، بەلام راستییەکەی ئەوەیە کە سەرنج و بەریانی تورکیە بۆ لای ولاتانی ئاسیای ناوەڕاست بەهۆی گرێدراویی زمانی‌و کولتووری نییە بەلکو رێژیمی تورکیە دەیهەوێ سەرنموونەیەکی حکوومەتی نوێ بهێنیتە گۆڕێ. لە بەرانبەر ئەم پنچینەیەدا سەرکردەکانی لە سەردانەکانیان باس لە جۆرێك رکەبەرایەتی نموونەیی حکوومەتی لەگەڵ ولاتە ئیسلامییەکان دێنێتە ئاراوە.

(١) بۆلتۆنی رادیۆ درەکییەکان، دەنگ و رەنگی کۆماری ئیسلامی ئێران، ١٣٧١/١/٢٠، لاپەڕەی ١٥.

له بەرانبەر ئەم ئامانجەی تورکیەدا، سەرکردەکانی ولاّتانی ئاسیای ناوەند دژکردەوەی جۆربەجۆریان لەخۆ نیشان داوە، بۆ وێنە، رێبەرانی توکمەنستان گوتوویانە کە "ئێمە وەك ولاّتێکی سەربەخۆ کاروباری نێوخۆییان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی و پێداویستییەکانی کۆمەڵگای خۆمان جێبەجێ دەکەین و لە وەرگرتنی نموونەی حکوومەتداری ولاّتانی دیکە کە لەگەڵ ئێمە پێوەندی هەمە لایەنەیان هەیە خۆ دەبوێرین"، هەر چەندە هێندێك لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوین رای دژی ئیستراتیژی سەرکردەکانی تورکمەنستانیان دەربڕیوە، بەلاّم بەهەرحاڵ بە گوێرەی لێکدانەوەی لێکۆڵەرێکی بیاڤی ئاسیای ناوەندی، ئەم کۆمارانە فیدراڵی بچووك نین کە چاوەڕوانی برای گەورەتر لە خۆیان بن و دەستیان بگرێ و لە مەترسی رزگاریان بکا...."[1] ئەوان لەگەڵ بوونی کەم وەکوریشەوە بانگەشەی شوناسی نەتەوەیی‌و سیاسی خۆیان لەبیر ناکەن. هەڵبەت دوورنییە یەك یان چەند کۆمارێکی ناوچەکە بە هۆکاری جۆربەجۆر بەرەو خەڵکانی دیکە رابکێشرێن، بەلاّم وا بەرچاو ناکەوێ ئەوان مەیل بە قەبوولکردنی داگیرکاری‌و زاڵبوونی، ولاّتانی دیکە بن بەلکو ئەوان خوازیاری پەرەسەندنی پێوەندییەکانیان لەگەڵ هەموو ولاّتانی جیهانن. لەهەمبەر ئامانجە ئیدئولۆژیکەکانی ئێران‌و تورکیە لە ئاسیای ناوین روانگەگەلی جۆربەجۆر هەیە، روانگەکانی هەرچییێك بێ“ یەکانەگیری و یان بە واتایەکی دیکە نەگونجانی ئێران و تورکیە لەم گۆڕەپانەدا دەردەخا.

تورکیە وەك رێژیمەکی عیلمانی‌و لایەنگری دێموکراسی رۆژئاواو ئێرانیش وەك حکوومەتێکی ئیسلامی‌و عیلمانی بۆ بیچمدانی شوناسی ناوچەکە لەگەڵ یەکتر بە چڕوپڕی رکەبەرایەتی دەکەن. پاکستان‌و عەرەبستانی سعوودی و کاراکتەرەکانی دیکەش بۆ بەدەستهێنانی دەسەلاّت بەشداری لەم رکەبەرایەتیە دەکەن.

زۆربەی رێژیمە عەرەب و رۆژئاواییەکان دەترسن کە ئێران لە هەوڵی گەشەپێدانی ئیسلامی بناژۆخوازیدا بێ. دەبێ بلێین کە "لە بلاّوکردنەوەی ترس‌و دڵەراوکێ لەم چەشنە ئامانجانە، زێدەڕۆییەکی زۆر کراوە. ناوچەیەك کە ئیتر یەکیەتیی سۆڤیەت، ناتوانێ رۆڵی شەیتانی تێدا بگێڕێ، جیهان بڕیاری داوە ئەم رۆڵە بە ئێران بسپێرێ. ئێران نایهەوێ لەم چەشنە لە جیهان بشێویی پێکبێنێ بەلکو تێدەکۆشێ پێش پێ‌بگرێ تەنانەت سیاسەتوانانە ئەمریکاییەکان دان بەوەدا دەنێن کە ئێرانییەکان لە پێوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ ولاّتانی ناوچەکە هیچ پێداگرییەك لەسەر شێوازی دانانی حکوومەتی ئیسلامی بە شێوەی ئێران لە ئاسیای ناوەندیدا نەکردووە"[1] بەلاّم وەزارەتی دەرەوەتی تورکیە پێشنیاری گەلاّڵەی دامەزراندنی ناوچەی ئازادی دەریای رەش و کۆمارەکانی ئاسیای ناوەندی کردووە کە بەو پێیە، تورکیە ئاڵقەی پێوەندی ئەم بیاڤەیە. ئامانجێك کە تورکیە لەم راستایە گرتووەتە بەر، دامەزراندنی حکوومەتی سیکۆلارو پێشکەوتوویی پێشەسازییە. بەواتایەکی دیکە، سیاسەتی تورکیە ئەوەیە کە حکوومەتی سیکۆلار لەسەر بناغەی دێموکراسیی رۆژئاوایی، هەروەها سوودوەرگرتن لە شێوازی ئابووری لەم ولاّتانەدا بگرێ.

سەرکردەکانی تورکیە لەپێناو دانی شێوازی حکوومەتی خۆیان لە هەوڵی ئەوەدان تاکو پێش بە هەر چەشنە چالاکییەکی ئیسلام خوازی بگرن‌و لە ئاستێکی بەرینتر پێش بە پێکهاتنی حکوومەتی ئیسلامی لە داهاتووی ولاّتانی ناوچە بە هەر جۆرێك کە بگرێ ، بگرن. جۆرێك کە سولەیمان دەمیرەڵ ـ سەرۆك کۆماری پێشووتری تورکیە ـ لە وتووێژ لەگەڵ کەناڵی تەلەفیزیۆنی CNN لە پێوەندی لەگەڵ پەرەگرتنی ئیسلامخوازی لە ولاّتانی ئاسیای ناوەندیدا رایگەیاند کە "... ویستی ئێمە لەگەڵ ئامانجی رۆژئاواییەکان لەم ولاّتە هاوئاهەنگی تەواوی هەیە، ئێمە نێگەرانین لە گەشە کردنی ئایینی ئیسلام و ئامادەی هەر چەشنە هاوکارییەکین لەگەڵ رۆژئاوا...".[2] ئەم وتەیەی سەرۆك کۆماری تورکیە دەرخەری نیگەرانی سەرکردەکانی پایەبەرزی تورکیەیە لە هەمبەر پەرەگرتنی ئیسلام بەتایبەتی ئیسلام بناژۆخواز. بە واتایەکی دیکە ئەوان خوازیاری پێشگیری لەم گەشەی ئیسلامی راستەقینەو پتەرکردنی باندۆری گشت لایەنەی خۆیانن لەناوچەکەدا. ولاّتە موسڵمانە تازە بە سەربەخۆیی گەیشتووەکانی ئاسیای نێوەڕاست و قەفقاز بۆ دیاریکردنی نیزامی سیاسی خۆیان، لەنێوان دوو نموونە دان، یەکیان نموونەی خەڵك سالاری ئایینی ئێرانییە و ئەوەی دیکەیان نموونەی عەلمانییەتی تورکیەیە، لە روانگەی رۆژئاواییەکان یەك لەوان ئەمریکا نموونەی حکوومەتی ئێران مەترسیدارە، کەواتە پشتگیری لە نموونەی تورکیە دەکەن. چونکە ئەم مودێلە لە چەند رووەوە بۆ رۆژئاوا گرینگی هەیە، لە روانگەیەکەوە، مودێلی تورکیە لەسەر بنچینەی دێموکراسی رۆژئاوایی ئەندێشەی

(1) shireen T. Hunter, op. Cit

(١) Ibid

(٢) پۆڵتەنی رادیۆ دەرەکییەکان، دەنگ و رەنگی کۆماری ئیسلامی ئێران، ١٣٧٠/١٢/٢٢ لە لاپەڕەی ٢٤.

سیکۆلار لەخۆ دەگرێ کە لەم رووەوە گرێدراون لەگەڵ ئەمریکا. لەلایەکی دیکەوە، نیزامی سیاسی تورکیە دژی هەر چەشنە بناژۆخوازی ئایینیو گەشەدان بە ئەندێشە ئیسلامییە سیاسییەکانە لەناوچەکەدایە، هەروەها لە رووی ئابووریشەوە ئەم وڵاتە خاوەنی نیزامێکی بازاڕییە. پاشان تورکیە هاوپەیمانی نیزامی رۆژئاواو ئەمریکایەو دەتوانرێ پشت بە پێگەی نیزامی ببەسترێ.

باسی نموونەی حکوومەتی تورکیە بەسەر ئەم ناوچەیە بە رادەیەك لە گۆڕێ دایە کە دەتوانین بڵێین بابەتێکی جێگرتووە و بەرهەڵستی نییە. لەو جێگایەی کە بناژۆخوازی ئایینیو گەشەی بیرۆکەی ئیسلامی توندڕۆ لە بەرانبەر ئیدئۆلوژی لیبراڵیزم زاڵە بەسەر رۆژئاوا،جا بۆیە رۆژئاوایەکان بەتایبەتی وڵاتە یەکگرتووەکان نیگەرانی ئەم جۆرە بیرۆکانەن لەناوچەکەدا. هەر لەم پێناوەدا یەکێك لە پلانەکانی رۆژئاوا بۆ بەرەنگاری لە بەرانبەر ئەم مەترسییە؛ کەڵکوەرگرتن لە رێژیمە سیکۆلارەکان و رۆژئاواییگەری ناوچەکەیە بەجێی بەرەنگاری راستەخۆ. بەم پێیە تورکیە زۆربەی مەرجەکانی بۆ جێبەجێ کردنی ئەم رۆڵە گەورەیەی تێدا هەیە. تەنانەت مۆدیلی رۆژئاواییخوازی و عیلمانییەتی تورکیە لەلایەن رێژیمەکانی ئاسیای ناوەندیو قەفقازیش پێشوازی لێ دەکرێ کە جێی نێگەرانییە لە مەڕ پەرەسندنی ئیسلامی توندئاژۆ.

ئەگەر چی رەنگە لە کورت ماوەدا وەها سیاسەتێك لەلایەن تورکیەوە بۆ بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا بەسوود بێ، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەم سیاسەتە رەنگە بە روانینی نوێ لە سیاسەتی دەرەکی تورکیە ـ گۆڕان لە سیاسەتی رۆژئاوایخوازدا پێکبێ و بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ٧٠ ساڵ بەرلە ئێستا. بەتایبەتی ئەم پرسە لەگەڵ بێبەریانی ئەورووپا بۆ وەرگرتنی ئەندامییەتی تورکیە تێکەڵبووەو رەنگە بەم پێیە تورکیە لە پێوەندییە دەرەکییەکانی خۆی پێداگری پتر لەسەر وڵاتە تورك نشینەکان بکات. هەر لەمکاتەدا بەرپرسە ئەمریکاییەکان وەك مۆدێلی وڵاتێکی عیلمانی و دێموکرات دەڕواننە تورکیە کە دەتوانێ شێوازێکی گونجاو بۆ وڵاتەکانی ناوچەکە بێ. رێبەرانی تورکیەش تێدەکۆشن بە پەیڕەوی کردن لە رێچکەی سیاسەتە دەرەکییەکانی ئەمریکا، هەروەها بە دامەزراندنی حکوومەت لە نوێنگەی خۆیان، لە یارمەتی رۆژئاواییو ئەمریکاییەکان، بۆ کارتێکەری لە ئاسیای ناڤین بەهرەمەند بن.



### ٣ـ ئێران

پێوەندی ئێران و وڵاتەکانی ئاسیای ناوەندی ریشەی بۆ چەند هەزار ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە. ئەگەر قەبووڵبکەین کە ئەتنیکە ئێرانییەکان شارستانییەتی خۆیان لە قەراخ رووباری نیك داییتی (جەیحوون)و کەستە ئایرانە ویجە (وەك خوارزەم، خێوە و زێدەکانی دەوروبەری دەریاچەی ئاراڵ) دەستیان پێکردووە، کەواتە دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە ئاسیای ناڤین ئاخێزگەی کولتوور و شارستانییەتی ئێرانییە و لەم شوێنگەوەیە ئارياییەکان توانیان سەرانسەری خاکی ئێران و تەنانەت لە وڵاتانی وەك نیمچە دورگەی هێند و ئاسیای چووکە کۆچ بکەن و کولتوور و شارستانییەتی خۆیان گەشە پێبدەن. لە سەرانسەری سەردەمی کۆن، مێژووی ئێران و ئاسیای ناویندا نەك لە رووی کولتوور، ئایین و کۆمەڵایەتی هاوبەش بووە بەلکو لە رووی سیاسیشەوە دەسەڵاتێکی هاوبەش لە چوارچێوەی حکوومەتی فیدراڵی شاهەنشاییدا هەبووە. لە سەردەمی ئیسلامیشدا لە چەندین سەدەدا ئێران و ئاسیای ناوەندی پاژگەلی یەکینە دەزگای خەلافەتیو دواتر حکوومەتە ئێرانییە ئیسلامییەکان بووە، هەر چەند زۆربەی حکوومەتە ئێرانییەکان لە سەردەمی ئیسلامدا بەرەچەڵەك تورك بوون بەڵام بەو جۆرەیش خۆیان بە میراتگەری شارەستانییەتی ئێران- ئیسلامی زانییووەو تەنانەت گەشە و پەرەشیان پێداوە. بەڵام بە هۆکارگەلی جۆربەجۆر بە هاتنە سەرکاری حکوومەتی شیعەی سەفەویی لە ئێران و دواتر حکوومەتە تەزاری و کۆمۆنیستەکان لە ئیمپراتۆری رووسیەیان لە سۆڤییەتی پێشوو، ئەم پێوەندییە دوور و درێژە کولتووری و سیاسی و مێژووییە بەرە بەرە پچڕ پچڕ بووو لە زەمانی بلشویکەکان گەیشتە لوتکەی خۆی. بەڵام بە دوای هەرەسهێنانی سۆڤییەت دەرفەتی هاتنەدەرێ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست لەم لەناوچوونە کولتووریو مێژووییە خۆش بوو، هەر بۆیە، ئێران دەرفەتێکی بۆ بووژاندنەوەی پێوەندییە مێژوویی و کەلتوورییەکانی لەم ناوچە بەدەستهێنا کە هەتا هەنووکە لەم دەرفەتە زێرینە کەڵکی پێویست وەرنەگیراوە.[1]

پێوەندییەکانی ئێران لەگەڵ ئاسیای نێوەڕاست، لە بیاڤی پرسە کولتوورییەکان بازنەیەکی بەربڵاویی لە هاوپێوەندییەکان پێکدێنێ، کە بە هیچ جۆرێك کورت ناکرێتەوە بە مژارگەلی

(١) ئادمۆند هەرزیك، ئێران و بیاڤی باشووری سۆڤییەتی پێشوو، وەرگێران کاملیا ئەحتەشامی، تاران: دەفتەری توێژینەوەی سیاسییە نێونەتەوەییەکان، ١٣٧٥، لاپەڕەکانی ١٧٨ ـ ١٧٤.

وەك زمانی هاوبەشییان لێکنزیکی مێژوویی و ئایینی. توێژینەوەیەکی ئاسیایی لە موسیقا، بیناسازی، شێوەکاری، وێژە، مێژووی ناوچەکە و تەنانەت داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان لە سەردەمی کۆن، یان لە سەردەمی شارستانییەتی ئیسلامی، پێشاندەری هاوجۆری و سرووشتی بەرانبەری کولتوور و شارستانییەتی ئێرانە لەگەڵ ئەم ناوچەیەدا. یارمەتیدان بە ژیاندنەوەی ژێرخانە کولتووریە لە بیرکراوەکانی ئاسیای ناوین‌و بەدەستهێنانەوەی ناسنامەی کولتووری ناوچەکە لە پلانە گرینگەکانی ئێرانە لە ئاسیای ناڤین، باندۆری کولتووری قووڵی ئێران لە ناوچەکەدا بە رادەیەکە کە لە گەڵ هەوڵ و تەقەلای بلشویکەکان لە سۆڤییەتی پێشوودا، هێشتا ئێرانی- ئیسلامی بوونی بەشێکی گەورەیە لە پێناسەی کولتووری ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، قووڵایی ئەم پێوەندییانە بە جۆرێکە کە رێبەرانی ناوچەکەی ناچار بە دانپێدانانی راشکاوانە و بەردەوام لە هێزی مێنۆکی ئێران لەم وڵاتانەدا کردووە، بۆیە لە رووی کولتوورییەوە لەگەڵ بوونی وەها هاوپێوەندییەکی هاوبەش و بنچینەیی لەنێوان ئێرانییەکان و خەڵکی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز، هەروەها لەگەڵ بوونی واژۆی رێککەوتنگەلی جۆربەجۆری کولتووری لەنێو هەردوولا؛ ئاستی پێوەندی کولتووری کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ ناوچەگەلی ئاماژە پێکراو زۆر جێگای تێڕامان و رێزلێنان نییە.

لە پرسە مێژوویی و کولتوورییەکان کە تێپەڕ بین، هەروەها لەگەڵ تێکچوونی سۆڤیەت و پاشان سەربەخۆیی وڵاتەکانی ئاسیای ناڤین، ئێران لە رووی سیاسی ئابووریشەوە پێگەی ژێئوپۆلۆتیکی نوێی بەدەستهێنا کە دەیتوانی بەباشی کەڵکی لێوەربگرێ. لە وەها بارودۆخێکدا بوو کە ئێران هەوڵیدا پێوەندی سیاسی و ئابووری خۆی لەگەڵ ئەم ناوچەیە پەرەپێبدا. لەلایەکی دیکەشەوە، بەستراوییە چڕەکانی وڵاتانی ئاسیای ناوین بە رووسیە؛ ئەوانی هانداوە کە هەوڵێکی گشت لایەنە بۆ بەدەستهێنانی کۆمپانیای نوێی ئابووری ـ بازرگانی لەناوچەکە بدەن. لەم بارەوە ئێران بە هەبوونی سنووری دوور و درێژی هاوبەش، تایبەتمەندییە جوغرافیاییەکان و رەوگەی پێوەندی گونجاو،. .. .. بۆ گرێدانی ئاسیای ناوەندی بە بازاڕە جیهانییەکان رەوشێکی لەبارتری هەیە. لە راستیدا کەڵکوەرگرتن لە رەوگەی ئێران بۆ بدەستهێنانی بازاڕە جیهانییەکان و کەڵکوەرگرتن لە ئاوە ئازادەکانی ئەم وڵاتە (کەنداوی فارس و دەریای عەممان) نەك هەر لە رووی ئابوورییەوە بە قازانج و کەم تێچووترینە بەڵکو رێگایەکی نوێشە بۆ وڵاتەکانی ئاسیای ناوەندی بە ئەژمار دێ تاکو خۆیان لە بەستراویی‌و ژێردەستی



رووسیە رزگار بکەن. پێکهاتە ئابوورییەکانی ئێران و ئاسیای ناوەندی بوارگەلی گونجاوی بۆ گەشەی پێوەندییە گشت لایەنەکان لەنێوان خۆیاندا بەرهەڤ کردووە کە یەکێك لەو بوارانە هاریکاری لەمەڕ وزەو لەوانە نەوت و گازە. بەم جۆرەی کە ئەزموونەکانی ئێران لە بارەی هێنانە دەرو کەڵك وەرگرتن لە چاوگەکانی نەوت و گاز بۆ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و بەتایبەتی توکمەنستان و قەزاقستان زۆر جێگای تێڕمان بووە. بەرفرە کردنی هاریکاری لەم بەشەدا دەتوانێ لەپێناو پتەو کردنی سەربەخۆیی ئابووری هاریکاری ئەم وڵاتە بکات.[1]

بۆ وێنە یەکێك لە سیاسەتەکانی قەزاقستان گورینەوەی نەوتی خۆی لەگەڵ نەوتی ئێرانە تا بە دانی نەوت لە قەراخە باکوورییەکانی ئێران؛ بتوانێ نەوتی بەرانبەری بۆ فرۆش لە بازاڕە جیهانییەکان لە کەنداوی فارس وەربگرێ. تورکمەنستانیش بۆ گوڕاستنەوەی گازی سرووشتی خۆی لە رێگای ئێرانەوە بە تورکیە گرێبەستێکی لەگەڵ حکوومەتی کۆماری ئیسلامی بەستووە کە لەگەڵ گوشاری ئەمریکا، سوورە لەسەر تەواو کردنی. هەروەها ئێرانیش پتەو کردنی پێوەندییە ئابوورییەکانی خۆی لەگەڵ وڵاتەکانی ئاسیای ناوەڕاست لە چەند لاوە چالاکی خۆی رێکخستووە، لەوانە، دامەزراندن و نوێوژەن کردنەوەی هێڵە پێوەندییەکان وەك رێگای قیرو ئاسن، دامەزراندنی ناوچە ئازادە بازرگانییەکان و هەروەها دانانی هێڵەکانی بۆڕی نەوت و گازی سرووشتی، بۆ وێنە، بە دامەزران‌و تەواو کردنی هێڵی ئاسنی مەشهەد ـ سەرەخس ـ تەجەن، هەروەها تەواو کردنی هێڵی ئاسنی بافق- بەندەر عەباس لەلایەن ئێرانەوە، دەبێتە هۆی پەرەگرتنی ئابووریی ناوچەکەو پێوەندی هەرچی باشتری ئێران و ئاسیای ناوین.

بە شێوەی گشتی، وڵاتانی ئاسیای ناڤین و قەفقازیش لە چەند رووەوە بۆ ئێران گرینگی هەیە، یەکیان لە رووی سەرچاوە سرووشتییەکان و مەوادی شلی جۆراوجۆرە کە لەم وڵاتانە لەرادەبەردەر دەستدەکەون. بە جۆرێك کە هەموو وڵاتانی ئاسیای ناوەندی ـ کەم تا زۆر خاوەنی نەوت، گاز، زێرو ئاسنە واڵەکانی پڕبەهای دیکە و سەرچاوە ئاوییە بە کەڵکەکانی، هەروەها ئەم وڵاتانە خاوەنی چاوگی گەورەی تەنگستەن، کرۆم، روی، زیو، مس، قورقوشم، مەنگەنیزو ئورانیۆمە. بۆ وێنە هێندێك لە شرۆڤەکانی پیشەسازی نەوت بەراوردیان کردووە کە بیاڤی نەوتی تەنگیز هەڵکەوتوو لە قەزاقستان دەتوانێ نزیکەی ١٠ ملیارد بەرمیل نەوت پاشکۆی

(١) مایکەل شەریدان "پاشکۆی مەکشوفەی ئاسیای ناوەڕاست"، وەرگێڕان مێهری قەزوینی، ئیندیپێندنت، ١٩٩٥.

نەوتی هەبێ کە لە پلەی بەراوەرد لەگەڵ بیاڤەکانی چل دانەی دەریای باکوور تەنیا ٣ ملیارد بەرمیل پاشکۆی هەیە، ئەژمارێکی جێگای سەرنجە.[١]

گەشەی بازاڕە سنوورییەکان و دانانی ناوچەگەلی ئازادی بازرگانی لە هەریمە سنوورییەکان- وێرای بەربەستو ئاریشەی بازاڕە هەرێمییەکان ـ یەکێك لە خاڵەکانە کە بایەخی ولاّتانی ئەم ناوچەیەی بۆ ئێران دوو بەرانبەر دەکا. چونکە بەشێك لە بازاڕەکانی بەرخۆری ئەم ولاّتانە دەخاتە ژێر رکێڤی ئێرانەوە. ولاّتانی ئاسیای ناوەندی بۆ زۆربەی شتوومەکە بەر خۆرەکان، پێویستیان بە دەلاّل و سەرمایەدانەرە. هەروەها ئەم ولاّتانە خاوەنی توانایی هەناردنی هێندێك لە کالاّکانیشە، کە هەنووکە رەوتی ئاڵوگۆڕەکانیان لەناوچە جۆربەجۆرەکانی جیهان درێژەی هەیە. بۆ ئاکتیڤ بوونی پێوەندییەکانی ئەم بیاڤە دەبێ لەلایەك پێداویستە هاوردەکانی ئەم ولاّتانە بناسرێو بە بەشە حکوومی و تایبەتییەکانی ئێران رابگەیەندرێ و لەلایەکی دیکەوە کالاّ هەناردەکانیش دەستنیشان بکرێن. ئێستاکە لە زۆربەی گرێبەست و رێکەوتنەکانی نێوان ئێرانی و ولاّتانی ناوچەکە ریزبەندی پەیوەیست بە هاوردەکان و رادەی هەناردەییەکان هەرکام لەوانە راگەیەندراوە کە بە هۆکاری جۆربەجۆر لە ئارشیوی بەڵگە حکوومییەکان ماوەو کەڵکی تەواویان لێ وەرنەگیراوە، لە کاتێکدا گەر بە بەشی تایبەتی رابگەیەندرێن دەتوانێ ببێتە هۆی گەشەی بازاڕەکانی دەرەکی ئێران.

هەڵبەت دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کە بۆ بەرژەوەندی ئاستی پێوەندییە ئابووری ـ بازرگانییەکانی ئێران لەگەڵ ولاّتانی ئاسیای ناڤین ئاستەنگەلێکی مەزنیش لە گۆڕێدا بووەو هەمیشە بە سەرنجدان بە بەستراوییە بنەڕەتییەکانی ولاّتانی ئاسیای ناڤین بە کۆماری فیدارتیوی رووسیەوە و تەنانەت ولاّتانی دیکە ئەندامی کۆمەڵەی هاوقازانجەکان، رێژیمەکانی ئاسیای نێوەڕاست ناتوانن سیاسەتێکی ئابووری سەربەخۆ بگرنە پێشو لەم رووەوە بەچڕی بەستراون. زێدەباری ئەمە، کەمی سەرمایەدانانی ماڵی، هەروەها نالەبار بوونی ژێرخانی ئابووری و پێوەندی ئێران کە زۆربەیان نوێژەن، یان لە تەواو کردن دان، لەو هۆکارانەن کە ئاستەنگ بوون لە بەرزکردنەوەی ئاستی پێوەندی بازرگانی ئابووری ئێران لەگەڵ ولاّتانی ناوچەکە. لەگەڵ جیاوازی و رەنگاورەنگی نێوان ئابوورییەکانی رێژیمەکانی ئاسیای ناوین،

(١) سەید رەسوڵ موسەوی، سەرچاوەی توانا ئابوورییەکانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، هەمان، لاپەڕەی ٣٩٤.



هەموویان خوازیاری گواستنەوەی سیاسەتگەلی کۆجێیی گەری حکوومی بۆلای بەشی تایبەتی کردن و ئابووری بازاڕە ئازادن کە گەیشتن بەم ئامانجەش پێویستی بە سەرمایە دانانێکی بەرفرەی دەرەکییە، لە کاتێکدا وا بەرچاو ناکەوێ هیچکام لەم دوو لایەنە لە بارودۆخێکی گونجاو بۆ ئەم کارەبن. هەر بەم هۆیە ولاّتانی ناوچەکە زیاتر لە هەوڵی دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ ولاّتانی پێشەسازی رۆژئاوایی یان رۆژهەلاّتی و باشووری رۆژهەلاّتی ئاسیان کە خاوەنی توانایی رێژەیەکی بەرز بۆ سەرمایەدانانن. هەڵبەت تونای سەرمایە دانانی ئێران جێگای سەرنجە بەلاّم بارودۆخێکی هەنووکە ولاّت و ئاڵوگۆڕە دەرەکییەکان، ئەم جۆرە سەرمایە دانانە دەخاتە ژێر کارتێکەری خۆیانەوە و ئاستەنگن لە باشتر بوونی پێوەندییەکان. بەلاّم لە درێژە ماوەداو بە پتەوبوونی هەرچی باشتری ژێرخانە ئابوورییەکانی ولاّت و کۆنترلّی گۆڕانکارییە دەرەکییەکان دەتوانین هیوادار بین کە ئێران رۆڵێکی ئاکتیڤتر لەناوچەکەدا بگێڕێ.[١]

لە پێوەندی لەگەڵ هۆکارەکانو ئاڵوگۆڕە دەرەکییەکان دەبێ بڵێین ئەمریکا بۆ کۆنترۆڵو خستنە پەراوێزی ئێران لە ئاسیای ناڤین، لە کەرەستەگەلی وەك سەرمایە، تەکنۆلۆژی، کۆمپانیا فەرە رەگەزییە عەرەبییەکان، هەروەها حکوومەتە هاوپەیمانەکانی خۆی لەناوچەکە بەتایبەت ئیسرائیل، تورکیە، کەڵك وەردەگرێ و تەنانەت خەریکی سەلماندنی سیاسەتەکانی خۆیە لە هەمبەر پێوەندییەکانی ولاّتانی ئاسیای ناڤین لەگەڵ ئێراندا، تا شوێنێك لەگەڵ ئەوەی کە ئێران بە هۆی بوونی پێگەیەکی لەباری پێوەندی کە دەتوانێ دەرفەتی دەست پێڕاگەیشتنی ئاسیای ناوەندی بە ئاوە ئازادەکان لە کۆرتترین، متمانەترین، کەم بەهاترین رێگەوە دەستەبەر بکات، بەلاّم کەڵکوەرگرتنی پێویست لەم ریگە پێوەندییە لەبارە، تاکو ئێستا تا رادەی چاوەڕوانی کردن نەبووە، چونکە ئەمریکا بە توندی تێدەکۆشێ پێش بە باندۆری کولتووری، سیاسی ئابووری ئێران لە ئاسیای ناوەڕاستدا بگرێ. هەڵبەت لەسەر رێگای بەرز بوونەوەی پێوەندییەکانی ئێران لەگەڵ ولاّتانی ناوچەکە ئاستەنگەلی گەورەی دیکە وەك ناکۆکییە سنووریەکان، دەستێوەردانی کەمینە ئەتنیکییەکان، ئەندێشە و کردەوە توندڕۆیانە هێندێك لە گرووپەکان و گەشەی ناسۆنالیزمی توندڕۆ، شەڕی نێوخۆیی، یان تێکەڵچوونە ئەتنیکییەکان ئایینی لەگۆڕێ دایە. ئەم بەربەستانە بێگۆمان ئامانج و بەرژەوەندی راستەقینەی ولاّتانی ناوچەکە لە بەرانبەر گوشاری رۆژئاوا و ئەمریکا خەسار هەڵگرکردووە و کاریگەری لەسەر بڕیاردان و سیاسەتی دەرەوەیان هەبووە.

(١) ئەدمۆند هەرزیك، ئێران و بیاڤی باشووری سۆڤیەتی پێشوو، هەمان سەرچاوە، لاپەڕەکانی ٥١ ـ ٥٠.

بەتایبەت ئەوەی کە، رکەبەرایەتییە ناوچەیی‌و نێونەتەوەییە بەفراوانەکان بۆ کارتێکەری لەسەر ئەم وڵاتانە درێژەی هەیە. بەم هۆیە پێشەڤە چوونی پێوەندییەکانی ئێران لەگەڵ هەموو وڵاتەکان وەك یەك نەبوون، بۆ وێنە، پێوەندی ئابووری ئێران لەگەڵ تورکمەنستان و قەزاقستان لە چاو کۆمارەکانی دیکە لە ئاستێکی باشتر دایە.[1]

سیاسەتی دەرەکی کۆماری ئیسلامی بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی ئێران لە ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز گرتنەپێشی پاراستنی سەقامگیری ناوچەیی، پێشگیری لە باندۆرو دەسەڵاتی هێزەدەرەکییەکانی ناوچەکە، گەشەی پۆزەتیڤی دراوسێیەتی لەگەڵ هاریکارییە بەرانبەرییەکانی ئابووری‌و پاراستنی پێوەندی هاوڕێیەکانی لەگەڵ رووسیە و... وڵاتانی دیکەیە. ئێران لەگەڵ جەخت کردن لەسەر گەشەی پێوەندییە کولتوورییەکان بەردەوام لە هەوڵی برەودان بە پێوەندی ئابووری بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکەش بووە. بەو جۆرەی کە زێدەباری گەشەی پێوەندی دوولایەنە کە واژۆی گرێبەستە جۆربەجۆرەکان لەگەڵ هەرکام لەم وڵاتانە لەخۆ دەگرێ، لە چوارچێوەی پێوەندی چەند لایەنەش گەشەی هاریکاری لە رێکخراوەیی هاوکاری ئابووری (ئێکۆ)، هەروەها هاوکاری نێوان وڵاتانی بیاڤی دەریای خەزەری گرتووەتە بەر. لەگەڵ ئەوەی کە ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز بۆ ئێران وەك لاگیرییەکی ئیستراتیژێکی ئەڵتێرناتیڤ یان تەواوکەر لە ئارادایە. واتە "روانیین بۆ لای باشوور" بە جێی تێروانینی نەریتی ئێران " بۆ لای باکوورە" کە لە سیاسەتی دەرەوەی ئەم وڵاتە بایەخی پێدراوە. بەم جۆرە بازاڕی بەربڵاویی ناوچەکە بۆ ئێران بە سەرنجدان بە پێویستییە نوێیە ئابوورییە جیهانییەکان جێی گرینگی پێدانە.

لە ئاستی شرۆڤەی ناوچەیی، دەتوانین کردەی ئێران لە سێ تەوەردا شیبکەینەوە،[2] تەوەری یەکەم بەستراوە بە هاریکارییە ئابوورییەکانە کە گرینگترین رێچکەی هزری و بەڕێوەبەری ئەو رێکخراوە هاریکاری ئابووری ئێکۆیە. ئەم رێکخراوە هەنووکە دامەزراوێکە بۆ دانیشتنی سەرکردەکانی ١٠ وڵاتی ئەندام بۆ هاوئاهەنگی و هاوکاریکردن و چارەسەری پرسگەلی وەك بازاڕە رەشە سنوورییەکان، ئابووری دانیشتوانی سەر سنوور، قاچاخی چەك و ماددەی هۆشبەرەکان، چارسەر کردنی تێکەڵچوونە ئەتنیکییەکان، کاروباری پەنابەران،

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەڕەی ٥١.

(٢) سەید محەممەد کازمی سەجادپوور "ئێران، ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، تاوتوێ بابەتی ئاستی شرۆڤە لە پێوەندییە ئابووبرییە سیاسییەکان لەگەڵ توێژینەوەی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ژمارە ٧، ساڵی ٣ (زستانی ٧٣)، لاپەڕەی ١١.



پارێزگاری لە ژینگەو هێندێك بابەتی دیکەی لەم چەشنە،[1] جیا لەوە دەتوانین کردەی ئێران لە بابەتێکی دیکەدا شرۆڤە بکەین، ئەویش تامەزرۆیی بە گەشەی رێکخراوە ناوچەییەکان جگە لە ئیکۆیە، لەوانە گەڵاڵەی رێکخراوی هاریکارییەکانی لێواری دەریای خەزەرە کە لە گۆڕەپانی پراکتیکدا زۆر سەرکەوتوو نەبووە. دەریای خەزەر وەك مەزنترین دەریای جیهانە کە چاوگی مەزنی نەوت و گاز لەخۆ دەگرێ. هەروەها بە پردی پێوەندی نێوان ئاسیای ناڤین و قەفقاز بە ئەژمار دێ. ئێران بە بەراورد دەگەڵ وڵاتانی دیکە کە ناردنی دەریا واتە قەزاقستان، تورکمەنستان، رووسیەو کۆماری ئازەربایجان بۆ هاریکاریە جۆربەجۆرەکان زیاترین پێداگری کردووە داهاتووی هاریکاریە ئابوورییەکان لەم دەریایە بەستراوەتەوە بە هۆکارگەلی جۆربەجۆری، وەك دەریایکردنی رێژیمی یاسای دەریای قەزەر، وەرێخستنی پێکهاتەی لە بارو هاوئاهەنگی پتری ئەوانە هەیە.[2] سێیەمین تەوەر بۆ روونکردنەوە لەسەر کردەی ئێران لە ئاست شرۆڤە ناوچەیی گرێدراوە بەرۆڵی ئەم وڵاتە لە هێنانە ئارای ئاشتی‌و چارەسەر کردنی ناکۆکی ناوچەیی، بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بە شەڕی نێوخۆیی تاجیکستان بکەین کە کۆماری ئیسلامی ئێران لەماوەی چەند خولی وتووێژ و نێوبژیوانی وەك یەکێك لەلایەنەکانی هێنانە ئارای ئاشتەواییدا لەتاجیکستان ناسراوە.[3] بە شێوەی گشتی، کۆماری ئیسلامی ئێران لە چوارچێوەی ئێکۆ، هەروەها لەناو رێکخراوی هاوکارییەکانی وڵاتانی قەراخ دەریای خەزەرو بە سەرنجدان بە هاوپێوەندییە کولتووری و مێژووییەکان لەگەڵ ئەم ناوچەیەدا دەتوانێ یارمەتییەکی گەورە بە پەرەگرتنی ئابووری وڵاتانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز بکات. لە سەرەتای دەستپێکی سەربەخۆیی ئەم وڵاتانە تاکو هەنووکە چەندین جار ئێران و وڵاتانی ناوچە پێشی بە گەشەکردنی ئەم هاوکارییانەیان گرتووە کە پێویستە ئیرادەی سیاسی بەهێزی وڵاتانی ناوچەکەو شیمانە کردنی داهاتوو بۆ لابردنی ئەم بەربەستانە تێبکۆشن.

(١) مێهردادی موحسنین، "رۆڵی ناوچەیی ئێران لە داهاتووی ئاسیای ناوەڕاستدا (نموونە توێژینەوەکانی: پێوەندی ئێران‌و تورکمەنستان) " توێژینەوەی ئاسیای ناوین و قەفقاز، ژمارەی ١٩، ساڵی ٥ (زستانی ٧٥)، لاپەڕەی ٦٦.

(٢) ر، ك ب: محەممەد رەزا دەبیری، "رێژیمی ئاسیای دەریای خەزەر بۆ بیاڤی ئاشتی وگەشە" وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز، ژمارە ٥، ساڵی ١٣، هاوینی ١٣٧٣، لاپەڕەکانی ٢٠ ـ ١٣.

(٣) ر، ك ب: مێهراد مۆحسێنین "تەنگژە ناوچەییەکان و هەوڵە بونیادنەرەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران" وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز، ژمارەی ٦، ساڵی ٣ (پاییزی ٧٣)، لاپەڕەکانی ٤ ـ ١.

## فەسڵی دووهەم

## ئاسیای ناڤین و هێزەکانی دەرەوەی ناوچەکە

### ١ـ ئەمریکا

بەرلە هەڵوەشانی یەکیەتیی سۆڤییەت و دروستبوونی پێنج وڵاتی سەربەخۆ لە ئاسیای ناڤین حکوومەتی ئەمریکا لەگەڵ راستی گەلێکی نوێ لە سیاسەتی دەرەکی خۆی رووبەڕوو بوو، چونکە سیاسەتی دەرەکی ئەمریکا لە سەردەمی شەڕی ساردو لە ماوەی پتر لە ٤٥ ساڵ رکەبەرایەتی لەگەڵ سۆڤییەتدا وەك زلهێزێکی رکەبەر، لە پێکهاتەیەکی تایبەتیو لەگەڵ هانەو یەکانەییەکی دیاریکراو لەخۆ گرتبوو. بەڵام رووخانی بەرەی رۆژهەڵات، ئەمریکای رووبەڕووی کۆمەڵێك یەکانەی سیاسیو وڵاتی سەربەخۆ کرد کە هیچکامیان پێشینەیان لە پێوەندییە دەرەکییەکانی ئەم وڵاتەیان نەبووە. ئەم بابەتە بووە هۆی ئەوەی کە ئەمریکا چاوخشاندن بە سیاسەتی دەرەکی خۆیدا بکاو ئیستراتیژییەکی نوێ لەهەمبەر وڵاتانی بەجێماو لە سۆڤیەتی پێشوو بەتایبەتی ئاسیای ناوین بگرێتە پێش. بوونی سەرچاوگەلی سرووشتی لەم ناوچەیەو هەڵکەوتنی لەنێوان شوێنی بە یەکگەیشتنی رۆژهەڵات و رۆژئاوا لەو هۆکارگەلەن کە بووەتە هۆی سەرنجڕاکێشانی ئەمریکا بۆسەر ئەم ناوچەیە. بەریانی سەرکردەکانی ناوچە بۆلای بازاڕو کەڵکوەرگرتن لە کەرەستەی ئابووری رۆژئاوا، هەروەها کەڵکوەرگرتن لە ئەمریکا وەك هێزێکی پاراستنی یەکسان لە بەرانبەر هێزە ناوچەییەکان لەوانە رووسیەو چین. .. .. بووەتە هۆی نزیکبوونی پێوەندی وڵاتانی ناوچەکە لەگەڵ ئەمریکا. هەرچەندە لە دابەش کردنەکانی ئەنجام دراودا لەلایەن لێکۆڵەرانی پێوەندییە نێونەتەوەییەکان، ئەمریکا لە دەستەی کاراکتەرەکانی دەرەوەی ناوچەیی پلەیەك بە ئەژمار دێ، بەڵام رۆڵ و جۆراجۆری بازنەی ئۆپراسیۆنی کردەوە و لێهاتوویی گەلێك کە ئەم وڵاتە هەیەتی یان ئەوەی کە بۆ خۆی گەڵاڵەی داڕشتووە- بە جۆرێکە هەنووکە ئەم وڵاتە لە دەستەی کاریگەرترین و سەرەکیترین کاراکتەرەکانی ناوچەکەدا هەڵکەوتووە. هێندێك لە ئەولەوییەتەکانی ئەمریکا لەناوچەکە بە کورتی ئاماژە پێدەکرێ.



**ئەلف. تێبینییە ئیستراتیژیك و جیهانییەکان**

کۆمەڵێك لە تێبینییە ئیستراتیژییەکانی لە دیاری کردنی جۆری هەڵسوکەوتی وڵاتە یەکگرتووەکان کاریگەرە،کە لێرەدا ئاماژە بە گرینگترینیان دەکەین.[1]

١) پێشگیری لە پێوەندییە ئیستراتیژییەکانی هێندو رووسیە

پێوەندییەکانی نێوان هێند و رووسیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سۆڤییەتی پێشوو تاکو شوێنێك کە ئەم پێوەندییە سێبەریشی خستبووە سەر هاوپەیمانانی ئەمریکا وەك پاکستان. هەروەها دوای دەیەی ١٩٩٠یش پێوەندی نێوان هێند و رووسیە درێژەی هەبووو پێوەندییەکانی دوو وڵات لە ئاستە جۆربەجۆرەکاندا پەرەی گرتووە. بەڵام ئێستا رەوشی نوێی ئەفغاستان درێژەی هاوکاری هێند و رووسیە لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکا لە ئەفغانستان و ئاسیای ناڤین لە دژایەتی دایە، بۆیە بوونی ئەمریکا لە قرقیزستان و ئەفغاستان دەتوانێ کاریگەری بێ لە بۆشایی نێوان رووسیەو هێنددا.

٢ـ بەرەنگاری لەگەڵ پلانە ناوچەییەکانی چین

هاوسنووریی لە رۆژئاواو باکووری چین و نزیکبوون لەناوچەی باشووری ئاسیاو کاریگەریدانان لەسەر گۆڕانکارییەکانی ئەم ناوچەیە لە ئامانجە ناوچەیەکانی دیکەی ئەمریکایە کە لەم برگەیەدا بە دانی یارمەتیگەلی ماڵی پتر بە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست دەچوونە پێشێ. رێژیمی چین لە ساڵانی دواییدا رۆڵێکی ئەکتیڤی لە ئاسیای ناڤینداگێڕاوە و پێوەندییەکانی خۆی لە هەموو بوارەکان بەتایبەتی ئەمنییەت، لەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناڤیندا بەرز کردوەتەوە. چونکە ترسی ئەوە لەئارادا بوو کە وەك هێزێکی ناوچەیی لە ساڵەکانی داهاتوو لەم ناوچەیە دەر بکەوێ رێژیمی ئەمریکا بە بوونیو باندۆری لەناوچە لە تەنیشت وڵاتانی چین دەرفەتێکی کە لەباری بەدەستهێناوە تاکو بتوانێ چالاکییە حکوومییەکانی چین کۆنترۆڵ بکا. لەلایەکی ترەوە، پرسی تەبەت لە دوو دەیەی دواییدا بیانوویەکی داوە بەدەست بەرپرسانی ئەمریکایی هەتا بەردەوام رەخنە لە سیاسەتەکانی چین لە هەمبەر پێشلکردنی مافی مرۆڤ بگرن. بەرپرسانی ئەمریکا تێدەکۆشن لە هاوکێشە نیونەتەوەییەکان لە بەرانبەر سیاسەتی پاوانخوازانەی چین لە

---

(١) ئەم کۆمەڵە تێبینییانە بە هێندێك دەستێوەردانەوە لەم سەرچاوە وەرگیراوە:

تەهمینە عەزیزی (ئیستراتیژی ئەمریکا لە ئاسیای نێوەڕاست) "نهضت" (بزووتنەوە)، ساڵی چوارەم، ژمارە ١٣، بەهاری ١٣٨٢ ل ٨٩ - ١٠

تایوان یان ئاسیای ناوەڕاستو. ... هتد وەك کەرەستەیەکی گوشاری سیاسی کەڵك لە تەبەت وەربگرن. بانگهێشتن لە دالایی لاما، ڕێبەری جیاخوازی تەبەت بۆ ئەمریکاو کردەوە سیخوڕییەکانی لەناوچەکە دەتوانێ بەڵگە بێ. لە ساڵانی دواییدا گەشەی تالیبان و مەسەلەی بناژۆخوازی ئیسلامی لە ئەفغانستان یان ئاسیای نێوەڕاست و سین کیانگ، حکوومەتەکانی هێنایە سەر ئەو باوەڕە هەتا بۆ پێشگرتن لە گەشەی وەها هزرێك ڕێوشوێنی چڕتری ئەمنییەتی لە وڵاتانی خۆیان بە شێوەی هاوئاهەنگ بگرنەبەر. بەم پێیە، حکوومەتی چین پێشنیاری دەمەزراندنی وەها ڕێکخراوگەلێك بە وڵاتانی ئاسیای ناوەندی بەتایبەتی ڕووسیە کرد. ئەم پەیمانە کە بە "پەیمانی شانگهای" ناسراوە سەرەتا پرسە ئەمنییەتییەکانی لەخۆ دەگرت و دواتر لە بواری ئابووریش کۆمەڵێك بابەتیان تێدا گونجاند. کۆنفرانسی سەرکردەی وڵاتانی ئەندامی ئەم پەیمانە (چین، قەزاقستان، قرقیزستان، ڕووسیە و تاجیکستان) لە ساڵانی دواییدا لە چەند قۆناخێکدا لە شانگهای چین و رقیزستان و قەزاقستان بەڕێوە چوو. بەڵام بەهۆی ڕووداوەکانی چەند ساڵی ڕابردووی قرقیزستان ناوەندی دووهەمی ئەم پەیمانە لە ببشکەك، پێتەختی قرقیزستان، جێگیر کرا. هەنووکە بوونی ئەمریکا لەناوچەکەدا دەتوانێ کاریگەری بێ لە لاواز کردنی پەیمانی شانگهای کە لە هەرحاڵدا کارتێکەری چین و دواتر ڕووسیە لە ئاسیای ناڤین بەهێز دەکاو یەکێك لە ئامانجەکانی ئەمریکا بێ‌ئەعتبار کردنی ئەم گرێبەستە لە ڕێگای ئەندامەکانی واتە (قرقیزستان یان ئوزبەکستان).

**٣ـ پێشگیری لە ڕووسیە لە مەڕ بەدەستهێنانی دەسەڵات وەك ڕکەبەر**

جیا کردنەوەی ڕووسیە لە کۆمارەکانی سۆڤیەت کەمکردنەوەی دەسەڵاتی مسکۆ بەسەر کەوشەنی نەریتی دەسەڵاتی پێشووی و خستە پەراوێزی ئەم وڵاتە لە چوارچێوە ناوچەیی لە ئامانجەکانی دیکەی وڵاتە یەکگرتووەکانە لە ئاسیای ناویندا. ئەم سیاسەتە لە ڕێگای پتر کردنی هاریکارییە ماڵییەکانی ئەمریکا بۆ ئەم وڵاتانە، دەگێڕایە پێش. پتر کردنی یارمەتییە ماڵییەکانی ئەمریکا بۆ کۆمارەکانی ئاسیای ناڤین جیا لەوەی کە یارمەتی بە توانایی وڵاتانی ناوچە و بەڕێوەبردنی ڕێوشوێنی ئەمنییەتی لە شوێنگە سنوورییەکان دەکرد، هۆکارێك بوو بۆ هاندانی ئەم وڵاتانە بە هاریکاری نیزامیو ئەمنییەتی لەگەڵ ئەمریکا. ئەم بابەتە سەرەتا دەتوانێ، کاریگەری لە دابەزینی ڕۆڵی ڕووسیە لە هاوکێشە ئەمنییەتییەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا هەبێ. دووهەم، دەتوانێ پەرە بە شك و گۆمانی هێندێك لەوڵاتانی ئەندامی گرێبەستی ئەمنییەتی هەرێمی لەسەر بێ توانایی ڕووسیە لە وڵامدانەوە لە پێویستی ئەمنییەکانی وڵاتانی



ئاسیای ناڤیندا بدا، بەتایبەتی هێندێك لەم کۆمارانە بە گرتنەپێشی ئیستراتیژی تایبەت، داهاتووی ئەم گرێبەستەیان لەگەڵ مەترسی لەناوچوون ڕووبەڕوو کردووەتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەمریکا لە دانی یارمەتی ماڵییەکان، دوای شەڕی دووهەمی جیهانی ئەزموونێکی نەرێنی هەیە، گەشەی باندۆری سیاسی لە ڕێگای دانی یارمەتییە ئابوورییەکان، هەروەها پشتیوانی دیپلۆماتێك لە وڵاتانی ناوچە بەمەبەستی شوێندانان لە کردەو گۆڕینێك ئاراستەی سیاسەتی دەرەکی ئەم وڵاتە لەهەمبەر هاریکاری لەگەڵ ڕووسیەداو تەنانەت لەگەڵ ئەورووپاو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بۆ هاوکاری لەگەڵ ئەمریکا، گرینگییەکی زۆری بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان هەیە. بەواتەیەکی دیکە، لەگەڵ لاوازی وڵاتانی ئاسیای ناڤین لە گەشەی ژێرخانەی ئابوورییەکاندا، هەروەها نابەرابەری لە دابەشکردنی سامانو پەرە گرتنی بەرچاویی گەندەڵی و بەرتیلخۆری بەرپرسانی پایەبەرزی ئەم وڵاتە، هۆکاری سەرەکی لە یارمەتییە ماڵییەکانی ئەمریکا بە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست بە تەماح خستنەبەر ڕێبەرانی ئەم وڵاتانە بۆ ڕاکێشانی وڵاتانی ئاسیای ناوەندی بە مەبەستی بەدەستهێنانی پشتیوانی ئەوان لە سیاسەتە کورت ماوەو درێژماوەکان و لە وتەیەکدا، یارگیری لە بیاڤی ژێر دەسەڵاتی نەریتی ڕووسیەیە.

لەگەڵ بوونی ئەوەش، دەبێ بڵێین کە سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان لە مەڕ ڕووسیە، درێژەی سیاسەتەکانی سەردەمی شەڕی سارد نییە. بناغەی سیاسەتی ئەمریکا لەمەڕ ڕووسیە لەسەر تەوەری هاوڕییەتی ئیستراتیژیکە. بە واتایەکی دیکە، وڵاتە یەکگرتووەکان بە مەبەستی گەشەدان بە بیاڤی دەسەڵاتی سیاسی، کەڵکوەرگرتنی ئابووری لە کانزا گەورەکانی نەوت و گاز، بەردەوامی هێژمۆنی نیزامی جیهانی لەسەر بنەمای نەزمی ئەمریکاییو گشتگیر کردنی بەها ئەمریکاییەکان، بوون لەناوچەی دەوروبەری دەریای خەزەر هاوکات لەگەڵ سیاسەتی خۆی لە مەڕ دێموکراتیزە کردنی ڕووسیەو پتەوترکردنی دوستایەتی ئیستراتیژیکی لەگەڵ مسکۆ، هاوکاتیش ڕکەبەرایەتی بۆ بەدەستهێنانی پێگەیەکی لەبارتر لەناوچەکەدا لە قەڵەم دەدات.

پێوەندییەکانی دوو وڵات دوای تێکچوونی کۆمۆنیزم بە ڕێبەری یەلتسین و پۆتین بە جۆرێك بوو کە ڕێبەرانی ئەمریکای بە گۆڕتر لە هەموو کات بۆ لای گەشەپێدان بە سیاسەتگەلی نزیکتری ئابووری، تێك ئالاوی بەربلاوتری سیاسی و ئالوگۆڕی بەرفراوانتری زانیاری و هاوپێوەندییە نیزامییەکان پاڵ پێوە ناوە. ئەمریکا کە سەردەمانێك نزیکەی حەوت هەزار بۆمبی ناوکی بۆ لەناوبردنی یەکیەتیی سۆڤییەت پاشکۆ کردبوو، ئەمڕۆکە، خاوەنی دووهەمین

ئاستی سەرمایەدانانە لە رووسیەدا.[1] رووسیە گەورەترین بەرهەمهێنەری نەوت لە دەرەوەی رێکخراوەیی ئوپێك كە تواناى وەبەرهێنانی نزیکەی چەند ملیۆن بەرمیلی لە رۆژدا هەیە. رۆڵی سەرەکی لە سیاسەتەکانی ئەمریکادا بۆ هاوسەنگکردنی هێزو لەژێر رکێڤ خستنی رێکخراوی ئوپێکە. بەم جۆرە، رێبەرانی ئەمریکا لە تەنیشت كانزاى نەوتی كۆماری ئازەربایجان و تاجیکستان و قەزاقستاندا بە مەبەستی هاوسەنگی لە سیاسەتی ئەندامانی ئوپێك و دابەزاندنی بەهای راستەقینەی نەوت، بایەخێکی تایبەتییان بە نەوتی رووسیەداوە.

٤ـ گشتگیر كردنی بەها ئەمریكاییەكان

بەریان بەلای رۆژئاوا هەم لە ئاستی رژێمەکانی ئاسیاییو هەم لە ئاستی جوولانەوە بەرهەڵستکارەکانی ئەم ناوچەیەدا دەبینرێو نارزاییان لەو بڕوایەن دەستێوەردانی ئەمریکاو رۆژئاوا لە ئاسیای ناوەڕاست یارمەتی بە ئارمانجی دێموکراسیخوازی دەكا. لە كردەوەدا، زۆربەی یارمەتییەکانی ئەمریکا بە ئوزبەکستان، قەزاقستان یان گورجستان نەك هەر بۆ پشتیوانی لە پەرەپێدان بە ئابووری بازارە، بەڵکو بۆ دامەزراندنی نیزامێکی سیاسی دێموکراتیکیشە. گوشارەکانی سیاسی واشنگتۆن بووە هۆی دەرکردنی راگەیاندراوێکی هاوبەش لە نێوان ئەمریکا ـ ئوزبەکستان لە مارسی ٢٠٠٢دا كە بە گوێرەی ئەو راگەیاندراوە، ئوزبەکستان دەروەستە بە دامەزراندنی "كۆمەڵگای مەدەنیو بەهێزو كراوە"، "رێز گرتن لە مافی مرۆڤ و ئازادییەکان"، "سیستمێکی راستەقینەی فرە حیزبی"، "هەڵبژاردنی ئازادو دادپەروەرانە"، "پۆلۆرالیزمی سیاسی، بیرو بۆچوونی جۆراجۆرو ئازادی بەیان"، "سەربەخۆیی راگەیاندنەکان"و "سەربەخۆیی دەزگای دادوەری".[2] یارمەتی بە پتەو كردنی دەسەڵاتی وڵاتانی ئاسیای ناوەندیو قەفقاز و سەربەخۆیی ئەوان لە رووسیە، دەرکەوتنی وڵاتانی سەربەخۆ، پێشکەوتوو، دێموکراتیك لەگەڵ لاگیری تەواو بەلای ئەمریکادا، متمانە بە ئەمریکا دەدا كە پێش بە تەشەنە كردنی ئەگەری ئاریشەکان لە داهاتوودا دەگرێ.[3] بە دواى گرینگیدان بەم ئیستراتیژیکەی ئەمریکا، دەبێ سەرنج بدەینە ئەم پرسە كە بەهۆی پاشماوەی

(١) حوسێن دێهشیار، "روانینی ئیستراتیژیکی ئەمریکا بۆسەر ناوچەی خەزەری" ئێران، ٨١/١٠/١٢، ل ٥.

(٢) رۆژنامەی ئێران، ٨٢/١/٢٨، لاپەڕەکانی ١٣.

(٣) برندا، شافر "قەفقازو ناوچەی خەزەر"، "تێگەیشتنی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان"، وەرگێران مەلعە مەهدی زادە، حەیاتی نوێ، ٨١/٧/١٠.



پێکهاتەی سەردەمی یەکیەتیی سۆڤییەت و لە كاتێکدا بژاردەکانی فەرمانڕەوای ئەم وڵاتە نەتوانن لە مەڕ هێنانە ئارای گۆڕانکاری گونجاو لە پێکهاتەی وڵاتانی خۆیانداسەرکەوتن بەدەستبێنن. ئەگەری روودانی ئاڵۆزییە كۆمەڵایەتییەکان كردەیەکی چاوەڕوانکراو دەبێ. زۆربەی رێبەرانی وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز لە پاشماوەی بژاردەکانی سەردەمی سۆڤییەتن كە بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێ رکەبەر توانیان لەسەر كورسی دەسەڵات بمێننەوە. جگە لەوە دەتوانین ئاماژە بە باسەکانی پێوەندییدار بە مافی مرۆڤ، چاكسازییە دێموکراتیکەکان، نیگەرانی لە ژینگەو..... هتد بكەین.[1]

**ب. تێبینییە سیاسییەكان**

رۆژئاوا بەتایبەتی ئەمریکا بە دوای دامەزراندنی "پلۆرالیزمی جۆغرافیایی" لە بیاڤی ئاسیای ناوەڕاستن. وڵاتانی ئوزبەکستان ـ قرقیزستان، لە هێندێك بەشدا تاجیکستانیش وەك یەكەمین ئامانجی ئەمریکا لە پێوەندییەدا لە ئارادان. بەهۆی پێکهاتەی بەجێماو لە (سیستمی سۆڤییەت و نە گۆڕینی ئەم پێکهاتەیە بە درێژایی سەردەمی دەسەڵاتداریو بژاردە بەجێ ماوەكان) یەكیەتیی سۆڤییەت، ئەگەر ئەم بژاردانە نەتوانن لە مەڕ هێنانە ئارای گۆڕانكاری لە پێکهاتە سیاسییەکان سەرکەون، ئەگەری سەرهەڵدانی قەیرانە كۆمەڵایەتییەکان چاوەڕوانکراون و زۆربەی رێبەرانی وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز بژاردە بەجێ ماوەکانی سەردەمی سۆڤییەتن كە بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێ رکەبەر توانیویانە لەسەر كورسی دەسەڵات بمێننەوە.[2] جگە لەوە دەتوانین ئاماژە بە پرسەکانی پێوەندییدار بە مافی مرۆڤ ـ چاكسازییە دێموکراتییەکان، پشتیوانی لە ئازادییە ئاینییەکان ـ نیگەرانی لە هەمبەر ژینگەو هتد.... بكەین.

**ج. تێبینییە ئەمنییەتییەكان**

ئەمریکا لە چوارچێوەی روانینێکی تاك جەمسەری بە نیزامی نێونەتەوەیی ناخوازێ ناوچە هەستیارو ئیستراتیژیکەکانی جیهان بەجێ بهێڵێت.[3] نیگەرانییە ئەمنییەکانی وڵاتە

(١) حەمید رەزا حافزی، پێوەندی رووسیە و ئەمریکا لە ئاسیای ناوەندی و قەفقاز دوای ١١ی سپتامبر، وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز، پاییزی ١٣٨١.

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) حەمید رەزا حافزی، "بەهێز كردنی رۆژئاواییەکان لە ئاسیای ناوەڕاست، ئامانج و رەوتەکان". ئیدارەی یەکەمی بەرژەوەندی هاوبەش، ١٣٨٠/١١/١٥

یەکگرتووەکان لە نیشانە ئیستراتیژییەکانی ئەمریکا لە ئاسیای نێوەڕاست بە ئەژمار دێ کە خاڵەکانی خوارەوە، لەخۆ دەگرێ.[1]

**١) سەرهەڵدانە ئیسلامییەکان:**

واشنگتۆن بە راگەیاندنی شەڕی دژی تیرۆریزمی نێونەتەوەیی، هێزەکانی بە رێبەری ئەمریکا بەرەو ولاَتانی پێشووی یەکیەتیی سۆڤییەت هەنارد.[2] ئوزبەکستان و قرقیزستان و تاجیکستان بوون بە پێگەی جێگرتنی هێزە نیزامییەکانی ئەمریکا. جۆرج بوش، کوڕی سەرۆک کۆماری پێشووی ئەمریکا، لە کاتی دانی گەڵاڵەی بودجەی حکوومەتەکەی بۆ ساڵی ٢٠٠٣ کۆنگرە،زیاتر کردنی یارمەتییە ماڵییەکانی ئەمریکا بە ٢٥ ولاَتی جیهان کە لە روانگەی حکوومەتی واشنگتۆنەوە لە هێڵی پێشەوەی خەبات لەگەڵ تیرۆریزمی نێونەتەوەییدا دانراون ـ بدات. بەم پێیە هێندێك لە ولاَتانی ئاسیای ناڤین لەوانە قرقیزستان، ئوزبەکستان، تاجیکستان و تورکمەنستان لە ریزی ئەو ولاَتانە دان کە وا بڕیارە یارمەتی ئابووری پتریان بدرێتێ.[3] رۆژنامەی "لۆمۆند دیپلوماتێك" ئەم یارمەتیانەی بە ٦٤ ملیۆن دولار بۆ خەبات لەگەڵ راپەڕیوان و ١٠٠ ملیۆن دولار بۆ گەشەی گورجستان، ١٦٠ ملیۆن دولار بۆ خەبات دژی ئیسلام گەراکان لە ئوزبەکستان و یارمەتییەکانی لەم چەشنەی بە تاجیکستان، قەزاقستان، ئازەربایجان و ئەرمەنستان راگەیاندووە.[4] لە راستیدا، دوای رووداوەکانی ١١ی سپتامبر،

(١) ئەم ئەتێبینییانە بە دەستکارییەکی کەم لە سەرچاوەی خوارێ وەرگیراوە:
تەهمینە عەزیزی، "ئیستراتیژی ئەمریکا لە ئاسیای نێوەڕاست" نێهزەت، ساڵی چوارەم، ژمارە ١٣، بەهاری ١٣٨٢، لاپەڕەکانی ١٠٦ ـ ٨٩.

(٢) خانمی بەتی جۆنز، یاریدەدەری حکوومی سەرۆکی حکوومەتی ئەمریکا لە کاروباری ئەورووپاو ئوراسیا لە وتوویژێك لەگەڵ cnn لەبەرواری ١٧ ژانوییەی ٢٠٠٢ بە ئاماژە کردن بە سەردانی بەرپرسانی ئەمریکا لەگەڵ بەرپرسانی حکوومەتەکانی ئاسیای ناڤین لە بواری هاوکارییە نیزامییەکانی داهاتووی ئەمریکا لەگەڵ ولاَتانی ناوچەکە گوتی: ئەمریکا ئامادەیە تاکوو یارمەتی بە راهێنانە درێژماوە نیزامییەکان لەناوچەکەدا بکا. ئێستا لەبیری ئەوە داین کە چوون پەرە بە سوپایەکی بەرگریانە بدەین کە بتوانێ پارێزگاری لە سنوورەکان و کەلکوەرگرتن لە کەرەستەکان بۆ بەرگری لە ولاَتدا بکات. ئەمە بە مانای رێکخستنی سیستمی هێرشبەرانە نییە. "

(٣) رادیۆ BBC، 16/11/1381.

(٤) "پێگە کەم بەهاکانی ئەمریکا لە ئاسیای نێوەڕاستدا"، کۆماری ئیسلامی، ١٣٨١/١١/١٧.



خەبات لە دژی ئیسلام لە جۆری تالیبانی بوو بە یەکێك لە گرینگترین و خێراترین ئەولەوییەتەکانی سیاسەتی دەرەکی کۆشکی سپی، گرینگی ناوچەگەلی وەك ئاسیای ناڤین و ولاَتانی هەڵکەوتوو تێدا وەك ئوزبەکستان لە کۆبەندنی تێبینییە دەرەوەی سنوورییەکاندا زیادبوونێکی بەرچاوی بەخۆیەوە دی. کە لە دوو هۆکاری گرینگی خوارێ سەرچاوەی دەگرت: سەرەتا،ئەو رۆڵە گرینگەی کە ئەم ناوچەیە دەیتوانی لەبردنە پێشی ئۆپراسیۆنی نیزامی ئەمریکا لە ئەفغانستاندا بگێڕێ، دووهەم، چالاك بوونی توند ئاژۆیی ئایینی لە هێندێك لە ناوچەکانی ئاسیای ناڤین کە دەیتوانی یارمەتیدەر بێ لە بەهێز کردنی بەریانە رادیکاڵەکان، لەم ناوچەیەدا. کۆی ئەم پرسانە، وای لە ئەمریکا کرد هەتا لە ولاَتانی وەك ئوزبەکستان نزیك بێ. وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکا لە کاتی سەردانی بۆ ئوزبەکستان رایگەیاند کە بەرژەوەندی ولاَتەکەی لەم ولاَتەدا هەمیشەییە. ئەو گوتی: بەرژەوەندی ئێمە بەو جۆرەی کە ئێمە لەبەرچاومان گرتوو، بە شێوەی بێمەرج درێژ ماوەن، من و سەرۆك کۆمار کەریم ئۆف" لەم پێوەندییەدا ئاڵوگۆڕی بیروڕامان کردووە. بەرژەوەندی ئێمە ئەم ناوچەیە دەبێ بەردەوام بێ، بۆیە پێوەندییەکانی ئێمە دوای کێشەی (ئەفغانستان)یش درێژەی دەبێ."[1]

بەریانی ئایینی ناوچەی ئوراسیا بەتایبەتی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز بۆلای رادیکالیزمی نەریتی (گەشەی وەهابییەت) بووە هۆی ئەوەی کە کاراکتەرەکان نیگەرانی ئاسایشی بەرژەوەندی خۆیان لەناوچەکەدابن. "ئیسلامی سیاسی"و "ئیسلامی بناژۆخواز" لە واژەگەلێکن کە بۆ گەشەی ئیسلامی سیاسی کەڵکی لێوەر دەگیرێ. "ئەگەر چی کورە ئیسلامییەکان زۆر پشتیوانیان لە ئیسلامی سیاسی لە ئاسیای ناڤین و قەفقاز نەکردووە و ئیسلامی سیاسی نەیتوانیوە رێبەرانی کارێزمای بە کۆمەڵگا ئیسلامییە سەربەخۆ نوێیەکان بناسێنێ. ئەم راستییە حاشا هەڵنەگرە کە ئیسلام بۆ رۆژئاوا بەمەترسییەکی گرینگ بە ئەژمار دێ".[2]

لە روانگەی کارناسانی ئەمریکاییەوە، ئەگەر رەوتی نەخوازراو رووداوگەلی وەك گەشەی بناژۆ خوازی ئیسلامی، تێکهەڵچوون لەنێوان رووسیە و کۆمارەکانی ئاسیای نێوەڕاست بەهۆی

(١) مەهدی ئەمیری، "لاپەڕەیەکی نوێ لە پێوەندییەکان لەنێوان ئەمریکاو ئوزبەکستان:، بژاردەیەك لە رووداوەکانی جیهان، خەرمانانی ١٣٨١.

(2) Paul a. Goble, "Back on the Map. The Geopolitics, Cantral Asia", on: 2 (8), 1997.

پرسە ئەتنیکیو سەرزەوینیو سەرچاوە کانزاییەکان، کێشەی بەریانە ئەتنیکیکان و گەشەی چەکە ناوکییەکان، ناوچەکە بەرەو ناسەقامگیری ببا، کاریگەری لەسەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا دادەنێ[1]. لە سەردەمی پێش جۆرج بوش هاوکات لەگەڵ سیاسەتەکانی ئابلۆقە دژی ئێران، هەبوونی ئابوورییەکی کاریگەریانە بەتایبەتی لە پیشەسازی نەوت و گاز پێشگیری لە کریدۆری رۆژهەڵات بۆ رۆژئاوا، لە پڕبایەخترین هۆکارەکانی سەرنجی حکوومەتی کلینتۆن بۆسەر ناوچەی ئاسیای ناوەڕاست،کۆنترۆڵکردنی جووڵانەوە ئیسلامییەکان بوو. بەڵام جۆری مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەم دیاردەیەدا جیاواز بوو. بە واتایەکی تر، رۆژئاواو شرۆڤەوانانی رۆژئاوایی کەڵکیان لە پروپاگەندە دەکردو رووسیە و جووڵانەوەکانی ناوچە و هەروەها، هاوپەیمانی ئەمریکا واتە تورکیە رێگای توند و تیژانەیان دەگرتە بەر.

لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر چی حکوومەتی بوش بە سانایی تاڵیبانی رووخاند،بەڵام هێشتا بە تەواوەتی مەترسی، لانەچووە. زێدەباری ئەوە، زۆربەی دەسەڵاتدارانی تاڵیبان، هەروەها هێزەکانی ئەلقاعیدە لەناوچەکانی دەوروبەر، خۆیان حەشار داوە. لەوانە، ناوچەگەلێك کە بە سەرزەوییە دەست پێرانگەیشتووەکان بەئەژمار دێن،وەك چیاکانی باکووری رۆژهەڵاتی ئەفغانستان و باشووری قرقیزستان.

ناوچەی باشووری قرقیزستان لە دوو ساڵی رابردوودا بارودۆخێکی لەبارتری بەخۆیەوە بینییەوە تاکو لەو رێگایەوە هێزە ئیسلامییەکان دزە بکەنە ناو ئاسیای ناوەندییەوە. هەر بۆیە، چاودێری و ئابلۆقەی ئەفغانستان بۆ پێشگیری لە پەرەگرتنی پرسە تروریستییەکان و کۆنترۆڵی هەر چەشنە هزری توند ئاژۆییانە لە نیشانەکانی گرینگی ئیستراتیژیکی ئەمریکایە کە لە ئاسیای ناڤین بەڕێوە دەچێ.

ئەم بەشە لە نیگەرانییەکانی ئەمنییەتی ولاتە یەکگرتووەکان هاوتابوو لەگەڵ روانینی زۆرینەی حکوومەتەکانی ئاسیای ناوەند و قەفقاز. بۆ نموونە، ئیسلام کەریم ئۆف، سەرەك کۆماری ئوزبەکستان، لە وتووێژێکدا لەگەڵ رادیۆی ئوزبەکستان، گوتی" لە راستیدا، ئەمریکا رۆڵێکی گرینگی لە مەڕ لەناوبردنی تاڵیبانو ماشێنی شەڕی تیرۆریزمدا هەیە. لە ئاکامدا،

---

(١) تورەج حاتەمی، "هاوتەریب بوونی بەرژەوەندی ئەمریکا و رووسیە لە ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز"، رۆژنامەی رەساڵەت، ١٣٨١/٥/٢٧



ئەوان ئوزبەکستانیان بەدەست هێرشی نیزامیو ئیدیۆلۆژی رزگار کردووە. "ناوبراو لە درێژەدا ئاخاوت: "بە بۆچوونی من، ئەوان تاکو کاتێك دڵنیا نەبن لە بارودۆخی ناوچەکە، بۆپارێزگاری کردن لە ئێمە لێرە دادەمێننەوە".

بەرەنگاری نیزامی ئەمریکا نەك هەر یارمەتی بە سەرەك کۆماری ئوزبەکستان کرد هەتا جووڵانەوەی ئیسلامی لە ئوزبەکستان لەناو ببات بەلکو یارمەتییەك بەبڕی ١٦٠ ملیۆن دۆلاریشی وەرگرت. ئەم جووڵانەوەیە کە پێگەیەکی جێی متمانەی لە ئەفغانستاندا هەبوو، بە هێرش کردنە سەر ناوچە سنوورەییەکان جار دەگەڵ جار ئاڵۆزتر دەبوو. لە هەموو گرینگتر، جیهانبینی واشنگتۆن لەگەڵ روانینی تاشکەند لە چەند ساڵی رابردوودا یەکدەگرێتەوە: سەقامگیری هەنووکە لەلایەن شەڕکەرانی ئیسلام هەڕەشەی لێ دەکرێ و دەبێ لێبڕاوانە دژیان خەبات بکرێ.

بە گوێرەی هێندێك لە راپۆرتەکان، دوای هاوهەنگاویی لەگەڵ ئەمریکا، کالین پاوەڵ، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە کاتی سەردانی بۆ ئوزبەکستان، نامەی جۆرج بوشی دابە ئیسلام کەریم ئۆف کە بە راشکاویی باسی ئەوەی تێدا کردبوو کە واشنگتۆن بەتەواوەتی پشتیوانی لە هەوڵەکانی خۆی بۆ گەشەی سیاسەتی سەربەخۆیی دەرەوە دەکا بە شێوەی سەرەکی یارمەتی هاتنە دەرەوەی تاشکەند لە بیاڤی ژێر دەسەڵاتی رووسیەدا دەکا.

بەرپرسانی ولاتانی ئاسیای ناوەڕاست لەمەڕ راکێشان و وەرگرتنی هاریکارییە جۆربەجۆرە دەرەکییەکان هەوڵ زۆر دەدەن. ئەم مژارە جاروبار لە ئاخاوتنەکانی بەرپرسانی ئەم ولاتانە لە هەمبەر نیگەرانیان لە پەرەسەندنی نائارامییەکان لە ئاسیای ناوین، کاریگەری بەردەوامی ئاڵۆزییەکان لەسەر گۆڕانە ناوچەییەکان و گەورەپێشاندانی نیگەرانی ولاتانی وەك ئوزبەکستان و قرقیزستان لە مەڕ گرووپە توندئاژۆ ئیسلامییەکان، هێندێك لە ناوەندە حکوومەتییەکان هەژاری و بێکاریان بە هۆکاری سەرهەڵدانی گروپە ئیسلامی خوازەکان لەناوچەکەدا لەقەڵەم دەداو بە بەهێزکردنی پێوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ ولاتانی دەرەکی و راکێشانی سەرمایە دەرەکییەکان ئامانجی زاڵبوونی بەسەر ئاڵۆزی و ئاریشە ئابوورییەکانی خویانیان هەبووە. زێدەباری ئەوەیش، ئەم باوەڕانە لەناوچەکەدا بەهێز بووە کە پێوەندییە ئابوورییەکان لەگەڵ ئەمریکا، وەرگرتنی پشتیوانی ماڵی لە دامەزراوە نێونەتەوەییەکان، هەروەها وەرگرتنی یارمەتی دەرەکی دەتوانێ بوار بۆ هاندانی کۆمپانیای دەرەکییەکان بۆ سەرمایەگۆزاری لە بەشە

پیشەییکانی ولاّتانی ناوچەکەدا خۆش بکا. لە کۆتاییدا، یارمەتی بە پێشکەوتنیو گەشەی ئابووری، پتر بوونی داهات و سەرمایەگۆزاری نەتەوەیو باش بوونی رەوشی ئابووری، کۆمەلاّیەتیو سیاسیو ولاّتانی ناوچەکەدا دەکا.

**٢) چەکە کۆمەلّکوژەکان**

پرسی زۆر بوونی چەکە ناوکیو کۆمەلّکوژەکان لە مژارە سەرەکیو شوێندنەرەکان لەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بووە. دوای هەرەسهێنانی یەکیەتیی سۆڤییەتیش ئەم نێگەرانییە لە ئارادا بوو، چونکە ئەمریکا نەیتوانی لە سالاّنی دواتردا بە گوێرەی رێککەوتنەکانی ئیستارت لەگەلّ رووسیەدا بە رێککەوتن بگات و دوای دامەزراندی ولاّتە نوێیەکان کە هێندێك لەوانە وەك هێزی ناوکی بە ئەژمار دەهاتن ئاریشەکانی رابردوو سەرلەنوێ سەری هەلّدایەوە. لەنێو ولاّتانی ئاسیای ناڤین، قەزاقستان چوارمین ولاّتی هێزی ناوکی جیهان، کەوتەبەر سەرنجی کارناسانی ئەمریکا. نووسینی وتارێك لەمەڕ فرۆشتنی موشکەکانی ئێس، ئێس ١٨ بە ئێران و ولاّتانی دیکە جیهانی سێهەم پەرەی بە پانتایی ئەم نیگرانییانە داوە، تاکو لە سالّی ١٩٩٢ قەزاقستان بەفەرمی رەزامەندی خۆی لەسەر واژۆ کردنی پەیمانی کەمکردنەوەی چەکە ئیستراتیژییەکاندا.

لە روانگەی ئەمریکاوە، پێویستە تاکو هەرچ خێراتر چەك و تکنۆلۆژی ناوکی و چەکە پێشکەوتووەکان لەم ناوچەیەدا کۆنترۆلّ یان لەناو ببرێن، ئەمریکا گەلاّلەی راگواستنی چەکە ناوکییەکانی شوورەویی دارِشتووە و گرینگی زیاتری داوە بەم ولاّتانەی کە چەکی ناوکییان وەبەر کەوتووە، لەم بارەوە ئەمریکا یارمەتی بە رووسیەو سێ کۆماری (قەزاقستان، ئوکراین، رووسیەی سپی) دەدا تاکو هێزە ناوکییەکانی خۆیان لە نێو ببا، یان بیپارێزن، لە بەرانبەر ئەو کارەدا بەلّێنی دانی یارمەتی مالّیی پێداون.(١)

**٣) پەرەپێدانی ناتۆ**

سیاسەتی دیکەی ئەمریکا لە بواری نیزامی و ئەمنییەتی، هەولّدان بۆ هێنانی ولاّتانی ئاسیای ناوین و قەفقاز بۆ بیاڤی پێوەندییە ئەمنییەتییە رۆژئاواییەکان و بەشداری لە کۆنفرنسی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا و پلانی هاوبەش بۆ ئاشتییە. ئەمریکا بەم کارانەی لەهەولّی دابەزاندنی باندۆری رووسیە لەم ناوچەکە و پتەوتر کردنی پێگەی خۆیەتی. ناتۆ بە شێوەی گشتی و ویلایەتە یەکگرتووەکان بە شێوەی تایبەتی لە ماوەی سالاّنی رابردوودا بە

(١) ئەسەدولّلا مونفەرید، س پ



گەلاّلّەی جۆراوجۆر لە هەلی پەرەپێدانی ناتۆ بەرەو رۆژهەلاّت دان و تاکو دزە بکاتە ناوەوەی ستراکتۆری نیزامی رکەبەری کۆنی خۆی واتە کۆی کەوشەنی پێشووی سۆڤییەت، ئەم سیاسەتە، بە بەریانی یەك بەدوای یەکی رێبەرانی کۆمارەکانی ئاسیایی بۆ هاوکاری لەگەلّ ناتۆ، زۆر سەرکەوتوو بووە. دانی بەلّێنی سەرمایەگوزاری رزگاریدەرانە لە پالّ بەرگریو دامەزراندنی ئاشتی، ئامانجگەلێکی لەبارن کە ملیۆنان مرۆڤ بڕوایان پێی هەیە.

بەرە بەرە گشت ئەندامانی پێشووی "پەیمانی وارشۆ" دوای سالّی ١٩٩١بوون بە ئەندامی ئاتلانتیکی باکوور. لە مارسی ١٩٩٢ گشت ولاّتانی سەربەخۆی هاوقازانج واتا ولاّتانی ئاسیای نێوەڕاست و قەفقاز بە ئەندامانی شوورای هاریکاری ئاتلانتیکی باکووری وەرگیران. ناتۆو ئەمریکا بە پەرەدانی چالاکییەکانیان لە ولاّتانی رۆژهەلاّتی لەوانە ولاّتانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز، بە دوای چاودێریو شوێندانان لەسەر ئەم رەوتە سیاسیانەی کە لە بوارگەلی جۆراوجۆر لە ئارادا بوون هەتا بە شێوەیەك بتوانن پێش بە رووداوە نەخوازراوەکان بگرن. لە ژانوییەی ١٩٩٤دا یەکەم هەنگاو بۆ پەرەپێدانی ناتۆ بە پلانی "بەشداری بۆ ئاشتی" دەستییپێکرد. بەلاّم لە بەرانبەر گوشارە چڕەنێوخۆییەکان بۆسەر رووسیە و رەنگدانەوەی سیاسەتی دەرەکی ئەم ولاّتە هەتا سالّی ١٩٩٧ پەرەپێدانی ناتۆ بۆ رۆژهەلاّت راگیرا.

بە وەرگرتنی رووسیە لە کوی حەوت ولاّتی پیشەیی یەکەمین قۆناخ لە پەرەی ناتۆ لە رۆژهەلاّتدا دەستی پێکرد. لە ٢٧ی مای ١٩٩٧ رێبەرانی شانزە ولاّتی رێکخراویی ئەتلانتیکی باکووری رووسیە بەلّگەنامەکی بە ناوی "بەلّگە نامەی بنچینەیی لە هەمبەر پێوەندی بەرانبەر، هاوکاری و ئاسایشی نێوان ناتۆو رووسیە لە پاریس واژۆیان کرد کە رەوشی هاوکارییە ئەمنییەتیەکانی نێوان دوژمنە کۆنەکانی لەخۆ دەگرت. گرێمانە لەسەر ئەوە بوو کە بە واژۆ کردنی ئەم بەلّگەیە، مسکۆ بەرانبەر بوونی پێوەندی ئەمنییەتی بەتایبەتی لەگەلّ رۆژئاوا لە دژایەتی ئاکتیڤ لەگەلّ پەرەی ناتۆ بۆ رۆژهەلاّتی ئەورووپا خۆی دەبورێت. پاشان لە دانیشتنی رێبەرانی ناتۆ لە ئیتالیا (٢٠٠٢) رووسیە رازی بوو بە فەرمی لە بڕیاردانەکانی ناتۆدا بەشداربیکا.

**٤) ئەمنییەتی هێلّی بۆریی وزە**

لەیاری گەورەی ئاسیای ناوەڕاست و ئەو ولاّتانەی کە رەنگە رەوگەی گواستنەوەی سووتەمەنی لەوێوە تێپەڕ بێ، وەك ئێران، ئەفغانستان، رووسیە و تورکیە و... ولاّتانێك هەن کە خۆیان بەرهەمهێنەری مەوادی سوتەمەنین، بەرهەمەکانی ولاّتانی بەرهەمهێنەری نەوت و گازی

ئاسیای ناڤین دەبێ بگاتە بازاڕەکان. لە گەڵ ئەوەیشدا، گواستنەوەی نەوت و گاز لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر ئیمکانی باندۆرو تەنانەت چاودێری سیاسیش دەڕەخسێنێ. بەم پێیە، ئەمریکا بۆ پشتیوانی لە کۆمپانیا نەوتییەکان کە لەم وڵاتانەدا سەرمایە گوزارییی یان کردووە و بە مەبەستی دژایەتی کردن لەگەڵ ئێران، بە شێوەی گشتی پلانی دامەزراندنی هێلی بۆری لە ریگەی خاکی تورکییەوە بۆ راگواستنی نەوت و گازی دەریای خەزەر قەبوولکردووە. رێورەسمی کردنەوەی پرۆژەی سێ ملیارد دۆلاری "فیلی سپی" (هێلی لوولەی باکۆ ـ تەفلیس ـ جیهان) لە ١٨ی سپتامبری ٢٠٠٢ بەڕێوە چوو. فێدر یکۆپنا، وەزیری پێشووی وزەی ئەمریکا، لەم بارەوە دەڵێت "حکوومەتی ئەمریکا دژی گواستنەوەی نەوت لە رێگای ئێرانەوەیە، چونکە ئێمە دەمانهەوێ پێش بەوە بگرین کە ئێران دەروازەی وزە لە ناوچەکە بێ کە بۆ ئێمە بایەخی هەیە".[١]

لەلایەکی دیکەوە، پرسی چیچان و رکەبارییەتی نهێنیی رووسیە و ئەمریکا، کریدۆری باشوورو باکوور، ناسەقامگیری لە ئەفغانستان، کریدۆری رۆژئاواو رۆژهەڵات و یاسای "داماتۆ" دژی ئێران، کریدۆری باکوورو باشوور لە ئاستی ئەم رکەبەرایەتییە کەم دەکاتەوە.

داغستان کە یەکێکە لە ناوەندەکانی گەشەسەندنی ئیسلامخوازی، بووەتە هۆکارێك کە هەم رۆژئاواو هەم رووسیە نیگەرانی داهاتووی ئەم ناوچەیە بن، چونکە داغستان ٧٥٪ سنووری دەریایی لەگەڵ رووسیە لە دەریای خەزەر پێکدەهێنێ و گەلاڵەی بۆڕی گەورەی کە لە خەزەرەوە بۆ دەریای رەش پەیوەست دەبن، لەوێوە تێپەڕ دەبێ.[٢] دەزانین کە سێ ساڵ دوای ئەو شەڕانەی کە بۆ خودموختاری چیچان هاتە ئاراوە، ناوچەی قەفقاز جارێکی دیکە تووشی نائارامیو بشێویی هات و ئەم جارە راپەڕین و تێکهەڵچوون لە رۆژهەڵاتی چیچان لە داغستانی رووسیە دەستی پێکرد. لە ١٦ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٧٨ھ (بەرانبەر بە ١٩٩٩ز) نزیکەی دووهەزار چەکدار لە سنووری چیچان هێرشیان کردە سەر دوو پارێزگای داغستان بە ناوەکانی بۆتلیخ و ستومادین و پاش چەند رۆژێك لەگەڵ پاشەکشە کردن بەهێزکانی رووسی، داغستانییەکانی نیشتەجێی لەناوچەکەدا توانیان دوو هەرێم داگیرو حکوومەتی سەربەخۆ

(١) وینفرید ئاشنایدر دیترز، "قەفقاز باشووری: تێکهەڵچوونە نێوخۆییەکان و بەرژەوەندییە دەرەکییەکان". گۆڤاری توێژینەوەکانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز ، پاییزی ١٣٨١.

(٢) عەلیرەزا نووری، "داغستان ناوەندی نوێ ئاڵۆزی قەفقاز"، گۆڤاری بۆچوونەکان و شەوقەکان، ژمارەی ١٣١، لاپەڕەی ٥.



رابگەیەنن. بە گوێرەی بەڵگە و دیکۆمێنتەکان، هێرشبەران لە دەستەی شامیل باسیف، رێبەری خەباتگێڕانی چیچانی کە پشتیوانی لێ دەکردن، بوون. لایەنە چالاکە وەهابییەکان لەناوچەکە، هەروەها حکوومەتەکانی بیاڤی کەنداوی فارسیش پشتیوانیان لێدەکردن، ولادیمێر راشیلۆ، وەزیری وڵاتی رووسیە، رایگەیاند کە هێندێك لە هاووڵاتیانی توندئاژۆی وڵاتانی وەك پاکستان و عەرەبستانی سەعوودی و ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی یارمەتییان بە دوایین راپەڕینی داغستان داوە، کە ئەم خەڵکانە لەلایەن رێکخراوە تیرۆرسیتییەکان و جیایی خوازەوە بۆ ناوچەکە نێردرابوون.[١]

**٥) دۆزینەوەی پێگەی نیزامی نوێ ئاڵترناتڤێکە بۆ پێگەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە کەنداوی فارسو وڵاتە عەرەبییەکان**

مەسەلەی ئەفغانستان و بنلادەن و پێوەندی ئەلقاعیدە لەگەڵ وڵاتە عەرەبییەکان تا رادەیەك بووە هۆی نارەزایەتی هێزەکانی یەکگرتووی عەرەبی لە کردەوکانی ئەمریکا لە هەمبەر سەرکوتی ئەلقاعیدە و تالیبان. وڵاتانی عەرەبی لە پشتیوانانی حکوومەتی تالیبان بوون و هەنووکە وەها ناکۆکیگەلێك گەلێ بۆچوونی جۆراوجۆری لەنێوان عەرەبەکان و ئەمریکا لەمەڕ ئەفغانستان هێناوەتە ئاراوە. شیمانەی ئەوە دەکرێ کە بنلادەن و هێزەکانی وەفاداری لە وڵاتە عەرەبییەکان ببنە هۆی لاواز بوونی ئەمریکا لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناڤین و کەنداوی فارس، حکوومەتی ئەمریکا لەم دەرفەتە کەڵکی وەرگرتووە هەتا کۆمەڵێك لە هێزەکانی بۆ نێو خاکی ئەفغانستان و ئاسیای ناڤین رابگوێزێت و ئەوان لە ئەگەری هێرشی نیزامی و تیرۆریستی هێزەکانی بنلادەن بپارێزێ.[٢]

**٦) تێبینییە ئابوورییەکان**

لەم بوارەدا چەند تێبینییەك شایانی سەرنجدانە کە گرینگترین تەوەرەکانی بریتین لە: دابەزاندنی بەستراویی بە نەوتی کەنداوی فارس لە درێژ ماوەدا،[٣] دامەزراندن و دۆزینەوەی بیاڤە نەوتی و گازییە نوێیەکان و هێڵەکانی راگواستنیان بۆ بازاڕی بەرخۆر، دۆزینەوەی

(١) ئێران، ٦٨٧/٢،

(٢) موسا ئەلرەزا وەحیدی، "بوونی نیزامی ئەمریکا لە ئاسیای ناڤین و قەفقاز، دژکردەوەی رووسیە"، وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز، ژمارە ٣٧، بەهاری ١٣٨١.

(3) http: www.energyHopress/releaseso1/ Maypr/ energy– policy–htm.

بازاڕێك بۆ كەلوپەلی بەرخۆری بۆ ركەبەرایەتی لەگەڵ چین و وڵاتانی دیكەی ناوچەكە. لە درێژەی باسەكەدا تێبینییە ئابوورییەكانی ویلایەتە یەكگرتووەكان لەناوچەی ئاسیای ناوەندیدا لێكدانەوە لە سەر دەكرێ.(1)

١ـ گەڕان بە دوای پاشكەوتە ئیستراتیژیكییە نوێیەكان و ئەڵتەرناتیڤ

به سەرنجدان بە زیاتر بوونی قەیران لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ڕەوتی بەرەو گەشەی ناڕەزایەتی عەرەبەكان لە ئەمریكا، هەنووكە ئاسیای ناڤین بۆ وڵاتە ڕۆژئاواییەكان گرینگییەكی زۆری هەیە. بەراوردی كانزاكانی دوو ناوچە كەنداوی فارسو ئاسیای نێوەڕاست ڕێتێچوونی گۆڕانەكانی ناوچەییەكانی لە داهاتوویەكی نزیكدا ڕێنوێنی دەكا: ٦٧٩ ملیارد بەرمیل نەوت (٦٥٪ پاشكەوتە ناسراوەكانی جیهان)و ٣٥٪ پاشكەوتی گازی جیهان لەناوچەی كەنداوی فارس هەڵكەوتووە. لەلایەكی دیكەوە بە گوێرەی تازەترین لێكۆڵینەوەكانی ئەنجام دراو، بەراورد دەكرێ كە پاشكەوتە ڕاستەقینەكانی نەوتی قەفقازو ئاسیای ناوەندی دەگاتە ٢٣٥ ملیارد بەرمیل، بە پێی لێكولینەوەكان، ئەم مەسەلەیە نیشاندەدا كە ئاسیای ناوین دووهەمین ناوچەی گرینگی چاوگی وزەیە لە جیهاندا. پاشكەوتەكانی گازی ناوچەی ئاسیای ناڤین و قەفقاز نزیكەی ٣٤٪ پاشكەوتی گازی جیهان پێكدێنێ،بەم جۆرە ئاسیای ناڤین وكەنداوی فارس لە ڕووی پاشكەوتی گازەوە جیاوازییان نییە.

ئەسپنسر ئابراهام، وەزیری وەزی ئەمریكا، ڕۆژی ٢٠ی ژووئەنی ٢٠٠٢ لە بەرانبەر ئەندامانی كۆمیتەی ناوەندی كاروباری نێونەتەوەیی پارلمانی نوێنەران جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كە لە ساڵی ٢٠٢٠ هاوردەكانی لەناوچەی كەنداوی فارسەوە نزیكەی ٢٦ لە سەدی پێداویستی ئەمریكا لەخۆ دەگرێ. لەم نێوانەدا، ڕەنگە ئەوروپا پتر لە ئەمریكا بە كەنداوی فارس بەستراوەبێ. كارناسان لەو بڕوایەدان كە لە ساڵی ٢٠٣٠ ئەوروپا ناچار دەبێ تاكو ٩٢٪ نەوت و ٨١٪ گازی بەرخۆری خۆی لەم ناوچەیەدا بەرهەڤ بكا. بەرپرسانی ئێدارەی وزەی نەتەوەیی ئەمریكا ئەم بارودۆخە بە"هەڕەشە بۆسەر ئەمنییەتی نەتەوەیی" لێكداوەتەوە و بە دوای وەبەرهێنانی چاوگی نوێی گازو نەوتن. هەروەها پێشنیاز كراوە كە توێژینەوە لەمەڕ شێوازگەلی نوێی بەرهەمهێنانی وزە پەرە بدرێ.

(١) ئەم تێبینییانە بە دەستكارییەكی كەمەوە لەم چاوگەی خوارێ وەرگیراو: تەهمیە عەزیزی "ئیستراتیژیكی ئەمریكا لە ئاسیای ناوەندی" هەمان سەرچاوە.



هەنووكە، ئەمریكا هەوڵدەدا لەم ناوچەیەدا پەرە بە دەسەڵات و ڕۆڵی پترلە ناوچەكە بگێڕێ. كەڵكوەرگرتن لەسەرچاوە نەوتییەكان، دروستكرنی پاڵاوگە، دروستكردنی كەرسەو پێویستییە ماڵییەكانی لەم وڵاتانە ئەم دەرفەتەی بە ئەمریكا دەدا هەتا بە كەڵكوەرگرتن لە شێوازگەلی دانی یارمەتی ماڵی كەم تێچوو و هەڵخەڵەتێنەرانە، جێ پێی خۆی لەناوچەی ئاسیای ناڤیندا پتەو بكا، سەرچاوە وزەكان و پاشكەوتە نەوتیو گازییەكان لە ئاسیای ناڤیندا هێندە گرینگی بۆ ئەمریكا هەیە،كە تەنانەت ئامادەیە كە هاوكاری ماڵی توركمەنستان (لەگەڵ بوونی پێشینەی هاوكاری لەگەڵ تاڵیبان، هەروەها خۆبواردنی عیشق ئاباد لە هاریكاریكردنی ئەمریكا لە شەڕی دژە تیرۆریزم لە ئەفغانستان)دا بكات. هەبوونی هێڵی سنووری لە دەریاری مازندەران، بوونی پاشكەوتی نەوت گازو پێویستی ئەم وڵاتە بە سەرمایەدانانی دەرەكی بۆدەرهێنانی ئەم سەرچاوەگەلە لە هەرێمی ئاویی توركمەنستان، لە هانەگەلی ئەمریكایە بۆ یارمەتی كردن بەم وڵاتانە بە ئەژمار دێ. لەگەڵ ئەوەی كە بەهێزكردنی پێوەندییەكانی ئەمریكا لەگەڵ توركمەنستان دەتوانێ هۆكارێكی شوێندانەربێ، بۆ هاتنی واشنگتۆن بۆ ناو هاوكێشەكانی دەریاری مازندەران لە داهاتوودا.(1) پاشكەوتی گازی توركمەنستان دەگاتە ٢١ملیارد میتری چوار گۆشە و ئەم شوێنە چوارەمین پاشكەوتی گازی جیهانی لەخۆ گرتووە.(2)

لەلایەكی ترەوە، گرینگی نەدانی ئەمریكا لە دانی یارمەتی ماڵی بە قەزاقستان لەڕاستای ئەم ئامانجە، شیاوی هەڵسەنگاندنە. چارەسەر نەكردنی مەسەلەكانی پێوەندیدار بە سەرمایەگۆزاری دەرەكی، هەروەها ڕوون نەبوونی چۆنییەتی ڕێژەی دانی سەرانەی كۆمپانیا ئەمریكاییەكان دەتوانێ سیاسەتی سزادانی لەلایەن ئەمریكاو بایەخنەدانی ئەم وڵاتە بە قەزاقستان لە دانی یارمەتییە ماڵییەكان بێ. بەڵام لە هەمووی گرینگتر پێشینەی سیاسەتی ڕێبەرانی قەزاقستان لە هەمبەر یاساغ كردنی هەناردنی نەوتە بۆ ئەمریكا، ڕوون نەبوونی ڕەوشی هاوكاری و بەشداری قزاقستان لە گواستنەوەی نەوت لە هێڵی بۆڕی نەوتی باكو- جیهان لەتەنیشت ناوهێنانی ئێران وەك یەكێك لە

(١) ئەمیر حوسێن ئەسدوڵلاهی مونفەرێد، "ئامانجگەلی ئەمریكا لە دانی یارمەتی ئابووری بە كۆمارەكانی ئاسیای ناوەندی"، بژاردەیەك لە گۆڕانكارییەكانی جیهان، ڕەشەممە ١٣٨١.

(٢) محەممەد قراگۆزلو، "ئەمریكا، عێراق، كومێدی یان تراژیدیا؟" ئیتلاعاتی سیاسی ـ ئابووری، ژمارە ١٨٠ـ ١٧٩، لاپەڕەی ١٠٠.

جێنشینانی راگواستنی نەوتی قزاقستان بۆ بازاڕی بەرخۆر دەتوانێ لە هۆکارگەلی بێ‌مەیلی ئەمریکا لەمەڕ حکوومەتی ئاستانەدا بێ. زێدەباری ئەوەش، هاوکاری هێندێك لە کاربەدەستانی نیزامیو ئەمنییەتی قەزاقستان لە مەڕ راگواستنی چل فرۆکەی شەڕکەری میگ بۆ کوریای باکووری ناکرێ لەبەرناچاو نەگیرێ، بەتایبەتی دەبێ ئاماژە بە حکوومەتی ئەمریکا لە دانانی قەزاقستان لە دەستەی ولاتانێك کە توانای بەهەراهێنانی چەکی بیولۆژیکیان هەیە بکەین.[1] بۆ بەڵگەکانی ئاماژە پێکراو دەبێ ئەوەی پێ زیاد بکەین کە پاشکەوتی ئەم ناوچەیە هی ئەو ولاتانەیە کە زۆربەیان ئەندامی ئۆپێك نین و پتر لە رووی سیاسییەوە، بەریانی رۆژئاواییان هەیە. هێنانی نەوتی خەزەر بۆ گورەپان دەتوانێ ببێتە هۆی لاواز بوونی بناغەی ئۆپێك، گوشار خستنەسەر سیاسەتی نرخ دانانی عەرەبستانی سعوودی و ولاتانی دیکەی ئەندامی ئۆپێك کە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی دابەزینی رادەی نرخی نەوت لە جیهاندا. بە سەرنجدان بەوەیکە ٦٥٪ پاشکەوتی نەوتی جیهان لەناوچەی رۆژهەلاتی ناڤین هەلکەوتووە و لەم رێژەیە، نزیکەی ٢٥٪، واتە ٢٦١ ملیارد بەرمیل هی عەرەبستانی سعوودییە، لە روانگەی حکوومەتی ئەمریکاوە، پتر لە ٢٠٠ ملیۆن بەرمیلی نەوتی دەریای خەزەرو ئاسیای ناوەڕاست دەتوانێ جێگرەوەیەکی زۆر گونجاو بێ. هەناردنی ١٠ ملیۆن بەرمیل نەوت لە رۆژدا بۆ ئەمریکا کە نزیکەی ١/٧ ملیۆن بەرمیل لەلایەن عەرەبستانی سعوودییەوە دابیندەکرێ، رێگا چارەیەکی بۆ کاربەدەستانی حکوومەتی ئەمریکا نەهێشتووەتەوە کە بۆ بەدەستهێنانی بەرزترین رادەی ئاسایشی ئابووری ئاسایشی سیاسیو نیزامی، بوونیان لەناوچەی دەریای خەزەر بە پێویست بزانن. بە سەرنجدان بەوەی کە نیوەی ئەو رادەیە لە پترکردنی دەرهێنانی نەوت لە جیهاندا لە دەیەی ٩٠ ئەمریکا مەسرەفی کردووە، ئەم ولاتە لە پشتیوانانی سەرەکی دامەزراندنی هێڵەکانی رۆژهەلاتی ـ رۆژئاوایی بۆ گواستنەوەی نەوتە بۆ بازاڕی ئازاد و لەم بوارەدا، دروستکردنی هێڵی بۆڕی غەیرە ئابووری، بەلام پڕبایەخی سیاسی "باکۆ ـ تەفلیس ـ جیهان" لە بیاڤی نەوتی "ئازەری"، "چراخلی"و گانچلی" لە سەرەوەی سیاسەتەکانی ئەمریکایە لەناوچەی دەریای خەزەردا.

٢. سیاسەتی هێڵەکانی راگواستنی وزە

بە سەرنجدان بە سنووردار بوونی زۆربەی ولاتانی بیاڤی ئورئاسیاو دەستپێڕا نەگەیشتنی ئەوان بە ئاوە گەرمەکان، چۆنییەتی راگواستنی نەوت و گاز دەرچواندنی هێڵە بۆڕیەکان لە

(١) ئەسد مونفەرید، هەمان سەرچاوە.



ولاتانی دراوسێ بۆ گەیاندنی نەوت و گاز بە بازاڕە نێونەتەوەییەکان و ولاتانی بەرخۆر، بووەتە یەکێك لە پڕکێشەترین باسە سیاسی و نەوتییەکانی جیهان و لەم رەوگەیەوە هەرکام لە ولاتانی ناوچەوزلهێزەکان تێدەکۆشن تاکو کەڵکی سیاسیو ئابووری لەم کارە بگرن، بە جۆرێك کەدەبێ بلێین ئەم مژارە بووەتە گەمەیەکی سیاسی. کاراکتەرەکانی ئەم گۆڕەپانە لایەنگەلی جۆربەجۆریان بۆ داڕشتنی نەخشەی رەوشی دەرچواندنی هێڵە بۆرییەکان لەبەرچاو گرتووەتە کە بە شێوەی کورتکراوەی خوارەوەیە:

ـ ئەمریکا پشتیوانی لە هێڵی باکۆ ـ جیهان دەکا کە ئەم پشتگیرییە بە مەبەستی گوشار بۆسەر رووسیەو تەریکخستنەوەی ئێرانە.[1]

ـ ئازەربایجان لە پێوەندییە سیاسییە ناوچەییو نێونەتەوەییەکانی لەگەڵ ئێران، تورکیە، رووسیە و ئەمریکا لە رەوگەی سەرەکی راگواستنی نەوت وەك کەرەسەیەك بۆ ئامانجە سیاسیو ئەمنییەتییەکانی خۆی کەڵك وەردەگرێ. هەر چەند جۆراوجۆری هێڵە بۆرییەکانی نەوت بۆ ئەم ولاتە باشترین هەلبژاردنە، لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا لەم بارەیەوە بە ئاکامێکی یەکلاکەرەوە نەگەیشتووە یان ئەوەی کە پێی وایە درێژە بەم گەمە سیاسییە بدا.

ـ حکوومەتی قەزاقستان بە راگەیاندنی سیاسەتی یەکلاکەرەوەی خۆی لە جۆراوجۆری رەوگە هەناردەیەکان ـ ئەولەوییەتی خۆی لەهەمبەر دروستکردن، کەلکوەرگرتن و سەرمایەدانان لە رێگاگەلی جۆربەجۆر لە نێو شك وگوماندا هێشتووەتەوە.

ـ رووسیە تێدەکۆشێ لە سیاسەتی خۆی لەنێوان رێژیمی یاسایی دەریاری خەزەرو دەرچواندنی هێڵی بۆڕی لە خاکی خۆیەوە بە سەرنجدان بە پرسە ئەمنییەکان هاوسەنگی پێکبێنێ. بەم حاڵە، ئامادە نییە پێگەی ئێستا خۆی بە هاسانی لە بەرژەوەندی جۆربەجۆری هێڵە هەناردەییەکان لەدەست بدات.

ـ ئێران لەو بڕوایە دایە کە هەلبژارنەکان دەبێ لەسەر بناغەی رێوشوێنە ئابوورییەکان بێ. هەر بۆیە، جۆراوجۆری هێڵە هەناردەییەکان بۆ گواستنی نەوت و گازو سیاسەتی ئابووری حاشاهەڵنەگرە، بەلام لەم رەوگەیە ئەولەوییەت گەلێکیش دەبێ لەبەرچاو بگیرێن.

(1) Wiliam E. odom, "us policy toward central Asia and The soutn caucaus," File: LD: Lminel chechnyal /31 1. hrml, 12/13/99.

- کۆمپانیا نێونەتەوەییە نەوتییەکان کەم و زۆر سیاسەتێکی لە چەشنی ئێرانیان گرتووەتەبەر، بەڵام هێندێکیان بە ناچاری پەیڕەویی لە سیاسەتی حکوومەتەکانیان دەکەن و هێندێکی دیکەیان بە تەنیا بڕیادەر نین، بەلکو رووداوەکانی ناوچەی باندۆری لە سەر بڕیاردانیان هەیە.(١) لە هەرحاڵدا، مەسەلەی راگواستنی وزە لەناچەی خەزەر، بیاڤی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز لە تەنگژە سەرەکییەکانی ئەم ناوچەیە بە ئەژمار دێ کە زلهێزە رۆژئاوایەکان بەردەوام لە هەمبەر ئەم پرسە پلان گەلێکیان داڕشتووە. ئەم بانگەشەیە دەگەڕێتەوە بۆهۆکارێکی تایبەتی: کەڵکوەرگرتن لە خوێندکارانی خوێندنگا ئایینییەکانی پاکستان، عەرەبستان، ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی بۆ کۆجێیی هێز لە ئەفغانەستان، پلانێك بوو کە لە ساڵی ١٩٩٤ بە ئامانجگەلی ئیستراتیژی دەگیرایەبەر. راست لە هەمان سەردەمدا کە تاڵیبان هێشتا لە ئەفغانستان بە تەواویی دەسەڵاتی بە دەستەوە نەگرتبوو، دانووساندن لەمەڕ نەوت و راگواستنی لە رێگای ئەفغانستانەوە، لەنێوان کۆمپانیا ئەمریکاییەکا نو کۆی کۆمپانیا رۆژئاواییەکان وتەنانەت شەریکەی دەڵتای عەرەبستانی سعوودی دەستیپێکرد. رووداوەکانی ١١ی سپتامبرو سەرنەکەوتنی تاڵیبان لە بەجێگەیاندنی پرۆژەکانی، ئاگادارین کە لەگەڵ نەبوونی سەقامگیری رەوشی سیاسی لە ئەفغانستاندا، وتوویژ لەسەر نەوت لەم وڵاتە بۆ راگواستنی گازی سرووشتی و نەوت و وزە لە ئاسیای ناوەندیو قەفقاز بە شێوەی گشتی لە بیاڤی خەزەر دەستیپێکرد. لەلایەکی دیکەوە، بێ ئاگایی تاڵیبان و نەبوونی تێگەیشتنێکی ورد و ژیرانە لە بارودۆخی نێونەتەوەیی و بارودۆخی لە حاڵی گۆڕانی جیهان دەرفەتێکی بۆ ئەمریکا پێکهێنا کە لە پانتاییەکی گەورە و بێ وێنەدا، بوونی خۆی لە ناوچەیەکی ئیستراتیژیکی جیهان جێگیر بکا. ئەمە هەمان ئەو ئامانجە بوو کە سەرۆك کۆمار جورج بوش لەسەردەمی شەڕی کەنداوی فارس لە ساڵی ١٩٩١ هەوڵیدا ئەم پرسە لەگەڵ بیرۆکەی نەزمی جیهانی بە رێبەری ئەمریکا بێنێتە ئاراوە کە لەگەڵ دژایەتی رووبەڕوو بۆوە.

٣. بە دەستەوەگرتنی بازاڕی سەرمایە و بازاڕی مەسەرەفی ناوچە:

ئەزموون نیشانیداوە کە هەرکات نیشانەکانی شکانی ئابووری دەرکەوتووە دواتر قەیرانگەلی نێونەتەوەیی و راکێشانی رای گشتیش هاتووتە ئاراوە. ئەگەر چی رەهەندەکانی

(١) "وزەو ژینگە لە دریای خەزەر"، گۆڤاری بۆچوونەکان و شرۆڤەکان ژمارە ١٣١، لاپەرەی ٣٦.



رووداوی ١١ی سپتامبری هێشتا روون نییە و یەکێك لەو هۆکارانە هەر ئەم پرسە ئابوورییانەی ئەمریکایە کە مەسەلەی ئەفغانستان بوارێکی نوێی بۆ چالاك کردنی ئابووری ئەمریکا پێکهێناوە. پرسی دەریای خەزەر، گواستنەوەی گاز لەوێوە و راوەستانی زۆربەی پلانەکانی ئەمریکا لە ئاسیای ناوەڕاست هەموویان دەرخەری ئەوەیە کە ئەم وڵاتە تێدەکۆشێ لەم قەیرانە رزگاری بێ. بوونی ئەمریکا لەناوچەکە جیا لە بوونی نیزامی، لەسەر هەڵسوڕانە ئابوورییەکانی ئەم وڵاتە شوێنواری ئەرێنی دادەنێ.

لەنێو بازاڕە ئابوورییەکانی جیهان، ئوراسیا لە هەموویان گەورەترە، ١٠٪ گەورەترە لە گشت ئەمریکای لاتین.(١) ئوراسیا بازاڕێکی گەورەی لە دوو قاڕەی ئاسیاو ئەورووپا پێکهێناوە کە بۆ سەرمایە دانان زۆر گرینگ بە ئەژمار دێ. لەلایەك، تواناکان و مەوداکانی ناوچەکو، لەلایەکی دیکە، دابەزینی ئابووری - مێژوویی ئەم بیاڤە لە ماوەی دەسەڵاتداری یەکیەتیی سۆڤییەت بووەتە هۆکارێك هەتا هەم کۆمپانیاکانی سەرمایە دانەری دەرکی بەچاوی تەماحەوە لەم ناوچەیە بڕوانن و هەم حکوومەتەکانیش لە رکەبەراتییەکی ئاشکرا بە دوای رێگاچارەگەلی گونجاوو بەکەڵك بۆ قەرەبوو کردنەوەی دابەزین و پاشکەوتنی ئابووری خۆیان بن.

کردەوە گەلێکی بەر فرە لە بواری سەرمایەدانانی لە ئورئاسیا جێبەجێ کراوە کە پێشاندەری گرینگی رۆژ لەگەڵ رۆژی ناوچەکەیە. لەو کارانە دەتوانین ئاماژە بە "بەرنامەی ئینوگێت"، "بەرنامەی فار"، "بەرنامەی ستلین"، "بەرنامەی تراسکا"و "سەرکەوتنە گشتگیرەکان" بکەین.

بەرنامەی ئینۆکێت لە ساڵی ١٩٩٥ بە هەشت وڵاتەوە دەست بەکار کرد و هەنووکە پتر لە پەنجا لێژنە لە نوێنەرانی وڵاتان و دامەزراوە ماڵی و رێکخراوە نێونەتەوەییەکان تێدا چالاکیان هەیە. دوو ئامانجی سەرەکی ئەم گەڵاڵەیە، دانی نەوت و گازی دەریای خەزەر بە کڕیارانی ئەورووپاییو وڵاتانی دەورووبەری دەریای رەش و راکێشانی سەرمایەدانانی نێونەتەوەیی بۆ نوێژەنکردنەوە و پەرەپێدانی تۆڕە نەوتیو گازییەکانە.

رێککەوتننامەی گشتگیریش کارێکی بونیادییە. سەرکردەی وڵاتانی ئەرمەنستان، ئازەربایجان، رووسیەی سپی، گورجستان، قەزاقستان، تورکمەنستان، ئوکراین، ئوزبەکستان،

(١) "دەرفەتی سەرمایەدانان لە بازاڕەکانی ئورئاسیا"، پەیامی ئەمرۆز، ژمارەی ٨، لاپەڕەی ٧٢.

مۆڵداویی و ڕۆمانیا بە مەبەستی تاوتوێ گەڵاڵەگەلی سەرمایەدانان کۆمەڵێك بواری هانسکاری بۆ دەرچواندنی نەوت و گاز لە سنووری ئەو وڵاتانەی کە ئەم هێڵە بەوێدا تێپەڕ دەبێ، واژۆیان کردووە.[1] گرینگترین تەوەرە گشتییەکانی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان لەناوچەی ئاسیای ناوەندی بریتییە لە:

١ـ پێشگیری لە گەشەسەندنی دزەی ئێران لە ناوچەکەدا.

٢ـ دانی نوێنگەگەلی حکوومی جێی ویستی ڕۆژئاوا بۆ وڵاتانی ناوچەکەدا.

٣ـ بەرەنگاری لەگەڵ ئیسلامگەرایی‌و ئەندێشەی ئیسلامی سیاسی.

٤ـ بڵاو کردنەوەی نیزامی ئابووری بازاڕی ئازاد لەناوچەکەدا.

٥ـ پێشگیری لە پەرەگرتنی چەکە ناوکییەکان.

٦ـ کۆنترۆڵی قەیرانە ناوچەییەکان بەتایبەتی دەرگیرییە ئەتنیکی ـ سەرزەوینی‌و چاودێری کردنی ئەوانە لە پێناو سەقامگیری پێویست بۆ ناوچەکە.

٧ـ دەست پێڕاگەیشتنی هاسان بە سەرچاوەکانی هیدروکەربۆنی ناوچە، بە شێوەی گشتی بازاڕی مەوادی خامی ناوچەکە.

٨ـ پشتیوانی لە مافی مرۆڤ ، دێموکراسی‌و پارێزگاری لە ژینگەی جیهانی.

٩ـ پێشگیری لە سەرهەڵدانی سەرلەنوێی پاوانخوازی ئیدیۆلۆژیك یان ڕادیکالیزمی ڕووسیە کە دەتوانێ ڕێخۆشکەری گەڕانەوەی دووبارەی جیهان بۆ ڕەکەبەرایەتی چەکی ناوکی بێ

١٠ـ بەرتەسککردنی چین‌وپەرەدان بە دەسەڵاتی ئیسرائیل لەناوچە[2]کەدا.

"ئاستەنگ و ئاریشەکانی بوونی ئەمریکا لە ئاسیای ناڤین".

هەڵبەت سەرنجدان بەم خاڵە گرینگە، ئەمریکا لە بوونی درێژماوەی لە ئاسیای ناڤین لەگەڵ دژواریگەلێك ڕووبەڕوو دەبێتەوە. ئەم بابەتە لە جۆری ڕوانین بۆسەر هاریکارییە درێژماوەکانی وڵاتانی ناوچەکە دەگەڵ ئەمریکا شوێندانەر دەبێ. لەگەڵ ئەوەی کە ئەمریکا ناچارە بۆ ڕاکێشانی متمانەی ڕوسەکان بۆ هاوکاریکردنی دەگەڵ ئەمریکا لە هێندێك بواردا پوانگەلێك بۆسەر ڕێگای بوونی ئەمریکا لە ئاسیای ناوین‌و قەفقاز پێکبێنێ. کۆمەڵێك لەو هۆکارەکانی

(١) "نەوت و گازی دەریای خەزەر و بەرنامەی ئینۆگێت"، گۆڤاری بۆچوونەکان و شرۆڤەکان، لاپەڕەی ٤٥.

(٢) حەبیوڵلا ئەبولحەسنی شیرازی، "بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی ئەمریکا لە ئاسیای ناوەڕاست"، وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز، ژمارەی ٢٩، بەهاری ١٣٧٩، لاپەڕەکانی ٦٠ ـ ٤٧.



کە دەتوانێ بە شێوەی بنچینەیی لەناوچەکەدا کە پێوەندی بە بوونی درێژماوەی ئەمریکادا هەیە و کێشە خولقێن، بریتین لە:

پاشماوەی پێکهاتەگەلی سیاسی و ئابووری و کولتوورییەکانی سەردەمی سۆڤییەت، بوونی هێزە نیزامی و نەریتی ڕووسیەکان لەناوچەکەداو بستراوییە ئابووری‌و نیزامییەکان بەم وڵاتە، نیگەرانییەکانی چین‌و ڕووسیەو هاوکارییەکانی ئەو دوو وڵاتە لە چوارچێوەی دوولایەنەو شانگهای،[1] جیاوازییە کولتوورییەکانی وڵاتانی ناوچەکە لەگەڵ ڕۆژئاواو ئەمریکا. دانی کۆمەڵێك پوان لەلایەن ڕۆژئاواو ئەمریکاوە کاریگەری لەسەر چوونە سەری ئاستی تواناکانی ڕووسیە لە هێنانە ئارای گۆڕانکارییەکان لە داهاتووی ناوچەکەدا دەبێ،کە بریتین لە:

ئەندامیەتی تایبەتی ڕووسیە لە چوارچێوەی فۆرمۆڵی ١+١٩، ئەندامیەتی لە کۆمەڵی ئابووری ٨ وڵاتی پیشەیی، دانەوەی قەرزکانی ڕووسیە بە ناوەندە مالییە ڕۆژئاواییەکان، نوێژەنکردنەوەی تێکنۆلۆژییەکانی ڕووسیە، دیاریکردنی پێگەیەکی نوێ بۆ ڕووسیە لە پرۆسەی جیهانی بەرهەم و فرۆشی نەوت و گاز، لەناوبردنی تالیبان و جێگیرکردنی تەناهی و سەقامگیری لەناوچەکەدا، دانانی بەربەستگەلێك لە بەردەم کارتێکەری چین لە ناوچەی ئاسیای ناڤین.

**سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا دوای ١١ی سپتامبر:**

گەورەترین ڕەوتی سیاسی شوێندانەر لەسەر دانی بڕیاراتی ئەمریکا لە دوای ڕووداوەکانی ١١ی سپتامبر لە ڕووبەڕوو بوونەوەیەك کە لەنێوان کۆنەپارێزکاران و پارێزکارە نوێیەکان کە لە پێکهاتی هێز لە ئەمریکادا پێکهات دەرکەوت ئەگەر چی ئەم ڕووبەڕوو بوونە لە دەیەی هەشتای زایینی بە دواوە لە سەردەمی حکوومەتی ڕێگان دەستپێکرد و بە سەرنجدان بە ڕابردووی مێژوویی ئەو لە دەیەی شەستی زایینی بە دواوە بوو بە مژارێکی جێگای بایەخ، بەڵام ئەمڕۆکە ئەم ڕووبەڕوو بوونەوە تا ڕادەیەك پێشکەتووە کە کیسنجیەر باوکی پارێزکارەکان بە توندی کەوتووەتە ژێر گوشارەوە.

مۆدیلی جێی پەسندی پارێزکارانی نەریتی یان بە واتایەکی دیکە (ڕیالیستەکان) لە ئەندێشەی کەسانێك وەك پاڵ کەندی- هێنری کیسێنجێرو ڕیچارد هاس، سەرچاوەدەگرێ. ئەم ڕووانگەیە لەو بڕوایە دایە کە دەبێ ئوپراسیۆنی ڕاستەخۆی ئەمریکا لە جیهانی سنووردار

(١) گرووپی شانگهای لەساڵی بە ئەندامیەتی وڵاتانی چین و ڕووسیە ـ قەزاقستان ـ قرقیزستان ـو تاجیکستان پێکهات و ئوزبەکستانیش دواتر پێوەست بوو، پێیان.

بکرێ و بە کەڵکوەرگرتن لە هاوپێمانان و ئەسپادرنی رۆڵ بەوان هێزی ئەمریکا وەك پایەیەك لە نیزامی چەند جەمسەری لە جیهاندا جێگیر بکرێ.

ریالیستەکان لەو بڕوایەدان کە تاوتوێ رووداوە ناوچەییەکان دەبێ گرینگی بە بوونی وڵاتە سەربەخۆکان و ئانارشیزمی زاڵ بەسەر پێوەندییە نێونەتەوەییەکان بدرێ. ستراکتۆری جیهان فرە نەتەوەییە و ئەندامان پێکەوە گرێدراون و ئەم بەستراوەیی و هاوپشتییەی ئەوانە کە دەبێتە هۆی لەناوچوونی کێشەکان و پێوەندییە نێونەتەوەییەکان و ئانارشیزمی زاڵ بەسەریاندا.

بەڵام لە روانگەی پارێزکارە نوێیەکانەوە کە لە ئەندێشەکانی کەسانێك وەك چۆن برژینسکی هانتینگتۆن ـ نیوت کینگریچ سەرچاوە دەگرێ. روانگەی پارێزکارە نەریتییەکان کارایی خۆی لەدەست داوە. لەم رووەوە ئەوروپا هاوپەیمانی سەرەکی ئەمریکا لە توانای پێویست بۆ بەشداریو هێزی بێ هەتای ئەمریکا بەهرەمەند نییە. قەوارەی ئەم بۆچوونە جێبەجێکردنی تیۆری ئیمپرالیزمی خێرخوازانەیە کە هێندێك لەبەشە گرینگەکانی بریتی لە:

ئەلف ـ دنەدان لەناوچە ژێئوپۆلۆتیکەکان و پتر کردنی هێزی ئەمریکا بۆ زاڵ بوون بەسەر نانۆرمی ژێئوپۆلۆتیك لە درێژماوەدا و لابردنی ئاستەنگ و بەربەستەکانی سەر رێگای دەست پێڕاگەیشتن بە سەرچاوەکانی وزە.

ب ـ رەتکردنەوەی هاوگرتوویی دەگەڵ هاوپەیمانە نەوتییەکان و کارکردی یەك لایەنە لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا

ج ـ لەبەرچاو نەگرتنی رۆڵی رێکخراوی نەتەوەکانو لاواز کردنی دەسەڵاتیان.

د ـ هێنانە ئارای گرینگی هێزی نیزامی بۆ چارەسەر کردنی ئاریشەکانی جیهان

هـ ـ هاتنەدەر لە پەیمانە نێونەتەوەییەکان وەك! کیۆتو ـ ABM ـ بەشی سزادانی نێونەتەوەیی، بەم پێیە پرسی کردەوەی راستەخۆیی هێزەکانی تاکە زلهێزی نیزامی جیهان (ئەمریکا) لە ناوەندە گرینگ و هەستیارەکانی جیهان بایەخی دەبێ و ئەم گرینگییە لە کاتێکدا دەتوانێ بێتە ئاراوە کە بە هۆی پێکەوەبوونێکی ئاشکرا لەگەڵ رکەبەری لە مێژینە نیزامی ئەمریکاو لەسەر بنەمای هەڕەشە هاوبەشەکان پێکبێ.

"گۆڕانە شوێندانەوەکان لە پێکهێنانی بارودۆخی هاریکاری ئەمریکا و رووسیە لە ئاسیای ناڤیندا" دوای رووداوی ١١ی سپتامبر لە واشنگتۆن و نیویۆرك و دواتر هێرشی هێزەکانی ئەمریکاو بریتانیا بۆسەر ئەفغانستان و لەناوبردنی رێژیمی تالیبان و لە راستای تەواو کردنی



ئیستراتیژی خەبات دژی تیرۆریزم لەلایەن ئەمریکا و هێزە هاوپێمانەکان، کۆمەڵێك لەم هێزانە لە ئاسیای ناوەڕاست (لە دەوروبەری ناوچەی شیویی فەرغانە، دراوسێتی لەگەڵ ئەفغانستان کە بە یەکێك لە ناوەندەکانی رادیکالیزمی ئیسلامی بە ئەژمار دێ)و لە وڵاتانی وەك قرقیزستان، ئوزبەکستان و تاجیکستان پێگەیان هەیە.

جێگرکرانی ئەم هێزانە کە پەیڕەویکردن لە ناوەندی فەرماندەیی ناتۆ، تایبەتمەندی هاوبەشیانە، لەناوچەیەك کە بەپێی پێناسەی نەریتی رووسەکان بیاڤی "دەرەوەی نزیك"ە لە ئەولەوییەتی سیاسەتە دەرەکیەکانی رووسیەیە و گرینگی نیزامی و ئیستراتیژیکی بەرزی هەیە. ئەم بابەتە دواتر لە پێوەندی دەگەڵ جێگرتنی هێزەکانی ئەمریکا لە گورجستان بە مەبەستی راهێنانی هێزە گورجییەکان لە خەبات دژی تیرۆریزم و دەربڕینی هەڵویستێکی نەرم لەم پێوەندییەدا، سەرسوڕمانی چاودێرانی دوو هێندە کرد. بەڵام بۆ شرۆڤەکاران کە مژاری پێوەندی رووسیە ـ ئەمریکا و رووداوە نێوخۆییەکانی ئەم دوو وڵاتەوچاودێری رەوتی پێوەندیو هاوکارییەکانی دوو وڵاتیان دەکرد بابەتێکی پێشبینی کراو بوو. بەتایبەتی لەو رووەوە کە بە هاتنە سەرکاری ولادیمیرپوتین و گرتنە پێشی سیاسەتگەلی ریالیستانە بۆ بەڕێوەبردنی وڵات، بەتایبەتی دژایەتی کردن لەگەڵ تێکەڵاوکردنی ئیدئۆلۆژی لە سیاسەتی دەرەکی، پێناسەیەکی نوێی لە پەرژەوەندەی نەتەوەیی و پەسند کردنی تیۆرییە نوێیەکان لە رەهەندگەلی ئابووری ـ سیاسی ـ ئەمنییەتی و نیزامی، رووسیە پێگەی نوێی خۆی لە نیزامی نێونەتەوەیی هێنا ئاراوە. بەم پێیە باشترین رێگا بۆ رووسەکان دووریکردن لە رکەبەرایەتیو دیاریکردنی سامان و کەرەستەی وڵات بۆ کاروباری پەرەدان بە نوێژەن کردنەوەی ئابووری و وەرگرتنی سەهمییەی پێویست بۆ هێنانە گۆڕێی ئابووری نێونەتەوەییە، بۆ وێنە وزە،[1] بازرگانیی جیهانی، بەرهەمهێنان و وەرگرتنی تکنۆلۆژی نوێ.

گرتنەبەری رێگاچارەی نوێ لەلایەن ئەمریکاو لە بەرانبەریشدا رووسیە کە بووەتە هۆی بەهێز بوونی هێندێك لە سەرچاوە جیهانییەکان لە بواری گۆڕانە نێونەتەوەیەکان تاکو هاوکاری دوولایەنە لە بوارگەلێکی شیاوی سەرنج پەرە پێبدەن. هێندێك لە بەشەکانی هاوکاری رووسیە و ئەمریکا لە ئاسیای ناڤین دەکرێ بەم جۆرەی خوارێ باسی لێ بکەین:

---

(١) رووسیە خاوەنی پێنج چاوگی ناسراویی نەوتی جیهانە. لەم سەرچاوە وەرگیراوە:
Reliable Affordable, and Report of the natonal Energy Enrironmentally suoad .Energy for Americas Future – policy Development Group – 2001 – Pp – 8 – 13

١ـ كۆنترۆلی قەیرانەكان (ئەوەی كە بۆ رووسیە لەم راستایەدا بایەخی حەیاتی هەیە بەدەستهێنانی پشتیوانی رۆژئاوا لە خەبات دژی شەڕوانە جیاخواز و ئیسلامگەراكانی چێچانە).

٢ـ خەبات دژی پەرەگرتنی ئیسلامخوازی رادیكاڵ و نیشانەكانی دیكەی توند ئاژۆیی.

٣ـ هاوكاری كردن لە بواری وزە وەك بەهێزكردنی ژێرخانە ئابوورییەكان بەتایبەت لە رەهەندگەلی ئابووری وزەو چاودێری بەسەرچاوگە سووتەمەنییە فەسلییەكان هەبوو لەناوچەكەدا (پێناسە كردنی ركەبەری بەكەڵك لە لایەن ئەمریكاوە بۆ ئۆپێك گرینگییەكی زۆری هەیە، هەروەها بۆ رووسیەش بۆ بەدەستهێنانی لانیكەمی كۆنترۆڵی هێڵەكانی گواستنەوەی نەوتو راكێشانی سەرمایە دانەرە رۆژئاوایەكان لە مەڕ نوێژەنكردنەوەی ستراكتۆری پێشەسازی نەوتی رووسیە قازانجی هەیە. )

٤ـ خەباتی هاوبەش لە بواری تیرۆریزم[1]

٥ـ چاودێری پتر بەسەر كردەوەی هێندێك لە كاراكتەرە شوێندانەرەكانی ناوچەیی، وەك چین ـ ئێران، بە هۆكاری جۆربەجۆر پێكهاتەی ئەم دوو وڵاتە توانایەكی تا رادەیەك بەرزیان هەیە بۆ پەرە پێدانی پێوەندییەكانی خۆیان لەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاستدا. لە روانگەی رووسیەوە پەرەسەندنی بوونی ئەمریكا لەناوچەكەدا، دەتوانێ ببێتە هۆی بەهێز بوونی پێوەندییەكانیان. ئەم بابەتە لە داڕشتنی مكانیزمی بەڕێوەبەری گۆڕانكارییەكانی ئاسیای ناوینو قەفقاز لەلایەن رووسیەوە، دەتوانێ یارمەتی بە بەرزكردنەوەی تواناكانی ئەم وڵاتە بدا.

٦ـ دابینكردنی ئەولەویەتییەكانی وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست ـ هێندێك لەم ئەولەوییەتانە بریتین لە: لاوازی ئابووری و هاریكاری ماڵی لە وڵاتانی ئاسیای نێوەڕاست بە پێی پێویست، هاتنەدەر لەژێر باڵی دەسەڵاتی رووسیە ( بۆ ئەم مەبەستە پێویستی بە هێزیكی گەورەتر لەهەمبەر هاوسەنگی دەگەڵ رووسیەدا هەیە)، گرینگیدان بە چاكسازییە سیاسی و ئابووری و نیزامییەكان، لەنێوبردنی هەڕەشەكان لەلایەن گرووپە ئیسلامگەراكان و بناژۆخوازەكان،

(١) ئیگۆر ئیوانۆف لەم پێوەندییەدا لە هەڤ پەیوینێك دەگەڵ بڵاو كراوەی نێویۆرك تایمز دەڵێ: گرینگترن ئەركی ئێمە بەهێز كردنی بەرەی دژە تیرۆرە لە جیهاندا. تەنیا وەها بەرەیەكە كە دەتوانین پێش بە چالاكییەكانی تیرۆریستی بگرن.

بەرواری ٢٧ ژانوییەی ٢٠٠٢ Newyork Times



هەرچەند ئەم گۆڕانە رێخۆشكەرە بۆ مانەوەی ئەمریكا لەناوچەكەدا و دەبێتە هۆی نێگەرانی رووسیەو هێندێك لە وڵاتانی دیكەی ناوچەكە.

## ٢ـ ئیسرائیل

كۆمارەكانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز بە دوای لەبەریەك هەڵوەشانی سۆڤییەت بەبێ هیچ ئەزموونێك لە كاروباری بەڕێوەبەری وڵات چووە ناو كەشێكی نوێوە كە مەترسی زۆر گەورەی لەگەڵدا بوو. لەو سەردەمەدا قەیرانگەلی جۆربەجۆری وەك قەیرانگەلی ئابووری و كۆمەڵایەتی و تەنانەت قەیرانی شوناس بەرۆكی بەم وڵاتانە گرت كە رێبەرانی ناوچەكەی بە چڕی بە خۆیەوە سەرقاڵ كرد، بە جۆرێك كە ئەم قەیارنانە ببوو بە دێوەزمەیەك بۆ سەركردەی وڵاتانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز، كە هەردەم چاوەڕێی ئەوە دەكرا ناوچەگەلی ئاماژە پێكراو تووشی ناسەقامگیری و شەڕی نێوخۆییش بكا. قەیران و مەترسییە پێشهاتووەكان نەك هەر رێبەرانی ناوچەكە بەڵكو وڵاتانی دوور و نزیكیش هەستیان پێكردبوو، بە جۆرێك وەزیری دەرەوەی پێشووی توركیە ـ حكمەت چیتەن ـ لەساڵی ١٩٩٣دا لەم پێوەندییەدا گوتبووی، "ئیستراتیژیك و جوغرافیایی سیاسی توركیە، ئەم وڵاتەی لەگەڵ دراوسێتی نائارامترینو شیمانە نەكراوترین ناوچە رووبەڕوو كردووەتەوە، كەواتە هەردەم ئەگەری ئەوە هەیە قەیرانەكان پەرە بسێنێ و بەرۆك بە توركیەش بگرێ. ..."[1] كۆمارەكانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز دوای سەربەخۆیی بە هۆی كێشە ئابوورییەكان پێشنیاری هەر وڵاتێكیان بۆ دانی یارمەتی وەردەگرت. بەم پێیە، رێبەرانی ئەم كۆمارانە پێشوازییان لە پێشنیاری ئیسرائیل كردو لەگەڵ نارەزایەتی وڵاتانی وەك ئێران رووسیە بەرەو روو بوو، بەلام ئەوان پەرەیان بە پێوەندییەكانی خۆیاندا. جگە لە فاكتۆرە نێوخۆییەكان، فاكتۆرە ناوچەییەكان وەك هێزەكانی دەرەوەی ناوچەش رۆڵیان لە پێشخستنی ئامانجەكانی ئیسرائیل لە ئاسیای ناوەندی و قەفقازدا هەبوو.

بێگۆمان یەكێك لەو هێزانەی كە زۆرترین رۆڵی بۆ بوونی ئیسرائیل لەناوچەكەدا گێڕاوە، ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایە. بە دوای كۆتایی هاتنی شەڕی ساردو هەرسهێنانی سۆڤییەت، ئیسرائیل سیاسەتی خۆی لە هەمبەر وڵاتانی ناوچەكە گۆڕی و دەستیكرد بە داڕشتنەوەی تاكو بتوانێ رۆڵی گەورەتر لەناوچەكەدا بگێڕێ. چونكە رۆڵێك كە ئیسرائیل لە

(1) Milik Mafti, "Dareng and Cautianin Tur Kish Foreign Policy", The Middle Esat Journal Vol 52, no, 1, winter 1997, Pp. 33 – 34.

کاتی شەڕی سارد و هەبوونی سۆڤییەتی پێشوو وەك زەلهێزێك قەبووڵ کردبوو لە سەردەمی نوێدا لە هەمبەر وڵاتە سەربەخۆ نوێیەکانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقازدا شیاوی کەڵکوەرگرتن نەبوو، لەم سیاسەتە ناوچەییە نوێیەدا، ئیسرائیل بە دوای جێبەجێکردنی پلانێکی ئەمنی گونجاو و نوێ بۆ خۆی بووە تاکو لە ژێر سێبەریدا بتوانێ ئامانجە سیاسیی و ئابوورییەکانی خۆی لەناوچەکەدا بگرێتە بەر.[1] لەم ڕێگەیەدا ئیسرائیل لە پشتیوانییە ماڵییەکانی ئەمریکا بەهرەمەند بوو کە بۆ بردنەپێشی مەبەستەکانی ئەم ڕێژیمە لە ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز شوێندار بووە. بە جۆرێك کە لە ئووتی ١٩٩٢ی زایینی ئەمریکاو ئیسرائیل پرۆژەیەکی هاوبەشیان لەم وڵاتانە گرتەبەر کە لەم پرۆژەیەدا ئەمریکا سەرمایەی ماڵی پرۆژەکەی دابین دەکردو ئیسرائیلیش گواستنەوەی تکنۆلۆژی و پسپۆڕیی پێویستی وەئەستۆ بوو.

بۆشایی دەسەڵات لە ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز هانی ئیسرائیلی‌دا تا نوێنگەگەلی ڕۆژئاوایی حکوومی لە نێوانیاندا پەرەپێبدا. هەروەها ئیسرائیل هەوڵێکی بەرفراوانی‌دا تاکو مەترسی بناژۆخوازی ئایینی لە ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز بە مەترسی (سوور) لەقەڵەم بداو ئەم سیاسەتە ڕای گشتی ڕۆژئاوا بەتایبەتی خەڵکی ئەمریکای کردبووە ئامانج. کەڵکوەرگرتن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ پێشخستنی ئامانجە سیاسیی و ئابوورییەکانی ئیسرائیل تەنیا لە ڕێگای گەورە کردنەوەی مەترسی بناژۆخوازی ئیسلامی لەناوچەکەدا نەهاتووەتە ئاراوە، بەڵکو ئەم ڕاستییە لە ڕێگاکانی دیکەش ڕەنگی داوەتەوە. یەکێك لەم ڕێگا شرۆڤەیانە، پلانێکە کە بانگەشەی ئەوە دەکا هەنووکە ئیسرائیل لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین بووەتە جێنشینی ویلایەتە یەکگرتووەکان و لە ڕاستیدا نەزمی نوێی ڕۆژهەڵاتی ناڤین وەك بەشێك لە نەزمی نوێی جیهانی بە پشتیوانی ئەمریکا دێنێتە گۆڕێ.[2] جگە لەوانە بە گوێرەی هێندێك ڕاپۆرت لە دەساڵی ڕابردوودا پلانگەلێك ئامادەکراوە کە تێدا پێشنیار بە حکوومەتی ئەمریکا کراوبوو کۆمەڵێك ئەرکی نوێ لە ئاسیای ناوەندی بە ئیسرائیل بسپێرێ. لەو گەڵاڵانەی کە لەلای شوورای ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکاو هاوکاری وەزارەتی

(1) Hader. "The last days of likud: Journal of Palestine studies, Vol. 21, no, 4, 1992.

(٢) "ئیسرائیل ـ ئاسیای ناوەڕاست: سیاسەتەکان و کارکردەکانی"، وەرزنامەی ناوەندی توێژینەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، خەزەلوەری ١٣٧٣ه، لاپەرەی ١١.



کاروباری دەرەوە و ئیدارەی زانیاری ناوەندی (سیا) ئامادە کراوە. لەم پلانەدا کە بەڕێوەبەری سەرەکی سامۆئیل بەرگر ـ ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەوکاتی ئەمریکا ، پێشنیار کردبوو کە بەرنامەکانی ئیسرائیل لە کۆمارە تازە سەربەخۆیی گەیشتووەکان لە قۆناخی یەکەم دەبێ بۆلای وڵاتانی موسلمانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز بێ تاکو ئەم وڵاتە بتوانێ پێش بە باندۆری دەسەڵاتی ڕووسیەو ئێران و هێندێك لە وڵاتانی عەرەبی لەم وڵاتانە بگرێ و مەترسی بناژۆخوازی ئایینیو ئیسلامی سیاسی لەناو ببات، هەروەها پێش بە گواستنەوەی تکنۆلۆژی نیزامی بۆ ئێران بگرێ.[1]

لە پاش ئەمریکا، بە سەرنجدان بەهاوپەیمانییەتی تورکیە لەگەڵ ئیسرائیل لەناوچەی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا ئەم دوو وڵاتە پێناسەی خۆیان بۆ قازانجە هاوبەشەکانیان لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز کرد کەئەوانی جارلەگەڵ جار لێك نزیکتر کردووە. یەکێك لە نموونەکانی هاوکاری ئیسرائیل و تورکیە لەم ناوچەیە پۆشتە کردنی کۆماری ئازەربایجان بە چەکە پێشکەوتووەکان، لەوانە مۆشەکەکانی ئیستینگێرە کە بەکەم وڵات دەدرێ.[2] ئەو هۆکارەی کە قازانجی ئیسرائیل و تورکیە لە ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز پێکەوە گرێدەدا بریتییە لە کۆمەڵێك هۆکار کە گرینگترینیان ئەوانەی خوارێیە:

ـ ئیسرائیل هەروەك تورکیە پێویستییەکی بەردەوامی بە نەوت و گاز و سەرچاوە سرووشتییەکانی دیکەی ئاسیای ناڤین و قەفقاز هەیە. بۆیە ئەم دوو وڵاتە هەوڵدەدن بۆ هاوکاری و پلانداڕێژی هاوبەش و ڕکەبەرە گرینگەکانی خۆیان وەك ڕووسیە ئێران چین وەلا بنێن، یان لانیکەم بەشی زۆرتر بۆ خۆیان تەرخانبکەن. تورکیە بەردەوام لە پێوەندی دەگەڵ پشتیوانی کردن لە ئیسرائیل هیچ گۆمان و دوودڵیەکی نەبووە و لەمڕووەوە بەردەوام هاوڕێی ئەمریکا بووە. هۆکارێکی دیکە کە قازانجی تورکیە و ئیسرائیل پێکەوە گرێدەدا، پرسی بەرەنگای دەگەڵ ئیسلامگەراکانە لەناوچەکەدا. بە جۆرێك یەکێك لە کارناسانی سیاسەتی دەرەکی ئیسرائیل لەم بارەوە ئاخاوتووە، ". .. .. وێنا کردنی بناژۆخوازییەکی ئایینی و ئیسلامی دژی ئەمریکایی لە ئاسیای ناڤین، پلانێکی ئەمنیەتی پێویستی بۆ ئیسرائیل

(١) "پێوەندییە باشەکانی ئیسرائیل دەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست"، ئەوسەت، ژمارە ٣١٦، (١٦ی فێورییەی ١٩٩٨) بە گوێرەی گۆڤاری تەرجومان، ساڵی سێهەم، ژمارە ١١٨، لاپەرەی ٢٧.

(٢) هەمان سەرچاوە ٢٧.

هێناوەتە گۆڕێ. بە سەرنجدان بەوەی کە، تورکیە لە دوای شەڕی سارد قورسایی ئیستراتیژیکی خۆی بۆ ڕۆژئاوا لەدەست داوە، ئەم وڵاتە هەوڵدەدا تاکو خۆی وەك هێزێکی نوێ دژی بناژۆخوازی ئایینی لەئاسیای ناڤین و قەفقاز پێشانبدا. بۆیە بیرۆکەی یەکبوونی ئورشەلیم و ئانکارا لە دوای شەڕی سارد چووەتە ناو ئیستراتیژی ئیسرائیل و ئەمریکاوە لە مەڕ ئیسلامی سیاسیو دژی ئایینی هەڵویستەکی یەکگرتوو بگرنەبەر..."[١]

بەم پێیە لە ڕوانگەی ئیسرائیل هاوکاری ئەم ڕێژیمە لەگەڵ تورکیە دەتوانێ بەر بەستێك بێ لەسەر ڕێگای گەشەی بناژۆخوازی ئایینیو چالاکی هێزی ئیسلامگەراکان کە بە دوای زەبروەشاندن لە قازانجەکانی ئەمریکان لەناوچەکەدا. جیا لەو خاڵانەی ناوبراو خەبات دژی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان و چەك و هەروەها بەربەرەکانێ لەگەڵ تیرۆریزم لە تەوەرەکانی دیکەیە کە بۆ هاریکاری نێوان ئیسرائیل تورکیە لەناوچەکەدا ڕاگەیاندراوە، تورکیەو ئیسرائیل هەر دوو خوازیارن کە ئەمریکا لەناوچەکەدا بە شێوەیەکی ئاکتیڤ و بەهێز بمێنێتەوە هەتا پشتیوانیان لێ بکات. هەڵبەت هاوکاری دوو لایەنەی ئەمریکا دەگەڵ وڵاتانی تورکیەو ئیسرائیلیش شێوازی جۆربەجۆر و بەتایبەتی لایەنی نیزامی لە ڕاستای قازانجە درێژماوەکانی ئەمریکا بووەو لە کاتی پێویستدا دەتوانێ کەڵکیان لێوەر بگرێ.[٢] بەڵام خاڵی جێ سەرنج ئەوەیە کە گرینگیدان بەو جولەکانە و دەرفەتی گەڕانەوەیان بۆ ئیسرائیل لە سەرەوەی سیاسەتی دەرەوەی تێلئاوییە. و ئەم کارەش تەنیا بە هاوکاری ڕووسیە جێبەجێ دەبێ و ئەمە یەکێك لە پرسەکانە کە بایەخی ڕووسیەو دەرەوەی نزیکی بۆ ئیسرائیل دوو هێندە دەکات.

یەکێکی دیکە لە هانەکانی ئیسرائیل لە ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز، ڕۆژئاوایی بوونی ڕووسیە هاو ئاهەنگی ئەم وڵاتە دەگەڵ ڕۆژئاوا بۆخەبات دژی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی ئێران، هەروەها بەرەنگاری دژی بەرەنگاری بناژۆخوازی ئایینی و تیرۆریزم لەناوچەکە دایە. ئەوەی کە گەلۆ خواستی ئیسرائیل لەناوچەکە دێتە ئاراوە یانە، زۆر ڕوون نییە، بەڵام ئەوەیش ڕوون نییە کە پێوەندی ئیسرائیلو ڕووسیە بتوانێ هەم کارێگەری لەسەر

---

(١) پولنیت ئاراس، "ئیستراتیژی ئیسرائیل لە کۆمارەکانی ئازەربایجان و ئاسیای ناوەڕاست"، وەرگێڕان حەمید ئەحمەدی، وەرزنامەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، ساڵی ٦، ژمارە ٤، (زستانی ١٣٧٧)، لاپەڕەی ٦٨.

(2) Barrty Rubin, "notes on turkey – Israel Relations" Maria Issue. No, 79. July 1999. Pp. 10 -12.



چۆنایەتی خەبات دژی ئیدئولۆژیك و سیاسەتی ئێران دابنێ و هەم ببێتە هۆی پەرەسەندنی دەسەڵاتی ئیسرائیل لە ئاسیای ناڤین و قەفقاز. لە ڕاستیدا باشترین بارودۆخ بۆ ئیسرائیل دامەزراندنی یەکیەتییەکی سێ لایەنە کە پێکهاتبێ لە وڵاتانی ڕووسیە، تورکیە و ئەمریکا، تاکو لە بەرانبەر هێزەکانی دژی ڕۆژئاوا ڕابوەستن. وابەرچاو دەکەوێ کە قازانجی هاوبەشیان بۆ وەها ڕێککەوتنێك هەمان کەڵکوەرگرتن لە گەورە کردنەوەی تیرۆریزم و مەترسی بناژۆخوازی ئایینییە لەناوچەکەدا. بەڵام خاڵێك کە هێشتا بە تەواوەتی دیار نییە ئەوەیە کە ڕووسیە هەتا چ ڕادەیەك ئامادەیە خۆی دەگەڵ ئەم ئامانجگەلە هاوئاهەنگ بکاو لە ڕیزی ڕووبەڕووی ئێران ڕاوبوەستێ. بەڵام ئەم خاڵە بۆ ئێمە ئاشکرایە کە ڕووسیە بەهیچ چەشنێك ناخوازێ لە نزیك سنوورەکانی خۆی یەکیەتییەکی ڕۆژئاوایی پێکبێ. بەتایبەتی مژارگەلی پێوەندییدار بە پەرەی پێدانی ناتۆ کە ڕووسیە ئەوەی وەك جۆرێك هەڕەشە بۆسەر قازانجە درێژخایەنەکانی خۆی لەقەڵەم داوە[١]. بەو جۆرەی کە "سەرگەئی ئاروتیونۆف"، لێکۆڵەری ڕووسی، لەم پێوەندییەدا دەڵێت، "... هاوکاری نزیکی تورکیە ـ ئیسرائیل لە ڕوانگەی جیهانییەوە ڕاستییەکی ئەرێنییە بەڵام بە شێوەی گشتی پێوەندییەکانی ڕووسیە ـ تورکیە ـ ئیسرائیل ئاڵۆزتر دەکا. ڕەنگە ئەم کارە پەرەبە ئازاردانی جوولەکەکان بدات. ئەم مەسەلەیە دەبێتە هۆی گەشە سەندنی ترسی و نیگەرانی لە ئەرمەنستانیش. لە قۆناخی یەکەم، دەبێ ڕێگاچارەیەکی گونجاوی دوولایەنە بۆ کێشەی قەرەباخ بدۆزرێتەوە و تەنیا لەو سەردەمەدا ئیمکانی دەسپێکی هاوکاری نێوان تورکیەو ئیسرائیل لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانی دەرەوەی نزیك دێتە ئاراوە و مەترسیشی نابێ. جگە لەمە دەتوانێ ببێتە هۆی نزیکبوونەوەی ڕووسیە ـ عێراق و ڕووسیە ـ ئێران و ئەرمەنستان و تەنانەت ڕەنگە توندئاژۆ ئەرمەنییەکان لە گشت جیهان ناچار بە هاریکاری کردن دەگەڵ توندئاژۆ فەلەستینییەکان بکا".[٢]

خاڵی کۆتایی ئەوەیەکە ئیسرائیل، بەردەوام ئاگاداری ئەوە بووە کە لە گەڵ ئەو هێزەی کە ڕەنگە ببێتە هۆی مەترسی بۆ سەر بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی مسکۆ لە دەرەوەی

---

(١) بۆلنت ئاراس ـ ئیستراتیژی ئیسرائیل لە ئازەربایجان و ئاسیای ناڤین، لاپەرەی ٧٠.

(٢) هەمان چاوگ، لاپەرەی ٧١.

نزيك، پێوەندی دەگەڵی دانەمەزرێنێ، چونكە تەنگـژەو رووبـەڕوو بوونـەوە دەگـەڵ رووسـيە دەتوانێ ئاريشگەلی جۆربەجۆر بـۆ ئيـسرائيل پێكبێنـێ، بـۆ نموونـە يـەكێك لـەم كێـشانە هەڵوێستی ناسيۆناليستی توندڕۆيانەی كۆمەڵێك كەسی و رێكخراوەكانە كـە هەڵويـستێكی دژی سامی و دژی ئيسرائيیلی توونديان هەيە. بـوونی ئيـسرائيل لەناوچـەكە و پـتر بـوونی دەسەڵاتی بەهۆی بۆشايی هێزەكە لەم ناوچەيەدا پێكهاتووە، بە واتايەك ئەمە كـەموكۆڕی و خاڵی لاوازی وڵاتانی ناوچەكەيە كە بە هەڵپەرستی ئيسرائيل بووەتە پێگەيەكی تايبەتی بـۆ كارتێكەری ئەو وڵاتە. وڵاتانی ئاسيای ناڤين و قـەفقاز بـە دوای سـەربەخۆيی لـە راسـتيدا نەيانويستووە سـەر بـۆ هـيچ دەسـەڵاتێكی دەركـی دانـەوێنن، ئاريـشەی وڵاتـانی ئاسـيای ناوەڕاست پرسە ئابوورييەكان بووەو هەيە. وڵاتانی وەك توركيە و ئێـران و تەنانـەت چـين و رووسيەش بەو جۆرە نەيانتوانيوە لە چارەسەركردنی كێشەكان يارمـەتی ئـەم وڵاتانـە بـدەن. بۆيە لەم بۆشاييەی هێزی ئـابووری ئيـسرائيل تـوانی خـۆی وەك ئـەڵترناتيڤێك بناسـێنێ و تەنانەت خۆی وەك دەروازەی جيهانی رۆژئاوا بناسێنێ كە دەتوانێ سەرمايەگەلێكی بـەرفرە بۆ ئەوان دابينبكا. لەم رووەوە كە ئيسرائيل لە خاڵە لاوازەكانی ئاسيای نێوەڕاست و قەفقاز و وڵاتانی دراوسێی كەڵكيوەرگرت و جێ پێی خۆی لەناوچەكەدا كردەوە. ئيسرائيل بـە دوای هەرسهێنانی سۆڤييەت دەرفەتێكی بەدەستهێنا هەتا پـەرە بـە بانـدۆری خـۆی لـە ئاسـيای ناوەڕاست و قەفقاز بداو ئەم كارە بە شێوەی بەربڵاو بە هاوكـاری وڵاتانێـك وەك ئـەمريكاو توركيە و لە سەرەوەی هەمووی ئەوانە بەهۆی بارودۆخی بۆشايی هێزی سياسیو ئابووری كە لەناوچەكەدا هاتبووە ئاراوە. ئاشكرايە ئيسرائيليش وەك وڵاتانی ديكەی شوێندانەر بە دوای بەدەستهێنانی ئامانجگەلی سياسیو ئابووری خۆيەتی لە ناوچەكەدا كـە دەكـرێ بـەم جـۆرە ئاماژە بە گرينگترينيان بدەين:

١) يەكێك لە گرينگترين هانەكانی ئيـسرائيل لـە دامەزرانـدنی پێوەنـدی لەگـەڵ وڵاتـانی ئاسيای ناڤين و قـەفقاز، پێكهێنـانی تۆڕگـەلی پێويـست لـە پێنـاو پێوەنـدی نزيـك دەگـەڵ جوولەكەكانی دانيشتووی ئەو ناوچەگەلە و يان كۆچی ئەوان بەرەو ئيسرائيل. بە جۆرێك كە لـە ماوەی كەمتر لە چوارساڵ واتـە لـە كـاتی لەبەريـەك هەڵوەشـانەوەی سـۆڤييەت هـەتا سـاڵی ١٩٩٦ی زايينی نزيك بە نيو مليۆن كەس لە دانيشتوانی وڵاتـانی پێـشووی سـۆڤييەت بـەرەو



ئيسرائيل كۆچيان كردووە ١٠٪ حەشـيمەتی ئـەو وڵاتـەی بـەرز كردەوەتـەوە.[١] زۆربـەی ئـەم كۆچەرانە دەرچووانی زاستگاكانی سۆڤييەتی پێشوو بوون.[٢] لەنێو جوولەكـەكانی دانيـشتووی سۆڤييەتی پێشوو نزيكەی دووسەد هەزار كەس نيشتەجێی ئاسـيای ناوەڕاسـتن كـە ئيـسرائيل دەيهەوێ كە هاسانكاری بۆ كۆچـی ئەوانـە بـۆ وڵاتەكـەی بكـا.[٣] يـەكێكی ديكـە لـە هانـە سەرەكييەكانی ئيسرائيل بۆ دامەزراندنی پێوەندی دەگەڵ ئاسيای ناڤين و قەفقاز، دامەزراندنی تۆڕگەلی پێويست بـۆ هێنانـە دەرێ جوولەكـەكان لەناوچـەكە دايـە. هەڵبـەت ئيـسرائيل بـە كـەڵكوەرگرتن لەكەمينـەی جوولەكـەی دانيـشتووی ئـەم ناوچـەگەلە،لەوان وەكـو چـلميری كارتێكەری خۆی لەو وڵاتانە بۆ پەرەدان بە ئەندێشەی زايونيزم كەڵكوەردەگرێ.

٢) ئامانجێكی ديكەی ئيسرائيل لە وڵاتـانی ئاسـيای ناوەڕاسـت و قـەفقاز، بـەردەوامیو هێنانە ئارای سياسەتی دەرەكی ئەم وڵاتە لەژێرناوی "ئيستراتيژی دوروبەری"ە كە لە رابردوودا نەقشەی بۆ دارێژرابوو. ئيستراتيژی دەوروبەر كە لەلايەن دەيويدبن گۆڕيۆن ـ يەكـەمين سـەرۆك وەزيری ئيسرائيل ـ پلانی بۆ دارێژراوە، پێشنياری دامەزرانـدنی يەكيـەتيی نێـوان ئيـسرائيلو وڵاتانی توركيەو ئێرانی سەردەمی شاو ئيتيۆپی كرد. ئەم پلانە بە رووخانی رێژيمی شا لە ساڵی ١٩٧٩ی زايينی نەهاتە ئاراوە و راوەستا. كۆمەڵێك لە كارناسانی سياسی لەو بڕوايەن كـە بـە بۆچوونی ئيسرائيل، ئاسيای ناوەندی و قەفقاز بۆ ئيسرائيل جـێ ئێرانـی گرتووەتـەوە. ئەگـەر وەها بيرۆكەيەك راست بێ دەردەكەوێ كە هێشتا ئەولەوييەتەكانی سياسەتی دەرەكی كاراكتەرە سەرەكييەكانی ناوچە زۆرتر لايەنی سياسی ـ ئەمنييەتی هەيـە هـەتا سياسـی ـ ئـابووری. و ئەمە خاڵێكە كە لە زۆربەی يەكيەتييەكان و گرێبەستەكانی ناوچەی ناوبراو بەرچـاو دەكـەوێ. ئەم كارە هۆی جۆربەجۆری هەيە كە يەكێك لەوانە ترسی لـە دەسـت پێڕاگەيـشتنی دوژمنـانی ئيسرائيل لە رۆژهەڵاتی ناڤين بە چەكی ناوكييە.

---

(١) عەلی ئەكبەر رەزايی، "ئيسرائيل لە ئاسيای ناوەڕاست" وەرزنامەی توێژينەوەی ئاسيای ناڤين و قـەفقاز، ساڵی سێهەم، ژمارە ٢٣، (پاييزی ١٣٧٧).

(2) Naomi shepherd, EX – Soviet Jews in Israel: Asset, Burden, or Cha llenge Israelaffairs. Vol, 1, no, 2 (winter 1994). P. 24 .

(3) Robert Freedd Israel and central Asia: A Prelmnry Analysis, Centroul Asia Menitor, no. 2, 1993. P. 17 .

٣) بەربەرەکانێ دەگەڵ شۆڕشی ئیسلامی ئێران و پێشگیری لە پەرەسەندنی بناژۆخوازی ئایینی لەناوچەکەدا، ئیسرائیل لەلایەك ڕێژیمی ئێرانی بە گەورەترین دوژمنی خۆی لەناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا لەقەڵەم دەداو دژی بوونی ئەم ڕێژیمەیە. ویلایەتە یەکگرتووەکانیش ئەم ئامانجەی گرتووتەبەر. چونکە ئامانجی ئەمریکا تەریکخستنەوەی ڕێژیمی ئێرانە لە جیهان.

هەر لەم پێناوەدا یەکێك لە بەرنامە هاوبەشەکانی ئەمریکاو ئیسرائیلو تەنانەت تورکیەیش تەریکخستنەوەی ئێرانە لەناوچەگەلی ئاسیای ناڤین و قەفقاز، بۆ وێنە، ئەمریکا لە پلانەکانی ئێران بۆ گواستنەوەی نەوت و گازی ناوچەکە کارشکێنی دەکاو لەگەڵ نائابووری بوونی هێڵی بۆڕی باکۆ ـ جیهان لە راستای زیان گەیاندن بە قازانجەکانی کۆماری ئیسلامی، پێداگری لەسەر دامەزراندنی کردەوە. چونکە لە روانگەی سەرکردەکانی کۆشکی سپییەوە ئێران رکەبەرێکە بۆ ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لەناوچەکەدا، بەستراوە کردنی وزەی ئەم ناوچەیە بۆ رکەبەرایەتی ئەمریکا و هاوپەیمانانی لەناوچەکە لە بەرژەوەندییدا نییە.[1]

وڵاتانی ناوچەکەش بە شێوەی بەرانبەر لە پێوەندی لەگەڵ ئیسرائیل بۆ نزیکبوونەوە لە ئەمریکا سوود وەردەگرن و روانینی رێبەرانی ئەو وڵاتانە دەگەڵ ئیسرائیل دەرخەری پتر بوونی ناوزەنگ و پێگەی شیاویان لە رۆژئاواو رۆژئاوا بوونیانە. بەو جۆرەی کە ئاماژەی کرا پلانێك لەلایەن دەزگا جۆربەجۆرەکانی ئەمریکا ئامادە کرا کە تێدا رۆڵی رێبەری کردنی ئاسیای ناڤین دراوە بە ئیسرائیل. ئامانجی سەرەکی لەم پلانە گورزلێدانە لە قازانجەکانی ئێران لە ئاسیای ناوەندی، هەروەها بەربەرەکانێ دەگەڵ بناژۆخوازی ئایینی لەم ناوچەیەدا. هاوکاری دیکەی ئەمریکا لەم پلانە، تورکییەیە کە بۆ دەست پێڕاگەیشتن بە سەرچاوە سرووشتییەکانی ئاسیای ناوەڕاست پێویستی بە هاوپەیمانێکی وەك ئیسرائیل هەیە. قازانجە هاوبەشەکانی سێ وڵاتی ئەمریکاو ئیسرائیلو تورکیە بۆ هاوکاری لەگەڵ یەکتر، پێشگیری لە جووڵانەوەی ئایینییەکان لەناوچەکە هەروەها بەرەنگاری لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێرانە. رەنگە باشترین هۆکار بۆ ئیستراتیژیك بوونی ئەم یەکیەتییە نە گۆڕانی پێوەندی نێوان تەلاویێو تورکیە تەنانەت بە دەسەڵات گەیشتنی حیزبە ئیسلامخوازەکانە لە تورکیەدا، بە هۆی گرتنە بەری هەڵوێستێکی توند لە هەمبەر ئیسرائیلدا، نیشانیانداوە کە لە کردەوەدا دژی پێوەندی نزیك دەگەڵ ئیسرائیل

(١) عەلی ئەکبەر رەزایی، پێشوو، لاپەرەی ٦٨.



نین و لەگەڵ دژایەتیکردنی وڵاتە ئیسلامی و عەرەبییەکان کۆمەڵێك رێککەوتننامەیان دەگەڵ ئەم وڵاتەدا واژۆ کردووە.[1]

٤) راکێشانی سەرنجی رێبەرانی وڵاتانی ئاسیای ناوەندیو قەفقاز بۆ پشتیوانی نەکردن لە راپەڕینی خەڵکی فەلەستین و حکوومەتی خودموختار، یەکێکی ترە لە ئامانجە سیاسییەکانی ئیسرائیل لەم وڵاتانەدا. ئیسحاق شامیر سەرۆك وەزیری پێشووی ئیسرائیل کۆمەڵێك نامەی بۆ ٢٣٠ کەس لە ئەندامانی کۆنگرەی ئەمریکا نووسیو خوازیاری بە کارهێنانی گوشارە بۆ سەر سەرکردەکانی ناوچەکە بە مەبەستی کەمکردنەوەی پێوەندییەکانیان دەگەڵ فەلەستینییەکان.[2] تەنانەت حکوومەتی ئیسرائیل داوای لە جیمزبیکر وەزیری پێشووی دەرەوەی ئەمریکا کرد تاکو هۆشداری بە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست یەك لەوانە قەزاقستان لە هەمبەر پێوەندییەکانیان دەگەڵ فەلەستین بدا. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم کردەوانە، چالاکی و باندۆری رێکخراوی رزگاریدەری فەلەستین لە ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز دەگەڵ سەرکەوتن رووبەڕو بووە، بە جۆرێك کە لە ژانوییەی ١٩٩٢ی زایینی عەرەفات سەردانی عەرەبستانی کردو هەردوولا جەختیان لەسەر پتر کردنی ئاستی پێوەندییەکانیان کرد. لە فیەورییەی هەمان ساڵ عەرەفات سەردانی وڵاتانی تاجیکستان و ئوزبەکستانی کرد کە لە راگەیاندراوەکاندا رەنگدانەوەیەکی بەربڵاوی هەبوو. ئەم چاوپێکەوتنانە ناساندنی وڵاتی فەلەستینی بە دواوە بوو، بووە هۆکارێك هەتا رێکخراوی رزگاریدەری فەلەستین باندۆری خۆی لەنێو وڵاتانی ناوچەکە بەرەز کاتەوە، بەڵام بە شێوەی گشتی دەتوانین بڵێین حکوومەتەکانی ناوچەکە بە هۆی کۆمەڵێك پرسی سیاسی و بەرژەوەندی ئابوورییەوە نەیانتوانیوە بگەنە خاڵێکی هاوبەشی لە هەمبەر پرسی فەلەستین و کێشەکانی ناوچەکە. واتە ئەگەر چی رێبەرانی ئەوان بە بوونەگەلی جۆربەرجۆر پشتیوانیان لە خەڵکی فەلەستین دەربڕیوە، بەڵام هیچکام بە شێوەی پراکتیك لەم بوارەدا چالاك نەبوون.

٥) پەرەگرتنی پێوەندییە ئابوورییەکان دەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقازیشی یەکێکی ترە لە ئامانجەکانی ئیسرائیل لەم ناوچەیەدا، لە راستیدا پلانە ئابوورییەکانی ئیسرائیل لەم وڵاتانە دەکرێ لە چەند گۆشەنیگاوە هەڵبسەنگێندرێ، یەکەم ئەوەیە، ئیسرائیل

(١) Strategic Digest, vol. XXVII, NO,November, 1997, p. 1776.

(٢) عەلی ئەکبەر رەزایی، پێشوو، لاپەرەی ٦٩.

خوازیاره له بەشه پیشەیی و جووتیارییەکاندا رۆڵێکی شوێندانەر بگێڕێ، لەوانە لە بەشی بەڕێوەبەری چاندنی لۆکە، دووهەم ئەوەییە، ئیسرائیل هەروەك تورکیەو ئەمریکا پێویستی بە نەوت و گاز و سەرچاوە سرووشتییەکانی دیکەی ئاسیای ناڤین و قەفقاز هەیە. ئیسرائیل ئەم ئامانجەی خۆی بە هاوکاری هاوپەیمانی لەناوچەکەدا واتە ئەمریکاو تورکیە دەپێکێ. لە رووی ئابوورییەوە، قەزاقستان گرینگترین ئامانجی ئیسرائیلە لەناوچەی ئاسیای ناوەڕاستداو زۆرترین چالاکییە ئابوورییەکانی ئیسرائیل لەم وڵاتە جێبەجێ کراوە. ئیسرائیل لە بەشی جووتیاری و بانکداری و هەتا دامەزراندنی سۆپرمارکێت گەلێك سەرمایەگۆزاری کردووە و لە بەشی تەلەفوون و گەیاندنی زانیاریش هاریکارییەکی بەرفرەی ئەم وڵاتەی کردووە. لە تورکمەنستانیش ئیسرائیلیەکان چالاکن لە پلانە جووتیارییەکانو سیستمە ئاودێرییەکان و بەڕێوەبەرییە ئاوییەکان. ئیسرائیل لە پرۆژەیەکی ١٠٠ ملیۆن دۆلاری لە بەڕێوەبەری ئاوداشتنی تورکمەنستان، هەروەها هاریکاری لە دامەزراندنی هێڵی بۆری گازی ئەم وڵاتە دەکا کە دەگوترێ ئەم هێڵە بۆرییە تاکو ئیسرائیلیش درێژەی دەبێ. تەنانەت ئیسرائیلییەکان لە بەرزکردنەوەی ئاستی دروستکردنی پاڵاوگەی تورکمەنباشی ئەم وڵاتە بە پرۆژەیەکی پێنسەد ملیۆن دۆلاری بەشداری کردووە. ئەوان لە کۆماری تاجیکستانیش لە پرۆژە ئاودێرییەکان و چاندنی لۆکە چالاکن بەڵام بە چڕی نیگەرانی پەرەی جموجۆڵە ئایینییەکانی ئەم وڵاتەن کە هەڵسوڕانی کۆمپانیا گەورەکانی ئیسرائیلی تا رادەیەك خستووەتە ژێر کاریگەری خۆیەوە. ئەم جۆرە پێوەندییە ئابووری و تێکنولۆژیکە لە کۆمارەکانی قرقیزستان و ئوزبەکستابیش کەم تازۆر دامەزراوە.[(١)]

٦) یەکێکی دیکە لە هانەکانی ئیسرائیل لە هەمبەر دامەزراندنی پێوەندی دەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناڤین و قەفقازە، هەوڵی گشت لایەنە بۆ راکێشانی هاریکاری رێبەران و رووناکبیرانی ئەم وڵاتە لە کۆڕە نێونەتەوەییەکان لە بەرژەوەندی خۆیەتی، بە واتایەك ئامانجی ئیسرائیل راکێشانی پشتیوانی خەڵك و حکوومەتە ناوچەییەکان لە رێکخراوگەلی نێونەتەوەییو یان ناوچەیی بۆ دامەزراندی گوشار دژی ئیسرائیلو لابردنی قەیرانی رەوایی نێونەتەوەییەتی. هەروەها پێشگیری لە بەرەی دژی ئیسرائیلی لەناوچەکەدا، پەرەدان بە ئاستی پێوەندی دەگەڵ وڵاتانی موسڵمان و دامەزراندی هەڵویستی دیپلوماتیکی هاوشێوازی حکوومەتەکانیان لەمەڕ

(١) هەمان سەرچاوە، لاپەرەکانی ٧٦ ـ ٧٥.



مشت و مڕی عەرەبەکان و ئیسرائیل و لە کۆتاییدا پەلە کردن لە پرۆسەی ئاشتی خۆرهەڵاتی ناڤین، لە هانەکانی دیکەی ئیسرائیلە لە ئاسیای ناڤین و قەفقاز بەئەژمار دێ.[(١)]

٧) بوونی چەکە ناوکییەکان لە ئەفغانستان و ترسی ئیسرائیل لە ئەگەری ناردنی ئەم جۆرە چەکانە بۆ وڵاتانی ناوچەکە، یەکێکی تر لە ئامانجەکانی بوونی ئەم وڵاتە ئاسیای ناوەندی وێنا کراوە. هەتا ئەو جێیەی کە نوور سوڵتان نەزەر بایەف ـ سەرەك کۆماری قەزاقستان ـ بۆ کۆتایی هێنان بەو دەنگۆیانەی کە گوایە قەزاقستان چەکی ناوکی فروشتووە بە هێزێك لە وڵاتانی ناوچە، لە وتووێژیك دەگەڵ "دیەیۆنت ئارانۆت" پێداگری دەکرد کە لەم بوارەدا نابێ هیچ نیگەرانییەك بێتە ئاراوە، چونکە ئێمە بەباشی پارێزگاری لە چەکەکانی خۆمان دەکەینو ئەگەری بە نهێنی چوونەتە دەرەوەی سنوورەکانی قەزاقستان بە هیچ شێوەیەك بناغەی نییە. نیگەرانی ئیسرائیل لە دوای هەرەسهێنانی سۆڤییەت دەستیپێکرد کە ژمارەکی زۆر لە زانایان و پسپۆڕانی ئەم وڵاتە چوونە دەرێ و ئەگەری ئەوە بووە کە ئەوان هاوکاری ناوکی وڵاتانی ناوچەکە بکەن. بەم جۆرە سیاو موساد بە وردی جموجۆڵی کارناسانی وزەی ناوکی لە ئاسیای ناوەندی و قەفقازییان خستووەتە ژێر چاودێریەوە.[(٢)]

## ٣ـ پاکستان

بە دوای یەك هەڵوەشانەوەی سۆڤییەت، وا وێنا دەکرا کە بەرە بەرە لە گرینگی ئیستراتیژیکی پاکستان دێتە خوارێ، بەم پێیە رێبەرانی ئەم وڵاتە هەوڵیاندەدا لە شوێنێکی دیکەی ئەم بۆشاییە پڕ بکەنەوەو بگرێن بە شوێن پێگەکی شیاو بۆ وڵاتەکەیان تاکو هەروا وەك کاراکتەریکی گەورە لە ئاشتی ناوچەکەدا بمێنەوە، لەم نێوەدا سەربەخۆیی کۆمارەکانی ئاسیای ناوین و قەفقاز "دەرفەتێکی مێژوویی"[(٣)] بۆ پاکستان پێکهێنا. هەر بۆیە بە خێرایی سەربەخۆیی وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقازی بە فەرمی ناسی و پێوەندی دیپلوماتێکی لەگەڵیان دامەزراند و بە

(١) کازمی سەجاد پوور، "ئێران، ئاسیای ناوەندی و ئیسرائیل"، وەرزنامەی خۆرهەڵاتی ناڤین، ژمارە ٣، زستانی ١٣٧٣.

(٢) محەمەد رەزا مەلکی "پێوەندی تورکیە و ئیسرائیلو شوێنەواری لەسەر ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز" توێژینەوەکانی ئاسیای ناوین قەفقاز ساڵی ٧، خولی ٣، ژمارەی ٢٤ زستانی ١٣٧٧، لاپەرەی ٥١.

(3) Histcri Copportunity

تامەزرۆیی گشت توێژینەوەی لەسەر لایەنە پێوەندییەکانی ئابووری ـ بازرگانی کردو پێشوازی لێکردووەو بەم مەبەستە نەواز شەریف و بێنەزیر بۆتۆ- سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی پاکستان سەردانی ولاَتانی ئاسیای ناڤینی کرد ڕێبەرانی ئەم ولاَتانەش سەردانی ئیسلام ئابادیان کردەوە و دەیان ڕێککەوتننامە لە بواری بازرگانی و پێوەندییەکان و ئالَوگۆڕی زانست، فەنی و فەرهەنگییەکان لەنێوان لایەنەکان و واژۆ کران بە هەلَسەنگاندنی ڕێککەوتننامەکانی ئاماژە پێکراو، هەروەها توێژینەوەی وردی سیاسەتی دەرەکی پاکستان لە هەمبەر ئاسیا دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە ئەم ولاَتە بە دوای گۆڕینی ڕۆلَی خۆی لە ناوچەکەدا بووە و بە پێداگری لەسەر هاریکاری ئابووری و بازرگانی لە هەولَی ئەوەدا بووە هەتا لە درێژماوە چارەسەرێك بۆ ئاریشە ئابوورییەکانی بدۆزێتەوە. پاکستان لەلایەك بە دوای بازاڕی سەربەخۆی ئەم ناوچەیە بووەو لەلایەکی تریشەوە هەولَیداوە نەوت و گاز گشت مەوادە پێویستەکانی بە بەهایەکی هەرزانتر بەدەست بێنێ هەتا دەرفەت بۆ ژیانەوەی ئابوورییەکەی بڕەخسێنێ.

پاکستان هەر لە سەرەتاوە پێداگری لەسەر لایەنی پێوەندییە ئابوورییەکانی دەگەلَ ئاسیای ناوەڕاستدا دەکرد، چونکە ئەم ناوچەیە نەك هەر دەتوانێ بازاڕێکی بەرخۆری باش بێ بۆ شتومەکەکانی پاکستان بەلکو دەتوانێ، مەوادە پێویستەکانی ئەم ولاَتەش دابینبکا. لەم ڕووەوە سیاسەتی سەرەکی پاکستان لەسەر بنەمای بەرهەمهێنانی خۆمالَی بۆ ولاَتانی ئاسیای ناڤین دانی ڕێگا تەرانزیتەکان بەوان لەپێناو هێنانو گواستنەوەی شتومەکەکانیان بۆ شوێنی مەبەست لەناوچەکەدا. کەواتە سیاسەتی دەرەکی پاکستان لەم پێوەندییەدا لەسەر دوو پایەی تەرانزیت و بازرگانییەوە بەندە.[1] هەروەها پاکستانییەکان هەولَدەدەن هەتا بازاڕێکی هاوبەشی لە چوارچێوەی ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری ـ ئێکۆ ـ دابمەزرێنن کە پێنج ولاَتی ئاسیای ناوەندیو هاورێ دەگەلَ کۆماری ئازەربایجان، پاکستان، تورکیە، ئەفغانستان و ئێران لە خۆی بگرێ. نەواز شەریف سەرۆك وەزیری ئەوکاتەی پاکستان ـ لە کاتی کرانەوەی کۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی ولاَتانی ئەندامی ئێکۆ لە ئیسلام ئاباد لە بەراوری ٣ی نوامبری ١٩٩٣ی زایینی کە پێکهات، پێداگری دەکرد کە، "..... ڕێکخراویی ئێمە ئێستا لە درێژایی ئەو زێدە کۆنە کە بناغەی ڕزگاری و شارستانییەتی بۆ جیهان دامەزراندووە، پەرەی سەندووە و جێبەجێ کردنی کۆمەلێك پرۆژەی گەورە و پرسوود جارێکی تر لەسەر جادەی کۆنی هەورێشم دەست

(1) The Econimist, "Looking North," February 22, 1992, p. 57.



پێدەکاتەوە. خەلَکی ئێمە خاوەنی مێژوویەکی هاوبەشن و هەروەها لە بەهامنۆکی و کولتوورییەکانی هاوتا بەهرەمەندن. ..."[1] گرووپێك لە بیرمەندان دامەزراندنی بازارێکی هاوبەشی ئیسلامی لە چوارچێوەی ئەندامانی ئێکۆیان ناکردەیی لێکدەداتەوە و دەست نیشانیان کردووە تەنیا پێوەندییەکی سنووردار لەسەر بناغەی قازانجی هاوبەشی لەنێوان ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە هەیە، ئەوان ئاستەنگەلی جۆربەجۆریان لەسەر ڕێگای ڕێکخراویی ناوچەیی ئێکۆ دەست نیشانکرد. بۆ نموونە پێویستییەکانی سەردەمی گواستنەوە و ئالَوگۆڕە نانۆرمە ئابووری ـ سیاسییەکان لەنێوان ئەندامانی ئێکۆ بەستراوەیی ئابوورییەکان و تەنانەت پێوەندییە مێژووییەکانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز دەگەلَ کۆمەلَەی ولاَتانی سەربەخۆی هاوقازانج، شەڕی نێوخۆی لە ئەفغانستان، تاجیکستان و ولاَتانی دیکەی ناوچەکە، گەشەی بناژۆخوازی ئایینی و بەرەوی ناسیۆنالیزمی ئەتنیکی و پێکدادان لەنێوانیاندا، بەزاندنی سنووری قازانجی نێوان هێندێك لە ولاَتانی ئەندامی ئێکۆ، هەروەها بوونی هێزەکانی دەرەوەی ناوچەکەو ڕۆلَی زالَبوونی ئەوان، بەزاندنی سنوورەکانی رووسیە لە لایەن ئێکۆوە، هەروەها دەگەلَ کارشکێنییەکانی ئەم ولاَتە، هەژاری گشتی ولاَتانی ئەندامی ئێکۆو نەبوونی سەرمایەگوزاری پێویست و هتد.....

نەوازشەریف لە کۆنفرانسی ناوبراودا چوار ڕێگای لە پێوەندی لەگەلَ بەرانامەکانی ئێکۆ دەستنیشان کرد کە بریتین لە، ١) هاسانکاری تەجارەتی دوولایەنەو هاوکاری ئابووریو گەشەی دامەزراوە مالَیو بازرگانییەکان. ٢) پەرەی پێدانی سەرچاوە مرۆیەکانیو هاوکاری لە زانست، تەکنولۆژی و پێوەندییەکان. ٣) دامەزراندنی تۆڕە بەربلاَوەکانی جادەییەکان، ڕێی ئاسن و هێلَی ئاسمانییەکان بۆ هاسانکاری و پشتیوانی لە چالاکییە ئابوورییەکانی ئەندامانی ئێکۆ. ٤) پەرەگرتنی هاتوچووەکانو نزیك کردنەوەی خەلَکی ناوچەکە لە ڕێگای پێوەندی و ئالَوگۆڕە کولتوورییەکان.

غولام ئیسحاق خان ـ سەرۆك کۆماری ئەوکاتەی پاکستانیش پێداگری لەسەر هاریکارییە ئابوورییەکانی ئەندامانی ئێکۆ کردووە و گوتوویەتی کە ئەم ڕێکخراوە دوو ئامانجی گەورەی لەبەرچاو بگرێ، یەکەم دامەزراندنی بازاڕی هاوبەش بۆ پێشکەش کردنی خزمەتگوازاری و دەرچواندنی کالاَ لەنێو ولاَتە ئیسلامییەکان و ئەوەی کە پەرەدان بە سەرمایەگوزاری و

(1) Dawn (Karachi), 30 november 1992.

دامەزراندنی بازاڕە داراییەکان لەپێناو هاوتەریب کردنی پەرداختەکان و بە ئەنجامگەیاندنی پرۆژە گەورە ئابوورییەکان لە نێو ئەندامانی ئێکۆدا بێ.[1]

ئابووریزانان ژمارەیەك لەسەرچاوە و کاڵاهاوبەشەکان لە پێناو ئاڵوگۆڕ لە نێوان پاکستان و وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست دیاری کردووە، لەوانە، پاکستان توانای هەناردنی کاڵای پیشەیی، ناردنی کەسانی پسپۆڕ، هەروەها پەروەردەی کادری زانستی، فەنی لە وڵاتانی ئاسیای ناڤینی هەیە، ئەم وڵاتانەش بە پێچەوانە توانای دابینکردنی گاز، نەوت و سەرچاوە سرووشتییەکانی دیکەیە بۆ پاکستان کە خاڵییە لە سەرچاوە وزەییەکان هەروەها پاکستان کۆمەڵێك بەرنامەی کولتووری، سیاسی دەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناڤین دەست پێکردووە. هەر چەند هۆکارگەلیك تێکچوونی ستراکتۆری پێوەندی گونجاو، قەیرانی ئەفغانستان و نێوەڕۆکی ڕێژیمەکانی لە ئاسیای ناوەندی بوونەتە هۆکاری ئەوە هەتا ئاستی پێوەندییەکان لە رادەیەکی گونجاو نەبێت.

شیاوی باس کردنە کە پاکستان لە پێوەندییەکانی خۆی دەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناوەندی لە پشتیوانی تەواوی ئەمریکا بەهرەمەند بووە. چونکە کارناسانی ئەمریکایی، پاکستانیان وەك هاوپەیمانی ئەم وڵاتە لە پێناو دامەزراندنی ئاسایشو هاوسەنگی هێز لە ناوچە بە گرینگ لە قەڵەم داوە. لە بەڵگەیەك کە لە وەزارەتی بەرگری ئەمریکادا لە پێوەندی دەگەڵ بایەخی ئیستراتیژیکی پاکستان بۆ رۆژئاوا بەمجۆرە هاتووە: "... . پێوەندی سوودمەند لە نێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و پاکستان شوێنگەیەکی گرینگە لە ئیستراتیژی ئێمە بۆ پشتیوانیو بەرزکردنەوەی ئاستی بارودۆخی ئاسایشی بەردەوام لە باکووری رۆژئاوای ئاسیا، هەروەها ئاسایشی ناوەندی دەبێ. هەر بۆیە ئێمە دەبێ هەوڵدەین کە سەرلەنوێ پێوەندی نیزامی دروست بکەینەوەو بە جۆرێك کە رێگاچارەیەکی گونجاویش بۆ پێوەندی ناوکی ئێمە بێت".[2]

ئەگەر چی پاکستان بایەخ بە لایەنی ئابووری پێوەندییەکانی دەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست دەدا بەڵام پرسە ئیستراتیژیك و سیاسییەکانیش لە رووی رێبەرانی ئەم وڵاتە دوور نەکەوتووەتەوە. بەم شێوازە پاکستان بە ئاشکرا هەوڵی داوە هەتا وڵاتانی ئەندامی ئێکۆ وەك

(1) the Mnslim (Islamabad). 29 november, 1992, p. 7.
(2) Times (new york, gmarch, 1992)



هێزێکی هاوسەنگ کەرەوە لە بەرانبەر هێندوستان و پشتیوانی ئەم وڵاتە لە مشت و مڕی لەسەر کشمیر بێنێتە ئاراوە[1] بەڵام ئەولەوییەتییەکانی ئەم کۆمارانە لە سیاسەتی دەرەکی خۆیان سەقامگیری سیاسی رێژیمە لاوازەکانیان و چارەسەری قەیرانی ئابوورییەکانیانە. بەمجۆرە ئەم وڵاتانە ئامادە نەبوون هێندوستان بەرژەوەندییەکانیان بخاتە مەترسییەوە، چونکە ئەم وڵاتانەش دەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناڤین پێوەندی بازرگانی هەیە.

پاکستان جگە لە پێویستی بە وزەی ئاسیای ناوەڕاست هیوادارە بە هەڵکەوتنی لەسەر رێگای گواستنەوەی نەوت و گازی ئەم ناوچەیە بۆ بازاڕە جیهانییەکان و تەرانزێت کاڵا. ئەم مژارە پاکستانی رووبەڕووی رکەبەرایەتی دەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە داناوە، بۆیە هەوڵدەدا هەتا بەشدارییەکی چالاکانە لە خۆی پێشانبدا. ئەم وڵاتە خاوەنی کەرەسە گەلێکە کە ئەگەر بوار بڕەخسێ، دەتوانێ ببێتە هۆی دەست پێڕاگەیشتنی ئاسیای ناوین بە دریاری ئازاد. لە راستێدا یەکێك لە تایبەتمەندییە گرینگەکانی پاکستان ئەوەیە کە ئەم وڵاتانە دەتوانن کەڵك لە کەرەستەکانی بەندەری کەراچی بگرن. حکوومەتی پاکستان کۆمەڵێك هاسانکاری بۆ باشکردنی هێڵە ئاسنییەکان هەتا کەراچی و رێگا قیرییەکان کە دەبێتە هۆی هاسانکاری بۆ دەست پێڕاگەیشتنی ئاسیای ناوەڕاست بە بەندەری ئاماژە پێکراو، دابینکردووە.[2]

بەم پلانە وڵاتانی ئاسیای ناوەندی دەتوانن کاڵاکانی خۆیان بۆ ئەفریقا، خۆرهەڵاتی ناڤین، باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاو ناوچەکانی دیکە بنێرن. هێڵە ئاسمانییە نێونەتەوەییەکانی پاکستانیش بیاڤی چالاکی خۆی لەم ناوچەیەدا پەرە پێداوە. هەروەها رێککەوتن لەسەر بەرنامەیەکی هاوبەش بۆ دامەزراندنی هێڵە ئاسمانییە تایبەتییەکان "ئێکۆ" لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی ئەندامی ئەم رێکخراوە لە ئیسلام ئاباد ( لە نوامبری ١٩٩١) هاتە ئاراوە.

لە بواری گواستنەوەی نەوت و گازی تورکمەنستان بۆ پاکستان کۆمەڵێك گەڵاڵە لەبەر دەستی جێبەجێ کردن دایە، دامەزراندنی هێڵی بۆڕی گاز بۆ پاکستان لە رێگای ئەفغانستانەوە یەکێکە لەم بەرنامەگەلە. ئەم هێڵە بۆڕییە ١٥٠٠ کیلۆمەتر درێژایی هەیەو دەتوانێ ساڵانە ٢٠ ملیارد مەتری چوار گۆشە بنێرێت. ناسەقامگیری ئەفغانستان لە دەیەی رابردووو لاوازی

(1) Dawn (karachii), 28 June, 1992.
(2) Dawn (krachi), 28 Juks, 1992.

ئابووری ولاتانی ئاسیای ناڤین و  تەنانەت پاکستانیش بۆ دابینکردنی سەرمایەگەلی پێویست، جێبەجێ کردنی ئەم پرۆژەیان لەگەڵ ئاریشەی بەرفرە رووبەڕوو کردووەتەوە بەم حاڵەش، رێبەرانی پاکستان زۆرجار جەختیان لە سەر ئەوە کردووە کە خوازیاری کەڵکوەرگرتن لە سەرچاوەکانی گازی تورکمەنستانن، بۆ راکێشانی ئەم ولاتە پێشنیاریان کردووە کە بەشێك لە گازی هەناردە، دوای گەیشتن بە ئیسلام ئاباد لە رێگای هێڵی بۆڕی ئامادەوە،دەگوازرێتەوە بۆ دەریای عەممان و دەفرشرێ بە کڕیارەکانی دیکە.[1] لەلایەکی دیکە، کۆمپانیای (برایداس)ی ئارژانتین ئاکتیڤە لە دۆزینەوەکان و بەرهەمهێنانی نەوتی تورکمەنستان، بە دوای ئەنجامدانی وتووێژگەلێك دەگەڵ حکوومەتی ئەوکاتی ئەفغانستان کە لەژێر دەسەلاتی تالێبان بوو رایگەیاندبوو کە کەڵك لەو رێگایە وەردەگرێ.

جیا لە هێڵی بۆریە نەوتیو گازییەکان، تەرانزێتی شتومەك لە رێگای ئەفغانستانەوە داهاتێکی باشی بۆ پاکستان دابینکردبوو. بە گوێرەی بەراوەردی بانکە جیهانییەکان، ئەم داهاتە سالانە دەگەیشتە پتر لە ٢/٥ ملیارد دۆلار، ئەمە جگە لە بەرهەمی بەدەست هاتوو لە قاچاخی مادده بێهوشکەرەکان کە داهاتەکانی سالانە دەگەیشتە یەك ملیارد دۆلار. کە لە راستیدا ئەم هۆیە بوو کە پاکستان بەردەوام داوای لە تالێبان دەکرد هەتا بە گرتنە پێشی چاودێرییەکی چڕی نیزامی پێش بە بازرگانی تەرانزیتی ئەم ماددەیە بگرێ. رەنگە هەر بەم هۆیە بێ کە سەراج عەزیز ـ وەزیری دارایی ئەوکاتی پاکستان، گوتبوویی کە ئەفغانستان لە رووی ئابوورییەوە پارێزگاری پێنجەمی پاکستان بە ئەژمار دێ.

هەر بۆیە بەربەستگەلی زۆر لە گۆڕێ دایەکە کارتێکەری ئەرێنی لەسەر پێوەندییە نزیکەکانی نێوان پاکستان و ئاسیای ناڤین دادەنێ، لەوانە دەتوانین ئاماژە بە ناسەقامگیری سیاسی لەناوچەی ئاسیای ناوەڕاست و بوونی کاراکتەرەکانی دەرەوەی ناوچەکە، هەروەها ئاریشە ئابوورییەکانیو قەیرانی ئەفغانستان بکەین. کە بە کورتی ئاماژە بە دوو خاڵ دەکەین.

لە رووی ئابوورییەوە دەتوانین بڵێین کە پاکستان زۆرتر لەسەر بناغەی بەرهەمە جووتیارییەکان بەندە، هەناردەکانی ئەم ولاتە زۆرتر لۆکە، خوری، پێست، دانەوێڵە، فەرشو

(1) A. Dastarac and M. Levent, "Islamabad regard Vwrs I, Asie Centrale", Le Mende Piplomatigue.



کەرەستەکانی، پۆلا، مەوادی کیمیایی، کەرەستەی ئوتومبێل کەرەستەکارەباییەکان، پارچەو نەوت پێکیدێنێ. پاکستان پتر لە نیوەی داهاتی نەتەوەیی خۆی لە رێگای جووتیارییەوە دابیندەکا. هەر بۆیە کێشەی سەرەکی پاکستان نەبوونی سەرچاوەی ماڵی پێویستە بۆ هێنانە دی ئاواتی لە مێژیینە خۆی واتە دروستکردنی پردێك،لە نێوان ولاتەکەی و ئاسیای ناوەڕاستە. دانی پشتیوانییە ئابوورییەکانی پاکستان زۆرتر لایەنی سۆمبولیکی هەیە. بەم حاڵەوە پاکستان هەوڵدەدا ولاتانی رۆژئاوا رازی بکا بۆ دانانی سەرمایە لە پێناو پەرەدان بە لایەنە ئابوریو پێوەندییە گشتییەکان لەم ناوچەیەدا.

بەلام ئیمکانی جێبەجێ بوونی زۆربەی سەرمایەدانان و پلانە هاوبەشەکان لە نێوان پاکستانو ئاسیای ناوەڕاست بە شێوەی جیددی جێگای شك و گومانی ئابووریناسانە. بۆ وێنە تێچووی گواستنەوەی کارەبا لە تاجیکستانەوە بۆ پاکستان زۆر گرانترە لە بەرهەمهێنانی ئەم وزە لە نێوخۆدا. هاتنە ئارای زۆربەی رێککەوتنە هاوبەشەکان لە نێوان پاکستان و ئاسیای ناڤین پێویستی بە واقیعبینی و سەرنجدان بە سیاسەتگوزاری و پلاندارێژییە. بارودۆخی ئالۆزی ئەفغانستانیش کە یەکێکی دیکەیە لە پرسەکان، کە دەبێتە هۆی ئاستەنگ لە بەردەم بەرزبوونەوەی رادەی چۆنییەتی پێوەندییەکان لە نێوان، ئاسیای ناوەڕاست. چونکە رێگا سەرەکییەکانی پێوەندی پاکستان بە ئاسیای ناوین لە ئەفغانستانەوە تێپەڕ دەبێ، بەم پێیە هەتا گەڕانەوەی بارودۆخی ئاسایی بۆ ئەفغانستان، پلانەکانی ئەفغانستان لە پێناو بوونێکی شوێندانەر لەم ناوچەیەدا لەگەڵ بەربەستگەلی جیددی بەرەوڕوو دەبێ. ئەگەر چی هەنووکە بە هۆی داگیر کردنی ئەفغانستان لەلایەن ئەمریکاوە تا رادەیەك سەقامگیریەو ئارامی لەم ولاتە هاتووتە گۆڕێ، بەلام هەروەها لە ئەفغانستان رەوشەکە نائارام و ئالۆزەو شیمانە ناکرێ کە هەتا داهاتوویەکی نزیك سەقامگیری راستەقینە لەم ولاتە دابمەزرێ. ئەم کارە دوواهاتێکی جیددی بۆ باشووری رۆژئاوای ئاسیای بەدواوەیە.

### ٤ـ ناتۆ[1] (nato)

دەگەڵ لەبەریەك هەڵوەشانی یەکیەتیی سۆڤییەت بارودۆخێك پێکهات کە ناتۆ بتوانێ پەرە بە ناوچەی ئەمنییەتی خۆی بدا. بۆ ئەم مەبەستە ناتۆ دوو رێچکەی گرتەبەر: یەکەم لە رێگای دامەزرندنی "شوورای هاوکاری ئاتلانتیکی باکووری"و دووهەم بە جێبەجێ کردنی پلانی

(1) North Atlantic treaty organization.

"بەشداری بۆ ئاشتی". لە ساڵی ١٩٩٢، هەموو وڵاتانی سەربەخۆی هاوقازانج وەك وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز بۆ ئەندامیەتی شواری هاریکاری ئاتلانتیکی باکووری وەرگیران و شوورا لە پێناو پێکهێنانی پێوەندییەکی رێکوپێك، کۆمەڵێك کۆنفرانسی بەڕێوەبرد. لە راستیدا، شواری هاوکاری ئاتلانتیکی باکووری بە دوای چاودێری و شوێندانان لەسەر رەوتە سیاسییەکان لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا بوو، هەتا بە جۆرێك بتوانێ پێش بە رووداوە دڵتەزێنەکان لەم وڵاتانەدا بگرێ. بۆ پەرەدان بە هاوکاریە نیزامی و بەرگرییەکان دەگەڵ ناتۆ پلانی هاوبەش بۆ ئاشتی هاتە ئاراوە کە گشت وڵاتانی ئاسیای ناڤین (جگە لە تاجیکستان)و قەفقاز بوون بە ئەندامی. ئامانجی درێژماوە و ئیستراتیژیکی ئەم پلانە لە ئاسیای ناوەڕاست بریتین لە:

١. تێوەگلاندنی وڵاتانی ئاسیای ناوەندی و قەفقاز لە کاروبارو پرسە ئەمنییەکانی ئەورووپا لە رێگای دانی دەرفەتی بەشداری کردنیان و بەڕێوەبردنی راوێژە هاوبەشەکان لە کاتی هەرەشەدا.

٢. ئاڵوگۆڕی زانیاری و پەرە بە هاریکارییە نیزامییەکان.

٣. دابینکردنی باوەندگراند لە راستای ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی پاراستنی ئاشتی لە کاتی قەیران.

٤. پتەو کردنی سەقامگیری لە ناوچەکە لە پێناو پاراستنی قازانج و ئامانجەکانی رۆژئاوا.

کۆمەڵێك لە سیاسەتوانانی رووسی، پلانی بەشداری بۆ ئاشتی یان نەك هەربە مکانیزمی دژە کردنی ئیمپرالیزمی رۆژئاوا بۆ رۆژهەڵاتی ئەورووپاو ناوەندی لەقەڵەمدا، بەڵکو بۆ دەورووبەری قەفقازو ئاسیای ناوەندیشیان لێکدەداتەوە. بە بڕوای ئەوان، سیاسەتی رووسیە لە هەمبەر پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری تەنیا دەبێ دژکردەوە بە دژی ناتۆ و وێرانکردنی ئەم رێکخراوە بێ. ئەگەر چی رووسیە مافی ویتۆ کردنی وەرگرتنی وڵاتە سەربەخۆکانی لە ناتۆدا نییە، هەنووکە کۆمەڵێك کەس لەو بڕوایەدان کە پەیوەست بوونی رووسیە بە ناتۆ و رێکخراوە بە کۆمەڵەکانی دیکەی وڵاتانی رۆژئاوا، وڵامدەری قازانجەکانی رووسیەیە. بە هەرحاڵ ئەوەی کە دەتوانین وەك بوارگەلی قازانجی هاوبەشی نێوان دوو رێکخراویی ناتۆو کۆمەڵەی CIS بێتە گۆڕێ بریتین لە: دابینکردنی ئاشتیو ئارامی، بەڕێوە بردنی ئۆپەراسیۆن بۆ پارستنی ئاشتیو هاوکاری هەمە لایەنەی نیزامی،گرتنە بەری رێوشوێنی پێویست لە پێناو کۆنترۆڵی چەکەناوکییەکان و پێشگیری لە پەرە سەندنی چەکە ناوەکییەکان و گرتنە بەری رێوشوێنی پێویست لە پێناو سڕینەوەی گومان ناکۆکی دوولایەنە.



روانگەی هێندێك لە حکوومەتەکانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز لەسەر ئەم بنەمایە بەندە کە پەیوەست بوون بە پلانی بەشداریکردنی بۆ ئاشتی دەتوانێ دوو ئامانجی سەرەکی بپێکێ:

١. دابەزینی بەستراوەیی نیزامی ئەم وڵاتانە بە رووسیە

٢. نوێژەنکردنەوەی کەرەستە و کەلوپەلە نیزامییەکانی وڵاتانی ناوبراو بەهێز کردنی دەسەڵاتی نەتەوەیی.

لەم پێوەندیەدا، ساڵی ١٩٩٦ قەزاقستان و ئوزبەکستان پێشوازیان لە پێشنیاری مسکۆ بۆ بەجێ گەیاندنی چاکسازی لە هێزە نیزامییەکانی وڵاتانی سەربەخۆی هاوقازانج لە پێناو دامەزراندنی ستراکتۆرێکی هاوبەشی نیزامیان ئەکردو هاورێ لەگەڵ قرقیزستان خوازیاری دامەزراندنی هێزێکی پاراستنی ئاشتی بە رێبەری رێکخراویی نەتەوەکان بوون.[1] بە هاتنی سێ کۆماری ئازەربایجان، ئەرمەنستان و گورجستان، ئەوانیش بەشدارییان لە پلانی ئاشتی ناتۆ کردو شیمانە نەدەکرا کە هەرکام لەم وڵاتانە بە خێرای خوازیاری هاتنەدەر لە سیستمی ئەمنییەتی بە کۆمەڵی وڵاتانی سەربەخۆی هاوقازانج، هاتنەدەری سەربازانی رووسیە لە قەفقازو جێگرتنی پێگە نیزامییەکانی ناتۆ لە ناو چەکە بن.

بە شێوەی گشتی دوای لەبەریەك هەڵوەشانی سۆڤییەت، سێ کۆماری قەفقازی باشووریو پێنج کۆماری ئاسیای ناڤین چەمکێکی سەقەت و سنووردارییان لە کردەی سەربەخۆیی خۆیان خستە رووو ئەوەیان تەنیا بۆ رزگاری لە ژێر دەستی سۆڤییەت کردبووە هاوکێشە. هێندێك لەم کۆمارانە لەوانە کۆماری ئازەربایجان و گورجستان گەشە و پێشکەوتنیان هاوتا دەگەڵ رۆژئاوایی بوون و یەکگرتنی هەرچی زیاتر لەگەڵ پێکهاتەکانی دیکە لەقەڵەم دەدا. دوواهاتی وەها روانینێك، جێبەجێ کردنی چاکسازی سیاسیو پێکهاتەیی بەپێی نوێنگە رۆژئاواییەکان بوو کە بووە هۆی دانان و پەسندی یاسای بنەڕەتی هەڵقوڵاو لە یاسا رۆژئاوایەکان و گۆڕینی سیستمی سیاسییەکانی وڵاتانی قەفقاز بۆ نیزامی سەرۆکایەتی بووو پاشان بەرە بەرە دوور کەوتنەوەی دوو کۆماری ئازەربایجان و گورجستان لە رووسیەو کۆمەڵەی وڵاتە سەربەخۆو هاوقازانجەکان شاهیدی هاوئاهەنگی پێ بە پێی ئەوان دەگەڵ پێکهاتە سیاسی و ئابووری و نیزامییە رۆژئاوایەکانن.[2]

---

(1)Bruno Coppiters, "the central Asian Region in a new International Environment", n Ato Reriew, no, 5, Septetember 1996, p. 27.

(٢) پەرەدان بە دراویی نەتەوەیی، گرینگیدان بە راکێشانی سەرمایەدانەرە رۆژئاواییەکان، هەوڵدان بۆ پەیوەست بوون بە ستراکتۆرە ئورووپایەکان و...

هاوکاری وڵاتانی ئاسیای نێوەڕاست و قەفقاز لەگەڵ ڕێکخراویی ئاتلانتیکی باکووری لە چوارچێوەی بەرنامەی "بەشداری بۆ ئاشتی دەگەڵ دزە کردەوەی ئەرێنی ئەندامانی ناتۆو بەتایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕووبەڕوو بووەتەوە. وڵاتانی خوازیاری ئەندامیەتی لە ناتۆ، دەبێ بەرژەوەندی ئیستراتیژیکی ئەم یەکیەتییە بەهێز بکەن و پەرە بە ئەمنییەتی وڵاتە ڕۆژئاوایەکان بدەن. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ کە قازانج و ئامانجی ئەندامانی ناتۆ یەك لەوان وڵاتە یەکگرتووەکان لە بوونی گشت لایەنییان لە ئاسیای ناڤین و قەفقاز چییە؟!

دەتوانین بەم جۆرە ئاماژە بە ئامانج و قازانجەکانی ئەندامانی ناتۆ بکەین:

١) بوون لە هەرێمی بۆشایی ڕووسیە پاشماوەی وڵاتانی یەکیەتیی سۆڤییەت لە ئاسیای ناوەڕاستو قەفقاز، بە واتایەکی دیکە پڕ کردنەوەی بۆشایی هێز کە بە هۆی تێکچوونی سۆڤییەت پێکهاتووە

٢) زاڵبوون بەسەر سەرچاوە نەوتییەکانو سەرچاوە سرووشتییەکانی دیکەی وڵاتانی ئاسیای ناوین و قەفقاز

٣) پێشگیری لە مەترسی باندۆری وڵاتانی ناوچەکە، لەوانە ڕووسیە، چینو ئێران لە ڕێگای ناوچەی ئیستراتیژیکی قەفقازو ئاسیای ناوینەوە

٤) پێوەندی ژێئوپولۆتیکی ناوچەی خەزەر بە ڕۆژئاوا لە ڕێگای تورکیەوە.

٥) بەرئەنگاری دەگەڵ تیرۆریزم و دروستکردنی چەکە کۆمەڵکوژەکان، لەوانە پێشگیری لە. قاچاخی چەك و چەکە ناوەکییەکانی وڵاتانی جیهانی سێهەم .

٦) خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان و بزاوتەکانی دژی ئەمریکاو ڕۆژئاوایەکان.

٧) پێشگیری لە بناژۆخوازی ئایینیو مەترسی ئیسلامی سیاسی، پێشگیری لە تێکهەڵچوونە ئەتنیکی ـ ئایینییەکان لە کاتێکدا بۆسەر قازانجە ڕۆژئاوا مەترسی خولقێن بێ.[1]

ئەم مەسەلەیە، باس لەوە دەکا کە هەنووکە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و قەفقاز بە دوای دامەزراندنی ڕێوشوێنی نیزامی نوێن بە هاوکاری ڕۆژئاوا لەم ناوچەیەدا. کارێك کە دەتوانێ ببێتە هۆی دابەزینی ڕادەی دزەی ڕووسیە لە ناوچەکە. لە بەرواری ٢٦ی ١٩٩٩ کۆمسیۆنی هاوبەشی ئوزبەکستان ـ ئەمریکا لە تاشکەند پێکهات و چەندین ڕێککەوتننامە بۆ خەبات دژی تیرۆریزمو هاریکارییە هاوبەشەکان لە نێوان دوو وەزارەتخانەی بەرگری ئەمریکاو

(١) حوجەتوڵڵا فەغانی، "بەرفراوانکردنی ناتۆ بۆ ڕۆژهەڵات: تاوتوێ هەڵویستی گورجستان"، وەرزنامەی توێژینەوەکانی ئاسیای ناڤین و قەفقاز ژمارە ٢٦، هاوینی ١٣٧٨، لاپەرە٢١.



ئوزبەکستان واژۆ کران. ئوزبەکستان وەك هاوپەیمانێکی سەرەکی دەروانێتە ئەمریکاو بە شێوەی بەربلاو لە هەڵوێستەکانی ئەمریکا لە هێندێك پرسدا وەك هێرشی نیزامی بۆسەر عێراقو یوگوسلاویی پشتیوانی کردووە. لە دوو ساڵی ڕابردوودا سەربازە ئەمریکاییەکان لە مەشقە هاوبەشەکانی وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست بەتایبەتی لە ئوزبەکستان بەشدارییان کردووە و بڕیارە هەتا لە ئوزبەکستانو وڵاتانی دیکەی ئاسیای ناڤین کۆمەڵێك سەرباز بۆ ڕاهێنانیان بۆ ئەمریکا بەرێ بکرێن. ئەستفان ستانویچ، نوێنەری تایبەتی ئەمریکا لە پێوەندی دەگەڵ هاریکارییە بەرگرییەکان دەڵێت: "ئێمە لە هەمبەر هاوکارییەکانمان بە دوای دامەزراندنی هێزی پاراستنی ئاشتی لە ئاسیای ناڤین و ئەمنییەتی سنوورەکان گەیشتووین بە کۆمەڵێك ڕێککەوتن". جیا لەوە ناوبراو وەبیری هێنایەوە کە "ئەمریکا پلانی دامەزراندنی پێگەی نیزامی لە ئوزبەکستان نییە، بەڵام کارناسانی ئەم وڵاتە یارمەتیمان دەدەن کە ئەو چەکە میکروبیانە کە پاشماوەی چەك و چوڵە نیزامییەکانی سۆڤیەتی پێشووەو لەم وڵاتە ماوەنەتەوەو دەبێتە هۆی پیس بوونی ژینگە، لە ناوی بەرن. بەڵام لە کردەوەدا ئوزبەکستان هێشتا بۆ دابینکردنی ئاسایشی خۆی بەستراوەیە بە ڕووسیە. لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا، مەترسییەکان بۆسەر ئوزبەکستان پەرەی گرتووە، بە جۆرێك کە لە نێوان ساڵی ١٩٩٨ بە جێگرتنی هێزی تاڵیبان لە ئەفغانستان، سەرنجی ئوزبەکستان بۆ لای دژبەرانی توندئاژۆ کە چالاکتر ببوون، ڕاکێشرا. هەر ئەمە بووە هۆی ئەوەی هەتا ئوزبەکستان بەرەو لای هاوپەیمانێکی وەك ڕووسیە بڕوا کە نیگەرانی گەشەسەندنی باندۆری ئەفغانستانە لە ناوچەکەدا. هەوڵی ئوزبەکستان، ڕووسیەو تاجیکستان بە دژی توندئاژۆ ئایینییەکان توندوتۆڵتر ببوو، وا بڕیاربوو لەم بوارەدا هاوکاری یەکتر بکەن. لەم پێوەندییەدا یارمەتیگەلێك بە هێزەکانی دژی تاڵیبان واتە ئەحمەدی شامەسعوود کرا کە لە شیویی پێنجشێردا جێگر بوون. لە بەرانبەریشدا حکوومەتی ئەفغانستان بۆ شەڕوانانی ئیسلامی کە لە ئوزبەکستانەوە هاتبوونە دەرەوە و لە نێوان چیاکانی ناوچەی تاجیکستان و قرقیزستان نیشتەجێ ببوون یارمەتی گەلێکی بۆ دەناردن. لە هەمان کاتدا کۆمەڵێك تاقم و بزاڤی ئیسلامی ئوزبەکستان[1] بە ڕێبەری جومعە نەمنگانی هەڵسوانیان دەستپێکرد بوو. لە ئاگۆستی ١٩٩٩دا، جولانەوەی ئیسلامی ئوزبەکستان هێرشی کردە سەر ناوچەی باتکەنی قرقیزستان و هەر لەم پێناوەیشدا شەڕوانانی چیچانی دەربەندەکانی کانی داغستانیان داگیرکرد. ئارمانجی سەرەکی لە هێرشی بۆ سەر

(1) the Islamic movement of Usbekisfan (IMU)

